حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٦٨)

# ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما)

عەلی کەریمی

چاپی دووەم

سلێمانی ٢٠٠٥

# ژیان‌و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی
## (مامۆستا عولەما)

نووسینی: عەلی کەریمی

بابەت: ژیاننامە

مۆنتاژ: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی کاریین

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٦٢٨)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

چاپی یەکەم: ١٩٩٩ بنکەی چاپەمەنی زاگرۆس گۆتنبێرگ، سوید

## پێشکێش:

« به یەکەم مامۆستای زمانی کوردییم، ئەو مامۆستایەی دەنگی لە هەموو کەس لام خۆشترە، ئەو مامۆستایەی کە بۆ یەکەم جار وشەکانی "بێژەن" ، "ژێکاف" ، "کۆمار" ، "کاکم" ، "زەبیحی" و هەزاران وشەی تری کوردایەتی لێ فێر بووم، بە دایکم رەعنا زەبیحی کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە بە دەم بێشکەوە، بەچاوی گریان و بە لایەلایەی "هەژار"انە بەسەر کاکی دوورەوڵاتی هەڵدەگوت. »

# ناوەرۆک



## وتووێژ لە گەڵ بەرێزان:



## چەند وتووێژی نامەیی لە گەڵ بەرێزان:

## زەبیحی لە شەرگەی زمان دا



## چەند بەرهەمی چاپکراوی زەبیحی:

دوای تێکچوونی کۆمار و چوونی زەبیحی بۆ خوارووی کوردستان ئەمە یەکەم رەسمە کەبۆ
دایک و خوشکەکانی ناردووە (١٩٥٠)

# پێشگوتن

هەر لە منداڵییەوە بزۆز و بەپرسیار بووم؛ پێمخۆش بوو لە هەموو شت سەر دەرهێنم؛ زۆر جار شتی ناوماڵ و عەلەتریک و مەلەتریکی کارەباییم دەست تێوەردەدا و دەمکردنەوە هەر بۆ ئەوەی بزانم چۆن ئیش دەکەن و ناوەکەیان چی تێدایە؛ دیارە زۆر جارانیش بۆم وەک خۆیان لێ نەدەهاتەوە و لەشەقی گەورەکان بێبەری نەدەبووم.

پێموانیە کەس لە دایک، بە تایبەتی لە سەردەمی منداڵیدا لە مرۆڤ نیزیکتر بێ، وردە وردە کە لە قسان حاڵی دەبووم و لە شتە سەرەتاییەکان تێدەگەیشتم، هەستم بەوە کرد کە دایکم هەڵگری غەمێکی قورسە لە ناو خۆیدا. زۆر کەڕەت لای قاوەڵتوونان یان پێش نوێژی ئێواران دوای ماڵ هەڵوەژاردن و گەوران بەرێ کردن، بەدەم سەرکڵاوە چنین و سوڕانی دەرزی و دەزووەوە، بە دەنگێکی مەحزون و یەکجار خۆشەوە هاورێ لە گەڵ خوڕەی ئاوی سەر ڕوومەتی بە لاواندنەوەیەکی زۆر بە سۆزەوە بە سەر کاکیدا هەڵدەگوت.

بۆم پرسیار بوو، کاکی لە کوێیە؟! بۆ نایەتەوە لای؟! بۆ دایکمی چاو بەگریان و غەمبار کردووە؟! من کەسێک نەبووم دەست لەو پرسیارانە هەڵگرم و واز لە دایکم بێنم، ئەویش دەیشاردەوە و سەرزارەکی بەگوتنی: چووزانم؟!... مردووە!... نەماوە!... چ کارت بەو شتانە داوە، دەیویست لە کۆڵ خۆتیم کاتەوە بەلام من دەست بەردار نەبووم. وردە وردە تێیگەیاندم کە کاکی ئاوارە و دوورە وڵاتە، لە گەڵ هەڕەشە لێکردن و وەعد لێ وەرگرتن لە باس نەکردنی لە ناو کۆلان و منالی کوچە، سڕی دڵی کردەوە و هاتە سەر ناساندنی کاکی و بە مێشکی منالیم هەر ئەوەندە تێگەیشتم کە خالم شای خۆش ناوێ چون شا کوردی خۆش ناوێ و دەیان کوژێ!

دایکم بە گێڕانەوە و وەسفی کاکی وای لێکردین کە لە ناو هەموومان هەرکات دەمان گوت: "بە سەری خاڵە ڕەحمان..." ئیتر هەموو شت تەواو دەبوو و بڕوای تەواومان

بە یەکتر دەکرد.

بە تێپەر بوونی ڕۆژگار و بەسەرچوونی سەردەمی منالّی بەو ڕاستییە گەیشتم کە مەرجی چاو پێکەوتن بە خالّە ڕەحمان تەنیا و تەنیا نەمانی شای ئێرانە!

ئەو کەسانەی سالاّنی ٦٠ و ٧٠ لە ئێران ژیابن باش دەزانن ئەو حکومەتەی شای ئێران پێکی هێنابوو بە خەونی شەوانی کەسدا نەدەهات کە هەرەس بێنێ و بڕووخێ.

ئەوەی کە قەت بیری لێ نەدەکراوە و ڕێگای بۆ ناو خەونی شەوانیش نەبوو، سالّی ١٩٧٩ قەوما و شای ئێران کلکی خستە سەر شانی و لە ئێران وەدەرکەوت.

فرمێسکی غەم و پەژارەی دایکم بوو بە فرمێسکی شادی و پێکەنین، پاش ٣٤ سالاّن خوشک و برا یەکتریان لە ئامێزی خۆشەویستی گرتەوە.

کە دەلّێن ئێمەی کورد گەلێکی هەژار و هەناسە ساردین درۆیان نەکردووە، بۆ داگیرکەرانی کوردستان فەرق ناکا و هەردەمەی بە ناوێک کوشتویانین، شا ڕۆیشت مەلا هات، ئەو بارەی کە لێمان بوو هەر لێمانە، زۆری نەخایاند ئەو خەون و خەیالّە خۆشانە بوونەوە بە شانۆی وێرانی هەموو شارەکانی کوردستان و هەزاران مرۆڤی بێدەسەلاّتی کورد لە خوێندا شەلالّ کران، دایکم ئەوجار نە تەنیا بە یەکجاری کاکی لە دەست چوو بگرە کچە ١٨ سالاّنەکەشی بەدەستی ڕێژیمی مەلایان گولّی ژیانی هەلّپرووکا. شا دوو برای لێ تەرە کردبوو، مەلا سێ کوڕی لێ هەلّوەدا کرد.

هاوینی سالّی هەشتا خەبەر هات کە مامۆستا زەبیحی لە بەغدا کوژراوە، خەبەرێکی لە ناکاو و دلّتەزێن بوو بۆ هەموو لایەکمان، بە تایبەت کە ماوەیەک بوو لە گەلّمان بوو لە ڕۆژهەلاّتی کوردستان و خەریکی کاری سیاسی و کوردایەتی بوو لە ناوماندا. کەس نەیدەزانی بۆ کوشتوویانە و لە سەر چی لە ناویان بردووە، ئەوە بۆ من پرسیار بوو کە هۆی نەمانی دەبێ چ بووبێ؟!

سالّی ٨٢ کە پەڕیمەوە خوارووی کوردستان هەلم قۆزتەوە و کەوتمە خەلّک بینین و پرسیار کردن، هەتا زۆرترم خەلّک و کۆنە ئاشناکانی دەدیت زۆرتر هۆگری بەسەرهات و ڕابوردووی مامۆستا دەبووم و باشترم دەناسی، ئەوە بوو بە هۆی ئەوە کە خالّم ببێتە بەشێکی گەورە لە مێشک و خەیالّم.

کە پەڕیوەی هەندەران بووم و خۆم لە ئورووپا گرتەوە و بەرەوپیری ژیانێکی ئاسایی هاتم، لە گەڵ ئیش و کاری ڕۆژانە لە پەناوە خۆم بەو کتێبانەوە کە لەسەر مێژووی سیاسی گەلەکەم نووسراوە خەریک کرد بە تایبەت ئەو بەشەی کەخاڵم خەباتی سیاسی خۆی تێدا دەست پێکردووە واتا کۆمەڵەی ژ.ک.

ئەوەی کە قەت بە بیریشم دا نەدەهات ئەوە بوو کە ڕۆژێک کتێب بنووسم، بەڵام ئەوەی کە مرۆڤ نایەوێ بیکا، دۆست پێتدەکا جا چ چاک و چ خراپ. کۆمەڵێک لە دۆستان کە ئەو وەدواکەوتنەی منیان دەدیت لە مەر ژیان و خەباتی سیاسی مامۆستا زەبیحی، لەسەر ئەو بۆچوونە کە مامۆستا وەک تێکۆشەرێکی گومناوە و کەس بە موڵکی خۆی نازانێ و کەس باسی ناکا، هانیان دام کە بە تەواوی وەدوای ژیان و بەسەرهاتی کەوم و لە ئاخردا کە کرا بڵاوی کەمەوە. هەر چی دەمهێنا و دەمبرد زۆرتر لەسەر ئەو سوور دەبووم کە من سواری ئەو مەیدانە نیم و لە شەرمەزاریی دوارۆژی دەترسام، ئاخر منێکی نەخوێندەواری، کوردی نەزانی بێ شەهادە، کتێب نووسین "کجا مرحبا"!؟

سەرتان نەئێشێنم، ئەوەی کە لێی دەترسام و لە خۆم ڕانەدەدیت بیکەم، دۆست پێی کردم و زیاتر لە ١٠ ساڵە ئەوە خەریکی ئەو بەسەرهاتەم و ئێستاش کە وا ئاخر دێڕەکانی دەنووسم هەر کە بیر لە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی دەکەمەوە ئارەقەیەکی سارد بە سەرتاپای لەشمدا دێتە خوارێ و لێی دڕدۆنگ دەبم. بیر لەو کەسانە دەکەمەوە کە خۆش خۆش کتێبێک دەدەنەدەر و هەر وا دەکەن و نەولا دەکەن کتێبێک دەنووسن، دەڵێم دەبێ ئاخۆ چ دڵ و جورئەتێکیان هەبێ و چەند پشت قایم بن بە خۆیان و چەندیان لە هەمبانەدا هەبێ؟!

خوێنەرەوەی خۆشەویستم، کاتی خوێندنەوەی ئەو کتێبە تکات لێ دەکەم بیر لە من و بێ سەوادیم مەکەوە، مەڵێ ئەوە کوا کوردی نووسینە، ڕەخنەی ئەدەبیم لێ مەگرە، بە شتی دوور لە مەبەستم سەرکۆنەم مەکە و مەمڕوخێنە، خۆم دەزانم ئەو شتانەی تۆ دەیڵێی هەمووی وایە، من خۆم لە تۆ باشتر دەناسم، ئەوەت لە بیر بێ من نە نووسەرم، نە ئەدیبم، نە زمانەوان، نە... هەر ئەوەندە ویستم بە هەر زمانێک کە لێک حاڵی دەبین وەبیرت بێنمەوە کە کورد خاوەنی هەزاران تێکۆشەری نەناسراوە کە بە بێ هیچ چەشنە

پاداش و نێـو و نێـوبانگێـک و بە بێ تەپ و تۆز کردن، بە هێـمنی و بە ئەسـپایی خـۆیان کـردە قـوربانی ئەو گەلە هەژار و لێـقەومـاوە و من و تۆ تەنانەت ناویشـیان نازانین، من ویستم تەنیا یەک لەوانەت پێبناسێنم:

زەبیـحی زیاتر لە ٤٠ ساڵ بە بێ وچان خەباتی کوردایەتی کرد، کوردایەتییەک بە مـانای تەواوی وشـە، ئەو لە مـاوەی هەمـوو تەمـەنی خـۆیدا ئەوەی بە کـردەوە سەلماند کـە سنووری دەستکرد بۆ وی مـانای نییە و کـوردستان یەک کوردستانە، لە هەر قوژبنێکی ئەو کوردستانە کە بۆی هەڵکەوت خەبات و کوردایەتی کرد.

زەبیـحی یەک لەو تاقـە کـەسـانە بوو کـە خـەباتی حـیزبایەتی لە پێناو خـەباتی کوردایەتی نا (ئەو شتەی کە ئێستا بۆتە هۆی ماڵوێرانیمان و هەمـوو هاواری بۆ دەکەین) و فـەرقی بەوە نەکرد کە ئەندامی کام حیزب و کـام بەشی کوردستانە، سـەردەمێک لە ناو ریزی پێشـەوەی کـۆمـەڵەی ژ.ک لە رۆژهەڵاتی کـوردسـتـان و سـەردەمـێک لە ناو پارتی دێمۆکرات لە خوارووی کوردستان و سەردمێکیش لە ناو پارتی کوردی سوریا لە رۆژاوا.

زەبیـحی ئەو تێکۆشـەرەیە کـە هەتا مـردنیش یەک رۆژی ژیانی خـۆی سـەرفی ژن و مناڵ، کەس و کـار، پارە و مـاڵی دونیایە نەکرد و هەمووی بۆ کوردایەتی تەرخـان کرد، ئەو بە کردەوە بە هەمـووانی سەلماند کە کـوردستـان بە هەر چوار قـوژبنێـوە موڵکی ئەو کەسـەیە کە خەباتی بۆ دەکا و بەس.

زەبیـحی جیـا لە کـوردسـتـان و نیشـتـمـانەکەی لە تەواوی ژیاندا دڵی بە دوو شت خۆش بوو و زۆری شانازی پێوە دەکردن: یەکەم: کۆمەڵەی ژ.ک، دووهەم: قـامووسەکەی کە بەداخەوە هەر دووکیانی لێ جوانەمەرگ بوو.

پێش خوێندنەوەی ئەو کتێبە چەند خالێک هەیە کە دەبێ ئامارژەیان پێ بکەم:

١- هەر نووسراوەیەکی راگوێزرابێتە ناو کـتـێبـەکە حەولم داوە هەر وەک خـۆی و بە شـێـوە گـوتن و رێنووسی خـوی و بەوپەڕی ئەمـانەتدارییـەوە رایگوێزم و هیـچ چەشنە دەستکاریێکی نەکەم، جا چ نووسراوەکانی مـامۆسـتـا زەبیـحی بێ یا خود ئی نووسـەرانی تر.

٢- چەند نیشانە لە نووسراوەکانی کۆندا هەن کە لە سیستمی ئەم کامپیۆتێرەدا

نییە و ئەگەر هەشبێ بەکار هێنانی زۆر زەحمەتە وەک "ا"ی کلاو لەسەر کە نیشانەی "آ"م بە جێی داناوە یان نیشانەی"-" کە بۆ دووپات بوونەوەی دەنگێک بەکار هاتووە من دوو جارم دەنگەکە بەکار هێناوە.

٣- زۆربەی ئەو وتووێژانە بە ویدیئـۆ کـراوە و لە لای من پارێزراون، مـەتنی وتووێژەکانم دەستکاری نەکردووە و ئەو جورەی کە بووە هێناومەتە سەر کاغەز، تەنانەت تا ئەو جێگایەی کە بۆم کرابێ نە زاراوەی قسەکانم گۆریوە و نە هیچم لێ زیاد کردوون و نە هیچیشم لێ کەم کردوون و ویستوومە نیشانی بدەم کە هەر زاراوەی چێژ و شیرینیی تایبەتی خۆی هەیە و هەروەها ببێتە ئازموونێک بۆ ئەوە کە لە زمانی کوردییدا بە پێچەوانەی زۆر زمانی تر شێوەی قسەکردن و نووسین ئەو جیاوازییە گەورەی نییە.

٤- لە ناو وتووێژەکان رەنگە باسێک لە چەند جێ و لە چەند وتووێژدا دووپاتە بووبێتەوە، لەسەر ئەو رایە کە مەتنی وتووێژەکان دەستکاری نەکرێ، ئەو دووپاتە بوونەوەیە لە دەسەلاتی مندا نەبووە و پێشی پێ نەگیراوە.

٥- ئەو شێوە وتووێژکردنە لە ناو ئێمەدا شتێکی زۆر تازەیە، من نەمویستووە ئەو کەسەی وتووێژی لە گەلا دەکەم چەشنی ژورنالیستان دەپرسیارانی گرم و خۆم قەرار بدەم کە ئەو کەسە باسی چ بکا بەلکو ویستوومە ئەو کەسە زۆر بە هێمنی و لەوپەری دەسەلاتداریدا چی پێخۆشە باسی بکا و مەیدانی قسە کردنی بەربلاو بێ، یانی بە پێچەوانەی ئەو شێوەیەی کە ئێستا لە ناو تەلەفزیون و رۆژنامەکاندا باوە و ژورنالیست مەیدان بەقسەکەر نادا، جا بۆیە لە ناو وتووێژەکاندا زۆر جاران زەبیحی هەر لە بیر دەچتەوە و دەچینە سەر باسێکی تر، بەلام بێ رەبتیش نابێ و زۆر رووداوی گرینگی مێژوویی دێتە باس و ویستوومە ئێوەی خوێنەرەوەی بەرێزیش لە گەل خۆم بەرم بۆ ناو باسەکان.

من ئەوەم پێکراوە کە توانیومە و هەر وەک دەلێن "کالا لە قەد بالایە" دەزانم کە زۆر شتم نەپێکاوە و مامۆستا زەبیحی بە هەزاران لاپەرەی ژیانی هەیە کە ئەوە تەنیا چەند دانەیەکێتی. ئەگەر هاتوو تۆش زانیارییەک وە یان نووسراوەیەکت لە مامۆستا دەست کەوت و ویستت یارمەتیم بدەی یاخود هەلەیەکم بۆ راست کەیەوە ئەوە بزانە کە بە

باوەشـێک ڕێز و خـۆشـەویسـتی و پێـزانینەوە چاوەڕێت دەکـەم و حـەول دەدەم لە چاپی دووهەمدا دەکاریان هێنم.

لێرەدا بە پێـویسـتی دەزانم کە سوپاسی هەمـوو ئەو دۆست و برایانەم بکەم کـە بە شێـوەیەک لە ئامادە کردنی ئەو کتێبەدا یارمەتیان کردووم و ئەگەر ئارشیو و ئامۆژگاری و پالپشتی و ڕێنوێنی برایانی ئازیز و خۆشەویستم کاک ئەمیری حەسەنپوور و کاک حەسـەنی قازی نەبایە هەرگیـز ئەو ئیـشـەم تا سـەر بۆ نەدەڕۆیشت. هەروەتر بە دڵ سـوپاسی هەمـوو ئەو کەسانەش دەکەم کە کاتی خۆیان بۆ تەرخان کردم و وتوویژیان لە گەڵ کردووم و یان بە نامە وڵامی پرسـیـارەکـانیـان داومـەوە. بە دڵ سـوپاسی برای بەڕێزم کـاک نەوشیـروان دەکەم کـە ئەرکی ئاخر وتەی ئەم کتێبەی خستە سەرشانی خۆی و هەروەتر لە وڵامدانەوەی پرسیاران و لە بەردەست نانی ئارشیوەکەی یارمەتی کردم .

منیش لە بارەگای کتێبخانەی کوردی دەپاڕێمەوە تا بەڵکو ئەو دیارییەم لێ قەبوڵ کا و جێگایەکی لە بەر دەرگای حەوشەکەی بۆ وەدۆزێ.

عەلی کەریمی

٩٨/٣/٢١

# پێشەکی

ئەمیری حەسەنپوور

## بەرەنگاری «باری باو» بوون:
## ئاوڕێک لە ژیانی عەبدولڕەحمانی زەبیحی «عولەما»
## (١٩٢٠-١٩٨؟)

**مێژوو هیچ** ناکا، "هیچ سامانێکی زۆر و زەوەندی نییە"، "**گەت** شەڕان وەڕێ ناخا". ئەوە مرۆڤە، مرۆڤی واقیعی و زیندوو، کە تەواوی ئەوانە دەکا، هەیەتی و بە شەڕ دێ؛ "مێژوو" کەسێکی هەڵبڕاو نییە کە مرۆڤ وەک ئامێرێک دەکار بێنێ بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی **خۆی** بگا؛ مێژوو **هیچ** نییە **مەگەر** چالاکی مرۆڤ بۆ ئەوەی وەدوای ئامانجەکانی بکەوێ.

فریدریک ئینگلس و کارل مارکس: *ماڵباتی موقەددەس*

زەبیحی، وەک زۆربەی رۆشنبیری کوردی سەدەی بیست، بەرەنگاری دنیاییێک بوو کە نە رێگەی دەدا بە تێگەیشتنێکی راستەقینە و یەکجارەکی و نە ملی شۆڕ دەکرد بۆ گۆڕانێکی بنچینەیی و تێکڕایی. پێداچوونەوەی ژیانی زەبیحی و عومرێک ململانی کردنی لە گەڵ باری باو[١] دا پرسیاری وا دەخاتە سەرزار کە وەڵامەکانی لە ئاڵۆزی مێژووی گەلی کورد دا لێلاییان دادێ.

## ئەلف: باری باوی کوردستان (سالانی ١٩٣٠)

مرۆڤ مێژووی خۆی دادەهێنێ (دروست دەکا) بەلام نەک هەر چۆنێکی پێی خۆش بێ. (مرۆڤ مێژووی خۆی) لە شەرتومەرجی وادا کە بۆ خۆی هەلیبژاردبێ داناهێنێ، بەلکوو لە شەرتومەرجێکی وادا کە راستەوخۆ لە رابردوو وەرگیراوە و دراوە و راگەیێندراوە.

کارل مارکس: ***برووم‌ێری هەژدەی لوویی بۆناپارت***

ئەو دنیایەی کە زەبیحی و رۆشنبیری هاوچەرخی وی بەرەنگاری بوون و دەیانەویست بیگۆڕن چۆن بوو؟ ئەو بارودۆخە چ بوو کە رۆشنبیران بۆ خۆیان هەلیان نەبژاردبوو، رابردوو بە سەریانی دا سەپاندبوو، و دەیانەویست بیرووخێنن، و لەسەر وێرانەکەی بناغەی داهاتووی خەیالی خۆیان دابڕێژن؟ لێکهالانی رابردوو، و ئێستە و داهاتوو چی لە ژیانی زەبیحی کرد؟ زەبیحی چۆن بەرەنگاری کۆکی و ناکۆکی، و درێژەیی و پساوەیی رابردوو-داهاتوو بوو؟

دەست راکێشان بۆ سەرەتای ئەو رابردوویەی کە ئێستەی ژیانی زەبیحی پێکهێنا بوو ئەرکێکی عەستەمە و پرسیاری زۆر دێنێتە گورێ. دەکرێ بپرسین ئێستەی ژیانی زەبیحی بە کوشتاری شاری سابلاغ بە دەستی جەیشی رووسیەی تزاری (١٩١٥) دەستی پێکرد یان بە تالانی سابلاغ بە دەستی جەیشی سمایل ئاغای سمکۆ (١٩٢١)؟ یان بە دابەشکردنەوەی کوردستان لە ١٩١٨دا؟ دیارە هەر سەرەتایێک دەستپێکی خۆی هەیە و، لە بێنیهایەتی زەمان دا، هیچ رووداوێک بێ رابردوو نییە. با بە خێرایی ئاورێک بدەینەوە رابردوویێکی نزیک کە باری باوی سەردەمی دەستپێکردنی ژیانی زەبیحی پێکهێنا بوو:

| | |
|---|---|
| ١٨٩٧ | - مردنی حاجی قادری کۆیی |
| ١٨٩٨ | - بلاوبوونەوەی هەوەلێ رۆژنامەی کوردی، **کوردستان** (قاهیرە) |
| ١٩٠٥ | - شۆڕش لە رووسیە |
| ١٤-١٩٠٥ | - شەڕی ئێران و عوسمانی لە سەر سنوور، داگیر کردنی موکریان |

| | |
|---|---|
| | لە لایەن جەیشی عوسمانی |
| ١٩٠٦-١١ | - شۆڕشی بورژوا-دێمۆکراتی لە ئێران (ئینقلابی مەشرووتە) |
| ١٩٠٨ | - بزووتنەوەی بورژوا-دێمۆکراتی لە تورکیەی عوسمانی |
| | - بلاو بوونەوەی سێ گۆڤاری کوردی لە ئیستامبوول |
| ١٩٠٩ | - چاپی هەوەڵ کتێبی کوردیی **الفبای کرمانجی** |
| ١٩١٤ | - دامەزرانی کوونسوولی رووسیە لە ساپلاغ |
| | - دەستپێکردنی شەڕی جیهانی هەوەڵ |
| ١٩١٤-١٧ | - شەڕی رووسیە و تورکیە لە کوردستان |
| ١٩١٥ | - ژێنۆسیدی گەلی هەرمەنی بە دەستی جەیشی عوسمانی |
| | - کوشتاری شاری ساپلاغ بە دەستی جەیشی رووسیە |
| ١٩١٧ | - شۆڕشی سوسیالیستیی ئوکتۆبر لە رووسیە |
| | - راگەوێزتنەوەی چەند سەد هەزار کورد لە کوردستانی باکوور بۆ رۆژاوای تورکیە |
| ١٩١٨ | - شکانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕ؛ تەواو بوونی شەری جیهانی |
| | - دابەشبوونی کوردستانی رۆژاوا (عوسمانی) بەسەر عێراق، سووریە، و تورکیە |
| | - بلاوبوونەوەی گۆڤاری **ژین** |
| ١٩١٩ | - دامەزرانی "کۆمەڵەی تەعالی ژنانی کورد" (ئیستامبوول) |
| ١٩١٩-٢٠ | - راپەڕینی شێخ مەحموود |
| ١٩٢٠ | - هاتنە دنیای زەبیحی |
| | - پەیمانی سێڤر و نەخشەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد و دەوڵەتێکی هەرمەنی |
| | - دامەزرانی "کۆمەڵی نەتەوەکان" |
| ١٩٢١ | - تالانی ساپلاغ بە دەستی لەشکری سمایل ئاغای سمکۆ |
| ١٩٢٣ | - دامەزرانی دەوڵەتی کەمالیستی "کۆماری تورکیە" |
| | - راپەڕینی دووەمی شێخ مەحموود؛ شکانی بە دەستی جەیشی ئینگلیس-عێراق |
| | - گوێزتنەوەی چاپخانەی سلێمانی بۆ ئەشکەوتی جاسەنە و بلاوکردنەوەی رۆژنامەی **بانگ حق** |
| | - پەیمانی لووزان و وەلانانی بەرنامەی دامەزراندنی دەوڵەتی کورد |

| | |
|---|---|
| | - قەدەغە کردنی قسە کردن بە زمانی کوردی لە مەدرەسە و ئیدارەکانی کوردستان (ئێران) |
| ۱۹۲۳-۲۹ | - ناوچەی ئۆتۆنۆمی کورد لە لاچین (قەفقازی سۆڤێت) |
| ۱۹۲٤ | - قەدەغە کردنی ڕێکخراوە و مەدرەسە و چاپەمەنی و نووسین بە زمانی کوردی (تورکیە) |
| ۱۹۲٥ | - بڵاوبوونەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی (بەغدا) |
| ۱۹۲٥ | - دامەزرانی دەوڵەتی پەهلەوی، پاشایەتی ڕەزاشا (٤١-١٩٢٥) و سیاسەتی تواندنەوەی کورد و نەتەوە نافارسەکان |
| | - ڕاپەڕینی شێخ سەعید (تورکیە) |
| ۱۹۲٦ | - حوزنی موکریانی چاپخانە دەکڕێ و بە باری ئێستران دەیباتە ڕەواندز؛ بڵاوبوونەوەی ***زاری کرمانجی*** لە ڕەواندز |
| ۱۹۲۷ | - پەیمانی سەعداباد و پاراستنی سنووری ئێران و تورکیە و عێراق |
| ۱۹۳۳ | - دەسەڵاتدارێتی نازییەکان لە ئەڵمان (٤٥-١٩٣٣) |
| ۱۹۳٤ | - کۆنگرەی زمانی کوردی لە ئێرەوان (هەرمەنستان) |
| ۱۹۳٦-۳۸ | - ڕاپەڕینی دەرسیم لە تورکیا و ژینۆسیدی خەڵکی دەرسیم |
| ۱۹۳۷ | - ڕاگوێزتنەوەی کوردی هەرمەنستان و ئازەربایجان، و گورجستان (لە ١٩٤٤) بەرەو ئاسیای ناوەندی |
| ۱۹۳۹ | - دەستپێکردنی شەڕی جیهانیی دووەم |
| | - دەستپێکردنی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی بەغدا |
| ۱۹٤۱ | - هێرشی ئەڵمان بۆ یەکێتی سۆڤێت |
| | - داگیر کردنی باکووری ئێران لە لایەن سۆڤیەتەوە و باشووری ئێران لە لایەن ئینگلیستانەوە، و هەڵوەشانەوەی "ئەرتەشی شاهەنشاهی" لە موکریان |
| ۱۹٤۳ | - هەوەڵ بڵاوکراوەکانی "کۆمەڵەی ژ.ک": ***دیاری کۆمەڵەی ژ. ک بۆ لاوەکانی کورد، نیشتمان، ڕۆژ ئەژمێر.*** |

ئەو ڕووداوانە، هەڵبژاردەی بەشێکن لە مێژوویێکی پڕ لە کارەسات کە نە ڕادەوەستا و نە ئارامی دەگرت. زەبیحی، وەک ڕۆشنبیرێکی کە دنیاکەی تەنیا لە ئەزموونی ژیانی خۆی دا کورت نەدەبۆوە، و هەم لە رابردوو دا دەژیا و هەم لە ئێستە و داهاتوو دا، چۆن بەرەنگاری ئەو دنیایە بوو؟

پێنج ساڵ پێش ئەوەی زەبیحی لە دایک بێ، چەند ڕووداوی گرینگ باری کوردستان و دنیایان تێکدا. هەوەڵ شەڕی جیهانی ئیمپریالیستی بۆ دابەشکردنەوەی دنیا (١٨-١٩١٤) زۆر زوو کوردستانی داگرت. موکریان، وەک زۆربەی ناوچەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بوو بە شەڕگەی ڕووسیە و عوسمانی و بە کوشتار و برسێتی و تالانی پەیتا پەیتا، قەڵاچۆ کرا. لە ساڵی ١٩١٥دا، جەیشی عوسمانی ژێنۆسیدی گەلی هەرمەنی، کە زووتر دەستی پێکردبوو، تەواو کرد و، دوو ساڵ دوایە نزیکەی حەوسەد هەزار کوردی ڕاگوێزتەوە بۆ ڕۆژاوای تورکیە کە زۆربەیان لە سەرمان و لە برسان تێدا چوون. لە ساڵی ١٩١٥، جەیشی ڕووسیە لە شاری سابلاغ کوشتاری کرد. دوو ڕووداوی گرینگ لە ساڵی ١٩١٧ دا، مێژووی کوردستان و دنیای گۆڕی. لەو ساڵەدا فەرانسە و ئینگلیس جەیشی عوسمانییان تێکشکاند و ساڵی دوایە کوردستانی ڕۆژاوا کە لە ساڵی ١٦٣٩ را ژێردەستی عوسمانی بوو لە سەرڕا دابەش کراوە و کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیس (لە عێراق) و فەرانسە (لە سووریە) و تورکیە.

ڕووداوەکەی دی، شۆڕشی سوسیالیستی ئۆکتۆبر بوو، کە بە سەرکەوتنی، جەیشی ڕووسیەی لە کورستان و وڵاتی دی وەدەرنا. شۆڕش ئاواتی کرێکاران و زەحمەتکێشان و ئازادیخوازانی ڕووسیە و دنیایەی - بۆ ماوەیێک - وەدی هێنا. شۆڕشی ئوکتۆبر، وەک ڕاپەڕینی کۆمۆنی پاریس لە ساڵی ١٨٧١، لە سەرکەوتنی دا ئیمکانی داهێنانی مێژوو - گۆڕانی ئاگایانەی "چارەنووس"ی - بە زاڵم و زوڵملێکراو سەلماند، و لە نوشستی دا تێدامانی ئاگایی لە بەرامبەر واقعییەتی ماددی دا ڕاگەیاند.

ئەو ساڵەی زەبیحی هاتە دنیا، دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان بۆ تێکدانی یەکجاری ئیمپراتووریی عوسمانی نەخشەی دامەزراندنی دەوڵەتی کورد و هەرمەنییان لە باکووری کوردستان (ڕۆژهەڵاتی تورکیەی ئێستە) لە پەیمانی سێڤر دا گەڵاڵە کرد. لەو ساڵە دا هێشتا دەسەڵاتی سۆڤیێت لە قەفقاز دانەمەزرابوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٢٣ دا کە قەفقاز کەوتە ژێر ئاڵای سوور و هێزی عەسکەری تورک بە ڕابەرایەتی کەماڵ ئەتاتورک بووژاوە، زلهێزەکانی ڕۆژاوا نەخشەی دەوڵەتی کورد و هەرمەنییان وەلانا و، بۆ گەمارۆدان و سەرنخوونکردنی دەوڵەتی سۆڤیێت، حەولیان دا ئێران و تورکیە و عێراق وەک دەوڵەتی

ناوەندی و عەسکەری سەقام بگرن و بەهێز بن. لەو بارودۆخەدا، رێژیمی سیاسی بە روالەت مودێڕنی (نوێباو) «نەتەوە-دەولەت» لە تورکیە و عێراق و ئێران و سووریە دامەزرا. گەلی کورد لە سالی ١٩١٨ بەو لاوە کەوتە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی سێ دەولەتی ئورووپایی سۆڤیەت (١٩٩١-١٩٢١)، ئینگلیس (٣٢-١٩١٨، عێراق) و فەرانسە (٤٦-١٩١٨) و دوو دەولەتی بە روالەت سەربەخۆی تورکیە و ئێران.

ناکۆکییەکانی ئەو سەردەمە هەر پارچەی کوردستانی بە چەشنێک خستە نێو گەرداوی مێژووی نوێ. لە قەفقاز، لە سالی ١٩٢٣ هەتا ١٩٢٩ ناوچەی ئۆتۆنۆمی کورد دامەزرا؛ لە عێراق بە تێکچوونی حکوومەتی شێخ مەحموود، ئۆتۆنۆمی تەواو بوو بەلام رێگە درا بە بەعزە ئازادییێک وەک دەکار هێنانی زمانی نووسراوی کوردی و بەشدار بوون لە دەزگای ئیداری دا. فەرانسە ئەوەندەشی بە کوردی سووریە رەوا نەدیت. لە تورکیە و ئێران، ناسیۆنالیسمی تورک و فارس دەسەلاتی دەولەتی وەدەست کەوت و بە شێوەییێکی دڕندانە دەستی کرد بە تواندنەوەی گەلی کورد. ئەو سنوورە تازانە لە سنوورە کۆنەکەی ١٦٣٩ (کە هەتا ١٩١٨ کوردستانی دوو بەش کردبوو) پتەوتر بوون. نەزمی ناونەتەوەیی پاش شەڕی جیهانی، لە گەل ئەوەشدا بە پەیدا بوونی هەوەل دەولەتی سوسیالیستی گۆڕابوو، ئەو سنوورانەی دەپاراست.

دابەشکرانەوەی کوردستان، سیاسەتی تواندنەوەی کورد و، پتەوکردنی سنوورەکانی "نەتەوە-دەولەت" لە باتی ئەهوەنکردنەوەی ناوچە، ئاوری هەستی نەتەوەیی خۆش دەکرد. دەکرێ بلێین هەوێت و سیاسەتی نەتەوەیی ئەوڕۆی کورد لە سالانی دوای شەری هەوەل دارێژرا. لە موکریان، ئەو رۆشنبیرانەی کە "کۆمەلەی ژ.ک"یان دامەزراند و لە ژیانی سیاسی و کولتووریی سالانی ١٩٤٠ دا بەشدار بوون - هەم شاعیر و ئەدیبەکان (سەیفوالقوزات، خالە مین، هێمن، هەژار، قزلجی...) هەم رابەرانی سیاسی - لە جەنگەی پرۆژەی کورد تواندنەوەی رەزا شا دا رێی کوردایەتییان بڕی.[٢]

ئەلمانی نازی لە ١٩٣٩ دا شەڕی دووەمی جیهانی دەست پێکرد و دوای داگیر کردنی چەند ولات، لە ١٩٤١ دا هێرشی بردە سەر یەکێتی سۆڤیێت. هەر لەو سالەدا، جەیشی سووری سۆڤیێت باکووری ئێران و جەیشی ئینگلیس باشووری داگیر کرد.

فرۆکەکانی سۆڤیێت چەند "بۆمبای ڕەحمەت"یان بە سابلاغ و شاخ و کێوەکانی دادا و بە بڵاوکردنەوەی "دووپەر ئاگاهی"، "ئەرتەشی شاهەنشاهی"یان پرش و بڵاو کردەوە[٣].
دیکتاتۆریی ڕەزا شا سەرنخوون بوو بەڵام دەزگای پاشایەتی هەر بەردەوام ماوە. شەڕی جیهانی باری باوی دنیای تێکدا و، خەباتی دژی فاشیستی گشت هێزی کۆمەڵایەتی کێشایە گۆڕەپانی سیاسەت، و دەرفەتی باشی بۆ ڕزگاری گەلانی ژێردەست پێکهێنا. "کۆمەڵەی ژ.ک" لە جەنگەی شەڕی دژی فاشیستی لە ١٩٤٣ دا دامەزرانی خۆی ڕاگەیاند.

زەبیحی دەورێکی سەرەکی بوو لە دامەزراندن و بەڕێوە بردنی "کۆمەڵەی ژ.ک". بە قسەی خۆی ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە بەڵام هەوەڵ بڵاوکراوەی لە ١٩٤٣ دا وەدەرکەوت. ناسیۆنالیزمی نوێباوی کورد لە باری ڕێکخراوەییدا بە کۆمەڵە دەستی پێکرد.[٤] دەکرێ بڵێین ئەستێرەی ژیانی سیاسی زەبیحیش بە دامەزرانی کۆمەڵە هەڵات و لە دوا تەقەلای بۆ ژیاندنەوەی کۆمەڵە ئاوا بوو.

کۆمەڵەی زەبیحی ڕێکخراوەیێکی نهێنی بوو. ڕێبازە سیاسییەکەی تێکدانی ئەو سنوورانە بوو کە کوردستانیان لەت وکوت کردبوو و، یەکگرتووکردنی نەتەوەی کورد بە ژن و پیاو، شارستانی و لادییی، ئاغا و جوتیار، هەژار و دەوڵەمەند. ڕێبازی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە، نهێنیگەری، هاوکاری و یەکگرتن لە گەڵ ڕێکخراوە کوردییەکانی سەرانسەری کوردستان، ڕاست و پاک بوون و خۆبەختکردن لە ڕێگەی "نیشتمان" بوو. کۆمەڵە سەرباقی نهێنی بوونی توانی پەیامی خۆی لە ماوەیێکی کەم دا لەمبەر و ئەوبەری سنوور بە تایبەتی لە موکریان دا بڵاو بکاتەوە. کۆمەڵە وەک ڕەمزی تێکۆشان و نەبەزین و ڕاستی و پاکی دەنگی داوە و دوژمن لێی تۆقیبوو و کورد پێی شاد ببۆوە.

بەڵام کە شەڕی جیهانی تەواو بوو و بارودۆخی ناوچە و نێونەتەوەیی ڕێگەی دامەزراندنی حکوومەتی کوردی لە ئێران خۆش کرد، "کۆمەڵەی ژ.ک" تێکدرا و "حیزبی دێموکراتی کوردستان" ڕێکخرا. ئەو زانیارییەی کە کاک عەلی کەریمی لەو کتێبەدا کۆی کردۆتەوە باسێک دێنێتە گۆڕێ کە یان تەواو بێدەنگی لێکراوە یان لەوانەیە زۆر کەس باوەڕی پێنەکا: زەبیحی لە زیندان دابوو کە کۆمەڵە هەڵوەشاوە و ح.د.ک و کۆماری

کوردستان دامەزرا، و بە تێکدانی ڕێکخراوەکەی رازی نەبووە. ئەو ئیدیعایە سەیر نییە چونکە دامەزرانی ح.د.ک تەنیا گۆڕینی ناو و قەوارەی "کۆمەڵەی ژ.ک" نەبوو؛ لەوە پتر، ح.د.ک وەلانانی پرۆژەی کوردستانی گەورە و سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردی گەلاڵە کردبوو. ح.د.ک، کوردستانی گەورەی "کۆمەڵەی ژ.ک"ی بە قەد موکریان تەسک کردەوە و سەربەخۆیی لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمی ترنجاند. گیران و دەست بەسەر بوونی زەبیحی بۆ ماوەیێک لە زەمانی کۆماردا، دووبەرەکی نێوان ئەو و پێشەوا، و هەروەها ژیانی زەبیحی دوای کۆمار هەتا گیران و کوژرانی بەڵگەیێکی زۆر سەبارەت بە کێشەی کۆمەڵەی ژ.ک-ح.د.ک دەهێننە گۆڕێ.

## ب: گۆڕینی باری باوی کوردستان

وا نییە کە "نوێنەرانی سیاسی و ئەدەبی چینێک" ئەندامی ئەو چینە بن کە نوێنەرایەتی دەکەن.[٥]

کارل مارکس: *برومێری هەژدەهەمی لوویی بۆناپارت*

کوردستانی سەرەتای ژیانی زەبیحی دوو قۆناغ لە مێژووی دنیایە وەدوا کەوتبوو. زۆربەی گەلی کورد لە گوندەکان دا دەژیان و پێوەندی دەرەبەگایەتی و عەشیرەتی بە سەریان دا زاڵ بوو. لە گەڵ ئەوەشدا شارنشینی لە کوردستان دا مێژوویێکی کۆنی هەیە، شارەکان لە نێو دەریای پێوەندییە ئابووری، سیاسی و کوولتوورییە فئۆدالییەکان دا نوقم ببوون. بەڵام لە ڕۆژاوا (ئورووپای ڕۆژاوا) لە سەدەی ١٧-١٦ەوە پێوەندی ئابووری و کوولتووری دەسمایەداری دەستی پێکردبوو و شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕانسە و دامەزراندنی کۆماری بوورژوا-دێمۆکراتی مێژووی دنیای خستبۆوە دەورێکی نوێ. نزیکەی سەد ساڵ دوای ئەو شۆڕشە، هەر لە فەرانسە و لە شاری پاریس، شۆڕشی کۆمۆنی ١٨٧١ وەخۆکەوتنی چینی کرێکاری بۆ گۆڕانی مێژوو و مێژوو داهێنان ڕاگەیاند. بە سەرکەوتنی هەوەڵ شۆڕشی سۆسیالیستی لە ١٩١٧ دا، کوردستان قۆناغێکی تر وەدوا کەوت.

بیری دیمۆکراسی بورژوایی هەوەڵ جار لە شێعری حاجی قادری کۆیی (١٨١٧-١٨٩٧) دا رەنگی داوە، بەڵام چل ساڵی پێچوو هەتا ئەو دەنگە لە شێوەی رێکخراوەی سیاسی دا بگاتە گوێی خەڵک. دەکرێ بڵێین کۆمەڵەی ژ.ک، روح و گیان و شکڵی رێکخراوەیی بیری حاجی قادر بوو. رەنگە شێعر و سیاسەت و رێکخراوە و نەتەوە لە هیچ کوێ وا تێک نەهاڵابن: هەوەڵ بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ژ.ک، ***دیاری ی کۆمەڵەی ژ. ک بۆ لاوەکانی کورد***، (١٩٤٣) دەنگی حاجی قادری کۆیی "بولبولی نیشتمانی کورد"ی وەک بەرنامە و رێباز و مانیفێستی ناسیۆنالیزمی کورد راگەیاند.

رێبازی حاجی قادر چ بوو؟ وەدی هێنانی سەربەخۆیی کوردستان بە راپەرینی خەڵک و بە رێبەرایەتی گەورە پیاوێکی کورد، گۆرینی کۆمەڵگەی کورد بە فەوتاندنی نەخوێندەواری و خورافاتی دینی، هاندانی خەڵک بۆ فێر بوونی زانست، وەرگرتن و دەکارهێنانی تێکنۆلۆژی، وەرگێران و نووسین و خوێندن بە کوردی، دەرس خوێندنی ژنان، یەککرتنی نەتەوەی کورد و هاودەنگی سیاسی و دامەزراندنی دەوڵەتی کورد.

بەڵام سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک جیاوازییەکی زۆری لە گەڵ زەمانی حاجی هەبوو. لە کۆتایی سەدەی نوزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست دا، دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرە و شێخ رابەرایەتی گشت بزووتنەوەیێکی دژی دەوڵەتییان بە دەستەوە بوو. لە کۆر و کۆمەڵی کوردی ئیستامبوولدا، ئەندامانی چین و توێژە بێدەسەڵاتەکان - چ "بۆرە پیاو" چ ژن - رێگەی خۆتێکردنیان نەبوو. دیارە حاجی قادر لە گەڵ ئەوەشدا لە باری ئابووری-کۆمەڵایەتییەوە لە چینی دەسەڵاتداری دەرەبەگ نەبوو، لە دیوەخان و کۆری بەدرخانییەکان دا پایە و قەدر و حورمەتی خۆی هەبوو. پرسیارێکی گرینگ ئەوەیە: حاجی تا چ رادەیێک لە رێبازی سیاسی چینی دەرەبەگ هەڵبرا؟

چل ساڵ دوای حاجی، کوردستان و ناوچە و دنیا تەواو گۆرابوو. لە سەردەمی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک دا، هێزی کۆمەڵایەتی نوێ هاتبوونە گۆرێ و لە گۆرەپانی سیاسەت دا چالاکییان دەکرد.[٦] زەبیحی خۆی، لە باری شوێنگەی کۆمەڵایەتی-ئابوورییەوە، ئەندامی توێژی وردە بوورژوازی شار بوو، لە مەدرەسەی نوێباوی عەلمانی

(ئادینی) دەرسی خوێند بوو، و ئیش و کاری نوێیاوی دەکرد. دامەزرێنەران و ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک یش - سەرباقی تێکەڵاویی بنکەی کۆمەڵایەتییان (وردەبوورژوازی، بوورژوازی، ئاغاوەت و مەلا و فەقێ...) - زۆربەیان وردەبوورژوازی شار بوون. لەباری سیاسییەوە، فکر و ڕێبازی دژی دەرەبەگایەتی و دژی دەسمایەداری، و فکری سۆسیالیزم تا رادەیێک لە چاپەمەنی و شێعر و ئەدەبیات و هونەر دا بڵاو ببۆوە و لە ١٩٤١ بەو لاوە لە لایەن یەکێتی سۆڤێت و هێزی چەپ و کۆمۆنیست بانگەشەی بۆ دەکرا. هەروەها، لە پەنا گوێی موکریان، لە یەکێتی سۆڤێت، لە نێو کورد و غەیر کورد دا، دەرەبەگایەتی و عەشیرەگەری بنەبڕ کرابوو.

بەڵام سەرباقی گۆڕانی سەردەم و بەرین تر بوونی بنکەی کۆمەڵایەتی کوردایەتی، کۆمەڵەی ژ.ک نەیتوانی لە سنووری ڕێباز و بەرنامەی حاجی قادر تێ بپەڕێ. لە کێشە هەرە گرینگەکانی دێمۆکراتی کردنی کۆمەڵگەی کوردەواری - رزگاری لە زوڵمی نەتەوەیی، رزگاری جووتیاران لە چەوساندنەوەی دەرەبەگی و رزگاری ژنان لە نیزامی مەزنپیاوی (پاتریارکی) - تەنیا کێشەی زوڵمی نەتەوەیی بەرنامە و کردەوەی کۆمەڵەی دادەڕشت.

بە پێچەوانەی بۆچوونی باو، کۆمەڵە بەرنامەی دێمۆکراتی کردنی ژیانی زۆربە گەلی کورد - وەرزێر و زەحمەتکێشی دێهات و شار - ی نەبوو. کۆمەڵە زگی بە جووتیاران دەسووتا و باسی چەوساندنەوە و زوڵم و زۆری ئاغاوەتی دەکرد بەڵام دژی دەرەبەگ - وەک چینێکی کۆمەڵایەتی - نەبوو. کۆمەڵە وەک حاجی قادر، تەنیا دژی ئەو ئەندامانەی چینی دەسەڵاتدار (دەرەبەگ و گەورە شێخەکان) بوو کە کوردایەتییان نەدەکرد.

ئاشکرایە کە دامەزرێنەران و بەکارەکانی کۆمەڵەی ژ.ک لە باری فکرییەوە هاودەنگ و یەکدەست نەبوون. لەباری سیاسییەوە، دوو هێڵی چەپ و راست سەرباقی بەعزە ناکۆکییێک، پێکەوە حاوا بوونەوە. ئەوەش روونە کە زەبیحی، چ لە کۆمەڵەی ژ.ک دا و چ دوای وی، لە باڵی چەپی کوردایەتی دا بوو. تەنانەت لە کۆماری کوردستان دا کە ئاغا و سەرۆک عەشیرەت لە دەسەڵاتی سیاسی دا بەشدار بوون، زەبیحی دژی کوێلایەتی جووتیار و ژن دەنگی بەرز دەکردەوە و لە رۆژنامەی **کوردستان** ی کۆمار

دا نووسی:

مەڕژێنە هێندە خوێنی ڕەنجبەر ئیمڕۆکە، خان
ڕۆژێ حیساب ئەکێشێ لە تۆ، ئینقلابی سوور...
ئاغا شەڕابی سووری لە پێشە و، لە برسێتی،
چاوی پڕە کچی جووتێر لە ئاوی سوور...
کەنگێ دەبێ کە دەستی عیلم هەڵبداتەوە
«بێژەن» لە رووی کچە کوردان نیقابی سوور؟[٧]

بەڵام ئەو ئاواتانەی زەبیحی نەبوون بە ڕێباز و بەرنامەی سیاسی کۆمەڵەی ژ.ک یان هیچ کام لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی دوای ئەو. کە وابوو، سەیر نییە لە ماوەی چاردە ساڵ دەسەڵاتی "پارتی دێموکراتی کوردستان" بەسەر گوندەکانی کوردستانی باشوور (١٩٦١-٧٥)، دەرەبەگایەتی و عەشیرەگەری بووژاوە.

سەردانەواندن لە بەرامبەر دەرەبەگایەتی، مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی دارشتووە. لە کوردستانی ڕۆژهەلات لە سالانی ١٩٢٠ هەتا ١٩٤١، دەسەڵاتی سیاسی دەرەبەگ و عەشیرەتان کز بوو بەڵام نەک بە خەباتی سیاسی کوردایەتی یان بە تەنینەوەی پێوەندییە ئابوورییەکانی دەسمایەداری. ئەو کز کردنەی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی بەشێک لە بەرنامەی ناوەندیکردنی دەوڵەتی بوورژوا-دەرەبەگی ڕەزا شا بوو، و لە باتی پەرەپێدانی دێموکراسی یان پێوەندی ئابووری دەسمایەداری لە کوردستاندا، دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەی هان دا کە ئالای کوردایەتی هەڵبکەن.

لە ئورووپای ڕۆژاوا و باکوور، پەیدا بوونی نەتەوە و نەتەوایەتی (ناسیۆنالیزم) بەشێک بوو لە پرۆسەی دێمۆکراتی کردنی نیزامی سیاسی و ئابووری و کوولتووری. ئەو پرۆسەیە کە زۆر جار ناوی مودێرنێتی (نوێباوی) لێدەنێن، بەشێک لە رووخان و رووخاندنی نیزامی دەرەبەگی و دامەزراندنی دەسمایەداری بوو. لە ئاکامی ئەو گۆڕانەدا، دەسمایەداری لە کشت وکاڵ دا زاڵ بوو و جووتیاری بەستراوەوە بە زەوی

(serf) یان بوو بە زەویداری دەسمایەدار یان بوو بە کرێکار. لە باری سیاسییەوە، دەسەلاتی موتلەقەی پاشایەتی یان سەرنخوون کرا (شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕانسە) یان بە ریفۆرم لە کار خرا و حکوومەتی دیمۆکراسی بووڕژوایی دامەزرا. لەباری کولتوورییەوە، ئامێری راگەیاندنی گشتی بە تایبەتی رۆژنامە و گۆڤار و ناملکە و رێکخراوەی ئەدەبی و سیاسی و هونەری کراوەییێکی زۆریان بۆ باس و موناقیشە پێکهێنا.

لە کوردستان دا، پرۆسەی سەرهەلدانی نەتەوە، بیری نەتەوەیی و بزووتنەوەی نەتەوەیی بە شێوەیێکی تر دەستی پێکرد. بیری نەتەوەیی حاجی - کە چێژی دیمۆکراسی بووڕژوایی تێدا بوو - لە کاتێکدا هاتە گۆڕێ کە لە سەرانسەری کوردستان دا پێوەندی عەشیرەیی و دەرەبەگی زاڵ بوو، زۆربەی خەلک (سەدی ٩٧) نەخوێندەوار بوون و گوندەکان شاریان گەمارۆ دابوو. بەرهەمی فکری حاجی، بێجگە لە چەند پارچە شێعر لە گۆڤارە کوردییەکانی عوسمانی، هەتا ساڵی ١٩٢٥ چاپ نەکرا. حاجی لە ئیستامبووڵەوە ئاگای لە پێشکەوتنی زانست و تێکنۆلۆژی ئورووپا و بزوتنەوەی رزگاریخوازیی نەتەوە ژێردەستەکان بوو و کوردی هان دەدا کە وەک گەلی سوودان و بولغار و... خۆی رزگار بکا.[٨] بەلام ئەو تەنیا سەرکەوتنی دیمۆکراسی بووڕژوایی دەدیت و دامرکانی شۆڕشی ١٧٨٩ی لە هەلاییسانی ئاوری شۆڕشی ١٨٤٨ دا وەبەر چاو نەکەوت. لە گەڵ ئەوەشدا بووڕژوازی تازە پێکەیشتووی عوسمانی باسی مەشرووتە کردنی حکوومەتیان هێنابووە گۆڕێ، وا دیار بوو حاجی لە کوردی ئەو سەردەمی رانەدەدیت لە باتی رێژیمی ئەمارەتە سەرنخوونکراوەکان وەدوای رێژیمێکی سیاسی دیمۆکراتی بکەون. لە ئیستامبووڵەوە بەرزایی ترۆپکی بورجی ئیفێلی دەدیت کە لە پاریس بە بۆنەی بیرەوەری سەدەی شۆڕشی ١٧٨٩ هەلچنرا بوو، بەلام وەدرۆ کەوتنەوەی دروشمی "ئازادی، برایەتی، بەرابەری" ئەو شۆڕشەی لە سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمۆنی پاریس و لە خوێن نوقم کردنی بە دەستی بووڕژوازی بەدی نەدەکرد.[٩] بەلام ئەگەر چی هیچ سنوورێک نییە بیری ئینسان نەی برێ و لە گەڵ ئەوەش دا بیر و ئیدە لە واقعیەتی ماددی وەپێشدەکەوێ، چۆن لە حاجی رابیینین کە وەک دیمۆکراتە شۆڕشگێڕەکانی رۆژاوا (دیدێرۆ، دالامبێر، تامس پەین) یان رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکانی رۆژهەلات (لوو هسوون،

فەروخی یەزدی) لە دژی جیهانبینی و سیاسەت و هونەری دەرەبەگی راپەڕێ؟[۱۰]

لە گەڵ ئەوەشدا سیاسەت و جیهانبینی دێموکراتیی حاجی قادر نیوە چڵ و تەسک بوو، کۆمەڵەی ژ.ک لە بارودۆخی نوێی سەرەتاکانی ۱۹٤۰ دا دەکرا دێموکراسییێکی پێ بە جێ و بنەڕەتی ڕەچاو بکا. کۆمەڵە بە قووڵ و بەرین نەکردنی ڕێبازی دێموکراسی حاجی، هەم لە سەردەمی خۆی وەدوا کەوت هەم لە حاجی. بەڵام لە ئاستی کوردستان دا و لە مێژووی سی ساڵەی ڕێکخراوەی سیاسی کورد دا، کۆمەڵەی ژ.ک هەنگاوێک بەرەو پێشەوە چوو. ڕێکخراوەکانی پێش کۆمەڵەی ژ.ک وەک "جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد" (۱۹۰۸)، و"جەمعیەتی تەعالی کورد" (۱۹۱۸)، و "خۆیبوون" (۱۹۲۷)، لە گەڵ ئەوەشدا رابەران و بەکارەکانیان لە باری بنکەی کۆمەڵایەتییەوە تێکەڵ بوون (دەرەبەگ و بوورژوا و تا رادەیێک وردەبوورژوا)، لە ڕێبازی سیاسی دا لە داخوازییەکانی سەرۆک عەشیرە و دەرەبەگان لایان نەدەدا. بێدەنگی لە کێشەی دەرەبەگایەتی، کۆمەڵەی ژ.ک دەخاتە ڕیزی ڕێکخراوەکانی پێش خۆی؛ حەوڵ دان و پێدا گرتن بۆ ڕاکێشانی دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتان و سەر پێدانەواندنیان لە بەرامبەر ڕێبازی دێموکراسی نیوەچڵی حاجی، کۆمەڵەی ژ.ک لە ڕێکخراوەکانی پێش خۆی جوێ دەکاتەوە. لێرەدا، هێشتا هەڵبڕانێکی مێژوویی لە نێوان ئیستیبدادی دەرەبەگی و دێموکراسی بەدی ناکرێ.

هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک و دامەزراندنی ح.د.ک، سازانی مێژوویی نێوان دەرەبەگایەتی و کوردایەتی هێناوە کایە. حکوومەتی شێخ مەحموود و دەسەڵاتی کورتخایەن و کوت کوتی سمایل ئاغا و بریقەی یازدە مانگەی کۆماری کوردستان – هەر کامەی بە شێوەیێک – ڕێبازی حاجی قادریان بەتاقی کردەوە. لە حکوومەتی شێخ مەحموود دا، هێزی نوێخوازی وردەبوورژوازی تازە پێهەڵکرتوو لە ژێر سمکۆڵی جەیشی عەشیرەیی دا پشووی لێ برا؛ لە کۆماری کوردستان دا، هێزی کۆنباوی دەرەبەگایەتی لە ژێر ئاڵای دێموکراسی بوورژوایی دا پشووی داوە.

وادیارە زەبیحی بە حیزبی دێموکراتی کوردستان و کۆماری کوردستان رازی نەبووبێ. لە شاهید هێنانەوە بۆ وشەی "بەیعەت" لە ***قامووسی زمانی کوردی*** دا، زەبیحی دەنووسێ:

بەیعەت پێکردن - ...رازی بـــوون بە سەرۆکایەتیی کەسێ و جڵەوی کاروبـــاری خـــۆی تەسلیم کـــــردن، هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات بە شێوەی ئیسلامەتیی. تێبینی ا) بۆ کردنی کەسێ بە خەلیفەی ئیسلام، موسڵمانان کۆدەبنەوە و تەگبییر و راوێژ دەکەن تا رایان دێتە سەر یەکێک بیکەن بە خەلیفە. ئەوجار یەکەیەکە هەڵدەستن و دەستی ئەو کەسە دەگرن و دەڵێن: بەیعەتم پێکردیی. ب) خوالێخۆش بوو قازیی محەممەدی شەهید سەرەڕای ئەوە کە بە شێوەیەکی گشتی و ئیمرۆیی بۆ پێشەوایی و سەرۆکایەتی حکومەتی میللی کوردستان هەڵبژێردرابوو، تا ماوەییکیش هەر کەس بۆ دیتنی دەچوو داوای لێدەکرد (بەیعەتی پێ بکا) و دەیگوت تا سەرۆکایەتیەکەی شێوەی شەرعی و ئیسلامەتی وەربگرێ

(قامووسی زمانی کوردی، بەرگی ٢، ل ٢٢٩

زەبیحی لەو تێبینییەدا، بە راشکاوی رەخنە لە پێشەوا و رابەرایەتییەکەی دەگرێ و ئەوەش بۆچوونی کاک عەلی کەریمی سەبارەت بە ناکۆکی نێوان قازی محەممەد و زەبیحی، و کۆمەڵەی ژ.ک و ح.د.ک وەراست دەخا. لێرە دا، زەبیحی دەڵێ قازی محەممەد بە شێوەی "گشتی و ئیمرۆیی" کە مەبەستی حیزبایەتییە بە سەرۆکایەتی کۆمار هەڵبژێردرابوو، بەڵام رێ و شوێنی هەڵبژاردن و سەرۆکایەتی کاتیی وەلانا و، دین و سیاسەتی تێکەڵ کرد و، داوای بەیعەتی لە خەڵک کرد.

جیا کردنەوەی دین و سیاسەت یەکێک لە پێداویستەکانی دێمۆکراسییە و وادیارە کە زەبیحی لە تێکەڵاوکردنی دین و سیاسەت دا خنکانی دێمۆکراسی بەدی کردووە. رەنگە بۆچوون و رەخنەی وا ببووێتە هۆی دەست بەسەرکردن یان هەڵپەساردنی زەبیحی؛ بەڵام زەبیحی کە دوای رووخانی کۆماریش بێدەنگی کرد و، دوای سی ساڵان رەخنەکەی لە نێوان مانای هەزاران وشەدا شاردەوە، چۆن دەکرا لە جەنگەی دەسەڵاتی کۆماردا - کە هەدی هاتنی خەونەکەی بوو - هاواری رەخنەی بەرز کردبێتەوە؟ لە زانیاری تر سەبارەت بە دەسەڵاتدارێتی کۆمار وادەردەکەوێ کە کراوەیی سیاسی بۆ کردەوە و بروای رەخنەگرانە یەکجار بەرتەنگ بووە.

زەبیحی وەک زۆربەی رۆشنبیرە ناسیونالیستەکان لەبەر بەرژەوەندی کوردایەتی و

کوردپەروەریی - "بۆ ئەوەی دوژمنمان پێ شاد نەبێ" - رەخنەی خۆی لە کۆمار و لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان کپ کرد. رەنگە کێشەی بەیعەتی زۆر پێ گرینگ بووبێ کە سەرباقی مەترسی رەخنە لە خۆگرتن وا بە شاردراوەیی تۆماری کردبێ. کە کۆمەڵەی ژ.ک هەڵوەشاوە و حیزبی دێموکرات رێکخرا و کۆماری کوردستان دامەزرا، زەبیحی و دوو هاورێی لە زیندانی دەوڵەتی ئێران، لە تاران، گیرا بوون. رۆژنامەی **کوردستان** لە ٤ی رێبەندانی ١٣٢٤ (ژمارە ١٤، ١٣ فیوریەی ١٩٤٦) مزگێنی ئازادی زیندانییەکانی راگەیاند:

**مزگێنی!!**

وەلام گەیشتوە کە سێ کەس ئازادیخوازی ئێمە: عبدالرحمن ذبیحی و دلشاد و قاسمی قادری کە هەشت مانگ لەمەو بەر لە لایەن کاربەدەستەکانی فاشیست مەئابی ئێرانی بە ناحەق بە دیل گیران و یەکسەر بردنیانە تاران لە حەمدی خودا دەگەڵ ئازادی ئێمە ئەوانیش ئازاد کراون و ئەم رۆژانە خزم و کەس و برایان بە وان شاد دەبن.

بەلام کە زەبیحی دەگاتە پێتەختی کۆماری کوردستان، باسی بەیعەت وبەیعەتخوازی و "ئایینی بەیعەت" دەبیستێ و دەخوێنێتەوە. هەر لەو ژمارەی **کوردستان** دا، لە درێژەی ریپۆرتاژی "جێژنی سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان"دا، لە لاپەڕەی یەک نووسرابوو:

پاش ٥ دەقیقە برای خۆشەویست غەنی خوسرەوی تەواو بوونی مێتینگی ئیعلام کرد. لە پێشدا پێشمەرگەکان مەرەخەس بوون و جەنابی ریاسەتی جمهوور تەشریفی چوو بۆ کانگای حیزبی دێموکرات و لە سالۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی دا قەراری گرت و دەستە دەستە نوێنەرانی تەوایف و قەبایل و لکەکانی حیزبی دێموکرات و خەلکی شار و دێهات دەچوونە حزووری پێشەوا و ئایینی بەیعەتییان بەجێ دەهێنا. قەولی فیداکاری و وەفاداریان دەدا...

هەر لە درێژەی ئەو ریپۆرتاژەدا، هەواڵی "مەراسیمی بەیعەتی" پێشمەرگە بە پێشەوا بلاو بۆتەوە. پێشمەرگەکان لە رۆژی ٣ی رێبەندان دا لە شەقامی وەفایی

رادەوەستن و "چاوەنۆڕی رەئیسی جمهووری و فەرماندەی خۆیان دەکەن کە بەیعەتی دەگەڵ بکەن ..." دوای هاتنی پێشەوا، سان گرتن و ئاهەنگی پێشمەرگەیی، "ئەمجار ریاسەتی جمهوور یەکە یەکە نێوچاوانی ماچ دەکردن و ئەوانیش بەیعەتییان دەکرد و قەولی فیداکارییان تازە دەکردەوە... پاش تەواو بوونی مەراسیمی بەیعەت..." (ژمارەی ۱٤ ل ۱). رۆژنامەی **کوردستان**، "جێژنی سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان"ی وەک "مەراسیمی بەیعەت" تۆمار کردووە. (ژمارە ۱۱، ۱۷ رێبەندان، ٦ فێوریە ۱۹٤٦، لاپەرەی ۱). لەو نووسراوانەدا، "بەیعەت" مانای دینی و ئیسلامی هەیە. حەول دان بۆ ئایینی کردنی دەسەڵاتی سیاسی کۆمار لە رۆژنامەی **کوردستان** دا بە وردی تۆمار کراوە. هەر لەو ژمارەی **کوردستان** کە مزگێنی ئازاد بوونی زەبیحی و هاورێیانی تێدایە، هەواڵی "هەدیەی قوران بە جەنابی (پێشەوا)" تۆمار کراوە:

> ... لەسەر قەراری هەیئەتی مەرکەزی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان تەسویب کرا دیارێکی تایبەتی کە وەسیلەی گەیاندنی عەقاید و ئیحساساتی دەروونی کوردان بێت بە پێشەوای بەرز و رەئیسی جمهووری کوردستان پێشکەش بکەن... هەیئەتی مەرکەزی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان رۆژی هەینو ساتی دەی بەیانی لە کانگای حیزب حازر بوون. ئاغای حەیدەری یەک قورانی مەجیدی ئەعلای کە لە بەرگی مەخمەر دابوو و شاڵی تورمەی بە سەردا کێشرابوو دەگەڵ دوو بەرماڵ هەڵگرت و ... لە سەر میزی پێشەوای دانا و ... (ژمارەی ۱٤، ل ۳).

ئاشکرایە کە مەبەستی زەبیحی دژایەتی کردنی دینی ئیسلام نەبووە و خۆشی دەیزانی کە زۆربەی بەرێوەبەرانی کۆمار، لە ژیانی رۆژانەدا، عەلمانی بوون. لەگەڵ ئەوەشدا دەستەوداوێنی ئایین بوون لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ژ.ک یش دا بەدی دەکرێ، وادیارە کە دەوڵەتی کورد لە دنیای فکری زەبیحی دا، رێژیمێکی سیاسی، ئیداری و قەزایی و قانوونی نائایینی و سیکوولار بووە.

دەکرێ بڵێین زەبیحی لە دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک ەوە، یەکێک لەو رۆشنبیرانە بوو کە تا رادەیێک هەستی بە پێویستیی جیابوونەوەی دوو رێگە و دوو رێباز -

کوردایەتی و دەرەبەگایەتی، و دیمۆکراسی و ئیستیبداد - کرد. رەنگە لەو بۆچوونەی دا هەم باری ژیانی خۆی (وەک ئەندامی بنەماڵەیێکی نەدار و هەژار) کاری لێ کردبێ و هەم ئیلهامی لە بیروڕای مارکسیستی و سۆسیالیسم وەرگرتبێ. لە لاپەڕەکانی ئەو کتێبەی لەبەر دەستمان دایە، تێدامانی رۆشنبیرێک لە نێوان ناسیۆنالیزم و کۆمۆنیزم، و خەباتی نەتەوەیی و چینایەتی تۆمار کراوە. زەبیحی لە لایێک زگی بە جووتیار و کرێکار دەسووتێ و جاڕی "شۆڕشی سوور" لە دژی دەرەبەگایەتی دەدا و لە لایێکی تر، بۆ درێژە دان بە خەباتی نەتەوەیی، پەنا دەباتە ئاغاوەت و پارێزگەی گوندەکان. زەبیحی نە توانی کوردایەتی و دەرەبەگایەتی پێک بێنێ و نە خەباتی نەتەوەیی و چینایەتی لێکبدا. رزگاریی گەلی کورد، لە کراوەیی گوندەکان و لە بەرزایی چیاکاندا. فیدای بەرژەوەندی عەشیرەیی-دەرەبەگی کرا.

زەبیحی دوای رووخانی کۆماری کوردستان، لەوبەری سنوور لە کوردستانی عێراق و سووریە درێژەی بە خەباتی خۆی دا. لێرە و پاش، بزووتنەوەی سیاسی دژی دەوڵەت و دژی ئیمپریالیزم لە کوردستان و لە ناوچە، بەرەو ئاڵۆزی و پێچ و پەنای زۆرتر دەرۆیشت.[11] بۆ زەبیحی هیچ کام لەو سنوورانەی کە ئێران و عوسمانی لە ١٦٣٩ کوردستانیان پێ دابەش کردبوو و ئینگلیس و فەرانسە لە ١٩١٨ دا کوردستانی رۆژاوایان پێ لەت و کوت کردبوو، سنووری رەوا و بە حەق نەبوون. ئەو، بۆ رزگاری نەتەوەی کورد لە زوڵمی نەتەوەیی و ژێر چەپۆکی دەوڵەتە داگیرکەرەکان و ئیمپریالیزم خەباتی دەکرد، و رێزی لە گەلی فارس و عەرەب و تورک دەگرت، بەڵام تینوی تێکدانی ئەو سنوورانە و دانانی سنووری نیشتمانی کورد بوو. ئەگەر سنووری خەیاڵی زەبیحی سنووری نەتەوەیی بوو، حیزبە کۆمۆنیستەکان سنووری نەتەوە-دەوڵەتەکانیان وەک سنووری خەباتی چینایەتی دەپاراست. ئەوان لە باتی هەڵکردنی ئاڵای ئینترناسیۆنالیزم، بەیداغی ناسیۆناڵ شۆڤێنیسمی تورک و عەرەب و فارسیان هەڵگرت. بە بیانووی پاراستنی یەکێتی چینی کرێکار لە چوارچێوەی سنووری نەتەوە-دەوڵەت دا، مافی گەلی کورد بۆ تێکدانی ئەو سنوورانەیان ئینکار کرد. حیزبە "شیوعیە"کان بە پاراستنی ئەو سنوورانە، سنووری نێوان ناسیۆنالیست و کۆمۆنیستیان رووخاند (رێکخراوە

کۆمۆنیستییەکانی تورکیە و ئێرانیش وایان کرد). وا هەبوو "کۆمۆنیستان" زیاتر و "قوولتر" لە ناسیۆنالیستی عەرەب و تورک و فارس نەتەوە بوونی کورد و ڕەوا بوونی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەییان ئینکار دەکرد. لە لاپەڕەکانی ئەو کتێبە دا باسی نووسراوەی ***ڕەدی کۆسمۆپۆلیتی***دەخوێنینەوە کە زەبیحی بە عەرەبی نووسیبوی و لەوێدا ڕەخنەی لە سیاسەتی حیزبی شیوعی سوریە و عێراق گرتبوو. حیزبی شیوعی سوریە لە باتی ددان نان بە داگیرکردنی کوردستان بە دەستی عێراق و سوریە دەیەویست دەنگی زەبیحی ببڕێ.

زەبیحی بۆ ڕووخانی نیزامی پاشایەتی عێراق و ئێران خەباتی کرد و سەرنخوون بوونی هەر دووانی بە چاوی خۆی دیت بەڵام ئاواتی ڕزگاری گەلی کوردی وەدی نەهات. خەباتی سیاسی دوای ١٩٥٨ و بە تایبەتی دوای ڕاپەڕینی ١٩٦١ ئەوەندەی دی ئاڵۆزتر بوو. لە "شۆڕشی" ئەیلوول دا، چینی دەرەبەگ و وردەبوورژوازی کورد بەشدار بوون و دوای تەقینەوەی ناکۆکییەکانیان لە ١٩٦٤ دا ڕێبازی دەرەبەگی زاڵ بوو. لە ١٩٦٤ هەتا ١٩٧٦، ڕێبازی "چەپ" لە گەڵ ڕێبازی دەرەبەگی و لە گەڵ دەوڵەتانی ناوچە - بەتایبەتی ئێران و عێراق - خەریکی تێکهەڵچوون و پێکهاتن بوو. زەبیحی لەو ململانییە دا بێ لایەن نەماوە و تەواو تێوە چوو. لاپەڕەیێکی تاریک لە ژیانی سیاسی دا، پێوەندی گرتن لە گەڵ تەیووری بەختیار و پەناهیان و پەژمان و دەستەودایەرەی "دژ" بە ئێرانە. ئەو پێوەندییانە - وێڕای تێوەچوون لە دەزگای دەوڵەتی بەعسی عێراق و سووریە - گۆشەیێک لە ژیانی سیاسی حیزبەکان لە کوردستانی باشوور دەخاتە بەرچاومان. لەو دنیایە دا هیچ سنوورێک نییە دۆست و دوژمن، ئازادیخواز و دیکتاتۆر، و سەربەستی و ژێردەستی لێک جوێ بکاتەوە. ئەمریکا، بەعسی عێراق و سوریە، شای ئێران، خومەینی، تورکیە و ئیسرائیل دەبنە یار و پشتیوانی کوردایەتی و حیزبە سیاسییەکانی. لەو تراژیدییەدا، خۆ هەڵپەساردنی ئەمارەتەکان بە عوسمانی و ئێران، بە شێوەی نوێباو بەڵام وەک کۆمێدی دووپاتە دەبێتەوە.

گەڕانەوەی زەبیحی بۆ کوردستانی ڕۆژهەلات لە ١٩٧٩ دا، دەسپێکردنی کۆتایی ژیانی بوو. لە گەڵ ئەوەشدا ئەو کتێبە ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو قۆناغەی ژیانی،

خوێنەرەوە چۆنێتی ئەو ڕووداوەی بۆ ڕوون نابێتەوە. وا دیارە زەبیحی بە نابەدڵی گەڕاوەتەوە بەڵام ڕوون نییە کە کێ هانی داوە بۆ گەڕانەوە. هەر چۆنێک بووبێ، وێدەچێ لەو ئاخر سەفەرەی بۆ کوردستانی ڕۆژهەلات ئارەزووی زیندوو کردنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک ی لە دڵ دابووبێ.

زەبیحی سی و دوو ساڵ بوو کوردستانی ڕۆژهەلاتی بەجێ هێشتبوو. لەو ماوەیەدا وڵات تەواو گۆڕابوو. سابلاغ، شارۆچکەی ١٩٤٦، شارێکی گەورە بوو؛ پێوەندی عەشیرەیی و دەرەبەگی کز ببوو؛ هێزی کۆمەڵایەتی نوێ و نوێباو هاتبوونە کایە؛ خوێندەواری و ڕۆشنبیری لە شار و لە دێ پەرەی ئەستاندبوو؛ ڕێکخراوەیێکی گەنج و نوێخواز - "کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران" - ژیانی سیاسی کوردستانی گۆڕیبوو؛ ڕابەرایەتی ح.د.ک لە دەرەوە ڕا گەڕابۆوە و بە ئاشکرا چالاکی دەکرد و دەسەڵاتی بەسەر موکریان دا هەبوو؛ مامۆستا شێخ عیزەدین وەک کەسایەتییێکی سیاسی-ئایینی لە ناو خەڵک دا لایەنگرێکی زۆری هەبوو و، حیزب و ڕێکخراوەی چەپ و کۆمۆنیستیش خەریکی چالاکی بوون.

لەو بارودۆخەدا، هەوڵدانی زەبیحی بۆ دامەزراندنی حیزبێکی نوێ، هاوسەنگیی ئەو هێزانەی دەشێواند. حیزبەکان نیگەران بوون و دەترسان. ئەوە سەیر نییە کە بەعزە هێزێک ویستبایان حیزبێکی نوێ بۆشایی نێوان ح.د.ک و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان - ئەگەر بۆشاییێکی وا هەبا - پڕ بکاتەوە یان بەدی بێنێ. لە بەرنامەییێکی وادا، هەر لایەنەی وەدوای ئامانجی خۆی کەوتوە و وادیارە زەبیحی پرۆژەی ژیاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک ی لە خەیاڵ دابووە. بەڵام کۆمەڵەی ژ.ک بەرهەمی بارودۆخێکی مێژوویی بوو کە دوای چل ساڵان ئیتر دووپاتە نەدەکراوە. کوردایەتی، کە قەت بزوتنەوە و بیرووباوەڕێکی یەکدەست و یەکڕەنگ نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٩ دا تەواو لەبەریەک ترازا بوو و ڕێبازە جیاوازەکانی لێک هەڵبڕابوون و بە یەکتریان دادەدا. شەڕی ناوخۆیی (بارزانی-مەکتەبی سیاسی، قیادەی موەقەت-یەکێتی نیشتمانی) و خۆ هەڵپەساردنی حیزبەکان بە دەوڵەتانی ناوچە و بە ئەمریکا و ئیسرائیل، هاوکاری "قیادەی موەقەتی پارتی دێموکراتی کوردستان" لە گەڵ دەوڵەتی ئیسلامی لە دژی بزووتنەوەی خودموختاری و زۆر

ناکۆکی تر رێگەی لە وەدیهێنانی خەونی کۆمەڵەی ژ.ک گرتبوو. بەڵام لە لایێکی ترەوە، دەکرێ بڵێین کە لە کاتی گەڕانەوەی زەبیحی دا، کۆمەڵەی ژ.ک لە موکریان و لە کوردستانی رۆژهەڵات ماوەیێک بوو زیندوو ببۆوە. "کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان" بێجگە لە هاوناویی، لە رێبازی رێکخراوەییش دا لە کۆمەڵەی ژ.ک نزیک بوو. لە نهێنیگەری دا لە کۆمەڵەی ژ.ک توند و تیژتر بوو (شەش مانگ دوای رووخانی دەوڵەتی پەهلەوی خۆی ئاشکرا کرد) و رابەران و ئەندامانی، وەک کۆمەڵەی ژ.ک، سوێندیان بە پاکی و خۆبەختکردن خواردبوو. ئەگەر کۆمەڵەی ژ.ک بە قسە دژایەتی چەوساندنەوەی جووتیارانی دەکرد، کۆمەڵەی شۆڕشگێر بە کردەوە لەسەر جووتیارانی دەکردەوە. ئەگەر کۆمەڵەی هەوەڵ ئالای دێمۆکراسی کاڵ وکرچی حاجی قادری هەڵگردبوو، کۆمەڵەی دووەم وەدوای دێمۆکراسی بنەڕەتی و شۆڕشگێرانەی قانیع و گۆران کەوتبوو. دیارە دوو کۆمەڵە لە خاڵێکی گرینگ دا لێک جیا دەبوونەوە - ئەویش خەبات بۆ کوردستانی گەورە بوو. لە ٨٠-١٩٧٩ دا، کۆمەڵەی دووەم، رێکخراوەیێکی کوردیی ئێران بوو و زۆرتر لە داوێنی "کۆمەڵەی رەنجدەرانی" ئەو بەری سنوور سەری لە بن سەوەتە دەرهێنابوو و، نێوانی لە گەڵ کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتی نیشتمانی لە رێکخراوە ئێرانییەکان خۆش تر و بەتین تر بوو. هەروەها لە ١٩٤٦ تا ١٩٧٩ و تەنانەت دوایەش هیچ حیزبێکی سیاسی لە کردەوەدا وەدوای دامەزراندنی کوردستانی گەورە نەکەوتبوو. لە دوورە وڵاتیش - دوور لە سنووری چوار دەوڵەت کە کوردستانیان داپچڕیوە - ئەو سنوورانە کوردیان لە سیاسەت و زمان و ئەلفوبێ و کوولتوور دا لەت وکوت کردووە.

بەڵام ئەگەر کێشەی کوردستانی بوونیش لە گۆڕێ دا نەبا، نە کۆمەڵە وەدوای زەبیحی دەکەوت نە زەبیحی بە کۆمەڵە رازی دەبوو. زەبیحی ژیانی خۆی لە پێناوی نەتەوەکەی دانا و وەدوای پارە و پایە نەکەوت بەڵام رابردوویەکەی، لە روانگەی هێزی چەپ، پەڵەدار ببوو. پێوەندی لە گەڵ بەختیار، پەناهیان و بەعس - با خۆشی بە هیچ کامیان نەفرۆشتبێ - زەبیحی لە پێش چاوی چەپ خستبوو. تەنانەت ح.د.ک یش کە لە بەرەی چەپ دا نەبوو و چاوەڕوان دەکرا رێز لە زەبیحی - وەک دامەزرێنەرێکی کۆمەڵەی

ژ.ک - بگرێ، وادیاره (له لاپەڕەکانی ئەو کتێبە دەردەکەوێ) کە لە بەکوشت دانی دا بەشدار بووە. ژیانی زەبیحی وەک مردنەکەی تراژدێکی هەناسەبڕە کە تەواوی ناکۆکییەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی سەدەی بیستی تێدا کۆ بۆتەوە و ئێستەش هەر لەسەر شانۆ ماوە. ئێستە سەد ساڵ دوای مردنی حاجی قادر و پەنجا ساڵ دوای هەڵوەشانی کۆمەڵەی ژ.ک، کوردایەتی ئەوەندەی دی لە ئامانجی دێمۆکراسی دوور کەوتۆتەوە. هەر هەنگاوێکی بۆ سەربەخۆییش هەڵگیراوە، هێزی خۆماڵی بە قەد هێزی بێگانە دژایەتی کردووە. ئەو "سەربەخۆییە" نیوە چڵەش کە لە ژێرسایەی فرۆکەی ئەمریکا و ئینگلیس لە باشوور دامەزرا، لە خوێناوی شەڕی "براکوژی" و "خۆکوژی" دا نوقم بوو. تەنانەت کۆنەپەرستیی دینیش کە حاجی قادر بە گژی دا چوو سەری هەڵێناوەتەوە و داوای دەسەڵاتدارێتی سیاسی دەکا و ئەوەندەی دەستی ڕۆیوە بەند و زنجیری کۆیلایەتی دنیای کۆنی خستۆتە ئەستۆی ژن و پیاو و منداڵی کورد. سەردانەواندنی دوو حیزبەکان بۆ ئەو دیاردە گنخاو و ڕزیوە و تەنانەت یارمەتیدانیان بۆ بووژاندنەوەی کۆنەپەرستیی دینی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بزووتنەوەی کوردایەتی توانای وەدیهێنانی دێمۆکراسی - تەنانەت دێمۆکراسی نیوە چڵی حاجی قادری - نییە.

دوو پڕۆژەی گەورەی ژیانی زەبیحی - کۆمەڵەی ژ.ک و ***قامووسی زمانی کوردی*** - ناتەواو ماوە. هەر دوو پڕۆژە، لە کوردەواری دا، ڕچەشکێن بوون. یەکیان هەنگاوێکی گرینگ بەڵام نیوەچڵ و دامرکێنراو بوو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگە و سیاسەت و کوولتووری دێمۆکراسی بوورژوایی لە کوردستانی دەرەبەگیدا. ئەوی تر هەنگاوێکی هەرە گرینگ بوو بۆ ئەوەی زمانی کوردی لە گۆڕایی مەعنا و دەربڕینی مەبەست بگاتە ئاستی زمانە پێشکەوتووەکانی دنیا. ئەو دوو پڕۆژانە - سیاسی و زمانی - لێک جیا ناکرێنەوە. زەبیحی لە سەرەتای بەرگی یەکی ***قامووسی زمانی کوردی*** دا دەنووسێ (ل٦):

کاتێ لە شاری (مەهابات) کە ئەوسا ناوی (سابلاغ) بوو لە لای مامۆستا (گیوی موکریانی) دەرسی زمانی (فرەنسیی)م دەخوێند سەروکارم دەگەڵ قامووسی فرەنسیی (لارووس) پەیدا کرد و هیوای ئەوەی کە ڕۆژێک زمانی کوردی یش قامووسێکی

ئاوای هەبێ، هەموو خولیا و خەیالاتی پێشووی لە مێشکم راماڵیی و کەشتیی کەڵکەڵەی زمانەوانییم لە بەندەرگای قامووسا لەنگەری گرت.

ئەگەرچی خەباتی سیاسی نیزیکەی هەموو کات و ساتێکی تەمەنی منی بۆ خۆی داگیر کرد و لە مەڵبەندی رۆژهەلاتی ناوەڕاستا رەتاندمیی، بەلام نەیتوانی بیری قامووسێکی کوردی لە مێشکم بسڕێتەوە، بەڵکوو بیری (قامووسی کوردی) بۆ قازانجی خۆی، لە خەباتی سیاسی و لە ئێران و تووران کردنەکەم کەڵکی وەرگرت.

گەشت و گێڵ لە گەڵێ ناوچەی کوردستانی ئێران و عێراقدا، چاوپێکەوتن و هاونشینی و گفتوگۆ دەگەڵ کەسانی سەر بە گەڵێ تیرە و هۆز و عەشیرەتەکانی کورد، دەسمایە و سەرمایەیێکی زۆر و زەبەندی بۆ ئەو قامووسەی لە خەیاڵدانی خۆمدا بۆ زمانی کوردیم رەچاو کردبوو پێکەوەنا. سەفەری دوو ساڵ و نیوییم (سەرەتای ساڵی ١٩٥٦-نێوەڕاستی ساڵی ١٩٥٨) بۆ سووریا و تێکەڵیی دەگەڵ کوردەکانی ئەوێ فێری یەکێ لە سێ لەهجە بنچییەکەی زمانی کوردیی (لەهجەی کرمانجیی) کردم و دەرگایەکی گەورەی بۆ چوونە ناو قەڵای (قامووس) بۆ کردمەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا زەبیحی زمانناسی (linguistics) نەخوێندبوو، قامووسەکەی لەسەر بنچینەی زانستی فەرهەنگنووسی (lexicography) داندراوە و بەرهەمی هەرە باشی فەرهەنگنووسیی کوردییە. ***قامووس*** دوو بەرگی زیاتر بلاو نەبۆوە و ئەو دوو بەرگەش تەنیا ئەو وشانە دەگرێتەوە کە بە حەرفی ء و ب دەست پێدەکەن (دوو بەرگەکە کە بە تێکڕایی ٤٧٠ لاپەڕەیە). گرینگێکی لەوە دایە کە فەرهەنگێکی یەکزمانییە: وشەی کوردی بە کوردی مانا دەکاتەوە. لە گەڵ ئەوەشدا شێخ محەمەدی خاڵ بە دانانی فەرهەنگی خاڵ (٧٦-١٩٦٠، سێ بەرگ)، هەوەڵ بەرهەمی کوردی-کوردی، رێگەی بۆ زەبیحی خۆشکردبوو، ***قامووس*** بە درێژایی سەدەیێک وەپێش فەرهەنگی خاڵ کەوت. دەبێ لە پێشدا بڵێم کە لە زۆربەی زمانە نووسراوەکانی دنیا دا، فەرهەنگی دووزمانی لە پێش فەرهەنگی یەکزمانی دا داندراوە و دانانی فەرهەنگی یەکزمانی نیشانەی گەشانەوە و پێگەیشتنی زمانە. لە کوردی دا، هەوەڵ فەرهەنگی یەکزمانی (خاڵ) سێسەد ساڵ دوای هەوەڵ فەرهەنگی دووزمانی ( ***نوبەهاری*** خانی) نووسرا. رەنگە مامۆستا خاڵ ئاگای لە ئەو پرۆسەی مێژووی فەرهەنگنووسی نەبووبێ بەلام

گرینگی بەرهەمەکەی خۆی تەواو بۆ روون بوو. جا بۆیە سەیر نییە کە لە پشتی "جزمی سێهەم"ی فەرهەنگەکەی نووسی:

### بۆ ئاگاداری

کەس لە پێش منا راڤەی وتەی کوردیی بە کوردیی نەکردووە، راڤەی هەر وتەیەکم کە کردووە هی خۆمە و دەست کردی خۆمە، بەڵکوو هەموو راڤەیەکم تالیفێکی سەربەخۆیە بۆ خۆی، بۆ کەس نی یە ئەو راڤانەم وەربگرن لە فەرهەنگی خۆیان بە بێ ناوبردنی فەرهەنگی خاڵ، واتە بۆ هەموو راڤەیەکم کە وەرنەگیری ئەبێ بەتایبەتی نیشان بدرێ کە لە فەرهەنگی خاڵ وەرگیراوە، وەک فەرهەنگی فەیرۆزابادی کە کردوویەتی بەرامبەر بە فەرهەنگی صحاحی جوهری.

تیۆری زانێکی بەناوبانگی فەرهەنگنووسی - لادیسلاف زگووستا - دەڵێ زمانێکی نەتەوەیی کە هێشتا باش ستاندارد نەبووە و سەقامی نەگرتووە، هێزی ئینتیزاعی (abstractive power) بۆ راڤە کردنی (شەرح دان، شی کردنەوە) وشە و مەبەستی نییە.[١٢] دەکرێ بڵێین کە خاڵ ئەو هێزەی (هێزی ئینتیزاعی)، کە دیارە زەمینەی لە هەموو زمانێک دا هەیە، وەگەڕ خست و ***قامووس*** کەیاندییە ترۆپکی خۆی. دوای ***قامووس***، رەنگە هیچ نووسەر و خوێنەرەوەیێک هەست بەوە نەکا کە زمانی کوردی لە مانا کردنەوەی وشە و شیکردنەوەی ئینتیزاعی دا سست وکزە.

***قامووس*** رەگی وشەکان (etymology) و دەوری رێزمانیی هەر وشەیێکی دیاری کردووە. هەروەها مانا جیاوازەکانی هەر وشەیێکی بە ژمارە جوێ کردۆتەوە و وشە هاومانا‌کان (synonym) و تەنانەت دژمانا‌کان (antonym)ی - ئەوەندەی بۆی کرابێ - نووسیوە. کارێکی گرینگی زەبیحی هێنانەوەی شایەد و نموونەیە بۆ وشەکان و ماناکان. سەرچاوەی شایەدەکان، فۆلکلۆر و ئەدەب و ترادیسیۆنی نووسراو و زارەکی کوردییە. زەبیحی خۆی بەشێک لەو شایەدانەی داناوە. بەڵام چ لەو شایەدانەی کە لە سەرچاوەی دی دەیگێڕێتەوە و چ لەوانەی بۆ خۆی داینا‌ون، مەبەستی تەنیا روونکردنەوەی مانا و شێوەی دەکارهێنانی وشەکان نەبووە. لەو شایەدانەدا، دوو مەبەست بە راشکاووی

دەردەکەوێ: (١) دەربڕینی دەوڵەمەندیی و زیندوویی ترادیسیۆنی زارەکی و نووسراوەی کوردی و (٢) بانگەشە کردنی بیروبۆچوونی رزگاریخوازانەی دانەری **قامووس**. با بڕوانینە چەند شایەد کە هەڵم بژاردوون و لە ژێردێڕی چەند بابەت دا دەیان گێڕمەوە:

## خەباتی دژی دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری

**ئامان** ئامان لە دەست زوڵمی دەرەبەگ

**ئاغایەتی** ئاغایەتی لەم زەمانەدا باوی نەماوە

**باو** دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری لەم زەمانەدا باویان نەماوە
رێژیمی پاشایەتی لە دنیای ئیمرۆدا لە باو کەوتوە

**بڕیار** بڕیار دراوە زەوی و زار بەسەر جووتیاراندا دابەش بکرێت

## خەباتی دژی ئیمپریالیسم و فاشیسم

**ئاشکرا** ئەمریکا بە ئاشکرا شەڕ بە دنیا دەفرۆشێ

**ئەبعاد** ئەبعادی شەڕی ویتنام دنیای گرتبۆوە

**ئاشتی** پاش تێکشکانی فاشیزم، ئیمپریالیزمی ئەمریکا ئاشتی دنیای تێکداوە

**ئاگرخۆشکەرە** ئاگر خۆشکەرەی ناو میللەتان ئیمپریالیزمە

**ئیخسیر** لە ستالینگراد گەلێ سەربازی هیتلەر ئیخسیر کران

**بەروبوو** بەروبووی خەباتی دژی ئیمپریالیزم ئازادی میللەتانە

**بەرهەڵست** ئیمپریالیزم بەرهەڵستی گەشە کردنی ئابووری وڵاتە بچکۆلەکانە

**بووژانەوە** ئیمپریالیزم تازە نابووژێتەوە

**پێ ئاشکراکردن** هیتلەرێکان پارتیزانەکانیان سەرەوبن هەڵداوەسی، هێشتا نەیان دەتوانی هیچیان پێ ئاشکرا کەن

## خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیی

| | |
|---|---|
| **ئازایانە** | هەڵمەتێکی ئازایانەیان بردە سەر سەنگەری دوژمن |
| **ئازادیخواز** | ئازادیخوازان لە پێناو ئازادی نەتەوەی کورد دا بە گژ ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان دادەچن |
| **ئاخر** | صەت ساڵ بکەی بێگانە پەرستی، ئاخرییەکەی دێنی نشوستی |
| **ئاسان** | شۆڕش بۆ ئازادی هێندەش ئاسان نییە |
| **ئاشکرابوون** | ئێستا زۆر چاک ئاشکرا بووە دوژمنی میللەتی کورد کێیە |
| **بەربەرەکانی** | بەربەرەکانی نەتەوەی کورد دەگەڵ ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستانە |
| **ئیش** | بەریشی گرژ و پرچی پڕ لە ئەسپێ بناغەی ئیشی کوردان چۆن ئەچەسپێ |

## ئەزموونی ژیانی نووسەر

| | |
|---|---|
| **بازار** | بازاری تەورێز |
| **بوون** | ئەو ساڵەی لە تەورێزێ بووین |

رەنگە بەعزە خوێنەرەوەیێک رەخنە بگرن و بڵێن قاموس بەرهەمێکی سیاسی نییە و نەدەبوو سیاسەت تێکەڵاوی فەرهەنگنووسین بکرێ. بەڵام هیچ سەرچاوەیێکی مەرجەع (reference)، قاموس یان ئالماناک و ئەنسکلۆپیدی، ناتوانێ سیاسی نەبێ یان ئیدەئۆلۆژی وەلا بنێ. ***ئەنسکلۆپیدی*** (*Encyclopedie*) فەرانسە کە دیدێرۆ و کۆمەڵێک زانای سەدەی هەژدەهەم لە فەرانسە دایان نا چەکێکی هەرە بەبڕشت بوو لە رووخاندنی جیهانبینی و سیاسەت و کوولتووری دەرەبەگی و گەشە پێدانی دنیای نوێ. تا ئێستە هیچ قاموسێک نەنووسراوە کە توانیبێتی سیاسەت و ئیدەئۆلۆژی وەلا بنێ.

کارێکی ئازایانەی زەبیحی تۆمار کردنی وشەی وەرگیراو لە زمانی ترە بەتایبەت زمانی نەتەوە زاڵەکان - عەرەبی، فارسی و تورکی. رۆشنبیری کوردی پێش ساڵانی ١٩٢٠ حەولێکی نەدەدا بۆ پالاوتنی وشەی «بێگانە» بەڵام لەو ساڵانە بەولاوە پەتیکردن، ژیانی ئەدەبی و زمانی و کوولتووری کوردی داگرت. دیارە پەتیکردن بەشێک

لە بزووتنەوەی ناسیۆنالیستییە و بۆچوونی جۆراوجۆری تێدا هەبووە و هەیە - لە پەتیکردنی یەکجاری و تێکڕایی را بگرە هەتا پەتیکردنی هێدی و پێویست و پەتیکردنی زۆر تەسک و بەرچاو تەنگانە. ئەگەر لە سەرەتا دا وشەکان پەتیدەکران دوای ماوەیێک دەنگەکانی زمانیش وەبەر کەوتن.

زەبیحی لە سەرەتای **قامووس** دا (بەرگی ١، ل ٦١) باسی پەتیکردنی وشە و دەنگی کرد و نووسی: "تعصب، خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپە لە هەر کارێکا بێ و بۆ هەر چێکی بێ". دوایە باسی تەعسوبی خۆی لە رابردوو دا کرد و، گێڕایەوە کە لە کاتی بەرێوەبردن و چاپکردنی گۆڤاری **نیشتمان** (١٩٤٣) بە هەڵە وشەی «بەرواری» (ناوی مەڵبەندێک) بە مانای «بە تاریخ...» خوێندەوە و کەوی لێ بوو بە زڕەکەو و «بەرواری» بەو مانایەی کە بە هەڵە پێیەوەلکاندبوو دەکار هێنا و، خەڵکی تریش بە بێ دوودڵی یان رەخنە وەریان گرت و ئێستەش دەستی لێهەڵناگرن (ل ٦٢-٦١). هەروەها پەتیگەرە توند و تیژەکان مۆری بێگانە بوونیان لە نێوچاوانی چەند دەنگی کوردی وەک /ح/، /ع/ و /ق/ داوە و دەیانەوێ بە کەڵەگایی لە زمانی کوردییان راماڵن. بەڵام زەبیحی ئەو حەقەی بە خۆی نەدەدا کە ئەو دەنگانە یان وشەگەلی وەک "ئیسراحەت"، "ئیستیناف"، "ئیستفادە" و "ئیفادە" و ... فڕێ بدا. ئەو بڕیارەی زەبیحی، فەرهەنگنووسیی کوردی خستە رێزی فەرهەنگنووسیی زمانە دەسەڵاتدارەکان وەک فارسی و عەرەبی و ئینگلیسی. ئەو زمانانە وشە وەردەگرن و لە گەڵ ئەوەشدا جاروبار تووشی پەتیکردن دەبن، لە وشە وەرگرتن ناترسێن.[١٣] تیۆری زمانناسی، بۆچوونی زەبیحی پەسند دەکا و دەڵێ وشە یان دەنگێک کە لە زمانی تر وەرگیرا و لە قسە کردن یان نووسین دا دەکار هێندرا ئیتر «بێگانە» نییە و دەبێتە خۆماڵی.

زەبیحی لە سەرەتای ژیانی ئەدەبی دا خولیای پەتیگەری بوو بەڵام توانی لەو تەعسوبە دەست هەڵبگرێ؛ ئەوەش لە گەڵ بۆچوونی سیاسی وی یەکی دەگرتەوە کە دژایەتی لە گەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی تورک و فارس و عەرەبی نەدەکردە دژایەتی لە گەڵ گەلی تورک و فارس و عەرەب و زمانەکەیان. پەتیگەری لە کوردی دا ململانێکی تەواو سیاسییە. کوردی ئێران کە ژێردەستی دەوڵەتی فارسن، وشەی فارسی لە کوردی رادەماڵن

و لە وەرگرتنی وشەی عەرەبی ناپرینگێنەوە؛ کوردی عێراق وشەی عەرەبی فرێ دەدەن و زمانەکەیان وەبەر لێشاوی وشەی فارسی داوە.[١٤] زەبیحی کە لە هەر دوو بەری سنوور ژیا بوو و دژی رەگەزپەرستی و شوڤێنیسمی نەتەوەیی بوو، توانی لە گۆڕایی زمان دا سیاسەتێکی وا رەچاو بکا کە زمانی کوردی پێ دەوڵەمەند ببێ.

زەبیحی لە ماوەی نیو سەدە خەباتی سیاسی خۆی دا، وەک زۆربەی رۆشنبیرانی هاوچەرخی خۆی - هەژار، هێمن، قانیع، قزلجی... - لە گۆڕەپانی سیاسەت دا تووشی بەرزی و نزمی و سەرکەوتن و نوشستی زۆر بوو. لە ژیانی خۆکەسیدا، بە هەژاری ژیا و بە نەداری مرد. تێکۆشەرێکی کە هەوڵی رێکخراوەی سیاسی نوێباوی کوردی دامەزراند و بەرێوە برد لە ئاخری ژیانی دا لە وڵاتی خۆی نامۆ بوو و مۆری جاشێتی و بەعسێتی و جاسووسی لێدرا. ئەو شەرە بێ بەزەییە، ئاڵۆزیی دیالێکتیکی ئاگایی-ماددە و داماویی رۆشنبیری کورد لە بەرامبەر باری باو دا دەردەبڕێ.

زوڵمی نەتەوەیی بە شێوەی درندانەی ژێنۆسید، زمانکوژی و ئێتنۆسید، گشت چین و توێژی کۆمەڵایەتی، نوێ و کۆن، زاڵم و زوڵم لێکراو، دەوڵەمەند و هەژار، ژن و پیاو، و گەورە و بچووکی لە بەرەیێک دا ڕێز کردووە. کوردایەتی لە دژی ئەو زوڵمە وەخۆ کەوتووە بەڵام، لە هەمان کات دا، بەرەوپیری ئەو یەکێتییە خەیالییە دەچێ و بزووتنەوەیێک وەرێدەخا کە ناکۆکییە ناوەکییەکان - چەوساندنەوەی کرێکاری کورد بە دەستی دەسمایەداری کورد، جووتیار بە دەستی دەرەبەگ و زوڵمی پیاو لە ژن - تێیدا بزر بن. زۆربەی رۆشنبیری کورد بە بێ رەخنە و بەربەرەکانی وەدوای ئەو سیاسەتە کەوتووە یان، راستترە بڵێین، میعماری ئەو پرۆژەیە بووە. ئێستەش کەس ناوێرێ بە چاوێکی رەخنەگرانە بڕوانێتە راپەرینی شێخ عوبەیدوڵا، سمایل ئاغا، شێخ مەحموود یان ئەزموونی گرینگی کۆماری کوردستان. راستە نەتەوەی دەسەڵاتدار و دەوڵەتەکەی دەنگی گەلی کوردی خامۆش کردووە بەڵام رۆشنبیری کورد، لە هەر چین و توێژێک سەری هەڵێنابێ، لە سیاسەت و لە ئەدەب دا نوێنەرایەتی چینی دەسەڵاتداری کورد - دەرەبەگ و هاوپەیمانە تازە پێهەڵگرتووەکانی (بوورژوازی) - کردووە. گرینگ نییە کە رۆشنبیر خۆی بە شۆڕشگێر، کوردپەروەر، سوسیالیست یان کۆمۆنیست دابنێ یان دایبنێن. رۆشنبیر

بەوەی دەبێتە نوێنەری ئەدەبی و سیاسی چینێکی کۆمەڵایەتی کە، مارکس گوتەنی، لە دنیای فکری خۆی دا لەو سنوورە تێناپەڕێ کە ئەو چینە لە ژیانی خۆی دا تێیدا دەژی،[١٥] کە وابوو، ڕۆشنبیر لە باری تیۆرییەوە بەو کێشە و چارەسەریکردنانە دەگا کە چینی کۆمەڵایەتی لە پراتیک دا پێی گەیشتووە. جا بۆیە ڕۆشنبیرێکی کە لە چینی کرێکار یان جووتیار سەری هەڵێنابێ دەتوانێ نوێنەرایەتی سیاسی و ئەدەبی چینی دەسمایەدار و دەرەبەگ بکا، یان ژنێکی ڕۆشنبیر لە وانەیە ئاڵای جیهانبینی مەزنپیاوانە (پاتریارکی) هەڵبکا.

لە تراژیدی ژیانی زەبیحی دا، ئاکتۆری جۆراوجۆر بەشدار بوون - لە دەوڵەتی ئێران و عێراق و سوریە را بگرە هەتا هێزە جۆراوجۆرەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی و، زەبیحی خۆی و فکر و بڕوا و کردەوەی و تەواوی ئەو بارودۆخەی کە ئەو درامایەی خستە سەر شانۆی مێژوو.

## ج - شەڕی ئاگایی و خۆڕسکێتی

بەبێ تیۆری شۆڕشگێرانە هیچ بزووتنەوەییێکی شۆڕشگێرانە ناتوانێ هەبێ.
لێنین

زەبیحی، ڕەنگە زیاتر لە گشت ڕۆشنبیری ناسیۆنالیست بایەخی بە ئاگایی دابێ، هەر بۆیە نازناوی «عولەما»یان لێ نا. قەت چەکی هەڵنەگرت بەڵام لەسەر چەک دابەشکردن تێدا چوو. کە دوای سی و دوو ساڵ گەڕاوە کوردستانی ڕۆژهەڵات، لە ماڵی دنیا تەنیا چەمەدانێک فیشی قامووسەکەی و بیرەوەرییەکانی پێبوو کە لە گەڵ خۆی بە شاخ و کێو و گوند و شاران دا دەیگێڕا. چەکەکەی ئاگایی - نووسین، ڕاگەیاندن، خەباتی ڕێکخراوەیی ئەویش بە شێوەی نهێنی، ڕۆژنامەگەری - بوو. لە ڕاگەیاندنی زارەکی دەپرینگاوە و عاشقی نووسین و چاپکردن بوو.

لە گەڵ ئەوەشدا زەبیحی بۆ ماوەییێک لە نێوان ناسیۆنالیزم و کۆمۆنیسم تێدا ما،

لە باری سیاسییەوە لە ڕێبازی دێمۆکراسی کاڵ وکرچی حاجی قادر لای نەدا. ڕۆشنبیران و ڕێکخراوە سیاسییە ناسیۆنالیستەکان نەیانتوانی پرۆژەی ڕزگاری نەتەوەیی و نەتەوە دانان لەسەر بنچینەیێکی تیۆری و فکری دابنێن. بوورژوازی ڕۆژاوا لە خەباتی خۆی دا لە دژی دەرەبەگایەتی بنچینەیێکی قایم و بەرینی تیۆری هەڵچنی کە بوو بە بناغەی نیزامی سیاسی دێمۆکراسی بوورژوایی و پەرە پێدانی پێوەندی ئابووری دەسمایەداری. بە درێژایی سێ سەدە، خەباتی فکری و تیۆری لە گشت ئاستێکدا - سیاسەت، زانست، دین، هونەر، ئەدەب، زمان، تێکنیک، حقووق - بەرێوە دەچوو. لە کاتێکدا واقعییەت (کۆمەڵگەی دەرەبەگی) بە شێوەیێکی خۆرسکی لە سەدەی پازدە بەولاوە خەریکی گۆڕان بوو و پێوەندی دەسمایەداری تیجارەتی سەری هەڵدێنا، ڕۆشنبیری سەردەمی ڕۆنیسانس (سەدەی ١٧-١٥) بە چەکی ئاگایی بەرەنگاری دەرەبەگایەتی و جیهانبینیەکەی بوون. وە نەبێ ئەو خەباتە بە ئەهوەنی چووبێتە پێش و بە خۆشی و شادی کۆتایی هاتبێ. گالیلە (١٦٤٢-١٥٦٤) کە کوتی کورەی عەرز خڕە تۆبەیان پێکرد و جوردانۆ بروونۆ (١٦٠٠-١٥٤٨) کە تۆبەی نەکرد بە ئەمری کەنیشتە بە زیندوویی ئاوریان تێبەردا.[١٦]

ڕۆشنبیری کوردی ناسیۆنالیست، وەک ڕۆشنبیرانی سەردەمی سەرهەڵدانی بوورژوازی و ڕەنگە زیاتر لە وان، سەرکوت کراون و لە بەرامبەر هێزی سەرکوتگەر - زیندان و جەزرەبە و کوشتن - سەریان دانەنەواندووە. بەڵام ئەو ئازایەتییەی لە بەختکردنی گیان دا دیومانە لە خەباتی فکری دا بەدی ناکرێ. ڕۆشنبیری کورد لە بەرامبەر باری باوی کوردەواری - دواکەوتوویی ئابووری و سیاسی، دەرەبەگایەتی و عەشیرەگەری، چەوساندنەوەی جووتیاران، چەوساندنەوەی کرێکار و زەحمەتکێشی شار، ژێردەستیی ژنان - سەری دانەواندووە. کۆمەڵەی ژ.ک لە سنووری فکری و سیاسی حاجی قادر تێ نەپەڕی و زۆربەی ڕێکخراوەکانی ئەوڕۆ لە دنیای پێش حاجی قادر دا دەژین. ڕۆشنبیری ناسیۆنالیست لەباتی بە گژدا چوونی دەرەبەگایەتی، سەری بۆ دانەواندووە و خۆی پێ هەڵاوەسیوە و وەدوای کەوتووە.[١٧] پێویست نەبوو وابێ. پێویست نەبوو شەڕی "براکوژی" و "خۆکوژی" ٩٧-١٩٩٤ ڕۆشنبیر ڕابچڵەکێنێ. ئەگەر ئاگایی هەنگاوێک لە مادە وەپێش بکەوێ پێویست نابێ ئاوا یەخسیری خۆڕسکی بێ.

لەگەڵ ئەوەشدا کوردایەتی نەیتوانیوە دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام پەیدا بکا و نەتەوە رزگار بکا، ئەو ئەزموونە تایبەتێتی ناسیۆنالیزمی کورد نییە. ناسیۆنالیزمی گەلانی تری ئاسیا و ئەفریقا کە دوای شەری جیهانی دەسەڵاتی دەوڵەتییان وەدەست کەوت، وەک ناسیۆنالیزمی کورد، لە بەرامبەر باری باودا سەریان شۆڕ کردووە: ناسیۆنالیزمی هیند پەنجا ساڵە دەسەڵاتی هەیە بەڵام لە هیندووستاندا، کویلایەتی (شێوەی پێش دەرەبەگی)، برسێتی، قاتی، منداڵ کوشتن و ژێر چەپۆکەیی ژنان وەک جاران باوە.

ئەگەر بوورژوازی، چ لە رۆژاوا چ لە رۆژهەلات، چ کۆن و چ تازە، نەیتوانیوە دروشمی «ئازادی، برایەتی، بەرابەری» وەدی بێنێ، چینی کرێکاریش لە خەباتی خۆی بۆ دامەزراندنی دنیاییکی نوێ سەرنەکەوتووە. دوو شۆڕشی سوسیالیستی ١٩١٧ و ١٩٤٩ و زۆر شۆڕشی تر، سەریاقی دەستکەوتە گرینگەکانیان، زۆر زوو لە بەرامبەر باری باوی دنیای کۆن دا پاشەکشەیان کرد و ئاواتی دنیای نوێ لە درندەگەری دەسمایەداری دەوڵەتی دا نێژرا. بەڵام جیاوازییێکی زۆر لە نێوان ناسیونالیسم و کۆمۆنیسم هەیە. راستە کە ناسیۆنالیسم نەیتوانی دروشمی «ئازادی، برایەتی، بەرابەری» بەدی بێنێ، بەڵام چینی بوورژوازی و ئیدەئۆلۆژییەکەی (ناسیۆنالیزم) لە دامەزرانی دنیای خۆی دا - بەلانی کەمەوە لە رۆژاوا - سەرکەوت. هەر لە سەرەتاوە رۆشنبیرانی بوورژوازی بۆ خۆیان و چینە ژێردەستەکانیان روون کردەوە کە ئازادی و بەرابەری بۆ چینی خۆیان - بوورژوازی - داوا دەکەن نەک بۆ تەواوی نەتەوە.[١٨] لە فەرانسە، کانگای شۆڕشی هەرە گەورەی دێمۆکراسی بوورژوایی، تا ساڵی ١٩٤٤ نیوەی خەلک - ژنان - مافی دەنگدانیان نەبوو. لە ئەمریکا، کانگای تری دێمۆکراسی، ژن و کوێلەی رەش و موهاجیر کە زۆربەی نەتەوەیان پێک دێنا لەو مافە بێ بەش بوون. گەلە بوومییەکانیش (ئەو گەلانەی کە، پێش کولۆنی کردنی قارەی ئەمریکا بە دەستی ئورووپاییەکان، لەوێ دەژیان) وەک "وەحشی" چاویان لێدەکرا و، یان جینوساید و کوشتار دەکران یان دەیان تواندنەوە و لە مەڵبەندێک دا گەمارۆ دەکران. بوورژوازی تەواوی نەتەوەی خۆی خستە ژێر ئالاکەی و حەولی دا - بەداگیرکردن و کوشتار - لە سنووری نەتەوەیی تێپەرێ و

تەواوی دنیا داگیر بکا. کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم هەزاران شەری خوێناوی و دوو شەڕی جیهانییان وەڕێ خست. بە کورتی ئەگەر بوورژوازی کورد لە پرۆژەی نەتەوە داناند سەرنەکەوتووە، بوورژوازی رۆژاوا لە دامەزراندنی کۆمەڵگەی خۆی - دەسمایەداری - سەرکەوتووە؛ ئەگەر چینی کرێکار و فەلسەفە و جیهانبینییەکەی لە هەوەڵ هەنگاوەکانی بۆ دامەزراندنی سۆسیالیسم سەرنەکەوت، چەوساندنەوە و زوڵم و هەژاری و برسێتی لە ژێر ئالای دەسمایەداری دا درێژەی هەیە و خەبات بۆ بەرابەری، عەدالەت، و رزگاری لە ژێر ئالای سوسیالیسم دا درێژەی دەبێ.

بە رووخانی رێژیمی دەسمایەداریی دەوڵەتیی لە سۆڤیەت و ئورووپای رۆژهەلات، رۆشنبیرانی بوورژوایی رۆژاوا «کۆتایی مێژوویان» راگەیاند و کوتیان کۆمۆنیسم شکا و مێژوو تەنیا رێگەی دەسمایەداری لە پێش خەڵکی دنیا داناوە. زۆر رۆشنبیری تریش کۆتایی دنیای تیۆری چینی کرێکار - مارکسیسم - یان بە دنیا راگەیاند. بەلام لە روانگەی مارکسیسمەوە هیچ دیاردەیێک، بە تایبەتی سەرمایەداری، ئەبەدی و نەگۆڕ نییە. رێبازی «کۆتایی مێژوو» و «کۆتایی مارکسیسم» سەردانەواندن لە بەرامبەر باری باوە. بەلام باری باوی دەسمایەداری و زوڵم و چەوساندنەوە بێ سنوورەکەی حەجمێن لە جەماوەر و رۆشنبیری کورد هەڵدەگرێ و دەرفەتی پشوودانی ناداتێ. باری باو بەزەیی بە هیچ کەس دا نایا، تەنانەت بەو رۆشنبیرانەی کە، بە دیتنی وێرانیی کوردستان و شەڕی «خۆکوژی»، داوای گۆڕانی خۆڕسکی کۆمەڵگەی کوردەواری دەکەن جا چ بە بەرنامەی «کۆمەڵگەی مەدەنی» چ بە بەدەستهەڵگرتنی یەکجاری لە بەرەنگار بوونی دنیای کۆن. بە هەر رێگەیێکدا بڕۆین، ناکۆکی نێوان ئاگایی و خۆڕسکێتی یان ئاگایی و ماددە کۆتایی نایا و درێژەی دەبێ. رۆشنبیر، یان بە چەکی ئاگایی بەرەنگاری پێش-مێژوو دەبێ و لە خوڵقاندنی مێژوو دا بەشداری دەکا یان لە گۆڕەپانی باری باو دا دەبێتە بەشێک لە مێژووی گۆڕانی خۆڕسکی.[19]

---

پەراوێزەکان:

١-"باری باو"م بە مانای status quo دەکار هێناوە. ئەو زاراوەیە لاتینییەوە کە کرووتن نووسەری

***قامووسی بیری سیاسی*** دەڵێ: مانای "وەزعی مەوجود"ە، و "لە ساڵانی ۱۸۳۰یەوە بە مانای ڕاگرتن یان گەڕانەوە بۆ نەزمی کۆمەڵایەتی یا سیاسی مەوجوود دەکار هێندراوە. لە بۆچوونی موحافزەکارانە (کۆنسرڤاتیو) سەبارەت بە کۆمەڵگە دا هەمیشە *بارێکی باو* هەیە کە ئەو فکرە رادەگەیێنێ کە نەزمی کۆمەڵایەتی سەرباقی کەم و کورِی دەستکەوتێکی باشە و باشترە بیپارێزی نەک تێکی بدەی."

Roger Scruton, A Dictionary of Political Thought. London, The Macmilan Press,1983, page449

"باو" لە قامووسە کوردییەکان دا:

* ١- چلۆنایەتیی و شێوەی هەڵکەوتنی شتێکی ماددیی: فەرشەکە بە باری خۆیدا راخەن ٢- حالەتێکی کارێک بە خۆیەوە دەگرێ: ئەم ئیشە بە بارێکدا بخەن ( ***قامووسی زمانی کوردی***، عبدالرحمن زەبیحی، بەرگی ٢ ،ل ١٨)
* داب و ئاسایی: دنیاکە لە باری خۆی نەماوە ( ***هەنبانە بۆرینە***، ل ٣٩)

"باو"

* هەر رێ و رەسمێکی ژیان و کۆمەڵایەتیی و... کە برەوی بووبێ یا هەیبێ: دەرەبەگایەتیی و سەرمایەداریی لەم زەمانەدا باویان نەماوە ( ***قامووسی زمانی کوردی***، ل ٥٩)
* رەمێن و رەونەق: تیر و کەوان لە باو کەوتوە ( ***هەنبانە بۆرینە***، ل ٤٧)

٢- لێکۆڵینەوە سەبارەت بە رۆشنبیری و رۆشنبیران بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستان زۆر کەمە و ئەوەندەی بەسەرهات و شوێنەواری رۆشنبیرانیش بە نیوەچڵی کۆکراوەتەوە، لە باری لێکدانەوە و چوارچێوەی تیۆری و مێژوییەوە لە رادەیێکی سەرەتاییدایە. مامۆستا هێمن لە باسی ساڵانی ١٩٣٠ - سەردەمی دیکتاتۆری رەزا شا - وێنەیێکی زیندووی لە ژیانی سیاسی و رۆشنبیری لە موکریان دا وەبەرچاو خستوە:

> هەزاران پێچ و پشتێن و رانک و چۆغە و پەستەی پیاوی کورد و شەدە و هەوری و دەسماڵ و کوڵوانەی ژنی کورد درا و سووتا، بەڵام جل و بەرگی کوردی وەک سوننەتێکی میللی هەر ماوە.
> لە قوتابخانە و ئیدارە تەنانەت لە کوچە و خەیابان هەزاران کورد بە تاوانی کوردی گوتن گیران و ئازار دران و سوکایەتیان پێ کرا، بەڵام زمانی کوردی وەک سەرمایەی نەتەوایەتیمان هەر پارێزرا. کورد نەتواوە و ئابروو تکاوی و ریسوایی مێژوو بۆ پۆلیسی رەزاخان مایەوە.
> لەو سەردەمە تاریک و تنوک و ئەنگوست لە چاوەدا، لە مەڵبەندی موکریان بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ سیاسەتی تواندنەوەی کورد، کۆمەڵێکی نهێنی لە زانایان و رووناکبیران و گەورە پیاوانی کورد، بە رابەرایەتی مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوای نەمر، قازی بۆکان، شێخ ئەحمەدی سریلاناوا، و گەلێکی تر لە رووناکبیرانی ئەو سەردەمە پێک هاتبوو کە ئامانجی ئەساسی و هەرە گەورەیان پاراستن و پەرەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی بوو. کتێب و رۆژنامەی کوردی کە لە عێراق بڵاو دەبوونەوە بە زەحمەت پەیدایان دەکرد و بە ئیحتیاتەوە بەسەر لاوانی بروا پێکراو دابڵاویان دەکردنەوە، تا فێری کوردی خوێندنەوە

بن. ئەوان بە تایبەتی مامۆستا فەوزی، دەستەیەک لاوی رووناکبیریان پێگەیاند، کە لە دوا ڕۆژدا شاعیر و نووسەری زۆر خزمەتکار و بە ناوبانگیان لێ هەڵکەوت.

هێمن، "سەرەتا"، لە حەسەنی قزلجی، *پێکەنینی گەدا*، بنکەی پێشەوا، ١٩٧٢، ل ٧-٦.

بۆ زانیاری زۆرتر سەبارەت بە بزووتنەوەی ئەدەبی ئەو سەردەمە لە موکریان، بڕوانە س.ج. هێرش، "رەوتی سەرهەڵدانی شیعری نیشتمانی و سیاسی لە موکریان،" *گزینگ*، ژمارە ١٣، پاییزی ١٩٩٦، ل ٧٠-٦٣؛ ژمارەی ١٥، بەهاری ١٩٩٧، ل ٣٩-٣٣

٣- هەژار لە هۆنراوەی «عەقڵ و بەخت» دا باسی ئەو ڕووداوە دەکا:

هات بە گرمە لە لای مەسکەو    بۆ عەجەم وەک شەهێن دەچێ بۆ کەو
هەڵمەتێکی گەیاندە تەختی جەم    تێکی دا شەوکەت و جەلالی عەجەم
بە بلاو بوونی دوو پەڕ ناگاهی    بوو بلاو ئارتێشی شاهەنشاهی
شا کە شێر بوو لە راوی مسکێندا    دیم کە مشکە لە ژێر ستالیندا

هەژار، *ئالەکوک*، تەورێز، تبریزدەکی سووەت مدنیت ایوینین نشریاتی، ١٩٤٥-١٣٢٤، ل ٨

٤- بۆ کورتە باسێکی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کورد و دەوری حاجی قادر و کۆمەڵەی ژ.ک لەو بزووتنەوەیە دا بڕوانە:

Amir Hassanpour, Nationalism and Language in Kurdistan, 1918-1985, San Francisco, Mellen Research University Press, 1992, pp. 60-65

٥- کێشەیێکی گرینگ لە باسی رۆشنبیری دا، پێوەندی رۆشنبیرانە بە کانگای دەسەلات (وەک چینی کۆمەڵایەتی، دەوڵەت، ڕێکخراوی سیاسی) و زەمان و مەکان. ئەو کێشەیە زۆر جار لە نێوان دووبەرێتی (dichotomy) سەربەخۆی/بەسترانەوە یان بێ لایەنی/لایەنگری دا دەگیرسێتەوە. تیۆری مارکسیستی خۆ لەو دوو بەرێتییە دەپارێزێ، پێی وانییە رۆشنبیر دەتوانێ، لە کۆمەڵگەیێکی چینایەتی دا، سەربەست بێ لە پێوەندی قودرەت و دەسەلات یان بێ لایەن بمێنێ. لەو ڕوانگەوە، بێلایەنی بریتییە لە لایەنگرتن بەڵام هەر ئینسانێک - بە تایبەتی رۆشنبیرێک - دەتوانێ سەربەخۆ بێ لە چین و توێژی کۆمەڵایەتی خۆی. مارکس، لە باسی وردەبورژوازی لە شۆڕشی ١٨٤٨ی فەرانسە دا کە داوای دێمۆکراسی دەکرد، پێوەندی نێوان چینی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرانی ئاوالێکداوە:

ئینسان نابێ پێی وا بێ نوێنەرانی دێمۆکراسی گشتیان دووکانداران [وردەبورژوازی] یان سینگ پێشەوەدەری بە سۆزی دووکاندارانن. ئەوان [نوێنەرانی وردەبورژوازی] بە گوێرەی خوێندنیان و هەڵوێستی فەردیی خۆیان ڕەنگە بە قەد عەرز و عاسمان لێک جیاواز بن. ئەوەی دەیانکاتە نوێنەری وردەبورژوازی ئەو ڕاستییە یە کە لە زێهنیان دا لەو سنوورە تێناپەڕن کە وردەبورژوازی لە ژیانی خۆی دا تێی ناپەڕێ، و هەر لەبەر ئەوەیە کە لە باری تیۆرییەوە دەگەنە ئەو کێشە و چارە دۆزینەوانە کە وردەبورژوازی، لەبەر قازانجی ماددی و

پایەی کۆمەڵایەتی، لە پراتیک دا پێی گەیشتووە. ئەوە بە شێوەیێکی گشتی، پێوەندی *نوێنەرانی سیاسی و ئەدەبی* چینێکە لە گەڵ ئەو چینەی کە نوێنەرایەتی دەکەن..

Karl Marx, "The Eighteenth Brumaire of Louis Bonaparte," in K. Marx and F. Engels, Collected Works, Volume 11, Moscow, Progress Publishers,1979, pp. 130-31.

لەو روانگەوە، رۆشنبیر سەربەخۆیە یان دەتوانێ سەربەخۆ بێ لە بەرژەوەندی چینی خۆی بەڵام لایەنی چینێکی تر دەگرێ. بۆ وێنە ئەحمەدی خانی خۆی دەرەبەگ نەبوو بەڵام نوێنەری ئەدەبیی چینی دەرەبەگی دەسەڵاتداری کورد (میر و حاکمی ئەمارەتەکان) بوو. ئەو سەربەخۆییە، رێگە دەدا بە رۆشنبیر کە جێگەی خۆی لە پێوەندی قودرەت دا بگۆڕێ. بۆ وێنە هەژار و زەبیحی و قزلجی - کە هەژار وەک "سێ تفەنگدار" نێویان دێنێ (هەژار، *چێشتی مجێور*، ل ٥٧٧-٥٧٥) - لە گەڵ ئەوەشدا پێگەی چینایەتییان یەک بوو (وردەبورژوازی)، رێبازی سیاسی و ئەدەبییان جیاواز بوو و، هەر کامیان لە ماوەی ژیانیان دا رێبازی خۆیان گۆڕێ. هەژار کە لە ١٩٤٥ دا دەیکوت "بالشویکی است خضر راه نجات" (*ئاڵەکوکە*، ل ١٢) سی ساڵ دوایە دەیکوت "قەت هێندە خوێری نەبووم کمونیست بم" ( *چێشتی مجێور*، ل ٥٥٨).

٦- بە گوێرەی لێکۆڵینەوەیێکی کە سەبارەت بە بنگەی کۆمەڵایەتی شاعیری کورد کردوومە، لە سەرەتای پەیدا بوونی شێعری کوردی هەتا ساڵی ١٩١٨، نیزیکەی ٦٨.٥ ٪ شاعیرەکان لە رێزی «رووحانیەت» دا بوون (مەلا ٤٤.٢ ٪، شێخ ١٧ ٪، مەولانا و فەقێ و سۆفی و دەروێش ٦.٦ ٪) و ٢٠.٤ ٪ لە چینی دەرەبەگ بوون (بەگ، ئاغا، خان، میر و پاشا) کە کۆی ئەو دووانە دەکاتە ٨٨.٩ ٪. تەنیا ٤.٧ ٪ ژن بوون کە ئەوانیش لە چینی دەرەبەگ بوون. لە ساڵانی دوای شەڕی جیهانی بنگەی کۆمەڵایەتی شاعیر و ئەدیب و رۆشنبیر بەرین تر بوو. بڕوانە:

Amir Hassanpour, Nationalism..., pp. 75-77, 442-445.

٧- بڕوانە لاپەڕەی ١٣٣ی ئەو کتێبە.

٨- حاجی قادر لە شێعرە بە ناوبانگەکەی - "خاکی جزیر و بۆتان" - دەڵێ:

هەر دوێنێ ئەهلی سوودان هەستانە پێ وەکوو شێر
ئێستێکە موستەقیللن مەحسوودی کوللی ئەدیان
بولغار و صیرب و یۆنان، هەم ئەرمەن و قەرەطاغ
هەر پێنجیان بە تەعداد نابن بە قەددی بابان
هەرێکە موستەقیللن، کوللیکی دەوڵەتێکن
صاحیبی جەیش و رایەت، ئەرکانی حەرب و مەیدان

٩- حاجی لە گەڵ ئەوەشدا بە گژی دواکەوتوویی (نەخوێندەواری، هەژاری، بێ بەشی ژنان لە خوێندن، خورافاتی دینی و....)

کۆمەڵگەی کورد دا چوو و بەو بۆچوونانەی داوای دیمۆکراسی کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری گەلی کوردی دەکرد، رزگاریی نەتەوەیی - سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی - کوردی پێ گرینگتر بوو لە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی، و ئەو دوو شۆڕشەی لێک جویێ دەکردەوە.

١٠- بوورژوازی رۆژاوا بۆ دامەزراندنی نیزامی دیمۆکراسی بوورژوایی خەباتێکی درێژخایەن و بەرین و قووڵی لە دژی دەرەبەگایەتی و جیهانبینی و کولتووری دەرەبەگی بەرێوە برد. نە لە کوردستان، نە لە ناو نەتەوەکانی تری رۆژهەڵات - لە چینەوە بگرە تا ئەفریقا - کە لە ئاخری سەدەی نوزدەوە کەوتنە گۆڕەپانی خەباتی نەتەوەیی، رۆشنبیرە ناسیۆنالیستەکان وەدوای شۆڕشێکی بەرینی فکری لە دژی دەرەبەگایەتی نەکەوتن.

دیدێرۆ (Denis Diderot، ١٧١٣-١٧٨٤)، فەیلەسوف و رۆمان نووس و دراما نووس و تیۆریدانی ئەنسکلۆپیدی (*Encyclopedie*) فەرانسە، جیهانبینی عیلمی، فەلسەفەیی و هونەری نوێباوی لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانیدا بانگەشە دەکرد و لە بۆچوونەکانی داسەدەیێک لە زەمانی خۆی لە پێش بوو؛ لە بەرپەرچدانەوەی ئیدەئالیسم دا گەیشتە سنووری ماتریالیسمی دیالیکتیک. تامس پەین (Thomas Paine، ١٧٣٧-١٨٠٩) دیمۆکراتی شۆڕشگێری ئینگلیسی، بوو بە رابەرێکی فکری و سیاسی شۆڕشی دیمۆکراسی لە ئەمریکا و فەرانسە. دوای سەرکەوتنی ئەو دوو شۆڕشانە کە ئازادییان تەنیا بە چینی بوورژوازی دا، پەین داوای بەرابەری و حەقی دەنگدان بە خەڵکی بێ موڵک و بێ دەسەڵاتیشی کرد. لە ساڵی ١٧٧٤ رۆیشتە ئەمریکا - کە ئەو کات کۆلۆنی ئینگلیس بوو- و دەستی کرد بە رۆژنامەنووسی و شێعر دانان و بە گژ کۆیلایەتی دا چوو و، خەڵکی هان دا بۆ سەربەخۆ بوون لە ئینگلستان و، لە شەری سەربەخۆیی ئەمریکا لە دژی نیشتمانی خۆی - ئینگلیس - بەشداری کرد. پەین گەڕاوە ئینگلستان و لە دژی پاشایەتی، نەخوێندەواری، و هەژاری و بێکاری قسەی کرد و داوای کرد کە بە مالیات وەرگرتن لە دەوڵەمەندان بەرنامەی یارمەتی بە نەداران وەڕێ بخرێ. بوورژوازی ئینگلیس پەینی بە تاوانی ویستی «شۆڕشی خوێناوی» و خەیانەت بە دەوڵەت محاکەمە کرد بەڵام پەین هەڵاتە فەرانسە و لە شۆڕشی فەرانسە دا بەشداری کرد و وەک ئەندامی «کونوانسیونی نەتەوەیی» هەڵبژێردرا. کتێبی *مافی بەشەر* *Rights of Man* کە لە ١٧٩١ دا بۆ بەرگری لە شۆڕشی فەرانسە نووسی دەورێکی گرینگی لە بزووتنەوەی دیمۆکراسی دا گێرا. لە ئینگلستان دادگا مەحکوومی بە خەیانەت کرد و کتێبی *مافی بەشەری* قەدەغە کرد. لە نامیلکەی «عەدالەتی زەراعی» دا (*Agrarian Justice*) هێرشی بردە سەر نابەرابەری لە مولکایەتی زەوی دا. لە ١٨٠٣ دا گەڕایەوە ئەمریکا بەڵام بوورژوازی ئەمریکا کە سەربەخۆیی وەرگرتبوو و سەقامی گرتبوو، دیمۆکراتیسمی رادیکالی پەینی پەسند نەدەکرد. پەین تا ئاخری ژیانی دەستی لە دژایەتی پایە و مەقام و خورافاتی دینی هەڵنەگرت.

*ئەنسکلۆپیدی* لە ساڵانی ١٧٥١ هەتا ١٩٨٠ بڵاو بۆوە و دەوری سەرەتای فکری و ئیدەئۆلۆژی شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرانسەی گێڕا. ئەو بەرهەمە، زانست و هونەری زەمانی خۆی لە روانگەی پێشکەوتن و ئازادیخوازی و لە دژی جیهانبینی دەرەبەگی کۆ کردەوە و بە کورتی لێکی داوە. لەباری فەلسەفییەوە، زۆربەی نووسەرانی ماتریالیست بوون و لە دژی خۆ تێوەدانی کلیسا لە زانست دا راوەستان و بەگژ ئیستبداد دا چوون و داوای رزگاری بەشەریان لە زوڵم و چەوسانەوە کرد. دەوڵەتی فەرانسە و کەنیشتە و کۆنەپەرستان بەرهەڵستی *ئەنسکلۆپیدی* یان کرد بەڵام دیدێرۆ و نووسەران و بڵاوکەرەوە سەریان دانەنەواند. دالامبێر و دیدێرۆ و چەند فیلەسوفی دی لە نووسراوەکانیان دا دینیان وەک خورافات و ئیلاهیاتیان وەک جادووگەری دەناساند و پێیان وابوو کە زانست و فکری زانستی و عەقڵ (reason) تارمایی نەزانین و دواکەوتوویی لادەبا و کۆمەڵگە بەرەوپێش دەبا. دەکرێ بڵێین *ئەنسکلۆپیدی* گرینگترین بەرهەمی دەورەی "رۆشنگەری"(Enlightenment) بوو. لو هسون (Lu

Hsun، ۱۹۳٦-۱۸۸۱)، یەکێک لە رابەرانی بزووتنەوەی ئەدەبیی ۱۹۱۸ی چین، لە دژی جیهانبینیی کۆنی کونفوسیوسی راپەڕی، و لە خەباتی خۆی بۆ گۆڕینی کۆمەڵگەی چین لە رێگەی ئەدەبیات، وەک نووسەری هەرە گەورەی چین ناسرا. و وەدوای بەرژەوەندی چینی کرێکار و زەحمەتکێشانی وڵاتی خۆی کەوت.

۱۱- کوردستان راستەوخۆ (ئینگلیس لە عێراق ۱۹۳۲-۱۹۱۷، فەرانسە لە سووریا ٤٦-۱۹۱۷) و ناراستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیسم و ئیمپریالیسم بووە و لێکدانەوەی سیاسەتی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستەکانی کوردستان سەبارەت بەم دیاردەیە ئەرکێکی زۆر گرینگە. بەڵام لەو نووسراوەدا، باسی بۆچوونی زەبیحی سەبارەت بە ئیمپریالیسمم نەکردووە.

۱۲- بۆ کورتە باسێکی پێوەندیی نێوان قامووسی یەکزمانی و پرۆسەی ستاندارد بوونی زمان بڕوانە:
Amir Hassanpour, Nationalism..., pp. 407-410

۱۳- پەتی کردن، دیاردەی نابەرابەری لە نێو زمانەکان و پێوەندی ژوور دەستی-ژێر دەستییە. ئەو دیاردەیە هەم لە زمانی سەرکوتکراوی وەک کوردی دا بەدی دەکرێ هەم لە زمانی دەسەڵاتداری وەک فەرانسەیی دا کە لە ژێر زەبری ئینگلیسی دا مەودای پێ تەنگ بووە. جەماوەری خەڵک وشە لە زمانی تر وەردەگرن و دەیکەنە وشەی زمانی خۆیان، بەڵام رۆشنبیران و سیاسەت بەدەستان بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتداریتی یان بە دەسەڵات گەیشتن، پێش بە پرۆسەی سروشتی گۆڕانی زمان دەگرن. لە فەرهەنگنووسیی ئینگلیسی دا، کە زمانی دەسەڵاتداری دنیایە، هیچ وشەیێک بە بیانووی "بێگانە بوون" وەدەر نانێن. فەرهەنگنووسی پەتیگەری توند و تیژی کورد چۆن ئەو مافە بە خۆی دەدا کە چەند هەزار وشەی عەرەبی و فارسی و ترکی کە لە شێعری شاعیرە کلاسیکەکان - سەلیمی سلێمان، مەلای جزیری و خانی - و زۆربەی شاعیرانی سەدەی بیست هەتا ساڵانی ۱۹٥ دەکار هێندراوە لە قامووسەکەی دا تۆمار نەکا و وەدەری بنێ؟

۱٤- بۆ کورتە باسێکی ئەو بابەتە بڕوانە:
Amir Hassanpour, Nationalism.... pp. 397-403

۱٥- بڕوانە پەراوێزی ٥

۱٦- کۆڵەکەیێکی جیهانبینیی سیزامی دەرەبەگی بڕوا بە تەخت بوونی زەوی بوو. کە گالیلە (۱٦٤۲-۱٥٦٤) کوتی سەیارەکان بە دەوری تاو دا دەگەڕێن، کەنیشتە تۆبەی پێ کرد و بۆ ماوەی هەشت ساڵی ئاخری ژیانی دەست بەسەر کرا. جۆردانۆ برۆنۆ (Giordano Bruno، ۱٦۰۰-۱٥٤۸)، فەیلەسوف، ئەستێرەناس و ریازی زان، کوتی کەیهان (universe) بێ نهایەتە و، کورەی عەرز ناوەندی کەیهان نییە و، دنیا هەر کورەی عەرز نییە و، بێ نهایەت دنیا هەیە. تیئۆرییەکانی برۆنۆ کاری کرد لە فەلسەفەی دەوری مۆدێرنیتی و برۆنۆ، وەک رەمزی ئازادیی بڕوا، بوو بە ئیلهام بۆ بزووتنەوە دێمۆکراتییەکان و بە تایبەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی سەدەی نۆزدەی ئیتالیا.

۱۷- بۆ وێنە مەسعوود محەممەد پێی وایە لە کوردستان دا دەرەبەگایەتیی نییە و ئەوەی کە بە هەڵە پێی دەڵێن

دەرەبەگایەتی، "براگەورایەتی و سەرەک هۆزایەتییە"، و

ئەوانەی وا دەزانن فیۆدالی ئەورووپا و دەرەبەگی کورد یەک جوورن خەیاڵێکی ئەفیوونئاوی دەخەنە فکریانەوە هەموو سوودەکەشی بۆ کورد ئەوەیە بە راشکاوی لەعنەت لە مردوانی دەکرێت دەواوش دەدرێ بە لەعنەت کردن لە دەرەبەگێک کە وجودی نیە، بە تایبەتی لە عێراق (مەسعوود محەمەد، *حاجی قادری کۆیی*، بەشی سێیەم، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦، ل. ٣٣٥).

نووسەر، لەو کتێبە (ل ٢٤١ هەتا ٣٨٢) و لە جێی تردا (مەسعوود محەمەد، *بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەر کوێیەک بێت*، بەغدا، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، ١٩٨٤) لەسەر دەرەبەگایەتی وەدەنگ دێ، پێی هەڵدەڵێ و لەسەری دەگەرێ، و هێرش دەباتە سەر ئەوانەی کە رەخنە لە چەوساندنەوە و ئیستبداد دەگرن. بەلام بۆ ئەوەی قسەی خۆی بسەلمێنێ و خوێنەرەوە بۆ لای خۆی رابکێشێ، باسەکە دەشێوێنێ، باسی تر دێنێتە گۆڕێ و رەخنەکە لە لێلایی هەلاویکرەکەی دا شرت و گوم دەکا. دەڵێ "براگەورەکان" پیاوچاک بوون، کوردایەتییان کردووە، دیوەخانیان ئاواڵە و ئاوەدان بووە و پەناگای تێکۆشەری چەپ و راست بووە. بەلام ئەو قسانە و هەزار قسەی وا ناتوانێ رێگە لە رەخنەی دەرەبەگایەتی ببرێ. ئەوانەی لە روانگەی دیمۆکراسی یان سوسیالیزم رەخنە لە دەرەبەگایەتی دەگرن ئینکاری وەیان نەکردووە کە لە نێو چینی دەرەبەگ دا ئینسانی باش و ئازادیخواز و تێکۆشەر هەبووە و هەیە. تەنانەت زۆر جار باسی وەی دەکرێ کە دەرەبەگ یان کچە دەرەبەگ و کورە دەرەبەگی وا هەیە لە چینی خۆی وەردەگەرێتەوە و پشت لە بەرژەوەندی خۆی و چینەکەی دەکا. کێشەکە ئەوەیە: دەرەبەگایەتی نیزامێکی ئابووری-کۆمەلایەتی-سیاسییە. ئەو نیزامە، چ لە ئابووری دا چ لە سیاسەت و پیوەندی کۆمەلایەتی و کولتووری دا، رێژیمێکی ئیستبدادییە و رێگەی لە دیمۆکراسی بوونی کۆمەڵگەی کورد بڕیوە.

١٨- بەعزە تیۆری دانەرێکی بوورژوازی زۆر بە راشکاوی دەیانکوت ئازادی بۆ جەماوەری خەڵک نییە. بۆ کورتە باسێک سەبارەت بە بۆچوونەکانی جان میلتن (John Milton, ١٦٠٨-٧٤) و جان لاک (John, ١٦٣٢-١٧٠٤ Locke) بروانە:

Noam Chomsky, Deterring Democracy, London, Verso, 1991, pp. 351-405.

١٩- ئاگایی (consciousness) و خۆرسکێتی (spontaniety) دوو مەقوولەی ماتریالیسمی مێژوویین. مەبەست لە خۆرسکێتی پرۆسەی گۆڕانی کۆمەڵگەیە بێ ئەوەی ئینسان ئەو پرۆسانەی لە پێشدا ناسیبێ، پێشبینی کردبێ و ئامانجی بۆ دیاری کردبێ و بە نەخشە و بەرنامە بیەوێ یان بتوانێ بیگۆڕێ. گۆڕانی مێژوویی کاتێکی ئاگایانەیە کە ئینسان بە بەرنامە و بە ئامانج بەشداری تێدا بکا. مارکس پێی وا بوو دەسمایەداری، وەک شکلێک لە کۆمەڵگەی چینایەتی، درێژەی کۆمەڵگە پێش دەسمایەدارییەکانە و وێکرا «پێش مێژووی کۆمەڵگەی بەشەرین» (prehistory of human society) و بە تەواو بوونی خۆی و دامەزرانی ئاگایانەی کۆمەڵگەی بێ چین و بێ چەوسانەوە، مێژووی بەشەر دەست پێدەکا.

# دەسپێکی ژیان

لە سـالّی ۱۹۲۰ی زایینی بەرامـبـەر بە ۱۲۹۹ی هەتاوی لە شـاری سـابلاغ، مەهابادی ئێستا لە بنەماڵەیەکی فەقیر و هەژار، زەبیحی چاوی کەوتە دونیایەکی ئاڵۆز و پڕ لە زوڵم و زۆر.

باوکی سۆفی مینەی کلاودروو پیاوێکی نەدار و بە ئیمان، مەزلوم و بێ ئازار، قورئان خوێن و خۆشەویستی ناوخەڵک بووە. هەموو ڕۆژێک بانگی مزگەوتی روستەم بەگی داوە، وەک دەڵێن دەنگی قـورئان خـوێندنی زۆر خۆش بووە، سۆفی مـینە جگە لە زەبیـحی کـە یەکـەمین ئەولادی بووە، دوو کـوڕ و سێ کـچی دیکەشی بووە، کـوڕەکـانی عەبدوڵلا ومحەمەد و کچەکانی فاتم و رەعنا و هاجەر بوون. (دوو کچی تریشی هەر بە منالّی مردوون)

هۆی فـەقـیـری وهەژاری و بـاب مـردن وای لە زەبیـحی کـرد هەر لە یەکـەم سـالانی لاویەتی دا باری گـرانی ژیان بە کـۆڵەوە گـرێ و خـۆی بە بەرپرسی ژیانی دایکی پیـر و خوشکەکانی دابنێ، سەرەڕای هەموو تەنگ وچەڵەمەی ژیانی ئەو سەردەم بیری خوێندن وعـیلم و پێشکەوتوویی شەشدانگی هۆشی گرتبوو، هەر چەند لە سـەردەمی ئەو کـاتی کـوردسـتـان خوێندن و چوونی قوتابخانە تایبەتی چینی بەگزادە، شێخزادە و مەلازادەکـان بوو، زەبیـحی خوێندن و چوونی قـوتابخانەی لە بیر نەکرد، قوتابییێکی بە زیروزەنگ و بە هۆش بوو زۆر کـەڕەت هەڵکەوت دوو پۆلی بە سـالێک تەواو دەکـرد، ئاخـر جـار سـالّی ۱۳۱۷ی هەتاوی (۱۹۳۸ زایینی) سێ پۆلی هەوەڵی ناوەندی کـە ئەوکـات لە سـابلاغ قوتابخانەی ناوەندی نەبوو لە ورمێ ئیمتیحان دا و تێیدا سەرکەوت.

زەبیـحی تەنیـا بە چوونی قـوتابخـانە رازی نەبووە و لە هەمـوو هەلێک کـەڵکی وەرگرتوە بۆ وەرگرتنی عیلم و خوێندنی هەرچی زیاتر، لە پێشدا ئەلف وبێتکە و قورئانی لە لای بابی خوێندووە، قواعیدی عەرەبی لە لای مەلا بایزی زگدڕاوێ فێر بووە و لە لای

مەلا قادری مودەرەسی دەرسی جەبری خوێندووە و هەر ئەویش بووە کە هەستی نەتەوەپەروەری تێدا وەخەبەر هێناوە.

سالّی ١٩٣٢ زایینی (١٣١١هەتاوی) کاتێک کە دەزانێ ماموّستا گیوی موکریانی هاتووەتە سابلاغ و دووکانی عەکاسی داناوە، ئەو فورسەتە دەقوزێتەوە و دەچێ لە لای زمانی فرانسەیی دەخوێنێ.

لە سالّی ١٩٣٧ زایینی (١٣١٦هەتاوی) لە ئیدارەی فەرهەنگی مەهاباد دادەمەزرێ و لە ئیش و کاری پەروەردە کردن و بارهێنانی قوتابیانی شار دەبێتە موّرەیەکی شاز لەو ئیدارەیەدا، بەهوّی سەرکەوتن و ناوبانگی لە ئیدارەی فەرهەنگ، حاجی سالّحی شاتری کە ئەو سەردەم خاوەنی ئەمتیازی نەوتی مەهاباد بوو دەعوەتی لێ دەکا کە ببێتە بەرپرسی شیرکەتی نەوتی مەهاباد و هەروەتر بە حسیاباتی تەجارتخانە و کار و باری ئیداری حاجی سالّح رابگات، بە هوّی تەنیا نان ناوەری مالّەوە و حقوقی زیاتر لە لای حاجی سالّح یکسەر دەعوتی ئەو قەبولّ دەکا و زوّر زوو جێی خوّی لە ناو دلّی حاجی سالّح دەکاتەوە و تەنانەت پاش روّیشتنی زەبیحی لە مەهاباد و رووخانی کوّمار حاجی سالّح دەبێتە پەنایەک بوّ دایک و خوشکەکانی زەبیحی و لە روّژانی ئەوەڵی گەرانەوەی ئەرتەشی شا بوّ مەهاباد هەموان دەباتە لای خوّی و ئاگاداریان لێ دەکا.

هوّش و زەکاوەت و ئیستعداد لە ئیش و کار هاودەم لە گەلّ بیری کوردایەتی و نیشتمان پەروەری وا لە زەبیحی دەکا زوّر زیاتر لە سن و سالّی خوّی بنوێنێ و ببێتە هاودەم و هاورێ لە گەلّ زوّر لە گەورە پیاوانی سەردەم و هەستان و دانیشتن لە گەلّ کەسانێک بکا کە زوّر لە خوّی بە عومرتر بوون و تەنانەت ئەو گەورە پیاوانەی شار رێز و حورمەتی تایبەتی بوّ قائیل بن و لە هەر کوّر و کوّمەڵێک کە باسی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری بێتە پێش ناوی زەبیحیش هەبێت، لە گەلّ هەژار هەر لە منداڵییەوە دوّستایەتی دەبێت و زوّر جاران بەیەکەوە کە ون بوون لە دەورو بەری "خەزایی"یان دیونەوە و بوّتە پرسیار بوّ دایک و بابەکان کە ئەو جووتە ئەو هەمووە بەیەکەوە دەڵێن چی؟!

کاتێک هێمنی لاویش لە لادێ را دێتە شار، بە هوّی هەستی کوردایەتی زوّر زوو بە دوای زەبیحیدا دەگەرێ و دێتە ناو کوّری رەفیقان و لە ناو شار دوّستایەتی "هێمن و

هەژار و بێژەن" دەنگ دەداتەوە و گۆیا هەر سێ ناو زەبیحی خۆی دایناوە.

با ئاورێک لە پێشەکی تاریک و روونی مامۆستا هێمن بدەینەوە و بزانین مام هێمن خۆی چ دەبێژێ:

"جێگایەکی تریش هەبوو کە ناکرێ ناوی بێنم. ئەو جێگایە مەکۆی ئەو لاوانە بوو کە هەوای نیشتمانپەروەری یان کەوتبوە سەر. زەبیحی و رەسولی میکاییلی، قزلجی و نانەوازادە و ئیلاهی و سەیدی و زۆر کەسی ترم لەوێ ناسین. هەژاریش هەر چەند جاری هاتبا شاری بە ماڵی ئێمەدا دەهات. ئەو رەفیقانە کۆڕی ئەدەبی پچووکی کوردیان پێک دێنا و بە ئەهێنی شێعری کوردی یان دەخوێندەوە دەیان ناردە کوردستانی عێراق و هەرچی کتێبی لەوێ چاپ کرابان بۆیان دەهات و دەیان دا بە منیش."
(تاریک و روون ل ١٥)

خوو و رەوشتی زەبیحی و ئیمان بە بیروباوەڕی وای لێکردووە کە بۆ پێش بردنی ئامانج و ئارەزووەکانی، عەلاقاتێکی پان و بەرین لە گەڵ ئەنواعی کۆڕ و کۆمەڵ و خەڵکانی زۆر جیاواز لە یەک پێک بێنێ و ئەوە بۆتە هۆی بردنە سەری هۆش و مەعلووماتی، لە لایەک لە گەڵ خوارترین چینی شار تێکلاوییەکی بەهێزی هەبووە ولە لایەکی تر لە گەڵ پیاوە ماقوولان و گەورە پیاوان هەستان و دانیشتنی کردووە. لە گەڵ ئەوەش کە زەبیحی و هاورێیانی لە ناو کۆمەڵەی ژ . ک بە ئاڵا هەڵگرانی ناسیونالیزمی کورد لە رۆژ هەڵاتی کوردستان ناسراون، دەبینین کە دۆستایەتی باشی لە گەڵ ئازەرێکان هەبووە و لە زۆر شوێنان زۆر بە باشی کەڵکی لێ وەرگرتوون بۆ بیر و باوەری کوردایەتی خۆی و هەروەتر بە هۆی تێکلاوی لە گەڵ ئەرمەنیەکان لە شوێنی خۆیدا گەورەترین یارمەتی و کەڵکیان بۆی هەبووە وەک لە دوایدا باس دەکرێ لە چاپکردنی گۆڤاری "نیشتمان". ئەوەش بمێنێتەوە کە لەو تێکلاوییە دوو زمان زیاتر فیر بووە و توانیویەتی زۆر بە باشی بە تورکی و ئەرمەنی قسە بکا.

هەموو باش دەزانین بیری کوردایەتی لە رۆژهەلاتی کوردستان ناگەڕێتەوە سەردەمی شەری عالەمی دووهەم بەلکو ئەوە لە رۆژگارانی زۆر پێش شەری عالەمی یەکەمیش وە لەو رۆژەوە کە کوردستان دابەش کرا بە سەر ولاتە داگیرکراوەکاندا بیری ئازادی و ولاتی سەر بەخۆی کورد لە ناو کۆمەلانی کوردا هەر هەبووە .

بەلام ئەو بیرە زۆرتر هەر لە ناو میرەکان و سەرۆک عەشیرەتەکان دا یانی چینی سـ ـوی کۆمەلدا ئورگانیزە و رابەری کراوە و تەنانەت زۆر جاران کە قازانج و بەرژەوەندی میرێک وە یان سەرۆک عەشیرەتێک لە گەل حاکمانی ولات و دەولەتانی مەرکەزی یەکی نەگـرتووەتەوە یاغی بووە و لە شـاخی داوە و شـەڕی چەکـداری لە گـەل حکومـەتە مەرکەزییەکان دەست پێ کردووە و لە دوایشدا بۆ دیتنەوەی رێگای شەرعی، کوردایەتی و زولـم وزۆری لە خەلک لە لایان حکومـەتەکـانەوە کـردووەتە دروشم و خەلکی پێ رازی کردووە کە دژی حکومەتی مەرکەزی دەست بدەنە چەک و وەک دەبینین هەموو شۆڕشەکانی کوردی پێش شەڕی عالەمی دووهەم بە شێوەی خێلەکی و کۆبوونەوە لە دەوری شێخێک یان سەرۆک عەشیرەتێک بووە و هیچ چەشنە تەشکیلات و رێ و رەسمێک ئەو شۆڕشەی رابەری نەکـردووە وهەمـووی هاتووەتەوە سـەر ئەوەی کـە رابەری شۆڕشـەکـە خـۆی چەندە بەتون بووە و چەندی کێشـاوە، زور جارانیش بە رازی کردنی سەرۆک عـەشیرەت و شـیخ و... هەمـوو جم و جـۆلێـک لە کـار وەسـتـاوە و هەر ئەوەنـدە کـە توانیـویانە سـەرۆک لە مەرکەزەوە رازی بکەن ئاو بە هەموو ئاورێکدا کراوە!

شـەڕی عـالەمی دووهەم و بـوونی بەشێـکی گـەورە لە دونـیـا بە بەرەی کـۆمـۆنیـزم و پێشکەوتنی عـیلم و سـەنعـەت و بلاوکـردنەوەی ئەخـبـار لەو سـەری دونـیـا بو ئەو سـەری دونیـا و تێـگەیشـتـووی و چوونە سەری شعـوور و فەهـمی خـەلـک لەو سـەردەمـە دا، گـوێ گرتن لەرادیو، خوێندنەوەی رۆژنامە و... کاری کردە سەر کۆمەلانی کوردستـانیش، چینی رووناکبیر و وردەبورژواکانی شار تین و تاقەتێکی تریان خستـە خۆ تەنانەت کەوتنە ئەو باوەڕە کە چی تر ئاغـا و بەگ و شێخ ئالا هەلگریان نەبن. ئەوە هەر تایبـەتی کوردسـتـان نەبوو بەلکو ئەوە شـۆڕشـێک بوو لـە هەمـوو دونـیـا و بەتایبـەت لە ولاتانی دواکـەوتوو دەستی پێکردبوو و هەر دەهات وبەرەو پێش دەچوو.

لە قوژبنێکی ئەو دونیایە، لە سەر خەریتەی جیهان نوقتەیەکی زۆر پچوک، شارۆچکێکی ۱٥۰۰۰ نەفەری لە بەشێک لە دواکەوتووترین بەشەکانی ئێران بە نێوی مەهاباد دوور لەو حەرەکەتە نەبوو تەنانەت رووناکبیر و وردەبورژوای ئەو شوێنە پچووکە چەند هەنگاویش زۆرتر رۆیشتن و دەستیان دا بەردێک کە کەس تا ئەو سەردەم غیرەتی نەدابوو خۆی بتوانێ بەردی وا گەورە هەڵگرێ، هەرچەند لە ئەنجام دا ئەوانیش بەردەکەیان کە نیزیک سەر ببووە لێ کەوتەوە خوار، یان لێیان خستنە خوار، دیسان نیشێکیان کرد کە ئەو نوقتە پچووکەی سەر خەریتەی جیهان وەها گەورە بکەنەوە کە هەموو دونیا بیناسێ و ئێستاش پاش ٥۰ ساڵان کەمتر کەسێک هەیە ناوی مەهاباد و حکومەتەکەی نەبیستبێ و کارێکیان کرد کە ئێستاش کەمتر مەهابادییەک دەبینیی کە شانازی بە مەهابادی بوونی خۆی نەکا و ئێستاش کە ئێستایە بە ناوی یەک لە ناوەندەکانی کورد و کوردایەتی لە هەموو کوردستان و دونیا ناسراوە!

لە ناو ئەو کۆمەڵە پچووکەدا دەبێ ئێمە زەبیحی بدۆزینەوە. ئەو یەکێک لەو رووناکبیرانەی سەر بە چینی خواروی شارەکە بوو کە لە گەڵ هاورێکانی رەچەی شۆرشی نوێ یان بە قسەی ئێستا ناسیونالیزمی کوردیان شکاند، ئەوان لە سەرەتاوە بە چەشنێک چوونە پێش کە تەنانەت چینی بەگ و شێخ و ئاغایان وەک هاوکاریش قەبوڵ نەدەکرد چ بگا بە رابەر و پێشەنگ! لەوە غافڵ بوون کە دەرەوەستی ئەو چینە نایەن یان جارێ بۆ وان زوویە! لە دەستپێکرا شانس و ئیقبال لە گەڵ چینی وردە بورژوا و رووناکبیری مەهاباد بوو، بە هۆی شەری عالەمی، ئێران کەوتە ژێر دەستی هێزە سوێند خۆرەکان، رووسەکان لە سەرەوە و لە خواروش ئەمریکا و ئینگلیس خاکی ئێرانیان داگیر کرد حکومەتی رەزا شا هیچ هێز و توانای تێدا نەمابوو لەوەش زیادتر شانس بەرەو پیریان چوو کە مەهاباد کەوتە دەستی هەرسێک لا وە یان دەتوانین بڵێین بوو بە وڵاتێک کە حاکمییەتی هیچ لایەک تیدا بە تەواوی نەبوو.

زەبیحی و هاورێکانی ویستیان بە تەواوی کەڵک لەو ئەوزاع و ئەحواڵە وەرگرن و تا دەتوانن بە لای کوردایەتی و بیر و ئامانجەکانی خۆیانیدا بشکێنن. لە پەیوەندێکی نامەیی لە گەڵ دوکتور هاشم شیرازی، یەکێک لە ئەندامانی کۆنی کۆمەڵەی ژ .ک و

خەڵکی شاری سابڵاغ، باسی سەردەمی لاویتیی زەبیحی و کۆمەڵەی ژ .ک مان بۆ دەکا.
لە گەڵ سپاس و ریز و حورمەتی بێ پایانم بۆ کاک دوکتۆر کە وڵامی داواکاریکەمی داوە،
لێرە دا نامەکەی کاک دوکتۆر دەخەمە بەر چاوی ئێوەی هێژا:

# عەبدولڕەحمان زەبیحی

دوکتۆر هاشم شیرازی[١]

عەبدولڕەحمان زەبیحی کوڕە گەورەی کەیخودا پیاوێکی بە ڕێز بوو کە (سۆفی مینە)ی ناو بوو. پیشەی سۆفی مینە کڵاو دورین بوو. هەر بۆیە خەڵک لەو سەردەمەدا بە (سۆفی مینەی کڵاودروو)یان بانگ دەکرد. ژنانی کورد تاس کڵاوێکی تایبەتیان دەکردە سەر، کە بە وردە خشڵ و گوڵابەتوون و پووڵ و پووڵەکەی زێر و زیو دەڕازایەوە. سۆفی مینەی خودالێخۆشبوو وەستاکاری پەنجە نەخشین و دست و دڵ خاوێنی بێ وێنەی ئەم ئیش و کارانە بوو. هەر بۆیە لە لایەن خەڵکی شار و دەور و بەری شار، ناو و ناوبانگێکی تێکەڵ بە قەدر و ڕێز و خۆشەویستیی پێ بڕابوو. ناو براو هەتا ما هەر خۆشەویست و خۆشناو و سەرفەراز ژیا.

عەبدولڕەحمان مرۆیەکی خۆ ڕستووی لە ڕادەبەدەر چالاک و هەڵسووڕاو بوو کە هەر لە سەردەمی کوڕ و کاڵێیدا، پێز و جەوهەر و ژیرایەتی ی خوادادی خۆی بە هەموو لایەک نواند ولە دڵی مامۆستایاندا جێی کردەوە. زمانی فەڕانسە لە گیو موکریانی فێر بوو، خۆ بە خۆ بە زمانی ئینگلیسی و عەرەبی ڕاهات و بەهۆی دۆستایەتیی هەرمەنی (فەلە)کانەوە، بە زمانی ئەوانیش قسەی دەکرد. لە خوێندنەوە و نووسیندا، بە چوار زمانی کوردی - فەڕانسەیی - ئینگلیسی و عەرەبی، نیازی خۆی بە بێ گرێ بە ئەنجام دەگەیاند.

لە ساڵی ١٣١٦دا، ئەو کات کە من پاش چەند ساڵ جێ هێشتنی دەرس و مەدرەسە، لە پۆلی یەکەمی ئامادەییدا دەستم بە دەرس خوێندن کردەوە، عەبدولڕەحمان لە دایرەی ڕاهێنان و پەروەردەکردن (ئیدارەی فەرهەنگ) دامەزرا بوو و بە چەشنی جەڕیادەر هەموو گرفت و کۆسپێکی فەرهەنگیی دەتواندەوە. سەرەڕای پێ ڕاگەیشتنی کاری

---

١-لەگەڵ سپاس لە کاک کەریم دانیشیار کە ئەو نامەیەی لە فارسی را کردە کوردی.

ئیداری، هەر کات کە پۆلێک بێ مامۆستا دەمایەوە، جێی بەتاڵی مامۆستای پڕدەکردەوە. بە باشترین شێوە بە بۆڵتەنی مەدرەسە ڕادەگەیشت و زۆربەی گوتار و بابەتەکان بەقەڵەمی بەتوانای ئەو دەنووسران و بۆڵتەنەکەی زۆر ئابڕوومەندانە بەڕێوە دەبرد. لە بەرنامەکانی هونەریی قوتابییەکانیشدا، هەمیشە یاریکار و دەستی ڕاستی مامۆستایانی مەدرەسە بوو.

من لە بواری خوێندن و لە باری وەرزشدا یەکێک لە شاگردە هەرە باشەکان بووم و هەموو ساڵێ گوڵی سەرتۆپی کلاس دەهاتمەدەر، هەرلە بەر ئەمە، ناو براو بوو بە دەستە برایەکی زۆر گەرم و گوڕی من، چەندێک ڕابوورد، کارامەیی، زیرەکی، پاکی و پشت گەرمییەکانی ئەو بوون بەهۆی ئەوە کە حاجی ساڵحی شاتری بە مانگانەیەکی باشتر لە مانگانەی ئیدارەی فەرهەنگ، لە بەشی بەڕێوەبەرایەتیی شەریکەی نەوت ئیشی پێ بسپێرێت. ئەویش سەرەڕای بەڕێوەبردنی هەموو ئەرک و ئیشەکانی شەریکەی نەوت، توانی دەفتەری بازرگانییەکەی حاجی شاتریش بە باشترینی شێوە هەڵسووڕێنێ.

گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٠، هێزی سوێند خۆرەکان لە ئێراندا جێگیر بوون. مەهاباد تەنیا شارێک بوو لە ئێراندا کە هێزی هەر سێ وڵاتی داگیرکەر (رووسییە - ئەمەریکا - ئینگلیس)ی تێ خزابوو.

لە هاوینی ساڵی دوادا، حیزبی "ژیان کرد" کە کورت کراوەکەی بە دوو پیتی (K . J) دەهاتە نیشاندان، لە لایەن دە نەفەر کوردی مەهابادی و بە بەشداریی ئەفسەرێکی کوردی عێراقی بەناوی میر حاج، لە یەکێک لە باغەکانی شاری مەهاباد دامەزرێندرا. عەبدولڕەحمانی زەبیحی یەکێک لەو دە کەسە بوو و هەر لە هەمان کۆبوونەوەشدا، وەک سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی دیاری کرا. نازناوەکەی لە(K . J)دا، بێژەن بوو.

باشم لە بیرە، ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژەی کە حیزب پێک هات، پاش کۆتایی کۆبوونەوەکە ڕێ و ڕاست هاتە سەردانی من و گەلاڵەبوونی حیزبی بۆ باس کردم و پێیشی گوتم کە ئامادە بم بە زووترین کات ڕێ و ڕەسمی سوێند خواردنم لەبەرە و دەبێ بە جێی بێنم. پاش دوو ڕۆژی تر، لە ماڵی خوداڵێخۆشبوو محەممەد نانەوازادە، بە شێوازێکی زۆر بەجێ سوێندم خوارد و بەهۆی ڕێنوێنی و ناساندنی خودی عەبدولڕەحمانی زەبیحی، یەکەم

کەس بووم کە هاتمە ریزی حیزبی "ژیان کرد"، واتە یازدەهەمین کەسی کۆمەڵە بووم و نازناوەکەشم (پرشنگ) بوو. کە ئەویش هەر خودی زەبیحی بۆی هەڵبژاردبووم.

بە وریایی و وردبینی و پاشە رۆژبینینەکەی، بە چازانی و نەوەستانی تێکەڵاو بە پاکی و ئیمانی پتەو بە حیزبەکەی، تاقانەیەک بوو کە دەگەڵ هیچکام لە ئەندامانی حیزب شیاوی هەڵسەنگاندن نەبوو. ژین و ژیان و هەست و بیر و هۆشی زەبیحی حیزبەکەی بوو. شەو و رۆژ بەهەموو هان وهەناسەوە تێدەکۆشا کە ئامانجە خاوێن و سوودمەندەکانی دەروونی حیزب پەرە پێ بدات. لە ئاکامدا، پێنج یا شەش مانگ لەهەوڵ و هەڵسووڕانی حیزب تێپەڕ ببوو کە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی حیزبەوە سەفەر بۆ تەورێزو ئەرکی چاپ کردنی یەکەمین بلاڤۆکی کۆمەڵەی "ژیان کرد"، بەناوی (دیاری)ی بەم تەرتیبە خرایە ئەستۆ:

رۆژانە، بە رۆژ لە ماڵدا بخەوێ و بیرای بیرا لە ماڵ دەرنەکەوێ، شەوانە لە چاپخانەی کابرایەکی هەرمەنی(فەلە)، کە دەستەبرای عەبدولڕەحمان و دۆستی کوردان بوو، تەنێ و تەنیا خەریکی پیت چنین و چاپی بلاڤۆکی حیزب بێ، هەر لە هەمان کۆبوونەوە دا کە ئەم ئەرکەیان خستە ئەستۆی ئەو، منیان بۆ ئەو ماوەیە بە جێگریی ئەو هەڵبژارد و ئەرکی سکرتێریی حیزبیان بە من ئەسپارد.

عەبدولڕەحمان بەهەوڵ و هەڵسووڕانێکی لە ڕادە بەدەر و بە چەرمەسەرەییەکی لە بڕان نەهاتوو، لە ماوەیەکی نەهێندە کورتدا، ئەرکی سەرشانی بە شانازی بە ئەنجام گەیاند و یەکەمین گۆڤاری (J . K)، بە زمانی کوردی، لە سای خۆڕاگری وخۆبەختکردنی ئەم پیاوە تێکۆشەرە، کەوتە دەست و باوەشی گەرمی خەڵکەوە.

ئەم بە سەرهاتە، سەرجەم، هەتا کۆتایی ساڵی ١٣٢٣ و بەر لە ئەندام بوونی خوداڵێخۆشبوو قازی محمد لە حیزب، هەر هەمووی نهێنی و شاراوە بەڕێوە دەچوو. لە ساڵی ١٣٢٤دا، خوادالێخۆشبوو قازی محمد وەک ئەندامی (J . K) وەرگیرا و خەباتی حیزب هاتە روو و بە ئاشکرا دەست پێ کرا.

رووسەکان کە لە مەڵبەندا دەست و باڵیان ئاواڵەتر و دەست رۆیشتووتر بوون، بە نیشاندانی یارمەتی و هاریکاری، خۆیان لە حیزب نزیک کردەوە و سەرەنجام لە دەستیان

هات و توانیان کە حیزب لە رچە و ڕێبازی خۆی لار کەنەوە و بیخەنەسەر ڕێ و ڕێبازی ویست و خواستی خۆیان، تەنانەت هەر بە پێداگرتنی ئەوانیش بوو کە ناوی " ژیان کرد" گۆڕا و بوو بە دێمۆکراتی کوردستان. عەبدولڕەحمان زەبیحی یەکێک لەو کەسانە بوو کە بە گۆڕانی ناوی حیزب ڕازی نەبوو.

بۆچوونی ئەو بە تێکرایی ئەوە بوو کە دەبێ لە هەموو هەل و مەرجێکدا بە قازانجی گەل کەڵک وەربگیرێ و عەبدایەتی و گوێ ڕایەڵی لە سیاسەتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بە قازانجی نەتەوەی خۆی نەدەزانی.

دیارە بۆچوونەکانی ئەو سەربەسەر ڕاست بوون . ئێمە کەوتینە دوای سیاسەتی سۆڤییەت و تامەکەییشمان چێشت. عەبدولڕەحمان زەبیحی لە ڕیزەی کەسانێکدا بوو کە دەی زانی دەوڵەتی ئێران جێی بەقا و مەتمانە نییە و هەر کە هێز لە وڵات بڕژێنێتەوە، دەست دەکا بە کوشتار وپیاو کوژی، هەر بۆیە بەرەو عێراق لە ئێران دەرکەوت.

لە عێراق، هاوکار و هاوفکریی لایەنەکەی برایم ئەحمەد-دوکتور گەیلانی زادە-جەلال تاڵەبانی-عومەر مستەفا (عومەر دەبابە)-عەلی عەسکەری و هاوڕێیانی ئەوانی بە نهێنی دەکرد و بەلای ئەوانیشەوە جێی ڕێز و ئیحتیرام بوو .

لە ساڵی ١٩٦٧دا (١٩٦٤-دانەر)، کاتێک کە گروپی ناوبراو لە مەلا مستەفا جیا بوونەوە و دەگەڵ هێزی پێشمەرگەی خۆیان ڕوویان کردە ئێران، عەبدولڕەحمان دەگەڵیان نەبوو. بەڵام لەماوەی مانەوەی ئەوان لە ئێراندا، یەک دوو دیداری بە نهێنی لێ کردن و هەر لە یەکێک لەو سەفەرانەشی دا بوو کە سەردانێکی منیشی کرد و قەرار وابوو دیدەن و دیداری تریشمان هەبێ، بەڵام بە داخەوە دەستی نەدا و قەتم نەدیتەوە.

لە عەبدولڕحمان زەبیحی، ئەو مەزنە پیاوە بێ ناو و نیشانە، کە هەموو هان و هەناسە و هەست و نستی خۆی دەبەر ئاوات و هیوای پیرۆزی نەتەوەکەی مراند، نامەیەکی یادگاریم لێی ماوە، کە ئەوا کۆپییەکەی دەکەمە پەیوەستی ئەو نامەیە[1].

---

١-بڕوانە پاشکۆی ئەو کتێبە

# زەبیحی و کۆمەڵەی ژ.ک

سـالانی ١٣١٦ و ١٣١٧ و... ١٣٢٠ (١٩٣٧، ١٩٣٨، ...١٩٤٢)دەورانی چەپەڵی حوکمی رەزا شا و دەورانی نێفەک هەڵبڕینیی شەڵواری کوردی و قەدەغە بوونی زمانی کوردی و چەک کردنی عەشایر و ئاغاواتی کوردی، بە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی عـالەمی دووهەم وردە وردە بەرەو کـزی و لاوازی دەڕۆیشت لە دەست پێکرا رەزا شـا بە لایەنگری کردن لە ئاڵمانی نازی زۆر ئومێدوار بوو بە پشت ئەستوری و ملهوڕی خۆی، بەڵام رەوەندی شـەڕ لە ئاخـرێکاندا تەواو وەرسـوڕاوە و تا دەهات بە لای هێـزە سـوێند خۆرەکاندا دەڕۆیشت و ئەوە لە کز بوون و وەلەرزە کەوتنی پایەکانی حکومەتی رەزا شا کە لایەنگری هێزی ئاڵمانیای دەکرد، شوێنەواری خۆی دانا و هێزەکانی ئینگلیس و ئەمریکا دەبوو بە رێگای ئێراندا یارمەتی بگەیێننە سۆڤیەت، ئەوە بوو بە بڕیارێک بە بێ سێ و دوو لێ کـردن کـە ئێران لەلایان هەر سێ وڵاتەوە داگیـر کـرێت و هێـزەکـانی ئەمـریکا و ئینگلیس لە جنوب و هێزی سۆڤیەت لە باکور بێنە ناو خاکی ئێران.

کۆڕ و کۆمەڵە رووناکبیر و نیشتمان پەروەرکانی شاری مەهاباد کە تا ئەو سەردەم هەر بە لە دەوری یەک کۆوەبوون و شێعر خوێندنەوە و... تێپەر ببوو ئیتر چی تر بەم شێوەیە کولی دڵیان دانەدەمرکا، دەبوو هەنگاوێک بنێن، ئەویش چ هەنگاوێک؟! ئاخۆ دەیانزانی ئەو کـات کـە وەڕێ کەوتن بەرەو باغەکـەی حاجی داود تا قـسـەیەکی حیـسـابی لە کـار و باریان بکەن ئەو هەنگاوەیان لە مێژوودا دەنووسرێ و سەدان لاپەڕەی مێژووی کوردیان پێ رەش دەبێتەوە؟! ئاخۆ بۆ خۆیان دەیانزانی کە ئەوان دەبنە رەچەشکێنی بیری ناسیونالیزم و شـۆڕشی نوێی کـوردسـتـان؟! ئاخۆ دەیانزانی ئەو بەردەی خـەریکن هەڵیگرن لە تاقـەت و توانای شـان و باڵیـاندا هەیە؟! وەیان لە حەولی دیتنەوەی پشـتـیـوانێکی بە تواناتر لە خـۆیـانن؟! ئاخـۆ قـەت بیـریـان لەوە کـردبۆوە ئەو ریـبـازەی وان چەند دوژمنی دەر و ژوری هەیە؟! ئاخۆ دەیانزانی کە لە سەر کێ وەک دۆستی کورد دەبێ پێ داگرن؟! ئەو پرسیارانەو

ئیداری، هەر کات کە پۆلێک بێ مامۆستا دەمایەوە، جێی بەتاڵی مامۆستای پڕدەکردەوە. بە باشترین شێوە بە بۆڵتەنی مەدرەسە ڕادەگەیشت و زۆربەی گوتار و بابەتەکان بەقەڵەمی بەتوانای ئەو دەنووسران و بۆڵتەنەکەی زۆر ئابڕوومەندانە بەڕێوە دەبرد. لە بەرنامەکانی هونەریی قوتابییەکانیشدا، هەمیشە یاریکار و دەستی ڕاستی مامۆستایانی مەدرەسە بوو.

من لە بواری خوێندن و لە باری وەرزشدا یەکێک لە شاگردە هەرە باشەکان بووم و هەموو ساڵێ گوڵی سەرتۆپی کلاس دەهاتمەدەر، هەرلە بەر ئەمە، ناو براو بوو بە دەستە برایەکی زۆر گەرم و گوڕی من، چەندێک ڕابوورد، کارامەیی، زیرەکی، پاکی و پشت گەرمییەکانی ئەو بوون بەهۆی ئەوە کە حاجی ساڵحی شاتری بە مانگانەیەکی باشتر لە مانگانەی ئیدارەی فەرهەنگ، لە بەشی بەڕێوەبەرایەتیی شەریکەی نەوت ئیشی پێ بسپێرێت. ئەویش سەرەڕای بەڕێوەبردنی هەموو ئەرک و ئیشەکانی شەریکەی نەوت، توانی دەفتەری بازرگانییەکەی حاجی شاتریش بە باشترینی شێوە هەڵسووڕێنێ.

گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٠، هێزی سوێند خۆرەکان لە ئێراندا جێگیر ببوون. مەهاباد تەنیا شارێک بوو لە ئێراندا کە هێزی هەر سێ وڵاتی داگیرکەر (رووسییە - ئەمەریکا - ئینگلیس)ی تێ خزابوو.

لە هاوینی ساڵی دوادا، حیزبی "ژیان کرد" کە کورت کراوەکەی بە دوو پیتی (K . J) دەهاتە نیشاندان، لە لایەن دە نەفەر کوردی مەهابادی و بە بەشداریی ئەفسەرێکی کوردی عێراقی بەناوی میر حاج، لە یەکێک لە باغەکانی شاری مەهاباد دامەزرێندرا. عەبدولڕەحمانی زەبیحی یەکێک لەو دە کەسە بوو و هەر لە هەمان کۆبوونەوەشدا، وەک سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی دیاری کرا. نازناوەکەی لە(K . J)دا، بێژەن بوو.

باشم لە بیرە، ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژەی کە حیزب پێک هات، پاش کۆتایی کۆبوونەوەکە ڕێ و ڕاست هاتە سەردانی من و گەلاڵەبوونی حیزبی بۆ باس کردم و پێیشی گوتم کە ئامادە بم بە زووترین کات ڕێ و ڕەسمی سوێند خواردنم لەبەرە و دەبێ بە جێی بێنم. پاش دوو ڕۆژی تر، لە ماڵی خوداڵێخۆشبوو محەمەد نانەوازادە، بە شێوازێکی زۆر بەجێ سوێندم خوارد و بەهۆی ڕێنوێنی و ناساندنی خودی عەبدولڕەحمانی زەبیحی، یەکەم

کەس بووم کە هاتمە ریزی حیزبی "ژیان کرد"، واتە یازدەهەمین کەسی کۆمەڵە بووم و نازناوەکەشم (پرشنگ) بوو. کە ئەویش هەر خودی زەبیحی بۆی هەڵبژاردبووم.

بە وریایی و وردبینی و پاشە رۆژبینینەکەی، بە چازانی و نەوەستانی تێکەڵاو بە پاکی و ئیمانی پتەو بە حیزبەکەی، تاقانەیەک بوو کە دەگەڵ هیچکام لە ئەندامانی حیزب شیاوی هەڵسەنگاندن نەبوو. ژین و ژیان و هەست و بیر و هۆشی زەبیحی حیزبەکەی بوو. شەو و رۆژ بەهەموو هان وهەناسەوە تێدەکۆشا کە ئامانجە خاوێن و سوودمەندەکانی دەروونی حیزب پەرە پێ بدات. لە ئاکامدا، پێنج یا شەش مانگ لەهەوڵ و هەڵسووڕانی حیزب تێپەڕ ببوو کە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی حیزبەوە سەفەر بۆ تەورێزو ئەرکی چاپ کردنی یەکەمین بلاڤۆکی کۆمەڵەی "ژیان کرد"، بەناوی (دیاری)ی بەم تەرتیبە خرایە ئەستۆ:

رۆژانە، بە رۆژ لە ماڵدا بخەوێ و ببڕای ببڕا لە ماڵ دەرنەکەوێ، شەوانە لە چاپخانەی کابرایەکی هەرمەنی(فەلە)، کە دەستەبرای عەبدولڕەحمان و دۆستی کوردان بوو، تەنێ و تەنیا خەریکی پیت چنین و چاپی بلاڤۆکی حیزب بێ، هەر لە هەمان کۆبوونەوە دا کە ئەم ئەرکەیان خستە ئەستۆی ئەو، منیان بۆ ئەو ماوەیە بە جێگریی ئەو هەڵبژارد و ئەرکی سکرتێریی حیزبیان بە من ئەسپارد.

عەبدولڕەحمان بەهەوڵ و هەڵسووڕانێکی لە ڕادە بەدەر و بە چەرمەسەرەییەکی لە بڕان نەهاتوو، لە ماوەیەکی نەهێندە کورتدا، ئەرکی سەرشانی بە شانازی بە ئەنجام گەیاند و یەکەمین گۆڤاری (J . K)، بە زمانی کوردی، لە سای خۆڕاگری وخۆبەختکردنی ئەم پیاوە تێکۆشەرە، کەوتە دەست و باوەشی گەرمی خەڵکەوە.

ئەم بە سەرهاتە، سەرجەم، هەتا کۆتایی ساڵی ١٣٢٣ و بەر لە ئەندام بوونی خوداڵێخۆشبوو قازی محمد لە حیزب، هەر هەمووی نهێنی و شاراوە بەڕێوە دەچوو. لە ساڵی ١٣٢٤دا، خوداڵێخۆشبوو قازی محمد وەک ئەندامی (J . K) وەرگیرا و خەباتی حیزب هاتە روو و بە ئاشکرا دەست پێ کرا.

رووسەکان کە لە مەڵبەندا دەست و باڵیان ئاواڵەتر و دەست رۆیشتووتر بوون، بە نیشاندانی یارمەتی و هاریکاری، خۆیان لە حیزب نزیک کردەوە و سەرەنجام لە دەستیان

هات و توانیان کە حیزب لە رچە و رێبازی خۆی لار کەنەوە و بیخەنەسەر رێ و رێبازی ویست و خواستی خۆیان، تەنانەت هەر بە پێداگرتنی ئەوانیش بوو کە ناوی " ژیان کرد" گۆڕا و بوو بە دێمۆکراتی کوردستان. عەبدولڕەحمان زەبیحی یەکێک لەو کەسانە بوو کە بە گۆڕانی ناوی حیزب ڕازی نەبوو.

بۆچوونی ئەو بە تێکرایی ئەوە بوو کە دەبێ لە هەمـوو هەل و مـەرجێکدا بە قازانجی گەل کەڵک وەربگیرێ و عەبدایەتی و گوێ رایەڵی لە سیاسەتەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوای بە قازانجی نەتەوەی خۆی نەدەزانی.

دیارە بۆچوونەکانی ئەو سەربەسەر راست بوون . ئێمە کەوتینە دوای سیاسەتی سۆڤییەت و تامەکەییشمان چێشت. عەبدولڕەحمان زەبیحی لە رێزەی کەسانێکدا بوو کە دەی زانی دەوڵەتی ئێران جێی بەقا و مەتمانە نییە و هەر کە هێز لە وڵات بڕژێنێتەوە، دەست دەکا بە کوشتار وپیاو کوژی، هەر بۆیە بەرەو عێراق لە ئێران دەرکەوت.

لە عێراق، هاوکار و هاوفکریی لایەنەکەی برایم ئەحمەد-دوکتور گەیلانی زادە-جەلال تالەبانی-عومەر مستەفا (عومەر دەبابە)-عەلی عەسکەری و هاوڕێیانی ئەوانی بە نهێنی دەکرد و بەلای ئەوانیشەوە جێی رێز و ئیحتیرام بوو .

لە ساڵی ١٩٦٧دا (١٩٦٤-دانەر)، کاتێک کە گروپی ناوبراو لە مەلا مستەفا جیا بوونەوە و دەگەڵ هێزی پێشمەرگەی خۆیان روویان کردە ئێران، عەبدولڕەحمان دەگەڵیان نەبوو. بەڵام لەماوەی مانەوەی ئەوان لە ئێراندا، یەک دوو دیداری بە نهێنی لێ کردن و هەر لە یەکێک لەو سەفەرانەشی دا بوو کە سەردانێکی منیشی کرد و قەرار وابوو دیدەن و دیداری تریشمان هەبێ، بەڵام بە داخەوە دەستی نەدا و قەتم نەدیتەوە.

لە عەبدولڕحمان زەبیحی، ئەو مەزنە پیاوە بێ ناو و نیشانە، کە هەموو هان و هەناسە و هەست و نستی خۆی دەبەر ئاوات و هیوای پیرۆزی نەتەوەکەی مراند، نامەیەکی یادگاریم لێی ماوە، کە ئەوا کۆپییەکەی دەکەمە پەیوەستی ئەو نامەیە[١].

---

١-بڕوانە پاشکۆی ئەو کتێبە

# زەبیحی و کۆمەڵەی ژ.ک

سـالانی ١٣١٦ و ١٣١٧ و...١٣٢٠ (١٩٣٧، ١٩٣٨، ...١٩٤٢)دەورانی چەپەڵی حوکمی رەزا شا و دەورانی نێفەک هەڵبڕینیی شەڵواری کوردی و قەدەغە بوونی زمانی کوردی و چەک کردنی عەشایر و ئاغاواتی کوردی، بە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی عـالەمی دووهەم وردە وردە بەرەو کـزی و لاوازی دەرۆیشت لە دەست پێکرا رەزا شـا بە لایەنگری کردن لە ئاڵمانی نازی زۆر ئومێدوار بوو بە پشت ئەستوری و ملهوڕی خۆی، بەڵام رەوەندی شـەڕ لە ئاخـرێکاندا تەواو وەرسـوڕاوە و تـا دەهات بە لای هێـزە سـوێند خۆرەکاندا دەڕۆیشت و ئەوە لە کز بوون و وەلەرزە کەوتنی پایەکانی حکومەتی رەزا شا کە لایەنگری هێزی ئاڵمانیای دەکرد، شوێنەواری خۆی دانا و هێزەکانی ئینگلیس و ئەمریکا دەبوو بە رێگای ئێراندا یارمەتی بگەیێننە سۆڤیەت، ئەوە بوو بە بڕیارێک بە بێ سێ و دوو لێ کـردن کـە ئێران لەلایان هەر سێ وڵاتەوە داگیـر کـرێت و هێـزەکـانی ئەمـریکا و ئینگلیس لە جنوب و هێزی سۆڤیەت لە باکور بێنە ناو خاکی ئێران.

کۆڕ و کۆمەڵە رووناکبیر و نیشتمان پەروەرکانی شاری مەهاباد کە تا ئەو سەردەم هەر بە لە دەوری یەک کۆوەبوون و شێعر خوێندنەوە و... تێپەڕ ببوو ئیتر چی تر بەم شێوەیە کولی دڵیان دانەدەمرکا، دەبوو هەنگاوێک بنێن، ئەویش چ هەنگاوێک؟! ئاخۆ دەیانزانی ئەو کـات کـە وەڕێ کەوتن بەرەو باغەکـەی حاجی داود تا قـسـەیەکی حیـسـابی لە کـار و باریان بکەن ئەو هەنگاوەیان لە مێژوودا دەنووسرێ و سەدان لاپەڕەی مێژووی کوردیان پێ ڕەش دەبێتـەوە؟! ئاخۆ بۆ خۆیان دەیانزانی کە ئەوان دەبنە رەچەشکێنی بیری ناسیونالیزم و شۆڕشی نوێی کـوردسـتـان؟! ئاخۆ دەیانزانی ئەو بەردەی خـەریکن هەڵیگرن لە تاقـەت و توانای شـان و باڵیـاندا هەیە؟! وەیان لە حەولی دیتنەوەی پشـتـیـوانێکی بە تواناتر لە خـۆیـانن؟! ئاخـۆ قـەت بیـریـان لەوە کـردبۆوە ئەو ریـبـازەی وان چەند دوژمنی دەر و ژوری هەیە؟! ئاخۆ دەیانزانی کە لە سەر کێ وەک دۆستی کورد دەبێ پێ داگرن؟! ئەو پرسیارانەو

سەدان پرسیاری تر ئێستا بووەتە جێی لێکۆڵینەوە و بیروباوەڕی جیاواز لە نێوان دەیان مێژوو نووسی خۆیی و بێگانە.

لە ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ (١٦ ئووتی ١٩٤٢) زەبیحی هاورێ لە گەڵ:
خوسێن فروهەر ـ عەبدولڕەحمان ئیمامی ـ عبدولقادر مودەرەسی ـ نەجمەدین تەوحیدی ـ محەمەد نانەوازادە ـ عەلی مەحموودی ـ محەمەد ئەسحابی ـ عەبدولڕەحمان کەیانی ـ سەدیق حەیدەری و قاسم قادری بەرەو باغی حاجی داوود لە نیزیک مەهاباد وەڕێ کەوت. لە لای زۆر کەسان ئەوە چوونی سەیران و رابواردنی ڕەفیقان بە یەکەوە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانە چەندین ساڵ بوو بە یەکەوە لە کۆڕ و کۆمەڵاندا، لەو ماڵ و ئەو ماڵ، لەو شوێن و ئەو شوێن بە یەکەوە لە کوردستان و نیشتمانە داگیرکراوەکەیان دوا بوون و زۆر جاران بە یەکەوە نووسراوەی کوردیی و شێعر و ڕۆژنامەکانی خوارووی کوردستانیان خوێند بووەوە (یەکێک لەو نووسراوانەی کە بۆیان دەهات گۆڤاری "زاری کرمانجی" بوو کە لە ڕەواندز سالانی ١٩٢٦-١٩٣٠ لە لایەن حوزنی موکریانی دەردەچوو) و ئاڵ و گۆڕی بیر و باوەڕیان کرد بوو. بەڵام ئەو جارە دەبوو لە گەڵ یەکتر قسەی ئاخر بکەن و هەموو بە یەکەوە ناوی خوای لێ بێننو و هێزیان بکەنە یەک و هەموو بە یەکەوە شانی وەبەر خەن، هەر واشیان کرد لە گەڕانەوەدا باریان قورس بوو هیچکامیان حوسێن، عەبدولڕەحمان، محەمەد و... نەبوون، هەموو یەک ناویان هەبوو "کۆمەڵەی ژێکاف". هەموو بە یەکەوە سوێندیان خواردبوو بە ئالای کوردستان و قورئان و شەرەف و شمشیر، کە خەیانەت بە کۆمەڵەکەیان نەکەن.

با بزانین مامۆستا هێمن لەو بارەوە لە تاریک و روون دا دەڵێ چی:

تا ڕۆژی ٢٥ گەلاوێژی ١٣٢١ ـ ١٦ی ئابی ١٣٤٢ کۆمەڵەی «ژ.ک»دامەزرا. ئەوانی ئەو کۆمەڵەیان دامەزراند دۆستانی پێشووی من بوون. من لەو سەر و بەندی دا لە تەورێز بووم و لە ڕۆژی دامەزرانی کۆمەڵەدا حوزوورم نەبوو، کە هاتمەوە بە هۆی زەبیحی کە لە مێژ ساڵ بوو دۆست بووین بە کۆمەڵە ناسێندرام. لە ماڵی یەکێک لە دۆستەکانی خۆم کە پاشان زانیم ئەندامی ژمارە یەکی کۆمەڵەیە و بەڕاستی تێکۆشەرێکی بە جەرگ و ئازا و ئەبەز و کۆڵنەدەر بوو، بە قورئان و بە ئالای

کوردستان و بە شەرەفی خۆم و بە شمشێر سوێندیان دام کە بە زمان و بە قەڵەم و بە نیشارە خەیانەت بە نەتەوەی کورد و ئەندامی کۆمەڵە نەکەم. ناوی ئەهێنی حیزبیم «هێمن» بوو و ژمارەی ئەندامەتیم -٥٥- . من هەقم نەبوو هیچ لەوان بپرسم. بەلام ئەوان ئەوەندەیان موتمانە بە من بوو، پێم بلێن، هەژاریش ئەندامی کۆمەڵەیە و خۆت لە کن ئەو مەشارەوە، ئەوەش بەو ڕادەگەیەنین.
بەو جورە من لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەدەبیم دا پێم نایە قۆناخێکی نوێ. ئەندامەتی کۆمەڵەی "ژ.ک" گۆڕانێکی سەیری بە سەر من دا هێنا.

لە داێک بوونی کۆمەڵەی ژ.ک گۆڕانی تەنیا بە سەر مام هێمن دا نەهێنا بەڵکو گۆڕانی بە سەر هەموو کوردستان دا هێنا. لە ماوەیەکی زۆر کورت دا سەدان کوردی شۆڕشگێر لە خۆ وماکۆ را بگرە هەتا کرمانشان وکامیاران گۆڕانیان بە سەر دا هات و سوێندیان بۆ کۆمەڵە خوارد.

جێگای سەرنجە کاتێک کۆمەڵە دامەزراو و دەستی بە ئیش کرد حکومەتی تاران لە کوردستان زۆر لاواز و بێ توانا بوو. هێزە سوێند خۆرەکان، سۆڤییەت لە باکوور و ئەمریکا و ئینگلیس لە جنوب ئێرانیان داگیر کرد بوو، بەلام کۆمەڵە وەک ڕێکخراوەیەکی زۆر ئەهێنی و بە شێوەی کاری تەنزیی ئیشی دەکرد و خۆی ئاشکرا نەدەکرد! لە گەڵ ئەوەش کە زۆر جم و جۆڵی لە کوردستان پیدا ببوو و کەس شەرمی لە دەوڵەتی مەرکەزی نەدەکرد و تەنانەت زۆر لە سەرۆک عەشیرەتەکان و پیاوە ماقولانی مەهاباد و قازی محەمەدیش بە بێ ئیجازەی دەوڵەتی مەرکەزی سەفەری باکۆیان کردبوو و حەتا ڕووداوەکانی باشووری ورمێ و سۆما وبرادۆست و... ڕووی دا بوو و ولات بە تەواوی ئالوز و بەرەلا بوو، ژاندەرمە و پۆلیسی شا هیچ دەسەلاتیان نەبوو، کۆمەڵەی ژ.ک لە سەر ئەوە کە هیچ ئەندامێک لە سێ ئەندام زیاتر نەناسێ پێی دادەگرت. بۆ زۆرتر هێنانە پێش چاوی ئەوزاع و ئەحوالی ئەو سەردەمی کوردستان لە شێعرەکەی مامۆستا هەژار باشتر نابینمەوە کە خوێنەرەوەی هێژا بتوانێ ڕادەی دەسەلاتی حکومەتی پەهلەوی لە کوردستان بێنێتە پێش چاو. مامۆستا هەژار ساڵێک پێش دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک حکومەتی شەهەنشاهی ئاوا تەوسیف دەکا:

"بە بڵاو بوونی دوو پەڕ ئاگاهی بوو بڵاو ئەرتەشی شەهەنشاهی"

لە سەر کۆمەڵەی ژ.ک بە داخەوە زۆر شت بە دەستەوە نییە هۆی ئەوەش دەکرێ چەند سەبەبی هەبێ:

١ ـ دوای رووخانی کۆمار هەرچی سەنەد و بەڵگە کە لە لای خەڵک بوو سوتێندار و لەبەین چوون.

٢ ـ ئەو خەڵکانەی کە لە بناغەدانەرانی کۆمەڵە بوون یان کوژران و یان بێ دەنگی تەواویان سەبارەت بە کۆمەڵە گرتە پێش، تەنانەت بەشێک لە بناخەدانەرانی کۆمەڵە هەر دوای تێکچوونی کۆمەڵە و پێک هاتنی حیزبی دێمۆکرات بە تەواوی وازیان هێنا و ژیانی ئاساییان گرتە پێش.

٣ ـ زۆربەی ئەو شتانەی کە لە سەر کۆمەڵە نووسراون لە پێش دا بە دەستی نووسەرانی بێگانە نووسراوە و لە زمان وانەوە کراوەتە کوردی و ئەوانیش بە وردی لە هەموو شتێک حاڵی نەبوون و یان لە سەر قسەی ئەو و ئەو کە هاتوون بۆ ناوچە و پاش چەند ساڵ تێپەربوون لە واقیعەکان شتیان نووسیوە.

٤ ـ نەبوونی هیچ رێکخراوەیەکی سیاسی چالاک و دڵسوز، دوای رووخانی کۆماری کوردستان و بایەخ نەدان بە کۆکردنەوەی سەنەدە مێژووییەکان لە لایەن تاقە رێکخراوی رۆژ هەڵاتی کوردستان یانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران و بە تایبەت بێ ئەهمیەت گرتنی کۆمەڵەی ژ.ک لە لایەن رابەرانی ئەو حیزبە کە ساڵیانی ساڵ بە دوای رووخانی کۆماری کوردستان لە ژێر نفوزی حیزبی تودە و دژی مەسەلەی ناسیونالیستی کورد بوون، هەر چەند خۆیان بە درێژە پێدەرانی کۆمەڵەی ژ.ک دەزانن!

٥ ـ تاقە کەسێک لە بناخەدانەرانی کۆمەڵەی ژ.ک کە دوای رووخانی کۆماری کوردستان هەڵسوڕاو و ژیانی تەواووەختی سیاسی هەبوو و چالاکانە لە رووداوەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان دا بوو عەبدولڕەحمانی زەبیحی بوو. کە ئەویش بە داخەوە لە بڵاوکردنەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی دەبوارد. رەنگە ئەگەر نووسراوەکانی زەبیحی لەسەر کۆمەڵە و کۆماری کوردستان ساڵانی ٤٢ -٤٦ وەدەست کەون زۆر شتی

مێژووییمان بۆ راست کاتەوە. (خۆی باسی ئەو نووسراوانەی کردووە لە لای من کە ئەودەم سالی ۱۹۷۹ حازر بە بلاوکردنەوەیان نەبوو)

بەڵام بەخۆشییەوە هێندێک سەرچاوە و بیرەوەری هەن کە تا رادەیەک ئەگەر مرۆڤ خۆی پێوە ماندوو بکا و لێی بکۆڵێتەوە، دەکرێ بە زۆر راستی مێژوویی بگەین و زۆرتر لەو رێکخراوە نەتەوەیە بگەین. کاک محەمەدی سەمەدی مرۆڤی دلسوزی کورد کە دیارە عەودالی راستی و شەیدای مێژووی کوردە ئیشێکی زۆر بە نرخی کردووە.و پێش ئەوەی مەرگ بگاتە سەر مەلا قادر مودەرەسی ئەو چووەتە لای و ئەو شتانەی لە بیری ماوە لێی وەرگرتووە و تۆماری کردووە. لێرە دا لە سەر باسی کۆمەڵەی ژ.ک دەقی وتووێژی مەلا قادر مودەرەسی کە بەڕاست جێی لێکۆلینەوە و لێکدانەوەیە دێنمەوە:

# کۆمەڵەی ژێکاف

مەلا قادر مودەرەسی

"... لە ساڵی ١٣٠٦ هەتاوی (١٩٢٧ زایینی) خوێندنی سەرەتاییم لە شاری سابڵاغ تەواو کرد. وەزعی ئەو زەمانی مەهاباد زۆر سەیر بوو، خوێندنی دەرسی غەیری دەرسی ئایینی کارێکی دروست نەبوو کە یەکێک چووبایە دەبیرستان (پۆلی ناوەندی) ئیدی بە جارێک کافر دەبوو. کە بڕوای بە خڕ بوونی زەوی هەبا یان کووتبای عەرز دەگەڕێ، دەیان گوت: فلانە کەس گەڕاوەتەوە سەر شوێنی ئاورپەرستی!

ئەڵبەت کەسانێکی وەک (قازی عەلی) هەبوون ئەگەر چی پیاوێکی ئایینی بوو، زۆر رووناک بیر و (متجدد) بوو، بەڵام لە بەرامبەری ویدا کۆنە پەرستی وا هەبوو کە باسیان ناکرێ. بە هەزار خوێنی دڵ خواردن مەدرەسەیەکی ناوەندی لەو شارە داندرابوو، تەواوی کۆشش بۆوەی دەکرا کە ئەو دبیرستانە دابخرێ!

یەکێک لە پیاوە بە ناوبانگەکان بوو بە کاندید بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەری مەجلیس (ئەگەر چی هەرگیز نەبوو بە نوێنەر و نەچووە مەجلیس) پێیان دەگوت کە ئێمە ئەو پەڕی کۆششمان دەکەین کە تۆ رەیی بەرێوە و بچی بۆ مەجلیس تۆش دەبێ بەڵێنی بدەی کە هەر گەیشتیە تاران بە تەواوی تین و تاوتەوە حەول بدەی کە ئەو دەبیرستانە لەو شار هەڵبگیرێ! جا وەڵاتێک بەو فەزایەوە، دیارە کە بیروڕای سیاسیشیان چۆن دەبێت

ئەو رۆژگاری، لە ئەمانی شێخ عوبەیدیلا و دەورووبەرەکانی رۆژگ ی زۆر نەدەگوزەرا، وە ئەو مەسەلە زۆر کۆن نەببوو، وە شوێنی لە سەر خەڵک هەبو جا بۆیە جاروبار چەشنە کۆششێکی سیاسی پێک دەهات، بەڵام بێ سازمان و بێ سەرەوبەرە وە دەتوانین بڵێین بزوتنەوەی کۆڕ بەدی دەهاتن. ئێمەش دەستەیەک لاوی خوێندەوار بووین کە ئاورێکی بەتین لە دەروونماندا بڵێسەی هەبوو، بەڵام ئەوکات رێگەیکی رووناکمان لە پێش نەبوو وە نەمان دەزانی چی بکەین. ئەو تین و مەیلە لە ٢٥ی شەهریوەری ساڵی

١٣٢١ی هەتاوی ڕێکەوتی ١٦ی سپتامبری ١٩٤٢ شکلی گرت[١]. ئەو ڕۆژە لە گەڵ پۆلێک چوونە باغی ئەمینولئیسلامی کە هەر ئێستا نەخۆشخانەی (مبارزه با سل)ی مەهاباد لەوێ هەڵکەوتووە وە لەوێ نوتفەی تەشکیلاتی ژێ . کاف گوورا. ئەو ڕێکخراوە شتێکی سەد دەر سەد( ١٠٠ ٪ ) وە خالیس نەتەوایەتی بوو. مقیاس و معیار و پەیمانە بۆ ئەندامەتی لەو ڕێکخراوەدا تەنیا "کورد" بوون بوو.

مەبەستە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵەی ژێ . کاف ئەوانە بوون:

١- بناغە دانەرانی ژێ.کاف لە ڕوی تەجرەبە و ڕووداوە مێژووییەکان بۆیان دەرکەوتووە کە دەس بردن بۆ چەک غەیری چارەڕەشی و بەدبەختی بۆ گەلی کورد هیچ بەرهەمێکی دییکەی نیە، یانی دیتن بە چاو و بوون لە تاریخدا ئەو مەسەلەی پێ سەلماند بووین نە ترسەنۆکی.

٢- بناغەو ئەساسی کۆمەڵەی ژێ . کاف لە سەر ئەو ڕاستەقینەیە کە گرینگترین هەنگاو بردنە سەری سەتحی فەرهەنگی گەلی کوردە یانی گرینگترین کۆششی کۆمەڵەی ژێ . کاف ئەوە دەبێت کە سەتحی فەرهەنگی گەلی کورد بەرێتە سەرێ تا ئەو گەلە لایقی ئازادی بێت و ئامادەی وەدەس هێنانی مافی خۆی بێت.

٣- لە ڕۆانگەی دیانەتەوە: لە بەر ئەوەی کە "دینی ئیسلام" زیاتر لە هەزار ساڵە تێکەڵ بە ژیانی ماددی و مەعنەوی گەلی کورد بووە، بە بەشێک لە فەرهەنگی گەلی کورد حیساب دەکرێ و ژێ . کاف ڕێزێکی تایبەت بۆ ئەو ئایینە پیرۆزە دادەنێ.

تەواوی ئەو کەسانەی دەبوونە ئەندامی ژێ . کاف بە "قورئان" سوێند دەدران. کوردی شیعە، کوردی ئاورپەرست، کوردی یەزیدی، کوردی شەیتان پەرست، وە... دەیان توانی ببنە ئەندامی ژێ . کاف، تەنیا جیاوازی وانە لە گەڵ ئەوانی دیی ئەوە بوو کە لە کاتی سوێند دان دا، ئەو تاقمە بە کتێبی ئاسمانی خۆیان، یان هەر شتێکی کە لای وان موقەددەس بوو، سوێند دەدران.

٤- چوار دەستە (تاقم) دەیان توانی ببنە ئەندامی ژێ . کاف بەڵام هەرگیز نەیان دەتوانی بە پلەی سەرۆکی ژێ.کاف بگەن، ئەو چوار دەستەش بریتی بوون لە: ئاغا،

---

١-دەبێ ٢٥ی مورداد (گەلاوێژ) بێ لە سەرنووسینی ڕۆژنەژمێری کۆمەڵەی ژ.ک. (دانەر)

شێخ، مەلا و سەید. هۆی ئەو کارەش جوان دیار بوو کە چیە، لە نێو جەماوەردا هێندیان ڕێز بۆ ئەو چوار دەستەیە دانابوو کە چەشنێک "دیکتاتوری" سەیر لە کرداری وانەدا بەدی هاتبوو، هەر ئەوەش بەس بوو بۆ ئەوەی کە نەتوانن بە پلەی سەرۆکی بگەن.

ئەو جار بزوتنەوەی چەکدارانەش تەنیا زەمانێک تەئیید دەکرا کە هەم پلەی فەرهەنگی گشتی تا رادەی پێویست چووبایە سەرێ وە ڕێکخراویش ئەوەندە بە هێز بایە وە پەیوەندی لە گەڵ تەواوی ناوچەکانی کوردستانی گەورە ئەوەندە بایە کە لە یەک کاتدا وە هاوئاهەنگ لە کوردستانی ئێران، عیراق، تورکیە، سوریا ڕاپەڕین دەستی پێ کردبا، چوونکوو ئەوەش ئامانجێکی زۆر نێزیک نەبوو، زۆری خۆ پێوە ماندوو نەدەکرا.

کەسێک کە دەبووە ئەندامی ژێ. کاف هەوەڵێ دەچووە حەمامی وە لە ڕۆانگەی ئایینێ وە خۆی خاوێن دەکردەوە، ئەو جار دەهاتە لای سێ (٣)کەس وە لە لای وان حەوت جاری بە قورئان سوێند بۆ وەبەرچاو گرتنی ئەو شەش مەبەستانە دەخوارد:

١- خەیانەت بە نەتەوەی کورد نەکات.

٢- کۆشش بۆ خودمختاری کوردان بکات.

٣- هیچ رازێکی ڕێکخراوە، نە بە زمان، نە بە قەڵەم، نە بە ئیشارە ئاشکرا نەکات.

٤- هەتا ئاخری عومری هەر ئەندام بێت.

٥- تەواوی پیاوانی کورد بە برای خۆی وە تەواوی ژنانی کورد بە خوشکی خۆی بزانێ.

٦- بە بێ ئیزنی کۆمەڵەی ژێ. کاف نەبێتە ئەندامی هیچ ڕێکخراو و دەستەیەکی تر.

وە غەیری ئەو سێ کەسەش، کەسێکی دیکەی نەدەناسی.

بوونی مەعنەوییەت و ئیمانی ڕاستەقینە، خۆی زەمانەتێکی زۆر باش بوو وە زۆر بوون کەسانێکی کە هەتا دواهەمین هەناسەکانی ژیانیان، بە هیچ قیمەتێک لەو پەیمانەیان لایان نەدا.

لە ماوەیکی زۆر کەمدا ژێ. کاف لە ماکۆ را تا کرماشانی گرتە ژێر نفووزی خۆی

وە بلاو بوونەوەی بەراستی سەرسوور هێنەر بوو.

کار و باری تەواو نەهێنی بوو، بە ووتەی ئەم رۆییەکان دەکرێ بڵێم "ژێر زەمینی" بوو. دروشـمی ژێ . کـاف تاوێک (هەتاو) بوو کـە بە لاتین دو پیـتی (ژ . ک) لە نێـوە راستەکەی دا نووسرا بوو.

بناغـەدانەرەکـان ئەوانە بوون: مـوحـەممەد نانەوازادە، رەحـمـان زەبیـحی، حوسێن فروهەر، عەبدولڕەحمان ئیمامی، قاسم قادری هەزار رەحمەت لە قەبری قەت کوردی وا هەر نەبوە، مەلا عەبدوڵای داودی مەشهور بە مەلای حەجۆکی، مـوحەممەد یاهوو، بۆ خۆم (مـەبەست مـەلا قـادرە)، سەددیق حـەیدەری، عـەبدولڕەحـمـان کـەیانی، وە مـیـر حـەجی عێراقیش لە پێک هاتنی توخم (نوتفە)ی ژێ . کاف دا لە وێ بوو وە رابیتی ژێ . کاف لە گەڵ حیزبی هیوای عێراق، سەعیدی حەمە قالەی بێستانچی بوو کە بەراستی بێ غایەتی زەحمەت دەکێشا. ماوەی دوو سالان "حوسێن فروهەر" (حوسینی زێڕینگەران) رئیـسی کۆمەڵەی ژێ . کاف بوو.

یەک یەکی ئەندامـەکان ئامادەی هەمـوو چەشنە گیـان بەخت کردنێک بوون، هەر کارێکی پێ یان ئەسپێردرابا، هەر لایان وابوو خودا خەنی کردوون. یەکێک بەرێ کرا بۆ عێراق واهات کە لەوێ گیرا وە تووشی ئەشکەنجە و تاڵێکی زۆر هات لە پاش ماوێکی درێژ کە گەڕایەوە مەهاباد، هەمیشە ئەو ماوە زیندانەی بە خۆشترین کاتی ژیانی دەزانی و شانازی پێوە دەکرد. هەزار رەحمەت لە قەبرەکەی سۆفی موحەممەد برای عەلی ریحانی، بۆ مەئمووریەت چوو بۆ عێراق لە رێگەی گەڕانەوەدا، کە زستانێکی زۆر سەخت بوو، گورگ خواردی. تا ئەورۆ نەبووە کە دەسـتـەیەک ئاوا بە گـەرمی و بەراسـتی و بە ئیـمـانەوە بۆ گەلی خۆیان حەولدەن.

ئەڵبەت وەک هەموو رۆژگارێک ئەو کاتیش "گوڵە بەرۆژە" هەبوون کە تاو لە هەر لایەک را هەڵاتبایە روویان لەو لای بوو، بەڵام ئەوەندە نەبوون کە شیاوی ئاوڕ وێدان بان. وردە وردە رۆژگار تێدەپەڕی و سالی ١٣٢٤ی هەتاوی نێزیک دەبۆوە. رووداوەکانی ئەو سالی کـتـێب و وتاریان لە سـەر نووسـراون، رەنـگ بێ ئاگـاداری باش لەو کـاتی لە لای زۆران هەبێ، هەر بۆیە ئەمن زۆر لە سـەری باس ناکەم. کـاتێک رووسـەکان بە جوانی و

تەواوی دەستیان بە سەر وڵات دا گرت، یەکێک لەو شتانەی کە دەیانەویست دەستی تێدەن و بیگۆڕن کۆمەڵەی ژێ . کاف بوو. بەڵام هەر چی دەیان کرد تێی نەدەگەیشتن، وە تێی دا سەرگەردان مابوونەوە. دەتوانم بە دڵنیایی بڵێم ئێستاش ئەو جوورەی دەیانەویست لەو رێکخراوە هەر نەگەیشتن. بەڵام کۆشش بۆ لێک بڵاوکردنەوەی (متلاشی کردن) لە زۆر لایانەوە هەر دەکرا. ئاخری توانیان کە پیاوە لێ هاتووەکان یەک یەک و دوو دوو وەلا بنێن، ئەڵبەت لە راستەوە نەیان دەگوت: فلان کەس وەرە بڕوە دەرێ! وردە وردە کاریان بە ئینسانە لێ هاتووەکانی کۆمیتەی ناوەندی دەسپارد کە لە جەرگی کارەکە دوور بکەویتەوە، مەسەلەن ئەمنیان کردە مەسئوولی چاپخانەی کوردستان، ئەگەرچی ئەوە کارێکی زۆر گرینگ بوو، بەڵام هەر چی بێ، ئەمنی لە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی ژێ . کاف وە پلەی تەسمیم گیری دوور دەخستەوە. بەو چەشنە یەک یەک کارزان وەلا دەندران وە کارنەزان و گوێ لە مست جێگەی وانیان دەگرتەوە.

ئەو جار لە لایەن رووسەکانەوە (بە تایبەت جەعفەر باقرئۆف) وە وابەستەکانیانەوە (وەکوو جەعفەر پیشەوەری) ئەو زەمزەمە ساز بوو کە پێویستە ژێ . کاف ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی تێدا بە دیی بێت، لە شکڵی ئەهێنی بێتە دەرێ، نێوی بگۆڕێ وە...

کە وا بوو کەم کەم کۆمەڵەی ژێ . کاف کاڵ بۆوە وە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان جێگەی گرتەوە. پۆلێکی زۆر لە دڵسوزە بەراستییەکانی ژێ . کاف هاتن دەحیزبی تازەوە وە تەواوی حەول و تەقەلایان ئەوە بوو کە بەرنامە و پروگرامەکانی پێشو لەو قالبە تازەیەدا بەرێوە بەرن.

داخەکەم حەول و تەقەلای بێ خەوشی وانە، بەرهەمێکی کە چاوەڕوانی دەکرا، نەی بوو وە نەی دا.

"عەبدولڕحمانی ئیلخانیزادە" شیاوی هەموو چەشنە رێز و حورمەتێکە چوونکوو لە رۆانگەی ماڵێوە ئەو پەری یارمەتی بە ژێ . کاف دەکرد.

ئەمن بەو تەمەنو و ناساغێو و ناڕەحەتی فیکری و روحیەی کە هەمە، بە هەموو گیر و گرفتانەی کە لە ژیانمدا بۆم هاتوتە پێش ئەو جار هیچ چەشنە سەنەد و بەڵگەیەکیش

کە لەو کاتیوو زەمانێوە بە دەستەوە نەماوە، هەر ئەوانەم لە بیر ماون کە پێم کووتی. ڕاگرتن و نووسینی وانەش خۆی خزمەتێکی گەورەیە."

# زەبیحی و نووسراوەکانی کۆمەڵەی ژ.ک

کۆمەڵەی ژ.ک، یەکەمین ڕێکخراوی ناسیونالیستی کورد لە شارەکەی سابلاغ لە دایک بوو، هەر لە یەکەمین کۆبوونەوە زەبیحی وەک سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژاردرا و ئیشە ئاستەم و گرینگەکان کەوتنە سەر شانی. ئەو هەڵبژاردنە هەروا لە خۆڕا نەبوو ئەگەر چاوێک بە یەک یەکی پێکهێنەرانی ژ.ک بخشێنین و ڕادەی سەواد و زانیاری، زبان زانین و پان و بەرینیی عەلاقات و پەیوەندییان لە گەڵ خەڵکان و خەباتکارانی پارچەکانی تری کوردستان هەڵسەنگێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە زەبیحی بۆ ئەو ئیشە لە هەمووان بە قابیلتر بووە.

زەبیحی قۆڵی هیممەت هەڵ دەکا و بێ وچان شەو و ڕۆژ بۆ ئەو کۆمەڵەیەی کە هەموو وجوودی داگرتبوو ناسرەوێ و لە حەولی پەرەپێدان و گەشە کردنی کۆمەڵە لە هەموو بارێکەوە دەبێ، لە وەرگرتنی ئەندامانی دڵسۆز، لە کۆکردنەوەی باری ئابووری، لە دروست کردنی تەنزیمات و ڕێکخراوی قورس و قایم و بە ئەزموون و.... بەڵام لە سەرووی هەمووان دەبوو لە فکری زمانی کۆمەڵە دا بێت و کۆمەڵە بتوانێ لە گەڵ خەڵک بدوێ، ئەوە بوو کە بیری دەرکردنی گۆڤارێک کە ببێتە پردی نێوان خەڵک و کۆمەڵە کەوتە سەرووی هەموو فکران.

بۆ ئەو کارەش هەر زەبیحی خۆی وەپێشدا و بەرەو تەورێز وەڕێ کەوت. بە هۆی دۆستایەتی لە گەڵ ئەرمەنییەکان لە چاپخانەی کابرایەکی ئەرمەنی کە دۆستی خۆی بوو بە نێوی "چاپخانەی ئەرامەنە" دەستی بە ئیش کرد. بە ڕۆژ لە هوتێل خۆی دەشاردەوە و بە شەو خەریکی پیت چنین و ڕێک و پێک کردنی نووسراوەکانی گۆڤار دەبوو، زۆری نەخایاند کە یەکەمین بەرهەمی کۆمەڵە بە ناوی "دیاریی کۆمەڵەی ژ.ک بۆ لاوەکانی کورد" لە دەستپێکی ساڵی ۱۳۲۲(۱۹٤۳)کەوتە دەست خەڵک و وەک بۆمب تەقیوە، لە فرۆشی ئەو نامیلکەیە پارەی چاک کەوتە دەست کۆمەڵە و ئیوا هەبوو کە تەنانەت

یەک دانەی بە ۲۰۰ تمەنی ئەو سەردەمی دەکری!

ئەوە بوو بە هۆی پشت ئەستوور بوونی زیاتر بە خۆ و لە حەول کەوتن بۆ بڵاوکراوەی تری کۆمەڵە وەک "رۆژ ئەژمێری تایبەتی کۆمەڵەی ژ.ک "و" گۆواری نیشتمان". ماموستا هێمن لە پێشەکی تاریک و روون لاپەرەی ۲۱دا دەنووسێ:

> "زەبیحی سەرنووسەری نیشتمان بوو و بەراستی لە چاپ کردنی ئەو گۆوارەدا زەحمەتی کێشا و وریایی نیشان دا. جگە لە زەبیحی و چەند کەسی باوەڕپێکراوی تر کەس دەستەی نووسەرانی نیشتمانی نەدەناسی و نەیدەزانی ئەو گۆوارە لە کوێ چاپ دەکرێ."

ئەگەر چاوێک بە یەکەمین بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ژ.ک یانی "دیاریی کۆمەڵەی ژ.ک بۆ لاوەکانی کورد" بخشێنین بۆمان دردەکەوەێ کە "بێژەن" (زەبیحی) دایرشتوە و لە زۆربەی لاپەڕەکان و پەراوێزەکان نووسراوەی" نووسەری کۆمەڵەی ژ.ک -بێژەن" دەبیندرێ. با بە یەکەوە چاوێک لەو "دیاریی"یە بکەین و زۆرتر لە گەڵ کۆمەڵە و زەبیحی ئاشنا بین:

ناوەڕۆکی ئەو بڵاوکراوەیە بریتی یە لە چەند پارچە شێعرێک لە دیوانی "مەلا محەمەدی کۆیی" و "حاجی قادری کۆیی" و هەروەتر "حەسەن سیف القضات" کە کۆمەڵە بە ئیجازە وەرگرتن لە "پیرە مێردی سلەیمانی" "پیرە مێردی سابڵاغ"ی پێ دەڵێ، لە ناو لاپەڕەکاندا ناو بە ناو بۆچوونەکانی کۆمەڵە و ئامۆژگارییەکانی بۆ لاوانی کورد و ئاغاوەتی کورد دەبیندرێ لە گەڵ پارچە شێعرێکی "خاڵە مین بەرزەنجی"، "لاوێکی موکریانی"، پارچە شێعرێکی "بێژەن-نووسەری کۆمەڵە" کە ناوناخنی شێعرەکانی مەلا محەمەدی کۆیی کراوە، پێنج خشتەکێکی قازیی هەڵەبجە، شینی "شێخ ئەحمەدی سریلاوایی" بۆ شەهیدانی "مەحکەمەی سەربەخۆیی"و...

زۆربەی زۆری بابەتەکان و شێعرە هەڵبژاردراوەکان پەیامی کوردایەتی و ناسیونالیستییان تێدایە و باسی چارەڕەشی کوردان کە لە نەخوێندن و بروا بە شێخ و مەلا و مانەوە لە جەهالەت و خراپی ئاغاوەتی کوردستانەوە هاتووە دەکەن بۆ نموونە:

## آه و ناله بوژیانەوەی ملت (مەلامەحمەدی کویی)

هەتا دەمـــرم لەبو کـــوردان دەنالـم
عیلاجیان چون بکەم هاوار بە مالــم

فەقـــیر و جاهـل و ناخویـــندەوارن
لە لای نەوعی بە شەر بیقدر و خوارن

کەسی قەدری لە لای خزمان نەمینی
لـە لای بیگانە قەدری چی ئەمـــینی

لە گەل یەک بەد رەووشتو بەد نهادن
لـــە بـــویە وا کەساد و بیـــمرادن

لە علـم و معرفت روتن بە کلـــی
خـەیالی خاوە لایان فـکری ملـــی

.................................. ..................................

## "قازانجی شیخەکانمان"

هەتاشیخی لە کـــــوردستان بمینی
اومیـــدی زندەگانـــیت پـی نەمـــینی

طـــــــــریــــــقی ... و ...[١]
بەبای دا رونەقو آهنـــگی کـــوردی

هەمویان بونە صوفی و پیر و دەرویش
بە بەرمـــال و سەبیحە و رشتـە و ریش

هەمو بـی ایش و بـی کار و تەوەززل
وورگ پـان و مـل ئەستـــور سەلک زل

لە وان و ئەرضـــروم تا حەددی جافان
تەوللا بـــون لە عقل و علـم و عـرفان

.................................. ..................................

مەلای نادان بە عنوانی شەریـــعەت
حەرامی کـــرد لە تو علـمی طەبیعەت

لە بویە هەرچی لەوخاکە وەدەر کەوت
لە(رادیوم) و(زیـــر) و(باقر) و(نەوت)

هەموی کەوتە ژیر دەستـی فەرەنـــگان
چیـا و چـــولان ئەنورن وەک پلەنـــگان

بیان نـــورن چیایان چـون ئەکـــولن
هەتا کـەی ایوە هەر بەرمال بە کـــولن.

---

١-دەبێ مە بەست تەریقەی قادری و نەقشبەندی بێت. (دانەر)

(خوری)و(مازو)و(کەتیرە)و(جەوت)و (گەلوان)
وەکو(سیچکە)و(بنیشت)و(رون)و(قەزوان)

دەخیلو بم نەکەن بیدەن لە دەستــو
و الا وا بــزانن روحــو دەرچــو

هەتاکــو نەبنە خاوەندی صەنایع
هەمــو ئەنعامــی خــوا ئەروا بە ضایع

بە خورایی نەچی عومری عەزیزتان
بە هاوین و بەهار پـاییز و زستـان

مەچونە خانەقا و و چایی خانــان
اومیــدم وایە ببنە خانــی خــانان

ئەگەر خواهیش ئەکەن خواو لی بی رازی
مــەچونە تەکیەکان بۆ حـوقە بـــازی

.......................................... ..........................................

زەبیحی(بیژەن) ئەو شیعرانەی خوارەوەی تێ هەڵکێشی شێعرەکانی مەلا محەمەدی کۆیی کردووە و بە شۆرشەکەی گەلانی سۆڤییەت و لەنین وسوسیالیست هەڵدەلێ و رقی خۆی بەرامبەر بە ئیمپریالیست و نازی دەردەبرێ:

« سەیاحەت کەن بچن بـــو سووەتستـــان »
« بزانن چون بە خیرائـی هەلستــــان »
« لەقەومی روس چە ظلمیکی ئەکرد (چـــار) »
« هەمــوی ژەهری ئەخوارد ملت بە ناچـــار »
« لە پر (لەنین) هەلستـــا وەک دلــیران »
« بناغـەی ظلمی چاری کـرد ویــــران »
« بنای نا دەولەتیــکی سوسیـالــیست »
« لە ناوی برد بە جاریک ایپــــرالیست »
« لە ناو کومەل بە زوری دەرکرا (خـــان) »
« بە تیـلا (بەگ) خرایە بەند و زینـــدان »
« بە مەحضی هەل کرانی بەیرەقی ســـوور »
« لە ناو خەلکا نەما فیتە وشــەر وشـــوور »

« ئەلەرزیت کاکـــی (آغـــــا ) وک بنـــی آو»
« کە آلای سوور و آلـــــی دیتە بەر چـــاو »
« تەماشا کەن لە مەیدانی هـــەرا و شـــەر »
« چلـــون سەربازی ســـــــور؛ آزا و دلاوەر »
« شەو و روژ بی ووچان واتـــــی نەکوشـــن »
« لە جەبهەی شـــەر ئەلەی شەربەت ئەنـــوشن »
« بە فەرمانی ستـــــــالین: پیاوی شەرکـەر »
« ئەدەن بەر با هەمو نەیـروی هیتـــــــلەر »
« بەیانـــی بلبلی ســوتـــا و لە بو گـــــول »
«وەها ئەیخویند بە دلسوزی لە سەر چـــــــل»

لە زۆربەی زۆری بابەتەکـانی ناو یەکـەمین بڵاوکـراوەی کـۆمـەڵەی ژ.ک رق و تورەیەکیی یەکجار زۆر بەرامبەر بە شێخ و ئاغا و مەلا دەبیندرێ وەک:

ئـەری ئەی شیـــخە پیسی بوری چلکن
ئـەری ئـەی وورگ هەمانەی زار بـوگن؟
ئەتو دەوواری چەرخی بی ستــــونی؟!
ئەتو توقینەری چەشمە و عیـــــونی؟!
ئەری ئەی شیخە کویری خواری مەجذوم؟
ئەتوی نایب مەنابی حی قیـــــــوم؟!
ئەری ئەی پیستە خوری لینگ گـــواوی!
لە گەل ذەراتی عالم تیـــــــکەلاوی!
ئەتو ممتازی رزقی مار و مــــــوری؟!
ئەتو انشا کنندەی ناز و نـــــوری؟!
بە حکمی تو ئەبی عفوی گوناهـــان؟!

وەکو پاپای نەصارای خیوی غفـــران؟!
ئەوی عەفوی بکەی جیگای نەعیـمە؟!
ئەوی عەفوی نەکەی ماوای جەحیـمە؟!
هەمو عالم لەژیر  فەرمانی تویـــە؟!
حەیاتی توش! بە مستیک آردە جـویە!!

*"نووسـەری کـومـەلەی ژ.ک بە بونەی هەندی دەسـتکاری شعـرەکـانی ئەم دیاریە لە جەنابی مەلا محمدی کویی تکا و داوای چاوپوشین ئەکات*
*بیژەن          کوردستانی موکوریان-لاجان ١٣٢٢-١٩٤٣"*

لە بەشێکی تر لەو بڵاوکراوەیە ژیانی حاجی قادری کۆیی باس کراوە و بەشێک لە شێعرەکانی  چاپ کراون کە لە سەر نیشتمانپەروەری و کەم و کۆری گەلی کورد دەدوێ:

تەنبەلی کار حیز و بی خیرە          دەستی ماندو لە سەر زگی تیرە

*"بە پارەی کومەلەی ژ.ک بو ووشیاری آغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کـورد لە چاپ درا هەیئەتی ناوەندی (مرکزی) کومەلەی ژ.ک ئەم سیپاریە پیشکەشی گیانی(روح) لاوی رەحمەتی م.س.توس ئەندامی ژمارە ١٣ کومەلە ئەکات."* (م.س.توس دەبێ محەمەدی سەلیمی بێ -دانەر)

لێرەدا سەرنجی خوێنەرەوەی هێژا بۆ ئەوە رادەکێشم کە بە پێچەوانەی نووسراوی زۆرێک لە نووسەرانی خۆیی و بێگانە کۆمەڵەی ژ.ک هەر لە ساڵی ١٣٢٢وە خاوەنی "هەیئەتی ناوەندی(مرکزی)" بووە!

یەکێک لەو شتانەی کە کۆمەڵە هەستی پێکردووە و لە قسەکانی مەلا قادری مودەرەسیش وەدەر دەکەوێ رادەی نزم بوونی خوێندن و فەرهەنگ و زانیاری گەلی کوردە،

بە رای من کۆمەڵە هەر لە سەرەتای دەسپێکەوە ئەو واقعیەتە تاڵەی لێ روون و ئاشکرا بوو و ئەوەی زانیوە کە بە بێ بردنە سەری رادەی ئەو شتانە کورد ناتوانێ بە هیچ بگا و دەست بردن بۆ چەک بە بێ بوونی ئەو "شەرتە لازمانە" تەنیا ماڵ وێرانی و خۆکوژی تێدایە! کۆمەڵە بەو پەڕی وریای و زانایی لە سەر نەهێنی بوونی رێکخراوەکەی پێی دادەگرت و خۆی بۆ خەباتێکی دوور و درێژ ئامادە دەکرد و دەیزانی ئامادە کردنی ئەو "شەرتە لازمانە" کاری ئەورۆ و سبەینێ نییە و ئەوان باشیان ئەوزاع و ئەحواڵی ئەو سەردەمی عالەم و ناوچە لێک دابووەوە و نەیان دەویست بەوەی کە شای ئێران هیچ دەسەڵاتی نییە و زلهێزەکان دەستیان بە سەر وڵاتدا گرتووە بە کەوچکە ئاوێک وە مەلە کەون. ئەوان زۆر بە باشی لەوە حاڵی بوون کە ئەو هەڵا و گرمەیە تا سەر نابێ و ئاگایان لە وەزعی نێونەتەوەیی و سیاسەتی زلهێزەکان بوو، هەر بۆیەش بوو کە بە تێکچوونی کۆمەڵە و پێکهاتنی کۆمار و حیزبی دێمۆکراتی کوردستان زۆر خۆشحاڵ نەبوون و لە بەر ئەوەی ئەنجامەکەیان لێ سوور و عەیان بوو ئەو هەڵسوڕانە و خەباتەی بۆ کۆمەڵەیان کردبوو ئیتر نەیان دەکرد!

بە لام چوون مێژووی گەلی کورد بە داخەوە بە دەستی مرۆڤی وەک دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملو لەوپەری ناشارەزایی و تەعەسوبی حیزبایەتی نووسراوە، تا ئێستا راستییەکانی ئەو گەلە بەشخوراوە بەو چەشنە چووە دە مێشکی لاوان و خوێنەرەوانی کورد و بێگانە:

"کە کەسانێک لە سەرەتاوە کۆمەڵەی ژ.ک یان پێک هینا و بەرێوەیان برد بە باشی لە وەزعی نێونەتەوەی و سیاسەتی نێو دەوڵەتان و تەنانەت لە خەباتی گەلان بۆ رزگاری ناگادار نەبون". وە یان کۆمەڵە بەوە مەحکووم دەکا کە "رێکخراوەیەکی نەهێنی و داخراو بوو". تەنانەت ساڵی دامەزراندنی کۆمەڵە بە هەڵە تۆمار دەکا و بە عانقەست لە رۆژی دامەزراندنی حیزبی دێمۆکراتی نیزیک دەکاتەوە و بە ساڵی١٩٤٤ی لە قەڵەم داوە! (وا دیارە سکرتێری حدکا بلاوکراوەکانی سەردەمی کۆماری نەخوێندۆتەوە) کە گۆیا لە کوردستانی ئێران جگە لە حیزبی دێمۆکرات بە درێژایی زیاتر لە پەنجا ساڵ هیچ حیزب و سازمانێک لە گۆڕێ دا نەبووە و کۆمەڵەی ژ.ک یش کەمێک پێش حیزبی دێمۆکرات

پێکهاتوو و بوو بە حیزبی دیمۆکرات! کە وابوو هەر خۆمان خاوەنی مووتڵەقی کوردستانین!

لە سەر بردنە سەری رادەی خوێندن و عیلم و یەکێتی لە ناو ریزەکانی گەلی کورد کۆمەڵە ئەو جورە شیعرانە لە ناو شێعرەکانی حاجی قادری کۆیی لە یەکەمین بڵاوکراوەی خۆی (دیاریی کۆمەڵە...)چاپ دەکا:

..............................................................

صاحب کتیب و پەیامە هەر کەس | ایمە نەبی بووینە قەومی چرکەس
ملتی بی کتیب و نوسین | غەیری کوردان نیە لە روی زەمین
(جوو) چە قەدری هەیە لە نیو کوردان | غەیری لیدان و جوین و تی هەلدان
قەومی (جوو) چاکە اتفاقی هەیە | کورد بی غیرەتیو نفاقی هەیە

..............................................................

وە یان:

ئەگەر کوردیک قسەی بابی نەزانی | محقق دایکی حیزە باوکی زانی(زناکار)
وەرە بابوت بلەم باسی نیهانی | تفنن خوشە گەر چاکی بزانی
(صلاح الدین) و (نورالدین) کوردی | عەزیزانی (جزیری)و(موش)و(وانی)
(مهلهل)(ئەردەشیر)و(دەیسم)و(شیر)* | (قباد)و(باز)و(میری)و(ئەردەلانی)
ئەمانە پاکیان کوردن نهایەت | لە بەر بی دەفتەری وون بون و فانی
کتیب و دەفتەر و تاریخ و کاغەز | بە کوردی گەر بنوسرایە زمانی
مەلا و پیر و شیخ و پادشامان | هەتا مەحشەر دەما ناو نیشانی

**بو ناسینی ئەم حکمدارە کوردانە تەماشا کردنی کتیبی کوردستانی موکوریان"آتروپاتین" تالیفی حزنی موکوریانی گەلی زانیاری بە کەلک ئەدا بە دەستەوە - بیژەن*

لە جێگایەکی ترلە مەر کوردستانی گەورە بیرکردنەوە ئەو پارچە شێعرەی حاجی

قادر دێنەوە:[١]

## سنووری کوردستان

کوردە نەزانی لە کوی ساکنە خزمانی تو
گوی گرە بو تو بلیم مەسکەنی قەومانی تو
کیوی تروس و عمقی حەوزەیی ئەسکەندەرون
غەربیە تا بەحری رەش سەر حەدی مەیدانی تو
بەحری رەش و ئەردەهان آوی ئەراسە بزان
حەددی شمالە ئەمە کوزی بیچولانی تو
ئەلوەند و گولی وورمی تا سەر آوی ئەراس
سەرحەدی روژ هەلاتە جوگە و کیوانی تو
ئەهواز و کیوی حەمرین ژەنگار و ریەی نوسیبەین
بو تەرەفی جەنوبە رەوضەیی رضوانی تو
داخلی ئەم سنورە دوازدە ویلایەت هەیە
دەلین دوازدە میلیونە نفوسی کوردانی تو
(حاجی)درویە اصلا نفوسیان نەنوسرا
دەگاتە بیست میلیون بنوسری خزمانی تو

بەشی دووهەمی "دیاریی کۆمەڵە..."بەو دێڕانەی خوارەوە تەواو دەبێ:

---

١- فرج الله ذکی بلاوکەرەوەی شرفنامە چاپی قاهیرە، ئەو شێعرەی لە ژێر دێری "سرحدان کوردستان" گێڕاوەتەوە و بە کوردتی بە فارسی وەریگێڕاوەتەوە (شرفنامە، لاپەرەی ٥٨٧ - ٥٨٨). بەڵام وادیارە ئەو شێعرە، بەرهەمی عەبدولخالقی ئەسیریە (هاوار، ژ ١١، ١٩٣٢، ل ١٤) و لە دیوانی حاجی قادری کۆیی ش (کۆکراوەی سەردار حمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، ١٩٨٦)دا تۆمار نەکراوە.

*برا خوشەویستەکان وا تی نەگەن ایە بە زمان خومانەوە هاوارتان ئەکەینی*
*بەلکو ئەمە دایکی نیشتمانە خوی هاویشتوتە باوەشی کومەلەی ژ.ک و*
*ئەلی ریککەون تا سەرکەوون.*
*کوردستانی موکوریان لاجان-خاکەلیوەی ١٣٢٢-١٩٤٣*

لە بەشی ئاخری "دیاری کۆمەڵە..." بە نێوی "دەستە گولیکی جوان و بونخوش لە باغی نیشتمان پەروەری" ئاوا نووسراوە:

*بە پارەی کومەلەی ژ.ک بو بە هێز کردنی هەستی نیشتمان پەرستی لە ناو*
*آغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد لە چاپ درا.*

ئەو بەشە رازاوەتەوە زۆرتر بە شێعری شاعیرەکانی موکریان وەک: لاوێکی کوردی موکریانی، شێخ ئەحمەدی سریلاوایی، جەنابی حەسەن سیف ولقوزات، خالە مین بەرزنجی و قازی هەڵەبجە.

هەروەک لە پێشتر باس کرا کۆمەڵە بە فرۆشی ئەو نامیلکەیە پارەی چاکی دەس کەوت و پێشوازی گەرمی لێکرا، هەر بە دوای یەکەمین بڵاوکراوەیان دیسان زەبیحی بەرەو تەورێز وەرێ دەکەوێ و لە بەهاری ساڵی ١٣٢٢(١٩٤٣) دیارێکی تر لە گەڵ خۆی دێنێتەوە، ئەو دیاریە رۆژنەژمێری ساڵی ١٣٢٢بە کوردی بوو، کە زۆر زوو سەری لە زۆربەی ماڵە کوردەکان دەرهێنا.

زەبیحی هەر وەک خۆی لە پێشەکی قامووس دا باسی کردووە و دەڵێ: "هێشتا منداڵ بووم گرۆگاڵی زمانەوانیی سەرانسوێی خانووی مێشکمی لێگرتم و دەستی کرد بە سەرەتاتکێ و چاوشارکێ دەگەڵم، هەر دەرسێکی دەم خوێند دەمکردە کوردیی، ووشە سەخت و زەقەکانم بە کوردیی مانا لێدەدایەوە."

زەبیحی خۆی بە زمانی کوردییەوە زۆر ماندوو کردبوو، ویستی ئەمجارە خۆی

تاقی کاتەوە و سەرنجی چووە سەر مانگەکانی ساڵ کە ئاخۆ بە کوردی دەبن بە چی؟

دیاریی ئەوجاریی شتێک نەبوو کە لەبەین بچێ و بسوتێندرێ و یان لە بیر خەڵک بچێتەوە، شتێک بوو کە هەتا کورد هەیە و زمانی کوردی قسەی پێ دەکری، مرۆڤی کورد بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکا کە ئەو دیارییە ئی کێیە و چۆن هاتووەتە ناو زمانی کوردی بە کاری بێنێ و زمانەکەی پێ دەوڵەمەندتر کا!

زەبیحی زۆر بە زانایی و کوردانە گەلی کوردی لە کۆڵ بە کار هێنانی وشەکانی مانگەکانی ساڵ بە فارسی و عەرەبی و... کردەوە، ئەو دوازدە وشەی جوان و کوردانە و پر بە پێستی خۆیانی بۆ دوازدە مانگەکەی ساڵ دارشت و بە نێوی رۆژئەژمێری ساڵی ١٣٢٢ لە هەمووماڵێکی هاویشت. ناوی مانگەکان هەروەک هەموو باش دەیزانن ئەوانە بوون:

١- خاکەلێوە ٢- بانەمەر ٣- جۆزەردان ٤- پووشپەر ٥- گەلاوێژ ٦- خەرمانان ٧- رەزبەر ٨- خەزەڵوەر ٩- سەرماوەز ١٠- بەفرانبار ١١- رێبەندان ١٢- رەشەمە

کۆمەڵەی ژ.ک ساڵی ١٣٢٣ بۆ جاری دووهەمیش رۆژئەژمێری ئەو ساڵەی بە کوردی بلاو کردەوە.

# گۆڤاری نیشتمان

کۆمەڵەی ژ.ک لە ماوەی کەمتر لە ساڵێک ٩ ژمارەی گۆڤاری "نیشتمان"کە زمانی حاڵی کۆمەڵە بوو بڵاو کردەوە کە زۆربەی نووسەرانی خۆیی و بێگانە تا رادەیەک باسی رۆڵی زەبیحیان لە دەرکردنی یەکەمین گۆڤاری سیاسی و ئەدەبی لە رۆژهەلاتی کوردستان کردووە، گۆڤاری نیشتمان لە بوژاندنەوەی زمانی کوردی و وەخەبەر هێنانی هەستی نیشتمانی لە ناو کوردستانا جێ پێیەکی بۆ خۆی دیاری کردووە کە زۆر زیاتر لەوە هەڵدەگرێ مێژوونووسان و زمانەوانانی کورد لێکۆڵینەوە و دراسەی لە سەر بکەن.

هەر وەک دەزانین لە یەکەمین کۆبوونەوەی گشتی کۆمەڵەی ژ.ک قەرار لە سەر دەرکردنی گۆڤارێک درا و زەبیحی بوو بە بەر پرسی ئەو قەرارە، ئەو دیسان بەرەو تەورێز و کۆنە دۆستە ئەرمەنییەکەی لە چاپخانەی «خەلیفەگەری ئەرامەنە» وەرێ کەوت، لە مانگی پوشپەری ساڵی ١٣٢٢ (جولای١٩٤٣) یەکەمین ژمارەی گۆڤاری نیشتمان لە کوردستان لە ناو کۆمەلانی خەڵک بلاو بۆوە، زۆربەی زۆری بابەتەکانی لە سەر هەستی نەتەوایەتی و خەڵک هاندان بەرەو یەکێتی و برایەتی و زوڵم و زۆری لە گەلی کورد بوو، زەبیحی لەو ژمارەیەدا بە ناوی ع - بیژەن سێ نووسراوەی هەیە کە بەو جورەن:

نیشتمان ژمارەی ١ ساڵی یەکەم پوش پەری ١٣٢٢ جولای١٩٤٣

## ریک کەوون تا سەرکەوون

ع - بیژەن

تاریکە شەوی شەوانی دوای ١٧ و ١٨ەی مانگ لەبەر پەنجەرەی ژورەکەما چاوی پی بریبومە آسمان: آسمانیکی پرر لە ئەستیرەی سیس وگەش: آسمانیکی هەوراوی؛ آسمانیکی شین و رەش وچاوەروانی دەرکەوتنی مانگم ئەکرد چاوشارکی ئەستیرەکان وەک مانیتیزوریکی چالاک لەهوشی بردم تاریکی ودیمەنی شیرینی آسمانیش خستبویانمە

حالەتیکی بروهوشەوە وام ئەزانی ئەوا من بالداریکی پچوکم لەآسمانی کوردستانا ئەسوریەوە لەسەر گومی(وان)را بەسەر چیاکانی زاغروسدا فریەسەر گومی(وورمی)لە ویرا بەسر خاکی موکوریان و ئەردەلانا چومەوە کرماشان ولورستان و...و...بەلام لە هەمو شوینیکی وولاتەکەمانا هیندم مەردمی بیگانە دیت سەرم سور مابو ووتم بەلکو ئەمانە میوانن تیفکریم لە خانە خیویش زیاترن اینجا دوردونک بوم بە خوم گوت ریگام هەلە کردوە و لە آسمانی کوردستان وەدەر کەوتوم سەرم هەل بزی چیاکانی تروس؛ ئەلوەند؛ حەمرەین یەک یەک وەبەر چاوم هاتن ئەیانگوت نا! ریگات هەلە نەکردوە ئەم آسمانەی تو تی یا ئەسورییەوە آسمانی کوردستانە ئەم چیا و کیو و دەشت و شیوانەی لەبەر چاوتن هەمو کوردستانە بەلام ئەم بیگانانەی تو ئەیان بینی لە بەر دوبەرەکیو خوخوری ایوە لە هەمو ئەوشتانەی خوا بەخشیویە بەکوردستان کەلک ئەسینن ئەگەر پیت ناخوشە برو بە نەتەوەکەی خوت بلی سەر کەوتن لە ریککەوتنایە.

## ریک کەوون تا سەر کەوون

نیشتمان ژمارەی ١ سالی یەکەم

### سەرکەوتن بە زور و کەمی نیە

وتەییکی « بیژەن » نووسەری کومەلە لە کوبوونەوە ییکدا

برایانی خوشەویست لە ووتاری ئەوشوی خوما باسی آیەتیکی کتیبی مقدس اسلامی یعنی قورآن تان بو ئەگیرمەوە -ئەم آیەتە لە تابلویەک نوسرابو ئەگەر چی زور جار چاوم پی کەوتبو بەلام هەر گیز وەکو ئەم جارە کاری لیم نەکردووە ئەوەتا آیەتە کە خوا ئەفرمویت « کم من فئـه قلیله غلبت فئـه کثیـره باذن الله » معناکەی زور آشکرایە ئەفرمویت زور دەستەی کەم هەن کە زال ئەبن بەسەر دەستە زوردارەکانا بە ارادەی خوا هوی زور کار لی کردنی ئەم جارەی ئەوەیە جاران لە خوما شتیکی دەگەل ئەم آیەتە مبارکە تطبیق بکات شک نەدەبرد بەلام ئەو جار کە بیرم کردەوە بوم دەر کەوت کە ئەو فەرمایشەی خوا بال ئەکیشیت بە سەر ایمەشا چونکو دستەیەکی نسبتا پچکولە لە دەوری

یەکتری کوبونەوە ئەلیین نیشتمانی خوشەویستمان رزگار ئەکەین؛ وولاتە کەمان ئەهاویژینە باوەشی سەربەخوئی؛ هەنگوینی سەربەستی ئەکەین بە گەروی هەمو کوردیکدا واتی ئەگەم ئەم آیەتە مزگینیکی گەورەی خدائی بو بویە وا قورسائی ئەخاتە سەر میشکم و لە پیش چاومە کە هیچ شتیک توانای نیە ایمە و براکانمان لە گەیشتن بە ئەم آمانجە پاک و خاوینە بگیریتەوە چونکە خوا دەگەل ایمەیە بوچ لە گەل مان نابیت ایمەبنچینەی کارمان لەسەر ری و شوینی اسلام داناوە و پالمان داوەتە بزەیی (رحم) خوا و گەورەئی پیغمبر و پاکی قورآن.

نیشتمان ژمارەی ١ سالی یەکەم

## شاعری بە ناوبانگ وەفایی

ع . بیژەن

خاکی دلکەش وشوینە خوشەکانی کوردستان هەستی زور وورد وبیری باریک ئەخاتە ناو دلی دانیشتوانی ئەم وولاتەی کە ایستا هەر لەتەی بەدەست یەکیکیەوەیە بویە بەشی زوری نەتەوەی کورد (خویندەوار ونەخویندەوار) طبیعتا شاعرن .

لە خاکی پاکی کوردستانا زور نەخونیدەواری وا هەیە و بووە کە لە خویندەوارەکانی بیگانە باشتر و جوانتر و ریک و پیک تر توانیویتی شعر بهونیتەوە شعر و ئەدەبیاتی کورد نشان ئەدا کە خویندەوارکانیشمان لە پلەی هەرە بەرزی شاعریدا جیگەیان بو خو کردوتەوە.

لە سالی ١٣٥٥ھ کە چوبومە موکوریان کومەلە شعریکی وەفاییم بەرچاو کەوت هیندە تەرر و آودار و شیرین و جوان بون بریارم دا دیوانی ئەم شاعرە بە ناوبانگە کو بکەمەوە و کە هەلم بو هەلکەوت لەچاپی بدەم خوا یارمەتی کرد گەنجینەییکی باشم لەلای کوردیکی صوفی نەک صوفیکی کورد دەس کەوت و ریکم خست کە بو چاپ حاضر بیت بەلام گریو قورتی زەمانە تا ایرو نەی هیشتوە ئەم آرەزوم پیک بینم هیوام هەیە بەم زووانە بیدم بە چاپخانەی ژ.ک بو چاپ کردن.

لە هەمو لاویکی کورد تکا ئەکەم بو تەواو کردنی بە سەراهاتی وەفائی لە نوسینی زانیار (معلومات)ی خویان دریغ نەکەن.

زەبیحی ووچانی نەبوو، پێیەکی لە سابلاغ و ئەوی تری لە تەوریز بوو، بەدەرکـردنی "دیاریی کۆمەلە..." و "رۆژئەژمێری کوردی" و "نیشتمان"ی ژمارە ١، کۆمەلە جێی خۆی لە ناو دلـی دایکی نیشـتمـاندا کـردبۆوە، رۆژ بە رۆژ سـوورتر بوون لە سـەر ئەو ئەرکـەی کەوتبـووە سەر شانیـان لە خەزلوەری سالـی ١٣٢٢ ژمارە ٢ی گۆڤاری نیشـتمـان کەوتە دەست خەلـک و زەبیحی لەو ژمارەیەدا لە کۆمۆنیزم دەدوێ:

نیشتمان ژمارەی٢ سالی یەکەم خەزەلوەری ١٣٢٢

## ایمه و مەردم

ع.بیژن

توز و غباری تەبلیغاتو پروپاغاندای ژەهراوی فاشیستەکان روی مینای بی گەردی کـوردسـتـانیشـی وەکو زور وولاتەکانی گـیـتی وەها تـاریک دا هینابو ایسـتـاش پاشمـاوی دوایی نە هاتوه.

لە کاتیکدا کە مبلغەکانی نازی لە عراق و ایرانا خەریکی لیلاو و شلوی کردنی آوی هیمنی سیاسەتی ئەم ولاتانە بون گەورەترین پروپاغاندیان خراب پیشاندانی کمونیزم وکـمـونیـسـت بو کـە بەناوی شـیـوعی ئەیاندا بە گـوی مـەردمـا. وایان بردبوە مـیـشکی خەلکەوە کە شیـوعیکان زور دورندە و وەحشین و پیاو کوشتن لە لایان زور رەواجی هەیە ئەم مـەوضـوعـە وەها چوبوە مـیـشکی دانیـشـتـوانی ئەم وولاتانە کە بە بیسـتـنی ناوی شـیـوعـی (بلشـویک) تورە دەبونو نیـوچاوانیـان تیک ئەنا - دوای هاتـنی اوردوی سـور (جیش الاحمر) بوکـوردسـتـان رەفتـار و اکـاری وا باشیـان پیشـاندا کە ئەم هەمـو رەنجی مبلغەکانی هیتلەر بە با چو بەلام، هیشتا هیندیک میشکی واهەن دەسخەروی آنتریکات و درو و دەلەسەی فاشیستەکانن.

چەند کە سیک لەم بی میشکانە کە کتیبی دیاریو ژمارەی یەکەمی نیشـتمـانیـان خویند بووە و لایەن گریو تمایلی ایمەیان بەلای حکومەتی سووەتدا دیبو گوتبویان آرمانی کومـەلی ژ.ک بلاوکردنەوەی مـەسلەک و باوەری کومونیـزمـە ئەم قـسـەیە بیشـک لە سـەر چاوەی تەبلیغاتی فـاشیستەکان آو ئەخەواتەوە دەنا ایمە کمونیست نین ئەگەر کمـونیستیش بین جیگای هیچ اعـتراضـیک بو خەلک نیە لەم مەوضوعەدا هەیئەتی مەرکەزی کومەلە

بەیاننامەی رەسمی دەرئەکات.

نیشتمان ژمارەی ٣ و ٤ سالی یەکەم سەرماوەز - ری بەندانی ١٣٢٢

## بو چی نەگریم !

ع.بیژن

هەر چی سەر هەل ئەبرم و چاوم بەم آسمانە شینە جووانەی کوردستان ئەکەویت، ئەوەندی دەچمە سەر کانیاو و شەتاو و جوبارو و رووبارەکانی کوردستان، هەر کە شینایی دەشتو کیو و میرگو و چیمەنەکانی وولاتەکەمم دیتە بەر چاو، لەباتی شایی و شای لوغان لە سەر ئەم دلە پچکولە گوشتینە ساواو ناسکەم کوسپەییکی سەختوو گری یەکی توند پەیدا ئە بیت کە تا لە سەر چاوەی چاوم فرمیسک هەل نەکولیو بەسەر اگری دەروونما هەل نەپرژیت بلیسەو گری کوورەی دەروونم دا نامرکیتەوە.

تو خوا چون نەگریم! چون خوینی جەرگم بە جوگەی چاوما بەر نەدەمە سەر چیمەنە بی ناز و بی خاوە نەکەی کوردستان!؟ تا بەلکو گولالە سوورەییکی جووانی پی بگەشیتەوە و منیش بە نالەی زار و هاواری زاری نەخوشی لە گیان بیزار، وەک بولبولو قومریو هوزار نەک جار و بار روژی هەزار جار بە دەوری ئەم گولە آلە جووانە دابیمو بچمو بلیم:

گولیکی خوم بدادەم پیچ و تاوەش    بەآوی دیدەکانم دادەم آوەش

بە دەرگاهی ایلاهی کەی رەوابو    گول ئەز منوو دیگەری گیری گولاوەش

کە خاکی پیروزی و پر روزی و آخی بی آخ و داخی وەک مسک و عەنبەری، دار و بەردی زیر و زیو مانەندی بەش بەشو لەت لەت کراوە و هەر پارچەی بە دەست یەکیکەوە ئەنالینی.

من چون ئەبی دل بە گیتی ی خوش کەم، چون چاوم بەرایی بدا لە دونیا بنورم؟ تا ببینم کە لە سەر سفرەی رەنگین و رازاوەی خوا کردی جیهان هەموو کەس بەشی خوی هەل گرتوە و کوردی بەستەزمانیش وا لە دوورە وە وەستاوە بەداخ و حەسرەتوو کلولیوە چاوی بریوەتە شایی و زەماوەندی دراوسیکان کە بەشەکەیان لی ئەستاندوە و ایستاش کە داوایان لی ئەکاتەوە گالتەی پی ئەکەن.

تو خوا برا گەل وەرن تا لە سەر کانیاویکی ساردو و جوان کورریک ببەستین تیر تیر بو حالی زار و ژیانی نەزاری نیشتمانە جووانەکەمان بگرین، بەلکو فرمیسکی دایکی نازدار و بیچارەی نیشتماغان کە بە چاوی کانیاوا دەیرژییتە سەر گونای دەشتوو دەری کوردستانی بی ناز بە دیتنی گریانی بە پەروش وئەسرینی بەجوش و خروشی ایمە ووشک بیتەوە وتوزی دلی بکریتەوە و ئەم گروگلپەی دەرونی دامرکیتەوە.

نەا! نەا! براکان، خوشەویستەکان وا گویم لە آە و نالەی نیشتمانە کە بە کروزانەوە پیم ئەلی رولە گیان گریان کاری پیریژنانە! تا دەرگای مردن و مراندن لە سەر پشتانە شیوەن و زاری ایشی ناپیاو پەستانە! خو ایمەش خومان بە لاویکی آزا ئەزانین و مەعنای بەزین نازانین کە وابو با بچینە سەر چیا بلیندەکانی نیشتماغان بە گەوایی ئەوان پەیمانیکی برایەتی ببەستین کە وەکو ئەم چیایانە رەنگین و سەنگین و بە خوینی جەرگمان رەنگین بی، بوگەلی هەژاری کورد دوایی هینی ژیانی نەنگین بی، بییتە یارمەتی دەری ایمە بو مردن و مراندن لە ریگای رزگاریدا.

نیشتمان ژمارەی٥ سالی یەکەم ری بەندانی ١٣٢٢

## کورد لە حەیاة ئەنیسکلوپیدیاسی دا

ع.بیژەن

« کاکە پشکو گیان: لە ژمارەی سالی پینجەمی گلاویژا بە پەروشەوە ئەم باسەت بو کردبووینە کوردیو گلەییشت کردبوو کە آمانجی سیاسی راستی ی زانینی گورریوە بە پیچەوانەی هەمو دیریکو میژوویەکی کە تاایمرو کە بە پی ی (زانستی آثارە )ەوە نووسراوە رەگەزی ایمەیان بردوتەوە سەر رەگەزی تورک چاوەکانم نەت بیستووە کەسیک کە سیکی ناخوش بویی خەونی گولیەی (جذام ) پیوە دە بینیت نەوا لە ژیرەوە وە لامی ئەم تومانجە(بهتان) بە دریژی دەنووسم کە دانەری ئەنیسکلو پید یاش بیخوینیتەوە و کتیبەکەی پی تەصحیح بکات »

تا ایمرو هەر آثاریکی دیریکی کە لە ژیر خاکا دوزراوەتەوە، هەر دیریک و میژویەکی نووسراوەتەوە بی باسی کورد نیە لە هەر لاپەرە ییکیشدا باسی کورد کرابیت

به رولەی آریائی ناسراوه بەلام هەندی له نووسەرکان به پیچەوانەی ئەم راستیو حەقیقەته له کورد دواون جاریک رەگەزمان ئەبەنەوه سەر جندوکەی چاخی (عصر) سولەیمان پیغەمبەر جاریکی تر ئەمانکەن به تورک آشکرایه که ئەمه بەبی آمانج نیه و ایمەش وه ئەبی تی نەگەیشتبین حالی کورد له بەرانبەر ئەم جوره درو و دەلەسەیەدا له حالی بازرگانیک ئەچی که کووتالی آل ووالا و جوانی هەبیو کریاریکی زور زانو زرینگیشی تووش هاتبیت خەریک بی به واتەی بی ریووجی کالاکەی له پیش چاو بخاتو به هەرزانی لی بکری بازرگانەکەش وەلامی بداتەوه بلی مەتەلیکی آذربایجانی هەیه: "او تاجرن گوزی کور اولسون که ئوز مشتریسین تانیماز" برو برو من توش چاک ئەناسم کالاکەی خوشم.

یەکیک لەم کتیبانه که دەربارەی کورد دواوه « حەیاة ئەنیسکلو پیدیاسی »یه که له لاپەرەی٢٩٦٥دا باسمان ئەکات ئەلی:« کومەلیکی دو میلیون ونیو تا سه میلیون کەسی هەن بەناوی کوردەوه ئەناسرین ئەم کومەله له کەناری گومی اورمیه و وانەوه هەتا سەر ...الخ »گویا کاکی نووسەر هیچ جوره زانیاریکی دیریکی له بابەت کوردەوه نەبوه دەنا نەی نەفەرمو« کومەلیکی دو میلیون ونیو تا سه میلیون » چونکو ئەمه له صەدا صەدی درویه و تەنیا ژمارەی ئەم کوردانەی که ایستا لەژیر بەیداغی حکومەتی تورکیادا ئەژین دوای ئەم هەمو کوچ پیکردنو کوشتنه هیشتا له چوار میلیون نەهاتوته خوارەوه خو کوردی ایرانیش هەرله کیوەکانی سنووری رووسیا و ایرانەوه به کەنار گومی وورمیه و میاندوا و کیوی ئەلوەندا ئەکشیته خوار تا ئەگاته لورستان و سەر گەروی فارس پانایی ئەم وولاتەش تا سنووری عراق ئەروا خو به فەرمایشی نووسەری خوشەویست کورد له ئەفغانستان و بلوچستان داهەن کوردەکانی هیندستان، برا خوبیکانی کرمان، چەمشکه زکەکانی خوراسانیش ده گەل کوردگەلی دەور و بەری گەیلان و طالش و بەشی کوردستانی سوریه و لوبنانیش خاطری جەنابیان اینجا چه پیاویکی تیگەیشتوو باوەر ئەکات ئەم هەمو خاکه پردانیشتوه به دو میلیون ونیو تا سه میلیون کەس مەسکوون بیت به پی ی تەحقیقاتیکی که هیشتا تەواو نەکراوه ژمارەی کورد به هیچ باریک له نو میلیون کەمتر نیه دوای چەند ووتەییکی تر ئەفەرموی « ...هەر چەند صلاح الدین بەتەواوی تورکیتی

آشکرایە » ایمە خومان بە وەلام بو ئەم داوایەوە ماندو ناکەین بەلام میژوناسەکان قاقا پی ئەکەنن و گەپ و گالتەی پی ئەکەن خو باسی میدیاییکانی باپیریشمان ئەکا و ئەفەرموی « هەر وکو زانراویشە میدیاییکانیش تورکن » ئەمە سەر سامیکی سەرآسا پەیدا ئەکات بو هەمو خویندەواریکی اگادار لە دیریک؛ ایمە نازانین لە کوی زانراوە کە میدیاییکان تورک بوون گویا ئەبی ئەم زانیارانەی نووسەری خوشەویست لەبابەت میدیاکانەوە هەیەتی شتیکی جیاواز بیت لە هی زاناکانی گیتی ی؛ نا ئەمە عادەتی لە میژینەی ئەم جورە نووسەرانەیە کە مفاخری تاریخی نەتەوەکانی تر بە قسەی پروپووچ بە خویانەوە ئەنوسین سالیکیش لە چاخی حکومەتی عثمانیکاندا ئەیانگوت « فردەوسی » تورکە « زەردەشت » ترک بووە شاعری بەناو بانگ وعەصری کورد « میرزادە عشقی »بە شیعری فارسی وەلامیان ئەداتەوە ئەلی:

« زردشت دل نبود کە آسان توان ربـــود »
« حاشا قیاس دل ز چە با انبیا کنید »
« زردشت بردنی نبود این طمع چە سود »
« اما فقط بە بردن دل اکتفا کنیـــد »
« امروز قصد بردن پیغمبران کردەایـد »
« فردا بعید نیست کە قصد خدا کنید »

دیسان جی ی سوپاس و شوکرانەیە نالین کەریم خانی زەند و بنەمالەکەی نادەر شاە و... غیرە هەمو تورکن ایمە نامانەویت چیدی لەم باسە بدوین چونکو دیریکی گیتی لە پیشدا جوابی ئەم نووسەرە خوشەویستەی داوەتەوە و جەختی کردووە کە کورد نەچیتەوە سەر دەستەی هیند واروپایی و هیچ مناسبتیکی لە گەل تورک نیە.

نیشتمان ژمارەی٥ ری بەندانی ١٣٢٢ سالی یەکەم

# فەلسەفەی ژیان

ع.بیژەن

*گشت مروو ئەبی بزانن بوچی هاو توونە گیتی ی*
*هەمــو مــەردوم ئــەتــوانن بــزانــن ژیـــان چیــە*

ایوە بە بهیـستنی ناوی فەلسـەفە سل ئەبن؛ ئەپرینگینە وە و... بهیستوتانە کە فەلسـەفە واتا شتیکی گران و هەودابیکی آلوز و گری گریاوی کە کەم کەس تیەی ئەگات بەلام بەراسـتی ی ئەمـە باوەریکی زور چەوتە و فـەلسـەفـە زور زور هاسانە بە تایبـەتی فەلسەفەی ژیان.

زانا و تیگەیشتوکانی رابوردو و تازەش جەخت (اثبات) یان کردوە کە لە گیتی ی دا « هەل کەوت » نابی و لە فـەرهەنگی وەدی هینان (خلقت) دا ووشـەی (خـورایی ی - عبث ) نەنووسراوە.

با سادەکانەتر بلیم ایرو لەم جهانەدا باوەری گشـتی ی ئەمەیە پچووکترین شتیکی هەبیت یا کاریکی روودەدا « خورایی و بی کەلک »نیە ناتوانین بە هیچ شتیکی ببیژین «هەلکەوت » واتا « کـاریکی لە خـورایی »یە ئەمـەش ئەزانن کـە « زور » هەمـیشـە لە کـوبوونەوەی « کـەم » دیتـە بەرهەم ئەگـەر ایمە نەتوانین شـتـیکی پچوک بە بی کـەلک و خـورایی بزانین چون ئەسـشی بەم کـارکـازلە کـە ناوی « گـیـتی ی »یە ببـیـژن بی آمـانج دورووست کـراوە یا خـو « ژیان »ی « پووچ وخـورایـی »یە؟ کـەسـیکی زانا بیت ئەمـە نابیژیت.

ایوە کەسیکی ایشی خورایی ئەکا پیتان شیت و نەفـامە ئەگەر پیاویکش خانویک بنیاد بنی کە تەواو بوو بی ئەمەی لە ژیر سیبەریا بحەسیتەوە دەس بە تیک دانی بکا پی دەکەنن حەق تانە پیاوی زانا ئەمـە ناکا جـوتیـر کە سال دوانزەی مانگ پشـوو نادا زەوی

ئەکیلی؛ تووی پی وەر ئەکا؛ آوی دەدیری؛ درووینەی ئەکا کە خەرمانی سوور بو اگری تی بەرنادا یا خو باغەوانیک نەمامیکی چەقاند پاش چەند سال بە دیاریەوە دانیشتن کە هاتە بەر خاک بری ناکا.

کەمیک وورد ببنەوە تی بفکرن دەزانن لە (ژیان)دا نهینیو تیکەل پیکەلی نیە بیریکی گەورە دەستیکی هیزدار ویستوویەتی مشت نموونەی باریک بیو شتیکی پچوک نوینەری زور ششتی گەورە بیت .

بە چاویکی وورد توزی سەرنج بدەنە گولیکی پچوک، دەکردەوەی میروولەییکی بی هیز بفکرن آدمیزادە بهیننە بەر چاو کە لە پیشا چلون « نطفە »ییکی بی بەهایە ولە ئەنجاما چی بە سەر دیت هەموو کویرە گریەی ژیان نتان بو ئەکریتەوە پیوست نیە فەیلەسووف بن تا ئەم شتانە بزانن شتیکی ئەبی بیزانن و چاکیش لە دەست تان دیت ئەمەیە:

## بو زانین تی بکوشن، لە هەمو شتیک بیر بکەنەوە.

نیشتمان ژمارەی٦ سالی یەکەم رەشەمەی١٣٢٢

## بو چی گەورەکانی « قریش » مسلمان نەدەبوون؟ ع.بیژەن

"آخو ئەم قسانەی « محمدامین » ئەیانلیو داوای ناردراوی لە لایەن یەزدان ئەکا نەبی راست بن یا ئەم وەعدانەی بەشەرطی مسلمان بوون ئەیاندات بەجی یان نەگەیینیت؟" ئەمە پرسیاریکە کە سی (٣) کەس لەگەورە و سەروکانی (قریش) « ئەبوجەهل » و « ئەبوسفیان » و « ئەخنەس » دوای گەلی کوششت کە بو بەربەست کردنی بلاوبوونەوەو پەرەسەندنی دینی پاکی اسلام کردیان و هیوا براو بوون لەدلی خویاندا بیریان لی دەکردەوە و بەشوین وەلامەکەیدا ئەگەران بەلام وەلامی ئەم پرسیارانە تەنیا بە نووری راستی ئەدوزراوە کە ئەمیش لە دلی تاریکی پیاویکی وەک «ئەبوجەهل » و هاوتاکانی دانەبوە.

بو تەحقیق و پشکنینی ئەحوالی (حضرت محمد صل الله علیەوسلم) هەرییکە بریاری دا بە بی ئەمەی ئەوانیتر پی بزانن شەوانە بچی لە گوشەییکی خانووی پیغەمبەر

کیشک بکیشیو اگای له آکاری شەوانەی ئەم ووجوده مقدس وگەورەیە بیت. شەویکی چوون تابەری بەیان غەیری قورآن خویندن و عبادەت هیچیان نەدیت له گەرانەوەدا توشی یەک هاتن گەلیکیان لومەی یەکتر کرد کە بوچی هینده ضعیف النفس بون کە شەوانەش ناتوانن له نیزیک مالی پیغەمبەر وەدوور کەونەوە سویندیان خوارد شەویکی دیکه ئەم کارە نارەوایە دووپاتە نەکەنەوە بەلام تا سی (٣) شەوان خویان پی رانەگیرا و تا بەیانی خویان حاشار دەدا بیگومان هیزی کیشەری راستی (قوه جاذبه حقیقت) ئەمانەی وا بەسەر دەهینا و له دلیانا اقراری پی دەکردن گوتاری(محمد صلی اللەعلیه و سلم) راستە و هەر وەعدەییکی ئەیدا بەخەلک بەجی ی دەگەهینی له ایرەدا ئەم پرسیارە دیتەپیش: ئەی کەوا بوو بوچی ایمانیان نەدەهینا ؟ لەم بابەتەوە جەنابی دوکتور محمد حسینی هەیکەل له کتیبی بالاو بەنرخی « ژیانی محمد صلی اللەعلیه و سلم »دا وا ئەلی: « ...آخو بە تی پەر بوونی روژگار جمود وکونە پەرەستی له بیر دەچتەوە؟ تەنیا ئەوکەسانەی هەمیشە بە شوین تەواویتی (کمال)دا ئەگەرین و پیاوانی تیگەیشتوو دەتوانن خوله جمود بپاریزنو بەرابوردنی روژگار شتی کونو رزیو لەبیر خو بەرنەوە. ئەم پیاوانە هەمیشە ئەو راستیانە (حقایق)ی لەپیش دا باوەریان پی کردوە سەروژیر ئەکەن تا رەنگی خەرافاتو خەیالاتی کە بە مروری روژان وەک توری جالجالووکە لەدەوری راستیە بەرزەکان ئەتنریت له سەر لابەرن؛ تو ئەلەی گیانی وان کوورەییکە کە هەمیشە بیر و راستیە تازەکان لەناو اگری خویدا ئەتونیتەوە و قالی ئەکا و خلتەی لی ئەگری تا راستیە جوانە کەی پی وەدەر خا ئەم پیاوانە متعسب و خوویست نین؛ جویای راستین بەشوین ئەم وون بوەی خویان لەهەمو شوینیک و لەلای هەموکەس دە گەرین بەلام ژمارەی ئەم پیاوە گەورانە له ناو هەمو نەتەوە و قەومیکدا زور کەمە و هەمیشە له گەل خاوەندانی (مال و مقام) بەربەرەکاینو کیشە کیشیانە؛ چونکو خاوەندانی (مال و مقام )لەبیر و باوەری تازە زور ئەترسین کە مەبادا باری گیتی ی بگوریو ئەوان مال و دولەتەکەیان له دەست بچیو بینە ریزەی مەردمەوە؛ چونکو له گیتی دا بو وان له (مال و مقام) زیاتر هیچ راستی یک نیه و هیچ شتیک قابل علاقە نازانن؛ هەمو شتیکی بە تەرازوی (مال و مقام)ە کەیان بەرآوەرد دەکەن ئەگەر مالیان پی ی زور بیو جیگایان پی قایم تر بیت؛ ئەوا راستیکی گەورە

واشکرایە بەلام ئەگەر کەمترین زیانیگیان پی بگەهینیی ئەمە خەیال پلاوە. لەبەر چاوی ئەوانەی دراو کو کردنەوە آمانجی هەرە بەرزیانە (فضلیت) ئەگەر دراوی پی زور ببی راستیکی بی هاوتایە خو ئەگەر (فضلیت ) پیوستی بی هیندیک لەدەولەی تی ئەوان کە بکاتەوە بیریکی خاوە؛ هەر بەم جورە ئەگەر (دین) آرزوو و هەوا و هەوەسیان تیر بکا هیچ شتیکی لی باشتر نیە بەلام ئەگەر ببیتە پەردەییک لە نیوان خویانو آرەزوی ناپاکیان لە بەری رادەکەنو بەهیچوو پووچی دەزانن.

خاوەند جیگا و مقامەکانیش هەروا بیر و باوەری تازە بە پی ی مەقامی خویان لیک ئەدەنەوە ئەم دەستەیە بو راگرتنی مال و جیگای خویان عەوامی قوربەسەر کە خاوەنی را و تەدبیر نین و وەکوو گولە بەرروژە هەتاو لە هەرلاییک هەلات روو لەوی ئەکەن بو سەر راستی ی تازە هان ئەدەن تا ببنە بەر هەلستی بلاوبوونەوەی؛ بو ئەم کارە خانوانی ویران ودابە پیوی بیرە کونەکان کە گیانی راستی یان (روح حقیقت) دەبەر دانەماوە سەر لەنوی ئەراز یننەوە تا بەم جورە عەوامی چارەرش هەل خەلەتینن و بی بەنە میشکیانەوە کە گیانی راستی ی لە ناو ئەم دیوارە رزیوانە دایە مەردوم چووزانن کە راستیو حقیقت وەک مەلیکی کیوی چەندین سالە هەلفریوە و ئەمە کەلاکەکەیەتی کە بە خەلاتی خەیالات داپوشراوە؛ کەسیکی خاوەندی رەئیو بیری خوی نەبی لە کوی دەزانی کە حقیقت ناتوانی لە چوار دیواری (معابد)دا بیینیتەوە؛ ئەگەر بە پەررو و بالی خەیالات و خەرافات دای نە پوشن هەر تیشکەیکی دونیایەک رووناک ئەکا و وەکو هەتاو لە هەموو جیگایەک ئەداو هیچ شتیک ناتوانی ببیتە بەرهەلستی بلاو بوونەوەی... »

بەم جورە چون ئەبی توقع مان بیت گەورەکانی (قریش)کە هەر ییکە بەجوی جوی ئە چون بوپشکنینی ئەحوالی پیغەمبەریکی گەورەی وەک (حضرتی محمد صلی الله و سلم) و گوی یان لە قورآن خویندنی دەبوو ایمانیان پی هینابا لە حالیکا کە کتیبە آسمانیکەی ئەم ذاتە پەردەییکی ئەستوری لە نیوان خویانو هەوا و هەوەسی ناپاکەکەیان ئەکیشا و پیاوە زانا و تیگەیشتوکانی لەوان بە زیاتر دەزانیو دەیفەرمو « هل یستوی الذین لا یعلمون!؟ »

خوینەرە خوشەویستەکان ئەم باسەتان کە خویندەوە ئەگەر نمونەییکو لە ژیانی

عصری خومان نیشان بدەین سەرتان سوور نامینی ئەویش ئەمەیە:
آغاییکی کوردی عراق بەلکو سەردار عەشیرەتیک یەک دوو سال لەمەوبەر نامەییکی بو آغاییکی کوردی ایران نوسیبو « کە دەستی منو دامانی تو نەکەی بە هیچ باریک لە پیناوی کوردایەتی دا تی بکوشی چونکو کوردایەتی مستلزمی ئەمەیە هەمو لاوە خویندەوار و گەنجە تازە پی گەیشتوکان بینە سەر کار و ایمە لە ژووری دیوەخانا دابنشین »

ایمە نازانین خوینەرە بەریزەکان چەندە فەرق لە نیوان ئەم آغا کوردە عراقیە خوشەویستە! و « ئەبو جەهل » و « ئەخنەس » دائەنین بەلام ایمە ئەلی ین: ئەی بە برین چی دەستیکی بو زیانی نەتەوەی خوی داوینی مەردوم ئەگریت ایوەش بلین آمین!.

نیشتمان ژمارەی ٧،٨و٩ سالی.یەکەم بەهاری١٣٢٣

## « (کوردستان قوت نادریت ) »

ع.بیژەن

« ...کوردن هیچ تی ناگەن چەند پیاویکی زرینگ، هیندک مالو دراو دە گەل چەند و وەعدەییکی درو بو فریو دانی گەورەکانیان بەسە گەنجەکانیشن بە زوری ئەم گەورانە دادەمرکینین » ئەو رستەیە بیرو خەیالی دەولەتانی تورکیا، ایران و عراقە کە چەندین سالە وەک زەروو بە کوردستانەوە نوساوون، خوینی دەمژنو بی هیزی دەکەن، بەلی خوینخوری پەردەییکی ئەستوور لە نیوان عەقلو میشکدا پەیدا دەکاو دەبیتە هوی تی نەگەهیشتنو نەفامین؛ جا پیاوی نەفامیش آرەزووی سەیری دیتە میشکیو وەکوو هیتلەر دەکەویتە خولیای جهانگیریو شاهەنشاهی -ایتر نازانی ئەم هەموو دونیایە ناخریتە دەست یەکیکەوە تا آغاییتی بەسەردا بکات.

دەولەتانی تورکیا، ایران و عراقیش پیتوبەرەکەتی کوردستان زور لەمیژە چاوی سوور کردوونو خستوونیە خولیای قووت دانی ئەم وولاتە گەورەیە کەنیزیکەی .....٤ کیلومترەی چوار گوش پاناییو نو (٩) میلیونی دانیشتوو هەیە بەلام ووشیار بوونەوەی کورد قامچیکی زور توند بوو کە لە جەنگی رابوردوودا لەدەمی ئەو دەولەتە استعماری یانە درا و حالی کردن: کورد هەتا هەتایەلە ژیردەستی ئەوان دانامینیتەوە و بی گومان

حەقی خوی داوا دەکا هەر وەکو کردیشی بەلام عصبەالامم « جامیعەی میلەل »یا وەکو بویژیکی کورد بژیویتی: «کوتەکی دەستی میستەر هیندەرسون » چلون کە نەیتوانی ببیتە هوی راوەستانی آشتی لە گیتی دا هەر وەها حەقی ایە و زور نەتەوەی پچووکی دیکەشی خستەگوری تەماعی خاوەنەکەی خویەوە.

دوو روویی، تەزویر و حەق کوژی ئەو « کارخانەی فەساد »ە لەلاییکا حەقی ایە لە معاهدەنامەی (سەور)دا تصدیق دەکاو لە لاییکی دیکەشەوە (پەیمانی لوزان) قیامی کمال پاشا بە رەسمی دەناسیو اجازەدەدا سەر لەنوی کوردستان لەنیوان تورکیا ، ایران، عراق و سووریادا بەش بکریت سەیری ئەم راستی و حقیقتە! سەیری ئەو عدالتو دادپەروەریە!! سەیری ئەم شەرەف و ویجدانە!!!

هەموو کەس دەیزانی کرداری عصبەالامەیکی وەها عادل!! خوینریژیکی وا گەوەری (کە چەند سالە دونیا و دانیشتوکانی لە اگردا دەسووتینی و چەندین هەزار دایکی لە شینی رولە شیرینەکانیاندا دەستوئەژنو - داناوە) بە شوینەوە هەیە.

هەر لەو عصبەالاممەش بوو بە کرداری نارەوای خوی دەبارەی کوردی چارەرەش ماوەی بەستنی زور معاهدەی دا بە ایران و تورکیا بو قتلی عامی کوردی بی چەک و سلاح ئەم هەموو خوینی کوردەی لە نیوان دوو جەنگ دا رژاوە گشتی وەبالی ئەستوی «کومەلی تەزویر » و « کارخانەی فەساد » واتا: (عصبەالامم - جامعەی میلەل)ە.

کوردی مظلووم و چارەرەش هیندی دەرد و داخ! زورەو ئەوەندەی ظلم لی کراوە تا پیاو یەکیک لەم دەردانە دەهینیتە بەر چاو بو چارە کردنی یا بیر لە ظلمیک دەکاتەوە بو لابردنی هەزارانی دیکەی بەشوینەوە دینو لەبەر چاویا ریزە دەبەستنو هیزیکی تایبەتی کە تەنیا مظلومان و ستەمدیتوان هەستی پی دەکەن دەکاتە سەر رەوانو فرمیسک وەکو بارانی بەهاری لە چاو هەل دەکولیو پەردەی حەسرەتو کلولی ئەو هەموو دەرد و ستەمانە لە پیش چاو وون دەکات.

دەمەویست باسی قووت دانی کوردستانتان بو بکەم کە تورکیا و ایران و عراق بە هوی پەیمانی سالی ١٩٢٥ و معاهدەی شوومی سەعدآباد پلانیان بو داناوە کە چی کردارە نارەواکانی عصبەالامم هاتەوە بیرم و شاهەودای ووتاری لە دەست وەرگرتم باسیشم

کرد ئەو حکومتە زورکار و استعماری یانە لە جەنگی رابوودوودا بویان ثابت بوو کە کورد هرگیز چاو لە حەقی خوی ناپوشیت بویە کەوتنە سەودای لە ناو بردنی کورد لە تورکیا زمانی کوردی یاساغ کرا قتلی عام و تەهجیر بە شیددەتیکی بی مانەند هینرایە اجرا کردن، لە ایران پیاوانی تیگەیشتو خرانە بەند و زیندان بو لە ناوبردنی آساکانی (عادات) میللی کورد هەزار جوورە پلان ریکخرا بە لام گەنجانی کورد بە هیممەتیکی بی مانەند، بەکوششتیکی بی ووچان، بە نەترسانیکی سەرآسا و بە یارمەتی هیزی شیرراوەی میللیەت و معجزەی آزادی لە بەرانبەر ئەم هەموو بیدادیە (کە لە بەر چاوی هەموو دەولەتە گەورەکانی گیتی کە دەیان گووت جەنگی رابوردویان بو وەرگرتنی حەقی مظلوم لە ظالم کردبوو لەایە دەکرا) دلیرانە و شیرانە راوەستان، شەو و روژ بو ووشیار کردنەوەی لاوان تیکوشان سوپاس بو خوا ماندوو بوون و کوششتیان بە فیرو نەچوو ایستا لە گشت شوینیکی کوردستان کومەلی سیاسی بنیاد نراوون، ایتر ایستا هیزی تەنیا و تاک تاک نین کە بو رزگار کردنی و تیکخستنەوەی پارچەکانی کوردستان کوششت دەکەن بە لکو هیزی کومەل، هیزی گشتی کورد خراوەتە مەیدان اەو نیروە پنهانی وە مرمووزە وەکو بەرداش هەرکاتی دەست بە کاری سووران ببی دوژمنانی کورد لە ژیر سەنگینی خویدا پی مال دەکات.

اەو گەورانەش کە حکومتانی تورکیا، ایران و عراق بیریان لێ کردوتەوە فریویان دەن و بی یان کەنە مانعی قیامی لاوانی کورد هیندە بی فام نین اەوانیشن دەزانن، دواروژیان دەگەل آزاد بوونی کوردستان بەستراوە تەوە اەگەر کوردستان آزاد نەبی، اەگەر قومی کورد زنجیری دیلی لەشان و ملی دا نەمالدریت و حکوومتیکی مستقل لە کوردستان دانەمزریت اەوانیشن ناتوانن بژین مەگەر لە بەندیخانەکاندا؛ مەگەر لە جیگایانی دوور لە وولاتی خویان لە ژیر چاوە دیری سەر بازانی تینوو بەخوینی سەری خویانو مال و مندالیان بویە بەشی زوریان باسکی هیممەت یان هەل مالیوە و داوینی مەردایەتیان بە لادا کردووە بە کویرایی چاوی دوژمنان، شان بەشانی لاوان، لە ژیر فەرمان و پیشوایی کومەلانی سیاسی کورد بو آزاد کردنی نیشتمانی خوشەویست تیدەکوشنو هیچ شتیک نابیتە مانعی کاریان.

ئەگەر هیندیک نەفام دەسخەروی درو و دەلەسەی دوژمنان بووبن لازمە بزانن:کومەلانی سیاسی کورد هەرکاتی ارادە بکەن وایان بە سەر دینن وەکو نە هاتبنە دونیا ایتر وە بالی خویان وە ئەستوی خویان # و ماعلی الرسول الاالبلاغ.

کەسانیکی نووسراو و هەلبەستمان بو دەنیرن لازمە لە سەر روویەکی کاغەذ بە ئەندازەی لاپەرەی ئەم ژمارە بە پاک و خاوینی بینوسن؛ نیوو نیشان و ژمارەی ئەندامەتی، جیگای دانیشتن و تەشکیلاتی کومەلیان زور چاک لە سەرەوەی نووسراوەکەدا دەرج بکریت
گەرینەندەی چاپەکانی کومەلەی «ژ . ک» ع . بیژەن ـ ٢

حەول و تێکۆشانی بەرێوبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک لە پتەوکردنی ڕیزەکانی گەلی کورد و هاندانیان بۆ خەبات و کوردایەتی و بردنە سەری هەستی برایەتی و یەکێتیان، هەروەتر حەول دانیان بۆ بوژاندنەوەی زمانی کوردی و پەرەپێدان بە نووسین و خوێندنەوەی کوردی لە کەس شاراوە نییە و لە زمان ئەو کەسانەوە خۆشە بۆ باس کردن کە لە گەڵ واقەعەکە بوون و لە نیزیکەوە بە چاو دیتوویانە ئەو نیشتمانپەروەرانە بە چ هەست و ئیمانێکەوە شەو و ڕۆژ لە خزمەت گەل و نیشتمانیان دا بوون، زۆر کەرەت لە دانیشتن و وتوویژ کردن لە گەڵ کۆنە پیاوان و ئەو مرۆڤانەی شارەزای ئەو سەردەمەن هەستم بەوە کردووە و پرسیارم بۆ هاتووەتە پێش کە ئایا ئێمەی گەلی کورد لە سەردەمی ئێستا لە چاو پەنجا ساڵ لەوەی پێش لە زۆر بابەتانەوە بەرەو دوا نەچووین و بە پێچەوانەی مێژوو جووڵانەوەی کورد بەرەو دواوە نەچووە؟!

خوێنەرەوەی هێژا ڕەنگە حەقی بێ و بڵێ ئەوە بۆچوونێکی چەوت و دوور لە زانست و تەتەوری کۆمڵگەیە! خۆ منیش پێمخۆشە وا نەبێ، بەڵام جوابی دەیان پرسیار و فاکت و بەراوەردی ئەوسەردەم و سەردەمی ئێستا لە عاست دەیان حیزب و ڕیکخراو و ڕێبازیان و بە فیڕۆدانی خوێنی هەزاران شەهید و پێشمەرگەی کوردستان لە لایەن سەرۆکایەتی ئێستای کوردستان چۆن وڵام دەدینەوە؟!

پەنجا ساڵ لەوەی پێش کۆمەڵەی ژ.ک بە بێ هیچ شەرم و شاردنەوەیەک باسی ستراتێژی کوردی دەکرد و بیری کوردستانی یەکگرتوو و سەربەخۆی دەبردە ناو کۆمەڵانی خەڵک و حەولی بۆ پەرە پێدانی ڕێکخراوەکەی خۆی لە بەشەکانی تری کوردستان دەدا، بەڵام ئێستا پێشڕەوانمان باسی ئیسقلال و سەربەخۆیی هیچ، باسی خودموختاریش بە بن لێوەوە دەکەن و ڕۆژێ سەد جار باسی لە هەر ئێرانێک ئێرانیترین و سوێند خواردن بە تەواویەتی خاکی ئێران و عێراقمان گوێ لێ دەبێ!

کاتێک خەباتکەرانی پارچەیەکی تری کوردستان پەنجا ساڵ لەوەی پێش لە خاکی خۆیان لیان دەقەوما و دەهاتن بۆ بەشێکی تر بە باوەشی گەرم پێشوازیان لێ دەکرا و ئەوانیش هەر وەک خەباتگێرێکی ئەو بەشەی کە هاتوونە ناوی دەستیان دەدا چەک و خەباتی خۆیان بە بێ جیاوازی لە گەڵ برایانی ئەو دیو درێژە پێدەدا، بەڵام ئێستا ئەگەر

لیـــان نەدرێ و تیـرۆر نەکـرێن و بە زیندوویی و بە کـوژراوی تەحـویل نەدرێنەوە، دەبێ شوکرانە بژێر بن!

رەنگە کـەس لە بیـری نەچووبێـتـەوە کە چۆن سولەیمان مـوعـینی و هاوڕێکانی لە لایەن "خـەباتکەرانی" ئەو دیوی کـوردسـتـان بە مـردوویی و بە زیندوویی تەحـویلی شای ئێـران درانەوە، یان سـەردەمی رووخـانی شـای ئێـران چۆن لە لایەن "خـەباتکەرانی" کـوردسـتـانی ئێران پێش بە پێـشـمـەرگەکانی ئەو دیوی کوردستان دەگـیرا و داوای "عدم تعرض" و دانانی چەکیان بۆ هاتنە ژووری ناو کوردستان لێ دەکرا!

خۆ رووداوەکانی دوای سالانی ١٩٩١یش لە خوارووی کوردستان ئەوە هەڵ دەگرێ کە چەندین کـتـێـبیی لە سـەر بنووسرێ و بە بێ شک بە تالترین و بێ سەرەوبەرەترین و کورد بە کورد کوشترینی رووداوەکانی سەد سالەی کوردستان تۆمار دەکرێ، لە ماوەیەکی کـەمی سێ چوار سـالەدا شـاهیـدی دەیان شـەری کـورد لە گـەڵ کـورد، هێـرشی کـوردی پارچەیەکی کـوردسـتـان بۆ سـەر پارچەیەکی تر، تیـرۆری دەیان پێـشـمـەرگەی رۆژهەلاتی کوردستان لە ناو خاکی ئازاد کراوی کوردستانی خوارو و"حکومەتی کوردستان" بووین!

ئەوانە و هەزاران نموونەی تری ئاکـاری "سـەرکـردە" و "پێـشـرەوانی" ئێـسـتـای کـورد وەک دزی، بێ ئەخلاقی، تەماح دەناموسی خەڵـک کردن، ماڵ و دارایی مـیللەت فـرۆشتن بە داگـیرکـەر و... ئەو پرسـیـارە ناهێنێـتـە پێش کە رەوەندی شـۆڕشی کوردسـتـان بەرەو دوا چۆتەوە و بەرەو پێش نەچووە!؟ ئایا ئەحزاب و رێکخراوی سەردەمی ئێستای کـوردستان لە لاپەڕەکانی مێژوو رووبەڕووی ئەو پرسیارە نابنەوە کە لە ماوەی خەباتی خۆیان چیان بۆ گەلی کورد و نیشتمانەکەیان کرد!؟

باشترە ئەو باسە کە هەویرێکە ئاو زۆر هەڵدەگرێ و ئێمە لە مەبەستی خۆمان دوور دەخـاتەوە بەوە دوای بێنم کە وەبیـر ئەو "سـەرکـردە" و " پێـشـڕەوانە" خـەمەوە کـە هەروەک چۆن ئێـسـتـا پاش پەنجـا سـاڵ بە دەیان دوکـتـۆر و زانا لە سـەر رووداوەکـانی سـەردەمی کۆمـەڵەی ژ.ک و کۆمـاری کـوردستان خـەریکی لێکۆڵـینەوە و مێژوو نووسـین، ئەوانەی ئێـسـتـاش لە دەستی نووکی تیژ و جـەرگبـڕی قـەڵەمی مـێژوونووسـانی داهاتوو رزگـاریان نابێ!

کۆمەڵەی ژ.ک هەر دەهات و پەرەی دەستاند و لک و پۆپی داویشتە بەشەکانی تری کوردستان، گۆڤاری نیشتمان ببوو بە چقڵی چاوی حکومەتەکانی ئێران و عێراق، بە هەموو لایەک لە حەولی دیتنەوە و لەبەین بردنی دا بوون، تەنانەت شکیان کەوتە سەر چاپخانەی کابرای ئەرمەنیش و وایان لێ کرد کە زۆر ترسا، بەڵام چیان وەدەست نەکەوت، زەبیحی هەستی بەوە کردبوو کە برادەرە ئەرمەنییەکەی زەختی زۆری لە سەرە و وای لێهات کە شەوانە لە کاتی چاپکردنی نیشتمان لە ترسان نەدەهاتە چاپخانە بەڵام چاپخانەکەی بۆ زەبیحی لە رووی دۆستایەتی و رەفاقەت بە جێ دەهێشت.

بە دوای دەرکردنی نیشتمانی ژمارە ٧، ٨ و ٩ بیری دروست کردنی چاپخانەیەک لە سابلاغ بوو بە بڕیاری کۆمەڵە، ئەو بیرەش بە جێ بوو چوون هەم کۆمەڵە زۆر گەورە ببووەوە و هەم بە چوونی تەورێز کاتیان زۆر لێ دەگیرا و خەڵک تامەزرۆی هەرچی زیاتری بڵاوکراوەی وەک نیشتمان بوون، کاک محەمەدی شاپەسەند ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک و نووسەری نیشتمان بە نێوی "م . آذر" لە نووسراوەیەکی لە "کوردستانی نوێ"دا دەنووسێ:

> ... دوای (٧ و ٨ و ٩)نیازمان وابو (نیشتمان) لە (مەهاباد) چاپ بکەین، مەکینەیەکی نیوفولسکاب و هێندێک حەرفمان دەست کەوت و گوێستمانەوە بۆ مەهاباد، پێش ئەوەی دەست بکەین بە چاپی ژمارەیەکی نوێ زەبیحی بەسەردا گیرا، پێم خۆش نەبوو چاپخانەکە بێ نیش بمێنێتەوە، بەدەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی (ئاوات) چاپ و بڵاو بکەمەوە، ناوەرۆکی (ئاوات) بریتی بوو لە پارچە پەخشانێکی رەمزی بە ناوی (برای دوورم) سەبارەت بە گیرانی زەبیحی...

# گیرانی زەبیحی و سەغیر بوونی کۆمەڵەی ژ.ک

هەر وەک ئاگادار کران بە دوای دەرچوونی نیشتمانی ٧، ٨ و ٩ یانی لە هاوینی ساڵی ١٣٢٣(١٩٤٤) زەبیحی لە گەڵ دوو نەفەر لە ئەندامانی چالاک و هەڵسوراوی کۆمەڵە قاسم قادری و دڵشاد رەسوڵی لە ورمێ بە دەستی حکوومەتی شای ئێران دەگیرێن.

لە سەر گیرانی زەبیحی و هاورێکانی لە لاپەڕەکانی مێژووودا زۆر کەڕەت لە لایان زۆر نووسەری خۆیی و بێگانە نووسراوە و تا رادەیەکی زۆریش گێرەشێوێنی کراوە!

لەو نووسراوانەی تا ئێستا نووسراون و بە دەستەوەن، ئەوەی کە بە دوور و درێژیی لەو ڕووداوە دواین کتێبی سەر لەشکر ئەحمەدی زەنگەنەیە کە لێرەدا دەقی قسەکانی زەنگەنە دێنمەوە:

> لە سەرەتای ئابانی ١٣٢٤(نۆڤامبری ١٩٤٥) بە تیپی رەزاییە و هەنگە ژاندرمەرییەکەی خەبەر گەیشت کە هەیئەتێکی تەبلیغاتی لە لایەن حیزبی کۆمەڵەی مهاباد و قازی محەممەدەوە بەرەو رەزاییە دێن تا لەوێ لە گەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی رەزاییە دیدار و وتووێژ بکەن و ئەوانیش وەکوو خۆیان بۆ نافەرمانی هان بدەن. دەگوترا کە ئەو هەیئەتە هێندێک سەنەد و بەڵگەی پێیە و بڕیار وایە بچنە ماڵی زێرۆ بەگی بەهادوری (لە کوردە تێکدەرەکانی عێراقی) لە گۆکیا و کۆبوونەوەی دیدار و وتووێژ لە گەڵ سەرۆکە کوردەکانی رەزاییە لە ماڵی وی بکرێ. بۆ وەدەست هێنانی ئەو سەنەد و بەڵگانە بەر لەوەی هەیئەتەکە بگاتە جێ لە گۆکیا (ناوی گوندێکە لە محاڵی بالانیش کە زێرۆ بەهادوری لە وێ دەژیا) ژمارەیەک ژاندارم لە مێشەڵانی خوارووی بالانیش لە سەر رێگای مهاباد تاقەت کران تا هەر کە چاویان بە هەیئەتەکە کەوت بیانگرن. هەر کە ئەو ئوتومبیلەی هەیئەتەکەی تێدا بوو وە دیار کەوت ئەو ژاندارمانەی لە وێ لە کەمینیان دابوون فەرمانی راوەستانیان پێدا، بەڵام شۆفیرەکە گوێی نەدایە و لە سەر لێخوڕین بەردەوام بوو و لە نێو ئوتومبیلەکەوە

دەستیان کرد بە تەقە لە مەئموورەکان. بە بەرز بوونەوەی دەنگی تەقە خۆڕاگری ژاندرمەکان توند و تیژتر بوو، ئوتومبیلەکە گەمارۆ درا و سەرنشینەکانی تەسلیم بوون. ئەوانە جگە لەو دوو چەکدارەی کە تەقەیان کردبوو بریتی بوون لە سێ کەس لە ئاژیتۆرەکانی حیزبی کۆمەڵەی مهاباد: عەبدولڕەحمانی زەبیحی و دلشادی ڕەسوولی و قاسمی قادری. (عەبدولڕەحمانی زەبیحی و دلشادی ڕەسوولی کە هەڵاتوون ئێستا لە عێراقن). لە ئوتومبیلەکە و چەمەدانەکانیاندا هەشت نامە دۆزرانەوە کە دەبوو لە لایەن قازی محەمەدەوە بۆ میرجەعفەر باقرۆف ڕەئیس جمهووری ئازەربایجانی شووڕەوی بە ڕێگەی کۆنسوولی شووڕەوی لە ڕەزاییە بنێردرێن. نامەکان بە زمانی کوردی بوون. لە یەکێک لە نامەکاندا کە بە فارسی وەرگێڕدرا قازی محەمەد ئاماژەی کردبوو بە سەفەری خۆی بۆ باکۆ و دیتنی سەرانی شووڕەوی و وتوویژی دۆستانەی خۆی لە گەڵ ئەوان باس کردبوو و داخی دەربڕیبوو کە هیچکام لەو بەڵێنانەی پێی درابوون جێ بەجێ نەکراون. نێوەرۆکی نامەکانی دی بریتی بوون لە داوای چەک و تەقەمەنی بۆ ڕاپەرینی کوردان لە دژی حکوومەتی نێوەندی ئێران، تەواو کردنی داودەزگای وێستگەی ڕادیۆیی، ناردنی کاغەز بۆ ڕۆژنامە و تەبلیغات، دانانی چاپخانە و هتد...

گیراوەکان قۆڵبەست (تحت الحفظ) ناردرانە ڕەزاییە و ئەو خەبەرە گورج ناردرا بۆ ستادی ئەرتەش و داوا کرا دەستبەجێ وەسیلەی گواستنەوە بنێردرێ بۆ بەندەری شەرەفخانە تا بێ ئیستگرتن لە تەورێز بنێردرێنە مەرکەز (تاران). (دیارە ئەگەر لە ناردنی ئەوانەدا تەنەخی کرابا و شووڕەوییەکان ئاگادار بوویان بێ شک خۆیان تێ هەڵدەقوتاند و نەیاندەهێشت ئەوان بنێردرێنە تاران) دەستبەجێ گیراوەکانم ناردە بەندەری گوڵمانخانە و لە وێوە بە کەشتی ناردمنە شەرەفخانە و لە وێ بە وەسیلەیەک کە لە لایەن ستادی ئەرتەش ئامادە کرابوو گیراوەکان برانە تاران و درانە دەست ستادی ئەرتەش. سەنەد و بەڵگەکانیشم بە ئیستوارێکدا کە خۆی گۆڕیبوو و جلکی شوانانی دەبەر کردبوو لە ڕێگەی مهابادەوە ناردە تاران و دوای ٤٨ سەعات گەیشتە دەست ستادی ئەرتەش. ئەو سەنەدو بەڵگانە دواتر لە ئەنجومەنی ئاسایشی کۆڕی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە کەلکی (سکالای) ئێران سوودیان لێ وەرگیرا. لە تاران لە سەرهەنگ حەبیبوڵای دەیهەمی ئەفسەری ڕوکنی دووی ستادی ئەرتەشم بیست کە گوتی: « هەر کە سەنەد و بەڵگەکان گەیشتن دەستبەجێ هەڵسەنگێندران و ناردران بۆ ئاغای تەقی زادە سەفیری ئێران لە ئینگلستان تا لەوێوە بنێردرێن بۆ حوسێنی عەلا سەفیری ئێران لە ئامریکا تا لە ئەنجومەنی ئاسایشی کۆڕی نەتەوە یەکگرتووەکان

کەلکی لێ وەربگرێ. »

لە بەر ئەوەی کۆپی ئەو سەنەد و بەڵگانە کاتی گیرانی ڕەزاییە لە نێو چووبوون من حەولم دا لە ستادی ئەرتەش یان وەزارەتی کاروباری دەرەوە پێشینەیان بدۆزمەوە بۆ ئەوەی لەم بیرەوەرییانەدا بیانهێنم، بە داخەوە سەر نەکەوتم.[1]

بە رای من بەشێک لەو زانیاریانەی سەر لەشکر زەنگەنە وەراستی ناچن و پێش هەموو شتێک تاریخی بەسەرهاتی ڕووداوەکە هەڵەیە بۆ:

ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ی ١٤ سالی یەکەم چوار شەممۆ ٢٤ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ دەنووسێ:

## مزگینی!!

وەلام گەیشتوە کە سی کەس آزادیخوای ایمە :عبدالرحمن ذبیحی و دلشادو قاسم قادری کە هشت مانگ لەمەوبەر لەلاین کاربەدستەکانی فاشیست مابی ایرانی بە ناحەق بەدیل گیران و یەکسەر بردنیانە تاران لەحمدی خودا دەگەل آزادی ایمە ئەوانیش آزاد کراون و ئەم روژانە خزم و کەس و برایان بەوان شاد دەبن .

دیسان ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی ١٧ سالی یەکەم چوارشەممۆ ١ رەشەمە ١٣٢٤ـ ٢٠ فوریە ١٩٤٦ دەنووسێ:

## دیسان مزگینی!!!

لە ژمارەی ١٤دا وەلامی آزاد بونی برا گیراوەکانمان بە عرض خوینندە وارانی خوشەویست گەیاند لەدوای بلاوبونەوی بری قسەو باس پەیدا بوو ایمەی ناهومید و بەلکو لە نوسینی ئەو مزگینیەش پشیمانیمان کیشا بەلام خودای بەرز دلی ایمەی

---

١- تەرجمە لە فارسییەوە لە لایەن کاک حەسەنی قازی

نشکاند و مزگینیەکەی بە راست گیراین کە سوپاس بو خودا هەر سیکیان چەند روژە گەیشتونە تەوریز پیشوای خوشەویست یەکی دو هەزار تمەنی خەلات کردون.

لە رۆژنامەی کوردستان ژمارەی ١٨ ساڵی یەکەم شەممۆ ٤ی رەشەمە ٢٣ فوریە ١٩٤٦ زەبیحی سپاسی خەڵک لە مەر بە خێرهاتنەوەی خۆی دەکا:

## سوپاس و معذرت

عدەیەک لە برایان کە بە تشریف هینانی خویان مفتخریان کردبوم لە بەر ماموریتیک کە پیم رجوع کرا نەم توانی بچمەوە خذمتیان و حضورا سوپاسی بی پایانی خومیان پیشکەش بکەم ؛بە هوی ئەم چەند ووشەیە داوای لی بوردن دەکەم .

ایتر بژی کوردستانی آزاد !

عبدالرحمن ذبیحی

رۆژنامەی کوردستان لە ژمارەی ١٩ ساڵی یەکەم دوشەممۆ ٦ی رەشەمە ١٣٢٤ ـ ٢٥ی فوریە ١٩٤٦دەنووسێ:

برایان عبدالرحمن ذبیحی و دلشاد کە لە پیشدا وەلامی آزاد بونی ئەوانمان دابو بە شانازیکی زور شەوی ٣. ١٢. ١٣٢٤ واردی مالە خویان بون و چاوی برا و آزادیخوایەکان و کەسوکاریان پی روون بو. برا قاسمی قادری لەبەر ضعف مزاج چەند روژیک لە بیمارستانی شوروی لە تەوریز دەمینیتەوە ئەم روژانە بە هومیدی خودا دەگەریتەوە لە خودا دەخوازین برا و کەسوکاری ئەم خوشەویستانە هەمیشە بە یەکتر شاد و دلخوش بن.

مامۆستا هەژار شاعیری میللی کۆمار لە رۆژنامەی کوردستان ژمارە ٢٦ ساڵی یەکەم دوشەممۆ ٢٧ی رەشەمەی١٣٢٤ ـ ١٨مارس ١٩٤٦ بە بۆنەی ئازاد بوونیان شێعریان بۆ دەڵێ:

# بو هاتنەوەی ذبیحی و دلشاد (و قادری )

"هەژار"

فریشتەی خوشی سەر چاوەی سرور
بابی هەژاران ئەی ............

نازانم توچی لەچی خولقاوی
گیانی شیرینی و بینایی چاوی

روشن فکریشم سەرم سورماوە
ماکەی خولقانت کام گل واوە

نا، نا تیکەییم وەختی کردگار
بەزەیی داهات بە کوردی هەژار

ایرادەی فەرمو کورد نەبریتەوە
توشی خوشی بی ببوژینەوە

لە خاکی سەری کوردی خاک بەسەر
لە آوی چاوی لاوی دەربەدەر

تیکەلی کردن توی هینا بەر هەم
بویە هەر روحمی بومان هەمو دەم

چاکەی تو بومە گەیوەتە پایەک
صد زمان بیلی لە کیوە کایەک

میللەت رزیبو بە زیندان و بەند
رزگارت کرد و مەدرەکت بو سەند

بەری کەوشی تو بالی هومایە
شاهیدن بو من ئەو سی برایە

زور جزیات کیشا تا دەر چون لەبەند
بەدیداری وان ایمەت کرد خورسند

بیژەن کەتوم دی بروات ببی پیم
جیژنی استقلال تازە بووە لیم

"دلشاد "هەر شادبی وەک شادت کردم
لە زیندانی خەم آزادت کردم

پیاوی آزاو ژیر بەخیر بیتەوە
دوامین گری ی دل بەو دەکریتەوە

ئیوە خوتان نالە پیناو میللەت
بو ایە دیتو آزار و ذیللەت

پیتان دل خوشە دایکی نیشتمان
روو سوورن لە راست ناموسوو و یجدان

کوتایو نەکرد بو سەر بەرزی گەل
بەلان رووی رەش بی لیبی قراندن قەل

قرەی قەل ایوە ی خستە زیندانی
ئەوەش انتقام دەردی دەزانی

یا خوا هەر بژی پیشوای عەزیز
سەروکی گەورە سەربەرز و بەریز

شادە کورد هەتا پیشەوا هەیە
خودا شادمان کەی تا دنیا هەیە

بژی هوردوی سوور بەفەتح و ظەفەر
وەک بو هەژاران خوی کردە لەمپەر

وەک لەو نووسراوانە دەردەکەوێ ئەو تێکۆشەرانە رۆژی ٣ی مانگی رەشەمەی ساڵی ١٣٢٤ (٢٢ی فێڤرییەی ١٩٤٦) گەیشتونەوە ماڵی خۆیان. یانی بە پێی ئەو نووسراوانەی **کوردستان** دەبی لە نهایەتی ڕێبەندانی ١٣٢٤ (نێوەراستی فێڤرییەی

١٩٤٦) لە زیندان ئازاد بووین.

هەم بە نووسراوەی **کوردستان** و هەم بە پێی قسەی بنەماڵەی زەبیحی (بروانە وتووێژ لە گەڵ رەعنا زەبیحی) ئەو سێ کەسە زیاتر لە هەشت مانگ لە زیندان بوون، یانی ئەگەر لە رۆژی ئازاد بوونیانەوە هەشت مانگ بچینە دواوە واتە نهایەتی جوزەردانی ١٣٢٤ (ئێوەراستی جونی ١٩٤٥) دەبێتە ئەو مانگەی تێیدا گیراون کە لە گەڵ تاریخەکەی زەنگەنە (ئابان یان خەزەڵوەری ١٣٢٤) فەرقی زۆرە. رەنگە ئەو تاریخەی بۆیە وا لێ کردبێ کە لە گەڵ داستانە دروستکراوەکەی لە سەر سەفەری قازی بۆ باکۆ و نامە نووسینی قازی بۆ باقرۆف یەک بگرێتەوە.

لەو نووسراوانەی کە بە دەستەوەن وا دەردەکەوێ کە هۆی گیرانی ئەو سێ کەسە ئەوە نەبوە کە زەنگەنە دەڵێ. کاک محەمەدی شاپەسەند لە رۆژنامەی **کوردستانی نوێ** ژمارە ١١٩ یەکشەمە ٢٤ـ٤ـ١٩٩٤ دەنووسێ:

> گیرانی زەبیحی و هاورێکانی:
>
> بە پێچەوانەی نووسینی سەرلشکر زەنگەنە، زەبیحی و هاورێکانی کاتی گەرانەوەیان لە پەیمانی سێ سنوور گیران.

لە سەر پەیمانی سێ سنور قسە و باس زۆرە و تا ئێستاش بە تەواوی ساغ نەکراوەتەوە کە پەیمانێکی ئاواو و کۆبوونەوەیەک بە بەشداری نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کوردستان لە چیای دالانپەر کراوە یان نا ؟! وە یان ئایا زەبیحی بەشداری ئەو کۆبوونەوەی کردووە یان نا ؟! بەڵام لە سەر گیرانی زەبیحی و قادری و دڵشاد کە هەر سێکیان ناویان لەولا و ئەولا هاتووە کە گۆیا لە گەرانەوە لە پەیمانی سێ سنور گیراون شک و گومان نییە.

لێرە دا مەبەست زۆرتر ئەویە کە بەرپەرچی بۆچوونەکانی زەنگەنە بدەمەوە کە زەبیحی و هاورێکانی لە سەر ئەوە نە گیراون کە نامەی قازی محەمەد بۆ کونسوولی شوورەوی بەرن بەڵکو ئەو سەردەم کە ئەوانە گیراون کۆمەڵەی ژ.ک لە هەرەتی جم و

جۆڵی دابوە و تەنانەت ئەو کات قازی محەمەد سەفەری دووهەمی باکۆشی نەکردبوو تا لە "نامە گیراوەکاندا" قەول و قەراری خۆیان وەبیر باقرۆف بێنێتەوە!

دوکتور عەزیزی شەمزینی کە لە سەردەمی ژ.ک و دوای ژ.ک یش یەکێک لە هەڵسوڕاوانی جوڵانەوەی کورد بووە و بە درێژایی ئەو ماوەیە دۆستایەتیکی بەتینی لە گەڵ زەبیحی هەبووە لە تێزی دوکتوراکەی "جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان" کە لە لایان دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە عەرەبییەوە وەرگێردراوەتە سەر کوردی دەنووسێ:

> دوای وەرگرتنی قازی محەمەد لە ریزی کۆمەڵەدا توانی لە ماوەیەکی کەم دا سەرکردایەتی کۆمەڵە بگرێتە دەس. هەر بە هەمان شێوە شاری مەهابادی کۆنترۆڵ کرد و توانی دەس بە سەر هەموو کار و باری بەرێوەبردن دا بگرێ. دیارە نفوزی قازی محەمەد دەسەلاتێکی زۆری پێ دابو. زۆری پێ نەچو قازی توانی سکرتێری کۆمەڵە عەبدولرەحمانی زەبیحی، محەمەد دلشاد و کەسانێکی تر لە کۆمەڵە و لە بەرێوەبردنی شاری مەهاباد دوورخاتەوە و لەباتی ئەوان کەسانێکی تری دانا کە لە راستیدا بەو ئەندازەیە بەتەنگ جوڵانەوەکەوە نەبون وەک مەلا حسێنی مەجدی، محەمەد حسێن خان، حەسەن تیلو، قاسم ئیلخانی زادە، ئەحمەد ئاغا ئیلخانی و کەسانێکی تر. لەوماوەیەدا پێوەندی نێوان قازی محەمەد و حزبی تودە زۆر خراپ بو. لە راستیدا ئەم ناکۆکیە ناکۆکی نێوان کۆمەڵە و حزبی تودە بو کە پاشان قازی تێوە گلا. حزبی تودە دەیویست لە کوردستاندا شاخەی تایبەتی هەبێ و کۆمەڵە لەم بارەیەوە لاری هەبو بەڵام پاش پێکهوەنانی دو کۆماری ئازەربایجان و کوردستان و هەڵوەشانەوەی شاخەکانی ئازەربایجانی حزبی تودە، ناکۆکیەکە بە شێوەیەکی هێمنانە چارەسەر کرا.
>
> دوای ئەو گۆڕانکاریانە رووداوی تر هاتە پێش. دەوڵەت عەبدولرەحمان زەبیحی و محەمەد دلشادی گرت و بە دەسبەسەری رەوانەی تارانی کردن. ئەوان تا ساڵی ١٩٤٦ لەوێ مانەوە. کۆمەڵانی خەڵکی مەهاباد بۆ تۆڵەسەندنەوە بریاریان دا پەلاماری فەرمانبەرە ئێرانیەکانی ناو شار بدەن و وەک بارمتە رەفتاریان لە گەڵدا بکەن و بەم جۆرە دەوڵەت ناچار کەن زەبیحی و دلشاد ئازاد کا. بەڵام قازی دەرفەتی ئەم کارەی نەدا و فەرمانبەرە ئێرانیەکانی بێ زیان لە مەهاباد دەرباز کرد. ئەو دەیویست مەسەلەکە بێ زەبروزەنگ چارەسەر بکرێ.

لەو کاتەدا کۆمەڵەی ژ.ک بە هێزترین گروپی سیاسی کوردستانی ئێران بو و لەناو خەڵکدا رێز و نفوزێکی زۆری هەبو. دوای دامەزراندنی حزبی دیموکراتی ئازەربایجان، قازی محەمەد کە ئەو کاتە سەرۆکی کۆمەڵە بو بیری لە گۆرینی ناو و پرۆگرامی کۆمەڵە دەکردەوە بەتایبەتی لە هەلومەرجی پاش برانەوەی جەنگ. بۆ ئەم مەبەستە پرسی بە زەبیحی کرد. زەبیحی دەسکاری کردنی پەیرەوی ناوخۆ و پرۆگرامی بە شتێکی چاک دەزانی بەڵام لە گەڵ گۆرینی ناوی کۆمەڵەدا نەبو. دوای گرتنی زەبیحی، قازی محەمەد ئاواتی خۆی هێنایە دی و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی دامەزراند.

زەبیحی و هاورێکانی چ لە گەرانەوەی پەیمانی سێ سنور گیرابن یان بە هۆیەکی تر، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە ئەو سێ کۆڵەکەیەی کۆمەڵەی ژ.ک لە حەسساسترین و گرنگترین سەردەمی حەیاتی کۆمەڵە و پر ئاڵوگۆرترین سەردەمی ناوچە و بە تایبەت کوردستان لە زیندان بوون و دەست بە سەر بوون.

بە گرتنی زەبیحی و هاورێکانی، قاسم قادری و دلشاد رەسولی کە هەردووک لە تێکۆشەرانی رەدەی یەکی کۆمەڵە، لە باشترین نووسەرەکانی گۆڤاری نیشتمان ولە بەرەی هێزی هەڵسووری جەوانی کۆمەڵە بوون، دەتوانین بڵێین کۆمەڵە وەک بنەماڵەیەک بێ سەرپەرەشت و هەتیو دەبێ و تەنانەت بۆیان ناکری تاقە ژمارەیەکی گۆڤاری نیشتمان کە تا ئەوسەردەم زۆر بە رێک وپێکی و یەک بە دوای یەکدا دەرچووبوو، بڵاو کەنەوە!

لە گۆڤاری نیشتمان ژمارەی ٧، ٨ و ٩ لاپەرەی ٣دا نووسراوە:

« بە کویرایی چاوی دوژمنان نیشتمان جار دە گەل جاری چاکتر و جوانتر دەبیو لە آخردا دەبیتە گوللە بو سینگی نەیاران لاو - ١٠ »

کاتێک زەبیحی و هاوڕێکانی دەگیرێن، یانی هاوینی ساڵی ١٣٢٣ کۆمەڵە لە هەرەتی گەشە کردن و ڕێک و پێکی خۆی دابووە، دەتوانین بڵێین هەر بە مانگێک دوومانگ، ژمارەیەکی لە نیشتمان دەر کردووە وهیچ باس لە ئاڵۆزی وهاتن ونەهاتنی قازی محەمەد بۆ ناو کۆمەڵە و دووبەرەکی و ئەوجورە شتانە نەبووە، تکایە بروانە ژمارەکانی ٧، ٨ و٩ی گۆڤاری نیشتمان کە زۆر بە روونی دەردەکەوێ، کۆمەڵە لە ترۆپکی گەشانەوەدا بووە.

لە هاوینی ساڵی ١٣٢٣ دەتوانین بڵێین کۆمەڵە لە زۆر مەشاکیل و ناکاملی خۆی رزگار کردبوو، بۆ نمونە مەسەلەی هەڵبژاردنی ناوەندی و نووسینی "بژی سەرۆک" (مەبەست رەفیق حیلمی سەرۆکی کۆمەڵەی هیوا )لە هەوەڵ لاپەرەی ژمارەکانی پێشودا وزۆر شتی تر وەک کۆمۆنیست بوون و سەر بە ئینگلیز بوون و...

مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەو سەردەم کە زەبیحی و هاوڕێکانی گیران، کۆمەڵەی ژ.ک لە هەموو ژیانی رێکخراوەیی خۆیدا رێک و پێک تر و بێ موشکیلەتر بوو.

بە پێچەوانەی نووسینەکەی سەرلشکر زەنگەنە، زەبیحی بۆ هیچ مەئمورییەتێک لە لایەن قازی محەمەدەوە بۆ لای روسەکان نەچوبوو، بەڵگەش ئەوەیە کاتێک زەبیحی گیراوە، یانی پاش دەرکردنی نیشتمانی (٧، ٨ و ٩) لە باری رێکخراوەیی و کۆمەڵەیەوە، قازی محەمەد نە سەرۆک بوو نە لە کۆمەڵەدا بەو جورە دەستی رۆیوە کە مەئمورییەت بدا بە یەکەم شەخسی کۆمەڵە کە بچێت بۆ لای روسەکان، ئەگەر بمانەوێ قوڵتریشی لێ بکۆڵینەوە ئەو پرسیارانە دێنە پێش:

١-پەیوەندی بە روسەکانەوە بۆ بە رێگای ورمێ دا؟ خۆ کۆنسولی گەورەتری روس لە تەورێز دەبوو و رابیتی نیزیکتریشیان لە گەڵ کوردان لە میاندوا دادەنیشت ورێگای تەورێز بە هۆی مەسەلەی ئازەربایجان بۆ کوردەکان گەلێک ئەمینتر بوو!

٢-تو بڵێی لەحکومەتی ئەو سەردەمی ئێران کە هەموو ولاتەکەی لە لایەن روس و ئینگلیز بە چاو تروکانێک داگیر کرابوو، تەنانەت ئەوەندە بێدەسلات بوو کە گوێی شایەکەیان گرت و رەوانەی جەهەندەمیان کرد، بۆ قازی محەمەد ئەوەندە موشکیلە بووبێ ئەو "نامە گرینگانە"ی کە زەنگەنە باسیان دەکا، بنێرێتە لای روسەکان؟! (هەموو باش

دەزانین کە ئەو سەردەم قازی محەمەد وکوردەکان بۆ پەیوەندی لە گەڵ روسەکان نە تەنیا هیچ موشکیلەیان نەبوو، بەڵکو ٣ -٤ ساڵ پێش ئەو تاریخەی زەنگەنە، قازی محەمەد وسی کەسی تر لە کوردەکان بە ئاشکرا سەردانی سۆڤیێتیان کرد و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کاربەدەستانی روسی لە هاتووچۆی مەهابادا بوون).

٣-وەک سەرلەشکر زەنگەنە دەنووسێ، دەبێ چەندین نامە لە زەبیحی گیرابێ، کە قازی محەمەد بۆ روسەکانی نووسیوە وکاتی خۆی ئێران کەڵکی لەو نامانە لە شکایەت کردن لە لای رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگرتووە، ئەگەر ئەوە وا بێت چونکە ئەو نامانە بە قازانجی ئێرانن، دەبوو بە هەزاران نوسخەی بە دەست خەڵکەوە بایە، یان هێچ نەبایە نووسخەیەکی وەدەست سەر لەشکر زەنگەنە کەوتبایە کە لە کتێبەکەیدا چاپی کردبایە و ئەوەندە "متاسف" نەبوایە! یان لە مەحکەمەی قازێکاندا بە دوای بەڵگە بە دژی قازی محەمەد دا نەگرابان، لەو بەڵگە بە نرخە بۆ کەڵکیان وەرنەگرت!؟ ئەدی چۆنە تا ئێستا بە دەیان بەڵگەو نامە لە سەر کۆمار وکوردستان وەدەست خەڵک کەوتووە، بەڵام ئەو نامانە کە بە قسەی زەنگەنە هەر ئەو سەردەم بۆ رێکخراوی نەتەوە یەککگرتوکان، بۆ کۆنسولی ئینگلیز و ئەمریکا ناردراون بۆ لە هیچ شوێنێک دیار نین؟!

سەرەڕای ئەوانەش، ئەوکەسانەی ئەوسەردەم لە جەرگەی رووداوەکان دابوون وئێستا وتوویژم لە گەڵیاندا کردوون، لە بیریانە کە لە زەبیحیان بیستووە کە ئەو لە سەر ئەوە محاکەمە کراوە کە کۆمەڵێک لە ژمارەکانی گۆڤاری نیشتمان و جانتایەک ئاڵای کوردستان کە کۆمەڵەی ژ.ک دروستی کردبوو، پێ بووە.

لە دادگای تاران، زەبیحی زیادتر لە سەر ئەوە دێن ودەبەن کە بۆچی ئاڵای کوردستانی پێ بووە و ئاڵای ئێران بۆچی سەرەونەخوون بووە، زەبیحی لە دیفاعیاتی خۆیدا دەڵێ: ئەوە ئاڵای ئێرانە و هیچ جورم نییە، دەڵێن ئەوە ئاڵای ئێران نییە. زەبیحی ئاماژە بۆ قانوونی ئەساسی ئێران دەکا، کە تێیدا نووسراوە ئاڵای ئێران سێ رەنگی سەوز و سپی وسووره و ئەو ئاڵایانەش کە بە من بوون ئەو سێ رەنگەن. بە سەرییدا دەگوڕێن کە ئاڵای ئێران، رەنگی سەوزی لە سەرەوە و سپی لە ناوەڕاست و سوورەکەی لە خوارەوەیە، زەبیحی دەڵێ لە هیچ کوێی قانونی ئەساسیدا باسی ئەوە نەکراوە کە

ڕەنگەکان چۆن ڕیز دەکرێن!

ئەو چیرۆکەم بۆیە هێناوە کە بۆمان ڕوون بێتەوە، ئەگەر بە قسەی کاک محەمەدی شاپەسەندیش بڕوا نەکەین کە زەبیحی لە گەڕانەوەی پەیمانی سێ سنوردا گیراوە، دەبێ قەناعەت بێنین کە زەبیحی بۆ ئیشی کۆمەڵە و پەیوەندی لە گەڵ کوردەکانی باکوور چووەتە لای ورمێ.

مەک داوڵ یش لە کتێبە ئینگلیزەکەی خۆیدا کە لەو ئاخریانەدا بڵاو بووەتەوە، ناوی زەبیحی دەبا کە لە گەڕانەوەی پەیمانی سێ سنوردا لە ورمێ گیراوە.

تا ئێستا بەوە گەیشتووین و شکمان لەوە دا نەماوە کە زەبیحی و هاورێکانی (سێ کەڵە پیاوی کۆمەڵە) بە دوای دەرکردنی نیشتمانی(٧، ٨ و ٩)دا دەگیرێن.

بە هەر جۆرێک حیسابی بکەین تاریخەکەی زەنگەنە (خەزەڵوەری١٣٢٤) ناتوانێ ڕاست بێت و لەوەش زیاتر ئەگەر تاریخی زەنگەنە ڕاست بێ، بۆچی لە جوەزەردانی ١٣٢٣ کە ئاخر ژمارەی نیشتمان دەرچووە تا ڕۆژی گرتنی زەبیحی، بە قسەی زەنگەنە (ئابانی١٣٢٤) کە دەبێتە ١٠ مانگ هیچ ژمارەیک لە نیشتمان دەرنەچووە؟!

جێگای سەرنجە کە کۆمەڵە بتوانێ لە ساڵێکدا ٩ ژمارە دەرکا بەڵام لە ١٠ مانگدا تاقە ژمارەیەک نەداتە دەر! (بڕوانە تاریخی ژمارەکانی نیشتمان ٩ -١)

ئەوە هیچ شک ناهێڵێتەوە کە بە دوای دەرکردنی نیشتمانی (٧، ٨ و ٩)دا مۆرە سەرەکییەکانی کۆمەڵەی ژ.ک لە کایەدا نەماون و لە زیندان بوون!

کاتێکیش کە دێینەوە زۆر شت ڕوویداوە، حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دروست کراوە و جێژنی ئیستقلال گیراوە وتەنانەت ٢١ ژمارە لە کوردستان دەرچووە و...

هەرچەند کە زۆربەی نووسەران لە نوسراوەکانیاندا باسی ڕۆڵی زەبیحی لە دامەزراندنی کۆماردا دەکەن و زۆر کەس بە نێوی وەزیر، ئەندامی ناوەندی حیزبی دێمۆکرات، یان وەک نوێنەری قازی محەمەد چووە بۆ لای ڕوس و ئینگلیزەکان و... ناوی دەبەن، نازانم کاتێک مرۆڤێک لە زیندان دا بێت چۆن ئەو هەمووە ئیشەی پێدەکرێ؟!

ڕەنگە زۆر خەڵکی سابلاغ لە بیریان مابێ و لەو پیرانەی کە ماون باسی ئەوەمان بۆ دەکەن کە لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا جەماعەتێک لە خەڵکی سابلاغ وەک

خۆپیشاندان دەچنە پێش دەرگای ماڵی پێشەوا و داوای ئازاد کردنی زەبیحی و هاوڕێکانی دەکەن و ئیعتراز بەوە دەکەن کە بۆچی تا ئێستا هیچ حەولێک بۆ ئازاد کردنی ئەو مرۆڤانە نەدراوە؟! تەنانەت باسی ئەوەشمان بۆ دەکەن کە بە دوای ئەو خۆپیشاندانە، پێشەوا داوا لە روسەکان دەکا کە حەولێک بدەن بۆ ئازاد کردنی زەبیحی و هاوڕێکانی و گوشاری روسەکان بوو لە سەر حکومەتی ئێران کە ئەوان ئازاد کران.

پێموایە تا ئێستا تا رادەیەک لێمان روون بۆوە کە چۆن کۆمەڵەی ژ.ک تێک چوو! زەبیحی، کۆمەڵە و شاری سابلاغی چۆن بە جێ هێشتووە بەرەو زیندان، کە هاتووەتەوە بەسەر چیدا کەوتووە، جەمهوری ئێعلان کراوە، رئیس جەمهور دیاری کراوە، وەزیر و وەزارتخانە لە گۆڕێدان و لەشکری کوردستان ئامادە کراوە، چاپخانە لە روس را هاتووە، ئاغاوات و شێخ و مەلا لە وەزارەت و رێبەریی کوردا دەست بەکارن و....

ئەگەر مرۆڤ بۆ لەحزەیەک خۆی بخاتە ناو قالبی ئەندامانی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی ژ.ک و خۆی بگەڕێنیتەوە سەر دۆخی ئەو سەردەمی سابلاغ و کوردستان، جگە لە تەسلیم بوون و مل راکێشان بۆ واقعەکان لە لایان بەڕێوەبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک وە، هیچ رێگایەکی تر نابینێتەوە، جا کۆمەڵێک لە ئەندامان لە رووی دلسۆزییەوە تا توانیویانە لە رەدەکانی خوارەوەی بەر و دەستگای جەمهوری، لە سەر ئەو بۆچوونە کە« تازە دەڵێی چی، تازە وای لێهات، با حەولێک بدەین بەڵکوو لەوە خراپتر نەبێ و... »وەک مەلا قادری مدەرەسی لە چاپخانە، زەبیحی لە هەلات هەلاتێن و دلشاد لە جبهەکان و... کاریان کردووە و کۆمەڵێکیش وازیان لە سیاسەت هێناوەو هەتا مردوون باسی هیچ حیزب و رێکخراوەیەکیان نەکردووە!

بەدوای تێکچوونی کۆمار وداگیرکردنەوەی وڵات بە دەستی جەللادانی پەهلەوی، هەموو ئەو کەسانەی کە دامەزرێنەری کۆمەڵە بوون و تەنانەت ئەوانی تریش کە ناویان وەک دامەزرێنەر یان کۆمیتەی ناوەندی هاتووە (وەک: رەحمان حەلەوی، مەلا عەبدوللا داودی، ئەحمەد عیلمی، محەمەد یاهو،...) جگە لە محەمەدی نانەوازادە کە لە سەردەمی کۆمار لە حادیسەی فڕۆکەدا شەهید بوو، ئەوانی تر هەموو مابوون و لە حەیاتدا بوون، بەڵام تاقە نەفەرێکیشیان قەت لە ژیانی خۆیاندا نەبوون بە ئەندامی "حیزبی دێمۆکراتی

کوردستانی ئێران"!

جا نووسەرانی بەڕێز و خۆشەویست! کە پێتان وایە حیزبی دێموکرات درێژەدەری کۆمەڵەی ژ.ک بوو، یان کۆمەڵە خۆی کرد بە حیزبی دێمۆکرات، ئەوە چ نێو گۆڕینێکە، کە تەنانەت یەک دانەش لە بەڕێوەبەران و کۆمیتەی ناوەندی ئەو ڕێکخراوەیە لە حیزبی تازەدا جێگای نابێتەوە و نابیندرێن؟!

ئەوە چ ئاڵوگۆڕێکە کە بە بێ هیچ کۆبوونەوەیەک و بە بێ هیچ بڕیارێک لە لایەن بەڕێوەبەرانی ئەو ڕێکخراوەیە و بەو شێوەیە خۆی دەکا بە حیزبی دێموکرات، ئایا ئەوە زۆرتر لە کودەتا ناچێ کە بە بێ پرسی بەرپرسان و ڕێبەرانی ئەو ڕێکخراوە و لە غیابی ئەواندا، تەشکیلاتێک بگۆڕی و بیکەی بە شتێکی تر و لە کەرەسە و ئەندامان و شانەکانی بۆ ڕێکخراوی تازە کەڵک وەربگری ؟!

بە کورتی و بە سادەیی ئەمن دەڵێم لە ماوەی هەتیو بوونی کۆمەڵەی ژ.ک و سەغیر بوونیدا ، ژ.ک کوژراو ناشترا (با دڵی زۆر کەسیشم لە خۆ کردبێ)!

کاک محەمەدی شاپەسەند لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا دەنووسێ:

لە بەهاری١٩٤٨ من و غەنی بلوریان گەیشتینە عێراق لە دێی سیتەکی شاربازێر لە گەڵ عبدالرحمن زەبیحی یەکترمان گرتەوە، لە سیتەک بڕیار درا درێژە بدرێ بە چاپی (نیشتمان). بۆ ئەم کارە دروست کردنی مەکینەیەکی دەستی چاپ بە من ئەسپێردرا و پەیدا کردنی پێویستیەکانی تر بە زەبیحی...من بە یارمەتی شێخ حوسێنی ئاسنگەر لە سلێمانی مەکینەکەم دروست کرد وتوانیمان لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی تری نیشتمان چاپ بکەین، من لەو ژمارەیەدا نوسینێکم هەیە بە ئیمزای (ئازاد) ئەگەرچی لە پێشدا بە ناوی (ئازەر) و (م.ش ئازەر) دەمنوسی.

دوکتۆر جەمال نەبەز لە کتێبی "گۆڤاری نیشتمان ..." لاپەڕەی ٢٨دا دەنووسێ:

...هەروەک زەبیحی خۆی گوتی ژمارە (١٠)ی "نیشتمان" پاش رووخانی کۆماری کوردستان دەرچوە. ئەم ژمارەیە لە شارباژێر دەرچووە لە کاتێکدا کە زەبیحی لە لای شێخ لەتیفی شێخ مەحموود پەنابەر بووە.

خۆشم لە گەران و هاتووچۆی کوردستانی خواروو و چاو پێکەوتن لە گەڵ مرۆڤی شارەزا و نیزیک لە زەبیحی، بیستوومە کە ژمارە ١٠ی نیشتمان لە سیتەک لە ماڵی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموودی نەمر، لە لایان زەبیحی وچەند کەسێکی تر دەرچووە و بە چەند نوسخەیەک بلاوکراوەتەوە. (بڕوانە وتوویژ لە گەڵ دوکتور عێزەدین مستەفا رەسول)

یانی پاش ناوارە بوونی زەبیحی و تێکچوونی کۆمار ئەو ئیشە کراوە، خۆ ئەگەر ئەوەش راست بێ، هەر بەوە دەگەین کە ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک پاش کۆماریش ملیان بۆ حیزبی دێمۆکرات رانەکێشاوە و حەولێیان بۆ زیندووکردنەوەی ژ.ک داوە.

ئەگەر کۆمەڵەی ژ.ک خۆی بڕیاری دابێ، ببێتە حیزبی دێمۆکرات، ئەمن باوەڕ ناکەم مرۆڤێکی وەک زەبیحی لە باری حیزبایەتی و ئوسولی ریکخراوەیی، ئەوەندە ناشارەزا بووبێت کە گوێ نەداتە بڕیاری کۆمەڵە و بچێ لە جیاتی "کوردستان" ئۆرگانی حدک، نیشتمان ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ.ک چاپ و بلاو کاتەوە!

ئەگەر کۆمەڵەی ژ.ک خۆی بڕیاری خۆ کردن بە حدک ی داوە ئەدی بۆچی پاش تێکچوونی کۆمار و چوونی کەسانی وەک: زەبیحی، سەدیق حەیدەری، دلشاد رەسولی، محەمەد شاپسند و... بۆ کوردستانی خواروو، هیچ حەولێکیان نەدا وەک حدک درێژە بە حەیاتی حیزب بدەن؟!

لەسەر گرینگی و مێژوویی بوونی ئەو باسە کە کۆمەڵەی ژ.ک چۆن تێکچووە و حیزبی دێمۆکرات چۆن پێکهاتووە و بۆچی رێبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک دوای تێکچوونی کۆمار لەو حیزبە تازەیەدا تێکۆشانیان نەکردووە و لەمەر نووسینەکەی کاک محەمەدی شاپەسەند (...من و غەنی بلوریان گەیشتینە عێراق...)، ساڵی ١٩٩٥ حەولێکی زۆرم دا کە پەیوەندی بە بەرێز کاک غەنی بلووریانەوە بکەم. بە یارمەتی دۆستێکی خۆشەویست ئەو فورسەتەم دەست کەوت. لە پەیوەندێکی نامەیی دا دوو پرسیارم ئاراستەی کاک غەنی کرد. پرسیارەکان ئەوانە بوون:

"١- کاتی خۆی لە ساڵی ١٩٨٢لە عێراق چاوم بە کاک محمد شاپەسەند کەوت،

زرووفێكى زۆر نالەبار و عاستەم بوو، نەكرا زۆرى كەڵك لێوەرگرم بەڵام باسى شتێكى كرد كە بەلاى منەوە زۆر گرینگە: كە ساڵى ١٩٤٨ لە دێى "سیتەك" لە شارباژێرى كوردستان لاى شێخ لەتیف، ئێوە و خاڵم و كاك محمد ژمارە ١٠ى ***گۆڤارى نیشتمان*** و دەركردووە، ئەگەر وایە تكایە بفەرموون چۆن بوو نیشتمانى ١٠ دەرچوو، مەگەر ژ.ك نەكرابوو بە حیزبى دێمۆكرات و ئۆرگانى حیزبى دێمۆكرات، "كوردستان" نەبوو؟! ئەگەر نیشتمانى ژمارە ١٠ دەرچووە، چون دەست دەكەوێ و باسى چى تێدابوو؟

٢- چۆن بوو پێوەندى خاڵم و ئێوە وەك حیزبى دێمۆكرات دواى چوونى عێراق تێكچوو وە خاڵم بۆ لاى پارتى لە عێراق چوو؟"

لەگەڵ دووپاتە كردنەوەى رێز و سپاسم بۆ كاك غەنى ئەوەش جوابى نامەكەى:

"بەڕێز کاک عەلی ڕۆژت باش

نامەکەت گەیشت، ئەوەی کە کەوتویە کۆکردنەوەی سەربەهوردی خالت کارێکی باشە.

من زۆر بە کورتی وەڵامی دو پرسیارت دەدەمەوە. ئەو بۆچونانەی لەو دو پرسیارە هاتونە گوریّ هیچی راست نیە و هەرکەس بۆی باس کردوی لەخۆیەوە کوتویە و فری بە راستیەوە نیە.

پاش هەرەس هێنانی کوماری مهاباد من لە مەلبەند نەبوم و بۆ خوێندن رەوانەی سویت کرابوم. لە سالی ١٣٢٦ کە گەرامەوە لە بەرپرسانی پێشوی حیزبی دیموکرات کەس لە گورێدا نەبو چونکو زوربە لە زیندان دابون و چەند کەسانێکیش پەرەوازەی گەرمیان ببون کە یەکێکیان خالت بو.

لە سالی ١٣٢٦ "اسفند" کە سەر لە نویّ حیزبی دیموکرات دامەزرایەوە پێویستی بە بانگەوازیک بو بۆ جەماوەر بۆ مزگینی خەباتی سەر لە نوێی حیزب. حیزبی توده ئەوسا رەسمی و ئازاد بو، نوێنەری لە مجلس هەبو. دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ کرد کە دەقی بانگەوازەکەمان بۆ لە چاپ دا بەلاّم ئەوان یارمەتیان نەداین، لە ترس ئەوە پێیان نەگریتەوە و نەکەونە بەر هیرشی میری و روی خۆشیان پیّ نیشان نەداین. لەبەر ئەوە هاوالان لە کۆبونەوەیەک دا لیّ بران من و کاک محمد رەوانەی گەرمیان بکەن بەلکو لای پارتی ئاواتمان پێک بێت.

ئێمە رەوانە بوین و چوینە مالی "شیخ لەتیف"ی زیندە یاد. ئەوسا مامۆستا حەسنی قزلجی بە نازناوی "مەلا حەسەن"، کاک رەحمانی زەبیحی بە نازناوی "مەلا قادر"، کاک سید محمد صمدی (سەیدە گولە) بە نازناوی "شیخ محمد" لە وێندەریّ بون.

ئێمە مەبەست لە هاتنەکەمان بۆ باس کردن داوای یارمەتی و هاوکاریمان لیّ کردن و ئەوانیش بە دلّ فراوانیەوە بە دەنگمانەوە هاتن. بریار بو بچینە لای "پارتی" و داواکەمان باس بکەین و یارمەتیان لیّ وەرگرین بەلاّم شێخ لەتیف رەزامەندی لەسەر

نەبو، کوتی خۆم هەمو چشتێکو بۆ ساز دەدەم. ئێمە بە تێکرایی دەستمان کرد بەکار و چاپخانەیەکی دەستیمان ساز دا بە یارمەتی شیخ لەتیف لە باری مالیەوە. لەسەر بەرژەوەندی گشتی لێ براین جاری روژنامەی "کوردستان" وەک ئورگان لە چاپ نەدرێ چونکو لە کوردستانی ئێراندا هێشتا "دادیگای زەمانی جەنگ" هەر چالاک بو مەترسی ئەوە دەکرا میری هیرش بکاتە سەر ئەندامانی کۆنی حیزب و سەر لە نوێ زینداینیان بکات و چەرمەسەریان بۆ ساز دا کە تازە لە زیندان وەبەر "عفو عمومی" کەوتبون. لێ براین بانگەوازەکە بە نێوی "مجلەی ریگا" و بەیانیکی بانگەواز دەربکرێ تاکو بزانرێ بەرخوردی میری ئێران لەو بابەتەوە چۆن دەبێ پاشان لە هەل و مەرجی پێویست دا "کوردستان" لە چاپ درێ کە ئەو هەلە لە سالی ١٣٣٣ دەس کەوت.

کەواتە "نیشتمان" لە ئارادا نەبو ئەوەی ئەو اطلاعاتەی پێ داوی ویستویە چشتێک بێژێ ئەگینا ئاگای لە مسئلەکە نەبوە. پاش لە چاپ دانی "ریگا و بەیانەکە" شیخ لەتیف داوای کرد کە نامیلکەیەکی بۆ لە چاپ بدەین کە دژی حیزبی شیوعی و پارتی بو کە دەقەکەی بە یارمەتی کاک رەحمان نوسی بو هەر ئەویش بۆ ئێمەی هێنا و مطرحی کرد و داوای لە چاپ دانی کرد بەلام ئێمە هیچ کام نەچوینە ژێر باری.

لەسەر ئەوە شیخ لە ئێمە توراو و کاک رەحمانیش خۆی کێشاوە دواوە سەبارەت بە دوستایەتێکی پتەوی کە لە گەل "شیخ لەتیف" هەی بو. بەداخەوە بەم جورە دواجار لەو چاپخانەیە کەلک وەرنەگیرا و من گەرامەوە بۆ ولات. ئەوە بو راستیەکە.

ئیمزا غەنی

ئاپریلی ١٩٩٥

تێبینی: نامە ٧ی مارسی ئێوە لە ٨ی ئاپریل گەیە دەستم"

دوای ئەو نامەیە حەولم دا و "مجەلەی ڕێگا"م وە دست خست. ئەو "مجەلەیە" بە نێوی "اورگانی کومەلەی ژیانی کورد" لە خەزەلوەری سالی١٣٢٧ تاقە ژمارەیەکی بلاو کراوەتەوە کە بریتییە لە دوو بەش: فارسی و کوردی، بەشە فارسییەکەی "پیناو" و بەشە کوردییەکەی "تیمور" (دەبێ کاک حەسەنی قزلجی و کاک غەنی بن) نووسیویانە. بەلام نووسراوەی کاک محەمەدی شاپەسەندم بە "تیمزای ئازاد" تێدا نەدیتەوە! ئەوە ئەو ڕاستییە دەگەیەنێ کە "مجەلەی ریگا" و "نیشتمانی ژمارە ١٠" نابێ یەک شت بن.

لەسەر قسەکانی کاک محەمەد شاپەسەند و کاک دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ کە تەنانەت باسی ناوەرۆکی "نیشتمانی ژمارە ١٠" دەکا و لە گەڵ باسەکەی مامە غەنی لە مەر نامیلکەی شێخ لەتیف بەرامبەر بە پارتی یەک دەگرنەوە (بڕوانە وتووێژ لە گەڵ کاک دوکتۆر...)، گەیشتوومە ئەو قەناعەتە کە بە دوای "تۆراندنی" شێخ لەتیف و چوونەوەی کاک غەنی بۆ ولات و مانەوەی کاک محەمەدی شاپەسەند لە "سیتەک" لە گەڵ زەبیحی و ئەوانی تر لە لای شێخ لەتیف، کەوتوونە سەر ئەوە کە هەر بەو چاپخانەیە کە ئامادەیان کردووە ئەوجار "نیشتمان"ی پێ دەرکەن و نامیلکەکەی شێخ لەتیفیشی تێدا چاپ بکەن. بلاوکراوەی ناوخۆی پارتییش بە ناوی "مرۆڤ" لە ژمارەی ٢یدا هێرش دەباتەوە سەر "نیشتمان" و دەنووسێ "نیشتمان لە دەوری دووهەمیدا ئەبێتە زمان حالی کۆمەلێک ئاژاوەچی".

کۆمەلەی ژ.ک لە دەست پێکرا لە سەر ئەساسی سیاسەتێکی روون و ئاشکرا لە مەر مەسەلەی کورد بۆ وەدیهێنانی ئاوات و ئامانجەکانی گەلی کورد لە هەموو پارچەکان کە پێکهێنانی دەولەتێکی یەکگرتوی کورد بوو، پێک هات. کۆمەلەی ژ.ک لە ڕابردووی مێژووی گەلی کورد ئاگادار بوو وە دەیزانی کە کورد کلۆلی دەستی دواکەوتوویی و نەخوێندەوارییە، دەیانزانی کە ڕابەریی شۆڕشەکانی پێشوو بە دەست شێخ و مەلا و ئاغاوەتەوە بووە و ئەوانە ناتوانن سەرکردەیەکی تا سەر و بەوەفا بن بۆ گەلی کورد، ئەوانە بەرژەوەندی چینایەتی خۆیان لە پێش خەلکی هەژار و جوتێری کوردستاندا دەبینن و بەوە گەیشتبوون کە ڕزگاری کوردستان بە دەست ئەو چین و تاقمەیە نایەتە دی. لە لایەکی ترەوە ئەو ڕاستێشیان لێ عەیان بوو کە کۆمەلی کوردەواری هێشتا نەیتوانیوە

خۆی لە دەست زنجیریی کوێلەتی ئەو تاقمە رزگار کا و ئەوەش ئیشی دوو رۆژ و سێ رۆژ نییە!

لە زۆربەی نووسراوەکانی کۆمەڵەی ژ.ک دا باسی ئەوە کراوە کە میللەتی کورد بە دەست نەخوێندەواری، دوور لە عیلم و سەنعەت، نەبوونی شارستانیەتی، خورافات، نفاق و دووبەرەکی، بە کەم گرتنی ژنان، خراپی ئاغاوەت و... دەناڵێنێ. حاجی مارفی کۆکەیی کە بە "شاعیرێکی بەناوبانگ" لە کۆمەڵەی ژ.ک دا ناسراوە لە گۆڤاری نیشتمان ژمارەی ٥دا لەسەر ئەو بابەتە دەدوێ:

## بیکەین بە جەمهووری

شاعیرێکی بە ناوبانگ

لە روژنامەی مدیری کەچ مەداری چەرخی شەفتوری

ئەنوسی روژی کوردی کەوتە ئەوجی بورجی بی نوری

بوخار و دوکەلی بی اتفاقی و سوئی ئەخلاقی

مجسم بو بە هەوری نەکبەتو روژ کەوتە مەستوری

لە بەر بی فکر و اقدامی رەئیسانی عەشایر بو

کە روژن بوتە ظلماتی شەوی تاریکی دەیجوری

هەمو میللەت گەیشتنە مەنزلی مەقصود و خوشنودی

فقط کوردن بە جی ماون بە مەحرومی و مەهجوری

عزیزم افتخاری خارجی هەم علمە هەم صەنعەت

بە ملیونو بە فرسەخ تو لە علمو مەعریفەت دووری

تەماشا کە لە بەر شوعلەی چرابەرقو نەلەتریکی

کورەی ئەرضی هەمو یەکپارچە بوتە یەک کورەی نوری

مەگەر توش هەر بە پشتیندی زلو پیچ و شەدەی هەوری

بنازی ی بیکەیە ئەسبابی کیبر و فەخر و مەغرووری

برا بیری چراییکی بکەن تاریکە شەو دادی

قیامیکی بکەن تا فرسەتە بیکەن بە جمهووری
کەسی میللەت پەرستو خاوەنی فیکر و سیاسەت بی
تەرققی میللەتو آسایشە مەقصوود و مەنظوری

هەر بۆیەش لە دەست پێکرا خۆیان بۆ خەباتێکی دوور و درێژ و راستەقینە ئامادە دەکرد، ئەوان بڕوایان بەوە نەبوو کە لە هەل و مەرجێکی ئاوادا کورد دەتوانێ دەست بۆ چەک بەرێ و شۆڕش بەرپا کاتەوە، ئەو راستییان لێ مەعلووم بوو کە ئەگەر خەباتی خۆیان ئاشکرا بکەن و دەس بۆ چەک بەرنەوە دیسان رابەری عەشیرەت و ئاغاوەت دێن و دەست بە سەر جولانەوەکەدا دادەگرن. ئەوەیان بە باش دەزانی کە بە وردی و لە سەرەخۆ درێژە بە خەباتی نهێنی و رێکخراویی خۆیان بدەن و کۆمەلانی خەلکی کوردستان بەرەو ئەوە بەرن کە لە چەنگی دواکەوتوویی و رێبەری خێلکی رزگار بن و بێنە ژێر چەتری بەڕێوەبەرایەتی پێشکەوتنخواز و رێکخراویی و مۆدێرنی دنیای ئەو سەردم. ئەوەش کارێک بوو کە پێویستی بە خەباتی نهێنی و تەبلیغی و تەرویجی بوو.

ئەوە راستییەک بوو کە هەر لە سەرەتاوە بەڕێوەبەرانی کۆمەلەی ژ.ک پێیگەیشتبوون و خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، تەنانەت لە سەر ئەوە کە دەیان زانی ئەوان لە باری جێ و شوێنەوە لە ناو کۆمەلی کوردەواریدا هیچ جێگا و رێگا و مەنسەب و مقامێکیان نییە هاتنە سەر ئەوەی کە بە کردەوە خۆیان لە ناو دلی کۆمەلانی خەلک دا جێگا کەنەوە. درۆ، دزی، خراپە، چاو لە ناموسی خەلک کردن و هەرچی پێی دەلێن کردەوەی خراپ و دزێو لە قاموسیاندا نەما و سوێندیان بۆ یەکتر خواردبوو کە لەو شتانە بە دوور بن. هەر واشیان کرد و توانیان لە ماوەیەکی کەمی دووسێ سالی دا خۆیان لە ناو دلی کۆمەلانی خەلک دا جێگا کەنەوە و تەنانەت زۆرێک لە دەولەمەند و ئاغاوەتی ناوچە کە بە کۆمۆنیست و دوژمنی خۆیانیان دەزانین، دانیان پێدا بێنن و ئەعترافیان پێ بکەن!

رەوەندی بەرەو پێشچوونی کۆمەلەی ژ.ک لە ماوەیەکی کەمدا و بە شێوەیەکی نهێنی، شتێک نەبوو کە خورپە نەخاتە دلی دوژمنانی گەلی کوردەوە بە خۆیی و بە

بێگانەوە! ئەوەیان هەست پێکرد کە ئەمجارە شۆڕشگێرانی کورد ڕێگای ڕاستەقینەی بە ئامانج گەیشتنیان دۆزیوەتەوە و لە حەولی پەرەسەندنی سەتحی شوعوور و فەهم و خوێندنی گەلی کورد دان و بێتوو ئەوە تاسەر بڕوا ئیتر هیچ زەبروزەنگێک و هیچ سەلاحێکی مۆدێرن و ماڵ وێرانکەر دەروەستیان نایە و موسەلەح بوون بە چەکی زانست شتێک نییە کە بە ناردنی چەند لەشکر و هاندانی چەند ئاغاوەت و عەشیرەتی خۆیی عیلاجی بێ!

کۆمەڵەی ژ.ک ئەسلەحێکی سارد بوو کە دەهات هەموو گەلی کوردی پێ موسەلەح بێت و شتێک نەبوو کە ئەگەر هەرچی زووتر عیلاجی نەکەن بتوانن وەک جاری جاران بە فرت و فێل و چەکی گەرم لە بەینی بەرن، ئەوە ڕاستییەک بوو کە دوژمنانی گەلی کورد زۆر زوو پێی گەیشتن و دەبوو بە هەر قیمەتێک بێ لە ناوی بەرن و هەر واشیان کرد!

ڕەوەندی مێژوو شتێکی زۆر سەیرە، بە هەڵکەوت یان بە پلان دارشتن چەند ڕووداو لە چەند جێگای جیاواز یەک دەگرنەوە:

١- حکومەتی ئێران لە هەڕەی گەشە کردنی کۆمەڵەی ژ.ک و لە کاتێکدا هەموو وڵاتەکەی لە لایان هێزە سوێند خۆرەکانەوە داگیر کراوە و تەواو بێ دەسەڵاتە، زەبیحی و هاوڕێکانی دەگرێ و لە زیندانیان داوێ. (پوشپەری ١٣٢٤- جونی ١٩٤٥) جێگای سەرنجە کە لە بەیتێکی شێعرەکەی مامۆستا هەژار لە مەر هاتنەوەی زەبیحی... هاتوە:

« قرەی قەل ایوەی خستە زیندانی ئەوەش انتقام دەردی دەزانی »

دیارە "قرەی قەل" دەبێ دوژمنی ناوخۆ و مەبەست ڕاپۆرت لێدان و جاسوسی کردن بێ، سەرلەشکر زەنگەنەش لە بیرەوەرێکانیدا باسی "خەبەر گەیشتن" دەکا!

٢- حکومەتی سۆڤیەت بە دوای گرتنی زەبیحی و هاوڕێکانیدا بە هۆی میر جەعفەر باقرۆف (سەرۆک کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت) دەعوەتی ڕەسمی لە قازی محەمەد و پیاوە ماقوڵانی کوردستان دەکا و داوایان لێ دەکا کە دەبێ کۆمەڵەی ژ.ک تێک دەن و حیزبی دیمۆکرات دروست کەن! (خەرمانانی ١٣٢٤- سپتامبری ١٩٤٥)

٣- قازی محەمەد لە پێشدا بە کردەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵەی ژ.ک کە ئەوە دژی مەبەستە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵە بوو کە ئاغا و شێخ و مەلا و سەید بتوانن ببنە

سەرۆکی کۆمەڵە! چونکا قازی محەمەد هەم ئاغا بوو هەم مەلا و توانی بە ماوەیەکی کەم بە کۆکردنەوەی ئیمزا لە خەڵکی سابلاغ کۆمەڵە تێک بدا و حیزبی دێموکراتی لە جێگای دروست کا و ئاغاوەت و سەردار عەشیرەتەکان بوونە شۆڕشگێر و هاتنە سەرۆکایەتی حیزبی تازە و جێگای شۆڕشگێرانی واقعی کۆمەڵەی ژ.ک یان گرتەوە! (خەزەڵوەری ١٣٢٤- ئوکتوبری ١٩٤٥)

ئەو سێ ڕووداوە مێژووییە لە ماوەی کەمتر لە پێنج مانگ یەک بە دوای یەکدا ڕوو دەدا و ئەنجامی بەوە تەواو دەبێ کە تاقە ڕێکخراوی ناسیونالیستی کورد جوانە مەرگ بێ و بۆ جارێکی تر بەڕێوەبەرایەتی جولانەوەی گەلی کورد بکەوێتەوە دەست ئاغاوەت و عەشایر.

بەشی زۆری بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی ژ.ک کە بە گیرانی سەرکردەکانیان وڕ و کاس ببوون، بە بێ هیچ بەرەنگارێک مل بۆ واقعەکان رادەکێشن و خۆیان دەکێشنەوە و هەر لەسەر ئەو سوێند و شەرتە کە پێی وەفادار بوون هەتا دەمرن نابنە ئەندامی هیچ حیزب و دەستەیەک و تەنانەت بەشی زۆریان لە گێڕانەوەی بیرەوەرێکانیشیان خۆیان دەبوارد و بێدەنگی تەواویان گرتە پێش!

کاتێک حەول بۆ زەبیحی و هاورێکانی درا کە رزگار بن لە زیندان، کە هەموو شتێک بە سەر چووبوو، کۆمەڵە نەمابوو، حیزبی دێمۆکرات لە قودرەت دابوو، جەمهوری کوردستان پێک هاتبوو و تەنانەت سەرکردایەتی کورد لە ناو زلهێزەکاندا بە لای سۆڤیەتی داخستبوو.

جێگای پرسیارە کە ئەو حەولەی بۆ ئازاد کردنی سەرکردەکانی ژ.ک درا، بۆ وا وەدرەنگی کەوتوو و ئایا نەدەکرا هەر لە سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک دا ئەو حەولە بدرێ و ئازاد کرێن؟! چونکە وەزعیەتی حکومەتی ئێران هیچ گۆڕانکاری بە سەردا نەهاتبوو چ ئەوکات کە ئەوان گیران و چ ئەوکات کە ئازاد بوون حکومەتی ئێران هەر بێ دەسەڵات بوو!

لێرەدا پێویستە بڵێم کە من دژ بە هەموو ئەو بۆچوونانەم کە دەڵێن "حیزبی دێموکراتی کوردستان جێگر و درێژەپێدەری کۆمەڵەی ژ.ک بووە". ئەمن پێموایە کۆمەڵە

لە گەلاوێژی ١٩٤٢ چرای ژینی هەڵکرا و لە خەزەڵوەری ٤٥ یشدا کوژاوە و هەر لەو کاتیشەوە حیزبێکی تەواو تازە بە نێوی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان هاتە حەیاتەوە بە بەرنامەی جیاواز لە کۆمەڵە، بە بەڕێوەبەرایەتی تەواو جیاواز، بە ستراتیجی تەواو جیاواز، بە تەرکیبێکی تەواو جیاواز و .... تەنانەت ئەگەر تەنیا بیست لە سەدی بەڕێوەبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک م لە بەڕێوەبەرایەتی ئەو حیزبە تازەیەدا دیبا ڕەنگ بوو بتوانم قەبوڵی بکەم کە ژ.ک ئاڵوگۆری بە سەر خۆیدا هێناوە و خۆی کردووە بە حیزبی دیمۆکرات بەڵام بەداخەوە نە تەنیا ئەوە نابینم بەڵکو هیچ شتێکی وەک یەکیان تێدا نابینم! جا بۆیە ئەمن ئەوە بە باشتر دەزانم کە لە مێژوودا ئەو ڕاستییە روون بکرێتەوە کە ئەو دووانە تەواو دوو شتی جیاواز بوون لە یەکترا!

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە بە دروست کردنی حیزبی دیمۆکرات و ڕێنوێنیی روسەکان، بۆ یەکەمجار ئەو شوعارە بێ ئەساس و بێ ناوەرۆکە "دیمۆکراسی بۆ وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان و خودموختاری بۆکوردستان" بوو بە ستراتیجی ئەحزابی کوردستان و دەیان ساڵە ڕەوەندی جوڵانەوەی گەلی کوردی لە شاڕێی خۆی ترازاندوە و تا ڕادەیەکی زۆر زیانی لە بیری کوردایەتی و یەکگرتوویی کوردستان داوە، سەرەڕای ئەوە کە ئەو شوعارە داتاشراوە تا ئێستا هیچ دیارییەکی بۆ گەلی کورد نەهێناوە و بۆ یەک جاریش دوژمنانی کوردستانی پێ نەغەڵەتێندراوە و بۆتە جێگای سەرسوڕمانی هەموو خەڵکانی دونیا کە ئایا خودمختاری لە چوارچێوەی وڵاتێکدا ئەوە دەهێنێ کە بە درێژایی ٥٠ ساڵ میللەتێک خۆی تووشی ئەو هەمووە کوشت و بڕینە و ماڵوێرانی و زیندان و ئەشکەنجە و کیمیاباران کردن و...هتد بکا!

لە سەر ژیانی زەبیحی بە دوای ئازاد بوونی و هاتنەوەی بۆ سابلاغ بە داخەوە زۆر شتمان بۆ گوتن نییە. زەبیحی کە هاتەوە بە سەر دونیایەکی تر داکەوت و ئەو ئیتر هیچ کارە بوو، تەنیا ئەوە کە لە رووی دڵسۆزی و هەستی کوردایەتی لە گەڵ چەند کەسێک لە بەڕێوەبەرانی کۆنی کۆمەڵە ویستیان تا ئەو جێیەی کە دەکری تێکۆشانێکیان هەبێ و خزمەتێک بکەن. دیارە زەبیحی پێش دامەزرانی کۆمار کەسێک نەبوو کە بەڕێوەبەرانی کۆمار بتوانن هەروا فەرامۆشی بکەن و وەک ئەوانی تر هیچ ئیعتنایەکی پێ نەکەن،

ئەوەیە کە لە عەکس و باسەکانی مێژوویيدا ناو و رەسمی هەر هاتووە. بەڵام ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵ دەینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لە دەورانی کۆماردا زەبیحی ئەو زەبیحی یەی سەردەمی "نیشتمان" نییە!

ئەوەی کە لە زەبیحی وەبەر چاو دەکەوێ چەند نووسراوەیە کە لە رۆژنامەی کوردستاندا چاپ کراوە کە ئەوەش لە چاو ئەو نووسراوانەی "نیشتمان" و ئەو هەڵسوڕانەی زەمانی کۆمەڵەی ژ.ک ی زۆر کەمە و بە یەکەوە قیاس ناکرێن!

لێرەدا هەموو نووسراوکانی زەبیحی کە لە سەردەمی کۆمار و لە رۆژنامەی کوردستاندا چاپ بووە عەینی خۆی دێنمەوە:

کوردستان ژمارەی ١٨، ١٩، ٢٠، ٢١ سالی یەکەم شەممۆ ٤ی رەشەمەی ١٣٢٤ ٢٣ی فوریەی ١٩٤٦

## "لە ناو جیگای مردنا"

نووسەری: مصطفی منفلوطی وەرگیر: عبدالرحمن ذبیحی

کومەلیکی زلم مەردوم وبەرچاو کەوت لەبەر دەرگای خانویکی پچوک کوببوونەوە هەرا و هەنگامەییکیان ساز کردبوو چەند پولیسیک بە ناویانا هاتوچویان ئەکرد لەپر گویم لی بو یەکیک ئەیگوت: «یەزدان خو کوشتنی پەسند نەکردوە و فەرمانی نە کردنی داوە» یەکیکی تر ئەیگوت: «پیم وایە کوریکی غەریبە چونکوو کەسی لەسەر ناگری» سا تی گەیشتم کە گەنجیک خوی کوشتوە و بوتە هوی ئەم کوبوونەوی مەردوم بەم کەمەی بەسەرهاتەکە بەسم نەکرد ویستم بە دریژی بیزانم هاتم بچمە ژووری خانوەکە ریگام نەبو، توزی راوەستام بەم لاولاما ئەروانی چاوم بە یەکیک لە پولیسەکان کەوت کە لەپیشا ئەم ناسی، چوومە لایو لە تەکیا رویشتمە ژوور.

گەنجیکی بیست سالانەم دیت لە ناو جیگای مەرگا راکشاوە، تەنیکی لاوازو رەنگورووی زەرد بوو، دەستی وەیشومی مەرگ نەیتوانیبوو هەموو نشانەی جووانی و لاوچاکی لە ناو بەریت، وەکو گولیکی سیس و ژاکاو کە هیشتا بونی هەر خوشبیت

کەمیک جووان چاکی مابوو مفتش جلکەکانی ئەپشکنی، تا بەلگەییکیان لی وەدەس خا، پزیشک لیی وورد ئەبووە تاهوی مردنی بدوزیتەوە، بەلام من وەکو دلسوزی لەتەنشتی دانیشتم، لەم مصیبەتە بیرم ئەکردەوە کە بەسەری هاتوە و لە جوانیو جحیلیم دەنوری بو گەنجیو ناکامیکەی کلول ئەبوم لەم کاتەدا چاوم بە چەند پەریک نووسراو کەوت کە لە دەورەی جیگاکەیا بلاو ببوونەوە بە جوریکی کە نە پزیشک تیم بگا و نە پولیس بم بینیە رابوومو نووسراوەکانم کو کردەوە لە جزدانم نا تا بەلکو آموژگاریکیان تی یابیو شتیکی لی فیر بم.

هیندە پی نەچوو پزیشک زانیی کە ئەم گەنجە ناکامە (زەرنیخ)ی خواردوە پولیسەکان کە ئەمەیان بهیست بردیانە نەخوشخانەییک کومەل بلاوەی کرد منیش لە خانوکە دەرکەوتمو ایتر نەچوومەوە و لیم نەپرسیەوە.

هاتمەوە لە خوم، سەرم بە سەر نووسراوەکانا دا گرت و تماشام کرد ئەمە بیرانی دلداریکە کە بەدەست خوی جامی دلداریی خواردوتەوە، و چونکو نوخشە دلوپی ئەم شەربەتە زاری شیرین کردوە پیالەکەی بەسەرەوە ناوە، دەمی لی نەکردوتەوە، بەتالی دلوپەکانی دوایەی نەزانیوە تا قومی دوایی کە ژهریکی کوشەندە بووە و لی پیی خستوە، گیانی لی ئەستاندوە.

بە خویندنەوەی ئەم نووسراوانە کولی گریانم هەلستا، هیندە گریام هاتمە هیلاک بوون بەزەییم بە خوما هات پیچامنەوە و لەناو نووسراو و کتیبەکانی خوما دام نان، چەند سالیک بەسەر چوو تا دویشەوی کە نووسراوەکانی خوم ئەپشکنی لە قوتویکی پچوکا ئەم نووسراوانەم دیتەوە کە تی پەر بوونی روژگار وەکو کفنیکی لەبەر کونیان زەرد ببیت زەردی هەلگیرابوون مچوورکیکم پیدا هات وام زانی لاکی مردوکە لەم قوتوە دایە وتاپوی (شبح) نووسەرەکەی لە گور دا لە باتی لاکی شیردراوەتەوە.

کە وەخو هاتمەوە دیسان خویندم نەوە، تەماشام کرد ئەمە نیگاری دلی دلداریکە کە بەختیاریو چارە رەشی زور چاک تی یا دیارە، ایستا بە ناو مەردوما بلاویان ئە کەمەوە تا ووشیار ببنەوە لە ریگای دلداریکی ئەبتە هوی هلاکیان دوور کەونەوە. دیم، بە چاو پی کوتنیک دلم پی بەخت کرد، لە کانگای دلما جیم بو کردەوە بەر لە دیتنی وی خوش ویستنو

دلداریم نە دەزانی، دلم لە تاریکاییکی توند دابو خوشی نەدەدیت، خوش ویستن و دلداری وەکو هەتاویک کردی بە دلما کە تەنیا رونایی و جوانی هەیە نەک سوتاندن و تواندنەوە.

دلم لە بیابانی ژیاندا تاک و رەویو بو، هوگری هیچ دلیک نەدەبو، کاتی بو دوستایەتی ئەو هاتمە بزوتن لە قفسی سینگی دا مەلیکم دیت کە لە گەل مەلی دلما بە بیکەوە ریک کەوت -و ترسی لا نەهیشت شایی و لذتیکم لە خوما دیت کە ئەگەر بە سەر دلانا بەشیان بکردایە نە دەرد و رەنج رووی تی ئەکردن نە ئەندوهو مینەت سەری لی ئەدان.

هەر کاتی نیوی بەختیارم نەبهیست، لە باغ و بەردار ؛ زیر و زیو، جیگا و شهرت، بەم لاوە هیچم لی نەدەزانی بە ئەو دەمەی دلم بەم سپارد بوم دەرکەوت کە لە گیتی دا بەختیاریی هەر بەختیاریی دلداریە مروو کە بەختیار بی تاپویان ئەویت نەک هی گیان وەکو ئەم مردوانەن کە بە هەریر و ئەتلەس دایان بپوشن کە چی لاکەکەیان ئەبیتە خواردنگای کرم و مار و دووپشکان .

(٢)

خوشم ویست، بەر لەوەی لەوە زیاتر کە خوشی ئەویم شتیکی لە ئەحوال بزانم ولی خوی بە من سپارد تا منیش گەنجینەی دلم پیشکەش کرد بە خوم ئەگوت کە ئەمە شتیکی زور کەم و بی بەهایە لە بەرانبەر ئەم بەخشیشە گەورەی ئەوا روژگاریکم لە ناو خزمەکانم رابوارد کە نە چاوەدیری کاریان ئەکردم نە پرسیاریکیان لە ئەحوالم، لە تالی و مەینەتی زەمانە وەهام چیشت کە کەسی دی لەتوانای دا نەبوو لەم بەینەدا یەکیکم دیت کە ئەحوالم ئەپرسی و لە ناخوشیکانی ژیانا دلخوشیم ئەداتەوە بە دلسوزیو دلووانی بوم ئە گری من تا ئەم روژە نەم دیبو هیچ چاویک فرمیسکم بو برژینی و کەسی بم لاوینیتەوە.

کەسیکم دیت کە جوانی منی لا خوشەویستە و وەکو نیگاریکی بە بەها ئەیروانیتی یە یەکیک بو چون خاوەن مال دلی بە مال و دراوی خوی خوش ئەبی دلی بە من خوش ئەبو ووتەکانمی وینەی چیروکیکی تازە وەرئەگرت و من تا ئەوکاتە کەسم نەدیبو خوشی بویم بەلام ئەو روژە دلیکم دیت کە بوم ئەکەویتە خورپە و لی دان چاویکیشم بەر

چاو هات لە ریگای منا ئەسرینی ئەرژاند گیانیک بو لە من زیاتر کەسی خوش نەئەویست جا ئەگەر ژینی خومی پیشکەش کەمو و سەری لە ریدا دابنیم دیاریکی بی بەهایە بەم حالەوە چون ئەتوانم لە تەسلیم کردنی دل و گیانم چرووکی بنوینم.

نوخشە جار کە چاوم پی کەوت دەستم گرت ویستم بی نیمە سەر سینگی خوم بەلکو اگری دەروونم دامرکیتەوە، لیم دوور کەوتەوە بە توورەیی چاوی لی کردمو بە لومە و سەرزەنشتەوە گوتی، لە دلداریدا پیاو بە وە منالی بو خەلک بە جی بهیلە.

ئەگەر تو منت بو خاتری گیانم خوش ئەوی وا رەوانم لە ئەزمانتایە و لە تو نەبی لەهەمو کەس خو ئەپاریزیت ئەگەر دلداری توش لە پیناو ئەم صورەتە تاپویەی منایە چەند پەست هیمەتو گیان نەزمی آیا، بویەت فرمیسک ئەرژاند و شەوانە نەدەنووستیو دلی خوت ئەسووتاند و هەل ئەقرچاند کە دەست بە بسکیک دابخشینی و یا پیستیکی ماچ بکەی؟؟! هەر وەکو گیانت بەرزە؛ دلداریشت بەرز بیت بزانە لە گیانی تو زیاتر چی ترم خوش ناویت و ئەتوش هەر گیانی منت خوش بویت.

ئەم قسانەی کە کرد لەبەر چاوی خوم گەلی پچوک بومەوە آرەزووم ئەکرد خوزگە لە پیش ئەم پیرانەدا مەرگ بهاتایە لام تا ئەم وەختەم نەدیبایە، پوزشتم لی خواست، داوای بوردینم لەم سووچەم کرد، لە ویدا کاریکی وام نەکردەوە.

ایستا نرخی ئەم آموژگاریم بو دەرکەوت، بەهای ئەم شارەزای یەم زانی و دەپایەی دلداری پاک گەیشتم.

گیانی من کە وەکو آوینە ژنگی گرتبو دلداریی خاوینی کردەوە کەم کەم جەلای داوە من کە سینگم پر بوو لە کین و بەغیلیی دوژمنانم ایستا نشانەییکیشی لەمانە تیدا نەماوە چونکوو دلداری وەکو پادشاهیک تەواوی ملکی دلی بو خوی داگیر کردوە و جەی بو ئەمانە نەهیشتوتەوە.

بە توزیک دەرد و ئەندوە هەراسان ئەبووم دلم تەنگ ئەبوو،آرزویکم پیک نەهاتبا رقم هەل دەستا بەلام ایستا بە دلیکی گوشادەوە رائەوەستم کین و رق ناتوانن بەسەرما زال ببن.

دل رەق بووم بەزەییم بە هەژاریکدا نەدەهاتو زگم بە لی قەوماویک نەدەسوتا

ایستا هەر چەخاریک بو مەردوم روو ئەدا منیش پی ی دل پەروش ئەبم چارەرەشی هەمو لی قەوماویک دلم تەنگ ئەکا چونکو نووری دلداری کیشوەری دلمی روناک کردوتەوە پەردەییکی ئەستووری کە لە بەینی ئەمو مەردوما کیشرابو هەلداوتەوە.

دوروندەییک بووم کە گیتیی منی پی رام نە ئەکرا بەلام بە دەستی دلداری بو آدەمیزادیکی پەری روحیک شەویکی پیکەوە چوینە کەنار شەتاویکی، آوی روبارەکە روون و آسمان ساو بوو لە رووی هەر دووکیانا ئەستیرە چاوبرکی یان ئەکرد و ئەدرەوشانەوە دوو آسمانم دەهاتە بەر چاو جیگای آو و آسمانم لیک نەدەکردەوە بو هەموو لایک ئەچووین، بیدەنگ بووین ئەتگوت آرامی و بی دەنگی شەو لە دلی ایمەدا کاریگەر ببوو لە بەر جلال و گەورەیی شەو بوو کە لیومان لیک هەلنەدەپچرا لەو کاتەدا بەدەنی خوم زور پی سووک بوو صەفا و خوشیکم لە گیانما دیت پیم وابوو کە بە بی پەر و بال ئەتوانم بو آسمان هەلفرم، بە چاو تی برینیک پەردەی آسمانان بدرم، بچمە دنیای بەرز و ئەوەی مەردوم نایزانن من ببینم آرەزووم بوو کە تیشکەکانی آسمان ری یان لی هەتلە بی و نەتوانن خو لە بەر چاوم آوا بکەن، شەویش رووپوشیک بە سەر خویا بکیشیتو لی ی بنوی و بەشوین بەیانا نەگەری تا ایمەش لە ژیر خیوەتی دا کە کچانی گەردون ریگایان لی ون بوە ریگای خومان بگرینەوە پیش.

بیدەنگی شەوم شکاند لیم پرسی آخر ئەتوش هەستت بەم بەختیاریەی من لە خومیدا ئەبینم کردوە؟

ووتی نەآ چونکو من لە کار و باری گیتی ی و باری روژگار شتی وا ئەزانم کە تو نایزانیت بەو چاوەی تو ئەروانیتە گیتی ی من بەو چاوەی تەماشا ناکەم.

. تو بە آرەزو بەختیاری ی، و من بە راستی و چارەرەشی، تو بەختیاری چونکو دەزانی هەمیشە بەختیار ئەبی و دووری لە دوای ی ایمە دا نیە.

بەلام من بەدبەختم چونکو هەمو دەمیک چاوەروانم آخو کەی ئەم خوشی لەبەرم رائەکا و لیک جوی ئەبینەوە.

ئەگەر توانیت هەتاو لە آسمانا بوەستینی، زەوی لە بزوتن بخەی، بزوکیک رابگریو ئەگەریک بخەیە گەران ئەو روژە دەستە بەری مانەوەی دایمی ی بەختیاری بو خوت

بکە کاتی ئەمەی گوت: دەمی لیک نا تاویک سەریداخست دیتم فرمیسک وەکو مرراوی بە سەر گونای دا دیتە خوار بو گریانی گریام و چەند دلوپە فرمیسک دارژت ووتم بو چی ئەگری؟ ووتی لە ترسی دووری ئەگریم ووتم لە ژیانا یا لە مردنا ؟

ووتی نەآ لە دوور بوونەوە لە ژیاندا ناترسم؛ چونکو هیچ هیزیک لە گیتی دا ناتوانی منو تو لیک جوی بکاتەوە من تەنیا لەم دوور بوونەوەیە ئەترسم کە مەرگ لە نیومانی ئەخا، ئەو دوور بونەوەیە بە هیچ باریک چاری ناکریو ناتوانم لەبەریشی رابکەم و ئەوەم کە بهیست پیم ووت آخو ئەتوانی پەیمانیک ببەستین، کە بەییکەوە بژین و پیکەوەش بمرین ووتی ئەم پەیمانە هەموو ئەندوهیکی لابرد. پەیمانمان بەست شەو داوینی کراسی خوی بەلادا ئەکرد تا لە پیش سوپای سەرکەوتووی بەیان رابکات بە کەنیشکەکانی خوی ئەگوت تا خو لە جلادی روژ بشیرنەوە.

آخر روژگاری ستەمکار ئەتوانی سەعاتیک بنوی، لە مەردوم بی اگا بمینیتەوە،آخو لە باری دا هەیە پیالەییکی لیلی نەبیو بەدبەختی تی نەکرابی دەرخواردی آدمیزاد بدات.

آخر لە دەستی دیت لە بەخشینی بەختیاریکی ایرو ئەیداو سبەینی دەی ئەستینیتەوە دەس رابگریو لە جامی خوی هیچ دەخواردی مروو نەدات.

... لە پیش بەدبەختی و چارە رەشی یەک لە سەر یەک ... گری بەلام بەختیاری پچر پچر لە پیی ئەخات.

...مەردوم بە آرەزو دەژین ئەگەر چی آرەزوو دەیان کوژیو کراسی ژیانیان ئەدرینیت.

خوزگە هەر بەختیار نەدەبوم. چونکو من بەدبەخت نەبووم مەگەر بەهوی بەختیاریمەوە، بریا آرەزوو لە دلما نەبایە چونکو ئەم بی هیوایی یە کەوا ئەم کوژی هەر بە ریگای هیوادا هاتوتە لای من.

کچیکی کە گیتیی بە تیشکیی جوانیی رووناک بوو دونیا بەویوە نرخیکی هەبوو دەستی مەرگ رفاندی، مردنی ئەم هەمو زیندوکانیشی مراند.

زەویی ئەو زەویی جاران نیە کە ئەم دیت آسمانیشم جوریکی تر دیتە بەر چاو. مەل و بالدار هەمو بی دەنگن بلبلان چریکەیان بریوە لک و پوپی درەختان ناجوولیتەوە

ئەستیرەکان آوا بوون، گولان سیس و ژاکاوون طەبیعەت چارەییکی تیک سمراو و دلسوتینی هەیە، بزە بە لیوبوە دیار نیە، رووی نادرەوشی، گیتیی گەراوەتەوە سەردەمی پیشوو، نە انسانیکی تی یایە نە گیاندارێکی تی یا ئەبینریت، ئەلیی من آدەمی مەشهوورم کە بو دووری بەهەشت ئەگریم لە بی هاوالی ئەکروزیتەوە ئەمەوی،

از دل تنگ گنهکار برآرم آهی

کاتش اندر جگر آدم وحوا میکنم

ئەی روزگار بی مرووەت، ئەگەر بە مراندنی ئەم گولەنازکە بە سەر منا زال بووی هەرگیز ناتوانی بە سەر خوما زال بیت، تو هەرکەست آرەزو بیت لە گیتی ئەیبەیە دەرەوە بەلام یەکیک بو خوی بخوازی بەدەر کەویت ناتوانی پیشی لی بگریت. ئەی کەسیکی آوارەو سەرگەردانی! بەم نیزیکانە لەسەرگردانیت دەرئەکەم ئەبی پەیمانی منو تو لەمەودواش هەر وەکو روژگاری رابواردو بیت.

هەر وەکو لەم دونیایەدا گیانمان هوگری یەک بوون ئەبی لەم دونیاش دا هەروا بن.

کوردستان ژمارەی ١٨ سالی یەکەم شەممۆ ٤ی رەشەمەی ١٣٢٤ ٢٣ی فوریەی ١٩٤٦

## شەرابی سور

ع. ذبیحی

به شای لوغان دەخوم ئەودەم شەرابی سور
کە بیتە دەر لە شەرقی انقلابا آفتابی سور

قوربانی ئەو دەمەم کە لە خوینی ستەم گەران
دەریایی انقلاب ببی پر حبابی سور

چەند خوشە ئەو زەمانە بە دارداری چەکچوداس
کوردان لە گەردنی دوژمن بکەن تەنابی سور!

مەرژینە هیندە خوینی رەنجبەر ایمروکە، خان

روژی حساب ئەکیشی لە تو انقلابی سور

پرسیاری دا بە من لە آنیە یی خوی جەناب

هینامە پیشی خەنجەرە کەم، ها جوابی سور

آغا شەرابی سوری لە پیشە و لە برسیتی

چاوی پرە کچی جوتیر لە آوی سور

خوتان بشون بە خوینی عدو کوردە راپەرن

فتوای شەرعی انقلابە بە نصی کتابی سور

کە نگی دە بی کە دەستی علم هەلبداتەوە

« بێژە ن » لەروی کچە کوردان نقابی سور

(بە هیندیک دەستکاری لە دیوانی ابوالقاسم لاهوتی کوردی کرمانشانی تەرجمە کراوە. )

کوردستان ژمارەی ٢٩سالی یەکەم شەممۆ ١٠ی خاکەلیوەی ١٣٢٥ ٣٠ی مارسی ١٩٤٦

## هاوپرسەکی گنرالیسموس ستالین
## دە گەل پەیام نووسی روژنامەی (پراودا)

مخبری روژنامەی پراودا بو رووناک کردنی نطقی جنابی چرچیل کە ئەم روژانە لە شاری « فولتون »ی آمریکا کردوویە هیندیک پرسیاری لە گنرالیسموس ستالین کردووە و وەلامی وەرگرتوتەوە بو کەلک لی وەرگرتنی برایانی کورد عینی پرسیار و وەلامەکان دەنووسم ئەگەر پیم کرا مقالەییکیش لەم بابەتەوە بو روژنامەی کوردستان دەنیرم.

عبدالرحمن ذبیحی

پ-ایوە بو ئەوەی نطقەی جنابی چرچیل لە آمریکا کردویەتی چی نرخیک دادەنین؟

و-ئەمن ئەوی بە نطقیک کە بو بلاوکردنی تو-وی نفاق لە نیوان حکومەتە یەک گرتوکان و گران کردنی هاوکاری ئەوان کرابیت دادەنیم.

پ-دەتوانن بیـژن کـە نطقی جنابی چرچیل زیان بە کـاری آشتـیو آسـایشت دەگەهینی؟

و-بی گومان دەتوانین وا بیژین، بروانینە حقیقتی امر دەبینین جنابی چرچیل خویو دوستـەکانی چی لەانگلسـتـان و چی لە آمریکا ایستـا لە ریزی اگرتیـژکەرانی جەنگ دا راوەسـتـاوون-جنابی چرچیل ودوسـتـەکـانی هیـتلەر و دەسـتـە و دایەرەکـەی وەبیـر ایمە دەهیننەوە، هیتلەر بە دەربرینی نظریەی رەگەزی و تەنیا بە گەورە زانیی ئەو کەسانەی کە بە زمـانی المانی دەدوین دەست بە کـاری بلاوکـردنەوەی جـەنـگ و جنابی چرچیلیش دەلی هەر ئەو نەتەوانەی کە بە زمـانی انگلیـسی دەآخیـون بو حلی مـقدراتی گیـتی لایقن بەم جورە بە هینانە گوری نظریەی رەگەزیی اگری جەنگ دەدەمین.

نظریەی (تفوق نژادی المان) هیتلەر و دوستـەکانی معتـقد کردبوو کە المانەکان بو حکمرانی لە سەر نەتەوەکانی دیکە دروست کراوون.

هەر وا (نظریەی نژادی انگلیس) یش جنابی چرچیل و دوستـەکانی دینیتە سەر ئەم عـقیـدەیە کـە ئەو نـەتەوانەی بە انگلیـسی دەدوین دەبی ببنە آغـای نەتەوەکـانی دیکـەی گیتی.

لە حقیـقتی امر وورد ببینەوە جنابی چرچیل و دوستـەکانی چی لە آمریکا و چی لە انگلستان ئەو اولتیماتومەیان: «آغایەتی ایمە بە خوشی خوتان قبول بکەن تا هەمو کار و باری گیتی ریک و پیک بی، دەنا بی گومان جەنگ دەقەومی» داوە بە ئەو نەتەوانەی کە بە انگلیسی نادوین.

بەلام جەنگی، خوننی پینج سالەی نەتەوەکان بو گورینەوەی آغایەتی هیلتەریەکان بە آغـایەتی چرچیلیـەکـان نەبوو، لە پیناو آزادی و سـەربەخـویی تەواوی وولاتەکـەیان خـوینیـان رژاندووە، لەم صورتەدا آشکرایە ئەو نەتەوانەی بە انگلیـسی قـسـە ناکـەن و زورایەتی گەوەری گیـتی دەهیننە بەرهەم راضی نابن بەرەو دیلی و یخسیـریکی تازە برون، جنابی چرچیل وەکو محافظە کاریکی زور لاسار ئەم حقیقتە آشکرایە تی ناگات.

بی گومان ریگاییکی جنابی چرچیل گرتویەتە پیش بەرەو جەنگ دەروا، بانگهیشتنیکە بو جەنگ لە علیهی کومارەکانی یەکیتی سووەت، هەروەها دەگەل پەیمانیک کە لە نیوان یەکتیی سووەت و بریتانیادا هەیە موافق نیە، جنابی چرچیل تەنیا بو فریودانی خەلک دەری بریوە کە پیمانی هاوکاریو یارمەتی یەکتیی سووەت و انگلیس تا پەنجا سال دریژ بکریتەوە و چونکو ئەو قسەیەی جنابی چرچیل بە هیچ باریک دەگەل آموژگاریکانی بو جەنگ لە علیهی یەکتیی سووەت ریک ناکەویت.

قسەی آغای چرچیل کە لە لاییکەوە خەلکی بو جەنگ لە علیهی یەکتیی سووەت هان دەدا و لە لایکی دیکەشەوە آرەزو دەکا پەیمانی نیوانی یەکتیی سووەت و انگلیس تا ٥٠ سال دریژ بکریتەوە پیمان نشان دەدا کە آغای چرچیل فقط بو داپوشینی بیرانی خوی لە (ضدی یەکتیی سووەت) موضوعی پەیمانی هیناوەتە گور.

ایمە ناتوانین هیچ اهمیتیکی بە بەیاناتی ساختەی آغای چرچیل و دوستەکانی لە بابت پنجا سال یا زیاتر دریژ کردنەوەی ئەم پەیمانە بدەین چونکوو ئەگەر یەکیک پەیمانەکە بپسنیو بیکاتە کاغذیکی هیچ و پوچ ایتر دریژ کردنەوە و ماوە پیدانی بی معنایە.

پ-جنابی چرچیل لە نطقەکەی خویدا پەلاماری رژیمی دیموکراسی حکومەتە آوروپاییکانی دەرهاوسی ایمە دەداو مناسباتی دوستایەتیو هاوسایەتی ایمە و ئەوان تەنقید دەکا ایوە چە ئەرجیکتان بو ئەم بەشە داناوە؟

و-ئەو بەشەی ووتەی جنابی چرچیل پرە لە بوختان و بی ئەدەبی، جنابی چرچیل ادعا دەکا کە: شارانی بە ناو بانگی :وارشوا، بەرلین، پراگ، ویانە، بوداپەست، بلگراد، بکرش و سوفیا و دانیشتوانی دەوروبەری ئەوان لە ژیر نفوذی یەکتیی سووەت دان، بەلکو لە ژیر نظارەتی (موسکوا)دا رای دەبویرن و ئەم چاوەدیریش روژ بە روژ لە زیاد بوونایە، جنابی چرچیل ئەو قسانە بە عنوانی «آرزووی بی پایانی پەرەسندن ی یەکتیی سووەت» بەیان دەکا.

بو اثباتی بی ئەدەبی جەنابی چرچیل دەربارەی حکومەتی موسکو و جیرانەکانی یەکتیی سووەت زەحمەتیکی تایبەتی لازم نیە.

لە یەکەم کاتا: نوینەرانی چوار دەولەتی یەک گرتوو بو چاوە دیری بەرلین و ویانا

شورایان هەیە کە یەکیتی سوەت لە هەر کاریکدا چواریەکی رەئی ئەوانی هەیە: بویە چاوەدیری جیاوازی یەکیتی سووەت لەم جیگایانەدا امکانی نیە.

هیندیک پیاو هەن کە لە باریان دانیە و ناتوانن لە تومانج کردن بە خەلک خو بپاریزن بەلام پیویستە لە هەمو حالیکدا راە و درجەییک بو هەر کاریک دابندری.

لە دووەم کاتا هجومی المانەکان کە لە بوونی حکومەتانی ضد سووەت لە وولاتانی (فینلاندیا، لهستان، رومانیا، بولگاریا،مجارستان، استفادەیان کرد و خویان دەخاکی یەکیتی سووەت کوتا لە بیر ناکریت.

لە نەتیجەی پەلاماری المانەکان، لەو جەنگانەدا کە دەگەل ئەوان کراوە و هەروا بە هوی داگیر کرانی وولات لە لایەن هیزی المانەوە و بە دیل بردن پیاوانی، یەکیتی سووەت نیزیکەی ٧ ملیون نفوسی بە ییکجاری لە کیس چوو، تلفاتی یەکیتی سووەت بە تەنیایی چەند بەرابەری تلفاتی انگلیس و آمریکایە.

رەنگە لە هیندیک جیگایان بیانەویت ئەو قوربانیانەی کە یەکتیی سووەت لە پیناو رزگار کردنی اورووپا داویەتی فەراموش بکریت بەلام یەکیتی سووەت ناتوانی لە بیریان بکات.

آیا چی عیبیکی هەیە یەکیتی سووەت بو تامینی دواروژی خوی دەگەل ئەو وولاتانا پیوەندی باش پەیدا بکات.

کەسیک عقلی هەبیت بە کوششتیکی حکومەتی ایمە لە پیناو آشتی دا دەیکا نالی (آرەزووی پەرەستەندن) جنابی چرچیل ادعا دەکا «لهستان کە لە ژیر فەرمانی روسەکاندایە لە علیهی المانەکان بو کاری زور گەورە و بیدادی هان دەدرا» تەواوی ئەو قسانە افتراییکی پر لە سوکایەتی و بی ادبیە.

لهستانی دموکراتی ایستا لە لایەن پیاوانی بە ناوبانگەوە کە لیاقتی خویان بو پاراستنی قازانجی وولاتەکەیان لە چاو کاربەدەستانی پیشو ثابت کردووە ادارە دەکری.

بو اثباتی ئەوەی کە کاربەدەستانی ایستای لهستان لە وولاتی خویان دا اجازەی حکمرانی بە نمایندەکانی خارجی دەدەن جنابی چرچیل چی بە دەستەوە؟

آخو افترا کردنی جنابی چرچیل بە (روسەکان) هەر بویە نیە کە تو-وی دووبەرەکی

لە نیوان یەکیتی سووەت و لهستاندا بپرژێنیت؟

جنابی چرچیل لە سیاستی لهستان کە دەگەل یەکیتی سووەت هەر بەرەو دوستایەتی و یەکیتی دەچیت ناراضیە؛ زەمانک بوو عناصری ضدی یەکیتی سووەت لە لهستان زور بوو آغای چرچیل دەیەویست لەم ضدیەتە استفادە بکا بە بەهانەی مدافعە لە بەرامبەر رووسەکان و ترساندنی رووسەکان لە جەنگیک کە لە نیوان لهستان و ئەوان دا هەلدایسیت لهستان بگریتە دەست خو وخوی بە پیاویکی منصف بداتە قەلەم، بەلام ئەو زەمانە رابرد چونکوو دوژمنایەتی نیوانی روسەکان و لهستان جیگای خوی داوە بە دوستایەتی، لهستان؛ لهستانی دیموکراتی ایستا نایەویت چیدیکە لە دەست بیگانەکاندا بیتە فوتبول و بە آرەزوی خویان یاری پی بکەن ئەمن پیم وایە تەنیا ئەمەیە جنابی چرچیلی توورە کردوە کە بەم چەشنە دەرحەق بە لهستان بی ئەدەبانە دەدویت لە کنفرانسی سی دەولەتان کە لە بەرلین گیرا حکومەتی لهستان داوای ئەو خاکانەی خوی کردەوە کە ئەلمانەکان لە لای روژآوای لهستان داگیریان کردبوو یەکیتی سووەت ئەم داوایەی بە داواییکی راست و عادلانەی لهستان زانی هەروا کنفرانسیش ئەم موضوعەی وەکوو حقیقت و داوای ئەساسی لهستان تلقی کرد ئەمە بوتە سبەبی ناراضیتی جەنابی چەچیل و دەستی کردووە بە مغالطە کاریو پەلاماردانی یەکیتی سووەت بەلام خو ئەم قەرارە تەنیا لە لاین یەکیتی سووەتەوە نەدراوە بەلکو انگلیس و ئەمریکاش بە تەواوی قبولیان کردوە ئەدی بو چی جنابی چرچیل تیری تومانج و بوختانی خوی تەنیا گرتوتە یەکیتی سووەت؟ شاردنەوەی بیرانی خەلکی بوچی بو جنابی چرچیل پیویست بووە؟

جەنابی چرچیل لە دوایی دا ادعادەکا: «لە تەواوی حکومەتانی روژهەلاتی اوروپا کومەلانی کمونیست کە لە کاتی خوی دا زور بی هیز و ژمارەیان کەم بوو ایستا بەهیز و زور بوون و لە هەموکاریک توتالیتەکان بو چاوەدیری کار و بار تیدەکوشن، دەتوانین بیژین لە تەواوی ئەو وولاتانەدا حکومەتی پولیسی بەرقەرارە و بیجگە لە چکوسلواکیا هیچ چەشنە دیموکراتیکی راست پەیدا نابیت».

دەولەتی انگلیز ایستا لە لایەن کومەلی کریکارانەوە هەلدەسووریندریتو کومەلانی دیکە لە شرکت دە کابینەدا بە تەواوی بی بەشن، گویا جەنابی چرچیل ئەوەی پی

دیموکراتیکی راست و حقیقتە.

لە وولاتانی لهستانی، رومانیا، یوگوسلاوی، و بلگارستان و مجارستان حکوومەت بە دەست یکیتیکی کومەلان (لە چوار تاشەش کومەلە) ادارە دەکریو کومەلانی مخالفیش ئەگەر کە بو زور بو هاوکاری حاضر بن حقی شرکتان لە کابینەدا بو تامین کراوە، جەنابی چرچیل ئەمە بە توتالیتاریزم، استبداد، حکوومەتی پولیسی دادەنی بو چی؟! اساسا منتظری مەبن لەم بابەتەوە جوابیکتان لە جەنابی چرچیل وەگیر کەویت.

جەنابی چرچیل نازانی بە نطقی پر لە هەرا و هوریای خوی لە بارەی توتالیتاریزم، استبداد و پولیسگەری خوی خستوتە چە وضعیکی نالەبار.

آرەزووی جەنابی چرچیل ئەوەیە کە لهستان لە لایەن سوسینکوفسکی و آندەرس، یوگوسلاویا بەدەستی میخائیلوویچ و پاوەلج، رومانیا لە طرف کانیاز شتربی و رادەسقو، وە مجارستان و آوستریاش لە لایەن هەر یەک لە پادشایانی بنەمالەی هابسبورگەوە ادارە بکریت.

جەنابی چەرچیل تەمایەتی پی مان بسەلمینی ئەو آغایانە کە کاسەوەلیسی ژیر خانی فاشیزمن دەتوانن لەم وولاتانەی سەرەوەدا دموکراتیزمی بە راستی بهیننە وجود، دموکراتی جەنابی چەرچیل وەهایە !

جەنابی چەرچیل کاتیک کە لە پەرەسندنی نفوذی کومەلانی کومونیست لە روژهەلاتی آوروپا دەدوی کەمیک لە راستی نیزیک دەبیتەوە بەلام دەبی بشزانین کە بە چاکی وورد نەبوتەوە و دقتی نەکردوە، نفوذی کومەلی کومونیست نە وەک هەر لە آوروپای شرقی بەلکو لەو جیگایانەی کە لە پیشدا فاشیستەکان آغایەتیان تیدا دەکرد لە تەواوی آوروپا «ایتالیا، آلمان، مجارستان، بولگارستان، رومانیا و فینلاندیا»دا یا خو لەو وولاتانەی کە آلمان و ایتالیا یا مجارستان داگیریان کردبوون (فرانسە، بەلژیک، هوللاندا، نورووەژ، دانماک، لهستان، چەکوسلواکیا، یوگوسلاوی، یونان و یەکتی سووەت... هتد)یش دا زیادتر بووە و پەرەی سەندوە.

توسعەی نفوذی کومونیستەکان شتیکی تصادفی نیە بەلکو واقعەییکە کە بە تەواوی مطابق قانونە، چونکو کومونیستەکان لە سالانی آغایی فاشیزم لە سەر آوروپا

بە هوی مبارزە و فداکاری لە پیناو آزادی مەردومدا بونە جیگای اعتبار بو خەلک.

جەنابی چەرچیل لە نطقی خویدا باسی هیندیک (پیاوی سادە) دەکا دستیان لەپشتی دەدا خوی بە دوستی ئەوان معرفی دەکا ، بەلام ئەو پیاوە سادانەش وەکوو لە یەکەم نظردا دینە بر چاو سادە نین، اوان آمانج و سیاستی تایبەتی خویان هەیە ، دەتوانن خویان ادارە بکەن هەر ئەوانە (ئەو پیاوە سادانە) لە انگلستان میلیون میلیون لە علیهی چەرچیل و کومەلەکەی رایان بو کومەلی کریکاران دا، هەر ئەو پیاوە سادانە لە آوروپادا مرتجعەکان و دستە و دایرەی فاشیزمیان روتاندونەوە و کومەلانی دیموکراتی دەستی چەپیان وەسەر خست، هەر ئەو پیاوە سادانە بون لە نیو بلیسەی مبارزەی کومونیستەکان دە گەل فاشیزم اثباتیان کرد کە کومونیستەکان بو باوەر پیکردنی مردوم دەشین، لە آوروپادا نفوذی کومونیستەکان بەم چەشنە زیاد بووە ئەوەیە قانونی پیشکەوتنی تاریخی لە گیتی دا، معلومە جەنابی چەرچیل ئەمەی پیخوش نیە بویە هانا دەباتە بەر هیز و زور و هەراو هوریا ساز دەکا ، هەروا دوای جەنگی رابردوش کە لە روسیا رژیمی سووەت هاتە سەرکار جەنابی چەرچیل پی-ی ناخوش بوو آرەزوی کرد پیش بە سەیری تاریخ بگریت ١٤دەولەتی لە علیهی روسیا بو جەنگ هان دا بەلام تاریخ زور لە جەنابی چەرچیل بە هیزتر بوو و مداخلەی مسلحی دون کیشوتانەی جەنابی چەرچیل توشی شکان و مغلوبیتیکی تەواو بوو.

ئەمن نازانم جەنابی چەرچیل و دوستەکانی بو تشکیلی یەکەتی جەنگی لە علیهی آوروپای روژهەلات موفق دەبن یان نا ، احتمالی موفقتیان زور کەمە چونکو بە میلیون پیاوانی سادە بو پاسەوانی کاری صلح راوەستاون و بەدل نیایی دەتوانین ببیژین هەروەکو ٢٦ سال لەمەو پیش مقاومەتیان کرد دیسانیش هەر بەو جوری بەربەرکانی دەکەن.

لە هەڵسورانی مامۆستا زەبیحی لە سەردەمی کۆمار و دوای ئازاد بوونی لە زیندان بە داخەوە زۆر بەڵگە و سەرچاوە بە دەستەوە نییە، ئەوەش بە رای من زۆر شتێکی نائاسایی نییە! هۆی ئەوەش هەروەک باس کرا ئەوەیە کە زەبیحی دوای هاتنەدەر لە زیندان و ئاگادار بوونی لەوەی کە کۆمەڵە ئیتر ناماوە زۆر شاد و رازی نەبووە. ئەوەش زۆر تەبیعی یە کە مرۆڤ لە کاتی وادا ئەو هەست و زۆقی جارانی نەمێنێ. دیارە لەو سەرچاوانەی کە بە دەستەوەن باسی زەبیحی زۆرتر لە مەر کۆمەڵەی ژ.ک کراوە هەر چەند لەو کتێبانەی کە بە دەستی بێگانە نووسراوە و ئەوانەی خۆشمان زۆرتر هەر لە وانیان دیسان وەرگرتووەتەوە لە چەند جێدا رەسمی هاتووە و لە ریزی کاربەدەستان و بەرێوەبەرانی کۆماردا راوەستاوە و لە چەند جێگاشدا باسی زەبیحی کراوە کە بۆ وتوویژ لە گەڵ روسەکان وە یان ئینگلیسێکان لە لایان قازی محەمەدەوە ناردراوە بەڵام هیچکام لەو سەرچاوانەم بە تەواوی بۆ ساغ نەکراوە و تەنانەت ئەو تاریخەی کە ئەوان دەڵێن زەبیحی چووە بۆ وتوویژ رێک ئەو تاریخە دەگرێتەوە کە زەبیحی لە زیندان بووە وەک تاریخەکەی ویلیام ئیگلتۆن جۆنیر کە دەڵی "لە ئاخری مانگی دیسامبر ساڵی ١٩٤٥ قازی دەسەڵاتی دا بە زەبیحی و عەلی ریحانی کە بچن لە گەڵ کۆنسولی بریتانیا لە مەر پەیوەندی کوردستان و بریتانیا وتوویژ بکەن و..." وەک ئاگادار کران و لە لاپەرەکانی پێشودا بە بەڵگە سەلمێندرا لەو مانگەدا زەبیحی لە زیندان بووە و ئەو بەڵگەیە ناکرێ وەراست بچێ!

ئەمن حەولم دا کە هەموو نووسراوەکانی زەبیحی کە لە سەردەمی کۆمار و لە رۆژنامەی "کوردستان" دا حاپ کراوە بیخەمە بەر چاوی ئێوەی هێژا، هەروەک هەستتان پێکرد بە داخەوە لە دوو تەرجمە و شێعرێک زیاتر نەبوو کە ئەوەش لە چاو چالاکیێکانی زەبیحی لە سەردەمی ژ.ک و گۆڤاری "نیشتمان" زۆر کەم و جێگای قیاس نییە. (هەڵبەت پێویست بە گوتنە کە ئەمن ٦٦ دانە لە ژمارەکانی رۆژنامەی"کوردستان"م لە لا دەست دەکەوێ و دەبێ لەوە زیاتر بن، لە پرسیار و حەولداندا نەمبیست کە زەبیحی نووسراوەی تری هەبێت).

زەبیحی لە سەردەمی جوانە مەرگ بوونی کۆماری کوردستان لە سابلاغ گیر نابێ و

پێش ئەوەی ئەرتەشی شای ئێران بگاتە سابلاغ لە گەڵ کاک سەدیقی حەیدەری سابلاغ بەرەو کوردستانی خوارروو و ماڵی شێخ لەتیفی کوری شێخ مەحموودی نەمر لە سیتەک بۆ ماوەی زیاتر لە ٣٣ ساڵ بەجێ دێڵێ و ژیانی تەواو وەخت سیاسی دەگرێتە پێش و هەتا شەهید بوون و تێدا چوونی هەر کوڕ دەمێنێتەوە و رۆژێک لە رۆژان بیری ئەوە ناکاتەوە کە دەبێ شەریکی ژیانێک بۆخۆی وەدۆزێ و چەند منداڵێک بە دوای خۆیدا بە جێ بهێڵێ.

پێویست بە گوتنە کە زەبیحی لە ئاخر ساعەتەکانی کۆمار لە لایان قازی محەمەدوە چووە بۆ کۆنسولی سۆڤیەت لە ورمێ و داوای پەنابەری بۆ ١٧ ماڵە سابلاغی لەوانە ماڵی قازێکان و ماڵی خۆیان و... کردووە کە بە داخەوە روسەکان قەبوڵیان نەکردووە و پاش ئەوە زۆری لە گەڵ شەخسی پێشەوا حەول داوە کە لە گەڵیی بچێ بۆ خوارووی کوردستان کە پێشەوا قەبولی نەکردووە و نەچووە.

باشترە لێرەدا خوێنەرەوەی خۆشەویست لە گەڵ ئەو بەرێزانە کە وتوویژم لە گەڵا کردوون جێ هێڵم کە ئەوان زۆرتر لە سەر ئەو بابەتانە و ژیانی "ع . بیژەن" و "عەبدولڕەحمان زەبیحی" لە رۆژهەڵاتی کوردستان و "مامۆستا عولەما" لە خوارووی کوردستان و "عیسی عرفات" لە رۆژاوای کوردستان باستان بۆ بکەن و ئەمن چیتر زێدە بێژی نەکەم.

# وتوویژ لە گەڵ رەعنا زەبیحی

١٩٩٥/٩/١٤

**عەلی:** تکایە بفەرموون چۆنتان مامۆستا زەبیحی لە بیرە، لە سەردەمی منالی چۆن بوو وچی دەکرد و هەرچی لە بیرتانە بفەرموون.

**رەعنا:** ئەمن زۆر بە منالی مامۆستا زەبیحیم دیوە، تا ئەو سەفەرەی ئاخر کە سالی ١٩٧٩هاتەوە، بەڵام لەودەمێوە کە لە بیرمە و چاوم کردووەتەوە عەلاقەیەکی زیاترم لە خوشک و براکانی دیکەم بە مامۆستا زەبیحی بووە. ئەوجار کە ئەویش رۆیشتووە و هەڵوەدای جێگایان بووە هەر ئەمن زۆرتر وەدوای کەوتووم، هەر بەو عەلاقەی کە لە منالییەوە پێمبووە هەر وەدوای کاغەز و خەبەرێکی وی کەوتووم و ئێستاش کە کتێب و کاغەزێکی وی دەبینم لە لام عەزیزە و ئەو وەک بابێک بوو بۆ من، هەمیشە حەسرەت دەخوازم کە نەمتوانیوە ئەو جورەی کە دەبوو کەڵکی لێ وەرگرم و زۆری لە گەڵ نەبووم.

ئەوجار ئەوەندەی کە لە بیرم بێ کاکم لەو ساڵانەی پێش بۆمبارانی سابلاغ یانی پێش قازی محەمەد و کۆمار و ئەوانە کە بابمان مرد، ئێمە کە چاومان هەڵێناوە هەر کاکمان دیوە و هەر ئەو بابمان بووە. یەک دوو ساڵ دوای ئەوەی بابمان مرد رۆژێک هاتەوە گوتی پێمخۆشە ئێوە لە شار بچنە دەر رەنگە شەڕ بێ و بۆمباران هەبێ و ئەوانە، دایکیشم کە زۆری عەلاقە بە کاکم بوو گوتی خۆ روحی ئێمە لە ئی تۆ زیاتر نییە، بێ تۆ بە خولای بۆ هیچکوێ ناچم، ئەمن ناتوانم بۆ خۆم برۆم و تۆ بە جێ بێڵم.

دوای ئەوەی ولات بۆمباران کرا و ولات تێکچوو، ئەمن بە حالم لە بیرە ئەودەم کاکم لە دوخانیات کاری دەکرد لە گەڵ رەفیقی جۆراوجۆر دەهاتەوە مالەوە و زۆر مەشغوول بوو. ئەودەم نەمدەزانی ئەو خەریکی چییە، ئێستا دەزانم کە وەدوای کوردایەتی و ئەوانە کەوتووە. میللەتێک کە باوەڕی پێی هەبوو و زانیویتی زولمی لێ دەکرێ. بۆیە ئێستاش هەر وەدوای نیویشتە و نووسراوەکانی دەکەوم.

موددەتێکی کە شەڕ بوو، وڵات ناخۆش بوو، کاکم هەر دەهات و دەچوو، دەستی لە کارەکەی هەڵگرت. ئەوجار وڵات خۆش بۆوە و پێشمەرگە دروست بوو کە ئەودەم بە پێشمەرگەیان دەگوت کێشکچی. تێعدادێک سابلاغی کە دەمناسین و ئێستا دەزانم کە هەر رەفیقەکانی کاکم بوون وەک مەنافی کەریمی، ئاغای مدەرەسی، سەدیقی حەیدەری، زۆر کوردی عێراقی، زۆر کەسی دی بوون کە بە زمانی دی قسەیان دەکرت، نەمدەزانی کێن ئەوانە هاتووچۆی ماڵێیان دەکرد. هەڵبەت ئێستاش ئەو رەفیقانەی کاکم کە ماون بۆ من هەر عەزیز و بۆنی کاکمیان لێ دەکەم.

**عەلی:** وەزعی خوێندن و زمان زانین و شتی وای چۆن بوو؟

**رەعنا:** لە بیرمە جارێک دەچوو بۆ ئیمتیحان، دایکم شت و متی بۆ دروست کرد بۆ رێگا، گوتیان چۆتە ورمێ ئیمتیحان بدا، بەڵام بە زمانی جۆراوجوور قسەی دەکرد لە بیرمە لە گەڵ کاک هەژار زمانێکیان قسە دەکرد هەر خۆی و کاک هەژار لێی حاڵی دەبوون. بۆ خۆی دەیگوت پێمخۆشە بە زمانێک قسە بکەم کە ئافرەتەکان لێم حاڵی نەبن.

**عەلی:** کەی هەستت بەوە کرد کە خەریکی سیاسەت و کوردایەتی یە؟

**رەعنا:** پاش موددەتێکی سابلاغ زۆر خۆش بوو، خەڵک زۆر شاد بوون، کورد ئازاد بوو لە ناکاو خەبەرێکیان بۆ ئێمە هێنا کە کاکم لە تاران گیراوە، بەڵام مودەتێک پێش گیرانی لە تاران لە بیرمە قەدەرێک نەهاتەوە ماڵێ، قاوەخانەیەک هەبوو بەرامبەر شارەداری، بەرامبەر بە کاروانسەرای سەید عەلی حەوزێکی زەلامی تێدا بوو، هەموو دووکان بوو، دووکانی سەڕاجی، دووکانی زین دروون و .... قاوەخانەکە لەو بەری بوو، بەڵام داخرابوو، پر بوو لە میز و سەندەڵی، کاکم لەو قاوەخانەیە زیندانی بوو. دایکم رۆژێ چەند جار منی دەنارد دەیگوت بچۆ بزانە چۆنە، دەرکەکان دەزانی ئەو سەردەم هەموو کەلێنی هەبوو بە نێو ئەو کەلێنانەدا چاوم لێ دەکرد و قسەم لە گەڵ دەکرد.

ئەودەم هەر من و هاجەر لە ماڵێ بووین لە گەڵ دایکم. ئێمە هەمیشە چاومان لە رێگا بوو ئەو بێتەوە وەک باب بۆمان وابوو، دایکمی زۆر خۆش دەویست، زۆری ئێحترامی دایکم لەبەر بوو، ئەگەر دەڕۆیشت زۆر ناڕەحەت دەبووین بەخسوس خوشکم کە

ئەودەم زۆر منال بوو هەمیشە سەری لە سەر رانی کاکم بوو. ئەوجار مودەتێک کە نەهاتەوە جا نازانم چۆنیان بە دایکم گوت ئەمن دەچووم دەمدیت ئەلعان قاوەخانەی کەریم جووجووی پێدەلێن بەلام داخرابوو، دەچووم بە کەلێنی دەرگاکەدا چاوم لێدەکرد کاکم لە سەر تەختێکی دانیشتبوو هەموو دەوروبەری میز و سەندەلی بوو. پاشان کە لە وێ ئازاد بوو موددەتێک دووبارە نەهاتەوە مالی خۆمان، لە مالە کەریمی یاهوی بوو لە کوچەیەک بەرامبەر بە مالە میرزا رەحمەتی شافعی لە وێ دالانێک بوو لە بیرمە بە پلیکانانداوەسەر دەکەوتم جا پلیکانی قەدیم، خوشکم لە گەل خۆم دەبرد دەچوومە مالی کەریمی یاهو کە دەچووم دەمدیت کە مەسەلەن سوبحانێکی موختەسەریان لە پێش داناوە، بەلام ژنەکەی کەریمی یاهو ناوی ئەشرەفی بوو زۆری ئیحترام دەگرت و زۆریشی محیبەت بە ئێمە دەکرد، هەموو جارێکی کە من و خوشکم دەچووین بۆ لای کاکم ئەو دەگریا. پاش مودەتێکی نازانم پێیان زانی چی، کاکم لەوێ رۆیشت چووە مالی مەلای داودی مەشهوور بە مەلای حەجۆکێ برای حاجی عەبدولخالقی حەسەن زادە. لەوێش هەر دەچووم بۆ لای، ئەودەم کچەکانی وان لە من گەورەتر بوون، هەلبەت ئێستاش لە گەل وان هەر شناسیمان هەیە و یەکتر دەناسین. ئەو جار کاکم نەخۆشییەکی هەبوو هەموو بەیانیان زوو زوو دەچوو ئاوی گراوان.

**عەلی:** باشە بۆ لە وێ بوو ئایا خۆی شاردبۆوە چی؟

**رەعنا:** ئەرێ وەلا وەک شاردنەوە خۆی شاردبۆوە و کەس بە جێگای نەدەزانی بەلام هەموو جار کە دەچووم ئەو کتێب و کاغەز و قەلەمی لە پێش بوو هەمیشە دەینووسی.

**عەلی:** ئایا ئەوە پێش کۆمار بوو؟

**رەعنا:** ئا! ئا! پێش کۆمار بوو چون نازانم چ بوو، کێ گرتبووی و لە بەر چی خۆی شاردبۆوە چون دوای ئەوەی کە ئازاد بوو کاکم چوو بۆ لای ورمێ و ئەوانە و لە وێ گیرا.

**عەلی:** ئایا ئەودەم کە دەلێی لە قاوەخانە گیرابوو و لەو مالانە خۆی شاردبۆوە حکومەتی شا مابوو یان کێ لە سابلاغ حکۆمەتی دەکرد؟

**رەعنا:** نا! شا نەمابوو. کوردان حکومەتیان دەکرد، یانی هیچ حکومەتێک نەبوو بەلام قازی محەمەد بە سابلاغ رادەگەیشت و ئەو رەفیقانەی کاکم لە هاتووچۆ دابوون.

شەوانە لە ترسان سیمی بەرقیان بە دەوری سابلاغدا دەکێشا لە ترسی دەوروبەر و خەڵکی تر، ئەودەم زۆرتر لە ترسی مەنگوڕان بوو، لە بیرمە هەر دەیانگوت مەنگوڕ دێ! هیچ دەسەڵات نەبوو سیمیان بە دەوری شاردا دەکێشا! کارخانەی بەرقی سابلاغێ ئەودەم زۆر چکۆلە بوو هەموو شەو لە ساعەتی ١٢ی بەرق دەکوژاوە، وەلی ئەو سیمە سابلاغی مەحفووز دەکرد لە تالان و شتی دیکە.

ئەوجار نازانم کاکم چۆن بەربوو لە وێ چۆن رزگاری بوو رۆیشت بۆ لای سەقز و بۆ لای رەزائیە و لە رەزائیە گوتیان لە گەڵ دڵشاد و میرزا قاسمی قادری گیراوە.

**عەلی:** ئەو ماوەیە کە دەفەرمووی لەو قاوەخانەیە گیراوە چەند بوو ئایا بە مانگ بوو بە رۆژ بوو چەند بوو؟

**رەعنا:** نا! مانگ نەبوو، چەند رۆژێک بوو لە بیرم نێ ١٠رۆژ ١٥ رۆژ.

**عەلی:** باشە ئێوە موتمەئینن ئەو دەم حکومەت بە دەست کوردان بوو؟

**رەعنا:** نا! ئەودەم قازی هەمە کارە بوو، یانی حکومەتێک نەبوو، چەکدارمان نەبوو، چەند کەسمان هەبوو پێیان دەگوتن قۆڵ سوور، ئەوانە بە نێو خەڵک و میتینگەکان و ئەوانەدا دەهاتن و دەچوون.

**عەلی:** ئەودەم کە دەچووی بۆ لای لە قاوەخانەکەدا هیچی بە ئێوە نەدەگوت؟

**رەعنا:** نا! جارێکی گوتی تۆزێک مەرمەشا و دەزووی رەش و دەرزێکم بۆ بێنە.

**عەلی:** بۆ چی بوو؟ ئایا بۆ نووسین و شتی وای بوو؟

**رەعنا:** نازانم! بەڵام پێموایە هەر دەبێ وەک نامە نووسین ئیستفادەی لێ کردبێ.

دوای ئەوەی کە لەوێ ئازاد بوو چەند رۆژێکمان لە لا بوو دوایە رۆیشت و گیرا. پاش ٤ رۆژ ٥ رۆژ پارشێوی رەمەزانێ بوو کە کوردەکان مۆزیق و باڵەبانیان هێنا بەر دەرکی ماڵی ئێمە و دڵشاد و میرزا قاسمی قادری لێیاندا و هەڵپەرین و شادیان کرد و گوتیان ئازاد بوون. پاش ٢٤ سەعاتان گوتیان وەڵا دیسان گرتوویانەوە و میرزا رەحمەتی شافعی راپۆرتی داوە[1] ئەودەم وایان دەگوت ئێستا دەڵێن گوزاریش. گوتیان ئەو راپۆرتی داوە و

---

[1] -جێگای سەرنجە کە مامۆستا هەژاریش لە شێعرەکەی "بۆ هاتنەوەی زەبیحی و..." لە ئاخر دێڕەکانیدا باسی "قراندنی قەل" دەکا کە مەبەست لە قراندن بە رای من هەر دەبێ راپۆرت لێدان بێ.

گوتویەتی ئەگەر ئەوانە بێنەوە، ئێران کوردستانی لە دەست دەچێ بەخسوس رەحمانی زەبیحی.

ئیدی کاکم زیاتر لە ٨ مانگ گیرا. ئێمەش بە تەنیا لە ماڵەوە و بە بێ هیچ شتێک و نانئاوەرێک مابووینەوە، ئەو جار پاش بەینێک گوتیان دێنەوە. جا ئەوجار هەمیشە خەبەرمان بۆ دەهات بە دایکمیان دەگوت (ئێستا بۆ خۆم دایکم، دەزانم دایکم چی کێشاوە) دەرزیان لێداوە و دەستی قەڵەم ناگرێ و شێتیان کردووە و ئەو شتانە، هەر کەرەت شتێکیان بە دایکم دەگوت دوایە کە ئازاد بوو شوکور وا نەبوو. دوایە ئەمن بیستم کە پاش ٧ـ٨ مانگان کە کەس لێی نەپرسیون، گۆیا خەبەری ناردووە بۆ قازی محەمەد کە ئەودەم پێشەوا بوو چون ئەودەم کە کاکم لە زیندان بوو قازی محەمەد لە چوارڕایە کە چوارچرایان پێدەگوت لیباسی رەئیس جەمهوری لەبەر کرد و کۆمار دروست بوو، ئەمن لە سەر بانێکی چکۆلە چاوم لێ دەکرد قازی لیباسی لەبەر کرد و سەدرولئیسلام لە لایەک و حەمەحوسێن خان لە لاکەی تری راوەستا بوون. بە داخەوە هەر بەو جۆرەش ئێعدام کرانەوە و موتەئەسیفانە هەر بەو سورەتەش بۆ خۆم بە دارەوە دیتمنەوە. جا دوایە نازانم چۆن ئازاد بوو بەڵام ئەوەم بیستووە و گوێم لێ بووە و زۆر شتیشم بە چاو دیتووە کە گۆیا کاکم لە زیندانەوە خەبەری بۆ قازی ناردووە کە ئەگەر بێتوو شتێکی نەکا و رزگارمان نەکا خراپی دەبینێ! دوایە گوتیان عروسان پولیان داوە و نازانم چ بووە و ئەوانە بەربوون، حەتا پولێکیان بۆ ئێمە هێنا ماڵێ. کە کاکم ئازاد دەبێ گۆیا هیچ لیباسی لە بەردانەبووە و بە وەسیلەی دۆست و رەفیقان کە لە تاران هەیبووە یەک باڵتۆیان بۆ کڕیوە و لە بەری کردووە و زستانیش بوو. کاکم لە پێش هەموان بە تەیارە دێنەوە تەورێز یانی پێش دڵشاد و میرزا قاسمیی، دوایە کە میرزا قاسم لە تەورێزێ نەخۆش دەبێ کاکم و دڵشاد دێنەوە میاندواوێ، هەڵبەت ئەودەم خەڵک نەیدەتوانی تا تەورێز بەرەوپیریان بچن وەزعیەت وانەبوو بەڵام خەڵک زۆریان پێ خۆش بوو کە ئەو چەند نەفەرە بەربوون. زۆر لە لای خەڵک ئازیز بوون و تا میاندواو بەرەوپیریان چووبوون.

لە وێ کاکم بە جێ دەمێنێ، سێ چوار نەفەری عروس لەوێ دەبن نازانم بە چ دەلیلێک نایەتەوە خەڵک لە گەڵ دڵشادی هاتنەوە و کاکم نەهاتەوە. کە دڵشاد دەگاتەوە

خالێکی خۆم خەبەری بۆ هێنایین بۆ ماڵێ (برای دایکم) گوتی هاتنەوە، دایکم گوتی ئەدی کوا رەحمان؟ گوتیان لە میاندواوێیە ئێستا دێتەوە، دایکم زۆر نارەحەت بوو پێیوابوو ئەو قسانەی کە دەیان گوت کە دەستی قەڵەم ناگرێ و شێت بووە و... حەتمەن راستێ بۆیە پێمان نیشان نادەن، دوایە هێندەی پێنەچوو ئێمە لە ماڵێ دانیشتبووین من و دایکم و خوشکە چکۆلەکەم هێندێک جیرانیشمان لە دەورە بوو هەر ئەو خاڵەم لە گەڵ کاک سەدیقی حەیدەری خەبەریان بۆ هێنایین گوتیان وەرن هاتنەوە، ئەمن غارم دا میرزا سەدیق و خالم دەستی منیان گرتبوو، چووم. ئەودەم جێگایەک بوو پێیان دەگوت حیزب ئێستا پێموایە شارەدارییە، لەوێ هاتبوو دەر بازدیدی وێی کردبوو دەهات بچێ بازدیدی چاپخانە بکا چون کاکم کە رۆیشت چاپخانە وانەبوو زۆر گەورە ببۆوە، ئەمن لە چاپخانە چووم دەستم لە قەدی کاکم وەرێنا و کاکم بە خێرهاتن کردەوە. دوایە کە هاتینەوە ئەفسەرێکی لە گەڵ بوو ئەفسەری عروسان بە جیبێکی هێنابوویانەوە (جیبەکە ئی خۆیان بوو ئی عروسان) عروسەکە گوتبووی تا خۆم دەستت دە دەستی دایکت نەنێم نارۆم و هەر لە گەڵت دێم. عروسەکە هێنایەوە لە پێشخانەی ماڵی بابم (ماڵێکی چکۆلەمان هەبوو) عروسەکە دەستی کاکمی دە دەستی دایکم نا. دایکم دەستەکانی گرتبوو لە دم و چاوی خۆی دەدا، دەیگوت رەحمان دەستەکانت ساغە بە منیان گوتووە دەستی قەڵەم ناگرێ، لە بیرمە دەستەکانی هەڵێنا گوتی ئەوە نێ باجی دەستم ساغە و هیچم لێ نەهاتووە.

دوایە عالەمێکی زۆر هاتن، قازی محەمەد هات، مەلا مستەفای بارزانی هات و... ژورەکەشمان زۆر پچوک بوو عالەم زۆر بوو لە بیرمە لە نێو ئەو عالەمەی، لەو وەتاغە پچوکەدا خوشکم لە سەر رانی کاکم خەوی لێ کەوتبوو.

دوای وەی کە خەڵک رۆیشت و بەینێکی پێچوو دایکم گوتی رەحمان ئیدی ئەمن ناهێڵم بۆ هیچ کوێ بچی هەر بەو زمانە گوتی بابم ئێمە کەسمان نییە و ئەو کچانە بە من بە خێو ناکرێن و ئەو سەغیرانە و ئەو منالانە کوا بە من بەخێو دەکرێن!؟ کاکم گوتی دەنا قازی گوتوویەتی هەر جێگایەک کە خەتەر بێت و شکم لێی بێت و لێی نیگەران بم دەبێ زەبیحی بچێ چون ئەو خۆی پێ رزگار دەکرێ و زیرەنگە و لێی خاترجەمم!

دوایە کاکم کە هاتەوە زۆری نەکێشا چەند مانگێک، مودەتێک، پێموایە یەک دوو

سەفەری کرد و هاتەوە، شەویکی زۆر نارەحەت بوو هەر دەهات و دەچوو خەوی لێ نەدەکەوت، هەر لە سەر تەختەکەی دەهاتە خوار و دەچۆوە سەر، بەیانی کە رۆژ بۆوە مەلابانگدانێ بە دایکمی گوت: باجی کۆماری ئێمە تێکچووە و عەجەم دێتەوە و....

دایکم گوتی ئەدی رەحمان ئەتۆ؟! گوتی: باجی ئەمن دەرۆم! ئێمە ١٧ مالێن دەچم بۆ رەزائیە (ئێستا دەلێن سەفارەت ئەودەم هەر دەیانگوت قۆنسوول) دەچین بۆ قۆنسوولی عروسان، ئەتۆش خواهیش دەکەم مەلێ مالەکەم و کورەکەم و چی و چی ئەگەر ئەمنت دەوێ هەر ئەو دوو کچانە و خۆت ساز کە و هیچ لە گەلٚ خۆت مەهێنە هەر لیباسی گەرم و شتی رێگا ئەمن دەرۆم ئەگەر گوتیان و رێگایان داین ئەوە دێمەوە و پێکەوە دەرۆین ئەگەریش نەبوو ئەتۆ ئاگات لە خوشکەکانم بێ. لە بیرمە گریا! ئەمن کە دوای بابم نەمتوانی وەزیفەی خۆم ئەنجام بدەم تۆ ئاگات لێیان بێ و ئەمن کە نەمتوانی ئەو کچانە پێبگەیەنم ئەتۆ چاوت پێیانەوە بێ و ئەمنیش لە هەر جێ بم ئاگام لێتان دەبێ و قەت لێتان بێخەبەر نابم ئەگەریش رێگایان داین ئەوە دێمەوە دەتان بەم. عیبارەت بووین لە ١٧ مالان: مالە قازی محەمەد، سەدرولیسلام، حەمەحوسێن خان، ئەو کورەی مالە خدر حەیرانی کە دوایە ٤ نەفەر بوون لە دارێ دران مازوچی و نەقەدەیان، مالە کاک سەدیقی حەیدەری، مەنافی کەریمی ئەوانەم لە بیرە چون نیزیک بوون و دەمناسین. دوایە ساعەت ١٢ی شەوێ لە گەلٚ کاک سەدیقی حەیدەری هاتبۆوە باغی گوێزێ لە وێ کاک سەدیق هاتەوە بە ئێمەی گوت رێگایان نەداین! زەبیحی دەلێ بە دایکم بلێ زۆری ئاگا لە خوشکەکانم بێ. ئێمە دەرۆین کچەکان بەرێتە مالی حاجی سالحی شاتری ئەودەم حاجی نەبوو هەر پێیان دەگوت ئاغا، کاکمی زۆر خۆش دەویست، گوتبووی بە باجیم بلێ کچەکان بەرێتە مالی ئاغای تا ولات ئەهوەن دەبێتەوە. نازانم بۆ سبەینێ بە کێدا خەبەری بۆ مالە حاجیاغای ناردبوو خورشید خانمی خێزانی حاجی سالحی بۆ خۆی هات بە دواماندا.

ئەمن و دایکم و خۆشکم چووینە وێ تا ٧ــ٨ رۆژان، تا دەولەت هاتەوە و عەجەم جێگیر بوو و ولات ئەهوەن بۆوە، ئەوجار ئێمە هاتینەوە مالە خۆمان هەر چاوەرێ! چاوەرێ! کاکم دێتەوە، دێتەوە هیچ خەبەر نەبوو! پاش سالێکی کاکم خەبەری هات.

هەر قاچاقچێکی چووبایە، هەر حاجێک چووبا حەجێ (ئەودەم حەجاج بە عێراقێدا دەچوونە حەجێ) کاکم ئاگای لە ئێمە هەر بوو، بەواندا شتی بۆ دەناردین و ئێمەی بێ خەرجی نەکرد و ئاگای لە ئێمە هەر بوو، سەرافەتی ئێمەی هەر دەکرد و دوای وەی کە دەوڵەتی ئێران زۆر بە هێز بوو، ساواک دروست بوو، ترس و وەحشەت لە نێو ئێمە زۆر بوو ئیدی دەستی لە خەبەری ئێمە هەڵگرت. پاش ئەوەی ئێمەیان ۲ـ۳ جار هێنا و برد و دەیان گوت لە کوێیە، پێی بڵێن بێتەوە، چەند جاریان مەلا عەبدوڵای مدەرەسی راسپارد، گوتیان با بێتەوە کاری چاکی دەدەینێ و پووڵی چاکی دەدەینێ و ئەوانە بەڵام کاکم ئەوانەی قەبووڵ نەکرد و ئیدی بەو دەلیلە کە ئێمە نارەحەت نەکەن و دەست لە ئێمە هەڵگرن کاکم خۆی بێ خەبەر کرد و ۱۳ ساڵان بێ خەبەر بوو.

**عەلی:** ئەگەر رۆیشت لە گەڵ کێ رۆیشت و کێی لە گەڵ بوو؟

**رەعنا:** ئەگەر رۆیشت بە جیبەکەی خۆی رۆیشت (عروسەکان کە لە زیندانی تارانێ هاتەوە ئەو جیبەیان هەر دابوو بە خۆی) ئیدی زۆر خەبەرم نییە کێی لە گەڵ بوو. دوایە پاش بەینێکی لە سولەیمانی خەبەری هات، دوایە لە ناسریە خەبەری دەهات، هەر دەمێک لە جێگایەک، بەینێک لە ناسریە کە بە نێوی خۆی نامەی بۆ دەنووسین دەنا هەر جارە بە نێوێک کاغەزی هاتووە، بەینێک لەوێش قاچاغ بوو هەر دەمەی لە شارێک بوو. زیاتر بە نێوی بابی دایکم نامەی دەنووسی یانی "عیسا زەبیحی". نامەی دەنووسی و راهنمایی دەکردین چ بکەین و پووڵی بۆ دەناردین، لیباسی بۆ دەناردین و خولاسە ئێمە پێگەیشتین و دوایە کە زانی ئێمە پێگەیوین و ساواک رەنگە عەزێتمان کا و ئەوانە، خۆی بێخەبەر کرد.

**عەلی:** لە سەردەمی منالی ئێوەی تەشویق دەکرد بۆ خوێندن؟ ئایا ئێوە هیچتان خوێند؟

**رەعنا:** بەرێ وەڵا کە رۆیشت گوتی دەچم بۆ رەزائیە ئەگەر هێشتیان ئەوە دێمەوە دەتان بەم ئەگەر نا ئەوە هیچ. دووربینی عەکاسی پێبوو عەکسی من و خوشکمی کێشا، ئەودەم خوشکم تازە دەچووە مەدرەسەی، گەڕاوە گوتی: "باجی هاجەرێ لە مەدرەسەی نەکەی" منیش ئەودەم زووتر مەدرەسە نەبوو کە دایاننا لە زەمانی کۆمار چووم بەڵام بە

داخەوە ئەودەم کە چووم عومرم زۆر بوو ڕێگایان نەدام گوتیان گەورەی. ئەوجار دوای کاکم، لە گەڵ دایکم بوومە نانئاوەری ماڵێ و بەدبەختی و کوێرەوەریم بەسەر هات و نەمتوانی بخوێنم[1] بەڵام هاجەر هەرخوێندی تا دیپلۆمی وەرگرت و بوو بە مەعەلیم و ئێستاش ئەوە زۆر لە مێژە بازنشەستە بووە و مەعەلیمی زۆر ژنی سابلاغێ بووە.

**عەلی:** ئێوە زۆرتر بە چ نێوهایەک ناسیوتانە و بیستووتانە؟

**ڕەعنا:** بە نێوی قادر، عیسا، بە نێوی خۆی، بە نێوی محەمەد بوو جارێک.

**عەلی:** دوای رووخانی شای چۆن هاتەوە؟

**ڕەعنا:** ئەوجار ئینقلابی ئێرانێ کرا، وڵات تێکچوو، خەڵک هاتنەوە، ئەوانەی کە ڕۆیشتبوون وەک مامۆستا هێمن و ئەوانە هاتنەوە و کاک حەمەدەمین سیراجی و... کە ئەوانە هاتنەوە دەچووم لێم دەپرسین کە بۆ کاکم نایەتەوە؟ ئەوان زۆریان تاریف دەکرد و دەیان گوت ئەسڵەن ئەو شتێکی دیکەیە و ئەوی لە گەڵ ئێمە مقایسە مەکە و ئەو شتانە، ئەمن هەر چاوەڕێ بووم. دوایەش کە تەلەفونی بۆ ماڵە ئێمە کرد کە بۆ خۆت ژمارەت بۆ ناردبوو و خۆت باشتر دەزانی کە چۆن بوو، زۆر بە بێ دەنگی هاتەوە و نەیویست شلوقی لە شار کەوێ و وەک ئەوانی دیکە کە هەموو بەرەو پیریان دەچوون و مەدرەسە تەعتیل دەبوو و بازار دادەخرا و... ئەو نەیویست ئەوانە بکا خۆی بە دزی بە ڕێگایەکی دیکەدا هاتەوە، بە ماشێنێک کتێبەوە یەکسەر هاتەوە ماڵە بابم کە ٣٣ ساڵ و ٦ ڕۆژ بوو بە جێی هێشتبوو.

**عەلی:** ئەوەڵێن جار لە کوێ و چۆنت دیتەوە؟

**ڕەعنا:** ئەوەڵ جار کە هەموو ئێوە بەرەوپیری چووبوون ئێمە لە ماڵێ بۆ ئیستقباڵ هەموو شتێکمان ئامادە کردبوو، ئەو خۆی بە خەتێکی دی بە وانێتێک کتێبەوە هاتە بەر دەرکەی، جیرانە قەدیمەکان هاواریان بۆ هێنایین، ئێمە کە چاوەڕێ بووین لە گەڵ ئێوە بێتەوە هەموو گوڵمان ئامادە کردبوو لە تەدارەک دابووین، ئەو خۆی لە ئێوە ون کردبوو بۆ خۆی ماشێنی گرتبوو هاتبۆوە، ئەمن کە چوومە بەر دەرکەی خوشکم زووتر بەلەنگاری ببو

---

[1] - دەبێ بڵێم کە دایکم بە سەری پیری و کاتێک کە خاوەنی شەش مناڵ و کوڕ و کچی جحێڵ بوو دەستی بە خوێندن کرد و لە سابلاغ ئیمتیحانی شەشی ئەکابیری دا و زۆر چاک تێیدا سەر کەوت.

باوەشی پێداگرت، لە خۆشی وەی کە هاجەری دیت سەری وەدەرگای ماشێنەکە کەوت و خوێن هاتە خوار، خۆشکم هەموو خوێنەکەی بە زبانی لێستەوە بە خودای هەمووی قوتدا. دوایە کە هاتە ژوور ئەمن چوومە پێش گوتم کاکە دەمناسی؟ گوتی: دەزانم خۆشکمی نازانم رەعنای یا هاجەری؟

ئەو چەند مانگە بەڕاستی زۆر زۆر خۆش بوو، زۆر شتمان بۆ زیندوو ببۆوە، ئەوجار ئەو ماوەیە زۆر لە من نیزیک بوو، زۆر قسەم بۆ باس دەکرد دەمگوت ئاوا بوو ئاوا نەبوو... دەیگوت شەیتان ئەتۆ ئەو شتانەت چۆن لە بیرە؟! رۆژێکی باسی هێندێک کەسانیان کرد دەیانگوت وا موحتەرەمن و وابوون و واچوون و... گوتم وەڵا ئەمن خۆشم ناوێن! گوتی بۆ؟! گوتم کاکە نەبوو ئەودەم کە تۆ گیرابووی، نەبوو ئەتۆ نەت دەوێرا بێیەوە ماڵی خۆمان، ئەتۆ خۆت لێ نەدەشاردنەوە؟! وانەبوو؟! گوتی با! بەڵام ئەتۆ ئەو شتانەت بۆ لە بیرە؟! گوتم بۆ لە بیرم نەبێ؟! لە بیرمە!

**عەلی**: ئایا ئێوە هیچ لە بیرتانە ئەو سەردەم ئەو چۆنی باسی کۆمەڵەی ژ . ک و کۆمار و ئەو شتانە دەکرد؟

**رەعنا**: بە خوا عەلی گیان ئێمە ئەودەم ئەوەڵەن مناڵ بووین دووەمەن ئافرەت بووین، ئەوجار کەسی دیکەی ئاوا لە ماڵێ نەبوو کە ئەو قسەی لە گەڵ بکا، بەڵام چاکم لە بیرە ئەو رۆژەی کە کاکم رۆیشت قازی چوار میرزای لە سەر ماڵە بابم دانا و هەرچی کتێب و رۆژنامە و پەروەندە و مەداریکی کاکم (خۆ لە کۆمۆد و شتی وادا نەبوو، زۆر بوو یەک ژووری تەواو بوو) سوتاندیان. دوویانم نەدەناسی بەڵام دوویەکەی دی یەکیان عابید بوو میرزا متەلیبی عابید خەزووری خوشکم، ئەوەی دیش بابی ئەو میرزا رەحیمی گەرمیانی بوو کە لە کارمژتییە. بە خوا چوار تەندوور دایسا یەکیان تەندووری ماڵە کەریمی مەحمەدجانی بوو ئەوانی تر ئی ماڵە سۆفی عەبدولخالەقی، ماڵە ساڵەزادەی و ئی ماڵە خۆمان چوار تەندوور دایسا و هەر کاغەزی کاکمیان تێداویشت و ئەو چوار میرزایە سەرپەرەشتیان دەکرد، ئێمە مناڵ و مناڵی جیران هەر بە باوەش بۆمان دەبردن، حەتا ئەگەر خەڵکی دی دەهات، ئەوانە ئەو چوار میرزایە ئاگایان لێ بوو نازانم چیان دەکرد بە خوا! دوایەش هەر خەڵک دەهات و دەیان گوت چ ماوە و چ نەماوە دەبێ هەموو

شتێک بسوتێ، جا نازانم قازی دەیناردن؟ کێ دەیناردن؟ ئەو هەمووە عەکسی ئەو میتینگانە و نازانم شتی دیکەش چ بوون، بریا ئەودەم تۆزێک زۆرترم عاقڵ پێ شکابایە و بە عومرتر بام!

**عەلی:** لەسەر ئەو نومایشە کە پێش کۆمار لە سابلاغێ دایان "دایکی نیشتمان" چت لە بیرە؟

**رەعنا:** کاکم گوتی بڵێتم بۆ کڕیون بچن، میرزا محەمەدی داودی هەیە ئەودەم کاکم ئەوی کردبوو بە نازرخەرجی ماڵێ، ئەو شتی بۆ دەکڕین لە گەڵ میرزا محەمەدی بللوری هاتن ئێمەیان برد، جێگایەک هەیە لە کن کارێژێ بەرامبەر مەیدانی ناردی ئێمە چووین لەوێ دانیشتین، عەبدوڵای نێهری دایکی نیشتمان بوو شتێکی سپی بە خۆی دادابوو، دوو ڕۆڵەی نیشتمانی هەبوو، یەکیان عوبەید بوو عوبەیدی ئەیوبیان، ئەوی دی نازانم کێ بوو بە لام دوو ڕۆڵەی لە باوەش دابوو، عوبێد چون دەواخانەکەیان لە لای ماڵە خۆمان بوو دەمناسی. شێعریان دەخوێندەوە و نومایشیان دەدا و سرودیان دەخوێندەوە.

**عەلی:** هیچ ئاگات لەوەی هەیە کە ئایا ئەو نومایشە کاکت نووسیوەتی؟

**رەعنا:** بە خوا نازانم، ڕەنگە وا بێت بە لام زێنەب خانم ئەو شتانە چاک دەزانێ زێنەبی شەرەفکەندی، ئەو لە ئێمە گەورەتر بوو زۆریش وریا و بە هۆش بوو.

**عەلی:** دوایە کە شا ڕووخا و هاتەوە زۆرتر لە ماڵێ چی دەکرد؟

**رەعنا:** زۆرتر لە گەڵ قامووس خەریک بوو. زۆر جاریش خەڵک دەهاتن بۆ موساحیبە لە گەڵیی، دەیگوت نا، جارێ وەختی نییە! ئەو ئاغایە، ئاغای مەجدی هات لە تەرەف ڕادیو و تەلەفزیونەوە، گوتی نا جارێ وەختی نییە! گوتی هیچ نەبێ باسی کتێبەکەت بکە! هەر گوتی نا! ئەو دەیگوت جارێ مەبەستم ئەو کتێبەیە (قامووس) دەبێ جارێ ئەوەی تەواو کەم. ئەوجار چەند خەبەرنیگاری خاریجی هاتن و قسەیان لە گەڵ کرد ئەوجار لە لایان دانیشگای ئازاد کە قەرار بوو داندرێ لە سابلاغێ و فۆرمیان دابوویە پڕی کاتەوە کە چ دەزانێ و چەند زمانان دەزانێ، کاکت لە لای بوو دەیگوت کە عەلامەتی لەو هەمووە زمانانە دا کە دەیزانی، هەمرو چاویان لێکتر دەکردا!

ئەوجار ئەو هەر خەریکی کوردایەتی بوو، ئەمن لە بیرمە خەڵک دەهاتنە کن بابم دەیان گوت شتێک هاتووە ئەگەر لە تارانێ قسە بکەی لێرە گوێت لێ دەبێ (رادیو)، پیاوەکان دەیان گوت وەڵا ئەگەر ئەوە وا بێ نابێ هیچ قسان بکەین هەموو شتێکیان گوێ لێ دەبێ! ئەوجار کاکم لە گەڵ رەفیقەکانی هەر بە رەمز قسەیان دەکرد نازانم دەیانگوت چی؟! مەسەلەن دەیان گوت کشمیش، دەیان گوت لەبلەبی و... دەمزانی کە شتێکی دەڵێن بەڵام نەمدەزانی دەڵێن چی؟! دوایە ماڵێکمان جیران بوو، بەکرەیان گرتبوو پیان دەگوت دوکتۆر کەنی، لیباسی ئەرتەشی دەبەر دابوو، پێموایە دوکتۆری ئەرتەشی بوو، ئەو رادیوی هەبوو هەموو رۆژێ کاکم ساعەت ٩ی شەو دەچووە سەر ئەردیوانەکە و گوێی لە رادیوی دوکتۆر کەنی دەگرت.

عەلی: باشە ئەگەر هاتەوە زۆرتر وەک سیاسەت خەریکی چ بوو لە گەڵ کێ بوو؟

رەعنا: وەڵا لە سیاسەتدا بۆ خۆشت ئەوەی لە من باشتر دەزانی، ئەودەم دێمۆکرات و کۆمەڵە هەبوو، ئەو موافیقی هیچیان نەبوو. ئێوە بۆ خۆتان کۆمەڵە بوون هەموو جارێک پێی نەدەگوتن دەست هەڵگرن، ئەو کتێبانەی ئێوە دەیان خوێنەوە ئەگەر ئەو کەسەی کە نووسیویێتی ئێستا زیندوو بێتەوە باوەڕی بە هیچیان نییە! نەبوو بە ئێوەی دەگوت ئەوەی کە ئێوە دەیڵێن زۆر جوانە بەڵام ئەوە نابێ! ئەوە زۆری ماوە، ئەنگۆ جارێ سەعی بکەن ماڵێکو هەبێ، چوار دیوارێکو هەبێ جا دوایە چۆنتان پێخۆش بوو رایخەن، خۆ ئێوە جارێ ماڵەکەتان نییە، چوار دیوارێکەتان نییە! بەڵام ئەمن ئاوای لێ حاڵی بووم کە ئەو زۆرتر لە ئازادی کورد قسەی دەکرد. کە هاتەوە زۆر کەس چاوەڕێ بوو بزانێ کاکم لە گەڵ کێ دەکەوێ، ئەودەم زۆر حیزب و گروە هەبوو بەڵام خۆشبەختانە لە گەڵ هیچیان رێک نەکەوت، مەرامی هیچیانی قەبوڵ نەبوو، بەڵام ئەوکەسانەی کە هاتنە لای کاکم مەلا شێخ عێزەدین بوو هەموو دەفتەرەکەی، کوڕەکانی کۆمەڵە کە بۆ خۆتان بوون، ئەمما حیزبی دێموکرات بەتەوری رەسمی نەهاتە لای کاکم، بەڵام چەند کەسێک وەک هێمن، حەمەدەمین سیراجی، هەشت نۆ دەیەک لە مەلاکان دەهاتن ئەوانە بە نێو لە گەڵ حیزب بوون بەڵام هاتن! ئەوجار جەوان زۆر دەهاتن کچ و کوڕ.

عەلی: لە کێ زۆرتر نیزیک بوو وەک باری سیاسی و هاتووچۆی کێی دەکرد؟

رەعنا : وەڵا کاکم ئینسانێک بوو قەت نەی دەهێشت بزانی کێیە و چ دەکا. بۆ خۆی جارێکی گوتی ئەمن حەوت ساڵان مەلا مستەفا ویستی لە جێگایەک دەعوەتم کا و ببینێ هەر بۆی نەکرا و نەمهێشت! هەرچەند ئەو لە پێشدا لە گەڵی بوو بەڵام دوایە کاری لە گەڵ نەدەکرد و ئیختیلافیان لێ پەیدا بوو هەرچەند ئەمن زۆرم باوەڕ بە وە نێ بەڵام ئەودەم دەیان گوت نازانم چەندی جایزە داناوە و چی هەرکەس خەبەری بۆ بەرێ یان بیکوژێ و ئەوانە! بەڵام زۆرم بڕوا بەوە نییە چون بارزانی ئەگەر هاتە سابڵاغ زۆر نێوانی لە گەڵ کاکم خۆش بوو و کاکمی زۆر خۆش دەویست، لە بیرمە ئەگەر کاکم لە زیندانی تارانێ هاتەوە بارزانی بۆ خۆی و چەند کەسانەوە هەر ئەو شەوە هاتە ماڵێ ئێمە و بە خێر هاتنی کاکمی کرد بۆ خۆم لە بیرمە!

ئەوجار کە شەری سێ مانگە کرا و ئێوە چوونە دەرێ کاکیشم هاتەدەر بەڵام شتەکانی هەر لە ماڵێ بەجێ هێشتبوو، ئەوجار رۆژێکی جومعە بوو گوتیان مامۆستا شێخ عیزەدین دێتەوە هەم بۆ سوخەنرانی و هەم بۆ نوێژی جومعە، خەڵک زۆر خۆشحاڵ بوو، دووکان و بازار هەموو داخرا و هەموو لە شارەداری کۆبوونەوە، مامۆستا هاتەوە و سۆخەنرانی کرد و زۆر کەسی تر قسەیان کرد. منیش لەوێ راوەستابووم و دەمزانی کاکم دەبێ لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەدین هاتبێتەوە و چاوەڕێ بووم بیبینم، پێشمەرگەیەک هاتە پێش و گوتی دایە بۆ لێرەی و چاوەڕێی چی؟ گوتم وەڵا چاوەڕێم کاکم ببینم، بزانم هاتووەتەوە؟ گوتی مامۆستا زەبیحی هاتووەتەوە و ئەوە لە دەواخانەی مەرکەزی دانیشتووە، ئەوجار ئەمنیش بە پەلە چووم کە دیتم ئەوە بە لیباسی کوردی لەوێ دانیشتووە جا ئەو قەت لیباسی کوردی لە ناو شار لەبەر نەدەکرد (ئەو دەیگوت جلی کوردی) هەر پێیخۆش بوو بە لیباسی کۆت و شەڵوار و رەسمی بێتە دەر. ئەو دەیگوت جلی کۆردی جلی ناوشار نییە و جلی شاخ و پێشمەرگایەتییە!

کە چوومە پێش گوتم ئەدی کاکە بۆ ئەتۆ نەهاتوویە نێو خەڵک و بۆ هاتووی لێرە دانیشتووی؟! خۆ هەموو خەڵکەکە لە لای شارەدارییە و خەریکی قسە کردنن! بە تورەیی گوتی بڕۆ دەرکەی بکەوە، شێخ عیزەدین هاتۆتەوە نوێژ بکا! بڕۆ دەرکەی بکەوە شێخ عیزەدین هاتۆتەوە نوێژی جومعە بکا و...! ئیدی ئەمنیش چوومەوە لە گەڵی زانیم زۆر

قەڵسە و دوایە کە گوێم لێ دەبوو لە گەڵ بەعزە کەسێک کە قسەی دەکرد دەیگوت: بەڵێ با پێشمەرگە بێتەوە ناوشار و شەڕ بکا و... بەڵام رهبەران با نەیەنەوە و با لە شاخ بن با دوژمن بزانێ ئێمە قایمین، با پێشمەرگەکە بێتەوە بۆ ئیش و کار، بۆ تەبلیغات، بۆ شەڕ بەڵام رهبەران نابێ بێنەوە و پەلەی بکەن لە هاتنەوەی ناوشار، دەبێ موزاکرە لە گەڵ دەوڵەت لە دەرەوە بکرێ نە لە ناوشارا ئەوجار زۆر بەوەش تورە بوو کە هەر حیزبە شتێکی دەگوت، دەیگوت بابە ئێوە جارێ بە هەمووتان شتێک بستێنن جا دوایە لە سەر چلۆنەتی ئەو شتە لە ناو خۆتان قسە بکەن، خۆ ئێوە جارێ هیچتان وەرنەگرتووە لە سەر چی بە یەکەوە شەڕ دەکەن و کێشە دەکەن؟! جارێ ئێوە ماڵەکەتان نییە، ئەگەر ماڵەکەتان دروست کرد دەتوانن لە سەر چلۆنایەتی ناو ماڵەکە بە یەکەوە قسە و شەڕ و... بکەن!

**عەلی:** لە گەڵ جەماعەتی مام جەلال و یەکێتی چۆن بوو؟

**رەعنا:** لە گەڵ مام جەلال و ئەوان هەر لە زۆوە لێک نیزیک بوون، ئەو ماوەیەش هەر هاتووچۆیان دەکرد، ژنەکەی مام جەلالی (هێرۆ) دەهات، جارێکی زۆر بەیەکەوە بوون و زۆریان قسە کرد، حەتا جارێک کە ئەمن لە گەڵ بابت لە لەندەن بووم، رەفیقەکانی کاکم زۆر بە میحیبەت بوون و ئێمەیان دەعوت کرد و زۆریان قەدر و حورمەت گرتین و قەت لە بیرم ناچێتەوە، ئەوان هەر تاریفی کاکمیان دەکرد و ئەوانە.

**عەلی:** ئاخر جار چۆن بزر بوو و چۆنتان بیست؟

**رەعنا:** ئاخر جار شەوێکی رەمەزانێ بوو، پێشمەرگەیەکی زۆری مام جەلالی لە ماڵە ئێمە بوون هەموو لە ژووره گەورەکە نووستبوون، پارشێو کرا بوو نەکرابوو کە لە ماڵە مامۆستا شێخ عیزەدینەوە تەلەفونیان بۆ ماڵی ئێمە کرد کە ئەوە سبەینێ ئەرتەش دێتەوە ناو شار...

**عەلی:** ببورە، ئەوە جاری دووهەمە کە سابلاغ بە یەکجاری گیراوە؟

**رەعنا:** ئا جاری دووهەم دوای شەڕی ئەوەڵ و ئەوانە، کاکم لە ماڵە کاک محەمەدم بوو غارم دا گوتم کاکە ئەوە شتێکی وایە، میوانێکی بوو نازانم دوکتۆر کەمالیان پێدەگوت چی بە عەرەبی قسەیان دەکرد، گوتم ئەوە کورەکانیش هەموو خۆیان حازر دەکەن و دەرۆن، ئیدی کاکم بە پەلە خۆی کۆ کردەوە و حەتا لە بیرمە تا گراواتەکەشی

نەبەست نەهاتە دەر! ئەوجار خۆی ڕێک و پێک کرد و لە گەڵم هاتەوە ماڵێ، بە پێشمەرگەکانی گوت ئێوە مەمێنن. لە بیرمە بەو بەیانێ زوویە چەند ماشێن لە حەساری هەڵکرابوو یەک بە دوای یەکدا ڕۆیشتن، ئەوجار ماشێنیک بۆ کاکم حازر کرا و ئەویش لە گەڵ چەند کەسان سوار بوو و ڕۆیشت ئیدی هەر ئەو ڕۆیشتنە بوو کە نەمدیتەوە.

**عەلی:** خەبەری مەرگەکەت چۆن بیست؟

**ڕەعنا:** ئیدی ئەمن پێموابوو ئەو چووەتەوە ماڵەکەی خۆی و سەر ژیانی خۆی، چون دەیگوت ماڵەکەم هەر لە بەغدایەیە و هەروا دامخستووە و کتێبخانەکەی هەموو لەوێ بوو چون کە هاتەوە گوتی کتێبەکانم زۆر نەهێناوەتەوە، چون دەمزانی سەید قادری جەعفەری کتێبخانەی باشی هەیە و لەوێ ئیستفادەی دەکەم. زۆر جار تاریفی ماڵەکەی خۆی بۆ دەکردم، دەیگوت کتێبی چاک و کتێبخانەی گەورەم هەیە و ئەوانە. بەڵام ئەگەر ئەوەڵ جار هاتەوە لێم پرسی کاکە بە یەکجاری هاتوویەوە؟ گوتی ئەدی دایکم بەس نییە؟! ئەوە ٣٣ ساڵ و ٦ ڕۆژە لە ئێوە و وڵاتی خۆم دوورم! ئەرێ وەڵا بە یەکجاری هاتوومەوە بەڵام سەفەر دەکەم. جارێکی کە لێرە بوو چووبوو ڕەزائییە کە گوزەرنامە وەرگرێ نەیان دابوویە، کە هاتەوە گوتی بە قەبری بابیانەوە! بە گوزەرنامەی خۆم لە بەغدایە هاتووچۆ دەکەم.

**عەلی:** خەبەری مەرگەکەی چۆن بوو؟

**ڕەعنا:** ئێمە وامان زانی (عیدەیەک باوەڕمان دەکرد، عیدەیەک باوەڕمان نەدەکرد) دەیان گوت حیزبی دێمۆکرات ڕاپۆرتیان لێداوە و چی! هەر چەند ئێستاش براکەی دیکەم هەر دەڵێ ماوە و نەمردووە! بەڵام بە خوا ئەمن باوەڕم پێی نییە! چون ئەگەر مابا تا ئێستا بە پیرەکەشی با هەر ئازادیان دەکرد.

**عەلی:** لە ڕەفیقەکانی زەمانی کۆمەڵەی ژ . ک کێت زۆر چاک لە بیرە و لە کێ زۆر نیزیک بوو؟

**ڕەعنا:** وەڵا ئەو کەسانەی کە زۆری لێ نیزیک بوون ئەودەم لە بۆکان ماڵێکی بچووکیان بوو کە ئێستا دەزانم دەبێ هەر ماڵی تیمی بووبێ، مامۆستا هەژار بوو، مامۆستا هێمن بوو، ئاغایەکی دی هەبوو ئاغای گیویان پێدەگوت، ئەوجار مدەرەسی بوو

لە گەڵ میرزا مەنافی کەریمی و کاک سەدیقی حەیدەری و ئەوانە رەفیق بوو، لە گەڵ کەریمی یاهو زۆر رێک بوو و زۆریان یەکتر خۆش دەویست، زۆرم لە بیر نییە.

**عەلی:** پێش کۆمار، ناوی کۆمەڵەی ژ . ک ت چۆن دەبیست؟

**رەعنا:** وەڵا ئەمن ئەودەم زۆر مناڵ بووم، بەڵام هەر دەمبیست کە ئەوە خەریکی کوردایەتی و شتی وان. بەڵام ئەو ماوەیە کە کاکم لە تاران گیرا بوو وڵات زۆری تەغییر کرد و لە ماوە ٧ـ٨ مانگێدا زۆر شت گۆڕا، قازی هاتە سەر کار و لیباسی لەبەر کرد، حەمە حوسێن خان و سەدرولئیسلام لە دەستی چەپ و راستی راوەستان. وەلی ئەودەم شتەهایەکم گوێ لێ دەبوو، دەیان گوت قازی، زەبیحی خۆش ناوێ بەڵام ئەمن یەک شت دەزانم ئێستا کە دەڵێن قازی وابوو، وابوو، خەڵکی بە جێ نەهێشت وانەبوو! چون ئەگەر کاکم چوو بۆ رەزائیە ئەگەر عروس رێگایان دابایەن هەموو دەرۆیشتین! ئەوجار لە پێشدا ئەو سێ ماڵانە دەبوون، ماڵە قازی و سەدرولئیسلام و حەمەحوسێن خان جا دوایە ماڵەکانی تر! کاکم ئیدی رێگای عێراقی گرت و رۆیشت هەر بەو ماشێنە کە عروسەکان دابوویانێ جا ئیدی نازانم کێی لە گەڵ سوار بوو.

**عەلی:** ئەدی دوایە کە کاکت رۆیشت، وڵات چۆن بوو و کێ لە ئێوەی پرسی و ئێوە چتان بەسەر هات؟

**رەعنا:** وەڵاهی موتەئەسیفانە بە حاجی ساڵحی شاتریان دەگوت دەولەتخایە و زددی کوردە! بەڵام ئەمن دەڵێم وەڵاهی زۆر چاک بە فریای خەڵکی سابڵاغەوە هات و زۆر چاک بە فریای مەشەوە هات، بە خودای ئەو دوو دیوە زەلامانە جێگای لێ راخرابوو، هەرچی لە خۆی ترسابوو خۆی لە ماڵە حاجی ساڵحی هاویشتبوو، بە خودای زۆر چاکیشیان پەزیرایی لە خەڵک کرد، بەخسووس لە مە، حاجیاغا ئەودەم حاجیش نەبوو رۆژێ چەند جار سەری لە ژوورێ دەنا و بە ژنەکەی دەگوت: خورشید! ئاگات لە خوشکەکانی رەحمانی بێ! ئاگات لە خوشکەکانی زەبیحی بێ! زۆری ئاگا لە مە بوو، ساڵەهاش گوزەرابوو ئێمە لە نیگەرانی چووبووینە دەر ئەو هەر ئاگای لێمان بوو و لێی دەپرسین و دەهاتە کنمان!

**عەلی:** دوایە قازی و وان گیران؟

**رەعنا**: ئەری وەڵا هێندەی پێنەچوو دوای حەفتەیەک قازی گیرا، قازی گیرا و دوایە بەیانێکی کە هەستاین، بوو بە سرت و خورت و خەڵک دووکانی دانەنا و خەڵک هاتەوە ماڵێ و ئەمنیش مناڵ بووم غارم دا دەرێ بزانم خەڵک بۆ غار دەدا؟! چوومە چوارچرایە ئەودەم هەرچی دەبوو هەر لە چوارچرایە دەبوو، منیش هەر پێموابوو شتێکی هەر وەکوو چەلانە و چووم بەرەو چوارچرا و ئیدی نەمدەزانی چ باسە، بەڵام هەستم بە ترس و خۆف دەکرد لە ناو خەڵکدا! کە چوومە چوار چرایە بە داخەوە هەر سێ قازی سەریان بە دارەوە بوو! لە دار درابوون! دوایە لێیان کردنەوە و بردیانە مزگەوتی قازی لە نێو بازاری و حەمەدی خورشێدێ چوو شووشتنی و نەیان هێشت بیانبەنەوە ماڵێ و بردیانن تەسلیم بە خاکیان کردن، ئیدی نە هیچ ئیعترازێک و نە هیچ تەزاهوراتێک و هیچ، هیچ! هەر کەس بە غەمی خۆیەوە چۆوە ماڵێ!

**عەلی**: جەماعەتێکی زۆر کە هەڵات بوون و رۆیشتبوون، دوایە کێ ماوە وکێ هاتەوە و چۆن بوو؟

**رەعنا**: وەڵا نازانم زۆرم لە بیر نییە، کاکم رۆیشت کە نەهاتەوە، میرزا سەدیقی حەیدەری رۆییوو و هاتەوە، هەژار کە رۆیشت لە پێشدا لە گەڵ مام جەلال و وان بوو دوایە کەوتە نێو بارزانی و هەر لە گەڵ بارزانیش هاتەوە بۆ کەرەجێ و لەوێ ماڵیان دایە و کاریان دایە و هەر لەوێ بوو تا مرد، مامۆستا هێمن جارێکی رۆیشت و دوایە هاتەوە و گرتیان و دیسان رۆیشتەوە و دیسان هاتەوە و دوایە لەو ئاخریانە بوو بە هاوکاری رۆژنامەی سروە و هەتا مرد.

**عەلی**: لە سەر دۆستایەتی هەژار و هێمن و بێژەن (کە کاکت بوو) چت لە بیرە؟

**رەعنا**: کاکم و هەژار کە من زۆر لە بیرم نایە، ئەوان منداڵ بوون ئەمن نەبووم لە دایک، ئەوانە گۆیا ١٢ــ١٣ ساڵە بوون هەمیشە دوو بە دوو هەم لە ماڵی بابم هەم لە ماڵی بابی هەژاری کە حاجی مەلا محەممەدی بۆریان پێگوتووە سەریان لە بن کورسی ناوە و شتیان نووسیوە، لە مەدرەسە هەڵاتوون و لە خەزایی یان هیناونەوە. ئەودەم خەزایی زۆر لە سابلاغێ دوور بووە، ئەلعان کە ئەوە لە نێو ماڵانە ئەودەم زۆر دوور بووە لە شار! بابم بە دوویاندا رۆیوە، هەر کە دیویانە ون بوون حاجی مەلای بابی هەژاری هاواری بۆ بابم

بردووە کە ئەوە دیسان کوڕەکان ونن! جا یا بابم بە دوایاندا ڕۆیوە یان حاجی مەلا چووە هێناونیەوە، بۆ خۆشی کە لە کتێبەکەیدا ئیشارەی پێکردووە کە لە گەڵ هەژاری چۆن بووە. ئەوجار لە مەدرەسە کە بازرەسی شای هاتووە و بە دوای بابمیاندا ناردووە (ئەو زەمانی نازانم کلاسی دووهەم و سێهەمی ئیپتدایی بووە) بازرەسەکە قسەی لە گەڵ کردووە و پرسیاری لێ کردووە، گوتوویەتی ئەوە شتێکی نابغەیە بەڵام موتەئەسیفانە بە کاری ئێمە نایە یانی بە کاری دەوڵەتی ئێرانێ، جا هەر لە سەر وەی بابم هەمیشە لێی ترساوە و نیگەرانی بووە بەڵام لە گەڵ ئەوەش هەمیشە ئیحترامی بۆ کارەکان و هاتووچۆکانی و ڕەفیقەکانی داناوە.

**عەلی:** بێجگە لە مامۆستا زەبیحی ئێوە برایەکی تریشت چۆتە کوردستانی ئەودیو و لەوێ ماوەتەوە، ئەو بۆ چوو و لە سەر ئەو چ دەزانن؟

**ڕەعنا:** ئەو برایەشم کە کاکم ڕۆیشت و وڵات ئەمین بۆوە گوتیان سەربازی دەگرن، ئەو برایەشم کە مەزهەبی بوو لە لای شێخ محەمەد مەعسوومی بوو، هەمیشە دوای کارێ دەچوو لای وی و لە لای دادەنیشت و نوێژی دەکرد و... ئەوەش کە گوتیان خەڵک بە سەرباز دەگرن و خەڵک دەبەن بۆ سەربازی و وڵاتی تر، ئێمەش کە شۆرەتمان زەبیحی بوو و زەبیحی بەو شێوەیە لە دەوڵەتی ئێرانێ قاچاخ بوو، ئەو برایەم نەیوێرا بچێ بۆ سەربازی، شێخیش تەشویقی کرد و ناردی بۆ عێراقێ و مودەتێکی زۆر بە موڵک و ماڵی وی ڕاگەیشت و لە گەڵ شێخ خالید و ماڵێ شێخ محەمەد مەعسووم و وان تێکەڵاو بوو، لەوێ ماوە و لەوێ ژنی هێنا و ئەو ژنەی مرد و دوایە کە ژنێکی تری هێنا و ئەلعان ماشەڵا ٧ کور وکچەکی هەیە و دوایە کەوتە بەر بۆمبارانی شیمیایی هەڵەبجە و هاتن بۆ دیوی ئێران و دوایە شەری کوردستانی عێراق و بۆ خۆت دەزانی کە چۆنیان لێقەوما، بۆ خۆی بەو حاڵە مرد و جارێکی کە بۆمبارانی شیمیایی کرابوون هاتەوە و بۆخۆم چووم بۆ سەنقورێ لە لای کرمانشانێ هێنامنەوە کن خۆم، دوایە خێزانیان زۆر بوو کوڕیان بە جێ هێشتبوو و چوونەوە. دوایە کە بۆ خۆت خەبەرت کردم دوای ئەو هەمووە نارەحەتی و کوێرەوەرییە بە چ حاڵێکی لەو ئاخریانەدا مردووە!

**عەلی:** شتێکی تایبەتی ئەگەر لە بیرتانە لە سەر کاکت تکایە باسی بکە.

ڕەعنا: وەڵا شتێک کە لە بیرمە کاکم دەی گێڕاوە کە ئەو دەم کە لە بەغدایە بووە دەیگوت: چووبووم بۆ سەفەرێ، شەش مانگان ڕۆیبووم، کە هاتمەوە وەزعی ماڵیم زۆر خراپ بوو، هیچم نەبوو، لە فرودگایە کە دابەزیم هەر ئەوەندەم هەبوو بیدەم بە تاکسی و بمباتەوە ماڵێ (قەتیش نەیهێشتووە تاکسی تا بەر دەرگای بەرێتەوە) گوتی کە چوومەوە زۆرم ئیشتیا لە چای بوو کە دیتم نە چارپزەکەم چای تێدایە نە پووڵیشم پێیە، گوتی کە تەماشای کەترێکەم کرد تلتەی شەش مانگ لەوەی پێشی تێدایە کە بە جێم هێشتبوو، ئیشک ئیشک هەڵگەرابوو زۆر خۆشحاڵ بووم، چاوم لە قەندانەکەم کرد سێ کلۆ قەندی تێدا بوو، ئاوم وەسەر ئەو تلتە چایە کرد و عەلادینەکەم هەڵ کرد و وەسەرم نا و لە سەرڕا کردمەوە چا و خواردمەوە! کوێر بم ئەو بەدبەختیانەی زۆر کێشاوە!

جارێکیش لە سولەیمانیە لە هۆتێلێک کاری کردووە، نازانم میرزا بووە، خزمەتکار بووە، چی؟ بەڵام خەبەرنیگاری خاریجی بەدزی ساحێب هۆتێلەکە چوون مساحیبە و وتوویژیان لە گەڵ کردووە.

زووتر پێش تێکچوونی مام جەلال و مەلا مستەفای ئەو هەر لە گەڵیان بووە و دەمبیست دەیان گوت بە لیباسی کوردی لە زەمانی پێکەوە بوونی مەلا مستەفا و مام جەلالی ئەو بە سەر عەمبار و تەداروکاتی پێشمەرگەکان ڕاگەیشتووە، دوایە کە مام جەلال و بارزانی تێکچوون و مەلا مستەفا هاتە ئێران و ئەوانە، ئیدی ئەو چوو لە بەغدایە دانیشت و بۆ خۆی دەیگوت چوومە سەر قامووسەکەم، دەیگوت گوتوومە باشترە کتێبەکەم تەواو بکەم ئەوانە بە من عاقڵ نابن و فایدەی نییە! وەلی زۆر لە وە نارەحەت بوو کە مەلا مستەفا هاتەوە ئێرانێ!

**عەلی:** زۆر سپاس بۆ ئێوە.

# وتوویژ لە گەڵ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل و کاک شیخ لەتیف بەرزنجی

١٩٩٣/١٠/١٢

**عەلی:** تکایە بفەرموون لە کویّ و لە کەیەوە مامۆستا زەبیحی دەناسن؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** لە یەکی مانگی حەوت کە هەمزە و جەماعەتەکەی حەمید عوسمان و ئەوانە دەرکران لە ئەنجامی کۆنفرانسیک کە بەندە لەگەڵ چەند کادریکی پیشکەوتووی حیزب چووینە ماڵی مەلا مستەفا دانیشتین هەتا بەیانی. کۆنفرانسەکە بڕیاری دا هەمزە دەربکریّ و تەجمید بکریّ هەتا مونتەمەر. ئیتر سبەینیّ لە بارەگا دەرکرا و "مەکتەبی سیاسی داتاشراو" تەسلیمی قیادەکەی پیشتر کراوە. ئا ئە لەو رۆژانەدا من زەبیحیم بۆ یەکەم جار دیت. پیشتر ناوم زانیبوو چونکیّ ساڵی ١٩٥٦ کۆراسیّکی دەرکرد "الرد علی الکوسموپولیتیە" ئەوە لە سوریا نوسیبووی و ناردی لیّرە حیزب رۆنیوّی کرد و تەوزیعی کرد، بەڵام خوّی نەهاتبۆوە ئیّرە تا ئەو رۆژە مونتەمەری چوار کە لە ماڵی برایم ئەحمەد بەسترا. زەبیحیم ئەمن بۆ یەکەم جار هەنگیّ دیی، بەڵام هەر هاتەوە وەکوو عوزوی قیادی ئیشی کرد. لە گەر ئیّمە هەر بوو بە ئەندامی لیژنەی تەحزیری کە بۆ مونتەمەر، کونفرانسیان دەبەست لەو شارانە.

بە دریژایی ئەومودەتە زەبیحی کابرایەکی لە خۆبردووی موتەوازیعی بیّ فەخفەخەی حەتا مەسەلەن حیزب پیّشی دەگووت بابە وەرە لە مقەر ژوورت بو تەئسیس کەین ئەو دەیگوت نەخیّر! ئیّمە هەموو حیمایەمان هەبوو ئەو نەیدەویست! ئیّمە هەموو ترومبیّلمان هەبوو ئەو نەیدەویست! مەسەلەن جەلکی چاک، نەیدەویست! ئەوە مام جەلال شەڕی لە گەڵ دەکرد لە سەر جلکی چاک و باش، دەیگوت ناکرم! ئەو پیاوە ئەوها تیکۆشەریکی وا بوو، سەر و راست بوو شەرمی نەدەکرد لە هیچ کەسیّک، هەر چی بە دڵی نەبایە یەکسەر دەیگوت بە دڵم نییە وە لە کردەوەی مام جەلال گەلیّکیش رازی نەبوو

بەڵا. لە گەڵ کاک برایمی ئەشەمبیلا موونسەجیم بوون. کە خیلافەکەشمان بوو لە گەڵ مەلا مستەفا، ئەوەم هەر لە بیرە ئەو لە بەغدایە بوو عەرزم کردی منیش لێرە بووم قیادە نەما بوو، زەبیحی لە بەغدایە لە جێی مەکتەبی سیاسی بوو منیش لێرە بووم جار جار دەچووم دەمدیت. حەبیبی حەمەی کەریم کە ئەوەڵ سکرتێر بوو، مەلا مستەفا شتێکی دروست کردبوو گۆیا حیزبە!

زەبیحی شتێکی نووسیبوو و ئەمن لێرە بۆم تایپ و رۆنیۆ کرد و چەند جارانیش تاریفم کردووە. چیرۆکەکە چ دەرێ: دەرێ ئەوە مەلا مستەفا حیزبی داناوە و حەبیب گۆیا بووەتە سکرتێر و حکایەتی دەکا:

دەرێ جارێکی ئەوە ئەوها ئەشرەکەیە: دەرێ پیرە کەرێکی رەق و ئێشکی لاوازی پشت برینداری بێ کلک هەبوو ساحێبەکەی چوو بەرەڵای کرد. کەرە بە کەڵک نەدەهات، لە ناو غاباتێکی بەرەڵای کرد. کەر لە بۆ خۆی لەوەڕا لە گیا و لە پوش، کاکە قەڵو بۆوە و برینەکانی پشتی چاک بوون. نێرە کەر دەهات و دەچوو غاری دەدا! رۆژێکی کەوڵە شێرێکی دیتەوە، کەوڵە شێرەکەی لەبەر خۆی کرد و رووی لە گوندێکی کرد و ئاوەدانی خڕ لە بەری هەڵات و گوتیان ئەوە شێر هاتییە، جا ئەویش مەغرور بوو گوتی وەڵا دەبا نەعرەتێکی لێ بدەم، نەعرەتێکی لێدا و زانیان خەڵکەکە! ئەوە گوتیان خۆ کەرە! ئەوە کەرە! چوون کەوڵە شێرەکەیان لێ کردەوە و بارە دارێکیان لێ بار کرد. دەرێ ئێنجا هەر کەسە راست بۆوە تایپ و رۆنیۆیەکی لە کنە خۆی دانا و عەرزت دەکەم خۆی کرد بە حیزب، نابێتە حیزب. ئەو کەوڵەی ئاخری کەشف دەبێ و کەوڵەکەی لێ دەکەنەوە و بارە دارەکەی لێ بار دەکەن.

ئەوە جا ئەوەی بە مەلا مستەفا وا گوت! زەبیحی نەدەترسا هەتا حیزبایەتی بوو ئەوە حیزبایەتی و لە زەمانی پێشمەرگایەتیشدا مەسئولی کەرکوک بوو ئەوە کاک لەتیف لە نیزیکەوە بوو، ئەمن هەر وەکوو عەرزم کردی ئیلا لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندی یا خۆ ئەگەر کۆنفرانسێک بایە دەمدیت، یان خۆی کاغەزی دەنووسی لە حیزب لە بۆ مەکتەبی سیاسی، من دەمخوێندەوە و جوابەکەم دەنووسیوە ئەوەی کە زۆرتر لە گەڵی ژیا بێ لە ناو مەنتەقەی قەرەداغ و ناو جافەتی و ئاوا لە گەڵ مەلا جەلیل و... کاک لەتیف

زۆرتر دەزانێ و پێکەوە بوون.

**عەلی:** کاک شێخ لەتیف! کە یەکێک لە دۆستە خۆشەویستەکانی بووی، تکایە بفەرموون کەی و لە کوێ ماموستا زەبیحی تان ناسیوە؟

**کاک شیخ لەتیف:** من لە ساڵانی ١٩٥٨-١٩٥٩ ماموستا عولەمام لە بەغدا ناسیوە. ماموستا عولەما بە هۆی بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان ئەوساکە عیلاقەم زۆر لە گەڵی بەتین بوو. ماموستا لە سەرەتای ١٩٥٩وە ئەندامی لیژنەی تەحزیری پارتیمان بوو. ئەو و ماموستا عومەر دەبابە و کاک نوری شاوەیس لەو ساڵە دەهاتنە هەولێر سەرپەرشتی ئینتخاباتە مەحەلیەکانیان دەکرد، دوای ئەوەی کە ئیش و کار تەواو بوو ئێمە هەموومان ئەندامانی کۆنگرە لە بەغدا لە موئتەمەر ئامادە بووین و ماموستا زەبیحی لەوێ هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. دوایی لە ساڵانی ١٩٦٠ کە وەزعمان بەرەو ناخۆشی دەڕۆیی (لە دەوری کەریم قاسم دا بوو) ساڵی ٦١ ئێمە چووینە دەرەوە لە مەنتەقەی قەرەداغ بووین. لە ساڵی ٦٤ ئەویش هاتە کەرکوک و لێپرسراوی ناوچەی کەرکوک بوو چەند جارێک لە ناوچەی جەباری و گەرمێن و سەنگاو بە یەکەوە لە گەڵ ماموستادا کۆدەبووینەوە چونکە مەسئولی لق بوو وە چەند لە ئێمە لەو کاتەدا بە ئیش و کاری پیشمەرگە هەڵدەستاین. من ئەندامی کەرتی ٣ و ٤ بووم لە گەڵ ماموستا کەماڵ موفتی دا، لە گەڵ ماموستا عولەما ماوەیەکی زۆر بە یەکەوە بووین. ماموستا ئینسانێکی خەباتکەر، ورد، تەنزیمی، رێک و پێک، زۆر مەشهوور بوو بەوە کە دائیمەن خەریکی ئەوە بوو کە مالیەی حیزب بە هێز بکا و پارە زۆر دەستی پێوە بگرێ، هەتا پێشمەرگە زۆر گلەییان لێ دەکرد، لە بەر ئەوەی وەکوو پێویستە یارمەتیان نادەن. تەبعەن مەبەستی ئەو لە رووی دڵسۆزیەوە بوو، یەعنی شتێک دارایی بۆ حیزب بەیەکەوە بنێ.

دوای ئەوە لە ساڵانی ١٩٧٠کانیشدا دیسان هەر لە بەغدا ماوەیەکی دوور و درێژ بە یەکەوە بووین لە گەڵ ماموستا عولەمادا. جارێکیان سەفەری دەرەوەی دەکرد. من لە بیرمە ئێمە کۆمەڵێک (لەو کاتەدا ماموستا عەبدوڵڵا وەزیری دەوڵەت بوو) چووینە پیریەوە بۆ بەغدایە کە بیهێنینەوە، لەوانەی کە لە بیرمە لە گەڵماندا بوون کاک ئەحمەد

حمەدەمین دزەیی، مەجموعەیەک لە کەوادێرەکانی خۆمان، لێپرسراوان، هەموو ئامادە بوون. وا بوو لە مەتار تۆزێک تەئخیریان کرد دوایە لە گەڵی هاتینەوە و ئاگاداریی ماموستا عەبدوڵلامان کرد و شتێکی وامان هەست کرد کە شتێک هەیە دەربارەی کە بیگرن یا شتێکی وا. ئەو شەوە مایەوە و ماموستا عەبدوڵلا دیبووی، بۆ بەیانی ماموستا عولەما گیرا، کە گیرا ماوەیەک لە بەندیخانە مایەوە لە بەغدا هیچ کەسێک خۆی نەکردە ساحێبی، جگە لە ماموستا عەبدوڵلا زیاتر کە زۆری پەرۆش بوو، یەقەی کاربەدەستانی دەگرت ئەوەندەی نەخایاند حەولیدا لە رێی مودیری ئەمنی عامەوە کە مواجهەکی بۆ وەرگرن. ئەمنی ناردە ئەوێ، پارەشی دامێ بۆ ئەوەی کە تەئکید بکەین کە ماموستا ماوە. هەر ماموستا عوبدوڵا خەبەری منداڵەکانی تەیموری بەختیاریشی دا کە ئەوانیش لایەنگری ماموستا عولەمایان زۆر دەکرد و حەولیان دەدا کە شتێکی بۆ بکەن. ئێمە بە هەموو لامان حەوڵمان دا و نەتیجە منیان نارد بۆ ئەمنی عام. پارەکەی ماموستا عەبدوڵلام بۆ نارد، بۆ ئەوە پارەی پێ بگا و وەسڵێکمان بۆ بکا. داوام لە مودیرەکە کرد (ئەو پیاوەی کە چوومە لای مودیری شوعبەی سێ یان پێ دەگوت) کە وەسڵێکمان بۆ بێنێتەوە کە پارەکە گەیشتووە یان نا؟ بە سێ چوار سەعات منیان تەئخیر کرد، دیاربوو ماموستا لە شوێنێکی دوور حەپس بوو کە جوابەکەیان بۆ هێنامەوە نوسیبووی " ایستلمت" بە عەرەبی، عەبدولڕەحمان تەوقیعی کرد بوو. من باوەڕم نەدەکرد، ئەوەڵ پێشانی ماموستا عەبدوڵلام دا، گووتی بەڵێ تەوقیعی خۆیەتی و ئیمزای ئەوە.

فەترەیەکی پێچوو ماموستا حەولی دا لە گەڵ مودیری ئەمنی عام و وەزیری داخلیە کە دەبێ چارەیەکی ماموستا زەبیحی بکەن، نەقلیان کرد بۆ بەندیخانەی فەزلیە کە بەندیخانەیەک بوو جێگای کۆمەڵە سیاسیەکان بوو.

بۆ ئەوەی کە وا ئێمە خۆمان دڵنیا بین لە سیحەت و لە دیتنی، دیسان هەر ماموستا عەبدوڵلا حەولی دا مواجهەی بۆ کردەوە و بۆ ئەوەڵ جار بۆ چاو پێکەوتن من چووم. بە داخەوە ئەو برادەرە زۆر دۆستانەی ماموستا عولەما کە لە بەغدا بوون چەند پارێزەر بوون! ئەو ماموستایەی کە زۆری لێ نیزیک بوون هیچ کەسێکیان نەیاندەویست نە لێی وەژور کەون نە هاتووچۆشی بکەن! یەکەم جار ئەوەی کە بۆ بە تاقی کردنەوە منیان

نارد، چووم ببینیم وتم ئەگەر نەتیجە چی لێ بێ قەی ناکا خۆ ئێمە لە ئەو زیاتر نین، من چووم بینیم زۆری پێ خۆش بوو، گەلێ قسەی خۆشی لە گەڵ کردم، تەبعەنیش هەر نەدرابوو بە محکەمە تێی گەیاندنم کە ئەو رۆژەی گیراوە چۆن گیراوە، وام بۆ مامۆستا عەبدوڵلا نەقڵ کرد: وتی من بەیانی لە ماڵەکەی خۆم (شوقەیەکی هەبوو لە بەغدا جەدیدە) لەوێ بووم گوتی رەفیق پشدەری هات بۆ لام گوتی: مامۆستا تۆیان دەوێ لە ئەمنی عام دەبێ بچین بۆ ئەوێ. گوتم خێرە؟! گوتی وەڵاهی شتەکە ئەوەیە و ناکرێ لێی دەرباز بی و تێی گەیشتم و وتی مەسەلەکە گرتنە. کە بردوویانەتە ئەمنی عام، وتم مامۆستا چیان لێ پرسی؟ وتی ئیستهامی من تۆهمەتی من ئەوە بوو، بەوەیان تاوانبار کردووم گە گۆیا لە گەڵ مام جەلال لە لوبنان چوومە سوریە. گوتم باشە وڵامت چی بوو؟ وتی وەڵاهی من وتم کابرایەکی عێراقیم و جەوازیشم عێراقییە من ئەگەر چووبمە سوریە ئەوە پاسپۆرتەکەم هیچی تێدا نییە! وتی ئەوان دەیانزانی من بە نەوعێکی دی چوومە سوریە.

سەفەرەکەشی کردبوو بەڵام بە جەوازێکی دیکە بۆیان تەرتیب کردبوو. عەلاکولی دوایە درا محکەمە و تەبعەن حوکم درا. رۆژێک مناسبەیەکی تەموز هەبوو ئەحمەد حەسەن بەکری رەئیس جەمهوری عێراق لە گەڵ سەدام حوسێن هاتنە لامان، مامۆستا عەبدوڵلا لە بەرچاوی سەدان کورە فەیلی نیشتمان پەروەر یەخەی سەدام حوسێنی گرت و داوای لێ کرد گوتی ئێمە پیاوێکی منازل، مامۆستایەکی گەورە، خەباتکەرێکی کۆن کە کوردی عێراق و ئێران دەیناسن و هەموولا خۆشمان دەوێ دەبێ لە بۆمان بەردرێ، ئەویش وتی سەبرم لێ بگرە. گوتی کەڵکی سەبری نییە دەبێ چارەم لۆ بکەی و وەعدم بدەیە! گوتی ئینشاڵا، ئینشاڵا! ئەمن لە گەریان راوەستا بووم. سەدام وەعدی دایە کە ئەویش ئەودەم لە حەپسخانەی ئەبوغرێب بوو حوکم درابوو بە دوو ساڵ سێ ساڵ شتێکی وا، ئێمە چووینە سەردانی ئەو لە سجنی ئەبو غرێب، گوتم مامۆستا چت دەوێ؟ گوتی حەزم لە یاپراغی گەڵا مێوە، گوتم بە سەر چاو! ئەو ماوەیەی لەوێ بوو ئێمە کابرایەکمان لابوو زۆر حەزی لە خواردن دەکرد هەموو جاران مەنجەڵە چێشتمان نیوەی لە رێیە دەخوارد، ناوی برایم خۆشناو بوو.

ئەو ماوەیەکی زۆر لەوێ بوو بەڕاستی مامۆستا عەبدوڵڵا زۆری حەول بۆ دا کە بەرماندا دیسان خۆمان بە ئیشەکەی هەڵئەستاین و چەند کەسێکی خۆیی بە تایبەتی مامۆستا عەبدوڵڵا هێنایە ماڵی خۆیان. لە ماڵی ئەوان میوان بوو حەتا زۆر لە دۆست و برادەرانیش گوتیان ئەوە بۆ مامۆستا موشکیلەیە، کابرایەکی وەزیر بێ و مامۆستا عولەمای بێنێتە کن خۆی بەڵکی ببیتە عەزاب! گوێی نەدایە و هەر بە دەستووری ئێران سەماوەرێکی گەورەیان بۆ دانا بوو هۆدەیەکیان بۆ دروست کردبوو کە ئەنگۆ پێی دەڵێن "وەتاغ" لەوێ لێی دانیشتبوو دیشلەمەی خۆی دەخوارد و ئەو خەڵکەی لێ کۆ ببۆوە.

دوای ماوەیەکی، زۆر بە ئیلخاحەوە چۆوە شوێنەکەی خۆی، لەوێش چەند گیرو گرفتێکی لە گەڵ چەند کەسێکی دۆستی خۆی هەبوو، خیانەتیان لێ کردبوو. ئەگەر پارەیەک پوولێک، شتێک، یان،... بووبێ لە شوێنێک لێیان شاردبۆوە، حەتا مامۆستا عەبدوڵڵا خەریک بوو کابرایەکی لە سەر بکوژێ، ئینجا ئیعترافی پێکرد کە ئەوە پارەی مامۆستا عولەمای خواردووە و شتی خراپی کردووە و عەلاکولین! بەو شێوە لە گەڵ مامۆستان رابوارد هەتا ئەم ئاخرییە، تەبیعی خەریکی ئەو کتێبانەی خۆی بوو، ئەو کتێبانەی تەبع کرد، بەرگی یەکەم و دووهەمیش تەبعەن لامانە و شتێکی چاک بوو باقیەکەی کە هەر لە خانۆکەدا بوو ئەویش مامۆستا عەبدوڵڵا زۆر حەولیی دا لە ڕێی کاربەدەستانەوە کە وەریی بگرێتەوە، وەعدیشیان داینێ...

**مامۆستا عەبدوڵڵا**: نا درۆیان کرد!

**شێخ لەتیف**: بەڵێ، پاشان مەسەلەی ئێران و وەزعی ئێران و باری سیاسی ئێران گۆڕاو و خومەینی لە فەرەنساوە وەرێ کەوت بۆ ئەوێ. کوردانی بەغدا هەموویان یەقەی مامۆستا عولەمایان گرت، ئەسسەن قسەکانم لە بیرە: دەیانگوت مامۆستا مویەریری مانەوەت نەماوە لە بەغدا!

**مامۆستا عەبدوڵڵا**: ئەرێ وەڵا وایان دەگوت!

**شێخ لەتیف**: هەموو جارێ یەقەیان دەگرت. جارێ لەوانە یەکەم جار مامۆستا عەبدوڵڵا دەعوەتێکی زۆر گەورەی لەبۆ گرت. تەبعەن بابەکر ئاغای پشدەری تێدا بوو، معاونی عەونی یوسف تێدا بوو، کۆمەڵێک شەخسیات و برادەرانی خۆمان، عەزیزی

شەمزینی، کەمال موفتی و ئەوانەی کە لە بەغدا بوون پیاوانی ناوداری کورد، کۆبوونەوە. هەر یەکە رۆژێک مامۆستا عولەمایان دەعوەت دەکرد بەو حیسابەی کە مامۆستا بگەڕێتەوە بۆ ئێران. بەڕاستی مامۆستا عولەما زۆری حەز لێ نەبوو، مەلا عەبدوڵڵاش ئاگادارە.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** پێی خۆش نەبوو.

**شێخ لەتیف:** لە بەر ئەوەی دەیگوت من ئەو برادەر و دۆستانەی کە هەمبوون یا ئاوارەی وڵاتانن یا تاق و لۆقێکیان ماون و زۆریان نەماون. ئەوەی کە ئێستا لە ساحەی کوردایەتین لە گەڵ من دۆستایەتیان نییە و ئەوەندە خۆشیان ناوێم لە بەر ئەوە من بیر و باوەڕێکی خۆم هەیە و رەنگە بە کارەکانی وان رازی نەبم حەزیشم زیاتر لێرەیە دوایە فەرقی ئێران و عێراق نییە، کوردستانی عێراق و ئێران بۆ من هەر یەکە، ئەو ئیشەی کە لێرە دەیکەم هەر عەینی ئیشەکەی ئەودیوە بە هەر حاڵ وازیان لێ نەهێنا و مامۆستا عولەمایان خستە سەر ئەوەی کە بگەڕێتەوە. ئێمە هاتینەوە هەولێر، مامۆستا عەبدوڵڵا کاک حیلمی شەریفی لە گەڵ نارد بوو بۆ لای من، هاتنە ئاوایی قەتەوێ من ماڵم لە دێی قەتەوێ بوو لەوێ کاک حیلمی گەڕایەوە. مامۆستا لە لای ئێمە بوو ماوەی یەک دوو رۆژێک بە یەکەوە بووین، سەری چەند دۆستێکی خۆی دا یەک لەوان محەمەد مەولود هەبوو کابرایەکی بە ئەسڵ سابلاغی بوو.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** مەم

**شێخ لەتیف:** مەم شاعیر بوو نووسەر بوو عەمری خوای کردووە. لێرەش گوتی وەڵاهی من پێم خۆشە ئەتۆ لە گەڵم بێی. من هەستام بە ترۆمبێلی خۆم لە گەڵیی چوومە حدودی ئێران، حاجی عومەران، لە دێی زینوێی شێخی لە ماڵی شێخ مستەفای شێخ عوبێدیلا لێیان میوان بووین دوو شەو لەوێ ماینەوە. کاک شێخ مستەفا و مەجموعەیەکی زۆریشمان لە گەڵی چووینە پۆستی عەجەمان. حیزبی دێمۆکرات لە سەر کار بوو لەوێ بوون. ئێمە لە مەقەری ئەوان لاماندا ئیحترامی مامۆستایان زۆر گرت لەوێ ناردیانە خانێ، ترۆمبێلێکی بۆ بێ و خەبەری مەهاباد بدا. وتمان لە خزمەتت دا بێین، وتی نا هیچ پێویست ناکا. بەڕاستی لەوێ چەند رەسمێکی لە گەڵ گرتین کە

رۆیشت پڕی چاوی ئاو بوو! زۆریش موتەئەسیف بوو، زۆر نارەحەت بوو بە گەڕانەوەی کە دەچێتەوە بۆ ئەوێ و ئێمە بە جێ دێلێ! عەلاکولی هەمووی ماچ کردن و خواحافیزی کرد. ماوەیەکی پێچوو ئەوان لەوێ بە ئیش و کار تەکلیفیان کرد و گەڕایەوە عێراق. لە گەڵ مامۆستا عەبدوڵلا قسەمان کرد و گوتمان دەبوو مامۆستا عولەما نەیەتەوە وا زوو! نەوەکوو موشکلەیەکی بۆ دروست کەن. عەلاکولی چەند جارێک بە ئیش هاتووچۆی کرد. یەک جارێک لە و جارانەی مامۆستا عولەما کە لە بەغدا بوو یەکێک لە کاربەدەستانی حکومەتی عێراق کە مەشهوورە (بارزان تکریتی) بەو مامۆستا عەبدوڵلایەی گوتبوو کە وەزیر بوو، گلەیی و ناڕەزایی لە مامۆستا عولەما دەربڕیبوو کە مام جەلال دەبینێ و کاربەدەستانی دەرەوە دەبینێ و ئەو جەماعەتانەی لە گەڵ ئەمان دۆست نەبوون! مامۆستا عەبدوڵلا دیفاعی کردبوو گوتبووی ئەو پیاوە، پیاوێکی مونازیلە، خەباتکەرە، نازانێ لە سەر دوو پەتک یاری بکا. ساحیبی مەوقیف و وەعدەی خۆیەتی، ئەوە مامۆستای ئێمەیە و ئێمە زۆر پێی رازین. گوتی وەڵا عەلاکولی ئێمە گلەیان لێیە "اذا تحب تکله گله" (ئەگەر پێتخۆشە پێی بلێی پێی بلێ).

من بە مامۆستا عەبدوڵلام گوت ئەمە خەتەرێکی گەورە بۆ ئەو پیاوە پەیدا دەکا بە قەناعەتی من سەری تێدا دەچێ پێی بلێ وا نەکا هەتا سەفەرێک لە دەرەوە لە لەندەن هەمووم بۆ عومەر دەبابە گێڕاوە وتی: مامۆستا عولەما پیاوێکی فەقیرە یاری بە ئاگر دەکا، تێدا دەچێ وە فێعلەن دوای ئەوەی کە ئیتر بزر بوو ئێمە هیچی کەی لێ نازانین وە ئومێد دەکەین ئینشاڵلا لە شوێنێکا شاردرابێتەوە وەک ئەو سیاسیانەی کە لە عێراقدا وون بوون، زۆر کەس هەیە پاش دە ساڵ و پانزە ساڵ دەبیندرێنەوە و سەر هەڵدێننەوە، موومکینیشە مابێ وە ئەگەر نەش مابێ و سەری تێ چووبێ بە لای منەوە لێرە تێ چووە نەک لە ئێران!

**مامۆستا عەبدوڵلا**: لێرە تێچوو بێ یا لە ئێران قاسملو سەری تێ برد!

ئەمن هەر لەوە سەرم سوڕ دەمێنێ ئەو پیاوە لەگەر ئەو جیهازە تایبەتێکانی حکومەت زۆر تێکەر بوو زۆریان خاتر دەگرت حەتا ئاخر جار پڕ جیبێک کەلاشینکۆف بە مەخزەنەوە، بە فیشەکەوە پێیاندا نارد لە بۆ عێزەدین حوسێنی! چوون لە لای مەریوانێ

جەماعەتی قاسملو هاتن سیلاحەکانیان لێ ستاند بردیان. پاشان گوتی دامیانەوە بەڵام کەلاشینکۆفێک و هێندێک مەخزەنیان هەر خوارد، ئینجا ئەمن پێمگوت جاری دووهەم کە هاتەوە زۆر پێم ناخۆش بوو گوتم مامۆستا ئەتۆ لۆ دێیەوە ئەتۆ ئیشەکت دەبێ لە گەر ئەوانە ئەمن وا لێرە نیمە؟! خەبەرەکەم لە بۆ بنێرە وەکوو مەسەلەی حامید بەگ، ئەمن جا ئیتسالت بۆ دەکەم بە بارزان، غەیری بارزان،... ئەتۆ نەدەبوو بێیتەوە! دوایی ئەمن گلەیی ئەوەم لێ کرد حەتا قسێکی پێگوتم کە موعتەمدی دەفتەری عێزەدین حوسێنی یە! گوتم عەیبە لە بۆ تۆ، ئەتۆ زەبیحی! ئەو تێکۆشەرە کۆنە ئاخر مەلا عێزەدین چیە ئەتۆ بچی نوێنەری دەفتەری ئەو بی! ئێمە بە تەمای ئەوە بووین لێرەش کە رۆیشت هەر وام پێگوت، گوتم مامۆستا لەوێ شتێک دروست کە ئەگەر ئێمەش لێمان قەوما یا حەزمان کرد بێین ئیلتحاقت پێوە بکەین. کە چی ئەتۆ چووی بوویتە پیاوی عێزەدین! ئاخر عێزەدین کێیە!؟ دەبوو ئێستا عێزەدین وەرەقێکی پێبایە لە مەکتەبی تۆ لە دەفتەری تۆ خەڵک بیناسێ! ئا گوتی عەرزت دەکەم هاتنەوەکەم ناجوور بوو راستە ناجوور! گوتی مەسەلەی عێزەدین حوسێنیش بڵێم چی؟! ئەوانە نامەرد بوون یەعنی مەقسەدی دیمۆکرات بوو.

ئەوە ٢١ی مانگی نیسان بوو. لێرە (هەولێر) حەفلەیەک بوو، ئەو ئەمنی عام و شەباب و مەباب گرتیان نازانم بە موناسبەتی چیی بوو؟ دەعوەتی منیان کردبوو وەڵاهی موتەرەدیدیش بووم، ئەو پێی گوتم برۆ، هاتمە ئێرە سێ رۆژم پێچوو کە چوومەوە زەبیحی نەمابوو! خەڵک گوتیان لە سلەیمانیان دیوە ...

عەلی: ئەوە ساڵی چەند بوو مامۆستا؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ساڵی ١٩٨٠ مانگی ٤ مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٠ یەعنی بە حیسابی خەڵک دەبوو ٢٥ و ٢٦ی نیسان لە سلەیمانی دیترا بێ. ئەوەم نەزانی پاشی ساڵ سوراوە بابەکری پشدەری وەکوو خەبەرێکی یەقین بە منی گوت مامۆستا زەبیحی لە ئێران مرد و لە کن هەژاری بووە، تەعزیەشیان لە کەرەجێ لە بۆ داناوە! ئەمنیش گوتم کاکی خۆم مامۆستا زەبیحی ئەگەر لە تارانێ بایە ئەگەر لە کەرەج و مەرەج بایە ئێمە دەمانزانی، شتی وانییە و نەگوترایە! ئینجا هاتمەوە لێرە کەریمی حەسەن

بەگی تازە هاتبۆوە (میرزا)، میرزام نارد گوتم میرزا کەریم هەتا کن عێزەدین حوسێنی برۆ بە قوربانتم، برۆ سۆراغێکی ئەو زەبیحێم بزانە لە بۆ ناکەی! کەریم رۆیی، بەینێکی پێچوو هاتەوە کاغەزێکی لە بۆ هێنا بووم کاغەزەکەش بەخەت و ئیمزایەک یەعنی بە شێوەی خەتی فارسی لە جەلالەدین (شێخ جەلالی حوسێنی) برای عیزەدینەوە هاتبوو. دەرێ ئەو پیاوە چووە تارانێ بە قاچاغی و نەگەراوەتەوە، دەرێ ئەوە سالی پاریش جارێکی دیکە لە بەهارێ سەفەرێکی وای کردووە. ئینجا جەلال؛ خۆی زەبیحی بەحسی جەلالی لە بۆ دەکردم، دەیگوت: پیاوێکی بەتوونە، سەر و بەند بەحسی جەلالەدینی بە چی لۆ کردم، گوتی پیاوێکی زۆر مەردانەیە ـ کو مامۆستا؟ گوتی لە گەڵ موخابرات (ئاخر ئەوانە هەموو لە موخابرات شتیان وەردەگرت سیلاح، پارە ...) پێی گوتوون ئێوە خزمەتی ئێمە ناکەن خزمەتی خۆتان دەکەن! ئێران دوژمنتانە ئێستا یارمەتی ئێمە دەکەن چونکی ئێمە دوژمنی دوژمنتانین، گەر وەختەکی ئەنگۆ لە گەڵ ئێران رێک کەون نەک یارمەتیمان نادەن، هەر زددیشمان دەبن، یەعنی حا جەلالەدین ئەوهای قسە لە گەر مخابرات کردیە! موخابراتەکەش تا ئێستا کە ئەمن نازانم کێ بوون و دەچوونە کن کێ؟ هەر بارزان گلەیەکەی کرد، بارزانیش خۆ من دیفاعم لێ کرد پاش ئەوە نەمدەزانی ئەو پەیوەندی بە کێوە هەیە؟ چونکە من ئەو خسوسیاتەم نەدەپرسی! پاشان دەترسام رۆژێکی ئیستمزاز بێ وەکوو بە حیلمی گوت ئەوەش بە من بلێ! مەسەلەن گوتم ئەوە چییە لە گەڵ حیلمی مامۆستا؟! گوتی: کاکە حیلمی دەرێ کە ئەتۆ شتێک بکەی دەبێ من بزانم! نی بۆ چی بزانی؟! ئێمە حیزب بووین ئیلتزامان هەبوو بەرامبەر یەکتری و بە بێ یەکترمان نەدەکرت ئێستا ئێمە هەر کەسە سەربەستە بۆ خۆی هەر کەسە کەیفی خۆیەتی.

لەوەی دەترسام! چونکە من گەلێکم خۆش دەویست، نەمدەویست رۆژێک لە رۆژان دری لە من گەردی بگرێ، دەنا ئەمنیش پێ رازی نەبووم حەتا کە هاتەوە گوتم لۆ هاتێوە؟! گوتی عەرزت دەکەم ناجوور بوو هاتنەوەکەم، بەڵام ئەوە هاتم! ئەی دوایە جارێکی تر هەر هاتەوە!

ئەو پیاوە نەدەترسا لە موخابرات و شتی عێراقی! دوایی... کورە ئەمن ئێستاکەش تێ ناگەم! وەرە لێکی دەینەوە ئەو پیاوە کە ئەوەندە جێگەی باوەڕیان بێ سیلاح و پارەی

لە بۆ پێدا بنێرن لە بۆ عیزەدین حوسێنی بۆ دەبی بیگرن و بیکوژن؟! ئەمن نازانم هەرچی لە گەر زەبیحی کرایە شکم لەوە نیّ قەتعەن کە قاسملو لە گەری کرد بیّ! ئینجا چ بە ئێرەی بە تەحویل دابیّ چ بە ئێران! وە بە قەناعەتی من باوەڕ ناکەم مرد بیّ! چونکە ئاخر ئەوە چی کردیە؟! لۆ لۆ وای لیّ بکەن؟!!!

بەریّ! جارێکی لە بەیروت هاتەوە لە کن مام جەلالی بوو یەک مانگی لە کن هێرۆیە دانیشت. مام جەلال چووبوو دەرەوە لە سەر ئەوە گرتیان وە شێخ جەبارەکەش تەخسیری پیّ نەدەکرد(جەبار و ستار و نیهاد)، ئەوە ئەوهایە.... ئەوە بالێی گەرێن!

فەقەت ئەو پیاوە وەکوو رەوشی شەخسی جاریّ هەتا بلێی ئینسانێکی لە خۆبوردوو بوو، کوڕە جلکێکی جوانی لە بەر نەدەکرد، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو پارەمان هەبوو، لە حکومەت پارەمان وەردەگرت هەموو مانگیّ من و ئەو دەچووین پارەکەمان دێنا، ئەی ئێمە هەموو ترۆمبێلمان هەبوو، حیمایەمان هەبوو، خانیمان لە بۆ بەکریّ دەگیرا ئەو پیاوە نە ترۆمبێلی ویست، نە خانی! وەڵا لە ماڵێکی بوو لە ماڵی کابرایەکی ئەرمەنی لەو کەمپی سارا لە ژێرزەمینی دا هۆدەکی هەبوو ئەمن دەچوومە کنیی، تا رادەیک دوکتۆر مراد پێی دەگوت مەرموزە!

**عەلی:** کام دوکتۆر مراد؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئەو دوکتۆر مرادەی کە خەڵکی کرمانشان بوو کە فەوتاویشە، ئەودەم کە پێکەوە بوون دوکتۆر مراد دەیگوت: زەبیحی مەرموزە! مەرموزێکە چییە؟ برادەرانی خۆشمان وایان دەگوت، مەسەلەن زەبیحی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزب بوو لەبۆ برادەرانی خۆی و رەفیقی خۆی کە ئەندامی سەرکردایەتی حیزب بوون ماڵی پیّ نەزانن؟! پێیان نەدەزانی! ئەمن پێم دەزانی، نازانم کێی تر؟ ئەمن کەسم نەدی کە لە گەڵ خۆم لە ماڵی بیّ! دەچوو هەر جێگایەک (ئیمە جیبێکی وەکیل لەتیف قۆزەمان بوو خراب بوو) دەچوو کە پارەی دەبرد لە بۆ پێشمەرگەکانی کەلار، ئەمن دەچووم لە گەڵی، لە ئەمنی عام پارەکەمان وەردەگرت، جانتایەکی گەورە دینار، هەر ئەمن لە گەڵیی دەبووم وەی دەزانی یەک فەوجی عەسکەر لە گەڵە! مادام ئەمنی لە گەڵ دەبوو هیچ! جانتاکەمان هەر لەویّ هەڵدەگرت دەمانا ترۆمبێلکە سوار دەبووین دەهاتینەوە، دەچوە

کەلار و مەلاریش لە گەڵی دەچووم. لە ڕەوشت و معانی ئەو پیاوە تێکۆشەر بوو، کوردپەروەر بوو، ئەفکاری تایبەتی خۆی هەبوو لە گەڵ ئەوەش دا کە لای چەپی پێ خۆش بوو بەڵام هەموو چ شتی مەعەسکەری ئیشتراکی پێ شتی قۆڕ بوو.

**عەلی:** چۆنی چاو لە کوردایەتی دەکرد؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئا! کوردایەتی! مامۆستا زەبیحی، کوردایەتی وەکوو هەر کابرایەکی سوسیال دیمۆکرات دەینۆڕێ مەسەلەی کورد وە باوەڕیشی وا بوو نەک هەر مەسەلەی کورد، هەموو مەسەلەیەکی دونیا بە عەقلی ئینگلیس و بە پارەی ئەمریکا دەکرێ! حەتا لە سەر ئەوە حیلمی و وان رکیان لێ دەبۆوە! بەڵام ها ئەو پیاوە بۆ خۆی نەوعێ لێکدانەوەی هەبوو، یانی وەک پیاوێکی کلاسیک، مەسەلەن ئەوەی کە سەدام گوتی: "خەللی هەسە" (کە ئەتۆکاک شێخ لەتیف بۆت گێڕاوە) ئەوەی تەفسیر دەکا "خەلی یەسە" مانای چییە و چ نییە ؟! ئێمە هیچ حیسابێکی لەو قسانە ناکەین ئەو دەیکرد. کە دادەنیشتین تەحلیلاتی وەک پیاوێکی کەون بوو. پیاوێکی وریا و باخەبەر بوو بە چاوی خۆم دیتم فەرەنسی قسەی دەکرد لە گەڵ خەڵکی، عەرزت دەکەم ئینگلیسی دەزانی، عەرەبییشی دەزانی مەلایانە! عەرەبێکی قەواعیدی قسەی دەکرد، عەرزت دەکەم فارسیشی بۆ خۆتان دەزانن و تورکیشی دەزانی. حەزی بە سەفەری دەرەوە دەکرد بچێتە ئوروپا و مورروپا. لە خۆی و لە بەرگ و باخەلی خۆی و ماڵی خۆی زۆر سەخی تەبیعەت بوو، بەڵام بۆ ماڵی حیزب حەتا بڵێی رەزیل بوو. خەڵکی گەلێکی لێ عاجز دەبوون لە سەر ئەوە کە مەسەلەن ئێمە کە دەچووینە بەغدا بایە ئەوەندەی نەدەدا بە من و عەلی عەسکەری پێی بەڕێوە بچین.

لە ساڵی ۱۹٦٥ نۆرەیەک کە حکومەت دەهات مفاوەزە بکا لە گەڵ مەلا مستەفا، لە پێشدا جارێ زەبیحیان دیبۆوە، ناردیانە کن برادەران. ئەمن لە کەرکوک ـوختەفی بووم، هاتن پێیان گوتم کە مامۆستا عولەمایان دیت لە گەراج هاتە خوار لە ـرۆ ـبێل، چوو کەبابخانە نانی خوارد و دوایە رۆیشت. کوڕە گوتم مامۆستا عولەماتان ـیت ـەروا بە ئاشکرا؟ گوتیان: ئەری وەڵا! ئەی دەبوو باوەڕ نەکەم چون مامۆستا عولەما مەرکـ ـی حیزب بوو یانی مەکتەبی سیاسی بوو لە بەغدایە بە تاقی تەنیا بە ئاشکرا لە

کەرکووکێ ناسرایە، مودەتێک مەسئولی کەرکوک بوو، کوو ئەوە هاتییە؟!

چوومە بەغدایە، موجازەفەم کرد بزانم چۆنە؟!

گوتی چووم عەبدولڕەحمان بەزازم دیتییە و چووم بە برادەرانم گوتییە، جا هەر ئەوەش ئەساسێک بوو کە برادەران هەلاتن لە دۆلە ڕەقەوە و چوونە سلەیمانییێ و حیلمی چۆوە بەغدایە، عەلی عەسکەری هاتە کن من لە کەرکووکێ و مام جەلالیش هەر چوو بەغدایە. جا ئەوە ئەتۆ وەرە موختەفی ماڵ وێران کوو عەبدولڕەحمان بەزاز ئەتۆ دیتتەوە؟! کوو چووی؟! کوو هاتێوە؟! دوای ئەو فەترەش کە دەڵێم مەرکەزی حیزب بوو کاغەزی لە بۆ من ناردبوو کە دەڵێ: ئەگەر هاتی بە واسیتەی عەبدوڵڵا شلێر پەیوەندیم پێوە بگرە، سەیرە وەڵا... !

مەعنەویاتێکی بەرزی هەبوو، حەتا بە من گوتیان بچووە کەرکووک، زۆرم پێناخۆش بوو لە بەر خاتری زەبیحی چووم، چون کە من دەزانم لە کەرکوک چم بە سەر دێ، شارێکی وا خراپ، کەسی لێ ناناسم، خۆم پێ قوتار ناکرێ، لێرە تووشی پۆلیس بووم بە دەمانچە و شەڕە دەمانچە قوتار بووم! لە کەرکووک لە سایەی بەعسیان نەبا دەنا من نە دەژیام، کە دیقەتم دایە گوتم: مامۆستا عولەما ئەگەر ئێستا نەچم ئیشەکە لە سەرمان دا دەشکێ، وە کەی برادەران لەو دیوی هاتنەوە هێندە دەڵێن، ئەتۆ لە پێش هەموویان دەڵێی جا من چ بڵێم، مەلا عەبدوڵڵا لەوێ بوو ئەویش بە قسەی نەدەکردم، لە بۆیە من بە قسەت دەکەم ودەچمە کەرکووکێ!

**عەلی** : مامۆستا هەروەک دەزانن زەبیحی لە دوای کۆماری کوردستان (لە ساڵی ١٩٤٧) هات بۆ عێراق و هات بۆ کوردستان و سیتەک و... ئەو سەردەمەش و دوای ئەوەش کوردی ئێران وەک جەماعەتی حیزبی دێمۆکرات و... لێرە بوون، چۆن بوو کە زەبیحی زۆرتر تێکلاوی کوردی گەرمیان بوو یانی ئێوە؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا**: مامۆستا عولەما لە پێش هەموو کەس دا هاتە لای شێخ لەتیف بەرەحمەت بێ، دەستی پێکرد لەوێ ماوەیەکی زۆر لەوێ بوو حەتا سەیتەرەی لە سەر شێخ لەتیف هەبوو! بۆ خۆی قسەی لە بۆ من دەکرد، پاشان نازانم جێی پێ تەنگ بوو، لەتیفیش حکومەت لێی لە هەنجەت بوو، ناردییە کلییە (گوندێک هەیە لە لای

تاونجی) لای شێخ حەمە سالح، ئەو شێخ حەمە سالحە گەیاندیێ بەغدایە.

**عەلی :** وەک لاجیئی سیاسی وە یا وەک چی؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** نەخیر هەر بە... هاتە وێ حکومەت گۆیا یەعنی ئیقامەی بدەنێ. ئیقامەکەیان نەدایە بردیان بۆ ناسریە. لە ناسریە جەبە و عەبا و مەبای لە سەری نا هەڵات هاتەوە بەغدایە! لە بەغدایە گوتیان تەحویلی ئێران دراوە لە قەسری شیرین. لە قەسری شیرین کویخایەک یان موختارێک لە دەست پۆلیسان رزگاری دەکا دەچێتە تارانێ، لە وێندەرێ کوردێکی دیتبۆوە نایبە لە پارلمان، پێی گوتییە دەتوانی چارە سەری وەزعی من بکەی؟ پێی گوتێ نەخێر ناتوانم چارە سەرت بکەم. رێک گەڕابۆوە ماڵی ئەو موختارەی کە ئەو لە دەستی پۆلیسانی هێنابوو دەرێ.

**عەلی :** ئەوە ساڵی ٥٠کان بوو یا چی؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** ٥٠ رەنگە ٤٩ (زایینی) بێ. جا گوتی گەرامەوە ئەو ماڵە موختارەی قەسری شیرین، لەوێ ئەو رەوانەی بەغدای کردمەوە، ئینجا هات، کورە سەیرە ئەم پیاوە! چووە لای عەبدوڵلا بوو بە کاتیب...

**عەلی:** مەبەست کەواکبە؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** نا! نا! ئەو ئەحمەد کەواکبە مسەوەرە جا ئەو ئەحمەدە برادەری ئەو بوو، حەتا لێرە ئێمە بە تەکلیفی مامۆستا عولەما دەفتەر نفوسمان بۆ دەرکرد لە هەولێر کردمانە عێراقی، ئەویش و عەبدوڵلا شلێریش. عەرزت دەکەم ئەو عەبدوڵلایە، عەبدوڵلا شەریفە نادی "لیلێ"ی هەبوو یانی مەلهای هەبوو، باڕی هەبوو، زەبیحی کاتبی بوو، جێی باوەڕی بوو حیسابی لە بۆ رادەگرت، پاشان لەوێ چووە سوریە کن ماڵیی بەدرخانیەکان هەتا ٥٩ کە هاتەوە دەستی دا ئەو حیزبایەتییە لە گەڵ ئێمە.
ناڵێم لە هەموومان موتەفێقتر بوو فەقەت یەک یەک وەڵا چیش تاقمان لەوی بە قابیل تر و لێزانتریش نەبووین، لە تەنزیم باشی دەزانی، لە سیاسەتیش دەیزانی، فەقەت کلاسیکی بوو ئیستا ب ایە ئێرە کەس پێی رازی نەدەبوو بە تەحلیلات و شتی زەبیحی، عەرزت دەکەم مەلا مستە[illegible]اش زۆری خۆش دەویست لێرە، هەتا خیلافەکە نەبوو لە گەڵ مەلا مستەفا، مەلا مستەفا زەبیحی خۆش دەویست بۆ ئەوەیکە لە ئێران لە

کۆماری کوردستان لەوێ بوو. حەتا بۆ چی پێمان وت "عولەما" بەعەزە تەحلیلاتێک و شتێکی هەبوو لە لیژنەی مەرکەزی لە بیرم نەمایە حادیسەکە، وەڵاهی کاک برایم ئەحمەد ناویی لێ نابوو، گوتی کاکە عولەمایە، عولەما! عالمە هەمووشت دەزانێ و... ئەو عولەمایە لەوێرا هات.

**عەلی:** ئەو نازنێوە ماموستا برایم ئەحمەد پێی دابوو؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئەرێ وەڵا مامۆستا برایم ئەحمەد پێی وتبوو، جا ئەگەر دیتت لێشی بپرسە. بەڵێ کە ئەو فەترەیەش کە مەسئول بوو لە وەختی شۆڕشی ئەیلوول لە هەر کوێ با خەڵک داد بوو لە دەستی، زەبت و رەبتێکی هەبوو، عولەما دیکتاتۆرە، عولەما وایە... شان بە شانی ئەوەش ئەوەندە ئینسانێکی بەوەفا بوو ئەگەر کەسێ چی چاکی تێدابایە وای خۆش دەویست کە خۆشی دەویست ئیتر وەفای زەبیحی وەک کەسی دیکە نەبوو ئەو مەلا عەبدوڵڵا جوتیاران یان پێیان دەگوت مەلا عەولا گچکە، چون دوو مەلا عەبدوڵڵا هەبوو لە کەرکووک، کوڕێکی زۆر ئازا و چالاک بوو حیزبایەتی چاک دەکرد، ئەوەندەی خۆش دەویست ئەو پیاوە کە حەتا ئێستا لە کتێبەکەی و لە قامووسەکەی باسی کردییە! پیاوێکی ئاوا بەوەفا، بەرد و تەرازۆکەش هەر تێکۆشان بوو وشتی دیکە نەبوو، یانی تۆ بڵێی زەبیحی چاوی لە چی کابرایەک، کادرێکی حیزب بووبێ؟! شتی شەخسی؟! قەتعەن! ئیلا ئەوەی کە تێکۆشان و خەبات! ئەوها بوو هەر بیریشی لێ نەکردەوە کە رۆژێ ژن بێنێ وە یا خۆ ماڵ و منالی هەبێ وە حەتا پێشتریش گوتم حەتا حیمایەشی قەبوڵ نەدەکرد دەنا معاشی بوو و پارە و پوولیشمان هەبوو.

**عەلی:** مامۆستا وەک دەزانن زەبیحی باری سیاسی بوو، باری ئەدەبیشی هەبوو، تۆ پێتوایە زۆرتر سیاسی بوو یا ئەدیب؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** سیاسی بوو کاکە، ئەو وەک ئەدیب قابلیەتی ئەدیبی تێدابوو، بەڵام نەیویست و ئیستفادەی لێ نەکرد. لە غەیری رەدی کۆزمۆپۆلیتی شتێکی نەنووسی، ئێمە شتێکمان لێ نەدیت بنووسێ لە غەیری تەقاریری حیزب و قامووسەکە، ئا قامووسەکەش ئیشی لە گەڵ دەکرد دادەنیشتین لە ماڵێ، لە پڕ دەتدی قسەیەک دەکرا، ئەها! دیگوت چی؟ دەینووسی!

**عەلی:** کەی زۆرتر هێزی خستە سەر قامووسەکەی ؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** ئەو ساڵانی بەغدایە، ئاخری.

**عەلی:** کە گیرا؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** تا پێش گیرانی، چونکی کە هاتەوە لە حەپسخانە مامۆستا عولەما جانتایەکی دابوو بە حاجی گچگە، ٤٠٠٠ دیناری پارە تێدا بوو، ٤٠٠٠ دینارەکەیان لێ دزی، جانتاکەیان بۆ هێناوە، هاتە کن من گوتی ئاوایان لێ کردووم، چم نەمایە، چوومە زعفرانیە گوتم دەتان گوژم، وەڵاوەبیلاوتەلاهی لە سەر زەبیحی چما دەتان گوژم! زاوایەکیان هەبوو عەسکەر بوو، عەرەب بوو، نازانم چ بوو لە گەڵ ژنەکەی ناوی قەمەر بوو وەڵا هاتن بە رجا و تکا ٢٥٠٠ دیناریان دایە،١٥٠٠ی ئیستاش مایە و ئیستاش وەرقەی هەر لە لای منە، لە دوایی دا حاجی کە لە دەفتەرێکی منالانەدا هەمووی ئەوە کاغەزە بۆ من، باسی ئەوە دەکا کە زەبیحی ئەو قامووسەی کە ئیستا وا بە تەمایە تەبعی بکا هەمووی ئەمن فیشەکانم دروست کردیە، ئەمن وام کردیە و وام کردیە و... وێش دەچوو چون حاجی لە تەبع زۆر شتی دەزانی، هەموو جارێ لە زەمانی حیزبێتیدا مەتبەعەی دەستیان دروست دەکرد، دەیان هێنا، ئاسن و حروف و مروفیان لەحیمیان دەکرد و دەچنی و شتیان پێ تەبع دەکرد! حاجی وەک کوتەکی دەستی وابوو لە بەردەستی دا بوو.

**عەلی:** تۆ مەبەستت کاک محەمەدی شاپەسەندە؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** نەم دەزانی، یەکی قوتەکەیە!

**عەلی:** بەڵێ ئەوە خەڵکی سابلاغە و لە زەمانی کۆمار لە چاپخانە ئیشی دەکرد.

**مامۆستا عەبدوڵلا:** جا ئەوە ئاوا بوو، ئەو پیاوە بەوەفا بوو لە گەڵ ئەوەش کە ئاوایان لێ کردبوو هێشتا ئەگەر باست دەکرد قەڵس دەبوو! من بەحسم بۆ دەکرد دەمگوت ئەوە زەخت لێ کردنە و زوڵمە، نازانم خۆشی دەویستن.

**عەلی:** ساڵی ١٣٤٦ی لای خۆمان دەبێتە ١٩٦٧ی زایینی جم و جۆڵێک لە ناو کوردستانی ئێران و حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران پێک هات جەماعەتێک بە بێ رای ئەحمەد توفیق لە حیزب شەڕی چەکدارانەیان کرد وەک کاک سولەیمانی موعینی و

سمایلی شەریف زادە و مەلا ئاوارە و... مەلا مستەفاش دژایەتی دەکردن، زەبیحی لە سەر ئەوە بۆچوونی یان مەوقیفی چۆن بوو؟

**مامۆستا عەبدوڵلا**: کاکە ئەوەڵ جار هەموویان پێکەوە بوون، ئێمە رقمان لە هەموان دەبۆوە، سولەیمانی موعینی کە پێیان دەگوت فایق، عەبدوڵڵا ئیسحاقی کە پێیان دەگوت ئەحمەد تۆفیق ، ئەوەی کوژرا لە سولەیمانیە ناویی چ بوو؟ ئا قادر شەریف، دوایی فایق (سولەیمانی موعینی) هەڵویستی باش بوو، بەڵام زەبیحی ئەوانی تری خۆش نەدەویست، بەو دوایەش لە گەڵ هێمنەکەش لە ماری ئێمە دۆستایەتێکەیان نوێ کردەوە، دەنا حەتا ئەوانیشی خۆش نەدەویست، زۆر سەیرە دەیگوت بڵحن! جا خۆ ئەوەش هەیە ئێمە مەسیرمان یەکە کوردی ئێرە و ئەودیو هەمووی یەکە، وەڵا بە گلێیش ناڵێم، با گلێیش بێ ئەشەدوبیلا لە زەبیحی بەولاوە هیچیان لە گەڵ ئێمە ئاوا تێکلاو نەبوون، هەر چەندی ئێمە ئەوەندەمان خۆش دەویستن ئەوان لە گەڵمان تێکەڵاو نەبوون، ئەحمەد تۆفیق هەر بە راشکاوی دژی حیزبەکەی ئێمە بوو، پاشان لە بەغدا بوو یارمەتیشم دا کە گیرا چووشم بۆ لای، بەڵام فایدەی نەبوو.

**عەلی**: کوشتیان وە نەبوو؟

**مامۆستا عەبدوڵلا**: بەڵێ، ناظم گزار کوشتی، فەوتاندی.

مامۆستا زەبیحی لەو ئاخریانە لە گەڵ پەناهیان تێکەڵاوی دەکرد پاشان وازی لەویش هێنا ، پەناهیان هەبوو فارس بوو، تورک بوو هەر خەریکی زیندوو کردنەوەی شتی تورکی و ئێرانی و شتی ئاوا بوو. لە زەمانێکی رادیویەک هەبوو قسەی دەکرد دژی ئێران و مامۆستا عولەما دەچوو پێموایە بۆ خۆی قسەی نەدەکرد بەڵام شتی بۆ دەنووسین، ئا خاڵت دەست بە تاڵ نەبوو، ئەو موددەتەی لە بەغدایە بووین قەت دەست بە تاڵ نەبوو. هەر ئەو شتە سوڕ هێنەرە، ئەو پیاوە حەتا دەیانبردە جێگای زۆر سڕیی، کوڕە لە کوللییەی ئەمنی قەومی مەحازەرەی دەدا، شتی دەنووسی، دەهات مەحازەرەکەی نیشانی من دەدا جاری وا بوو دەمگوت مامۆستا عولەما ئەوەی لابە لێت دەکەونە شکەوە ئەوە بەعسین ئەمن دەیان ناسم!

ئەو جار وەختێک بەیانی ئادار بوو، ئێمە هەڵوەشاینەوە (لەشکرەکەمان). ئەو

ئێرانیانەی کە لە گەڵمان بوون بە ئیتیفاق لە گەڵ حکومەت گوتمان با مامۆستا زەبیحی بەو ئیعتبارەی کە ئێرانییە با ئەو مەسئولیان بێ. لە سەی سایقیان دانابوون هەموو سەری مانگان دەچوو پارەی دەدانێ و دەچوو سەری لێ دەدان. پاشان ئەو شێخ جەبارە کەران بابگاوە کە پاشان تۆبی لێی خوێند و دەی دەی، دەی دەی مشاغەبەی کرد و تا لە دەستیان دەرهێنا، دایانە دەست ئەو، ئەو بە جارێک هەموویانی دەر کردن، ئەو حامید بەگەیان هێنا لە سامرەیان دانا، هێندێکیان بردە رومادی، نازانم هێندێکیان کوشتن، ئەو جار کە ئەوەیان لێ هەستاندەوە دایانە شێخ جەبار، لە گەڵ ئەو پەناهیانە کەوت و لە گەڵ ئیزاعەکە و شتی وایان هەبوو هەتا ئاخر رۆژیش عەلاقەدار بوو لە گەڵیان بەڵام فەقەت هەر کورد بوو، هەر کوردایەتیشی دەکرد، بە حیسابی خۆی ئەوانەی فێر دەکرد بۆ کوردایەتی، ئاخر عەرزت ناکەم ئەو عالەمێکی سەیری بوو، ئەوانەی ئیستقرار دەکرد وفێری دەکردن لە بۆ کوردایەتی، هەر واشی کرد!

بە حیساب لێرە سیلاح و میلاحی لەوانە وەردەگرت دەیبرد بۆ عێزەدین و دوایی لە گەڵ مام جەلال خەریکی شتی دیکە دەبوو، هەر لەو شتەدا تێداچوو. جا بۆ ئێمە کە ئەو برادەرمان بوو، برادەری راستیمان بوو وە بۆ تۆش کە خاڵت بوو جێی شافەخر و شانازییە، ئەوەندە لاپەڕەی ژیانی ئەو پیاوە پاقژ بوو، لە کوردایەتی دا ئەوەندە بێگرد بوو هەر دەبێ شانازی پێوە بکەی، خەڵکی دیکە پیاوی خراپ و ناحەز رەنگە سەد شتی بڵێن، بەڵام وەڵاهی قەناعەتی ویجدانیم وایە، کە ئەو پیاوە لە کورد زیاتر هەر خزمەتکاری کورد بوو! رەنگە بە خراپ چووبێ وەکوو عەرزت دەکەم، دەڵێم ئەو پیاوە تەحلیلاتی کلاسیکی هەبوو ئی ئەو زەمانەی نەبوو حەتا نووسینیش، نووسینی دەتگوت مەلایە، مەلای مزگڤتییە! ئەو عەرەبیی لە کێ فێر ببوو! ؟ خوێند بووی لە لای فەقێیان؟

**عەلی:** زۆرتر هەر خۆی فێری ببوو، ئەو سەردەم لە مەکتەبیش وەک دروسی رەئیسی عەرەبیان دەخوێند.

**مامۆستا عەبدوڵلا:** من باوەڕم نەدەکرد کە فەرەنسی بزانێ تا هێمن، کچێکی فەرەنسی میوانی ئەو بوو! بۆ بەدبەختی کچی فەرەنسی هاتییە، میوانی ئەو کەلاکە بێ! ئاخرا ئەو کچە لە سۆربۆن دەیخوێند لە بەشی کوردی، ئەسمەرێک بوو، جا من نازانم

فەرەنسی ئەسمەریان هەیە؟

**عەلی:** بەڵێ هەیانە.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئەوە هاتنە ماڵی ئێمە دەعوەتمان کردن، هێمن و کچە و مامۆستا زەبیحی و ئەمن، یەکی دیکەمان لە گەڵ نەبوو، لە حەدیقە لێی دانیشتبووین وەڵاهی بە فەرەنسی قسەی لە گەڵ دەکرد لە گەڵ کچە، ئەو حەینە باوەڕم کرد کە فەرەنسی دەزانێ، بە فەرەنسی قسەی لە گەڵ دەکرد، زۆر ڕێک و پێک!

**عەلی:** خۆم لێم بیستووە بۆ نووسینی قامووس لە لاروسی فەرەنسی کەڵکی وەرگرتووە.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** پیاوەکە زیرەک بوو، مەسەلەن دەهات بەحسی ئەمواجی مەحمووله و سیمی لاستیقی و تەلەیفون و شتی وای دەکرد، مەسەلەن سایکرۆفۆن... تەلەیفونێک، نوعە سێرێکە... هەستی لێ راگری... بۆڵە بۆڵێک... وەکی گرامافۆنێکی قورمیشی کەم بوویێتەوە عوم... عوم... ئەوها قسەی دەکرد بۆی تەفسیر دەکردم و تێشی دەگەیشتم! کە ئەوە چۆن ئەوها ئەو دەنگە بار دەکردرێ و سوار دەکرێ و... ئەمواجی مەحمووله و... جا ئەو جیازە ئیستخباری دەکا و جۆی دەکاتەوە ئەو لاو ئەو لای لێ دەکاو... ئەوها قسەی دەکرد، کوڕە حەتا دەستی کیمیا و شتی واشی هەبوو، ئەمن دەرێم دوور نییە ئەو پیاوە خەریکی بەعزە تجاروبێک کە جاران باسیان دەکرد چۆن زێڕی دروست دەکەن، رەنگە ئەوانەشی کرد بێ! پیاوێکی خۆش و حەتا بڵێی ئەخلاق بەرز، بەوەفا و راست بێژ و دەست پاک بوو، کوردپەروەر و نیشتمان پەروەر و نیشتمان پەروەری چاک، بەڵام کاکە بە بڕای بە بڕای لە گەڵ برادەرانی ئەودیو ئینسجامی نەدەکرد.

**عەلی:** باشە ئەو نیزاعەی، هەر وەک جەنابیشت فەرمووت هەر بوویەتی لە گەڵ حیزبی دێمۆکرات لە کۆنەوە، لەو ئاخریانەش لە گەڵ قاسملو و جەماعەتەکەی، ئەوە لە چێوە سەرچاوەی دەگرت؟ ئایا لە کۆنەوە بوو، پەیوەندی بە زەمانی ژ . ک وە هەیە وەیان چی بوو؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئەو ئینسجامەی ئەو لە گەڵ ئێمەی کردبوو، ئەو پیاوە ئەوە نەبوو کە بڵێی لە گەڵ خەڵک ناژیی، ئینسجامێکی وای لە گەڵ ئێمە کردبوو هەر.

دەتگوت خەڵکی ئێرەیە! نازانم سەبەب چ بوو، ئەوەم لێ نەپرسیوە، خۆشی نەدەویستن!

**شێخ لەتیف:** وەڵاهی من بەش بە حاڵی خۆم زۆری لە گەڵ دانیشتووم، بە نیسبەت برادەرانی ئەودیو عەلاقاتی لە گەڵیان سارد بوو و خۆشی نەدەویستن و باسی دەکردن و دەیگوت ئی ئەوە نین کە بتوانن شتێک بۆ میللەتی کورد بکەن، زیاتریش ئەو خەریکی مەسەلەی قاموس و نووسین و خوێندن و مەسەلەی لۆغەوی و ئەو شتانە بوو، ئەوەش تەبیعی بوو زیندەگی کوردایەتیشی هەر لە گەڵ خۆمان بوو نەک برادەرانی ئەودیو، حەتا برادەری شەخسیشی نەبوو، لە گەڵ چەند کەسێکی کە دابڕابوون لە حیزبی دێمۆکرات وەک عەبدوڵڵا شلێر و مەجموعە خەڵکێکی تر عەلاقاتێکی هەبوو.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** لە گەڵ ئەویش لەو ئاخریانە تێکی دابوو.

**شێخ لەتیف:** مامۆستا عولەما وەک ئینسانێکی کوردپەروەر و نیشتمان پەروەر، ڕێک و پێک و ڕۆشنبیر وای بە باش دەزانی لە گەڵ ئەو برادەرانەی کەوا سەرکردایەتی پارتی دێمۆکراتی کوردستان بوون وەک مامۆستا برایم ئەحمەد و مام جەلال و ئەو مەجمووعانە بێت، ئەوەی بە باشتر دەزانی لە هەموو جێگایەک ئینسجامی لە گەڵیان هەبوو، گوێیان بۆ قسەکانی دەگرت و باوەڕیشیان زۆر پێی هەبوو، خاسەتن بە تحلیلاتی کە مامۆستا عەبدوڵڵا باسی کرد، پێیان دەگوت "عولەما" مەشهوور بوو.

ماوەیەکی زۆریش لە شار و لە ئیختیفا زۆر ناجیح بوو لە ئیش و کاری خۆی، کە هاتە دەریش لە ئیش و کاری پێشمەرگەدا تەداخولی دەکرد، مەسەلەن لە ئیش و کاری پێشمەرگەی ناوشار و....

لەوە زیاتریش عیلاقاتی لە گەڵ بنەماڵە گەورەکانی کورد زۆر بە قووەت بوو، مەسەلەن لە عێراق لە گەڵ ماڵی شێخ مەحموود عیلاقەی یەکجار بە قووەتی بوو، شەخسی شێخ مەحموود زۆری خۆش دەویست لە لای شێخ ژیا بوو، لە گەڵ شێخ لەتیفی کوڕی عیلاقەی یەکجار زۆر باش بوو، زۆر جار ئێمەی لە گەڵ خۆی دەبرد کە شێخ لەتیف نەخۆش دەکەوت، دەهاتە بەغدایە لە خەستەخانەی "ڕاهیبان" نوستبوو، ئەغلەبی ئێواران ئێمەی دەبرد لە گەڵ شێخ سوحبەتی یەکجار خۆشیان دەکرد. لە گەڵ شێخ لەتیفی ڕەحمەتی لە سیتەک ژیا بوو. لە گەڵ ئەو کوردە ئاوارانەی سوریە و... بەدرخانەکان عیلاقەی زۆر

باش بوو، باسی ئەو بنەماڵانەی سوریای زۆر بۆ دەکردین، پیاوێکی هەتا بڵێی ماقوڵ و خۆڵێوەشاوە، پیاوێکی بێ فڕ و فێڵ بوو، حەزی لە رەفیقایەتی پیاوی ساختەچی و درۆزن و شتی وا نەدەکرد، سیاسی ئەو زەمانە نەبوو، سیاسی وەقتێکی دی بوو، ئی پێشتر بوو.
جگە لەوەش ئەمن شتێکی دی مامۆستا عولەمام دێتەوە بیر: لە کۆنگرەی کەلاردا خەڵکێکی زۆری لێ بوو لە ساڵی ١٩٦٧، ئەو کاتە مەسئولی بادینان بوو، لە گەڵ مەجمووعە خەڵکێکی هاتە هەولێر، لێرە میوانی کاک ئەحمەد محەمەدەمین دزەیی بوو گوتی حەز دەکەم هەموومان پێکەوە بچین، ئێمەش جەماعەتی هەولێر لە گەڵی چووینە کەلار لە بەر زۆری خەڵکەکە تەبعەن کەلار دێیەکە و لادێیە و مقەڕاتی حیزبیش لەوێیە، دابەشیان کردین، ئەمن و مامۆستا عولەما و کاک ئەحمەد محەمەدەمین دزەیی وەبەر ماڵی عەلی سەلیم بەگ کەوتین کە پیاوێکی ناودار و موحتەرمی پارتیمان بوو ئەو ماوەیەی کۆنگەرە لەوێ بووین، لە ناو مۆئتەمەریش دا دەورێکی زۆری بە خاسەتن لە سەر مەسەلەی مەنهەج و نیزام و گۆڕین و... هەبوو ئارای زۆر ماقوڵی هەبوو، شتی تازەی تەرح دەکرد زۆر رێک و پێک یەعنی بەڕاستی سەرنجی خەڵکەکەی رادەکێشا و لە ئینتخاباتیشدا کابرایەکی خەڵکی لای ئێمە نەبوو بەڵام زۆربەی دەنگەکەی وەردەگرت.
مامۆستا عولەما ئەوها بوو وەکوو کوردێکی رۆشنبیر فەرقی بە کوردی عێراق و ئێران و سوریا و تورکیا نەدەکرد، بەڵام لە بەر ئەوەی کە بە ئاوارەیی لەوێوە هاتبوو ئەو وڵاتە، لێرە حاوابۆوە لە گەڵ ئەو برادەرانە رێک کەوتبوو، ئێرەی لە هەموو شوێنێک بە لاوە خۆشتر و پەسەندتر بوو.

**عەلی:** پێتوایە وەک بیری کوردایەتی، کوردستانی وەک یەک کوردستان چاو لێ دەکرد؟

**شێخ لەتیف:** بەڵێ! هەمووی بە یەک کوردستان چاو لێ دەکرد، لەو دوایانە بیری لەوە دەکردەوە کە بتوانێ شتێکیش لە ئێران دروست کا لە گەڵ خۆی و ئەو دۆست و برادەرانەی. هەرچەند لە بەغدایش ئەو مەوزوعاتەی زۆر لە گەڵ باس دەکردین، بەڵام واشی بیر دەکردەوە کە ئەوانەی وا رەفیقی ئەو بوون وا نەماون، ئەوانەی ئێستاش خۆیان بە نیشتمان پەروەر و گۆیا لە حیزبی دیمۆکرات و حیزبەکانی ترن، ئەویش کە وا بەوان

رازی نییە! بیری لەوە دەکردەوە کە وەکوو کوردێک، خوێندەوارێک و نووسەرێک بچێ لەوێ دانیشێ، حەول بدا لە ناحیەی نووسین و فکر شتێک بکا، ئەگەر لە موستقبەلیش خەڵکێکی پەیدا کرد تەشکیلی حیزبێکی سیاسی بدا.

**مامۆستا عەبدوڵلا:** ئێمەش هەر وامان پێخۆش بوو، داوای ئەوەمان لێ دەکرد. هەر کە خومەینی هاتەوە دەمگوت مامۆستا بچۆوە و شتێک دروست کە، بەڵکو ئێمەش رۆژێک بێین بۆ لات، هەر بەو حیسابە چووبۆوە کە چی دوای ئەوەش هاتەوە کاغەزی دەفتەری عێزەدینی پێبوو، پێم عەنتیکە بوو! زۆرم پێناخۆش بوو، خۆشی مورتاح نەبوو. مەسەلەن ئەمن پێم دەگوت ئێستا دەبێ عێزەدین کاغەزی جەنابتی پێبێ کەوا ئەو جێگای ئەعتباری تۆیە، نەک بە پێچەوانە! دەیبردە سەر غەرایی جەماعەتی قاسملو.

**عەلی:** مامۆستا ئێمە لە ئێران کاتی خۆی دەمان بیست کە مەلا مستەفا جائیزەی بۆ سەری زەبیحی تەعین کردووە، ئەوە راستە؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** کاکە ئەو پیاوە ئەوەڵ جار وەک عەرزم کردی مەلا مستەفا خۆشی دەویست و حورمەتی دەگرت کە تازە هاتبۆوە کە شۆڕشی ئەیلوولیش بوو. ئەو زەبیحی یە لە مەیدانی کوردایەتی مجاملە و شتی وای نەدەزانی و نەیبوو، یانی لە سەر هەڵوێستی راستی مەلا مستەفا رەقی لێ بۆوە و قسەشی دەکرد دەنا حەتا تا ساڵی ١٩٦٣ عەلاقەیان هەر باش بوو لە گەڵ مەلا مستەفای، ئەمن مەسەلەن پێمەوە دیت، ئەو مەسئولی کەرکووک بوو کە مفاوەزاتەکە دەرباز بوو ئەمن دوو خەریتە فیشەکم بوو کە فارس باوە بۆی ناردبووم زۆر شتێکی جوان بوو لە پشتم بوو، ئەودەمی مەلا مستەفا غەزەبی لە من گرتبوو لە سەرچیان بووین لوقمانیش لەوێ بوو، عومەر هاتبوو(ئەو کابرا زۆر وەرە) عومەر میران هەبوو... تفەنگێکی نوێی لە نێو ئەو جافەتێ پەیدا کرد بوو هەر بە بۆیاغی خۆیەوە، عومەر هاتە ئەوێندەرێ، وەڵا لوقمان لێی ئەستاند، لوقمانی مەلا مستەفا تەماحی لە فیشەکدانەکەی منیش کرد بوو، شێخ حوسێن گوتی پیاسێکی نەکەین کاک مەلا عەبدوڵلا، گوتم بەرێ وەڵا، گوتی ئەوە لوقمانی مەلا مستەفا حەز لەو فیشەکدانەی تۆ دەکا و داوای دەکا، گوتم وەڵا نای دەم! گوتی چۆن ئەوە عومەر تفەنگی خۆی داوەتێ، گوتم عومەر کەیفی خۆیەتی من حەقم چییە؟! گوتم دەزانی بۆ نایدەم؟ خۆ بە

بەلاش وەنالێم، گوتم ئەوەڵەن من مەبدەئییەن خۆم بە لایەقتر لە لوقمان دەزانم لە بۆ ئەو فیشەکدانە، ئەوە یەک، دوو- ئەگەر ئێستا حەسیب لێرە بوایەو لەوانەی دروست کردبایە، ئەوەم دەدایە و یەکی چاکترم لە بۆ خۆم دروست دەکرد، فەقەت کێ دەگاتە حەسیب، بە من ناکرێ و نایدەم! کە مامۆستا عولەما هاتە کۆیە لوقمان رایسپارد فیشەکدانی لۆ بێنێ، عەلاقەی باش بوو لە گەڵیا، لەو ئاخرە کە خیلافاتەکە بوو نەچوو بۆ لای و خۆی لە لای تەقدیم نەکرد و بلێ: "بەڵێ قوربان ئەز وا هەر لە گەڵ تۆمە" مەلا مستەفا چ لزوم نەبوو جائیزە تەعین بکا لە بۆ سەری زەبیحی! بەڵام چییە؟ ئەو پیاوە، پیاوێکی عالیجەناب بوو عیزەت نەفسێکی سەیری هەبوو لە مەیدانی خەبات و تێکۆشان دا چەکەرەی نەدەکرد، یەعنی نەچوو بۆ لای مەلا مستەفا بلێ قوربان لە خزمەت تۆ دام! مەلا مستەفا رەنگە وای لێ چاوەروان کردبێ وەک "هەژار" ی بکا، ئەویش وەک هەژاری نەدەکرد! منیش لێم نەبیستییە لە مەلا مستەفا هەزار رەحمەتی لێ بێ لێم نەبیستییە جوێنێکی دابێتە زەبیحی، جوێنی دەدا کاک برایم ئەحمەد، دەیدا جەلالی، بە عەلی عەبدوللای دەگوت "ژنک" ئەو ئەوانەی دەگوت بەڵام وەڵاهی نەم بیستییە بە زەبیحی بلێ، بۆ زەبیحی گوێم لێ نەبووە، ئەو رەقی لە هەموومان دەبۆوە، ئاخر ئێمە ئینشقاقمان نەکردبوو بە حیسابی ئەو؟!

**عەلی:** باشە مامۆستا، زەبیحی بە چ نێوێک لە عێراق مایەوە وەک لاجیئی سیاسی؟ وەک چی؟

**مامۆستا عەبدوللا:** ئەبەدەن ... وەڵا جنسییەکی هەبوو، ئەرێ کێ بۆی دروست کرد؟ خۆ ئێمە بۆمان دەر نەکرد؟

**شێخ لەتیف:** نەخێر خۆی بە واسیتەی خەڵکێکی ناسراوی خۆی، حەتا پاساپۆرتێکیشی دروست کرد بە ناوێکی دیکە.

**مامۆستا عەبدوللا:** جنسییەکە بە ناوی عبدالرحمن محمدامین بوو. قوربان حکومەتی عێراق عانەیەکی نەدەدایە. هەتا زەمانی حیزبایەتی بوو ئەوە حیزب بوو، پێش حیزبایەتیش ئیشی دەکرد، ئیش! ئەویش و هەژاریش کاسبیان دەکرد! لەو ئاخریانە منیش کە نەقلی بەغدا کرام، چوومە مەکتەبی سیاسی لێرە یارمەتی ٢٥ دیناریان دەدامێ کە

چوومە بەغدا ١٠٠ دیناریان دەدامێ، من وەرم دەگرت و ئەویش وەری دەگرت.

**عەلی:** پەیوەندی زەبیحی لە گەڵ حکومەتەکانی عێراق کە زۆرتریان دەبێتە حکومەتی بەعس چۆن بوو و تا چ رادەیەک پەیوەندی هەبوو؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** پەیوەندێکی وەک مونازلێک، وەک سیاسێک، وەک دۆستێک بوو.

**عەلی:** ئەندامیان بوو؟

**مامۆستا عەبدوڵلا:** نا! ئەندامی کێ بووبێ!؟ چی!؟ بەعسی بووبێ! لا! لا! لا!... زەبیحی گەلێک لەوە بەرزتر بوو ببێتە ئەندام و شتی وا، نەخێر عەرزت ناکەم کە محازەرە و شتیان پێ دەنووسی لە بۆ بچێتە کوللیەی ئەمنی قەومی کە بچێ محازەرەیان بداتێ، تەماشام دەکرد هێندێک شتی خراپ بوو، دەمگوت کاکە ئەوە نەزەرەیکی ترت لێ وەردەگرن، ئەوە بگۆڕە و... لەوانە داغی گرانم ئەو پیاوە ورد نەبوو، ئەو پیاوە بە حوسنی زەمێکی سەیر لە گەڵ ئەوانە ئیشی دەکرد، وەی دەزانی ئەوانە برادەرن! ئەمنیش دەمگوت مامۆستا ئەوانە برادەری ئێمە نینە! دوایە ئەتۆ دەبێ وریا بی لە خۆت و لزمان نەدەی!

**عەلی:** چونکو ئەگەر هاتەوە بو ئێران و لە کوردستان مەیدانی حیزبایەتی و شتی وا دەستی پێکرد و کۆمەڵێک لەو خەڵکانە لە بەغداوە هاتبوونەوە کوردستان و خەریکی حیزبایەتی بوون، زۆریان دعایەی ئەوە بۆ دەکرد کە بەعسیە و شتی وا....

**مامۆستا عەبدوڵلا:** درۆ دەکەن، ئەوانەی لە بەغدا بوون هەموویان معاش خۆری حکومەت بوون، حکومەت بەخێوی دەکردن، قاسملو مووەزەف بوو لە "وەزارتی تخطیط" نازانم چی تریشیان دەدایە؟!

زەبیحی جارێ حەتا حیزبەکەی مە لە گۆڕێ م (بالی مەکتەبی سیاسی پارتی) حالی، حالی مە بوو لەمە زیاتر چ عیلاقەی لە گەڵ کە ، تر نەبوو. پاشان کە حیزب تەواو بوو، نەما و بەیانی ١١ی ئادار بوو، خەڵک دەرێشتەوە و ئێمە ماینەوە لە بەغدایە. مامۆستا زەبیحی هەروەک عەرزم کردی پەیوەندییەکی هەبوو بە حکومەتەوە وەک پێشتر هەمان بوو، منیش هەمبوو، ئەو قابیلییەتی زیاتر بوو لە ئیشی ئیزاعە و سەبارەت بە ئێران و فارسی دەزانی، لە گەڵ ئەو پەناهیانە (کابرایەکی ژنرال بوو بە ناوی

موعارەزەی ئێران قسەی دەکرد) ئەو خەریکی ئیزاعە بوو، ئیزاعەیەک هەبوو بە ناوی موعارەزەی ئێرانی قسەی دەکرد بە فارسی. زەبیحی شتی بۆ دەنووسی، جار بە جارەش دەهاتن دەیان گرت محازەرە و شتی وای دەدانێ، ئاشکرا بوو نەیدەشاردەوە، منیش دەمزانی، بەڵام زەبیحی نە پیاوی وان بوو نە ئەندامی وان بوو، ئەندامی چی؟! ئەو سەگبابانە، ئەندامی چی ؟! نەوەڵا کاکی خۆم زەبیحی فێر بوو بە حیسابی خۆی لە ١٩٦٦وە ئێمە لە گەڵ حکومەت عەلاقەدار بووین گۆیا بە حیسابی خۆمان هەموو حیزبەکە بە کاک برایمیشەوە و بە جەلالیشەوە، گۆیا ئێمە حکومەتمان دەغەڵەتاند و یارمەتیمان لێ وەردەگرت، ئێمە مەلا مستەفا لابەرین و ئێمە خۆمان بێین جێی بگرینەوە، ئینجا حکومەت بێنینە ناوەندی عەردێوە، جا باوەڕ ناکەی برۆ بی پێوە! زەبیحیش عەینی لە سەر ئەو عیلاقەیە لە گەڵ ئەوان بوو.

**عەلی**: دژایەتی (لە ئەوەڵێش فەرمووت کە رەنگە تێداچوونی دەستی قاسملوی تێدا بێ) قاسملو و زەبیحی لە چێوە هات ؟

**مامۆستا عەبدوڵلا**: زەبیحی بە سورەتێکی عام لە گەڵ هەموو برادەرانی ئەو دیو یانی حیزب دێمۆکرات عەلاقەی باش نەبوو، قاسملوش کە سەری ئەو جەماعەتە بوو پێشتریش کە یەکتریان خۆش نەدەویست کە هاتنەوە سابڵاغیش پێشتر کە ساردی هەبوو وای لێهات پتر ساردی بێت. دوایی کە لە گەڵ عیزەدین حوسێنی تەعاونی کرد، لێرە سیلاح و فیشەک و میشەکی لێ بۆ وەردەگرت و بۆی دەبرد، قاسملو ئیتر بوو بە دوژمنی، یانی توند کردنەکە لە قاسملو بوو لە زەبیحی نەبوو. زەبیحی هەروەک خۆی بوو، دەیگوت ئەوانە بلحن و خۆشی نەدەویستن، بەڵام کە لە گەڵ عیزەدین تعاونی کرد و سیلاح و شتی بۆ وەرگرت لە عێراق، قاسملو کە هەر سەری بە عێراقەوە بوو دەترسا کە زەبیحی ئاخری ئەوی هەڵپەسێرێ، ئەویش حەولی دەدا زەبیحی هەڵپەسێرێ، جا هەر دووکیان عەینی شتیان دەکرد، هەر چەند پێموانییە زەبیحی ئەوەی کردبێ بەڵام قاسملو وا تێدەگەیشت، زەبیحی هەر چەند قەتعەن شتێکی وای نەگوت لە لای من هەر دەیگوت بلحن.

ئێمە دادەنیشتین دەمگوت وەڵاهی مامۆستا عولەما (ئاخر ئەمن ئەو پیاوەم

دیتییە، لە ١٩٥٩ قاسملو لە کەرکووک لە گەڵ مە بوون، دەهاتن بۆ مقەرێ، دەچوونە ماران ئەمن رام لە گەڵی نەبوو) ئەو پیاوە کە قسان دەکا عەینی ئاخوندەکان چ وەکوو کورد قسە ناکا! مامۆستا عولەماش دەیگوت ئەو پیاوە لە جێگایەکەوە هاتووە لە لای ورمێ لە لای دەرەی قاسملو و... لەهجەیان وایە، کوردن بەڵام لەهجەیان ئاوایە. دەمگوت باوەڕ ناکەم ئەو پیاوە سواری ئەو مەیدانە نییە، بە خوا لە من زیاتر تۆختر نەبوو لە نەقدی قاسملو! دەیگوت ئەمن چم لە گەڵی نییە، بەڵام قەناعەتم وا بوو کە قاسملو ئەو نەوعە پیاوە نییە، فەقەت خەڵک قسەی دەکرد، دەمگوت کاکە دیارە لەوی کەسی پێشکەوتووتریان نییە لە ئێران کە وابوو قەی ناکا! با هەر ئەو بێ! بەڵام تۆخکردنەوەکە لە قاسملووە بوو، ئەدی کو سیلاح و میلاحیان بردوو دوایی بە هەزار حال دایانەوە ئەوە چ بوو ؟! لۆ جەماعەتی دیمۆکرات سیلاحیان لە زەبیحی دەدزی؟!

بەڵام جا ئەو پیاوە داغی گرانم بە تەنیا هیچی پێنەدەکرا، ئەگەر خۆمانی لە گەڵ باینایە لە هەر جێگایە بایە زەبیحی عولەما بوو، بەڕاستی فەقەت بە تەنیا کە کەوتەوە ناو ئەو عێزەدین و مێزەدین و... هەموو شتێکی لە دەست چوو!

عەرزت ناکەم من دەمانچەم دابوویە خۆی، لە بۆ خۆی، چووبوو دەمانچەی لە قەڵادزێ لای هەمزە ئاغا بەجێ هێشتبوو، هەمزە ئاغا خواردی، ئێستاش کە ئێستایە خواردی چون کە هاتەوە دەمانچێکی چواردە خۆر و کامەرایەکم دابوویە، تۆ دەمانچەی خۆت لۆ لە قەڵادزێ دادەنێی؟! بە هەمزە ئاغاشم گوت بمدەوە، ئەو قسەی لە بۆ من کرد بوو بە خوا هەر نەیدامەوە. یانی تۆ ئەو دونیایە دەگەڕێی، هەموو وڵات چەکدارە لۆ دەمانچەی خۆت لە قەڵادزێ بە جێ دێڵی؟! دەڵێم داغی گرانم ئەو پیاوە ئی ئەوە نەبوو ئاوا بە تەنیا بەرەڵا بکرێ، ئەهوای لێ دێ! ئەمە بۆ خۆمان لە دەوری باینایە ئەوە هیچ وای لێ نەدەهات، یانی ئەو وردە نیش و وردەیەی خــــوارێ ئی ئەو نەبوو، دەبوو دانیشتبایە تەدبیرمان پێکردبایە، بەڵام ئەو بچێ تووشی ناو قوڕ و زیلاق و رێ و جادان و لە وڵاتێکی بێ حکومەت و چەکدار بێ، ئەوهای لێ دێت!

ئاخری کە فەوتاش ئەمن هەر شکم لە بەغدایە بوو، بابەکر دەیگوت لە کەرەج تازێیان لە بۆ داینایە لە ئێران مردییە، ئەمن دەمگوت تۆ بڵێی حکومەت پێی گوتبێ

بابەکر ئەو قسانە بڵاو کاتەوە؟! لە بۆ ئێمە نەزانین! چ باوەڕیش ناکەم!

**عەلی:** وەک بیرەوریێکی خۆش لە ئاخردا چتان هەیە، تکایە باسی بکەن.

**شێخ لەتیف:** وەڵا ئاخرجار لە بەغدایە دانیشتنی خۆش خۆشمان بۆ کرد بە مناسبەتی ئەوە کە دەڕواتەوە ئێران. شەوێک لە ماڵی بابەکر ئاغای پشدەری بوو، شەوێک لە ماڵی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا، شەوێک لە ماڵی عەونی یوسفی ڕەحمەتی کە ئەغلەبیان نەماون، خوا عافویان کا، شەوێکی لە لای کاک کەماڵ موفتی بوو کە هاتیشەوە ئێرە (هەولێر) چەند شەوێک لێرە بوو.

بەڵام ئەوەی کە قسەی دەکرد و مەلاحیزەم دەکرد ئەوە بوو کە هەستم دەکرد زۆری پێناخۆشە کە دەڕواتەوە. زۆر بێ زەوق و دڵتەنگ بوو کە دەڕواتەوە و ئێمە بە جێ دێڵێ. یانی گەڕانەوەکەی پێخۆش نەبوو، قەناعەتی منیش وای تەسەور دەکرد کە ڕەفیقێکی ئەوتۆی نییە وە ئەو خەڵکەی کە هاتبوونە مەیدانیش یانی بەڕاستی هەر جارێ کە لە گەڵ ئێمە قسەی دەکرد باوەڕی بەو خەڵکە نەبوو کە حوکمی ئێران دەکەن، دەیگوت ئی ئەوە نین کە بتوانن لە گەڵ میللەتی کورد بگەنە ئەنجام و خێرێکیان بۆ کورد بێ.

**مامۆستا عەبدوڵڵا**: شەوێکی ئەمن و ئەو عەزیز عەقراوییە دانیشتبووین لە ماری ئێمە، عەزیز عەقراوی جا ئێمە هەر فشەمان پێدەکرد، ئێمە فێرین ئەمن و کاکە لەتیف ئەگەر بمان هەوێ سەری یەکێکی بنێین، ئوسلووبی خۆمان هەیە، دەمگوت مامۆستا زەبیحی دەزانی خاڵە عەزیز دڵداری دەکا، گوتی دڵداریی چۆن؟! خاڵە عەزیز گوتی: ئەرێ وەڵا ئەمن دەبمە فەلە، روحەکەم فەلەیە، ئەمن دەبمە فەلە...

مامۆستا زەبیحی گوتی: ئەمن دەترسێم دڵدارێکەی عەزیز وەکو دڵدارێکەی فەقێکەی مەهاباد بێ، گوتی : ئەوە فەقێیەک لە سابلاغ دڵی بە کچێکەوە دەبێ، کچێکی سابلاغی، لە خولای دەوێ، بە حەسرەتەوە دەبێ بە ئاواتەوەیە رۆژێک لە رۆژان ئەو کچەی دەست کەوێ لە جێیەکی دوو قسەی لە گەڵ بکا! گوتی تەقە رۆژێکی فەقێ بە ناو باغچاندا دەڕوا (جا ئێمە سابلاغمان نەدییە، نازانم سابلاغ باغچە و ماغچەی کوی هەیە؟) گوتی دەگاتە کچەی ئەوە کولێ دەکا، ژن کە کولێ بکەن هەر مەلافەیەکیان پێوەیە، تەقریبەن رووت و قووت! دەیبینێ دەرێ ئەی فلان کەس ئەوە لێرەی؟! کچەکە

دەرێ ئەرێ وەڵا ئەوە لێرەم - دەی ئەوە چ دەکەی؟ دەرێ: ئەوە کولێ دەکەم - فەقێکەش لە باتی فورسەتە قسان بکا یا شتێک بکا دەرێ: دەبشۆ بشۆ و راست دەڕوا! ئەو مەعنا لە یەک لا یەعنی سەگ ژەنی پێدەڵێن، جا پێمدەگوت بە خاڵە عەزیز، ئەو پێیوابوو ئەوە رێک دڵدارییە! ئەوە لە مەتار و لە هەموو جێگایەک دەیگوت: بشۆ بشۆ دەکەم، خاڵە ئەوە ئەمن وام و وام! دەمگوت وەڵاهی خاڵە عەزیز بشۆ بشۆکەی مامۆستا زەبیحی یە! دەمگوت سەگ ژەنی، سەگ ژەنی! لە سەر دێڵە بەبای گۆڵە سەگ خڕ دەبنەوە یەک بە تەنیا لە دوورەوە ناوێرێ بچێتە پێش، لە دوورەوە حینکان داوێ، جا ئەوە من و بابەکر شێن دەبووینەوە! (پێکەنین) جا زۆر جار بۆ مامۆستا زەبیحیم دەگێڕاوە دەمگوت تۆ دەزانی ئەوە عەزیز عەقراوی مەسەلەکەی تۆی بە دڵداری تەواو تێگەیوە! دەیگوت ئاخر کەرە!

**عەلی:** زۆر زۆر سپاستان دەکەم، پێموایە ئیشەکی زۆر باش بوو بۆ بیرەوەری لە مامۆستا زەبیحی، ئێوە وەک دۆست و رەفیق ئەو وەختەتان بۆ تەرخان کردم.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** وەڵاهی ئێمە لە دۆست و رەفیق زیاتر بووین، ئێمە وەکوو برا بووین، ئەو برای گەورە و ئێمەش برای گچکە بووین، بە تایبەتی ئێمە ئەو تەشکیلاتەی ئەو ئاخرێ هەمان بوو "حەرەکەتی تەقەدوومی ئەکراد" ئەو پیاوە وەک ئەندامێکی قیادی بۆ ئێمە وابوو، بەڵام ئێمە ئەوەندە ئەو پیاوەمان لە لا موقەدەس بوو، ئەوە نەبوو کە بڵێین ئەوە مامۆستا کۆبوونەوە هەیە! بۆ خۆی دەهات و خۆی دەرۆیشت، دوایی "حەرەکەتی تەقەدوومی ئەکراد" ئەو گوتی ناوتان با ئەوە بێ.

باوەڕ دەکەم ئەگەر ئەو پیاوە نەهاتبایە ئەودیو هەر لە گەڵ خۆمان ئیشی دەکرد.

**عەلی:** مامۆستا تۆ وەک بزانی کە ئەو ئاخریانە زۆری لە گەڵ بووی، باقی قامووس و نووسەراوەکانی دەبێ لە کوێ بێ؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** لای ئەمنە، نەک هەر پێموایە هەر لای ئەمنە و داوام لێکردن و وەعدیان دامێ گوتیان دەتدەینەوە، دوایی نەیان داوە!

**عەلی:** پێتوایە دەستمان دەکەوێتەوە؟

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** بە خوا ئەگەر عەلاقە باش بێت لە گەڵ ئەوانە (حکومەتی کورد و پارلمان) ئا، ئەوان ئەگەر لە گەڵیان پێک بێن من هەر خۆم وەری

دەگرمەوە، جەماعەتی کۆڕی زانیاری زۆریان داوا لە من کرد، ئەمنیش هەموو جارێ پێم دەگوتن، دەیان گوت : ئەی اهلا و سهلا، دەلەل و ... لە کن فلان کەسە و با فلان کەس بێ و دوایەش هیچ و لە بیر خۆیان دەبردەوە، کتێبیشی زۆر بوو، زۆر سەیرە نازانم ئەو کتێبانە چ بوون؟! موحەقەق ئاوەستاشی هەبوو چوون هەر دەهات دەیگوت ئاوەستا ئاوایە و ئاوای گوتووە، لەهجەیان ئاوا بوو، قسەیان ئاوا بوو، دەنگیان ئاوا بوو... یانی لۆغاتی ئاوەستایی نازانم دەیزانی یان نا؟ پیاوێکی بە حەز بوو، سەر ئامەد بوو، لە مەیدانی کوردایەتی، لە پێشمەرگایەتیش دەتگوت ئەو پیاوە چەند ساڵە پێشمەرگەی مەیدانە! مەسەلەن کەم مەسئولم دیتییە ئی خۆمان کە حیسابی فیشەک لە گەڵ پێشمەرگە بکا، ئەو حیسابی فیشەکی لە گەڵ پێشمەرگە دەکرد، حەتا جارێکی ئەمن چوومە دهۆکێ، ئەو مەسئولی دهۆک بوو، من سەرم لێ دەدا لە گەڵ کاک لەتیف دەچووم، لە گەڵمان دەهاتە ئێرە، قسەی بۆ کردم باسی کابرایەکی بۆ دەگێرامەوە بە پێکەنین دەیگوت چووە هەموو فیشەکەکانی خۆی تەقاندییە، فیشەکدانەکەی پێبوو وەک کەوڵە کۆن لە پێش منی داناوە، گوتوومە یەک فیشەکت نادەمێ، نەیدابوویە، تا نەقل بوو ئەمن چوومە جێگای فیشەکم پێدا، کابرا تفەنگی پێبوو بێ فیشەک! جا ئەوە هەر پێشمەرگەی مەیدانیی حیسابی شتی وا دەکا !

**عەلی :** زۆرت سپاس دەکەم، هیوادارم ئەگەر لە داهاتووش شتی تازەت بە نەزەر هات و وەبیرت هاتەوە لە بۆمی بنووسی.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** سەر چاوان جا لە بەرگی سێی کتێبەکەی خۆمدا زۆری باسی ئەو تێدا دەبێ، تەبعەن فکریش دەکەمەوە، دەیگووشم هەر چی بوو لە کتێبەکە دەینووسم و لە بو تۆشی دەنووسم .

**عەلی:** مامۆستا، کاک شێخ لەتیف، زۆر زۆر دیسان سپاستان دەکەم کە ئەو هەلەتان بۆ رەخساندم.

**کاک شێخ لەتیف:** ئێمەش زۆر زۆر سپاسی تۆ دەکەین، چەند رەسمێکیش هەیە کە پێشکەشی دەکەم، هیوادارین ئێوەش سەرکەوتوو بن لە پرۆژەکەتاندا.

**مامۆستا عەبدوڵڵا:** ئێمەش سپاسی تۆ دەکەین کە هەلت بۆ رەخساندین بیر

لەو برایەمان بکەینەوە و گەلیک قسەمان لە بیر چووبۆوە کە تۆ وەبیرت هێنایەنەوە.

# وتوویژ لە گەڵ کاک حەمەدەمین سیراجی

١٩٩٥/٣/١١

**عەلی:** تکایە بفەرموون لە کەیەوە نێوی مامۆستا زەبیحیتان بیستووە و ئەوەڵجار لە کوێتان دیوە؟

**کاک حەمەدەمین:** بەداخەوە ئەمن نێوی مامۆستام کاتێک بیست کە مامۆستا خۆی بەرەو کوردستانی گەرمێن و لەوێش را بەرەو مەنتەقەی جنوب ئاوارە ببوو. زۆربەی بیرەوەرییەکانی مامۆستا و بانگاوازی لە زمان ئەو کەسانە بووە کە لە گەڵ مامۆستا تێکۆشانی خۆیان درێژە پێداوە و لە ڕیزی کۆمەڵەی ژ . ک و دوایەش حیزبی دێموکراتی کوردستان دا بوون. بێجگە لە بیرەوەری ئەوانە کە وەک سەرچاوەیەک دەتوانم بە بەڵگە بیانهێنمەوە هێندێک نامە بە خەتی خۆشی کە زەمانێک لە تەورێز وەکوو بەرپرسی چاپەمەنی ژ . ک و زەمانێکیش وەکوو بەرپرسی پەیوەندی لە گەڵ مەسئولەکانی روسی بووە. لە رووی ئەوانەوە دەتوانین شەخسیەتی مامۆستا باس بکەین، بە هەڵسەنگاندنی ئەو شتانەی کە لە رۆژنامەی کوردستان و لە چاپەمەنیەکانی سەردەمی کۆماردا نووسراون و هەروەها ئەوانەی لە پێش کۆماریشدا نووسراون وەک نیشتمان رۆژنامەی ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ . ک دەکرێ بڵێین مامۆستا یەکێک لەو مێشکە موتەفیکرانە بووە کە لە جوڵانەوەی کورد لە کوردستانی ئێراندا تێکۆشاوە و نەخشێکی بەرچاوی هەبووە. زۆربەی ئەوانەی کە لە سەر کۆمار و بەر لە کۆماریان نووسیوە ئەگەر مامۆستایان لە ریزی یەکەمدا نەنووسیبێ حەتمەن وەک نەفەری دووهەمی ژ . ک ناویان بردووە. دیارە ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر بارودۆخی ئەووەختە کە کۆمەڵی کوردستان تێیدابووە بە تایبەت شاری مەهاباد. ئەگەر سەرنجی ئەندامانی بەرێوەبەری کۆمەڵەی ژ . ک بدەین بۆمان دەردەکەوێ کە لە مەجموعەیەک گەنجی رووناکبیری شارستانی کە پتر یەکتریان ناسیوە و پەیوەندیان لە گەڵ یەکتری بووە، بنج و بناوانی کۆمەڵەی ژ . ک لە وانە پێک هاتووە و لە نێو

ئەوانەشدا یەکێک لە وانەی کە سەتحی خوێندەواری زیاتر بووە مامۆستا بووە.

بە بڕوای من مەسئەلەی هەستی کوردایەتی مامۆستا بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی ژ . ک دەبێ بیگەڕێنینەوە بۆ ئەو بزوتنەوە فکرییەی کە لە کوردستانی عێراقدا بووە و ئەو ئیرتباتە فکری و ئامووشۆیە کە لە بەینی کوردستانی عێراق و ئێراندا بووە. چاپەمەنی کوردستانی عێراق بۆ ئێران هاتووە، کتێب هاتووە، بیرەوەری هاتووە، ڕاپەڕینی شێخ مەحموود تێکشکاوە و ڕاپەڕینەکانی دیکە لە شوێنی جۆربەجۆری دیکەی کوردستان بووە، ئەوانە تەئسیریان کردووەتە سەر مێشکی ڕووناکبیرەکانی کورد و لە مەهاباد و ئەوانە بەرەبەرە دە فکری پێکهێنانی سازمانێکی سیاسی دابوون. مامۆستا بۆ خۆی لە نووسراوەکانیدا کە بۆ ڕوسەکانی ناردووە و ئەمن خوێندوومنەوە، لە نامەکانی خۆیدا پێکهاتنی کۆمەڵەی ژ . ک بە پێچەوانەی تەواوی ئەو تاریخانەی کە تا ئێستا باس کراون بەر لە شەهریوەری ١٣٢٠ دادەنێ. دەڵێ هەر لە زەمانی ڕەزا شایدا بنج و بناوانی ڕێکخراوەیەکی سیاسی لە مێشکی ئێمە دا پەرەی ستاند، لێک کۆدەبووینەوە و ئاڵوگۆری فکریمان دەکرد.

دەڵێ یەک دوو جار ئەندامانی بزوتنەوەی کورد لە عێراق دەهاتن بۆ تەماس بۆ کوردستانی ئێران بە شکلی قاچاغچی و ئەوانە، یەک لە وانە کە جارێک هاتبوو پیاوی مخابراتی عێراق بووە، پاش ئەوەی کە هاتووە لە گەڵ ڕووناکبیرانی لای خۆمان تەماسی گرتووە و گەڕاوەتەوە چووە ساف و خالیس گوزاریشی داوە بە حکومەتی عێراق! ئەو وەختیش کە لە سالی ١٩٣٧ بڵێین پەیمانی سەعدئاباد لە بەینی ئەو وڵاتانەدا ئیمزا کراوە یەکێک لە مادەکانی پەیمانی سەعدئاباد هاوکاری بۆ سەرکوت کردنی بزوتنەوەی کورد بووە کە ئەوە شمولی ڕاونان و گرتن و ئازاردانی ئەو کوردانە بووە کە لە فکری کاری سیاسیدا بوون.

بە گوێرەی نوسراوەی خودی مامۆستای لە سالانی ١٣١٧و ١٣١٨ و ١٣١٩ ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی کە خەریکی هاتووچۆی عێراق بوون یا ئیحتمالی وەیان لێ داون کە فکری سیاسیان هەیە یا سەرۆک عەشایر و ئەوانە کە فکری ئازادیخوازییان لە مێشکی دا بووە، دەڵێ ئەوانە هەموو گیران و دوور خرانەوە و بە تایبەتی قاچاغچێکان

کە هاتووچۆی گەرمێنیان دەکرد.

مامۆستا دەڵێ ئێمە بۆ ماوەیەکی کڕ بووین و خۆمان مات کرد هەتا ئەو مەوجی ترس و خۆفە رادەبڕێ. دەڵێ بەڵام دیسانەکانە وردەوردە کە هەستمان دەکرد رژێمی رەزا شای لە حالی رووخاندنێ دایە دیسان چاو پێکەوتن و دیدار و تەماسی دوو بە دوو، سێ بەسێ تەشکیلی پەیدا کرد تا رووخاندنی رەزاشا. دەڵێ دوای روخاندنی رەزا شای ئیدی ئێمە تێکۆشانی نەهێنی کۆمەڵەی ژ . ک مان پەرە پێدا و زۆرترمان کرد بەڵام تێکۆشینەکە هەر بە شکلی نەهێنی بوو. وای لێهات کە لە مەنتقەی شاری تێپەری و دێهاتێکی زۆری تەنێوە. ئەو نامەیەی کە مامۆستا لە سالی ١٣٢٢-١٣٢٣ بۆ مەسئولینی روسی نووسیوە بۆ ئاتاکیشۆفی لە تەورێزێ، لە جوابی وان کە داوایان لێ کردووە ئیتلاعات بدا بە روسەکان لە سەر کۆمەڵەی ژ . ک، مامۆستا باسی تەشکیلاتی کۆمەڵەی ژ . ک دەکات لە مەهاباد کە کێمان هەیە و دەتوانن ئێوە وەک نموونە حیسابی لە سەر بکەن، لە بۆکان کێمان هەیە، لە سلەیمانی کێمان هەیە، لە سنە کێمان هەیە، لە کرمانشان کێمان هەیە. یەعنی تەشکیلاتێکی بەرین کە کۆمەڵەی ژ . ک ئەو وەختی سازی کردووە! مامۆستا وەکو ئینسانێکی مەسئول و ئاگا لە سەر بەدەنەی کۆمەڵەی ژ . ک نەزەر دەدات و نێو مەعەرەفی دەکا بە مەسئولینی روسی[1]. مامۆستا دیارە بۆ پێکهێنانی ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ . ک کە بڵێین نیشتمان بووە دەوری سەرەکی هەبووە، دیارە بە پەسەندی زۆربەی پێکهێنەرانی کۆمەڵەی ژ . ک بووە کە دوایە میرحاجیش هاتووە لە گەڵیان دانیشتووە و بریاری ئورگانیان داوە.

- **عەلی:** دوایە لە گەڵیان دانیشتووە یا هەر لە هەوەڵەوە لە گەڵیان بووە؟

**کاک حەمەدەمین:** ئەمن وا فکر دەکەمەوە کە میرحاجیش و ئەسلەن بزوتنەوەی کورد ئیرتباتی ئۆرگانیکی بووە لە گەڵ کوردستانی گەرمێن و ئەمن لەو بڕوایە دام ئەسلەن

---

١- دوای وتووێژ کردن لە گەڵ کاک حەمەدەمین زۆرم حەولدا ئەو نامە و بەڵگانەی کە زەبیحی نووسیوێتی بۆ کاربەدەستانی سۆڤیەتی وەدەستیان خەم، سەرنەکەوتم. پاش بەینێکی بیستم بەشێک لەو نامانە کە بە ئازەری لە لایان زەبیحی یەوە بۆ کاربەدەستانی سۆڤیەتی نووسراوە، کاتی خۆی لە باکۆ وەدەست رەحمەتی کاک رەحیمی قازی کەوتووە و لە کتێبە دەستنوسەکەی خۆی لە سەر رووداوەکانی سەردەمی کۆمار ئاماژەی بەو بەڵگانە کردووە و تەنانەت کۆپیی ئەو بەڵگانەی بۆ کەلک لێ وەرگرتن داوە بە چەند خوێندکاری کورد. لە ئاخر و ئۆخری تەواو بوونی ئەو کتێبە دا بووم کە بە خۆشیەوە لە لایان گۆڤاری "هاوار" ئەو نامە و بەڵگانە بلاو بوونەوە و کەوتە دەست خوێنەرەوەی کورد. لە گەڵ سپاسم بۆ ئەو گۆڤارە، ئەوە لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا چاپیان دەکەمەوە.

کۆمەڵەی ژ.ک کلکەی بزوتنەوەی فکری لە کوردستانی عێراق و وەک بەشێک لە وی بووە بەڵام بارودۆخ لە کوردستانی ئێران جۆرێکی دیکە بووە، لە ئێرانێ لە بارتر بووە کە رەزاشا رووخاوە و ئەو رێژیە هەرەسی هێناوە و ئەو دیکتاتۆرە نەماوە، لە ئێرانێ پتر هەڵتۆقیوەتەوە هەتا لە عێراقێ. وای لێهاتووە کوردستانی ئێرانێ بووەتە پەنا بۆ کوردەکانی عێراقێ. خودی مامۆستا برایم ئەحمەد لە گەڵ ئەو هەمووە گێرە و کێشەی کە لە کوردستانی عێراقێ بووە و بوونی سازمانە جۆربەجۆرەکانی چەپ و مامناوەندی و ناسیونالیستی ئەو ئیرتباتی لە گەڵ کۆمەڵەی ژ . ک بووە.

**عەلی:** ئایا ئەندامی کۆمەڵەی ژ . ک بووە؟

**کاک حەمەدەمین:** بەڵێ! مامۆستا برایم ئەحمەد ئەندامی کۆمەڵەی ژ . ک بووە و زۆرێک لەو شەخسیەتانی دیکە وەک عەبدوڵڵای کانی مارانی، عوسمان دانیشی رەحمەتی کە خاڵت نێوی دەبا لە سلەیمانی لە کۆمەڵەی ژ . ک دابوون.

مامۆستا عولەما یا بڵێین مامۆستا زەبیحی لە ساڵی ١٣٢١ یا ١٣٢٢ کە دەچێتە تەورێزێ وەکوو بەرپرسی چاپەمەنی کۆمەڵە تێکۆشانی خۆی لەوێ درێژە پێدەدات، ئەو ژومارانەی نیشتمان کە دەرچوون مقالاتی مامۆستای تێدایە، خوێندنەوەی وانە تۆفۆقی فکری مامۆستا دەگەیێنێ.

دیارە سەردەمێک بوو هێندێک مقالاتی کە مامۆستا نووسیوێتی بە گوێرەی ئێحساساتی ئەو وەختیمان، بە گوێرەی لێکدانەوەی خۆمان پێمان وابوو کە مامۆستا بە لای راستیدا لێداوە. بەڵام گوزەشتی زەمان دەری خست کە نەخێر مامۆستا سیاسیانەتر بەرخووردی کردووە و بە تەعەسوب نەبووە لەو مەسەلەیەدا و ویستوویەتی بەراستی دۆست بۆ کورد پەیدا بکا لە کاتێکدا کە نیزیکترین رابیتەی لە گەڵ کۆنسولگەری روسی هەبووە لە تەورێز بەڵام ئەو دۆستایەتیی بە قیمەتی دوژمنایەتی لە گەڵ بریتانیا تەواو نەکردووە! بەڵکو مەقالەی نووسیوە لە تەئیدی بریتانیا، دەوری دێمۆکراسی بریتانیا، چۆن دەتوانێ ببێتە دۆست بۆ میللەتی کورد. مامۆستا ویستوویەتی دۆست بۆ کورد پەیدا بکات بە بڕوای من.

مامۆستا درێژەی بە تێکۆشانی داوە تا وردەوردە کاری کۆمەڵەی بە تەواوی

گرتوویەتی لە کوردستاندا دوایە مەسئەلەی گۆڕینی ناو و شکلی تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.ک بە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان هاتووەتە گۆڕێ. چەندە مامۆستا موافێق بووە یا موخالیف ئەمن ناتوانم ئێستا نەزەر بدەم چون ئیتلاعاتێکی وام نییە بەڵام ئەوە کە مامۆستا لە بافتی حکومەتی کوردستاندا و لە کابینەی کە لە حکومەتی کوردستاندا پێک هات ئەو نەقشەی کە دەبوو بیبێ نەی بوو ئەوە بۆ خۆی دیاردەیەکە کە مامۆستا بەو جوورەی فکر نەکردووەتەوە یا بەوجوورە تەسەروفاتی نەکردووە کە دڵخوازی زۆریەی هەڵسوڕێنەرانی کۆماری کوردستان یا حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بووە. کەسێکی کە لە باری ژومارەی ئەندامەتی لە کۆمەڵەی ژ . ک نەفەری دووهەم بووە و دەتوانین بڵێین فکری کۆمەڵەی ژ . ک بووە، چون فروهەر کە نەفەری یەکەم بووە بەڕاستی فروهەر لە زیندان بڕێک فکری کراوە و نووسین و قەڵەم و ئەوەی پەیدا کرد، دەنا هەر مامۆستا بوو کە دەینووسی و نەزەری دەدا و بەولاوئەولای شتی دەنارد. کەسێکی ئاوا دوایە لە حیزبی دێمۆکراتدا و لە حکومەتی کوردستاندا دەورێکی بەرچاوی نەبێ ئەوە بۆ خۆی نیشان دەدا کە ئەو ئاڵوگۆڕە دڵخوازی وی نەبووە یا لانی کەم بڵێین ئەوانەی کە ئەو ئاڵوگۆڕەیان پێکهێناوە ئەویان دڵخواز نەبووە! بەهەرحاڵ ئەوەی کە دەگێڕنەوە مامۆستا لە گەڵ هەینەتێک دەگەڵ قاسمی قادری کە ئەویش یەکێک لە پێکهێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک بووە و هەروەها دەگەڵ دڵشادی رەسولی و ئەوانە بۆ کارێکی رێکخراوەیی بۆ پەیوەندی لە گەڵ هێندێک لە کوردەکانی سەروو دەچن، جا ئایا ئەو پەیوەندییە ئیرتباتی دەگەڵ کۆبوونەوەی سێ سنور بووە یا هەر بۆ دیتنی جەلالێکان و میلانێکان و هەرکێکان و ئەوانە بووە نازانم! ئەو کاتەیە کە مامۆستا دەگیرێ و بۆ ماوەیەک لە تارانێ رادەگیرێ و کە بەردانیشی بە هۆی فشاری ئەو هێزانە بوو کە ئەووەختی لە ئێراندا دەسەڵاتدار بوون. مامۆستا بەربوو گەڕاوە بەڵام دیسان ئەو ئەرکە بەرچاوەی کە دەبوو هەیبێ لە کۆماری کوردستاندا نەیبوو! ئەسنادی مەربووت بە کۆماری کوردستان بڵاو بووەتەوە، نامەکان بڵاو بوونەوە، دۆکۆمێنتەکان ئێستا تا حدودێک هەن بەڵام لەو دۆکۆمێنتانەدا ئەو وەزنەی کە مامۆستا لە کۆمەڵەی ژ.ک دا بوویەتی لە بافتی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان یان کۆماری کوردستاندا نابیندرێ!

دوای رووخانی کۆماری کوردستان مامۆستا لە ریزی ئەو کەسانە دابوو کە ئاوارەی کوردستانی گەرمێن بوو وە ماوەیەکی زۆر لە لای شێخ مەحموودی نەمر بوو لە مالّی شێخ لەتیف و ئەوانە مایەوە و دوایە لە گەلّ رەحمەتی قزلجی و کاک هەژار بەرەو بەغدایە رۆیشتن.

**عەلی:** کاک حەمەدەمین ببورە! ئێوە قەت بیستووتانە لە بابەت یان پیاوە کۆنەکانی سابلاغ کە زەبیحی لە سەردەمی کۆمەلّەی ژ.ک لە سابلاغ ئەو کاتە کە حکومەتی تاران هیچ دەسەلاّتی نەمابوو گیرابێ بۆ ماوەیەکی کەم مەبەستم ئەو کاتەیە کە قازی محەمەد بە سەر شار رادەگەیشت؟

**کاک حەمەدەمین:** نا! نەمبیستووە، شتێکی وا بووە!؟

**عەلی:** ئەمن وام بیستووە لە زمان نەنکم و دایکم و مالّەوە کە دەلّێن لە قاوەخانەکەی کەریم جووجووی کە ئەودەم زیندان بووە بۆ ماوەی پازدەبیست شەوان زیندانی بووە کە گۆیا ئەوان هەموو رۆژێک چوون و سەریان لێداوە و نانیان بۆ بردووە و بە کەلێن و قوژبنی دەرگای قاوەخانەکەدا قسەیان لە گەلاّ کردووە و تەنانەت جارێکیان داوای مەرمەشا و دەرزی و دەزووی رەشی لێکردوون کە دیارە دەبێ بۆ نامە نووسین کەلّکی لێ وەرگرتبێ. بەلاّم ئەوەی کە بۆ گیراوە و بۆ لە هیچ جێگایەکی دیکەم نەبیستووە جێگای پرسیارە!؟

**کاک حەمەدەمین:** دلّنیام دایک و خوشک وەک کەس و کار بە تایبەت ئەوانەی کە دەگەلّ برای خۆیان دەژین دەبێ خەبەرێکی کە ئەوانە دەیدەن حەقیقەت بێ، بەلاّم راگیرانەکەی بۆ چی بووە ئەمن هەم گیرانەکەیم نەبیستووە هەم راگیرانەکەی وە هەوەلّ جارە کە لە زمان تۆی دەبیسم، بەلاّم بە دووری نازانم ئەویش هەر لە نیرتبات دابێ لە گەلّ دەوری ئەو هێزانەی ئەووەختی کە لە کوردستان دەسەلاّتیان هەبوو وە پتر لە وانیش دەوری ئەو حاکمیەتە خۆجێییە کە لە کوردستاندا هەبووە کە بۆ گرتوویانە مەسئەلەکە روون نییە!

**عەلی:** کاک حەمەدەمین تۆ وەکوو ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر لە حیزبی دێمۆکرات دابووی و ئەندامی دەفتەری سیاسی بووی، بۆچی هێندە موخالفەتی قازی محەمەد کراوە بۆ هاتنی بۆ ناو کۆمەلّەی ژ.ک؟ پێتوایە ئایا باری چینایەتی و تەبەقاتی و ئەوانە بووە؟

ئایا کۆمەڵەی ژ.ک کۆمەڵەیەکی چینایەتی بوو؟ یان شتێکی تر بوو؟

**کاک حەمەدەمین:** وەڵا کۆمەڵەی ژ.ک ئەگەر سەرنج بدەینە بەرنامەکانی، ئەوەی مەلا قادری مودەرەسی نووسیویێتی، ئەوەی دوایە باسیان کردووە کۆمەڵەی ژ.ک بافتەکەی راستە پێکهێنەرانی کۆمەڵێک رووناکبیری شارستانی بوون، بەڵام بارودۆخەکە دوایە وای لێهات (وەکوو حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران دوای رووخانی رژێمی شای) زۆربەی خەرجی نەشریاتی کۆمەڵەی ژ.ک ئاغاکان داویانە، یەکی وەکوو حاجی رەحمان ئاغای کە ئاغایەکی رووناکبیری کورد بوو زۆر زۆر خەرجی داوە. کاک هێمن لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ بۆ یەک ژمارە قیمەتی هەر چەند بووە دوو سەد بەرابەر خەڵک پارەی پێداوە! خەڵکەکە بە ئیحساساتێکی پاکەوە هاتووەتە پێش! جا فکر بکەوە لە سەرووی کوردستان هەتا خواروو ئەو خەڵکە ویستوویەتی لەو حکومەتەدا بە نیسبەتی خۆی بەشدار بێت، کابرا ئاغا بووە، شێخ بووە، مەلا بووە، هەر چێکی بووە. بەڵام لە ئەوەڵێدا، لە سەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵەی ژ . ک دا بڕێک مەحدودییەت هەبووە بۆ مەسئەلەی کە خۆ لە ئاغا بپارێزن بەڵام دوایە ئەو بەرهەڵستە و ئەو مانعە نەماوە لە بافتی کۆمەڵەیدا.

**عەلی:** لە شێعرەکانی بایز و باپیر لە ناو گۆڤاری نیشتماندا هەیە کە چۆن باسی ئاغاوات دەکەن.

**کاک حەمەدەمین:** بەڵێ! ئەووەختی ئەوەی کە هێناویانە زیاتر موتەوەجیهی ئەو ئاغایانە بووە کە ئیرتباتیان لە گەڵ حکومەتی ناوەندی هەبووە. ئەمن هەر ئەو رۆژانە ئەوەی ئارچی رۆزڤێلتم دەخوێندەوە دەڵێ: ئەمن لە ماڵی ئەمەر خانی بووم فیلمێکیان هێنا لە ورمێ نیشانیان دا کە خەڵکی دێیەکی چۆن راپەڕیون و ئاغای لەبەین دەبەن و شۆڕشی سوور دەکەن، دەڵێ ئەمەر خان گەڕاوەتەوە گوتوویەتی چی دیکە ئەمن هاوکاری کۆماری کوردستان ناکەم! جا ئەمن ئەگەر سبەینێ دێیەکەم لێ بستێنەوە و بەدەردی ئەو فیلمەم بەرن ئەمن چۆن هاوکاری ئەوەی دەکەم!

دیارە ئینسان ناتوانێ بڵێ بزوتنەوەی چینایەتی یا خەباتی چینایەتی بۆ رۆژێک و بۆ سەعاتێک لە نێو ئەو میللەتە رادەوستێ! بەڵام شیددەتی زەعف و قووەتی هەیە، مووەکینە لە بەعزە وەختێکیدا ئەوە زۆر بێتە خوارێ، نزم بێ، هەستی ناسیونالیستی

ئەوەندە بە قووەت بێ کە خەڵک هێندێک سەرفی نەزەری بێ لە موقابیل ئەو داوایانەی کە هەیەتی، بەعزە وەختێکیش هێندە بەرچاوتەنگ بێ بە خاتری مەسەلەحەتێکی کابرا ولاتەکەشی بفرۆشێ! بە داخەوە هێندێک سەرۆک عەشیرەتیش هەیە کە کردوویانە ئیستاش ئەوە روون بووەتەوە، ئەسنادی وانەش رۆژ دەگەڵ رۆژ زیاتر روون دەبنەوە، وەختێک بە زاهیر لە گەڵ کۆماری کوردستان بوون و لە ژێرەوەش لە گەڵ ئەولاو ئەولای ئیرتباتیان هەبووە و لە پشتەوەش را خەنجەریان لە حەرەکەی کورد داوە!

بەلام ئەوەی کە موشەخەس بێینەوە سەر سوئالەکەی کە کردت، ئەمن بەراستی ئیتلاعاتێکی وام نییە لە سەر گیرانی یا عیللەتی گیرانی، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە ئەو وەختی ئەمن منداڵێک بووم لە سێی ئیپتیدایی بووم. ئەوەی کە دوایەش پیاو دەبیسێتەوە لە لای ئەو و ئەو کە کێ کێ بووە و باسی زەبیحی دەکەن و دەڵێن دەوری هەبووە و... باسی سەدیقی حەیدەری دەکەن و... ئەوە دوایە پیاو کۆی دەکاتەوە و جا مەنابیعی جۆربەجۆر هەر یەکەی بە گوێرەی بۆچوون و لێکدانەوەی خۆی ئیوایە رقی لە بۆچوونی مامۆستا زەبیحی یە دیزە و گۆزەی دنیایەی لە سەردا دەشکێنێ، ئیوایە خۆشی دەوێ حەتا ئیشتباکانیشی بۆ دادەپۆشێ! بەلام پێموایە وەختی وا پیاو دەبێ واقیعبینانە بەرخوورد بکا.

**عەلی:** باشە کاک حەمەدەمین ئێوە ئەوەڵجار لە کوێ چاوت پێیکەوتووە؟

**کاک حەمەدەمین:** ئەوەڵجار ئەمن لە بەغدایە چاوم بە مامۆستا کەوت. دووکانی یوسفی ریزوانی مەکۆی مامۆستای بوو ئەکسەری ئەو نامە نەهێنیانەی کە بلێین رێکخراوی پارتی موخالیفی مەلا مستەفا لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی کوردستان بۆیان دەهات دەهاتە دووکانی یوسفی ریزوانی، ئەویش کۆی دەکردەوە دەیدا بە مامۆستای، لەگەڵ مامۆستای نیوانی خۆش بوو.

**عەلی:** ئەوە ساڵی چەند بوو؟

**کاک حەمەدەمین:** ئەوە ساڵی ١٩٦٤ و ١٩٦٥ بوو، کە ئێمە لە گەڵ سمایلی شەریفزادەی رەحمەتی و ئەو کاک سالاری حەیدەریە کە ئێستا لێرەیە و ماوە هەستاین چووینە بەغدایە. ئەمن میوانی یوسفی ریزوانی بووم، سمایل میوانی کۆنە مامێکی

خۆی بوو، سالاریش میوانی عەبدولڕەحمانی شێخی بوو بەڵام ڕۆژانە پاتۆقمان دووکانی یوسفی ریزوانی بلێین عەبدوڵا شلێر بوو لەوێ یەکترمان دەگرتەوە، وەڵا ماموستا بیستبووی کە ئێمە هاتووین یەعنی جەماعەتێک کوردی گەنجی ئێرانی هاتوون بە یوسفی گوتبوو کە پێمخۆشە بیانبینم و دەعوەتیان کەم، یوسفیش گوتی وەڵا ئەوە شتێکی وایە و جا ئێمەش گوتمان ئەگەر ئەو برێکی پێخۆش بێ ئێمە دەئەوەندەمان پێخۆشە! لەو کاتەشدا کە ماموستا ئەوپەڕی ئیحتیاتی دەکرد کە هەم لە لایەن حکومەتی عێراقەوە و هەم لە لایەن مەلا مستەفاوە کەشف نەبێ! ماموستا زۆر دەست و دڵئاوەڵە و بە جورئەتەوە ئێمە سێ کوردی ئێرانی کە نەیدەزانی فکرمان چییە و بۆچوونمان چییە دەعوەتی کردین و زۆر دەعوەتێکی بلێین دەست و دڵئاوەڵانەش. چووین ماڵە نەهێنی کەشیمان دیت و لە گەڵی دانیشتین و زۆر بە تەعاروف و ئەوانە ڕۆژێکی خۆشمان لە لای ماموستای بردە سەر و ئەوە سەرەتای ناسینی ماموستای بوو. دیارە هەر ئەو وەختیش بەحسمان دەبوو، لە بۆچوون و لە هەڵوێست و ئەوانە نەزەری خۆمان لێکتر نەدەشاردەوە، ماموستا جۆرێکی فکر دەکردەوە نیسبەت بە مەلا مستەفا و ئەو حەرەکەیەی کە لە کوردستاندا هەبوو، ئێمەش جۆرێکی دیکەمان فکر دەکردەوە، بەحسمان بوو لە سەر ئەو مەسەلەیە، بەڵام بەحسەکەمان ئی دوو دۆست و ئی دوو ناسیاو بوو نەک بەحسێکی توند و تیژ.

ئەوە ساڵانی ٦٤ و ٦٥ درێژەی کێشا تا وای لێهات لە ساڵی ٦٨-٦٩ کە ئێمە جارێکی دیکە پاش شکانی بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی ئێران بە نەهێنی چووینەوە عێراق و ئەوانە، دیسان لەوێ جاروبار چاومان بە ماموستای دەکەوتەوە. ئەووەختی جەماعەتی بلێین پارتی کۆن (مەکتەبی سیاسی کۆن) کە لە گەڵ حکومەت هاوکارییان دەکرد و لە گەڵ بەعسییەکان بوون، دەسەڵاتیان هەبوو، هوتێلیان هەبوو، ئامووشۆیان هەبوو. ئەووەختی ماموستا دەستی زۆر زۆر دەڕۆیی، بەرپرسی ماڵی بوو. ئەووەختیش ماموستامان هەر دەدیت و نەزەراتی خۆمان لە یەکتری نەدەشاردەوە، ماموستا جۆرێک بۆچوونی هەبوو ئێمەش جۆرێکی تر بەڵام دۆستایەتی و نیزیکی ئێمە پتر وەختێک دەستی پێکرد کە ئێمە رادیۆیەکمان لە بەغدایە دامەزراند کە ئەو رادیویە هەم ئێمەی تێدا بوو وەک حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەم جەبهەیەک پێک هاتبوو کە پەناهیان پاش

کوژرانی بەختیار پێکی هێنابوو کە ئەو جەبهەیە هەم ئازەربایجانییەکانی تێدابوو هەم بەلووچەکان و هەم جەماعەتێک عەرەبی خورەمشهر و ئەهوازی تێدا بوو.

دوکتۆر مەحموودی پەناهیان کە بەرێوەبەری ئەو جەبهەیە بوو ماموستا کە ئەهلی قەڵەم بوو کردبووی بە مەسئولی ئەو رادیۆیە، مەسئولی نووسین و مەقالە وەرگێران لە بەغدایە، چونکی ماموستا هەم فارسیکەی باش دەزانی هەم کوردی هەم عەرەبی باش دەزانی و مەقالاتی ئێمە ئەگەر بە تورکی با ماموستا دەیکردە تورکی، بە عەرەبی با دەیکردە عەرەبی، بە فارسی با دەیکردە فارسی یەعنی لە هەموو زمانەکاندا ماموستا دەستی هەبوو و کاری دەکرد و نەخشی بەرچاوی بوو لە رادیۆکەدا، دیارە لە جەریانی کاری رادیۆشدا ئەکسەرەن بەحس و موناقشە و بۆچوونی جۆربەجۆر و ئیختیلافی نەزەر و سەلیقە هەبوو بەڵام هەمیشە زۆر زۆر برایانە و دۆستانە، ئێمە هەموومان بە چاوێکی زۆر زۆر رێز و ئیحترامەوە چاومان لە ماموستای دەکرد لە گەڵ ئیختیلافی بۆچوونیشمان، عیلەتەکەشی هەر ئەو ناساندنەی کاک حەسەنی قزلجی بوو کە پێی وابوو ماموستا عولەما دەگەڵ ئەوەی سەدی سەد لە باری فکرییەوە لە گەڵ وی ئیختیلافی فکری هەیە بەڵام لە باری ئەخلاقییەوە، لە باری شەخسیەتەوە بە ئینسانێکی سالمی دادەنا و رێزی بۆ قائیل بوو وە هەمیشە وەک دۆستێکی هەرە نیزیکی خۆی حیسابی لە سەر دەکرد کە ئەو کۆمۆنیست بوو ئەویشیان بە ناسیونالیست دادەنا بەڵام هەمیشە ئەو ئیحترامی بۆ قایل بوو وە رێزی بۆ دادەنا، ئێمە بەراستیش بۆخۆمان لە جەریانی کاردا بۆمان دەرکەوت کە ئەوەی کاک حەسەن دەیگوت برێک بە کەمیشەوە بوو یەعنی ماموستا زیاتر لەوەش بوو. ئینسانێک بوو نەزەری خۆی دەگوت نەزەری غەڵەت یا سەحیح نەزەری خۆی نەدەشاردەوە، برێک ئەو روحیەیەی تیپیکی رۆژئاوای پەیدا کردبوو، نەزەری خۆی دەگوت جا با نەزەرەکەی غەڵەت بایە نەیدەشاردەوە، دیفاعی لە نەزەری خۆی دەکرد، ئەتۆش نەزەرکەت وەردەگرت، چەندە قەبوڵت دەکرد و چەندە ئەو قەبوڵی دەکرد ئینسان خۆی دەزانێ و ئەوانە! بەڵێ جا ئێمە لە بەغدایە نیزیکی و هاوکاریمان پتر بوو، دیارە ئەوەش وەختێکە کە جەماعەتی مەکتەبی سیاسی کۆن گەڕانەوە بۆ لای مەلا مستەفا بەڵام تەنیا لە بەرێوەبەری واندا یەک: ماموستا زەبیحی ماوە لە بەغدا، دوو: مەلا عەوڵڵا. ئەمن

هەتا جارێکی لە خودی مامۆستام پرسی گوتم باشە لەو جەمعەی کە لە مەکتەبی سیاسی کۆندا بوون ئەوە مامۆستا برایم ئەحمەد، ئەوە مام جەلال ئەوانە هەموو گەڕانەوە بۆ لای مەلا مستەفا ئەتۆ عیللەتی چییە کە ئێستا ناچییەوە و هەر لێرە دانیشتووی؟! بزەیەکی هاتێ و بڕێک راما و ئەوانە، گوتی وەڵا وا مەسڵەحەتە! گوتم باشە مەسڵەحەتەکە یەعنی بۆ خۆت گەیشتوویە ئەو نەتیجەیە کە وا مەسڵەحەتە یا خێر قسەی لەسەر کراوە و مەسڵەحەت زاندراوە؟ درکاندی گوتی وەڵا مەلا مستەفا گوتوویەتی باشترە لە بەغدایە بێ چون ئەمن دەتوانم بڵێم برایم ئەحمەد کوردی عێراقییە و ئەوی دیکە کوردی عێراقییە، ئەدی ئەگەر ئێران داوای وی کرد بڵێم چی؟! با لە بەغدایە بێ باشترە!

**عەلی:** من لە منداڵییەوە زۆرم دژایەتی مەلا مستەفا و زەبیحی بیستووە حەتا ئەودەم کە ئێمە لە سابڵاغ بووین (زەمانی شا) شایعەی وا دەهات کە گۆیا مەلا مستەفا جایزەی بۆ سەری زەبیحی تەعین کردووە و ئەوانە! ئێوە کە ئەو دەم لەوێ بوون ئایا ئەو دژایەتییە بەو توووند و تیژییە بوو کە باسیان دەکرد؟! وە ئەگەر بوو لە سەر چی بوو؟

**کاک حەمەدەمین:** وەڵا ئەمن دژایەتی بەینی مەلا مستەفا و زەبیحی ناتوانم بڵێم دژایەتی بووە و چەندە مەلا مستەفا لێی تووڕە بووە و ئەوانە، بەڵام هێندێک شت کە لە خوودی مامۆستام بیستووە پێموایە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کۆن ئێستاکانەش حاشای لێ ناکەن ئەوەیە کە وەختێک ئیختلافی بەینی مەکتەبی سیاسی کۆن و مەلا مستەفا گەیوەتە ئەو پەڕی، خۆی نوێنەری مەکتەبی سیاسی کۆن بۆ لای مەلا مستەفا مامۆستا عولەما بووە! دوایەش ئەگەر پێشنیارێک یا شتێکیان بووبێ بۆ مەلا مستەفا و ویستبێتیان زەمینەی ئەو پێشنیارە خۆش کەن لە لای مەلا مستەفا دیسانیش هەر مامۆستا عولەمایان ناردووە! ئەمن ئەو رۆژانە لە گەڵ جەمعێک دانیشتبووم باسی وەمان دەکرد کە جارێکیان مەکتەبی سیاسی کۆن فکر دەکاتەوە کە تەنیا بە بەڕێوەبەری پارتی نەیانتوانیوە کە بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی عێراق بەڕێوە بەرن یا خێر بە گوێرەی لێکدانەوەی خۆیان دەیانهەوێ بڕێک بن پێی مەلا مستەفا لە باری عەشایر و شتی واوە بۆش بکەن. نەخشە دادەنێن کە وا باشە ئێمە بەڕێوەبەرێکی جەمعی ساز کەین کە عەشایری تێدابێ، ئاغای تێدابێ، شێخی تێدابێ، مەلای تێدابێ و ئەندامانی

پارتیشی تێدابێ. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نەخشەیە مامۆستای دەکەنە نوێنەر کە بچێتە لای مەلا مستەفا و لە گەڵی قسە بکات. مامۆستا بۆ خۆی بۆی گێرامەوە گوتی: چوومە لای مەلا مستەفا نەزەری مەکتەبی سیاسیم پێ راگەیاند کە ئێمە بەڕێوەبەری حەرەکەی کورد، شۆڕشی کوردستانی عێراق بەرینتر بکەین، ئاغاشی تێدابێ، شێخ و مەلاشی تێدابێ و بەشێکیش لە بەڕێوەبەری پارتی تێدابێ. مامۆستا گوتی مەلا مستەفا بڕێکی فکر کردەوە و گوتی ئەوە ئیشتبایە، پێنج شەش دەلیلی هێناوە لە رەدی ئەوەی کە ئیشتبایە. دەلیلەکانی ئەوەی کە لە بیرم مابێ گوتی ئێمە حەرەکەیەکی چەکداری و سیاسی بەڕێوە دەبەین، سبەینێ ئێمە خەریتە دادەنێین کە بچین فلان جێگا بگرین، ئەو عەشایرە هەر یەکەی سەری بە بیست جێگاوە بەندە، چ مەعلومە ئەوەی کە تۆ ئێستا قەراری لەسەر دەدەی سبەینێ فەورەن نەدرکێ! ئەوجار فلان شێخ و فلان عەشایر پیاوی شایە و پیاوی بەعسە و پیاوی تورکیایە و پیاوی کوێتیە و... ئەتۆ چۆن دێنیی بەڕێوەبەری ئەو حەرەکە و ئەو میللەتەی دەدەیە دەستی ئەوانە! سبەینێ ئەو خەڵکە بە تۆ دەڵێ چی؟! ئەوجار ئێستا ئەندامانی پارتی کاریان کردووە و رابردوویەکیان هەیە و دەیانناسی، ئەوانە لە کوێ دەناسی؟! ئاخر دەبێ کابرا لە ژیانی خۆیدا شتێکی کردبێ کە ئەتۆ بڵێی کاکە وەرەوە و هەنگاوێکت بۆ هەڵدێنمەوە و ئەوانە! گوتی مەلا مستەفا زۆری دەلیل هێناوە و ئەمنیش دەلیلەکانم یاداشت کرد. هاتمەوە بە بەڕێوەبەری مەکتەبی سیاسیم راگەیاند، گوتی مەکتەبی سیاسی جوابێکی نەبوو بۆ قسەکانی مەلا مستەفا و قەناعەتی پێ هێنا.

مامۆستا گوتی بەڵام پاش ئەوەی کە مەلا مستەفا لە ئێمەی دا و ئێمەی لە هەمەدانێ کرد (زەبیحی نەچووە و هەر لە عێراق ماوەتەوە - دانەر) ئەوجار بە شێنەیی هات عەینی بەڕێوەبەریی بۆ خۆی پێکهێنا و مەجلیسی سەرکردایەتی شۆڕش (مەکتەبی تەنفیزی) لە هەموو خەڵکی کوردستان کۆبوونەوەیەکی بەرینی پێکهێنا و لە تەواوی وانە سەرکردایەتی تازەی دروست کرد و ئەو کڵاوەی کە ئەوان دەیانهەویست لە سەری مەلا مستەفای بنێن، مەلا مستەفا لە سەری وانی ناوە!

جا ئەوە، ئەوەی دەگەیەنێ کە ئەگەر مەلا مستەفا هێندەی رق بڵێین لە خاڵت

بوویێ، بۆ زیاد لە تەواوی ئەندامانی بەڕێوەبەری مەکتەبی سیاسی کۆن خاڵت دەنێرن؟!
نا! پێموانییە ئەوە راست بێت. دیارە مەلا مستەفا ئەوانەی کە لە نیزیکەوە ناسیویانە
کە ئەمن بەداخەوە لە نیزیکەوە زۆر کەم شارەزاییم لێی هەبووە، لە زۆرێک لەو
مەسئولانەی رابردووی هەڵکێلاوە، لە مام جەلالی هەڵکێلاوە، لە برایم ئەحمەدی
هەڵکێلاوە، لە گەڵ تەواوی ئەوانە ناکۆکی بووە، لە گەڵ خاڵێشت موومکینە شتێکی
بوویێ ئەوە هیچ بەعید نییە. ئیدی بەلام ئەوەی کە بەڕاستی وەکوو ئینسانێکی سیاسی
خاڵتی وەچەنگ کەوێ و بیکوژێ شتی وا نەبووە! چونکی ئەگەر ویستبای خاڵت
بکوژێ، خۆ خاڵتی وەک چۆلەکە لە بەغدایە دەیتوانی لەبەین بەرێ! مەلا مستەفا خۆ
ئەو برادەرانەی کە دەزانن ئاگادارن کە دەسەلاتی هەبووە، مەلا مستەفا وەلا لە هەولێریش
دەیتوانی بیکوژێ، لە بەغدایەش دەیتوانی بیکوژێ، لە لوبنانیش دەیتوانی بیکوژێ! با
شتێکی سەیر کە ئەو رۆژانە بیستوومە بۆت بگێرمەوە:

عەبدوللا بارزانی یەک هەبووە کە لە کۆماری کوردستاندا بووە و لە گەڵ
بارزانییەکان هاتبوو. دوایە کە کۆمار نامێنێ و بارزانی دەڕۆن، عەبدولا بارزانی هەر لە
ئێران دەمێنێتەوە و ماوەیەک خۆی مات دەکا و خۆی دەشارێتەوە، دیارە بارزانی نەبووە و
هەر خۆی ناوی لە خۆی ناوە عەبدولا بارزانی. دوایە کە فەعالیەتی حیزبی تودە دەستی
پێکردووەتەوە لە گەڵ حیزبی تودە فەعالیەتی کردووە و جل و بەرگی کوردی لە بەر کردووە
و جامەدانی لە سەر ناوە و یەکێک لە بە جەرگترین هەڵسوراوانی حیزبی دێمۆکرات بووە
لە سالانی ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٣٠، ٣١، ٣٢ و هاتووچۆی تارانی کردووە و هاتووەتەوە
مەهاباد و هاتووچۆی مالی قازی محەمەدی کردووە و ئەوانە. کە کودەتای ٢٨ی مورداد
بووە، عەبدولا بارزانی ماوەیەک نەهێنی بووە کە ئەودەم مەلا مستەفا لە روسیە بووە.
پاشان کە مەلا مستەفا گەراوتەوە عێراق (کۆدەتای عبدالکریم قاسم) جەماعەتی حیزبی
تودە دەچن شکایەتی لە لا دەکەن کە کابرایەک بە نێوی عەبدولا بارزانی زۆرێک لە
ئەندامانی ئەوانی شناسایی کردووە و تەحویلی روکنی دووی داون لە سالانی ١٣٣٣ و
١٣٣٤. مەلا مستەفا گوتوویەتی تەعقیبی دەکەم، دوایە زانیوەتی کە ئەو عەبدولا
بارزانییە هەلاتووە و چۆتە سوریا. مەلا مستەفا پیاوی بە دوادا ناردووە و لە سوریا

کوشتوویەتی! جا دوایە بە حیزبی تودەی گوتووە کە ئەو کابرایەی زەربەی لە ئێوە دابوو فلان رۆژی لە سوریا لە فلانجێ کوژراوە! جا مەلا مستەفا ئەگەر ویستبای کەسێک بکوژێ دەیکوشت و بۆی دەکرا. ئیمکاناتی زۆر بوو حەتا ئیمکاناتی لە حکومەتی عێراقیش پتر بوو!

بەڵام مەلا مستەفا رەفتاری خاڵتی وەک کوردێکی ئێرانی پێ خۆش نەبووە. دیارە ئەوەی کە کاک هەژار دەیکرد خاڵت نەیدەکرد. خاڵت زۆر لە سەر پێی خۆی بوو لەو بارەیەوە کە کاک هەژار شێعری دادەنا و بە گاڵتە و بەوە بەڵام خاڵت ئەهلی ئەوشتانە نەبوو. پیاوێکی زۆر جدی بوو لەو بارانەوە و خۆی راگرتبوو، لە کوردستانی عێراقێ وەزنی هەبوو، لە مەکتەبی سیاسی کۆندا کە ئەندامی سەرکردایەتی بوو وە تا ئەوانیش تێکۆشانیان هەبوو هەمیشە بە ئینسانێکی وەفادار و دڵسۆزی خۆیان داناوە، ئێستاش پێموایە هەر ئێحترامی بۆ قایلن.

ئەو ماوەیە کە لە رادیو کارمان دەکرد بە هۆی هێندێک شەرت کە بەعس بۆ ئێمەی هێنا گۆڕێ کە ئەوەش ئیرتباتی هەبوو لە گەڵ مەسەلەی سەنار و گیرانی سەنار و تەحویل دانی و ئەوانە، کە ئێمە بەیاننامەیەکی دەرکەین و لەو بەیاننامەیەدا رەفتاری مەلا مستەفا و پارتی مەحکوم بکەین کە کارێکی جنایەتیان کردووە. ئێمەش بەڕاستی نە بە عینوانی ئەوەی کە تەئییدی ئەو کارەمان دەکرد کە مەلا مستەفا ئەو کارەی کردووە، بەڵام نێتر بەو دەلیلە کە بەعس لە ئێمەی دەویست وەک شەرت پێمان تەحمیل بکا کە ئێوە مادام ئێمە لێرە ئیمکانی رادیومان لە ئیختیار ناون، ئێوەش دەبێ ئەو کارەمان بۆ بکەن و ئەو ئیعلامیەی بدەن و ئەوانە، ئێمە نەچووینە ژێرباری وەی و رەدمان کردەوە و رادیوکە تەحتیل بوو. دوایە ماوەیەکی مامۆستا لە گەڵ جەماعەتە فارسەکان درێژەی پێدا و دوایە سەر لە نوێ دیسان رادیویەکی دیکەمان وەرگرتەوە و بەعس پەشیمان بۆوە کە دیتی ئێمە لە سەر هەڵوێستی خۆمانین و ئەوانە، بە نێوێکی دیکە دیسانیش هەر هاوکاریمان لە گەڵ مامۆستا دەکرد و ئەویش هەر دیسانەکە لە ئیرتبات لە گەڵ حەرەکەی کوردا بەعزە ئیمکاناتێکی لە ئێمە ئەستاند. دوایە مامۆستا لە گەڵ وردی و جەماعەتێکی دیکە پێموابێ بابکرناغاش هاوکاری دەکرد و لە گەڵ وانە درێژەی بە بەرنامەکانی رادیو دا.

دیارە مامۆستاش وەکوو هەر ئینسانێکی سیاسی لەو بوارەیدا کە ئێمە لە نیزیکەوە دەماناسی هێندێک بەرنامەی لە مێشکی خۆیدا جێ کردبۆوە. بەرنامەکانی چەندە ریئالی بوون، چەندە لە گەڵ واقعییەت دەگونجا، چەندە مەتلووبی خەڵکی ئێران بوو، چەندە هێزەکانی ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی بە دڵیان بوو جێگای پرسیارە! مامۆستا ماوەیەکی زۆر بوو دوور بوو لە موحیتی ئێرانێ، ئەوە بوو کە کەمتر تەوەجوی بە بەعزە شت دەکرد، بۆ نموونە وەختێک بەختیار هاتە بەغدایە و بوو بە پەناهەندەی حکومەتی عێراقێ، ئیمکاناتێکی زۆر زۆریان لە ئیختیار نا و ئەو قەسرەی نوری سەعیدیان دایە.
گۆیا مامۆستا هەر بۆ تۆڵە ئەستانەوە لە رژێمی شا و ئێران ماوەیەکی لە گەڵ تەیموری بەختیاری هاوکاری کردووە! هەر لە ئیدامەی ئەو ئیرتیباتانەیدا دوایی کە پەناهیان هات و ئەوانە. دەیانگوت حکومەتی عێراقێ لە ژەنەراڵان خۆشی دێ، حیزبی دێمۆکرات ژەنەراڵی تێدانێ، یەکدوو ژەنەراڵ ئیجارە بکەن هەتا ئیمکاناتی ئێوەش زۆرتر بێت! ئەو ئیمکاناتەی کە بە تەیموری بەختیاریان دەدا، سەدیەکی وەی، پێنج سەدیەکی وەیان نەدەدا بە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان! دوایە کە پەناهیانیش هات هەر عەینی وەزع بوو لەبەر وەی کە پەناهیان (ژنراڵ دوکتۆر مەحموودی پەناهیان) لە روسیاوە هاتووە و خۆی بەڤ را لادیوارێکە و ژنەکەی لە خۆی زلترە، پێیان وابوو سبەینێ ئێرانێ قوت دەدا!
ئەوانە هاتن لەو خەڵکە بەدبەخت و لێقەوماوەی کە لە کوردستانی عێراقێ ئاوارە بوون و لێقەوماو و برسی بوون کەڵکیان وەرگرت. بەڵام حکومەتی شا زۆر زۆر لەوان وریاتر بوو، زۆر لە عەوامیلی خۆی لە نێو ئەو گروهە چەکدارانە خزاند. هەر دەستەیەکی کە دەیاننارەوە (دەستەیەکی بیست نەفەری)، پێنج نەفەری ساغی تێدابوو، پێنجەکە دەکوژرا و باقی خۆیان تەحویل دەداوە و چەکەکانیشیان دەدا بە حکومەتی شا! بەداخەوە ئەوە دەدوازدە جار لە رۆژنامەکانی ئێران زەمانی شا تێکرار بۆوە بە نێوی عەواملی حکومەتی عێراق کە دێن لە ئێران خراپکاری دەکەن و دەگەرێنەوە بەڵام هەمووی دەکوژران!
مامۆستا دەگەڵ ئەو محەمەدی شاپەسەندی یە وەکوو کوردێکی کە زمانی خەڵکەکە دەزانن و رووحیە و فەرهەنگی کوردیان دەزانی کەڵکیان لێ وەردەگیرا بۆ ئەو بەرنامەی کە غەیری بەدبەختیو و فەوتانی عیدەیەکی بێخەبەر لە هەموو لایەکی،

نەتیجەیەکی دیکەی نەبوو. ئەوە تا حدوودێکی زەربەی لە ئیعتبار و وەزنی مامۆستا دا. دیارە ئەوە کاتێک بوو کە مام جەلال و برایم ئەحمەد و ئەوانە دانیشتبوون لە کوردستان و لە گەڵ مەلا مستەفا بوون. مامۆستا زەبیحیش لە بەغدایە بوو، ئەو بە تەشخیسی خۆی و بە فشاری حکومەتی عێراق بۆ سەر مامۆستا ماوەیەک لە گەڵ ئەو خەتەیدا رۆیی بە نێوی ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی، ئۆپۆزیسۆنێکی کە ئێمە ئاگامان لێ بوو حەتا حیزبی تودەش رەدی دەکردنەوە! پەناهیان و مورادی و رەزمئاوەر و ئەوانە، کەسی دیکەیان لە گەڵ نەبوو، جەبهەی میللی رەدی دەکردنەوە، موجاهدین، هەموو کەس رەدی دەکردنەوە. بەڵام لەو نێوەیدا مامۆستا و بە تەبەعەی مامۆستاش کاک محەمەدی شاپەسەند هاوکاری ئەوانەیان دەکرد. ئەوانە رۆژنامەیەکیان دەردەکرد، رۆژنامەکە بە شێعرێکی فەرروخی یەزدی بوو کە دەبێ ئینقلاب بکەی و بە شەمشیر وڵات رزگار کەی، ئەو جەبهەیە رزگاریخوازی سەراسەری ئێرانی تێدایە کە لە کورد و بەلوچ و... پێک دێ، دیارە ئەحمەد تۆفیقیش ماوەیەکی دەو داوە کەوت بەڵام هەر ژمارەیەک دوو ژمارە بەڵام دوایە ئەحمەد تۆفیق وازی لێهێنان. (ئەووەختە کە لە بەغدایە پەناهەندە بوو) بەڵام مامۆستا ماوەیەکی زۆر دەگەڵیان بوو، ئیستفادەیان لە شارەزایی و زمانزانی وی دەکرد. چەکداریان هەبوو، چەکدارێکی زۆریان لە نەواری مەرزی هەبوو. دوایە ئاخری کە حکومەت دیتی هیچ لەوانە شێن نابێتەوە، ژمارەیەکی زۆری لە وانە هێنا لە دەوروبەری بەغدا و ئەوانە نیشتەجێ کرد.

**عەلی:** ئەوانە هیچ رابیتەیان لە گەڵ جەماعەتی ئینقلابی حیزبی تودە هەبوو؟

**کاک حەمەدەمین:** نەخێر! جەماعەتی ئینقلابی حیزبی تودەش موخالیفی ئەو سیاسەتەی بوون. ئەوان پتر لە گەڵ نەوشیروان و ئەو جەماعەتەی کە دوایە رەنجدەرانیان لێ پێک هات ئیرتباتیان بوو.

دوای وەش بە بڕوای من رابیتەی ئێمە لە گەڵ مامۆستای، دیارە مامۆستا هێمن بە عیللەتی ئەوەی کە هەر لە قەدیمەوە مامۆستای دەناسی و دۆستایەتیان هەبوو حەتا لە خودی بیرەوەرێکانیشیدا کاک هێمن باسی دەکا کە مامۆستا عولەما ئەوی بە کۆمەڵە ناساندووە و شاهیدی بووە. هەژاریش و ئەوانیش هەموو خۆیان بە شاگردی مامۆستای

دەزانی و بە دۆستی نیزیکی. دوای ئەو جەریاناتەی ئێمە کە لە بەغدایە بووین تەبیعی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران چاو لێ بکەین دوکتۆر قاسملو سکرتێری حیزب بوو، کاک کەریم حیسامی خۆی بە دەبیری دووهەم دەزانی کە قەت قەت دەبیری دووهەم لە بەرنامەی حیزبدا نەبوو، بەڵام واقعییەت ئەوەیە کە مەسئولی دووهەم بوو ئەگەر زۆر جار لە مەسئولی ئەوەڵ دمی زۆرتر نەهێنابا پێشێ مەسئولی دووهەم بوو! ئێمە زۆر جار کە باسی مامۆستای دەهاتە گۆڕێ و قسە دەکرا نەزەراتی جۆربەجۆر هەبوو نیسبەت بە مامۆستای لە نێو حیزبدا. حەتا جارێکی مەسەلەی ئەوە هاتە گۆڕێ کە بابە لەو ئەندامانەی پێشووی حیزب کە رۆژگارێک لە گەڵ حیزب بوون و ئێستا بە هەر عیللەتێک لەولاوئەولا دانیشتوون، لێیان بگێرینەوە و هاوکارییان بکەین و ئەوانە، حەتا خوودی ئەحمەد تۆفیقیش! کە لێمان گێراوە و لە گەڵی دانیشتین دیارە رەدی کردەوە. ئەحمەد تۆفیق، مامۆستا زەبیحی، کاک هەژار یەکێک لەوانە بوون کە گوتمان لێیان بگێڕینەوە. دیارە کاک هەژار وا خۆی بە ماڵی مەلا مستەفاوە بەستبۆوە کە بە هیچ جۆرێک لەوان نەدەترازا! مامۆستا عولەماش کە باسمان کرد بەداخەوە موخالفەتێکی توند کرا کە موخالفەتەکەش پتر لە لایەن دوکتۆر قاسملو و کاک کەریمی حیسامی یەوە بوو. ئەویش هەر دەگەڕاوە سەر ئەو رسوباتی فکرییە کە گۆیا مامۆستا زەبیحی کتێبێکی بە ناوی "رەدی کۆزمۆپۆلیتی" نووسیوە و لەوێدا دژی چەپەکان بووە و لەگەڵ مەکتەبی سیاسی کۆن بووە کە ئەوانیش هەر دژی چەپەکان بوون. ئەوە دەبوو بە کۆسپ کە نەک هەر بۆ مەسەلەی وەرگیران لە حیزب حەتا بۆ رابیتەی هاتووچۆش لە گەڵیدا! بەڵام ئێمە سەرەڕای ئەوە لە بەڕێوەبەری حیزبدا بووین پەیوەندی دۆستانەمان لە گەڵ مامۆستای نەدەپساند، زۆری ئیحترام بۆ قایل بووین بە رابردووی، بە تێکۆشانی و بەوەی کە ئەو عومرەی ئەو کابرایە لە ئاوارەیی دابووە و سەری بۆ رژێمی شا شۆڕ نەکردەوە و درێژەی بە کاری خۆی داوە! جا چەندە شێوەی کارەکەی دروست یا نادروست بووە ئەو هەر درێژەی پێداوە و سەری شۆڕ نەکردووە! هەژار جارێکی قسەیەکی دەکرد دەیگوت: کە پیاو فکر دەکاتەوە ژیانی و ئەولاوئەولا و ئەو بەسەرهات و بەدبەختییە کە هەیەتی بەڵام وەختێک دێنێ بەراوردی دەکا لە گەڵ ئەو کەسانەی بە جێی هێشتوون، کابرایەکی حاجی تەنگەزل مووەکینە دە

میلۆنی هەبێ بەڵام کە چاو لە مێشکی دەکەی بایی تورێکی تێدا نییە، خانووی جوانی دروست کردووە و ژیانی باشی هەیە بەڵام مێشکی بەتاڵە!

مامۆستا لەو کەسانە بوو کە بەڕاستی زۆر دەروێشانە دەژیا، زۆر عارفانە دەژیا، سەرمایەی مامۆستا کتێبەکانی و یادداشتەکانی بوون و ئەوەش لە خۆڕایی نەبوو کە مەکتەبی سیاسی کۆن لە هەموو کەس پتر ئیتمینانی مالییان بە مامۆستای دەکرد، مەسئولیەتی مالی خوشک و برایانی نەبوو، کەسی لەوێ نەبوو بیداتێ و شتی لێ وەلا نێ وەکوو ئێستا کە مەسئولەکان دەیکەن بەداخەوە! ئەوە بوو کە مامۆستا زۆر جێگای ئیعتماد بوو.

لە دوایشدا کە ئینقلاب کرا و مامۆستا هاتەوە ئێمە باسمان کرد گوتمان ئەوە مامۆستا هاتووەتەوە، دیسان هەر عەینی ئەو رسوایاتی فکری کۆن گوتیان قەی ناکا هاتووەتەوە، هاتووەتەوە! بۆ نایە بۆ دەفتەری حیزب و ئەوانە؟! بەڵام دەڵێی چی؟! خۆ حیزب مەکینە نییە هەر کەس جۆرێک فکر دەکاتەوە، ئەگەر یەکێک پێی ناخۆشە کە بچێ مامۆستای بێنێ یا پێی کەسری شانە بچێ مامۆستای ببینێ وەڵا ئەمن یەکێک لەوانە بووم نە پێم کەسری شان بوو و نە هیچ، زۆریشم پێخۆش بوو چووم و دیتم و زۆریشم لە ئامێز گرت.

**عەلی:** باشە کاک حەمەدەمین لە جەریانی ٤٦ و ٤٧ کە کاک سولەیمان و کاک سمایل و ئەوانە تێدا چوون ئەو لە عێراقێ بوو تا ئەندازەیەکیش دەسەڵات و ئەوەی بووە و لە مەکتەبی سیاسی کۆندا بووە ئایا هیچ رابیتەیەکیان لە گەڵی هەبووە؟

**کاک حەمەدەمین:** نەخێر! لە جەریانی ٤٦ و ٤٧دا ئێمە (ئەمن و کاک سولەیمانی رەحمەتی) چووین بۆ ئیرتبات لە گەڵ حیزبی شیوعی عێراق و حیزبی تودە و ئەگەر بکرێ میسر و ئەوانە. ئێمە قەرارێک کە دابوومان بە هیچ جۆرێک خۆ لە جەماعەتی مەکتەبی سیاسی کۆن نەدەین بۆ وەی حەساسیەتی پارتی تەحریک نەکەین و خۆ لە حکومەتی عێراقیش نەدەین چون تو لە گەڵ حکومەتی عێراق بی ئەو رێگایەت لێدەبڕن. هەر لە سەر ئەو قەرارە من و سولەیمانی رەحمەتی لە گەڵ وەی ئەوپەڕی ئیحتیاج بووین و جەماعەتی دیکەش بیستبوویان کە ئێمە چووبووین، حەسۆ و وانە دەهۆڵێکیان

هەڵگرتبوو کە ئەوانە چوون بۆ لای جەماعەتی مەکتەبی سیاسی کۆن. حەسۆ نامەیەکی نووسیبوو بۆ سولەیمان کە "دەزانم ئێستا لە ئامێزی جلە و بلە دای"! لە کاتێکدا ئێمە خۆمان لەوان دەشاردەوە. مامۆستا ئەووەختی لە بەغدایە بوو، ئێمە ماوەیەکی زۆر لە سولەیمانیە بووین. لە بەغدایە ئەووەختی مامۆستا گرفتاری زۆر بوو وە ئێمە لە بەغدایەش خۆمان دەشاردەوە لێیان کە نەیانبینین حەتا سەدیق عەلی کە یەکێک لە کادرەکان بوو کە ئێستا لە بادینان مەسئولە و خۆشکەزای ئەحمەد عەبدوڵایە (ئەندامی بەڕێوەبەری جەماعەتی کۆن) ئەوە لەو دۆستە نیزیکانەی ئێمە بوو کە زوو گیرابوو لە زیندانی حیزبی دێمۆکرات دابوو، مەلا مستەفا گرتبووی، کە ئێمەی دیت گوتی دەچم بە برادەران دەڵێم، داوامان لێکرد کە کاک سەدیق ئێمە بە نەهێنی هاتووین و بە نەهێنیش دەگەڕێینەوە، نابێ لای برادەران بیدرکێنی. جا باسی کردووە یا نا نازانم بەڵام ئێمە خۆمان لەوان دەشاردەوە، خۆمان دەبوارد. ئێمە ناردمان بۆ لای مەلا مستەفا، دارا تۆفیقی ڕەحمەتی کە عێراق کوشتی، ئێمە ئەومان نارده لای مەلا مستەفا، رادمەنیش چوو بۆ لای مەلا مستەفا. مەلا مستەفا گوتبووی ئەگەر ئەوانە دەگەڵ بەعس (یەعنی حکومەتی عێراق ئەووەختی بەعس نەهاتبوو سەرکار، عەبدولڕەحمان عارف بوو عەبدولسەلامیش کوژرابوو) و دەگەڵ جەماعەتی جەلالی نەبن ئەمن کارم پێیان نەداوە، بە دەهۆڵ و زوڕنا نەیەن بەو سنورەیدا، بە نەهێنی بێن و بچن کارم پێیان نەداوە، کاریان بە من نەدابێ لە ئاسری وەردەگرن لە روسی وەردەگرن لە هەرچی وەردەگرن بەڵام لە عێراق و ئەوانە وەرنەگرن!

**عەلی:** مەسەلەی یارمەتی و چەک دانی مامۆستا زەبیحی بە تایبەت بە مەلا ئاوارەم بیستووە، ئایا هیچ شتی وا هەبووە؟

**کاک حەمەدەمین:** نا! دەزانی ئەوە چ بوو کاکە؟ ئەوە ئێمە کە لە کوردستانی عێراق بووین ئەو جەماعەتەی دوکتۆر لاشایی و ئەوانە هاتبوون، بیستبوویان کە لە ئێرانێ حەرەکەت هەیە و ئەو کوڕە مستەفای نورانی چووبوو خەبەری دابوونێ، دەپێشدا مستەفایان ناردبوو بۆ ئێرانێ. دوایە بۆ خۆیان جەماعەتێکیان هاتبوون، دوکتۆر لاشایی وئەوانە کە بێن ئیرتبات لە گەڵ ئێمە بگرن. ئەوانە کە بە مام جەلالیان گوتبوو، مام

جەلال گوتبووی کە ئێمە ئیرتباتمان لە گەڵیان هەیە، تەقریبەن پێنج شەش مانگیان ڕاگرتبوون، گوتبوویان ئەوە نامەمان ناردووە کە بێن، بێ ئەوەی هیچ ئیرتباتێکیان بێ لە گەڵ ئێمە! ئێمە کە هاتین و لە سولەیمانی ماوەیەک ماینەوە و چووینە بەغدایە و دوایە هاتینەوە سولەیمانیە و هەر ئینتزارمان دەکرد، دوو جار برادەرانی ئێمە لە ئێرانێ را مەلا ڕەحمانی کاژێ و ئەو مەلا حەسەنی شیوەسەڵی و محەمەدی ڕەسوڵ مەڕەی و ئەو برادەرانەیان نارد بوو کە بێن بزانن ئێمە لە گەڵ سولەیمانی ڕەحمەتی بۆ نەگەڕاوینەوە. ئەوانە دەزانن لێرە و لەوێ و دەبیسن کە پارتی شایعی کردووە دەڵێ ئەوانە هاتوون چوونە لای جەلال تاڵەبانی و ئەوانە. سمایلی ڕەحمەتیش کاغەزێکی خەست و خۆڵ بۆ مام جەلالی دەنووسێ، سمایلی شەریفزادە پێی وا دەبێ کە ئێمە لە لای وانین. نامەیەکی بۆ دەنووسێ و پێی دەڵێ کە ئەو برادەرانەی ئێمە کە هاتوونە لای ئێوە، وەزیفەی ئینسانی و کوردانەی ئێوەیە کە یارمەتی وانە بکەن و ئەوەی بۆتان دەکرێ دەریغی مەکەن و چ بکەن و چ مەکەن! ئەویش نامەی سمایلی لە تەنکی گیرفانی دەنێ کە بەڵێ ئەوە ئەوانە لە گەڵ ئێمەن. بە لاشایی و ئەوانیش دەڵێ کە ئەوە لە گەڵ ئێمەن. خەلیل شەوباشیش کە دێ و دەچێتە لای وان کە نامەی سمایلی هێناوە، دەڵێ باشە لە کوێن سولەیمان و فلانکەس (حەمەدەمین سیراجی)؟ دەڵێن وەڵا چوون بۆ مەئموریەت، چوون بۆ ئیرتبات، دەگەڕێنەوە! ئاخر ڕۆژێک ئیرتبات، دە ڕۆژ ئیرتبات، مانگێک... کە دەبینێ ئێمە ناگەڕێینەوە و ئەوان خەبەریان لێ نییە، لە چایخانەی قەڵادزێ مامۆستا جەماڵ دەبینێ دەڵێ ئەوە ئێمە هاتووین بە دوای ئەوانەدا و ئەوانیش دەڵێن لە لای ئێمەن و مانگێکە ئەمن ئەوە لێرە سەرگەردانم، ئەویش دەڵێ کاکە ڕاست ناکەن ئەگەر لێرە بن دەبێ لە لای شیوعیەکان بن، ئەوە ئەو وەختەیە کە شیوعیەکان ئیختلافیان دەبەین کەوتبوو. دەڵێ باشە بە ڕای تۆ لە لای کێهە شیوعیەکانن؟ دەڵێ وەڵا دەپرسین لە هەر دووک لایان دەپرسین، وەڵا بەڕێکەوت دەچن لە یەکێک دەپرسن کە لە جەماعەتی لایەنگری عەزیب حاجیە. کابرا دیارە ئەندامی ڕێکخراوی سولەیمانیان بووە بەڵام لە گەڵ عەزیب حاجی بووە جەناحی بڵێین چەپ، دەڵێ وەڵا دەزانین لێرەن بەڵام لە لای ئێمە نین و لە لای قیادەن،لێژنەی مەرکەزی. خەلیل هاتبوو لە گەڵ لێژنەی مەرکەزی تەماسی گرتبوو، هاتن گوتیان کاکە ئەوە برادەرێکی ئێوە

هاتووه ئێوه ببینێ، چووین خەلیل شەوباشمان دی، گوتی بابە ئەوانە دەهۆڵێکی زەلامیان هەڵگرتووه کە دەڵێن ئێوه دەگەڵ ئەوانن! گوتمان ناوەڵا لە گەڵ وان نین و راست ناکەن! جا لەو فاسیلەیەدا قاچاقچی هەبوون، جەماعەتێکی سۆسنی دەهاتن و دەچوون، ئەوانە هاتوون وەجیبەیەک تفەنگ دوازده یا چارده تفەنگ بووه بە یەکێک لەو قاچاقچیانەدا بە نێوی دیاری جەماعەتی مەکتەبی سیاسی کۆن بۆ مەلا ئاوارەیان ناردووه، ئەوه بە مەلا ئاوارەی گەیشتبوو. کە ئێمە چووین تەماشا دەکەین مەلا ئاواره تفەنگەکانی پێیە! ئەوه چییە مەلا ئاواره؟! گوتی وەڵا ئەوه بۆیان ناردووین، ئێمە فیشەکێک، تفەنگێک لە حەوای دەقۆزینەوه ئەوه ئەوەندە تفەنگەیان بۆ ناردووین. گوتمان وەڵا کارێکی زۆر زۆر خراپو کردووه، ئەوه دیاره ئێمە لە حاڵەتێکی زۆر زۆر پێویست داین و موحتاج بەڵام ئێمە هیچ رابیتەیەکمان لە گەڵ وان نییە و ئێمە لە ئێوەشمان مەعلووم کرد و قسەمان کرد کە رابیتەمان لە گەڵ وان نەبێ. مەلا مستەفاش قسەمان لە گەڵ کردووه وای گوتووه، حیزبی تودەش قسەمان لە گەڵ کردووه موخالیفی ئیرتبات لە گەڵ وانە! گوتی تازه چووه و کراوه و وەرمانگرتووه و چی لێ بکەین و تازه کراوه بەڵام قەتعی دەکەین. جا ئێمە ئەو رابیتەیەمان نەبوو لە گەڵ وان!

بگەڕێینەوه سەر باسەکەی هەوەڵمان، جا مامۆستا بە داخەوه بە عیللەتی وەی کە ئەو وەزعەی هەبوو لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا، پاش ئەوەی کە ئینقلابیش کرا مامۆستا دەخۆی رادەدی، رابردووی هەبوو، ئەهلی نووسین بوو، ئەهلی فکر کردنەوه و ئەوانە بوو. بەداخەوه بوو بە تۆعمەیەک کە بەهرەبەرداری خراپیان لێکرد، هەر نموونەی ئەو عەکسەی شێخ عیزەدین کە تۆ نیشانت دام، لە ناو و شارەزایی مامۆستا کەڵک وەرگیرا یەک بۆ ئیمتیاز وەرگرتن و یارمەتی وەرگرتن لە حکومەتی عێراق دوایە بۆ دەهۆڵ هەڵگرتن کە بەڵێ زەبیحی ئەو شەخسیەته خاوەن لە مێژینە لە گەڵ ئێمەیە و دژی وانە! مامۆستا شێخ عیزەدین دوو دانە نامەی بە خەتی خۆی نوسیبوو دابووی بە مامۆستا زەبیحی کە ئەوه نوێنەری منە، زمانی منە، هەرچێکی ئەو بیلێ وەکوو ئەمن گوتبم وایە!

بەڵێ ئەوه هات و چوو ئەمن جارێک لە مەنزومەی سولەیمانی چووین لە گەڵ ئەو رەشید خانی کیوەرۆیە ئێستا ئەوه لێرەیە و قاقا (کاک محەمەدی کەریمی) حەولی

ئەوەمان دەدا کە ئێمە ئەوانە بگەڕێنینەوە ئێرانێ، بە ژن و منداڵەوە هاتبوونە عێراقێ، دەیانگوت بە بێ وەرقەی مەنزوومە ڕێگا نادرێ ئەوانە بگەڕێنەوە، چووین وەڵا تەماشا دەکەین لە بەر دەرکی مەنزوومە کابرایەک بە جیپەوە راوەستاوە، حاجی دەرویشمان لە گەڵ بوو (حاجی دەرویشی بانەی) حاجی دەرویش گوتی وەڵا ئەمن ئەو جیپەی دەناسمەوە ئەوە ئی جەماعەتی شێخ عوسمان و ئەوانە. زەنگمان لێدا کابرای مەئموور هاتە دەر، جا مەنزومە وەک ماڵی مەعموولی وابوو زەنگت لێدەدا کابرا دەهاتە دەر و دەیگوت چت دەوێ؟ ئێمەش وەرەقەمان بۆ راگرت گوتی وەختێکی دیکە وەرنەوە (نیو ساعەت، سەعاتێکی تر) گوتمان با نەڕۆین بزانین ئەوانە کێن لە ژوورێن! چووینە لای رانەندەی جیپەکە گوتی وەڵا هەم مامۆستا زەبیحی لەوێیە هەم شێخ جەلال و هەم کوڕەکەی شێخ عوسمان. ئێمە لەوێ بووین تەماشامان کرد مامۆستا زەبیحی هاتەدەر لیباسێکی وەکوو وییێتکۆنگ و ئەوانە قۆڵ کورت و پانتۆڵێکی کورتی دەبەر دایە! گوتم مامۆستا ئەوە چییە بۆ وات لە خۆت کردووە؟! زۆر توڕە بوو گوتی کاکە هەر چێکی لە گەڵ وانە بڕوا، بە قسەی وانە بکا، بە قسەی وانە خۆ دە ئاور باوێ ئەسڵەن زایە دەبێ! مەنزوری بەعس بوو گوتی ئەوانە درۆیە دەکەن، راست ناکەن و ئێمەیان بۆ هەدەفی خۆیان دەوێ! ئەمن واز لەوانە دێنم. ئەمنیش پێکەنیم و گوتم مامۆستا خۆ تۆ لە بیرتە ئەمن لە مێژە بەحسی وا دەکەم، ئەوانە دەیانهەوێ پردی پشتی ئێمە بڕوخێنن و دوایە مەعاملەی خۆیان بکەن! گوتی نا ئەمن تازە دەچمەوە بەغدایە دادەنیشم لە سەر کارەکەی خۆم و ئەمن هاوکاری وانە ناکەم.

بەداخەوە ئەوەی کە لێرولەوێ بیستراوە پاش ماوەیەک تێدا چوو، لە بەغدایەش ئەووەختی ئەمن لە مەهاباد بووم بیستبوویەوە کە ئێمە ئێعلامی مەوزەعمان کردووە و جودا بووینەوە، تەلەفونی کرد یەکدووجار تەلەفونی کرد دەیگوت حکومەتی ئیسلامی دەبێ بە مست لە موقابیلی راوەستی گوتم مامۆستا ئەتۆ دووری، لێرە نی، ئەگەر لە بیرت بێ قسەکانی کە کردمان پیاو نابێ بە ئومێدی بەعس خۆی دە ئاور باوێ، ئەوانە دۆستی ئێمە نین، ئەتۆچ دەکەی؟ مامۆستا گوتی وەڵا ئەوە سەر مێزەکەم ببینی پڕپڕە، هەموو کتێبەکانم داناوە و خەریکی قامووسەکەم گوتم جا باشە مامۆستا ئایا ئەو مێزەی

بێنی لە مەهاباد دابنێی یا لە شوێنێکی دیکەی دابنێی لێرە کەس موخالیفت دەبێ؟! ئایا ئەگەر تۆ کاری سیاسی نەکەی هەر خەریکی نووسین و فەرهەنگ دانان بی کێ کاری بە تۆیە؟! گوتی حەوسەڵەی ئەو مەلایانەم نییە، لێرە دەمێنمەوە و خەریکی فەرهەنگەکەم دەبم بە داخەوە ئاخر تەلەفونی کە دەگەڵ ماموستام کرد ئەوە بوو دوایە پاش دوو مانگان ئاگادار بووم کە گوتیان بێ سەر و شوێنە.

**عەلی:** چت بیستووە بۆ خۆت لەسەر تێدا چوونی؟

**کاک حەمەدەمین:** وەڵاهی کاکە ئەوەی کە من بیستوومە دەوەیدا کە بەعس کوشتوویەتی هیچ شک نییە بەعس بۆ کوشتوویەتی خۆ ماموستا عولەما ئەوەڵ نەفەر نییە و ئاخر نەفەریش نابێ کە بەعس دەیگرێ و دەیکوژێ!

ئەوە هەموو دەزگاکانی کەلک وەرگر لە هێزی ئەو میللەتانە وادەکەن تا ئەو رۆژەی کاریان بە تۆیە ئیستفادەت لێدەکەن و ئەگەر کاریشیان پێت نەما فڕێت دەدەن!

ئەمن وا فکر دەکەمەوە بەعس یارمەتێکی زۆری لە کانالی ماموستای را بە شێخ عیزەدین و شێخ جەلال و وانە کرد، ئەوە هیچ شکم تێدا نییە، لەوەشدا کە بەشێک لەو یارمەتییە گەیوەتە دەستی هێزەکانی مام جەلال دەوەشدا شکم نییە، دەوەشدا کە دەنێو جەماعەتی مام جەلالیدا ئیوا زۆر بووە کە خەبەری داوە لە رابیتەی ماموستا لە گەڵ مام جەلالی دەوەشدا شکم نییە! ئەمن پێموایە لەبەین چوونی ماموستا لە رابیتە دەگەڵ وەیدا بووە. خۆ ئەو برادەرانەی ئێمە ماون و دەزانن کە بەعس لە ئەمنی سولەیمانی منی دێنا و دەبرد دەیگوت ئێمە ئەسلەحە دەدەین بۆ موخالفەتی جەمهوری ئیسلامی ئێوە دەیدەن بە حیزبی شیوعی کە دوژمنی ئێمەن! هیچ دەلیلێکی بەدەستەوە نەبوو! ئەو برادەرانە دەزانن وەزعی ئێمە چۆن بوو، ئێمە ئەگەر ئەسلەحەشمان دابێ ئەسلەحەی پادگانێ بوو ئەوە مەلا رەسوڵ لێرەیە، ئێمە ئەسلەحەی بەعسمان ئەو وەختی پێ نەبوو. بەڵام منیان محاکمە دەکرد کە ئەتۆ ئەسلەحەت داوە بە حیزبی شیوعی و ئێستا کابرای دێنین کە تۆ ئەسلەحەت داوەتێ بۆ ئەوەی ئێمەی پێ بکوژێ!

**عەلی:** کاک حەمەدەمین بە دەقیقی لە بیرم نییە کەی بوو ئایا پێش کۆنگرەی چوار بوو یان دوای کۆنگرە، بەڵام ئەو کات بوو کە شارەکان ئازاد بوونەوە و حیزبی

دێمۆکرات دەسەلاتێکی زۆری هەبوو، ڕۆژێک تەلەفونیان کرد و ئاگادار کراین کە حیزبی دێمۆکرات لە دەوروبەری مەریوان زەبیحی و شێخ جەلالی گرتووە و چەکێکی زۆریان پێبووە، هەڵبەت دوایە خۆم لە زەبیحیم بیست کە ئەو خۆی بە دەستەوە نەداوە وخۆی لێشاردوونەوە، بەلام ماوەی چەند سەعاتێک شێخ جەلال و چەکەکان گیران و پاشان مامۆستا شێخ عیزەدین تەداخولی کرد و ئەوان ئازاد کران، هەر چۆنێک بێ هەموو دەمانزانی کە دژایەتێکی قووڵ هەیە بە تایبەت لە لایەن قاسملووە بۆ سەر زەبیحی، ئەوجار بۆخۆم زور باشم لە بیرە کە هەر ئەو سەروبەندە ڕۆژێک چریکەکانی فیدائی خەڵق بەیانێکی سێ لاپەڕەیان دا کە ئەوە "حامید بەگی جوانڕۆ عامیلی سەر بە بەعس و پیاوی دوکتۆر زەبیحی عونسوری کۆن و خەتەرناکی بەعس" کە هەرچەند دوکتۆر نەبووە و وادیارە چریکەکان بە تەواوی نەیانناسیوە، لە مەهاباد بە دەستی چریکە فیدائیەکان گیراوە، هەروەتر ئەوە هاوکات بوو لە گەڵ ستادی موشتەرەکی حیزبی دێمۆکرات و چریکە فیدائیەکان. تکایە بفەرموون ئێوە ئەوە چۆن دەبینن و چەندە لەو شتانە ئاگادارن و چۆن بوو کە لەوپەری دەسەلاتی حیزبی دێمۆکرات لە شاری سابلاغ چریک دەتوانێ حامید بەگ بگرێ و دوایەش ئیعدامی بکا؟!

**کاک حەمەدەمین:** ئەمن تا ئەو جێگایەی کە لە حیزبی دێمۆکرات دابووم تا کۆنگرەی چوار تا مانگێکیش دوای کۆنگرەی چوار هیچ ڕابیتەیەک و هیچ نیزیکێکی وا لە گەڵ چریکان نەبوو، بەلام دوای ئەوەی کە ئیختیلاف کەوتە بەینی حیزبی دێمۆکرات و ئەو جەماعەتەی بلێین پەیرەوی کۆنگرەی چوار یا گروهی حەوت نەفەری، ئەو بەیانیەی کە تۆ دەیلێی یان نیزیکی حیزبی دێمۆکرات و چریکی فیدائی دەست پێدەکا، تەشکیلاتی کوردستانی سازمانی فیدائیان مقالەیەکیان لە سەر کوردستان نووسی و دیفاع لە حیزبی دێمۆکرات دەکا و حیزبی دێمۆکراتیش موتەقابیلەن شتی نووسی. حامید بەگ تەقریبەن دەکرێ بلێین سێ مانگ دوای کۆنگرەی چوار گیراوە یەعنی وەختێک بووە کە ئیعلانی مەوزیع کراووە و حیزبی دێمۆکرات جودا بۆتەوە. حامید بەگیش لە واقیعدا حیزبی دێمۆکرات لە دووی ناردبوو، حامید بەگ بە دەعوەتی حیزبی دێمۆکرات هاتبوو کە لێرەدا ئەو نوختەیە موبهەمە! حیزبی دێمۆکرات کە ناردوویەتی بە دوایدا و میوانی حیزبی

دێموکراتی کوردستانی ئێرانە و دەسەڵاتی زاڵە لە مەهاباد بۆ دەبێ چریکەکان ئەو دەسەڵاتە بدەن بە خۆیان یا ئەو جورئەتە کە حامید بەگی لە مەهاباد لە هۆتێل بێننەدەر و بیفڕێنن! یا بۆ حیزبی دێموکرات نابێ حیمایەت لە میوانی خۆی بکا! ئەوە مەسەلەیەکە بۆ من ناروونە، لە گەڵ مەلا محەمەدی جوانرۆیش قسەم کرد کە ئەو یەکێک لەو وەسیلانە بووە کە ناردوویەتی لەدووی حامید بەگ، ئەویش هەر پێی سەیر بوو! حامید بەگ مورمکینە کابرایەکی هەڵەشە بووبێ و ئیحتمالەن زۆریشی خەڵک بە بێ تاوان کوشتبێ بەڵام کابرایەک بوو سەرجەم دەیگوت ئەمن ئەو ئیمکاناتەی هەمە دەئیختیاری حیزبی دێموکراتی دەنێم، کاکە ئەمن ئینسانێکم حیزبی دێموکرات چۆنێکی ئیستفادەم لێدەکا با لێم بکا! دەیگوت ئەمن پێموابووە شێخ عیزەدینی حوسێنی دەگەڵ حیزبی دێموکراتە و حیزبی دێموکرات تەئیدی دەکا! ئەوەش کاغەزی شێخ عیزەدین! ئەویش کاغەزی شێخ عیزەدینی پێ بوو کە لە عێراق چەک وەرگرێ! کاکە بەداخەوە لە ئیمکاناتی دوای سەرکەوتنی ئینقلاب لەو بارەوە زۆر کەس بۆ بردنە پێشی هەدەفی سیاسی وە زۆر کەس بۆ بردنە پێشی هەدەفی مالی کەڵکیان وەرگرت و لەو بوارەیدا زۆر کەس دەبینی لێرولەوێ بۆتە میلۆنێر!

(لێرەدا کاک مەلا رەسولی پێشنماز کە لەو دانیشتنە بوو مەعلوماتێکی هەبوو لە سەر هاتنی حامید بەگ و گرتنی کە عەینی خۆی دەیهێنمەوە)

**کاک مەلا رەسوڵ:** لێرەدا کە هاتە سەر حامید بەگ ئەمن کە شاهیدی زیندووم، حامید بەگ ئێمە ناردمان بە دوایدا و سەید رەسولی بابی گەورە هێناویە، ئێمە لە هوتێلمان داناوە، من و دوکتور قاسملو و مەلا محەمەدی جوانڕۆیی لە گەڵی دانیشتین. ئێمە زۆر مەبەستمان بوو کە لە مەنتەقەی جوانڕۆ و مەنتەقەی حامید بەگی تەنزیماتێکی بە قووەتمان هەبێ و باشترین رێگاشمان حامید بەگ بوو. بەحەقیقەت حامید بەگ چی تێدا نەهێشتەوە بۆ وەی کە هەرچی لە توانای دابێ بیکا و باسی رابردووی خۆی کرد کە لە عێراق ئێوە لەوێ بوون و ئەمن لەوێ بووم بەڵام هیچ نیزیکیم نەبووە لە گەڵ حیزبی دێموکرات و ئەوانە. ئێستا کە وەزع ئاوایە و وڵات گۆڕاوە و... ئەمن حازرم بۆ هەموو هاوکارییەک، دوکتور قاسملوش کە وەک ئێمە لەوێ ئامادە بوو یەکجار زۆری پێخۆش

بوو. ئێمە هەموو لە سەر ئەوە موتەفیق بووین کە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە ئێمە ئەو کابرایە چەکی بدەینێ و قودرەتی بدەینێ و لە مەنتەقەی خۆی بیکەینە دەسەلات و بە نێوی حیزبی دێمۆکرات کار بکا. ئەوە بوو کە سەید ڕەسوڵ هێنایە هوتێلێ، و ئێمە هەر دەچووین بۆ لای و سەرمان لێدەدا. پاش شەوێک یان دوو شەوان حامید بەگ ون بوو، سەید ڕەسوڵ کە هێنابووی و مەلا محەمەد کە لەوێ وەک بەشی پێشمەرگە کاری دەکرد، ئەوان زۆری بۆ تەنگاو نەبوون، بەڵام بە حەقیقەت ئەمن زۆری بۆ نارەحەت بووم و زۆر بە وەعد و وەعیدی لە خۆڕایی تێک دەچووم. ئەمن لە گەڵ دوکتۆر قاسملو دانیشتم و کێشەم پێکرد کە ئەو ماستە وەک موویەکی تێدابێ وایە، ئەتۆ جارجار لە موقابیل ئەو هێزە توندرەوانەدا زۆر نەرمیش دەکەی، ئێستا شەخسیەتی ئێمە لە گۆڕێدایە و ئەو کابرایە هاتووە و هەموو وەعدێکی بە ئێمە داوە و ئەمن نارەحەتم چون ئەمن مەسئولی ئەو بەشەم، ئێمە دەبێ بیبینینەوە! گوتی چۆنی دەبینێوە؟ گوتم ئەمن هەر ئەوشۆ جەماعەتێک کە لێیان مەشکوکم جا یا نی چریکن یا نی کۆمەڵە ئەمن ٥ یا ٦ کەسیان لێدەگرم و دەڵێم حامید بەگم دەنەوە و ئەمیش نەفەرەکانو دەدەمەوە! گوتی سبەینێ بە نێوی خۆت تەواو دەبێ و ئابڕومان دەچێ و سبەینێ دەڵێن حیزبی دێمۆکرات تەحریک کراوە لە لایەن عێراق و کوێ و چی و چی! گوتی ڕاوەستە بۆ خۆم تەعقیبی دەکەم، خولاسە دوکتۆر وەک شتێکی عەمدی یان نازانم بڵێم چۆن ئەوەی کە پێویست بوو نەیکرد و نەیهێشت ئەمن ئیقدام بکەم نە سەید ڕەسولیش کە ئەوە کاک حەمەدەمین دەزانێ لە گەڵ دوکتۆر زۆر کەینەوبەینەیان هەبوو کە ئەویش هێنابووی و میزبانی بوو و خۆی بۆ ئەو شتانە بە پیاو دەزانی و بە کورد و عەشیرەت دەزانی دومبالەی گرتەوە و لە سەری ڕۆیشت!

ئەوە بوو کە ئەوانە نەیان کرد و منیش گوێم نەدایە و حامید بەگ بەو شێوەیە تێداچوو دەنا حامید بەگ ئەو دەمی لە جەریانی خالت و شێخ عیزەدین و ئەوانەدا نەمابوو، ئەودەم زمانیان گەیاندبوویە و هێنابوویان گۆیا بە حیساب لە گەڵ حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران کار دەکا!

**کاک حەمەدەمین:** بەڵێ! پێموایە وەک باس کرا شەهید بوونی مامۆستا زەبیحی

دەرابیتە لە گەڵ ئەو نەسلەحانە و ئەو یارمەتییانە بوو کە وەری گرتبوو. چەندە ئەو یارمەتییانە لە جیهەتی مەتلووبی بەعسیاندا بەکار برداوە و چەندە نەکراوە وەک خۆیان دەیانهەویست من بێننە محاسبەکاری کە یارمەتییان بە ئێمە داوە و ئێمە داومانە بە شیوعێکان کە لە دژی وان بە کاری بێنن، ئەمن پێموایە زیاتر لە ئیرتبات لە گەڵ وەی دایە. ئەمن حیزبی دێمۆکراتم لە پشت بوو کە لە ئەمنی کەرکووک و بەغدایە و لەو لاوئەولای بەرهەڵەستیانم دەکرد بەڵام مامۆستای فەقیر دیواری کورت بوو، بۆتە فیدای بێ پشتیوانی و ئەوە بەداخەوە.

**عەلی:** ئایا ئێوە هیچ ئاگاتان لە دانانی حیزبێک لە لایەن زەبیحی و مامۆستا شێخ عیزەدین بە ئاگاداری مام جەلال هەیە؟

**کاک حەمەدەمین:** وەڵا حەقیقەت ئەوەیە هەر لە سەرەتای ئینقلابدا کە ئینقلاب سەرکەوت، ئێمە هەستمان دەکرد و ئینتزارمان هەبوو حیزبی دێمۆکرات کە حیزبێک بوو رەگ و ریشەی هەبوو، خەڵک دەیناسی، با کادری پێویستی نەبایە، با ئەوشتەی نەبایە دەموقابیلی رووناکبیری ئەو وەختیدا جەوابگوو بێ بەڵام ئینتزاری زۆرمان هەبوو کە خەڵک بە لامانەوە بێ، رەدی فێعلێک کە پەیدا بوو هێندێک بەهرەبەرداریان لەو رەدی فێعلە کرد بۆ کەڵک وەرگرتن لە دژی حیزبی دێمۆکرات، زۆر کەس بەعەمد یا لە رووی نەزانینەوە ئەوەیان تەشدید کرد کە دەموقابیل حیزبی دێمۆکراتدا شتێک ساز بکەن کە دیارە ئەوە هەم شتێک بوو عێراق پێیخۆش بوو هەم ئێران یەعنی هەر جیهەتێکی کە بڵێین دژی ویستی میللەتی کورد بوو پێیخۆش بوو کە تەفرەقە هەبێ، حیزبی دێمۆکرات زەعیف بێ یا لایەکی لێ بێتەوە، ئەوە بوو حەول درا کە حیزبێکی دیکە لە موقابیل حیزبی دێمۆکراتدا ساز بکەن. تا ئەو جێگایەی کە من بیستوومە حەتا ئەساسنامەکەشی نووسراوە و گۆیا خالیشت نووسیوێتی. شێخ عیزەدینیش لەو جەریانە دابووە و زۆر لەو کەسانەی کە لەو لاوئەولاش بوون ئاگایان لەو مەسەلە بووە کە ویستوویانە ئەو حیزبەی ساز بکەن. بەڵام بۆیان نەلوا و ناعیلاج پارسەنگی هێزەکەیان دا سەر کۆمەڵە کە کۆمەڵەی پێ بە هێز بکەن. ئەو حیزبەی کە ئەوان دەیانهەویست نەبوو کە خاڵت دەو جەریانەدا برێک هاریکاری و ئەوانەی کرد، دیارە مام جەلالیش دەوری هەبوو دە ەبدا.

کۆمەڵەکان لە سەرەتاوە دۆستی مام جەلالی بوون و یارمەتییان دەکرد و لەمپەرێکی بوون لە ئێرانێدا کە بۆخۆت ئاگات لێیە. کاک سەلاح موهتەدی هەر لە سەرەتای ئینقلابەوە کە ئێمە گەڕاینەوە باسمان کرد کە لێی بگێڕینەوە و کارمان لە گەڵ بکا، ئەووەختی ئەو کاغەز و شتە سەیرانە بلاو نەبیوونەوە و ئەمن بۆخۆم لە گەڵ کاک سەلاحی هێنامە گۆڕێ گوتم کاک سەلاح ئەتۆ ئەندامێکی خاوەن رابردووی، ئەو نامانەش کە لە برادەرانی زیندانێ را بۆ ئێمە هاتووە لە زەمانی شادا بە باشی باسی تۆ دەکەن، ئەتۆ هەر لەسەر حیزبی دێمۆکرات قاچاغ بووی و لەسەر حیزبی دێمۆکرات گیراوی، با برێکیش لە گەڵ ئەحمەد تۆفیق ئیختیلافت بووبێ و جودا بووبنەوە، بەلام ئێمە پێمان خۆشە کارمان لە گەڵ بکەی. کاک سەلاح گوتی ئەمن کار لە گەڵ حیزبی دێمۆکراتدا ناکەم. زۆر بەسەراحەت گوتی کە من حیزبی دێمۆکرات بەو حیزبە نازانم کە ویستی من و ئاواتی من بێنێتە دی و کاری لە گەڵ ناکەم، دیاربوو هەر هومێدی ئەو خەتە بوو کە بە هومێدی بوون کە بەرنامەیان بۆ دانابوو کە سازی بکەن!

**عەلی:** جیا لە باری سیاسی زەبیحی باری ئەدەبیشی هەبوو ئەوە چۆن دەبینی؟

**کاک حەمەدەمین:** لە باری ئەدەبییەوە مامۆستا زەبیحی فەرهەنگەکەی کە دایناوە دەتوانین بلێین ئەوە ناهێلێتەوە کە پیاو شکی لەوە دابێ کە مامۆستا زەبیحی ئەو تەمەنەی کە لە ئاوارەیی دابووە بە فیڕۆی دابێ! شارەزایی بە سەر لەهجە جۆربەجۆرەکانی زمانی کوردی، کاری بۆ فێربوونی عەرەبی و مقالات و ئەو جوزەواتەی کە نووسیویەتی بەڕاستی لەو مەنبەعە بەنرخانەن کە بەداخەوە نیوەچڵ ماونەوە، مەسەلەن هەر ئەو فەرهەنگەی کە دایناوە ئەو بەلایەی بەسەر نەهاتبایە، بەلاکەشی بەسەر هات کتێبەکە بە دەستەوە مابا، ئەوە گەنجینەیەکی زۆر زۆر بە نرخ بوو کە بەداخەوە لەبەین چوو. غەیری ئەوەی هەر لە رابیتە دەگەڵ کاری نووسینی مامۆستادا هەر لە ساڵەکانی دوای ٦٠وە بە پێشنیاری مەکتەبی سیاسی کۆن رابردووی کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دێمۆکرات و ئەوانەی، مامۆستا نووسییەوە، کتێبێکی نووسیوە. ئەو کتێبە ماوەیەکی زۆر قەول وابوو پارتی چاپی بکات لە لای مەلا حەمدی بوو کە لە ئەکسەری ئەوانەی کە من گوێم لێبووە لە عەلی عەبدوڵلا، نوری شاوەیس و ئەو کەسانەی لە بەڕێوەبەری کۆنی پارتیدا بوون

پێیان وابووە کە کامڵترین و دەقیقترین نووسراوەیە کە لە سەر ئەودەم نووسراوە!

**عەلی:** ئەو مەلا حەمدیە ئایا ماوە و لە کوێیە؟

**کاک حەمەدەمین:** مەلا حەمدی لە کوردستان چوو دەرێ. دەیان گوت لە لەندەنە و نازانم لە کوێیە، ئەو مەحرەمی مەلا مستەفا بوو دوایە بووەتە پەنابەر لە ئورووپا و وڵاتانی دەرەوە، دەتوانی بۆ خۆت بپرسی بزانی ماوە یان نا.

ئەمن کتێبی رەدی کۆزمۆپۆلیتیم نەخوێندووەتەوە، هیوادارم وەدەستت کەوێ و تەرجمە بکرێتەوە. بەڵام ئەوانەی مامۆستا هاوکاری تێدا کردووە رۆژنامەی روناکی بوو لە بەغدا کە مامۆستا پتر تێیدا دەنووسی، مامۆستا قەڵەمێکی جوانی هەبوو، خەتێکی زۆر زۆر خۆش و رێک و پێکی هەبوو، بەڕاستیش کە پێیان دەگوت عولەما نێوێکی بێ موسەما نەبوو، کابرایەک بوو کە سەرمایەکەی زانستەکەی بوو، پیاو کە چاو لە فەرهەنگەکەی دەکا بۆی دەردەکەوێ کە بەڕاستی عولەما بووە!

**عەلی:** ببورە! ئایا ئێوە دەزانن ئەو نازناوە لە کوێرا هاتووە؟

**کاک حەمەدەمین:** هەر لە مەکتەبی سیاسی کۆن پێیان داوە، چون لە هەر بوارێکدا کە قسەیان کردووە مامۆستا کۆلێک شارەزایی هەبووە، کۆلێکی موتالەعە کردووە، ئەگەر کابرایەک شارەزایی لە شتێکدا هەبووە پێیان گوتووە عالم، ئەو کە لە هەموو شتدا شارەزایی هەیە و کاری چەند عالمان دەکا کە وابوو عولەمایە! باسی فیزیکیان کە کردووە ئەو لێی زانیوە یانی حافزەیەکی زۆر باشی هەبووە، ئەکسەری ئەو مەسائیلی ریازی و جەبر و ئەوانە کە خوێندوویەتی لە مێشکیدا هەر مابوو و شتی زۆر چاک لە بیر بوو، رۆژنامە و مجەلە و شتی وای زۆر دەخوێندەوە، مەعلوماتی زۆر بوو، هەر لەوەیرا پێیان گوتوە عولەما!

**عەلی:** وەک ئامۆژگاری ئێستا کە دەزانن ئەمن دەستم داوتە ئەو کارە پێتان وایە جەنبەی سیاسی مامۆستا زۆرتر بە قووەت بووە یان جەنبەی ئەدەبی؟ پێتان وایە زۆرتر لەسەر کامیان بڕۆم؟

**کاک حەمەدەمین:** بە بڕوای من ئەتۆ ناتوانی مامۆستای لە کتێبێکدا بکونجێنی، دەبێ ژیانی مامۆستا مەقتەع مەقتەع بکرێ، ژیانی مامۆستا لە کۆمەڵەی ژ

. ک ، حیزبی دیمۆکرات، ئاوارەیی، کوردستانی عێراق، ئەخلاقی مامۆستای، زمانەوانی مامۆستای، ئەوانە هەرکام بۆخۆی بەشێکە. بە بڕوای من ئەگەر تۆ تەنیا بتوانی سەردەمی کۆمەڵەی ژ . ک و ئەوانە لە کتێبێکدا بکونجێنی ئەوە بۆخۆی گەورەترین خزمەتە، هەروەتر نووسراوەکانی سەردەمی ژ . ک ی مامۆستا کە لە نیشتمان و کوردستاندا هەیە کۆی کەیەوە شتێکی زور باشە.

ئەتۆ وەرە هەر ئێستا ئەو مەقالاتەی کە لە نیشتمان و کوردستاندا نووسراوە مقایسەیان بکە ئەوەی مامۆستا زەبیحی فەرقی زۆری هەیە لە گەڵ ئەوانی دی! ئەوەی کە مامۆستا زەبیحی یان دڵشاد نووسیویانە کوردییەکی زۆر رێک و پێک و زۆر پوختەیە. کە تۆ دەتوانی هەر ئەو ئیختلافی فازی نێوان مامۆستا و ئەوانی دی لە رۆژنامەی کوردستان و نیشتماندا بە تەواوی وەڕووخەی و بزانی کێ چی لە باراندا بووە! ئەوەیە کە دەیخوێنییەوە بۆت دەردەکەوێ کە مامۆستا عەیاری چەند بووە لەو زروفەیدا کە نیشتمانی دەرکردووە!

ئەوجار تۆ تەماشا بکە لە رابیتە لە گەڵ بەعس، پیاو دەبێ شت بە بەڵگە بنووسێ، ئەمن بڵێم مامۆستا سەر بە بەعس بووە ئاخر بە چ بەڵگەیەک؟! مامۆستا دیارە لە عێراق بووە، لە گەڵ پارتی بووە، لە رۆژنامەدا شتی نووسیوە، حکومەتی عێراق یارمەتی داوە بەڵام ئایا بڵێین مامۆستا چی بۆ بەعس کردووە؟! ئەوە بە بێ بەڵگە ناگوترێ! ئینسان دەبێ بەڵگەی پێ بێ کە بڵێ مامۆستا زددی بەعس بووە یان تەئیدی وانی کردووە لە هەر دوو رووودا دەبێ بە بەڵگە قسەی خۆت بکەی!

بەڵام ئەوەی کە من ئێستا باسی مامۆستا دەکەم و رابڕدووی دێنمەوە پێش چاو ئەوە لە نیزیکەوە دەزانم کە ئەو کێ بوو.

هەر ئەو رۆژانە دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ لێرە بوو، باسی وەمان دەکرد کە هەر ئەو یەکێتی نیشتمانی یە لە هەموو کەس زۆرتر قەرزداری مامۆستایە. دوکتۆر عیزەدین دەیگوت بە مام جەلالیم گوتووە کە مامۆستا زەبیحی چی و چی بۆ نەکردین؟! بەڵام ئێستا کە خۆمان حکومەتین و دەسەڵاتمان هەیە و وڵات بە دەست خۆمانە مەدرەسەیەک، کۆڵانێکمان بە نێو نەکرد! گوتی مام جەلال گوتوویەتی راست دەکەی دەبێ

کۆنفرانسێک، یادێکی بۆ دابنێین بەڵام هیچیان نەکردا

دەبێ بۆخۆمان یادی بکەین، ئەوەی کە تۆ ئێستا قۆڵت لێ هەڵمالیوە کارێکی زۆر زۆر باش دەکەی، هیوادارم لەسەری بەردەوام بی و درێژەی پێبدەی و کارێکی زۆر بە نرخە.

**عەلی:** لەسەر گرتنی لە ساڵی ٧٥ و ئەوانە لە بەغدا چ دەزانی؟

**کاک حەمەدەمین:** ئێمە ساڵی ٧٥ سەفەرێکمان لە گەڵ دوکتۆر قاسملو بۆ ئورووپا کرد ئەوەی راست بێ دوکتۆر نەیدەویست بگەڕێتەوە و دەیویست منیش لە ئورووپا راگرێ، دوکتۆر عێزەدین هاتبوو دەرەوە و بڵاوی کردبۆوە کە ئەگەر بێتو بچنەوە بەعس دەیانکوژێ، ئەوانە زۆریان لەو لاوئەولا قسە بە بەعس گوتووە، ئەوە بوو کە کێشەم زۆر بوو لە گەڵ دوکتۆر قاسملو کە دەبێ بچینەوە، گوتم وەڵا هەر چی دەبێ با ببێ ئەمن دەچمەوە و ئەو برادەرانە لەوێ بە تەمای ئێمە لەوێ دانیشتوون و خۆ خوێنی من لە ئیوان سوورتر نییە و ئەمن دەچمەوە، وابوو ئاخر نوقتە من هاتمە لوبنانێ، کە هاتم مامۆستا زەبیحیش لەوێ بوو، مام جەلالیش لەوێ بوو، دووسێ جار یەکترمان دیت، مامۆستا لە منی راسپارد کە بە عەبدوڵلای کانی مارانی بڵێم فلان رۆژێ دەگاتە بەغدایە و بچێت بە پیرێوە لە فرودگا، ئەمنیش کە هاتمەوە بە کاک عەبدوڵام گوت کە بچێت بۆ فرودگا و مامۆستا دێتەوە. دوای یەکدوو رۆژان کە تەلەفونم کرد خەبەری مامۆستای بزانم کاک عەبدوڵلا بە جۆرێکی جواب دام و گوتی دوایە لە نیزیکەوە بۆت باس دەکەم! ئەمنیش چووم کاک عەبدوڵلام دیت، گوتی وەڵا لە فرودگا گرتوویانە! گوتم بۆ گرتوویانە؟! گوتی وەڵا بەعسە و گرتوویەتی و خۆ من دەسەڵاتی بەعسم نییە!

دوایە زانیمان لە زیندانی ئەبوغرێبە. ئێمە چووین داوامان کرد و گوتمان ئەوە دۆستێکی ئێمەیە و دەمان هەوێ ببینین، جا ئێمە زۆر شتمان دەکرد یان دەگوت، لێیان نەدەترساین و بە ویستی خۆمان دەکرد، پێیان خۆش با ئەوە دەمانکرد و پێیان خۆش نەبا دەرۆیشتین، بە هەر حاڵ ئێمە حیزبی سیاسی بووین و بە ویستی خۆمانمان دەکرد. وەڵا هەستاین لە گەڵ کاک هێمن چووین، زۆر زۆری پێخۆش بوو. گوتمان چی بووە؟ بۆ گرتوویانی؟! گوتی وەڵا هیچ نازانم ئەوە هاتوومەوە و گرتوویانم. بەڵام دوایە لەسەر

گیرانی شایەعە زۆر بوو، شایەعەکان جۆربەجۆر بوو لە نیزیکترین کەس بە مامۆستای را دەگرتەوە تا ئەوەی کە زۆر لە دوور لە لوبنان دیبووی! بەلاّم نەزەری غالب ئەوە بوو کە لەو سەفەرەی کە کردوویەتی زۆرتر زەرەری بۆ وان هەبووە تا قازانج. هێندێک جەماعەتی دیوە کە نەدەبوو بیان بینێ، دیاربوو مام جەلال بووە وە پێشموایە ئەگەر بەعس لێی پرسیبا کە مام جەلالی دیووە، ئەو نەیدەشاردەوە و دەیگوت دیومە! جا سەرجەم شتەکان ئەوە بوو کە بەعس لە هەلّسوکەوتی ئەو لە لوبنان نارازی بووە حەتا دەیانبردەوە سەر نیزیکترین کەس بە مامۆستا کە حاجی بوو!

**عەلی:** لە سەر شێخ جەبار چت بیستووە؟ گۆیا ئەو راپۆرتی لێداوە؟

**کاک حەمەدەمین:** ئەمن ئەوەم نەبیستووە، بەلاّم شێخ جەبار کابرایەک بوو بە بێ پەت لە گەلّ موخابرات بوو، ئەمن جارێکی توشی بووم جا ئێمە بە وانەمان دەگوت تولّە، سلاّوی لێکردم و ئەوانە، منیش زۆر بە ساردی جوابم داوە! گوتی باشە تۆ بۆ وا لە گەلّ من ساردی؟! گوتم جا باشە ئەمن چ مەجبووریم هەیە لە گەلّ تۆ گەرم بم؟! گوتی وەلاّ عەیبی من ئەوەیە کە من بە بێ پەت لە گەلّ موخابراتم و نایشارمەوە بەلاّم مەسەلەن هەر براکەی خۆم (شێخ سەتار) هاتووە مەسەلەن حیزبێکی داناوە و ئاوا لە گەلّ موخابراتە! جا کاکە ئەگەر هەر لە گەلّ موخابراتی، بۆ هاتووی حیزبێکت داناوە و بە پەتەوە پیاوی موخابراتی! وەلاّ ئەمن بە بێ پەت پیاوی موخابراتم! جا ئەوە چەندی دەور بووە نازانم.

**عەلی:** لە ئاخردا وەک بیرەوەری و ئامۆژگاری چت هەیە بفەرموو.

**کاک حەمەدەمین:** وەلاّ ئێمە بیرەوەری و خاترەی خۆشمان لەو ماوە موختەسەرەی ژیانی ئاوارەیی لە گەلّ مامۆستا بووە. مامۆستا ئینسانێکی دلّسۆز و بەوەفا بوو، پێمخۆش بوو ئێستا برادەرانی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق لێرە بایەن، لە گەلّ ئەوەی کە سەدی سەد موخالیفیان بوو و فکرەن موخالیفی کۆمۆنیستەکان بوو بەلاّم زۆر جاران کە کابرای کۆمۆنیست لە سەیتەرە یا لە جێگایەک گیراوە و بە واستەی من و یەکی دی مامۆستا چووە و حەجمینی نەبووە تا کابرای بەرداوە! حسی دلّسۆزی و ئەوە لە مامۆستادا زۆر بە قووەت بووە. ئەمن باسی کاک حەسەنی قزلجیم کرد، کاک حەسەنی کۆمۆنیست و مامۆستای ناسیونالیست، لەوپەڕی موخالیفەتی فکری، نیزیکترین رابیتەی عاتیفیان

دەبەین دابووە، ئەو حیسسەی مامۆستا زۆر بە قووەت بووە کە بەداخەوە هێندێک کەس ئیستفادەی خراپیان لەو حیسسە ئینسانی و عاتیفەیەی مامۆستا کرد!

بە هەر حاڵ ئەو کارەی کە تۆ خستووتە سەر شان کارێکی زۆر باشە و گۆشەیەکە لە ژیانی کەسێک کە خاوەن رابردوویە و کەسێکە کە دەروێشانە ژیا لە پێناو ئامانجەکانی. ئەوەی کە تۆ دەتهەوێ لەسەر ژیانی کۆی کەیەوە و بیکەیە کتێب و یادی بکەی کارێکی باشە و هیوام وایە سەرکەوی و هیواداریشم ژیانی مامۆستا بە موسبەت و مەنفیوە ببێتە رێنوێنی بۆ گەنجەکان و ئیستفادەی چاکی لێ بکەن.

**عەلی:** زۆر زۆر سپاس بۆ ئێوە و ئەو کاتەی بۆتان تەرخان کردم.

**کاک حەمەدەمین:** زۆر سپاسی تۆش دەکەم کە ئاوا دڵسۆزانە دەتهەوێ ژیانی خاڵت بنووسی کە بەداخەوە دەبوو ئینسانی دیکە ئەو کارەیان کردبایە! پێمخۆشە کە قۆڵت لێ هەڵماڵیوە و بەحەق دەتهەوێ ئەو پلە و پایەی کە زەبیحی هەیبووە زیندووی کەیەوە و بیخەیە بیران کە زەبیحی ئەو هەمووە زەحمەتەی کێشا و بێ نێو نەمێنێتەوە.

**عەلی:** دیسان سپاس بۆ ئێوە.

# وتوویژ لە گەڵ دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ

١٩٩٥/١٠/١١

**عەلی:** کاک دوکتۆر تکایە بفەرموون یەکەم جار چۆنتان مامۆستا زەبیحی ناسیوە؟

**کاک دوکتۆر:** من دوو جوورم بیر دێت، پێش ناسین دوو جارم دیبوو و دوایەش ناسینەکە لە سوریاوە بوو.

بینینەکان: سالی ١٩٤٩ قوتابی دواناوەندی بووم، رێکەوتێکی سەیر، شەو لە مزگەوتەکەی خۆمان لە ژوورەکەی باوکم خەریکی خوێندن بووم، یەکێک هات وتی ماشێنەکەی شێخ لەتیف وەستاوە و دەیانهەوێ ئێوە ببینن، باوکم لەوێ نەبوو، کە چووم شۆفیرەکەی شێخ لەتیف بوو لە گەڵ کەسێکی تر بە جلی کوردییەوە و کلاو و مشکی لە سەر، دیار بوو کلاو و مشکێکە ئی سلەیمانی نەبوو، لێی پرسیم کە کێیت و وتم کوڕی فلانیم، وتی دەڵێن دەروێش عەبدوڵلا لە لای ئێوەیە، دەروێش عەبدوڵلا دەفەزەنێک بوو بە ئەسڵ خەڵکی ناوچەی موکریان بوو، ماوەیەکی زۆر بوو کەوتبووە سلەیمانییەوە و لە سەروبەندی کۆماری کوردستان هاتووچۆی سابلاغی دەکرد، بۆخۆی ئەیوت من لە بلیندگۆی مەهاباد وتوومە، دیارە ئەووەختە لە مەهاباد بلیندگۆ هەبووە و مەبەستی رادیوکەی کۆمار بووە، ئێستاش لە بیرمە بە دەفەکەیەوە لێی ئەدا:

"لە سایەی پێشەواوە زۆر بە ئازا و بە مەردی

ئەیپارێزین ئەو خاکە بێچوە شێرانی کوردی"

ئەو دەروێش عەبدوڵلایە زۆرتر لە ماڵی خزمێکی ئێمە کە شێخ محەمەدی مەحوییە (نەوەی مەحوی) هەر لەوێ دەژیا، ژوورێکیان دابوویە و بە خۆی و خێزانەکەیەوە لەوێ بوو. جا دەروێش عەبدوڵلا زۆر کەس تێکەلی دەکا لە گەڵ ئەو دەروێش عەبدوڵلایەی گۆران باسی دەکا، ئەوەی گۆران باسی دەکا دەروێش عەبدوڵلای

شمشالژەنە کە لە ساڵانی ٢٥ و ٢٦ (زایینی-دانەر) مامۆستا گۆران لە هەورامان دیوێتی، ئەو جیایە و ئەم دەروێش عەبدوڵڵا دەفەزەنە یەکێکی دیکەیە، دەنگێکی وەک کورد دەڵێ بریندارى هەبوو، گۆرانیشی ئەوت بە دەفەوە و ئەو سروودانەشی ئەوت.
دیارە ئەویش دوای جەمهوریەتی کوردستان هاتبووە لای خۆمان و کاک شێخ محەمەدی مەحوی کە زەوقی گۆرانی و خەڵقی دەنگخۆشی هەبوو لە بەر ئەوە داڵدەی دابوو، زۆر جاریش هەر چەند مەجلیسی ئەوکات مەجلیسی دانیشتن و خواردنەوە نەبوو بەڵام دادەنیشتن چەند کەسێکی دەنگخۆش گۆرانیان ئەوت و ئەویش لەوێ گۆرانی ئەوت.
دیارە مامۆستا زەبیحی بیستبووی کە دەروێش عەبدوڵڵا هاتووە و لە سلەیمانییەیە و دەیناسی، هاتبوو بۆ مزگەوتی ئێمە. ئەمن وتم لە ماڵی کاک شێخ محەمەدە و ماڵەکەی دەزانم، لە گەڵیان سوار بووم، لە ناو ماشێنەکە (ترۆمبێلێکی جیپ بوو) کەوتە پرسیار لێ کردنم، کۆمەڵێک پرسیاری ئاوا زانستی و عیلمی و خوێندنی لێکردم، وتی دیارە زۆر زیرەکی! سایقەکە وتی ئەوە کوڕی لای مەیە بۆیە وایە! وتی نا، ئەوە کوڕی فلانە بۆیە وا زیرەکە! دوایە بردم دەروێش عەبدوڵڵام پێنیشاندا و دەروێش عەبدوڵڵای لە گەڵ خۆیا برد بۆ ماڵی شێخ لەتیف، جا خۆی دوایی بۆی باس دەکردم کە دەروێش عەبدوڵڵای بردووە و گۆرانی بۆ وتوون و دەروێش عەبدوڵڵای چۆن لە مەهابادەوە ناسیوە و ئەوانە، ئەوە یەکەم بینین بوو ئاوا بەو سەرپێییە!

دووهەم جار لە بیرمە ساڵی ١٩٥٤ بوو لە گەڵ کاک نوری ئەحمەد تەها کە تازە لە حەپسخانە بەر ببوو لە جادەی رەشید ئەرۆیشتین یەکێک بانگی کرد شەبقەیەکی لە سەر بوو شەو بوو، دارجگەرەکەشی بەدمەوە بوو وەک خۆی، بردێ ئەولا و کۆمەڵێک قسەی کرد و هاتەوە، بە منی وت ئەوە نایناسی؟! وتم بەخوا شێوەی ئەکەم! وتی ئەوە قادرە، جا باسی ئەوەی کرد کە چۆن نایناسی؟! دوایە وتی ئەوە رەحمان زەبیحی یە و ئەڵێ ئەمری گرتنم لەسەرە و خۆم شاردووەتەوە، جا پاش ئەو جارە گیرا. من بە یەکەمەوە بەست چونکا نەمدەزانی قادرە، برادەرێکمان هەبوو دوایە بوو بە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی شیوعی، ساڵی ١٩٥٣ لە حەپسخانە بە یەکەوە بووین (حەپسخانەی ئەبو غەرێب هەبوو لە حەپسخانەی عەسکەری) نامەی ئەنووسی بۆ قادر ناوێک کە جل و بەرگ و پارەی بۆ

بنێرێ، ئەو برادەرە حەمید الدووژێری ناو بوو کوشتیان، لە ساڵی ١٩٦٥ لە بەغدا کە چوونە سەریی رای کرد و گولەیان پێوەنا کوژرا. حەمید الدووژێری زۆر لای سەیر بوو کە من قادر ناناسم کە کوردە و ئەویش خەڵکی سلەیمانییەیە (دیارە نەیزانیوە خەڵکی کوێیە) و سەر بە کۆمۆنیستە و زۆری یارمەتی داوە و.... لەو حەپسخانەیە ناردی شتی بۆ هات حەمید! یەعنی خۆی نەهات و رێگای نەبوو بەڵام خۆراک و بەرگ و شتی بۆ نارد، زەمانی نوری سەعید تۆزێک نەرمتر بوو لەو شتانە، حەمید وتی ئەوە قادر ناردوویەتی چۆن قادر ناناسی؟! جا ئەمن دوای ئەوە کە لە گەڵ کاک نوری دیتم و وتی ئەوە قادرە ئیتر ئەمن رەبتم کرد کە ئەوە خۆیەتی! یانی مامۆستا زەبیحی ئیشی سەیرسەیری کردووە بۆ ژیان و گوزەران لە ژیانا کە من کۆمەڵێکی ئاگادارم، زۆر جار ئیشی کردووە کە ببێتە هۆی خۆشاردنەوە کە خۆی لە شوێنێک بشارێتەوە کە کەس بە خەیاڵیدا نەیە! سەردەمێک لە رستورانی ئەمباسی ئیشی دەکرد، رستورانێکی موحتەرەم بوو، ئارتیستی بێگانەی بۆ دەهات، کابارە بوو، ئی کەسێکی بوو عەبدوڵلا شەریفیان پێ ئەوت. عەبدوڵلا شەریف شەریفولحەدادیشی هەبوو، چەند شوێنێکی تریشی هەبوو، پێم خۆشی سابلاغی بوو بەڵام لە کۆنەوە هاتبوو کوردستانی عێراق و ببوو بە ئەفسەری پۆلیس و دوایە دەوڵەمەند ببوو، جا ئەمان زۆریان مەدح دەکرد چ مامۆستا زەبیحی و چ مامۆستا هەژار. عەبدوڵلا شەریف لە لای ئێمە هەر ئەوەندە لە دوورەوە دەمانزانی کابرایەکی دەوڵەمەندی کوردە و ئەو شوێنانەی هەیە، بەڵام ئەوان باسی نیشتمانپەروەرییان دەکرد، باسی وەیان دەکرد کە یارمەتی داون، دیارە ئەوانی هەموو ناسیوەتەوە و جێگەی کردوونەوە لەوێ. مامۆستا زەبیحیش بەراستی پاک بوو و دەربەستی پووڵ و پارە و فلان نەبوو، بۆ ئەو ئەوەندە بەس بوو عەبدوڵلا شەریف جێی بکاتەوە و خۆی بشارێتەوە و نانێکیش بخوا! جا عەبدوڵلا شەریف شتەکانی تەسلیم کردبوو، وەک موباشیر موباشیری بوو چون لێی ئەمین بوو، تەنانەت لە شام زۆر جار کە دەکەوتینە ناخۆشی و نەبوونییەوە چون ژیانێکی زۆر ناخۆشمان بردەسەر لە رووی نەبوونی و ئەوەوە، دەیگوت جەناب ئەگەر عەبدوڵلا ئەفەندی (عەبدوڵلا شەریف) بێرەدا رەد دەبێ ئەمن دەزانم چۆن دەکەوینە خۆشییەوە! دەمگوت چۆن؟! دەیگوت قەناعەتی پێدەکەم لێرە شوێنێک بکاتەوە، رستورانێک،

شوێنێک، فلانێکی گەورە بکاتەوە و بۆی دەبەم بەرێوە، هەمووشمان لەوێ جێمان دەبێتەوە، بە گاڵتە دەیگوت تۆ دەخەمە فلان جێ و ئەوی تر دەخەمە سەر چی و... (پێکەنین) جەمهوریەتەکەی ئیفلاتون بەوە دروست دەکەین.

جا لەبەر ئەوە عەبدوڵلا شەریف لێی ئەمین بوو ماموٚستا زەبیحی وەک دەرکەوت کۆمەڵێک خەڵکی تر بە تایبەت کۆمۆنیستەکان زیاتر چون ئەووەختە کە لە گەڵ عەبدوڵلا شەریف ئیشی دەکرد وەک دوایە باسی دەکەم لە پارتی دوور کەوتبۆوە و زیاتر نیزیکی لە کۆمۆنیستەکان و باڵی "رایە الشغیلە" هەبوو لە حیزبی شیوعی دەکرد، لە لای خۆی جێ کردبۆوە. لە گەڵ ئەوەش برادەرێکی ترمان هەبوو لە بیرمە ئێستاش ئەندامی لیژنەی مەحەلی حیزبی شیوعی یە لە سلەیمانی یە، ئەحمەد حامید، بوو بە ئەمیری عام لە حوکمی زاتی لە شێستەکان کە دەوری کۆمۆنیستەکان بوو، ئەو و کۆمەڵێکی دیکە ئەو جێی کردبوونەوە، هەر لەوێ دەنووستن و دیارە لە رستورانێکی وا ئەوەندەش خواردن هەیە و بمێنێتەوە کە دە کەس وا لێی بخوا.

ئەوە ساڵانی ٥٣ تا ٥٥. دوایە لەوێ ئەو و کاک حەسەنی قزڵجی گیران. جا ئەوە بۆ من دەرفەتێکە کە زۆر شت بڵێم، بەراستی پێرار ساڵی ١٩٩٣ لە گەڵ مام جەلال کە لە گەڵیا چوومە شام بە لای ماڵەکەدا رەد بووین، گوتم ئەوە ماڵەکەی من و ماموٚستا زەبیحی یە، منیش گلەیەکم لە خۆم و خۆی کرد کە تا ئێستا لە عاست ماموٚستا زەبیحی ئاوا بێدەنگ بووین! گوتی حەقتە کە چووینەوە بیرم بێنەوە با شتێکی بۆ بکەین! بۆ خەڵق زۆر کەس یادی دەکرێتەوە؟! ئەوە شەهیدە، ئەوە شاعیرە، ئەوە... هەموو یادیان دەکرێتەوە، خۆ هەموو دەهێنن یادیان بکرێتەوە بەڵام بەداخەوە ئەوەی خۆی کەسێکی نەبێ و کەس و کارەکەی وەبیر حیزبەکە نەهێنێتەوە لە بیر دەچێتەوە! حەتا وتم مام جەلال ئەگەر ماموٚستا زەبیحی کەس و کارێکی هەبێ دەبێ من و تۆ بین! ئێمە باشی دەناسین رەنگە ئەو خەڵکە وای نەناسن با حەقی خۆی بدەینێ، وتی حەقە، بیرم خەرەوە. ئیتر هەر رێک نەکەوت و کەوتینە گێژاوێکی واوە! منیش نەمدەویست هەر کۆبوونەوێکی یەک رۆژە بێ و بەس! خوا هەڵناگرێ دوکتور کەماڵ فوادیش هەر یەک لەو کەسانەیە کە لە بیرێتی هەروەتر ماموٚستا برایم ئەحمەد. من لە بیرمە لە تەموزی ١٩٩١ پاش راپەرین ماوەیەک

من لە "بۆلێ" بووم لە قەندیل لای برادەرانی حیزبی دێمۆکرات، شەهید دوکتۆر سادقی شەرفکەندی مابوو، هاتینە سەر باسی کاک هەژار و مامۆستا زەبیحی و قسەی خۆش و گاڵتە و پەیوەندییان بە یەکەوە، بەو بۆنەوە من گلەیم لە وان کرد، کاتی خۆی لە گەڵ دوکتۆر قاسملوی شەهید باسم کردبوو کە دەبوو جۆرێکی تر حیزبی دێمۆکرات لە گەڵ مامۆستا زەبیحی رەفتار بکا! هەرچەند خوا حەقە قەت رای خراپیان نەبوو لە سەریی. مامۆستا زەبیحی خۆی حەزی لە شتی نەهێنی و خۆشاردنەوە و شتی خۆی دەرنەخا بوو! رەنگە خەڵق هەبێ قسە بکا بەڵام بە نیسبەت حیزبی دێمۆکراتەوە قەت شتی خراپم نەبیستووە، یەعنی ئەو تۆهمەت و شتانە کە خەڵق دەیدا بە پاڵیانەوە، بەپێچەوانە رەنگە ئەوان رازی نەبووبن چون کە ئەو هاتەوە زیاتر لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەدین و کۆمەڵە و ئەوانە بوو، جا کە من گلەییم لێکردن مامۆستا برایم ئەحمەد وتی زەبیحی کورد بوو بە مەعنای کورد، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانە، هاتە سوریا لە دامەزرێنەرانی پارتی دێمۆکراتی کوردی سوریا بوو، هاتە عێراق لە گەڵ پارتی دێمۆکراتی عێراقا بوو، رەنگە ئەگەر ئێستا مابا لە گەڵ برادەرانی باکور بایە چون مزاجی لە گەڵ وان یەک دەهاتەوە و ئەگەر رێک بکوتبایە لە گەڵ ئەو برادەرەی باکور (عەبدوڵڵا ئۆجەلان) مزاجی زۆر لە گەڵ وان دەهاتەوە! مامۆستا زەبیحی ئەو کوردستانیی تێدا بوو لە ئیشا لە کارا....

دوایە ئەوان گیران و چوونە سوریا. من ساڵی ١٩٥٦ سەرەتا بە ئیشێک چووم بۆ سوریا، کۆنگرێکی قوتابییان هەبوو کە لەوێوە بچم بۆ پراگ کە رێ نەکەوت و مانگێک مامەوە، لەوێ لە نیزیکەوە ناسیم چونکا پێیان وتم کە زەبیحی لەوێیە تەنانەت لە بیرمە کاک محەمەد تۆفیق وردی وتی لەوێ ناوی عیسایە. لەوێ برادەرێکی کۆمۆنیست هەبوو پێشانی دام، پاشان بەیەکەوە چووینە ماڵی رەوشەن خان، لە گەڵ رەوشەن خان زۆر رێک بوو، لەسەرەتاوە لە گەڵ قەدری بەگیش نێوانی باش بوو. لەوێ وەک هەموو بەزمی کورد بنەماڵەکان رەنگە تۆزێک ناکۆکی و فلانیان هەبێ، ماڵە بەدرخانەکان گەورەن، دیارە لە تاریخی کورددا زۆر شتیان کردووە و کورد نابێ کەس نییە ئاوا رەمز و نیشانەکانی خۆی سوک بکا! لەبەر ئەوە ئەمن بە عەقلی ئێستا وا دەڵێم رەنگە ئەو

سەردەم ئاوا نەبووبم لە گەڵ ئەوە نیم شتی بچوک گەورە بکرێتەوە، هەر کەس شتێکی شەخسی و فلانێکی هەیە، ئەو ناکۆکییانە هەبوو بەس ئەو زۆرتر لە گەڵ ماڵە ڕەوشەن خان تێکەڵ بوو هەرچەند قەدری بەگ کە بەرامبەر بە ماڵە بەدرخان بوو بەڵام قەدری بەگ بە ویجدان و بە ئینساف بوو، قەت قسێکی خەراپی بەرامبەر بە ماڵە بەدرخان نەکردووە، ئەکرەم بەگی ئامۆزای هێندێک تێبینی لەسەر کامەران بەگ هەبوو وە تێبینیەکان عیلمیش بوون کە ئەوە حەقی هەموو کەسێکە.

لە گەڵ مامۆستا زەبیحی چووینە ماڵی ڕەوشەن خان و مانگێک مامەوە و ئەو هانی منی دا کە تۆ بۆ ئەڕۆیتەوە؟ وتم ئەمن دەرۆمەوە، لە پۆلی دووهەمی کۆلێجی پەروەردە دەرکرابووم، ماوەیەک مەعلیمیم کرد لە قەڵادزێ، لە قەمچۆغە، لە سلەیمانی، وتی وەرە بخوێنە و لێرە خوێندنەکەت تەواو کە، من دەبوو بچمەوە شەهادێکم هەبوو کە ئی پۆلی دووی کۆلێجی پەروەردە بوو ئەوم بۆ بە جێ هێشت، لە گەڵ ڕەوشەن خان خەریک بوون و خەبەریان بۆ ناردم کە وەرە ئەوە وەرگیراوی! ئیتر ئەوە بوو کە من وەزعێک هاتە پێش و رام کرد و لە مانگی تشرینی یەکەمدا چوومەوە.

جا ئەوە من هاوین ئەوم لەوێ ناسی، کاک جەماڵ نەبەزیش لەوێ بوو بە سەفەر هاتبوو.

**عەلی:** ببورە کاک دوکتور ئێوە دەزانن کە ئەو چۆن خۆی دەرباز کرد بۆ سوریا لە عێراقەوە؟

**دوکتۆر:** با! چونکا خۆی ئەیگێرایەوە، ئەو کە گیرابوو کەسێکی خەڵکی سلەیمانی کە ناوی عەلی مەلا شەریف بوو کە ئەو ناسیوێتی و لە ئەمباسی بەیەکەوە بوون ببوو هۆی گرتنیان، کە گیرا حەولێکی زۆریان بۆ دابوو، کاکەی حاجی مەحموود لە کەرکوکەوە، دیارە دەستی مامۆستا برایم ئەحمەد هەبوو لەوەدا کە حەولیان بۆیدەن، مەسەلەکە گەیشتبووە سەعید قەزاز و ئەویش وتبووی هەر ئێعترافیان نەکردبێ کە کێن بەریان ئەدەم کە وەزیری ناوخۆ بوو، دیارە ئیتر تا سەعید قەزاز فریا ئەکەوێ ئەوان ڕەوانەیان کردبوونەوە! ئەو سەردەم لە خانەقینەوە خەڵق ڕەوانە ئەکرا، لە خانەقین هەموو ڕۆژ ئێرانی و فارس دەهاتن دەچوون بەرەو نەجەف و کەربەلا بە بێ پاسپۆرت و ئەوانە.

ئەمن خانەقینم دیوە ئەو سەردەم هەمو رۆژێ ٧٠ - ٨٠ کەسیان بە پەت ئەیان بەستنەوە و دەیان بردن لە سنور فڕەیان دەدان، ئەوانیشیان کە هێنابوو ئاوا فڕەیان دابوونە ناو دیوی ئێران، کە هێنابوویانن ئەوراق و شتەکانیان بە وەسیلەی دیکە ناردراوە یانی ئەمنی عێراق ناردویەتە هینی ئێرانی بە ڕێگای سەفارەتەوە بۆ تاران بەرێ کراوە. ئەوان کە ئەیانبەن هەر یەکسەر لە کرند و قەسری شیرین تەحقیقیان لە گەڵا نەکەن! وتی من تێگەیشتم وەزعەکە چۆنە! لێیان پرسیبوو تۆ چی ئەکەی لەوێ؟ وتبووی من ئیشم دەکرد لەوێ. لە کەیەوە لە وێی؟ لە سالی ٤٥ و ٤٦وە. بووی بە عێراقی؟ نەخێر، ئێمە تەرکی تەبەعیەت ناکەین لە ئێرانی! وتی ئافەرین لەو وەختەوە لەوێی تەرکی تەبەعیەتت نەکردووە فەرموون بڕۆن ئافەرین!

وەڵا هەر دووکیان بەر دابوون. وتی وەڵا یەکسەر سوار بووین بەرەو سنە و بەرەو مەریوان و حودوودی عێراق و هاتینەوە عێراق!

کە هاتنەوە دیارە وەزعی شێخ لەتیف ئەوە نەبوو کە جارێکی دیکە بیان گرێتەوە، دەزانی بۆ خۆت کە لە پێشدا ماوەیەکی زۆر لە مالی شێخ لەتیف بوون، کە هاتبوونەوە عێراق کاک حەسەن قزلجی مابۆوە لە عێراق هەتا شۆڕشی تەموز، حەتا دەیگوت کاک حەسەن ئەو بەزمی را کردن و رۆیشتن و...ی پێناکرێ و خۆی چووبوو بۆ سوریا.

**عەلی:** لەوماوەیەدا هەمووی لە گەڵ کاک حەسەن بووە لە تەحویل دانەوە و هاتنەوە و...؟

**دوکتۆر:** بەڵێ هەمووی پێکەوە بوون هەتا گەیشتوونەوە عێراق، ئەویش رای لەسەر کاک حەسەن زۆر چاک بوو بەڵام دەیان وت کە کاک حەسەن تاقەتی ئەو هەڵاتن هەڵاتێنو و هینەی نەبووە. جا سەیر ئەوەیە بە داخەوە بەعزە بریار کە دەدرێ، زۆر کەس کاک حەسەنی بە ترسەنۆک دادەنا! کە چی کاک حەسەن ئەو برادەرانەی کە دەزانن لە حەپسخانەی ئەوین لە هەمووان مەردانەتر و ئازایانەتر مرد! برادەری خۆمان هەیە کە لە گەڵی بووە!

جا مامۆستا زەبیحی خۆی شارەزا بوو هاتبۆوە موسڵ و لەوێوە هاتبوو سوریا، گوندێک هەیە نیزیکە، چووبوو ئەوێ کە پێی دەڵێن توربەت سپی. توربەت سپی ئی

ماڵی حاجۆیە، ئەوسەردەمە حەسەن ئاغا حاجۆ مابوو ئەو گەورەیان بوو، کوڕی حاجۆ ئاغا بوو، پیاوێکی گەورە و سەردەمێک لە پارلمانا بوو، شەخسیەتێکی ناسراوی ناو سوریاشە، کوردێکی ساغ و پاک و... بوو. کۆمەڵێک کورد هەبوون لە سوریا لەو بابەتە کە حازر بوون هەرچی مولک و ماڵە بیدەن لە پێناو کوردایەتی یەوە! مامۆستا زەبیحی کە هاتبوو و گوتبووی فلانم، حورمەتێکی زۆریان گرتبوو و یەکسەریش جنسیە و شتیان بۆ پەیدا کردبوون بۆ ئەویش و مامۆستا هەژاریش. ئی ئەو بە ناوی عیسا عەرەفاتەوە بوو و ئی مامۆستا هەژاریش بە ناوی عەبدولڕەحمان محەمەد ئیبراهیم بوو، جا حەسەن ئاغا چووبوو خۆی شاهیدی دابوو کە ئەوە قەبری باوکێتی و ئەوە خەڵکی ئێرەیە! مامۆستا زەبیحی یەکسەر بە ناوی "عیسا عەرەفات"ەوە هاتبوو بۆ شام و مامۆستا هەژار لە توربەت سپی مابۆوە و جارجار هاتووچۆی دەکردین. من جاری دووهەم لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦دا کە چوومەوە سوریا و چوومە دانیشگا ماوەی چەند رۆژێک لە هوتێل بووم، دوایە خوا هەڵناگرێ رەوشەن خان جەمشیدی کوڕی نارد و جانتا و مانتای بردەوە ماڵی خۆیان، تا ئیتر حەفتەیەک دوایە وتم مەمنونتانم و لە گەڵ مامۆستا زەبیحی ژوورێکمان گرت لە گەرەکێک پێی دەڵێن "زوقاق سخر" لەوێ لە شوقەیەک بووین و ژوورەکانی تریش هەر قوتابی دانیشگا بوون. ماوەیەکیش برادەرێک هەبوو لەو ئاخریانە لە سلێمانی کوشتیان حاکم بوو، بەلای منەوە بە غەدریش کوشتیان، ناوی عومەر محێدین شەریف بوو، ئەویش ماوەیەک هاتە لامان بەڵام ئیتر مامۆستا زەبیحی تاقەتی ئەوی نەبوو، ئەیوت منالە و ئەمن ناتوانم لە گەڵ ئەوە ئیدارە بکەم. عومەریش ژیانی لە ئێمە باشتر بوو ئەو لاتی و نەبوونەی ئێمەی بۆ تەحەمول نەدەکرا، خۆی جیا بۆوە و بەس هەر برادەرمان بوو هەتا مردنیش!

دوایە چووینە شوێنێکی تر لە گەڵ مامۆستا زەبیحی لە جادەی "شارع قائل فازل" نیزیک پارلمان، ئیتر بۆ ماوەیەک لەوێ بووین، ئەو ئاخریانە چووم شوێنەکەم دیبەوە، بووەتە شتێکی تر. ئیتر هەمووی پێکەوە بووین، ژیانێکی سەیر رەنگە کەمتر دوو برادەر ئاوا بووبن! لە ماڵەکە هەموو شتێک مللی کرابوو، تەنیا ئەیوت جەناب گۆرەوی، فانیلە، جلی ژێرەوە نابێ! ئەوە بۆ سیحەت باش نییە! جا زۆر پاک و تەمیز بوو، گوێی

ئەدا بە پاک و تەمیزی و خاوێنی لەو پەری نەبوونیدا! دەیگوت جەناب پاک و تەمیزی بە بوون و نەبوونی نییە، ئەوە کراسێکە و دەیشۆم! بۆ بە پیسی لە بەری کەم؟! جا کراس، قات، بۆینباغ و... هەموو شت یەک بوو، لە پارە ئەوە هیچمان ئەو توانایەمان نەبوو، ئەو جاروبار یارمەتێکیان پێدەکرد ئەو ماوەیە مام جەلال لەوێ بوو شتێک یارمەتی ئەو و هەژاری دەدا، منیش لە دانیشگا شتێکیان دەدامێ و لە ماڵەوەش شتێکم بۆ دەهات بەڵام نیتر کەمترین و حەدینەقەلی ژیان بوو. بەیانیان بیوو عادەت کامان هەستابا چامان لێدەنا و دەچووین نانێک شتێکمان دەکڕی و یەکترمان هەڵنەستاند. جا لە گەڵ کاک عومەر بۆیە پەست بوو کە ئەو ئیشی نەدەکرد، رۆژێک هاتمەوە دیتم ئەوە فێری دەکا، ئەیوت ئەوە پریموسە، ئاوا هەڵ ئەکرێ، ئاوا ئاوی وەسەر دەندرێ، ئاوا شەقارتەی لێ ئەدەی و ئاوا... چایەکی پێ لێنا و وتی جا فێر بە تۆش بەیانیان کە هەڵ ئەستی ئیتر تۆ چا لێ ئەنێی و ئەچی بە نان ئەڵێن "خبز" بە عەرەبی بە ماست ئەڵێن "لبن" و وتی فێر بووی؟! وتی بابە دەزانم، دەزانم... (بە حاکم عومەر مەشهوورە لە سلەیمانی کوشتیان، برادەرانی... دەی... کورد...). جا مامۆستا بە منی وت کە من نایکەم و لە گەڵ ئەوە ناژیم مادام ئیش ناکا! وتم دە لێی گەرێ گەنجە و منالە و ئاوا فێر بووە، قەی چ ئەکا با ئێمە چای بۆ لێبنێین و ... وتی بۆ جەناب ئەمن هاتووم بۆ شام کوردایەتی بکەم یا دائیرەیی عومەر بکەم؟! (پێکەنین)

ئیتر لە گەڵ عومەر لێک جیا بووینەوە. جاری واش هەبوو لە سەر سیاسەتەکە لە گەڵ یەک تێک دەچووین، ئەو کە هاتبوو لە توربەت سپی کۆمۆنیستەکانی دیبوو و ئەوان ئەو بایخەیان پێنەدابوو کە دەبو پێی بدرێ و یان خۆی بە خۆی ئەدا، وای خەیال ئەکرد کە هات بۆ شام کۆمۆنیستەکان بە دوایدا ئەگەرێن و چی ئەکەن و چی ناکەن، هەڵوێستی حیزبی کۆمۆنیستی سووریاش کە هێندە نیزیک نەبوو لە مەسەلەی کوردەوە ئەوەی پێناخۆش بوو ئیتر کەوتە ناو کۆمەڵی کوردەکانەوە، قەدری بەگ و مەمدوح سەلیم و دوکتۆر نافیز و... و کۆنەکان و ئەوانەی لە شۆڕشی شێخ سەعیدوە هاتبوون، لە سووریاوە، لە خۆیبوونەوە، لە کۆمەڵی هیوی ببوون و ... ئەو شەخسیەتە کوردانە و گەورانە و ئەو جەوە نەک مزاجی کوردەوارییەکەی لێ نەدەشێواند بەڵکو زیاتریشی دەکردا ئەویش کە

هەر لە سەرەتاوە و تا دوایەش خۆی سەر بە بیری مارکسی و ئەوانە دەزانی بەڵام لە گەڵ ئەوەش لای کوردایەتیکەی بە هێزتر بوو، ئەمن ڕاستە لە ناو حیزبی کۆمۆنیست مامەوە بەڵام قەت کۆزمۆپۆلیتی نەبووم. جا ئەو وەزعە وای کرد کە لە کۆمۆنیستەکان عاجز بێ و هەتا وای لێکرد کە ئەو کتێبەی "ڕەدی کۆزمۆپۆلیتی" بنووسێ! ئەوە دەبوو بە دەنگە دەنگمان لە سەر ئەوە، ئێمەش دەزانی کە حیزبایەتیکە بوت پەرەستی بوو، حیزبەکەی خۆت نابێ کەس قسەی پێ بڵێ! دەبوو بە هێن لە بەینمان و قسەمان بە یەکەوە نەدەکرد بەڵام بەیانیان هەر عەینی حیساب بوو، ئینجا مەسەلەی پارە ئێستاش عیبارەتەکانیم لە بیرە لە پڕ ڕۆژی وا هەبوو ئەیوت "جەناب پارەت پێیە"؟! کە ئەیوت "جەناب" دەمزانی کە ئەوە پارەی پێیە! ئەموت نەوەڵا ئەیوت دەباشە ئەمن بیست لیرەم پێیە (لیرە وەک سەد فلسی لای خۆمان بوو ئەو دەم شت بوو) ئەوەندەی بۆ تۆ! ڕۆژی وابوو ئەیوت "هەتیو پارەت هەیە"؟! ئەوە دەمزانی کە پارەی پێ نییە دەمگوت ئەوە مەسەلەن دە لیرەم پێیە، ئەیوت بێنە پێنجیی! جاری وابوو بە حەفتەیەک هەر ئەوەندەمان قسە دەکرد بەس لە یەکیش جیا نەئەبووینەوە! دوایە ئاشت دەبووینەوە یانی ژیانەکەمان ئاوا بوو بەیەکەوە، بەمجۆرە تا دوایەش دۆستایەتیکەمان هەر ما جا دێمەوە سەری کە بەڕاستی نموونەی وەفا و هێن بوو!

ئەو لە ماوەی کوردستانی ئێراندا ئەوەی من ئاگادار بم کە هێندێک لە یادداشتەکانی خۆیم دیوە، ئەوەی کە من چەند جار گێڕاومەتەوە حەتمەن ئەو ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بووە کە لە ژ.ک وە هاتوون بۆ حیزبی دێمۆکرات بەڵام خۆی تاقەتی بەعزە ئیشێکی تایبەتی نەبووە، حەتا ئەوە کە لە سۆفیا لە گەڵ کاک حەسەنی قزلجی یەکترمان گرتەوە و ئەو لە ڕادیۆ پەیکی ئێران بوو و من لە ڕادیو دەنگی گەلی عێراق بووم دائیمەن باسمان دەکرد، مەسەلەن دەموت کاک حەسەن ئەگەر کورد حکومەتی هەبێ بە مامۆستا زەبیحی بڵێین سەرۆک وەزیران بێ یان مودیری ئەمن بێ کێهەیان دەکا؟ دەی وت مودیری ئەمن! چونکە شتی نەهێنی تێدایە و حەز دەکا بە شتی نەهێنی و ...! جا ئەو لەوێ لە جەمهوریەتدا دیارە برادەرانی ئەوێ باشتر دەزانن کە ئیشی چ بووە، حەتا هێندێک دەڵێن لە وەزارەتەکەدا تێدا بووە بەڵام نا تێدا نەبووە، خۆی

وا بڵاو ببۆوە کە وەزیری خاریجەیە چون هاتووچۆی کردووە حەتا شێعرێک هەیە، مەلایەک هەبووە هەجوی جەمهوریەتی کردووە جا مامۆستا زەبیحی و مامۆستا هەژار هەموویان لەبەر بوو ئەوەندەی لە بیرم مابێ ئاوایە:

| | |
|---|---|
| حاجی و بابە شێخ یەکجار شەرورن | نە فینووفورە نە فینووفورە |
| زەبیحی زار زل وەزیـــری خاریـــج | نە فینووفورە نە فینووفورە |

جا مەلا ئەو بەزمەی پێوتوون، کاک هەژار ئەیوت تەنیا کە باسی من و هێمن کراوە کابرای مەلا وتوویەتی چونکا باوکیان پیاوی چاکە من زەمی ئەوان ناکەم! کاک هەژار ئەیوت بە خوا وانییە زانیویتی من و هێمن بێحەیاین و جوابی ئەدەینەوە و بۆیە باسی نەکردووین!

جا مەبەستم چییە ؟! ئەوەیە کە لای خەڵکەکە ئەو وەزیری خاریج بووە چون حکومەتەکە بە ئاشکرا وەزیری خاریجەی نەبووە! جا ئەوە بە رای من "جەمهوریەتی مەهاباد" کە زۆر کەس باسی دەکەن، خۆی حکومەتەکە "جەمهوریەتی کوردستان"ی وتووە. کۆماری مەهاباد و جەمهوریەتی مەهاباد و... وجوودی نییە لە نووسینەکانی خۆیاندا. دووهەم لە لای سۆڤیەتییەکان "جەمهوریەتی کوردستانی ئۆتۆنۆم" دەنووسن لە بەر ئەوە لە بەرامبەر ئێراندا بڵێن ئەوە دوو جەمهوریەتی خودموختاریە کە کورد و ئازەری بۆخۆیان دایانناوە یانی دژایەتی سەربەخۆیی ئێران و ئەوەیان نەکردووە و شتەکە لە ناو ئێراندا بووە! جا چونکا نەیان ویستووە کە بڵێن حکومەتەکە لە ئێران جیایە وەزیری خاریجەیان دانەناوە بەڵام وەک دەڵێن زەبیحی وەزیری خاریجە بووە هەرچەند حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی وەزیری دیفاع بووە!

وابزانم جارێکیش لە سەردەمی کۆمار گیراوە و دوایە بەر بووە، جا ئەو لە یادداشتەکانی کە دەینووسی ئەو شتانەی زۆر تێدابوو، شتی بە نرخی تێدابوو.

لە سەرەتاوە کە هاتە عێراق بە هۆی شێخ لەتیف نیزیکی پارتی بوو، لە سەرەتاوە لە گەڵ شیوعێکانیش دۆست بووە ئەودەم کە من نەمناسیوە بەڵام خۆی نەیگێڕاوە کە لە

سیتەک بووە چاپخانەیەکی پارتی هەبووە کە ئەودەم ڕۆژنامە نهێنییەکەیان کە ڕزگاری بوو پێ دەردەکرد ئەو بەشێکی هەر لە دار درەخت و ئەو شتانە تیپی بۆ دروست کردووە، وەختی خۆی حوزنی موکریانی لە ڕەواندز کردوویەتی و لە دار بەڕو تیپی دروست کردووە، جا ئەویش عەینی شت کردوویەتی! چاپخانەکە لە لای شێخ لەتیف بووە دوایە شێخ لەتیف بە هەر سەبەب لە گەڵ پارتی و مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا و ئەوان تێکچووە ئەوەش ڕەنگە هێرشی شیوعێکان بووبێ کە دەیان گوت حیزبی دەرەبەگە و ئەوەتا ئەوە کاکە زیاد جێگری سەرۆکە! تەبعەن بارزانی لەوێ نەبوو ئەودەم لە سۆڤیەت بوو باسی ئەو نەبوو، مادام لە سۆڤیەت بوو شیوعی لە لایان گەورە بوو چون لە سۆڤیەت بوو! جا باسی بارزانیان نەدەکرد بەڵام باسی شێخ لەتیف و کاکە زیادیان دەکرد کە ئەوە چۆن حیزبە؟! ئەوە حیزبی دەرەبەگە و...! شێخ لەتیفیش وەکوو ئەوان ئەیانگێڕایەوە هەڵبەت ئێمە خەڵکی سلێمانین و دەیناسین بەڵام بەڕاستی نموونەی نیشتمانپەروەری و پیاو چاکی بووە، کاک حەسەن و مامۆستا زەبیحی شتی سەیریان لێ ئەگێڕایەوە! ئیتر شێخ لەتیف لە گەڵ پارتی تێکچوو و چاپخانەکەش مابۆوە و مامۆستا زەبیحی ژمارەیەکی نیشتمانی پێ دەرکرد.

**عەلی:** کاک دوکتۆر ئەوە بە ڕای من شتێکی مووهیمە لەسەر ئەو "نیشتمانە" چونکا ئەگەر ئەوە ڕاست بێ تۆزێک لە بۆچوونەکانی مێژوویی دەگۆڕدرێن، ئێوە تا چ ڕادەیەک ئاگادارن لە دەرکردنی ئەو ژمارەیەی "نیشتمان"؟

**دوکتۆر:** من خۆم دیومە و خۆشیان باسیان دەکرد، خۆی مامۆستا زەبیحی مەسئولی نیشتمان بووە کە لە تەوریز دەری کردووە و ئەمن ئاگاداری ئەو شتانەم. مامۆستا زەبیحی ئەو ژمارەیەی نیشتمانی لە سیتەک دەرکردووە و هێرشی بۆ سەر پارتی و کاک هەمزە عەبدوڵلا و ئەوانە تێدا بوو، حەتا ئەمن پێمدەگوت تۆ چۆن حەقت هەبووە ئەوە بکەی؟! ئەوە نی حیزبێک بووە و تێکچووە، ئەوە نی ژ.ک بووە و نی حیزبی دێمۆکراتیش نەبووە! ئەوە دوای هاتنی حیزبی دێمۆکرات بڕاوەتەوە و تەواو بووە! بەس ئەو حەقی بە خۆی داوە و نیشتمانی دەرکردووتەوە! بەڕێوەڵا لە بیرمە ژمارە ١٠ی دەرکرد، لێم پرسی باشە چیت لە سەر نووسیبوو خۆ ژ.ک نەمابوو! وتی لێم نووسیبوو "ئۆرگانی نەهزەتی مقاوەمەت" ئەمن خۆم دیبووم بەڵام ئەوشتانەم لە بیر نەمابوو لە سوریا لێم

پرسی، بەو حیسابە کە ئەوە مقاومەت هەیە و شۆڕش درێژەی هەیە لە کوردستانی ئێران بەس کۆمەڵێک پلاریشی لە سەر پارتی تێدابوو! ئەوانیش هاتن پارتی ئەوکات دوو رۆژنامە بڵێین بلاوکراوەیان هەبوو یەک "رزگاری" بو ئەویتریش بڵێین بلاوکراوەی داخیلی بوو ئی ناوخۆی پارتی ناوی "مرۆڤ" بوو جا "مرۆڤ" ژمارە ٢ی هێرشی لە سەر ئەو نیشتمانە تێدابوو "نیشتمان لە دەوری دووهەمیدا ئەبێتە زمان حالی کۆمەڵێک ئاژاوەچی"

**عەلی:** ئایا "مرۆڤ" یان ئەو "نیشتمانە" دەست دەکەوێ؟

**دوکتۆر:** وەڵا ئێمە بەداخەوە وەک شەخسیش پاش شۆڕشی تەموز ئەو هەستی ئارشیو گەریمان نەبوو ئەگینا زۆر لەوانە لە ئارشیوی ئەمنی عێراقیدا هەبوو رەنگە ئێستاش مابێ چون ئەمنی بەغدا و ئەوانە نەسوتاوە، ئی سلەیمانیە و هەولێر و ئەوانەمان سوتاند! جا رەنگە ئێستاش ئەگەر کەسێک هەبێ و بگەرێ لە ئەمنی بەغدا هەبێ. من خۆم پاش شۆڕشی تەموز بە مجەلەد کراوی رۆژنامەی"ئازادی" (ئەهێنی حیزبی شیوعی) کاک جەمال حەیدەری دایمێ و وتی رێکی خە، ژمارەکان بە یەکەوە رێک نەکرابوون، رێکم خست و ئەشم پرسی ئەوەت لە کوێ بووە! لە یەکێکیان نووسرابوو کە ئەوە لە لای کەمال عەلی باپیر گیراوە، بە وەیرا زانیم کە ئەوە لە ئەمن دەست کەوتووە و دراوەتەوە بە حیزبی شیوعی! جا رەنگە ئەوانە هەموو هەبن هەم "نیشتمانەکە" و هەم "مرۆڤ" بەڵام لەوە تەئکید بە کە ئەوە دەرچووە و هەیە و خۆم دیومە!

جا ئەوە کە چەند جارم گێڕاوەتەوە و من لە خۆی مامۆستا زەبیحیم بیستووە کە هاتوون بۆ عێراق وتی تەنیا یەک ئۆتۆمبێلی جیپمان مابوو، سوپای ئێران نازانم سەرهەنگ غەفاری بوو کێ بوو هاتبوو نیزیک مەهاباد ببۆوە، وتی چوومە خزمەت قازی و وتم تۆ لە گەڵ مەلا مستەفا نەچووی بۆ سۆڤیەت، ئەوە کە مەلا مستەفا چووە بۆ لای پێشەوا و پێی وتووە هەموو دەزانن، وتی نوری سەعید بە رێگای بابەکر ئاغای پشدەرییەوە خەبەری بۆ بابە شێخ ناردبوو کە ئەو و قازی محەمەد دەتوانن بێن بۆ عێراق و ببن بە پەنابەر، وتی پێمووت بە قازی تۆ بۆ سۆڤیەت نەچووی، فەرموو ئەوە یەک ترومبێلی جیپمان ماوە فەرموو سوار بە و دەچین بۆ عێراق، وتی قازی پێکەنی و وتی

رەحمان شورەوی شورەوی منە پێش ئەوەی شورەوی مەلا مستەفا بێ، من چوومە باکۆ و چوومە کوێ و ...، پەیوەندی قازی و شورەوی و حەتا لە قازی فەتاح و تەزار و ... دەزانی، وتی شورەوی ئی منە بەڵام بە یەک سەبەب ناچم! من بڕۆم ئەرتەشی ئێران دێن دەرپێ لە پێی ژنە سابلاغی دادەکەنن! من بۆ دیفاع لەو خەڵکە دەمێنمەوە و هەموو شت ئەهێنمە سەر شانی خۆم بەڵام تۆ مەمێنەوە و بڕۆ! وتم نا ئەمێنمەوە لە گەڵتا چۆن بە جێت دێڵم! وتی نا تۆ دەبێ بڕۆی! من دەمکوژن نامکوژن هیچ نییە رەنگە نەشمکوژن! ئیتر ئەوە بوو چوو مەحکەمە و هەموشتی بە سەر خۆی و حەمە حوسێن خانی ئامۆزای داهێنا! بەڵام وتی یەک شت ئەڵێم بۆ تاریخ نەک بۆ تەنبێ نەکردن و شتی وا سەدری برام ئاگای لە هیچ نییە ئەوەش بۆ تاریخ نەک بۆ پارانەوە بۆی!

بەمجۆرە ئیتر هات بۆ کوردستانی عێراق و یەکسەر چوو بۆ لای شێخ لەتیف و لە لای ئەو بوو هەتا شێخ لەتیف نەفی کرا بۆ حیلە و وەزعی وانیش تێکچوو لە ساڵی ١٩٥٠.

مامۆستا زەبیحی حەتا زۆر لە موشکیلە و ئاڵۆزی ناو خانەوادەی شێخ لەتیف، ناو خێزانی و... ئاگادار بوو، بەعزە شتێک هەیە زۆر شەخسی یە بۆ گوتن نابێ دەنا زۆر شت ئاگادارم کە حەتا لە بەینی مەسائیلی خێزانی شێخ لەتیفدا حەل و رەبت و ئەوەی کردووە! جا ئەوە لە گەڵ شەخسییەتەکەی شتێکی زۆر سەیرە، ئەوە دەزانین کە ئەویش ئینسان بووە و ئەوە نەبووە کە نەفس و فلانی نەبووبێ بەڵام بە پاکی بووە، زۆر پاک بوو لە سەر ئەو شتانە! قەت موومکین نییە کە لە ماڵێک بووبێ چاوی بە جورێک گیرابێ، زۆر پاک بووە لە سەر ئەو شتانە بۆیەش زۆر لە ماڵی شێخ لەتیف نیزیک بووە.

جارێک رەحمەتی قەدری جان هات وتی ئەوە بۆ ژن ناهێنی؟! وتم جا بڵێم چی؟! فەقیرە پارەی لە کوێ بوو؟! ماڵی لە کوێ بوو؟! حاڵی لە کوێ بوو؟! ژنی چی؟! وتی دەئەوە من ژنێکم بۆ دۆزیوەتەوە پارەشی هەیە و خانووشی هەیە و فلانیشی هەیە و... ئافرەتێک بوو خێزانەکەی قەدری جان ئەیناسی و دراوسەیان بوو، گەورە کچێک بوو شتی زۆر بۆ مابۆوە، ئیتر کاک هەژار کەوتە بەش کردنیان هەر یەکسەر! وتی ژورێکیان بۆ من و ژورێکیان بۆ ئەو و خۆت و ژنەکەشت لە ژورێکا بنوون و... پارەکەش ئیشی پێدەکەین

(پێکەنین) کە قەدری جان هات پێیوت کە شتێکی وام بۆ دۆزیوێوە و وەرە کچەی بشبینە، خێزانەکی باش و گەورە کچە و یەکێکیان دەوێ وەک تۆ سەرپەرشتیان بکا، قەدری جان بە کچەی گوتبووش و رازی کردبوو.... پاش دوو رۆژان مامۆستا زەبیحی هات وتی جەناب قەدری جانی دۆستت دەیهەوێ من لە تێکۆشان و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بخا! وتم بۆ جا بۆ خراپە؟! وتی دەیهەوێ لە جیاتی وەی کە من بەو بەزمەوە خەریک بم بێم بەو پیرەژنەوە و بەو مالەوە خەریک بم و بمبەستێتەوە و واز لە هەموو شت بێنم! وتی پێی بلێ ئەمن بڕیارم داوە تا خەریکی ئەو بەزمە بم ژن ناهێنم و من لە سابلاغێ نەبێ ژن ناهێنم!

جا ئەو شتانەم بۆیە هێناوە کە بەراستی ئەو پیاوە جیا لە کوردایەتی و نیشتمانپەروەری بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە!

لە کۆتایی ٥٦ مانگی تشرینی یەکەم ئەمن چوومەوە شام تا پاش شۆرشی ١٤ی تەموز. ئەو ماوەیە ئێمە زۆرتری بە یەکەوە بووین و لە سالێ زیاتر لە یەک ژووردا بووین، لە یەک خانوو بە یەکەوە بووین، دوایە ئەو یەک دوو سەفەری کرد و لە بەر کرێی زۆر لێک جیا بووینەوە بەلام کە جیاش بووینەوە هەموو رۆژ یەکترمان دەدیت، چایخانەیەک بوو لەوێ دائەنیشتین، عێراقی و کوردی ئاوارە لەوێ دائەنیشتن، جاروبار تاولەشی ئەکرد، لەوێ یەکترمان دەدیت و سەردانی مالی رەوشەن خان و قەدری بەگ وئەوانەمان دەکرد.

بەس لە رووی سیاسییەوە ئەودەم کە من لەوێ دیم لە سوریا ئەو خۆی هەر بە مارکسیست ئەزانی بەلام زۆر لە گەلێ هێلێ و خەتەکەی خرۆشۆفا نەبوو بە تایبەتی بەرەو پێشچوونی ناسەرمایەداری هەر زۆر هینی دەکرد. جا زۆر جار دەمان جولاند کە قسە بکا ئەی وت جەناب من لە چایخانە و شوێنی وا هێرش نابەمە سەر شورەوی بەلام کە ئاغای خرۆشۆفم دیت پێی ئەلێم کە ئەوە غەلەتە کە چۆن بە رێگای ناسەرمایەداریدا خەلک ئەبا بەرەو سوشیالیزم! قسەکانی ئەوە بوو.

بەلام لە گەلێ ئەوەشا کە لەو حالانە بووین و لە نەداری و ئەوە ئەو زۆری وەختەکەی بە خوێندنەوە دەبردە سەر، بەراستی منیش دەمخوێندەوە بەلام کەمتر لەو، زۆر جار گالتەم

لە گەڵ دەکرد دەمگوت ئەمن قوتابی دانیشگام کە چی تۆ شەو و ڕۆژ خەریکی سەعی کردنی! ئەو خەریکی دوو شت بوو ئەو دەم: کتێب! ئەوە هیچ، ئەو کتێبە مارکسیانە کە لە عێراق دەس نەدەکەوت هەمووی دەخوێندەوە، لەوێ زۆر بوو ئەو دەم کە ئێمە لەوێ بووین دیمۆکراتییەتێکی ئازاد لەوێ هەبوو، کۆمۆنیست لە پارلماندا بوون، بەرەیەکی نیشتمانی هەبوو ئەووەختە، بەرامبەر بە ئەمریکا و ئەوانە توند بوون بەڵام تەنیا بۆ کورد هێشتا زۆر شت قەدەغە بوو! ئەو خوێندنەوانەی بە دائیم هەبوو، ئەوە ئەوە. دووهەم خەریکی زمان بوو زیاتر، ئەو خۆی تەبیعی کوردی و فارسی و ئازەری دەزانی، ئەو کوردانەی ڕۆژهەڵات خۆیان باسیان دەکرد کە ئازەری مامۆستا زەبیحی لە هەموویان بە هێزترە ڕەنگە سەبەبێک هەبێ بۆ ئەوە کە ئەو خوێند بووی، مامۆستا هەژار ئەوەندەی نەخوێند بوو حەتا لە فەقێتیدا نەگەیشتبوو پلەی موستەعیدیش، هێمن زیاتری خوێند بوو بەڵام مامۆستا زەبیحی لە قوتابخانە، سانەوی تەواو کردبوو لەبەر ئەوە لە تەورێزیش ژیا بوو ئازەرییەکەی باشتر بوو و ئەشیخوێندەوە. بە هۆی سەردەمی جەمهوری روسی فێر ببوو، ئەو سەردەم خەریک بوو روسییەکەی باشتر کا لە شام، کە من نازانم چەندی روسی دەزانی چون من ئەودەم نەمدەزانی بەڵام ڕۆژێک هاتەوە زۆری لا خۆش بوو، کتێبێکی جوغرافیای عێراقی دەست کەوتبوو بە روسی، وتی ئەوە بۆ من چاکە! وتم چی بۆ تۆ باشە ئەوە جوغرافیایە بۆ تۆ بۆ باشە؟! وتی نازانی! فەرهەنگێکی فارسی - روسی هەبوو کوردی - فارسێکیشی هەبوو، ئەوە سەید عەزیزی شەمزینی بۆی ناردبوو، سەید عەزیز کۆمەڵێک کتێبی بۆ نارد، دادەنیشت بەدیار ئەو کتێبەوە چون مادەکەی ئەزانی و لەو دەرسانەی تەرجەمە من سودم لەوێدا لێ بینی! چون تۆ دەبێ دوو زمانەکە بزانی و بە تایبەت ئەو زمانەی کە تەرجەمەکەی دێنێ سەر بەڵام ئەگەر شارەزای مادەکە بی هەڵەی تێدا ناکەی، ئەو چون خۆی لە عێراق ژیا بوو و جوغرافیای عێراقی دەزانی کە ئەوە چوار لیوایە و ئەوەندە قەزایە و... هەمووی بەو پێیە تەرجەمە کرد ئەوجار کاغەزی هێنابوو هەموو قواعیدەکەی لێ دەرهێنابوو و خۆی قواعیدی روسی نووسی کە لە کوێ فێعل و لە کوێ فاعیل و لە کوێ ... دێت. کە لە کتێبەکە لێ بۆوە وتی چایەک لێنێ! وەڵا چایەکمان خواردەوە و هەر لێ بۆوە ئاوای کرد و هەمووی دڕاند و تەرجەمەکەی فڕێ دا! وتم جا ئەوە

یانی چی؟! وتی فێر بە! دەفتەرێکی دیکەی هێنا و وتی ئەوجارەش تەرجەمەی دەکەمەوە! جا فێعلەن جاری دووهەمیش تەرجەمەی کردەوە نازانم ئەو کتێبە چی لێهات؟! جا سەیری ئەو زەوقە لە سەر زمانا! جاری دووهەم ویستبوی خۆی بە تاقی کاتەوە!

فەڕەنسییەکەش کە ئەوە لە لای مامۆستا گیوی موکریانی خوێند بووی ئەوکات کە مامۆستا گیو چووەتەوە سابلاغ. جا ئەوە دەیوت کە مامۆستا گیو زانی کە ئەوە من بەڕاست فێر دەبم دەری کردم! هەمووانی دەر کردبوو هەر سوڵتانی وەتەمیشی مابوو، وتمان با شتێکی لێ بکەین ئەویش دەرکا! کتێبێکی سوڵتانم وەرگرت لە کتێبەکە نووسرابوو "گیو" نوقتەیەکم بۆ کرد و کردمە "کپو" جا مامۆستا گیو کەپۆی زۆر زەلام بوو، وەڵا کە دەفتەرەکە هەڵدەداتەوە و ئەوە دەبینێ سوڵتانی دابووە بەر شەق و ئەویشی دەرکردبوو! وتی ئەو بە لێدانیشەوە دەرکرا! (پێکەنین)

عەرەبییەکەی لە بەغدا فێر ببوو و تەرجەمەی پێدەکرد، حەتا ئێمە بە یەکەوە شتی ترمان تەرجەمە کرد لە شام. ئەو سەردەمە بۆ باری گوزەران و ژیانەکە دەستمان دا تەرجەمەی بەعزە شتێک بە عەرەبی. لە فارسییەوە ئەو ئەیکرد بە عەرەبی و منیش بە عەرەبییەکەدا دەچوومەوە، شتێک کە بزانین دەفرۆشرێ و بۆمان چاپ دەکەن. دیوانێکی لاهوتی دەس کەوتبوو، ئەبولقاسمی لاهوتی تاجیکستان، ئەو دیوانە بە تایبەت شتێکی هەیە لە سەر نەورۆز، ئەوەی کرد بە عەرەبی و منیش عەرەبێکەم چاک کرد بەڵام ئیتر بلاو نەکرایەوە و نازانم نوسخەکەی چ لێکرد. من ئەوەم لە بیرە کە مامۆستا گۆرانیش شتێکی هەیە لە سەر نەورۆز ئی "لیبرتۆیە" لە مەسکۆ پێموت شتێکی چاکت کردووە، وتی ئەوە ئی من نییە! ئەوە ئی ئەبولقاسمی لاهوتییە و من تەرجەمەم کردووە، وتم کوا لاهوتی لە کوێ گوتویەتی:

"بۆ کچە کورد ژینی دیلی ژین نییە          بە دمی دیل هەنگونیش شیرین نییە"

وتی خۆ کاکە پیاو دەبێ دەستکارێکی ئاواشی بکا! وتی باشە تۆ لە کوێ وا ئاگاداری لاهوتیی؟ وتم بابە ئێمە تەرجەمەمان کردووە بە عەرەبی! جا عەرەبێکەشی ئاوا بوو و بەردەوامیش بوو لە سەری.

ئینگلیسییەکەشی کە ئەوە دەزانی و ئەو هەستی زمانەوانەی تێدا پێک هاتبوو.

ئەو ماوەیەش کە لە کابارەی عەبدوڵلا و ئەمباسی و ئەوانە بوو لە گەڵ خەڵکی ئینگلیسی و شتی وا عەلاقاتی هەبوو و زۆر چاک بە ئینگلیسی قسەی دەکرد و ئەو هەستی زمانەوانەی بە قووەت بوو! جا ئەوە لە گەڵ هەژار دەڕۆیشتن و ناوی ئەو شتە و ئەو گەرەکو و...یان لێک دەداوە کە لە چێوە هاتووە و لێیان دەکۆڵیوە. هەژار کوردی و عەرەبی و فارسی دەزانی بەڵام ئەو زمانەکانی تریشی دەزانی و شتەکانی لێک دەداوە و زۆر جار دەیپرسی کە مەسەلەن بە یونانی یان بە ... ئەو وشەیە چییە؟ جاری وابوو بە گاڵتە وشەیەکی عەرەبی هەر لێی دەکۆڵیوە و دەیهێنا و دەیبرد پاشان دەیوت جەناب ئەوەشم لێ ئەستاندنەوە! ئەیکرد بە شتێکی دیکە و ئی زمانێکی تر و دەیگوت عەرەبی نییە!

ئەو ماوەیە خەریکی ئەوانە بوو، وەک کوردایەتی کوردایەتێکی عام و گشتی بوو و تا ٥٧ وەزعەکە ئاوا بوو، لە گەڵ کوردەکانی ئەوێ و ئەو بنەماڵانە کوردایەتێکی عامی دەس دابوویە، لە گەڵ کۆمۆنیستەکان ناکۆک بوو وە ئەوە بوو کە کتێبی "رەدی کۆزمۆپۆلیتی" لە سەر نووسین. لە گەڵ مامۆستا جگەر خوێن دادەنیشت، مامۆستا جگەر خوێن ئەودەم سەر بە حیزبی کۆمۆنیستی سوری بوو، پیاوێکی فەقیر بوو لە پڕ ئەوڕۆ ڕای دەدا سبەینێ دەیگۆڕی! خالید بەکتاش شتێکی تری پێ ئەوت و ئەمانیش رەقیان هەڵدەستاند و قسێکی دەکرد زیدی کوردایەتی! مامۆستا زەبیحی هەموو ئەو وردە قسانەی کۆ کردەوە و کردیوە بە رەد لە سەر شیوعییەکان. جا ئەوە من لە سەر ئەوە وەک حیزب حیسابێکیشم بۆ کراوە! هات وتی کتێبەکە چی لێ بکەم؟ من بە باشی نەمدیبوو، عەرەبییەکەی رەوشەن خان بۆی چاک کردبوو و ئی من نییە چون ئەو تۆهمەتەم لەسەر بوو کە من بۆم چاک کردووە بەڵام ئی من نییە! بەس من پێموت ئەگەر دەت هەوێ خزمەتی کۆمۆنیستی بکەی پێشکەشی ئەو حیزبە کۆمۆنیستانەی ئەو وڵاتانەی بکە کە کوردیان بە سەر دابەش بووە! وتی دە بۆم بنووسە! لاپەرەیەکم بۆ نووسی پێشکەش بە حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و ئەوانی تر... بەس ناوەوەی زۆری شت تێدایە ئیتر لە سوریا کرا بە هەرا! بە تایبەتی شتێکی تێدابوو کە دەڵێ دەوڵەتە عەرەبییەکان کە دوانیان وڵاتی کوردیان داگیر کردووە! ئەمە لە رووی قانوونەوە لە سوریا جزای هەیە، دەیان ویست

موشکیلەی گەورەی بۆ بنێنەوە! دوایە هەژار و عەلی فەتتاح دزەیی و من پێکەوە چووین کاک جەمالّ حەیدەری لەوێ بوو پێمان وت و ئەویش چوو لای شیوعییەکانی سوری و پێیوتن بابە واز بێنن و ئەو مەسەلەیە هێندە ناهێنێ، ئەودەمیش شیوعییەکان لە دەستگای سوریا و ئەوانە دەستیان هەبوو و ئیتر ئیشەکەیان بۆ داخست دەنا بە تەما بوون لێی گەورە کەنەوە!

**عەلی:** کتێبەکە بە کوردی تەرجومە نەکراوە؟

**دوکتۆر:** نا! بە عەرەبی یە "رەدی کۆزمۆپۆلیتی" بە نێوی "مەحموود حەسەن شنۆیی" نووسی. جا لە ٥٧ فێستیوالّی لاوان و قوتابیان هەبوو لە مۆسکۆ، کۆمەڵێک کورد لە عێراقەوە هاتبوون بە کۆمۆنیست و بە پارتییەوە. لیژنێکی فێستیوالّ لە بەغدا دروست کرابوو بە نەهێنی، لیژنەکە ٢٠ کارتیان دابوو بە پارتی کە لە ناو ئەندامانی پارتیدا بلاوی کەنەوە و پارتی ئەوانە بنێرێ، ئەوانیش زۆر کەس بە نەهێنی هاتبوون کە بچن بۆ مۆسکۆ و بە شامدا رەد دەبوون، هەر کەسێک ئەو کارتەی پێبا لیژنێک هەبوو ئی مێهرەجان لە شام دەی برد ئەی وت ئەوە ئەمن بۆ مێهرەجان ئەچم و خۆی ئەناساند. مام جەلال هات وتی ئەمن چوار کارتم لە گەلّ خۆم هێناوە، یەکیان بۆ مامۆستا زەبیحی، یەک بۆ هەژار و یەکیش بۆ سینەمی کچی رەوشەن خان و چوارەمیش بۆ من. ئەمن ئەندامی حیزبی شیوعی بووم بەلام دۆستایەتی و ئەوماوەش رای ئەسپاردبوو هێندێک ئیشیان بۆ بکەم پەیوەندی بە دەرەوە و سەعید دزەیی و... بۆم کردبوون چونکا شەخسی جەمالّ حەیدەری زۆری پێخۆش بوو و رازی بوو کە ئەو کارە بۆ وان بکەم.

من کە کارتەکەی خۆم برد ئەو برادەرە کە دوایە شەهید بو (محەمەد سالح ئەندامی مەکتەبی سیاسی شیوعی بوو) جۆرێکی جواب دامەوە! وتی خۆ ئەگەر ئێمە بمان هەوێ بتنێرین خۆمان دەتنێرین، ئێمە دەمان هەوێ ئەوانی ناوەوە جارێ بێن جا دوایە ئەوانی سوریا ئەگەر جێ ما دەتان نێرین، ئیتر پاسپۆرتەکەی من تۆزێک موشکیلەشی هەبوو وتی ناخوا و نابێ! بەلام ئەوان رۆیشتن، لە رێی سەفارەتی چێکی دوکتور قاسملو حەولێکی دا ویزای دابوونێ کە لەوێوە رەوانەیان بکا. مامۆستا زەبیحی و هەژار و سینەم خان، ئێمەش لە گەلیان چووین تا بەیروت کە لە تەیارەخانەی بەیروتەوە بەرێیان بکەین. ئەوە

بوو کە شیوعییەکانی سوری فەرقیان پێکردبوو و پێیان ناخۆش بوو کە لە ڕێگای ئەوانەوە نەڕۆیشتوون، دیارە ئەوان خەبەریان دابوو بە سەفارەتی چێکی چونکا ئێواریّ تەلەفونێکیان کرد بۆ ماڵی رەوشەن خان گوتیان ئەو سێ کەسە بێن ویزاکانیان نوقسانی تێدایە و کاغەزێکی تێدایە نەمان داونەتێ بێن بیبەن! بەڵام ئەوان گوتیان نەخێر تازە دەڕۆین، رەنگە بچین بیستێننەوە و ئەوانە! ئەوان ڕۆیشتن کە چووبوونە حودودی چێک لە ئالمانەوە گێڕابویاننەوە. ئەوان بە تەیارە خۆمان بەڕێمان کردن لە بەیروتەوە چوونە ئالمانیا و لەوێش نازانم بە سەیارە یان بە قەتار چووبوونە حودوودی چێک. هاتنەوە ئالمانیا و خەبەریان نارد بۆ شام پارەیان بگەیەننێ و فلان بکەن و چی بکەن و ئەوانە، بە حالێکی ناخۆش گەڕانەوە و نەچوون بۆ فێستیوالی مۆسکۆ! کە نەچوون و گەڕانەوە چ مامۆستا زەبیحی و چ هەژار ئەوە بەرامبەر بە حیزبی کۆمۆنیست و شیوعی دڵی شکاندن! ئیتر هەژار کەوتە ئەو شێعرانە کە زیدی کۆمۆنیستی و ئەوانە بوو، بەڵام مامۆستا زەبیحی نەکەوتە ئەوانە بەڵام ئیستا پیاو ئیستا فکری لێ دەکاتەوە ئەوکات حیزبی بووین و زۆرمان بیر لەوە نەدەکردەوە کە قەی چ ئەکا با ڕێگای دابان و بچووبان! بەس تەسک بینێکە ئاوا بوو کە ڕێگای لێ گرتن! بەس ئەمان ئامانجیان وەک قوتابی و ئەوە نەبوو، ئەوان زۆرتر لە شام کە وەزعمان خراپ بوو دەیان ویست مەلا مستەفا ببینو و ئەگەر بکرێ لەوێ بمێننەوە و ئەوانە و بۆ مەسەلەی کوردایەتیش، ئیتر گێڕایاننەوە!

جا ئەوە کۆمەڵێک قسەی خۆشیان لە گەڵ هەژار هەیە لە سەر ئەو سەفەرە، کە چووین بیانهێنینەوە تەماشام کرد کە ناو تەیارەخانەی بەیروت قەرەباڵغە و سەدان کەس وەستاوە! پرسیمان ئەوە چییە؟! وتیان ئەوە عەلی خان کوڕی ئاغا خانی ئیسماعیلەکانە، جا ئیسماعیلەکان رقیان لە شامە، قەبری ئاغا خانیش لە شاری سەلەمیەیە کە قەبری ئیسماعیل و هینەکانیان لەوێیە، ئەمە هاتووە بۆ زیارەتیان و هەموو ساڵێ کە دێ بە سەدان موریدی لێ کۆ ئەبێتەوە و بە زێڕی ئەکێشن و ئەیدەنێ و... ئەوە عەلی خان هاتووە و دەگەڕێتەوە و قەرەباڵغێکە ئەوە بوو، مامۆستا زەبیحی وتی بە خوا هەژار ئەوە خوا گەیاندی ئێستا ئەچم بۆ لای و باسی ئیسماعیلییە دەزانم و دەڵێم ئێمەش لە سابلاغ ئیسماعیلییەمان هەیە و باسی بۆ دەکەم، شتێکمان هەر دەداتێ! هەژار وتی ئاخر دەڵێم

عەقڵت وایە! ئێستا تو بچی باسی ئیسماعیلییەی بۆ بکەی پارەت دەداتێ؟! دەڵێ بێنە حەوت پشتت هیچیان نەداوە و شتێکیشت لێ دەستێنێ!

جا ئەوە لەو سەفەرە نەخۆش دەکەون و جاری یەکەم هەژار نەخۆش دەکەوێ، چون ماوەیەک بێ پارە دەبن و تا دوایە کوردەکانی سوریا پارەیان بۆ ناردن و گەڕانەوە، هەژار دەڵێ باشە رەحمان ئێستا ئەمن لێرە بمرم چم لێ دەکەی؟ مامۆستا زەبیحی دەڵێ جەناب تۆ بمری تۆ شاعیری گەورەی کوردستانی و دەت بەم لە سەر ئەو شاخە بەرزە دەتنێژم! پاش دووسێ رۆژ مامۆستا زەبیحی نەخۆش ئەکەوێ و دەڵێ هەژار من بمرم تۆ چم لێ ئەکەی؟ دەڵێ وەڵا بمری دەت خەمە ئەو تەنەکەی خۆڵێوە! چت لێ بکەم؟! پارەی ناشتنم هەیە؟!

ئیتر هاتنەوە و کە هاتنەوە هەژار چۆوە جزیرە و کەوتە ئەو شێعرانە کە هێرشە بۆ سەر شیوعی. مام جەلال چووبوو بۆ مۆسکۆ و هاتەوە کە هاتەوە ئیتر کەوتنە پارتی دروست کردن، (پارتی کوردی سوریا) پارتی وەک پارتی نەبوو تا ئەووەختە، کۆمەڵێک هەبوون قەدری بەگ و ئەوان، کۆمەڵێک لاو هەبوون پێگەیشتبوون حەمید دەرویش و عوسمان سەبری و نورەدین زازا و مامۆستا زەبیحی و ئەوانە ئیتر پارتییان دروست کرد و مامۆستا زەبیحی بوو بە نوێنەریان، ئیشی بۆ هەڵدەسوڕاندن و لەو بەینەدا سەفەرێکی قاهیرەشی کرد، کۆنگرەیەکی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا هەبوو کە لەوێ بە ناوی کوردەوە قەبوڵ کرێ بەڵام قەبوڵیان نەکرد حەتا میوانی ئەو تەها محێدین مەعروفە بوو کە ئێستا جێگری سەرۆکی جەمهوریەتی عێراقە کە ئەووەختە سەر بە پارتی بوو و زیاتر لە گەڵ کاک برایم و مام جەلال و ئەوان پەیوەندی هەبوو، حەولێکی زۆریان دابوو کە مامۆستا زەبیحی ببێ بە ئەندامی کۆنگرەکە بەڵام نەیان هێشت! بەڵام چووبوو بڵاوکراوە و شتی لە ناو کۆنگرە بڵاو کردبۆوە! خوا هەڵناگرێ رەوشەن خان بۆ ئەو جورە شتانە زۆر باش بوو، دەینارد لە بەیروت شت و متی بۆ چاپ دەکرد، ئێمە ئەودەم مناڵ بووین و ئاوامان لە سەر رەوشەن خان بیر نەدەکردەوە! مامۆستا زەبیحی و هەژار زۆریان ئێحترام دەگرت بەڵام ئێمە لە رووی سیاسی بە جۆرێکی دیکە تەماشای ئەومان دەکرد! لە رووی شەخسییەوە ئینسانێکی بە ئێحترام و خزمەتی هەموویانی کردووە، بەس ئێمەی چەپ ئەودەم بە جۆرێکی تر تەماشامان دەکرد بەڵام ئێستا کە هەست دەکەی کە کارێکی زۆری کردووە! جا

تۆ کە چووبایە ماڵی رەوشەن خان دەدیت کە پڕ بوو لە نامیلکە و بڵاوکراوە و....

ئیتر لە ساڵی ١٩٥٥وە تا شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم بەو جۆرە مامۆستا زەبیحی لە سوریا بوو. ماوەیەک لە خەستەخانەش ئیشی کرد لە گەڵ ئامبولانس دەچوو نەخۆشی دێنا و بەو هینە هەڵی دەگرتن! پێمان ئەوت کاکە ئەوە بۆ تۆ نابێ، خەبەرێک بنێرە بۆ عەبدوڵلا شەریف و ئەو خەڵکانە یارمەتیت بدەن نەیدەکرد و تا ئیش هەبایە ئیشی دەکرد! جا لەوەشەوە کەرەسەی گاڵتە بۆ هەژار دروست دەبوو! جار جار دەچوون بۆ ئەو دێهاتانە نەخۆش بێنن گۆشتی حوشتری دێناوە و هەژار دەی وت وەڵا ئیشەکەت زۆر باشە! ماوەیەک لە گەڕەکی کوردان بینایەکیان دروست دەکرد شەوانە بوو بە حەرەسی ئەوێ، ماوەیەک لە هوتێل ئیشی کرد بەڵام دوایە کە پارتییان دروست کرد ئیتر ئیشی نەدەکرد. دوایە بە دزی سەفەرێکی لای خۆمانیشمانی کرد تا موسڵ هاتبوو، چاپخانەیەک هەبوو (چاپخانەی کەرەم) کۆن جەلادەت بەگ و وان شتیان لێ چاپ کردووە، باسی ئەو دوو کتێبەی جەماڵ نەبەزم کردووە کە لەوێ چاپ کرا ئەویش بە ڕێنوێنی مامۆستا زەبیحی چاپ کرا، جەماڵی برد و ئەو دوو کتێبەی لەوێ چاپ کرد. پاشان هەژار بەیتی سەرەمەر و ئەوانەی لەوێ چاپ کرد.

ڕۆژێک ئێمە لە شام چووین بۆ شوێنێک چاپخانەیەکی بچوکی لێ بوو، وتمان وەڵا ئەوە بۆ ئیشی بڵاوکراوە و شتی وا دەس ئەدا، چووین بە حیزبی شیوعیمان وت، بە ١٠٠ دینار بوو، خستیانە پشت گوێ و گوێیان نەدایە بەڵام دوایە دەرکەوت کە مامۆستا زەبیحی کڕیبوی بۆ پارتی و گەیاندبوویەوە بۆ موسڵ و ئەو هاتەوە، دوایە لە موسڵ چاپخانەکە گیرا بەڵام کەسی پێوە نەگیرا. برادەرێکمان هەبوو دوایە بوو بە شیوعی ناوی محەمەد کەریم فەتحوڵلا بوو، تەسلیمی وی کردبوو و ئەو بەرپرسیار بوو بەس ئەو نەگیرا بەڵام چاپخانەکە گیرا.

**عەلی:** ئەو ماوەیە کە ئەو لە سوریا بوو پەیوەندی ئەو لە گەڵ پارتی دیمۆکراتی کوردستانی عێراق چۆن بوو؟

**دوکتۆر:** ئەو وەختە پارتییەکەی سوریا ئەگەر بە رەسمیش فەرعی پارتییەکەی عێراق نەبووبێ لە فیعلیا فەرعی پارتێکەی عێراق بوو. ئەمری لەوێوە وەردەگرت و شتی

لەویوە وەردەگرت. جا خۆش ئەوەیە ئەو مامۆستا هەمزەی خۆش نەدەویست و کاک هەمزەش دەیان وت ئەوی خۆش نەدەویست، بەس کاک هەمزە خوا هەڵناگرێ تا ئیستا لەو ئینسانانەیە کە دەمی پاکە و تۆهمەت و شت و قسەی خراپ ناکا. ئەمن لەو ئاخریانە لە بەغدایە دەمجولاند و باسی زەبیحیم لە گەڵا دەکرد، قسەیەکی خراپی نەدەکرد، هەر دەیگوت "دە لێی گەرێ لە زەبیحی بێ قەزا بی تۆش"! هەر ئەوەندە! لە گەڵ کاک هەمزە دانوویان نەدەکولا. حیزبەکەی وان سێ لایەن بوون کە یەکیان گرتبۆوە، ئەمن بیستبووم کاک هەمزە بۆتە سکرتێر، پێم ئەوت ئەوە کاک هەمزە سکرتێرە! ئەیوت نەخێر هەر ئەندامێکی عادیی یە و هیچی ترا جا مام جەلال هات پێی وتم چم بۆ ئەروژێنی؟! من ئیشم بەوەیە کە چی تۆ پێی ئەڵێیی هەمزە سکرتێرە، لێی گەرێ با هەر وا بزانێ ئەو سکرتێر نییە! بەس مامۆستا زەبیحی گوێی نەدەدایە، مەسەلەی کوردایەتییەکە وا قووڵ بوو لە لای کە گوێی نەدەدایە! جا ئیتر من ئاگاداری ناوەیان نیم کە چ سفەتێکیان دابوویە و چ مەسئولییەتێک! بەلام دیسان ئەو کۆڵەکەیەکی ئیشەکە بوو لەوێ!

ئیتر کە چووینەوە عێراق سالی ١٩٥٨ شۆرش بوو، بە یەکەوە چووینەوە. ئێمە با بلێین ئێمەی کۆمۆنیست و عێراقی ئیشەکە گەورە بوو لامان، بە هەموو حیسابێک ئیشەکە زۆر گەورە بوو لامان! جا ئەوە من لەو دوایانەدا لە بەغدا لە شوێنێک نووسیومە لە سەر ئەوە بەلام نە ئەبوو ناوی ئەو بێنم. شتێکم لە بیرە هەفتەیەک پێش شۆرشی تەموز، حاجی ئەووەختە لە شامەوە ئەهاتن، بۆ ئێمەش کە حاجی سلەیمانی دەهاتن زۆر خۆش بوو، کاک زەبیحیش هەروەک ئێمە خۆی بە سلەیمانی دەزانی چون عومرێکی لەوێ برد بووە سەر و زۆری خەلکی سلەیمانی ئەناسی! رۆژێک باسی (ئوتوبوس)حاجییەکان وەستابوو، سێ چوارێک جیرجاشە و ئەوەیان لە بەر دابوو، قسەیان کرد وە سلەیمانی نەدەچوون وەلا سابلاغی دەرچوون! سابلاغی ئەهاتن بە عێراقدا بە پارە پاسپۆرتیان بۆ دەر ئەکردن و بە عێراقیی ئەچوون بۆ حەج! کە کەوتمە باسی سابلاغ و قازی محەممەد و ئەوانە زۆریان پێخۆش بوو، ئیتر کە وایان زانی کەوتنە قسە کردن و گوتیان ئێمە ئەوە دوو رۆژە لە شام ماوینەوە و بەو جادانەدا ئەسوورێینەوە، سێ کەسی لای ئێمە لێرەن خەبەرێک، سوراغێکی وان نازانی؟ وتم کێن؟ وتیان هەژار و زەبیحی و دلشاد رەسولی. دیارە

دڵشـاد لەوێ نەبوو لە پشدەر بوو هێشتـا نەکوژرابوو، دوایە کوشتـیـان! ئەمن جارێک دڵشـادم لە گرسپکان دیت، سەلیم ئاغـای پشدەری هەبوو لەوێ کاتبی ئەو بوو. منیش وتم دڵشــاد نازانم بەڵام ئەو دوانەی تر رەنگە لەو ناوانە بن، من نەمگوت لێـرەن وتم رەنگە! وتم با بچم بزانم سوراغێکتان بۆ ناکەم، ئەوان وتیان ئەوە لێرە چاوەڕێت دەکەین. چووم بۆ چایخانەکە کە شەش حەوت دەقیـقە دوور بوو، دیم ئەوە لەوێ تاوڵە ئەکا، وتم هەسـتـە تاوڵەکە داخە با بڕۆین! وتی چییـە ؟! وتم هەسـتـە جارێ، هاتینە دەر وتم ئەوە کۆمەڵێک حاجی سابڵاغی لێرەن و سوراغی ئێوەیان گرتووە و منیش وام پێوتوون! وتی بەڕاستتە ؟! وتم وەرە ئەوە لێرەن! زۆر بە شۆقەوە هات. ئیتر هەر لە دوورەوە یەکیان وتی کورە کاکە خۆ ئەوە رەحمانی خۆمانە و ئیتر پەلاماری دا و لە باوەشیان گرت و ماچیان کرد و کەوتنە گریان هەموویان! ساعەتێک دوو ساعەت دانیشتن و باسی سابڵاغ و خەڵک و ئەوانەیان زۆر کرد. هەرچەند پێشتر عەبدوڵلا ئیسحاقی و دوکتۆر قاسملو هاتبوون و دیبوونی و شتیان بۆ باس کردبوو بەڵام ئیتر ئەوانە خەڵکی شار و خەبر و باسی ناوشار و ئەوانە زۆر بە لایەوە خۆش بوو!

دوایە کاغەزەکەی کە لەوێ بۆ ئێوەی نووسی (بۆ ماڵەوە) نووسی: پێرار کاغەزی ئێوەم پێگەیشتووە و ئێستـا جوابتـان دەدەمەوە! ئیتر من بەوە زۆر گریام! پێرار و ئێستـا جوابتان دەدەمەوە! زۆر تێکچووم و لە نووسینەکەمدا ئیشارەم بەو شتە کردووە! ئیتر ئەوان رۆیشتن و مـاوەیەک لە گەڵـیـان سوار بووین و رەوانەمـان کـردن. ئیـتـر دڵی پڕ بوو وتی تەمـاشـا کە هەمووکەس ئەچێتەوە ناو مـاڵ و منـاڵی خۆی و شاری خۆی هەر ئێـمە لێـرە ماوینەوە و هیچ هومێدێکمان نییە! جا بۆیە رۆژی ١٤ی تەموز بۆ ئێمە زۆر خۆش بوو و زۆر شتـێکی گەورە بوو لامان! ئەمن پێمـوا نەبوو کە بۆ هەژار و ئەو زۆر فـەرقی هەبێ، بەغدا و شام بۆ وان فەرقی چییە ؟! کە چی لە هەموان زۆرتر خۆشحاڵ بوو و خەڵکی ماچ ئەکرد و چوو بۆ ناو موزاهیرەکە و.... وتم ئەوە تۆ کە لایەنی ناسیونالیستەکەت ئاوا بە قووەت بوو چی بوو وات لێهات و ئاوا دەکەی ؟! وتی کاکە بە نیسبەت ئێمەش هیچ نەبێ لە برسێتی و رووتی نەجاتمان بوو! جا بۆیە پێمـخۆشە کە ئەچینەوە و عێـراق شتێکی دیکەیە و دەتوانین بچینەوە سلەیمانی و شارەکان و... ئیتر وابوو بە یەکەوە هاتینەوە.

**عەلی:** پێش ئەوەی دەرباز بین لەو بەشە تکایە باسی ئەحمەد تۆفیق و قاسملوت کرد لە شام، ئەو چاوپێکەوتنە چۆن بوو؟

**دوکتۆر:** دوکتۆر قاسملو ئەوکات کە ئەمن مەسئولی حیزبی شیوعی لە قەڵادزێ بووم ساڵی ١٩٥٤ هات، ئەو و ئەحمەد تۆفیق و کاک غەنی. ئەودەم کە من لە قەڵادزێ بووم ئەوانە نامەیان دەنارد بۆ حیزبی شیوعی عێراقی و نامەکان لە قەڵادزێ دەهاتنە لای من، زۆرتر ئەسعەد خودایار لە پەیوەندی دابوو. ئەسعەد خودایار زۆرتر بە لای پارتیدا ئەشکاند و زۆرمان خۆش نەدەویست بەڵام ئەوەی کە زۆرتر بە لای ئێمەیدا ئەشکاندەوە و خۆشمان دەویست و پۆستەی ئەهێنا و ئەبرد حەمەی حاجی سەعیدی سەردەشتی بوو کە لە ئێمە زۆرتر نیزیک بوو. لەو وەختەوە دوکتۆر قاسملو هاتووچۆی دەکرد، چووبوو بۆ بەغدا و هەژار تەرجەمەی بۆ کردبوو (ئەودەم عەرەبی نەدەزانی) لە گەڵ عەزیز شەریف و ئەوانە. دوایە لە شام خێزانەکەی هات، جارێک خوشکە نەسرین بە پاسپۆرتی عێراقی هاتبوو کە رۆیشتەوە بۆ چێکۆسلاواکیا. دوایە خۆی هات ساڵی ١٩٥٧ ئەودەم تەبعەن مامۆستا زەبیحی پارتی دێمۆکراتی کوردستانی عێراق بوو بەس لە گەڵ قاسملو زۆریان قسە کرد و خەبەر و باسی حیزبەکەیان و ئەوانە و چەند رۆژ بە یەکەوە بووین حەتا وتی کە ئەوە مراد (ئەحمەد تۆفیق) هاتووە و ئاگاتان لێی بێ و بەرێی کەن بۆ پراگ. ئەحمەد تۆفیقیش هەر هاتبوو بچێ بۆ فێستیواڵی مۆسکۆ، دوایە نەکرا و نەچوو. دوکتۆر قاسملو حەولێکی زۆری بۆ دابوو لە پراگ بەس نازانم چۆن بوو ئەویش نەچوو! دوایە ئەحمەد تۆفیق گەڕاوە و چۆوە کوردستان.

ئیتر رۆژی ٢٤ی تەموز هەموومان بە یەکەوە بە بێ پاسپۆرت باسێکیان بۆ گرتین و مامۆستا زەبیحی و هەژار و من و... چووینەوە عێراق. رۆژێکی زۆر خۆش بوو، تەبعەن کە چووینەوە دابەش کراین. هەژار ستۆدیۆی هەبوو چۆوە سەر کاری خۆی و لای شەریکەکانی و مامۆستا زەبیحی وەڵا چەند رۆژێک هات بۆ لای ئێمە و باوکمی ناسی و دوایە بە یەکەوە چووینە لای شێخ لەتیف، ورتە ورتێکیان لە گەڵ شێخ لەتیف هەبوو لە سەر کابرایەک بوو ناوی مەلا عەلی بوو، دۆستیان بوو نازانم چی لێ دەرکەوتبوو ئیتر باسیان دەکرد. دوایە ئەو گەرایەوە بەغدا و لە گەڵ پارتی کەوتە ئیش. لە پێشدا

ئەندامی ئحتیاتی لیژنەی مەرکەزی بوو بەس لە دەستگای راگەیاندن و رۆژنامەی خەبات و ئەوانە بوو. ئیتر ئەو ماوەیە زۆر جار یەکترمان دەدیت و لە لای دووکانەکەی مامۆستا بەشیر موشیر زۆر جاران بە یەکەوە دادەنیشتین، لای هەژار یەکترمان دەدیت و تەلەیفونمان بۆ یەکتر دەکرد و دۆستایەتیکەمان بەر دەوام بوو بەڵام خەتی ئیشەکە ئیتر جیا بوو، من لە حیزبی شیوعی بووم و لە رۆژنامەی ئازادی ئیشم ئەکرد، دوایە لە مارسی ١٩٦٠ چووم بۆ سۆڤیەت تا ساڵی ١٩٦٥.

جا ئەو ماوەیە کە مەلا مستەفاش هاتبۆوە ئەو هەر ئیشی دەکرد و لە گەڵ مەلا مستەفاش زۆر ریک بوو حەتا جاریک ئەمن لە ماڵە مەلا مستەفا دیتم! دوایە بوو بە مەسئولی کەرکوک. جا ئەوە شتیکم وەبیر هاتەوە لە سەر کاک عەزیز محەمەد:

ئەوە ساڵی ٧٤ - ٧٥ مامۆستا زەبیحی گیرا ئیمە حەولیکی زۆرمان بۆ دا، هەموو جار بۆ خۆم ئەچووم بۆ ئەبوغەریب بە مەنجەڵە چیشت و خواردنەوە حەتا جاریک وتی ئەمن پیمخۆش نییە ئەتۆ ئیستا دوکتۆری مەنجەڵە چیشت و ئەوە هەڵگری و...! ئەمن چووم بۆ لای عەزیز محەمەد پیموت کە ئەوە مامۆستا زەبیحی گیراوە با حەولیکی بۆ بدەین. وتی من بە پیویستی شەخسی خۆمی ئەزانم کە رۆژی ٨ی شوبات کە کۆدەتا کرا من (عەزیز محەمەد) و کاک کەریم ئەحمەد لە کەرکووک بووین، ویستمان پارتی ببینین کە ئەوە کۆدەتا کراوە بەڵکو خەڵک نەجات دەین، وتی مامۆستا زەبیحی زۆری یارمەتی داین و زۆریک لە برادەرانمانی لە کەرکووکەوە رەوانەی دەرەوە کرد هەرچەند ئەوان دوایە لە گەڵ بەعس تۆزیک ئەهوەن بوونەوە و شەریان وەستاند. کاک عەزیز محەمەد وتی مامۆستا زەبیحی پیی وتوین ئەگەر ئیوەش من و کاک کەریم ئەحمەد بۆخۆشتان جیگای ئەمنتان نییە ئەمن جیگام هەیە و میوانی من دەبن جاری! جا کاک عەزیز محەمەد وتی من نەفسم قەبوڵی نەکرد کە ئیمە حیزبیکی وا زل و زەلام لە یەک رۆژا وامان لی بی بڵیین جیگامان نییە! ئەوە بوو من و کاک کەریم ئەحمەد نەچووینە لای خۆی بەڵام ئەوانی تری هەموو دەرباز کردا جا کاک عەزیز محەمەد وتی ئەوە حەقی بە سەر ئیمەوە هەیە!

ئەوە با شتیکم لە بیر نەچی لەو فەترەیەی شام ئەو یادداشتی زۆری نووسی لە سەر

کۆمەڵەی ژ . ک و کۆمار و ئەو فەترە، هەمووی زۆر جوان نووسیبۆوە بە خەتی خۆی و ئەمن دەمدیت و چاویشم لێ کردوون. دەیدا بە خەڵک بۆ کەڵک وەرگرتن و تەنانەت مام جەلالیش لە کتێبەکەی کەڵکی لێ وەرگرت، شێخ ستار هەروەتر لە سەر کتێبی تەنزیمات و جەمعیاتی کورد لە رووی یادداشتەکانی مامۆستا زەبیحی لە سەر کۆمەڵە و جەمهوریەتی کوردستان کەڵکی لێ وەرگرتوە. جا ئیتر نازانم بەداخەوە ئەو یادداشتانە چیان بە سەر هات کە زۆر ئەهمیەتیان هەبوو و لەو ماوەیە لە سوریا نووسرایەوە. ژ.ک چۆنیان دروست کرد؟ چۆن دانیشتن؟ باسی وەی دەکرد کە ژمارەمان بۆ هەموو ئەندامان دانا لە پڕ فروهەر وتی خۆ تۆ ژمارەت بۆ خۆت دانەناوە! تۆ ئەگەر ژمارە یەکیش نەبی خۆ دەبێ ژمارە دوو بی! نووسینەکانی ژ.ک، شێعرەکانی بە ناوی ع . بیژەن، کۆمەڵێک لەو یادگارانەی تێدایە، ئەو شەخسە سۆڤیەتییەی کە پەیوەندی پێوە گرتوون دوایە بوو بە مێژونووس ئەمن لە ئەرمەنستان دیتم، حەتا وتی ئەمن حوسێنی فروهەرم دەدیت و کۆمەڵێک ئیشم لە گەڵ ئەو رێک خستبوو لە پڕ رۆژێک یەکێک گرتمی وتی: "آغای یعقوب شما چرا با من حرف نمیزنی"؟! (ئاغای یەعقوب بۆ لە گەڵما قسە ناکەی-دانەر) وتی منیش وتم ئێوە کێن؟! وتی: من زبیحی هستم ( ئەمن زەبیحیم) منیش دەمزانی زەبیحی ئەگەر ئەفەری هەوەڵ نەبێ ئەفەری دووهەمە و ئیتر دەستم کرد بە قسە کردن لە گەڵیا! چونکا ئەوان حوسێنی فروهەریان بە ئەفەری یەکەم دادەنا ، پێموایە چون بە تەمەن لەوان گەورەتر بووە بە هوی ئیحترامەوە بە ئەفەری یەکەمیان داناوە!

تەبعەن پێشەوا قازی زۆر درەنگتر چووەتە ناو کۆمەڵە حەتا دەیان گوت کە زەبیحی خۆش نەئەویست! خۆی مامۆستا زەبیحی وای نەئەوت، ئەیوت وەختی خۆی کە ویستوویانە یەکێک بکەن بە سەرۆک وتیان دەبێ یەکی ناودار بێ، وتی ئێمە هیچمان خەڵک نەیئەناسین و هەموو کوڕە فەقیر و گەنج و خەڵکی ناوشار و... بووین. خەڵکی سابلاغ کە زۆربەیان وتوویانە با قازی محەمەد بێ ئەو زیدی بوو هەرچەند هێندێک ویستوویانە سەید عەبدوڵڵای ئەفەندی گەیلانی دابنێن ئەو هەر زیدی ئەویش بوو! هەر لەو وەختەوە بە حیسابی ئەوە کە ئەو گەنجانە بۆ بۆخۆیان نەبن؟! زیدی ئەو کەسانە بووە کە ببن بە سەرۆک، بە حیسابی خۆی تودەیانەتر بیری کردووەتەوە! جا لەو دەمەوە

مامۆستا زەبیحی خۆی دینەمۆی ژ.ک بووە بەس ئەوان حوسێنی فروهەریان داناوە بەو حیسابە کە گەورەتر بووە لە وان! دەرکەوت کە مامۆستا زەبیحی لە گەڵ کۆمەڵێک لە وانی روس کە ئەهاتن و ئەرۆیشتن پەیوەندی نیزیکی هەبووە چون ئەوانی کە ئێمە لەوێ دیانن هەمووی دەیانناسی. جارێک کاغەزێکی نووسی بۆ وان لە شامەوە بۆ پەنابەری و ئەوانە، جا سەیر ئەوە بوو زۆربەی کە ئەو ئەیناسین دەستەی زەمانی ستالین و ئەوانە بوون! جا ئەوە من بە گاڵتە پێم ئەوت خەریک بوی منیش بە گرتن بدەی! کە چووم لە کاک رەحیمی قازیم پرسی حەسەنۆف لە کوێیە؟ ئاتاشیر لە کوێیە؟ و... و...لە کوێیە؟ وتی وستبە! وستبە! ئەوانە تۆ لە کوێ ئەناسی؟! وتم چۆن ئەوانە پیاوی گەورەی سۆڤیەتن! وتی ئەوە کێ پێی وتویی؟! وتم چۆن ئەوانە هەموو دۆستی مامۆستا زەبیحین! وتی کورە ئەوانە هەموو خەتەرن! پێی بڵێ ئەگەر نامەت بۆ نووسی ناوی ئەوانە نەبا ئیتر!

جا ئەوە کە هاتنەوە و مەلا مستەفاش هاتەوە بۆ عێراق، ئەو و هەژار لە پێش بوون و دائیمەن لەوێ بوون بەڵام فەرقەکە پیاو حەقە بۆ مێژوو بیڵێ کە کاک هەژار زۆر زیاتر چووە پێشەوە! موشکیلەکەش رەنگە موشکیلەی پێشەوا قازی محەمەد بێ کە هەژار حازر بوو ناوی نەهێنێ و باسی نەکا! بەس مامۆستا زەبیحی لە موقابیل مەلا مستەفا دائیمەن دیفاعی لێ ئەکرد و مەلا مستەفاش لەو هەڵوێستەی قازی محەمەد لەو کاتەوە هەر عاجز بوو کە لە گەڵیا نەرۆیشتبوو و ئیتر ئەوە مەسەلەی مێژووە و هەمووشت ناگوترێ! بەس مامۆستا زەبیحی دیفاعی خۆی لە پێشەوا هەر دەکرد و دای نەدەنواند بۆ مەلا مستەفا! هەرچەند حەق وابوو بەعەکسەوە بێ چون مامۆستا زەبیحی هاتبوو بۆ ناو پارتی کوردستانی عێراقەوە و حەقی وانی نەمابوو و دەیتوانی باسی پێشەوا هەر نەکا بەس ئەو وا نەبوو و باسی پێشەوا و دیفاع لە پێشەوای هەر دەکرد! حەتا لە دەرکردنی دوکتۆر قاسملو مامۆستا زەبیحی هەڵوێستی زۆر چاک بووە کە بە تەئسیری مەلا مستەفا و پارتی و ئەحمەد تۆفیق و وان لە ساڵی ۱۹۵۹ لە عێراق دەریان کرد، بەس مامۆستا زەبیحی دیفاعی لێ کرد!

**عەلی:** لە گەڵ ئەحمەد تۆفیق چۆن بوو؟

**دوکتۆر:** نا! نا! لە گەڵ ئەو هەڵوێستی یەک نەبوو.

ئەو وەختە لە وانەی پارتی زۆربەیان خۆیان لە حیزبی شیوعی نیزیک کردبۆوە، ئەو وەختە کە حیزبی شیوعی لە برەوا بوو و دەسەلاتی هەبوو زۆر هەبوو لە سەرکردایەتی پارتی لە ژێرەوە داوای ئەندامێتی حیزبی شیوعیان کردبوو! ئەیان وت ڕەنگە هەر زەبیحی و مام جەلال داوایان نەکردبێ! هەر چەند ماموستا زەبیحی خۆی لە هەمووان بە کۆمۆنیستر دەزانی لەوێ، بەلام لە گەڵ حیزبی شیوعی ڕێک نەبوو! دوایە چووە ناو شۆڕش و ماوەیەک مەسئولی بەغدا بوو، ماوەیەک مەسئولی کەرکووک و ئیتر لەو جیابوونەوەیەدا لە گەڵ مەکتەبی سیاسی ڕۆیشت دەنا لە گەڵ مەلا مستەفا ڕێک بوو!

**عەلی:** ئەو دوژمنایەتییە و زیدایەتییەی ماموستا زەبیحی و مەلا مستەفا لە چێوە دەستی پێکرد؟

**دوکتۆر:** وەڵا هەر روحیەتی حیزبێتییەکە بوو! ئەوەی شعوری پێ بکەم هەر روحیەتی حیزبایەتی بوو ئەگینا ئەو مەلا مستەفای خۆش ئەویست، هەژار حەولێکی دا بیهێنێتەوە بۆ ئەوێ و ڕێک نەکەوت و نەهاتەوە و هەر لە گەڵ مام جەلال و ماموستا برایم ئەحمەد و وان مایەوە. دوایەش کە ئەوان چوونەوە لە سالی ١٩٧٠ بۆ لای مەلا مستەفا ماموستا زەبیحی هەر نەچۆوە بەس ئەو کەوتە بەعزە گێژاوەوە، من عەرزم کردی کەم و کوڕیی گەورەی ئەو پیاوە ئەوە بوو کە باوەڕێکی زۆری بە خۆی هەبوو! بەو باوەڕە پێیوابوو دەتوانێ فێڵ لە هەموو دەوڵەت و حکومەتێک بکا بۆ ئەو مەسەلەی کە هەیبوو! مەسەلەکەی کە هەشی بوو بە خوا نە بە تەمای پارە بوو نە بە تەمای ماڵ و مناڵ بوو نە ژن بوو و نە... هەر ئەو مەسەلەیەی کە باوەڕی پێیەتی بتوانێ ئیشەکی بۆ بکا، کوردایەتییەکە لەودا زۆر بە هێز بوو لە گەڵ بیرە پێشکەوتنخوازەکەشدا، بیرەکەش ڕاستە لە گەڵ حیزبی شیوعی و ئەوانە نەبوو بەس بە گشتی ئەو خۆی لەسەر بیری مارکسیەت حیساب دەکرد و خۆی بە یەکێک لە تئۆری زانەکانی مارکسیەتیش ئەزانی چون ئەو وردە شتانەی نووسیبوو و زۆریشی خوێندبۆوە. لەبەر ئەوە تەبعەن بۆ ئەو مەسەلە هەر فیداکاری بوو و چی تر، تەبیعەتی ژیانەکەش فێری خۆشاردنەوە و ئەوانەی کردبوو، لە بەغدا دووسێ مالی هەبوو، لە هەر خانوویەک ناوێکی هەبوو، حەزی ئەکرد خۆی بشارێتەوە!

پاش ئەوە کەوتە بەعزە ئیشی ئێرانەوە، رادیۆیەکیان هەبوو ئەو جەماعەتی تەیموری بەختیار و مرادی رەزمئاوەر و... جا ئەوسەردەمە کۆمەڵێک شتیان بەرامبەر ئێران هەبوو حەتا رەزا رادمەنیشی تێدا بوو، هات بۆ بەغدا و من یەکدوو جار دیم، من رادمەنیشم ئەناسی لە گەڵ دوکتۆر قاسملو یەکەم جار هات بۆ شام ئیتر من لەوێوە ئەمناسی. ئیتر کەوتبووە ئەوە کە شتێک بەرامبەر ئێران بکەن!

دوایە ساڵی ١٩٧٤ گرتیان، ئەمن دیتم کە هاتبوو بۆ بەیروت. بەشی زۆری تۆهمەتەکەی ئەوە بوو کە هاتبوو مام جەلالی دیبوو و چەند رۆژێک بە یەکەوە رۆیشتبوون و بە یەکەوە بیوون.

من هاوینی ٧٤ هاتم بۆ بەیروت، مام جەلال لەوێ بوو من فازیلی ئامۆزام (دوکتۆر فازیل مەلا مەحموود) خەبەری دامێ کە ئەوە مام جەلال ساعەت ئەوەندە لە هۆتێل شێخ چاوەرێت دەکا، منیش وامزانی کە ئەوە مام جەلال بە دزییەوە لەوێیە و کەس نایبینێ کە چی کە هاتم ٢٠ - ٣٠ کەس لەوێ بوون! دوایە وردە وردە قسە کردن مام جەلال وتی رەفیق پشدەری لێرەیە. وتم خواحافیز مام جەلال! وتی لێی مەترسە! وتم تۆ لێی مەترسە، رەنگە رەفیق بۆ تۆ ئیش بکا و لە لای منیش پیاوی خراپ نەبێ بەڵام کابرایەک کە ئیشی بۆ دوو لا کرد دەبێ شتێکیش بۆ ئەو لا هەر بکا! لە سەر تۆ رەنگە بڵێ مام جەلال جنێوی بە حکومەت دابێ! هیچ نابێ بەڵام بە نیسبەت منەوە هەر لە گەڵ تۆ ببیندرێم شتێکە بۆ من! وتی راست ئەکەی و ئەمن رۆیشتم! دوایە لە لای برادەرێک بووم کاک زەبیحی زانیبووی و تەلەیفونی بۆ کردم وتی وەرە لە گەڵ مام جەلال ئەچین بۆ شاخ ماڵێکی هەیە هەوارێکە ئەچین بۆ ئەوێ و هەر بۆ خۆمان ئەبین و سێ رۆژ لەوێ ئەبین و دائەنیشین و بە ئارەزوی خۆت باسی بەشیر موشیر بکە! ئەمن نەچووم!

قسەکە وابوو کە رەفیق ئەوی دیوە کە لە گەڵ مام جەلال رۆیشتووە، ئیتر کە هاتەوە گرتیان! خۆی بۆی گێڕامەوە کە هاتبۆوە خەبەری دابوو بە مەلا عەوڵا و بابەکر ئاغای پشدەری و کێ و کێ و هەموویان چووبوون بە پیریەوە، حەتا پێیموت باشە تۆ کە بۆ حەمام و بۆ سینەما بە دزی دەچووی لە شام، بۆ ئاوا بە ئاشکرا هاتیتەوە؟! وتی دەمزانی رەنگە شتێک هەبێ! بۆیە خەبەرم بۆ وان نارد کە بێن بۆ تەیارەخانە. کە ئەوان هاتبوون

نەیان ویستبوو لەوێ بیگرن، ڕەفیق سواری سەیارەکەی خۆی کردبوو و پێی وتبوو کە ئەوە لە ئەمن تۆیان دەوێ!

**عەلی:** ببورە ئەمن باسی شێخ جەبارم بیستووە لە سەر ئەو شتە!

**دوکتۆر:** شێخ جەبارەکەش لەو بەزمانە دابوو ئەو وەختە بەس ڕەنگە ڕەفیق خۆی ئاگای لە گرتنەکە نەبووبێ بەس پێی وتبوو کە لە ئەمن دەیان هەوێ، بەس بۆ سبەینێ ڕەفیق خۆی گەیاندبوویە و چووبوو بە دوایا و بردبووی و حەتا خواردنیشی بۆ کڕیبوو و نیتر ئەوە بوو گیرا! کە گیرا تەبعەن ئەوان بە تەما بوون لە ناوی بەرن و ئیعدام و شتی بکەن! بەس ئەمانە هەموویان کەوتنە ئیش بۆی. شێخ ستار دەڵێ مەلا عەولا کەمتر بەس من نازانم چون مەلا عەولا زۆرتر نیزیک بوو لێی! هەموویان قسەکیان بۆ کردبوو، تەها محێدین کە ڕەنگە بۆ کەسی نەکردبێ ئەوەی کە من بیستم چووبوو بە سەدامی وتبوو کە ئەم پیاوە وایە و وابوو و... سەدام وتبووی ئەوەی کە خەیانەتمان لە گەڵا بکا ئێمە ئەیکوژین! تەها محێدینیش وتبووی ئەوە خەیانەتی لە گەڵ ئێوە نەکردووە! کە وای وتبوو سەدام وتبووی تۆ ئەڵێی خەیانەتی نەکردووە؟! تەبعەن چون ئەو بۆ کەس نەچووبوو وتبووی مادام تۆ ئەڵێی دەبێ سەر لە نوێ تەحقیقی لە گەڵا بکرێتەوە! کە تەحقیقیان لە گەڵا کردەوە تەبعەن نەتیجەکە هەر ئەوە بوو وتبوویان مام جەلالت دیوە! وتبووی بەڵێ دیومە و ئەمن لێرە کە ڕۆیشتووم وتوومە فلانکەس دەبینم! وتبوویان کە مام جەلال پێی وتووی کە مەڕۆوە بۆ عێراق و وەرە بچووە بۆ ئوروپا و ئەترێنین و ئەوە، ئایا ئەوە ڕاستە؟ وتبووی بەڵێ ئەوەش ڕاستە! وتبوویان ئەدی بۆ جاری یەکەم باسی ئەوەت نەکردووە؟! کە واتا تۆ شتت شاردووەتەوە و ئیتر بە تۆهمەی مەعلومات شاردنەوە دوو ساڵیان حوکم دا! بۆ ئەوەی نەڵێن لە خۆڕایی گرتوویانە. بەس غەڵەتەکە ئەوە بوو دوای ئەوە ئەو دەرفەتەی دەس کەوت کە خۆی لە داوی بەغدا ڕزگار کا بەس ئەوە بوو مایەوە هەتا سەورەی ئێرانی و ئیتر لە سەورەی ئێرانیش بەو نەوعە هاتەوە بۆ عێراق! جاری ئاخریش بارزان وتبووی ئەوە قەت ئیشی بۆ ئێمە نەکردووە و هەر دوژمنی ئێمە بووە! ئیتر بە داخەوە بەو نەوعە ڕۆیشت!

**عەلی:** ئێوە جاری دووهەم کە گیرا و تێدا چوو چۆنتان بیستووە و چ دەزانن؟

**دوکتۆر:** جاری دووهەم کە هاتەوە لە نیسانی ١٩٨٠ بوو، دواجار تەلەیفونێکم بۆ کرا، یەکێک لە منداڵەکان هەڵی گرت و وتی بابە یەکێکە دەنگی وە مەلا جەمیل ئەچێ! هاتم خۆی بوو، ئەی کاک زەبیحی بە خێر بێیتەوە، کەی هاتوویەوە؟! و بۆ هاتوویەوە و...؟! رتی وەرە بۆ لام هەر نەمشۆ لێرەم. وتم لە کام ماڵیی؟ وتی لە هیچیان وا لە ماڵی برادەرێکم ر ...ەن ماڵەکەش حەز ئەکا بێیت. ماڵی کاک بابەکری پشدەری بوو، کە چووم قسەی ر...م پێوت و وتم چی ئەکەی بڕۆ! لە گەڵ تودە، لە گەڵ حیزب، لە گەڵ کۆمەڵە، لە گەڵ شێخ عیزەدین هەرچی دەیکەی بەس مەیەوە بۆ ئێرە! چواری وەک من نەبێ دەنا کەس قسەی خێر ناکا تۆ ئەو هەمووە هاتووچۆیە دەکەی! قسەی نەکرد و تەبیعی من گەیاندمەوە بۆ ماڵەکەی بەغدا جەدیدەی. دوایە کاک بابەکر وتی بەیانی تەلەیفونی کردووە و وتوویەتی ئەمن ئەو قسانە تەنیا لە عیزەدین قەبوڵ دەکەم و دەزانم خۆشی ئەویێمو و لە دڵسۆزییەوە ئەو قسانە ئەکا! ئیتر رۆیشتەوە کە رۆیشتەوە ون بوو ئیتر ئەو ونبوونە بوو! هاوینی ١٩٨٠ هاتمە دەرەوە هەر بۆ سەفەر بۆ ئوروپا بە شامدا رەد بووم، کاک بابەکر ئەیزانی من خەڵق ئەبینم وتی مام جەلال ئەبینی، هەرچەند هێشتا هەر وەزیریش بوو بەس پیاوی چاک بوو، وتی بە ناوی منەوە پێی بڵێ ئیشێک بۆ زەبیحی بکا لە ئێران بەردرێ! مام جەلالم رێک لە ٣١ی ئابی ١٩٨٠ لە شام دیت لە قسەکانمدا پێموت کە ئەوە بابەکر ئاوا ئەڵێ. وتی پێی بڵێ بابەکر خۆی لە بەغدا شتێکی بۆ بکا! بارزان گرتوویەتی! کە هاتمەوە بۆ بابەکر سەیر بوو وتی من ئەوەم نەزانیوە بەس ئەکەومە حەول دان بۆی. بەس دیار بوو حەول دان فایدەی نەمابوو یان هەر پێیان نەکرا، دیارە هەر زوو گرتوویانە و کوشتوویانە! بەس ئەوە کە دەستیان بە سەر قامووس و شتەکاندا گرتووە خۆ قامووس شتی سیاسی نییە! ئەوە مانای ئەوەیە کە خۆیان کردوویانە بۆیە دەستیان بە سەر شتەکانیشدا گرتووە!

حەتا ئەمن بیستوومە داریوش فروهەر و ئەوان کە هاتوون، ئەو لە کۆبوونەوەیەک تێدا بووە، دیارە لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەدین چووە، نە ئێرانیەکان زانیویانە ئەوە فڵانە و کێیە کە دوایە گۆیا گلەیان کردووە لە دیمۆکرات کە بۆ باسیان نەکردووە نە حکومەتی عێراقیش بەو کۆبوونەوەی زانیوە کە ئەو بەشداری تێدا کردووە! یانی پێی نەوتون کە

ئەوە لەو کۆبوونەوەیەدا حازر بووم! تەبعەن ئەوان زانیویانە کە کۆبوونەوێکی ئاوا بووە! جا ئەوە دەلیلی ئەوەیە کە ئیشی بۆ کەس نەکردووە، ئیشی بۆ ئەو هینەی خۆی ئەکرد کە لە مێشکی دابوو! یانی بڵێی ئیشی بۆ لایەک کردبێ قەتعەن نا! ئەو ئیشی هەر بۆ بیروباوەڕی خۆی کردووە. بەعسیشی خۆش نەدەویست و ئەو باش ئەیناسین و چاک لێیان تێگەیشتبوو، بەس خەڵقی ئەناسی و لەوە سڵی نەدەکردەوە کە خەڵق ببینێ، زۆریش یارمەتی خەڵقی دا، حەول دان بۆ خەڵق، هەر ئەوەندە ئیشێکت پێی هەبا نموونەی وەفا بوو حەتا جارێک بۆ کاک محەمەدی مەلا کەریم چووین پێمان وت، چوو پیاوانە بۆی حەل کرد، ئەو ئەحمەدی کەواکب، لە مردن رزگاری کرد، ئەمانەی ئەکرد بۆ خەڵق، نموونەی دۆستایەتی و وەفا بوو!

**عەلی**: لەو دوایانەدا ئایا لە باری پارە و پووڵەوە هیچی هەبوو و وەزعی چۆن بوو؟

**دوکتۆر**: وەڵا نەمبیستووە! شتێک پارەی هەبوو لای کابرایەک بوو حاجیان پێ ئەوت (محەمەدی شاپەسەند) ئەو لە کۆنەوە لە چاپخانەی "نیشتمان"وە هەر ئیشی پێکردبوو و دوایە لە "خەبات" ئیشی پێکردو... ئەو هاتووچۆشی ئەکرد لە حەپسخانە. وتی ئەوە ٤-٥ هەزار دینارم وەلا خستبوو بۆ قامووس، جا ئەو کە باسی قامووسی دەکرد وەک باسی کوڕەکەی بکا وابوو، وەک ئەوە کە بڵێ ئەوە وەلام خستوە بۆ شایی کوڕەکەم، کە ئەیوت قامووس بە لایەوە زۆر بەرز و ئازیز بوو! ئەوە گۆیا پارەکەی لە لای ئەو حاجی شاپەسەندێ داناوە و لێی خواردوە و نەمابوو! ئەو خۆی دەربەستی ماڵی دنیا و ژیان نەبوو، هیچی نەبوو، رەنگە ئەگەر چووباینە مەتعەمێک، چێشتخانەیەک شتی چاکی خواردبا دەنا هیچی بەلاوە مووهیم نەبوو لە ژیان! ئیتر لە گەڵ شاپەسەندی کێشەیان بوو، ئەو ئەیوت ون بووە و لێیان بزر کردووم و.... ئەوەندەی من بزانم پارە هەر ئەوەندەی هەبوو ئەویش ون بوو!

**عەلی**: باشە کاک دوکتۆر با تۆزێک لە باری سیاسی دوور بینەوە و وەک ئەدیب و باری ئەدەبی ئێوە زەبیحی چۆن دەبینن؟

**دوکتۆر**: وەڵا لە سەرەتاوە ئەو وەک ع . بیژەن شێعرەکانی مستەوای شێعری ئەو

سەردەم و شێعری هەژار و هێمن و شاعیرەکانی لای خۆمان بووە، ئەو کتابخانەی سەیفولقوزات کە لەوێ لە سابلاغ هەبووە، لەو بابەتانەیە بەڵام تۆزێک پێشکەوتووترە، حەتا خەڵق هەبوو لە بەریان بوو. من لە بیرمە جەماڵ حەیدەری شەهید کۆمەڵێک شێعری لە نیشتمانەوە لەبەر بوو لە شام ئەیخوێندەوە، وتم باشە تۆ ئەزانی ئەو شێعرانە ئی کێن؟! وتی ناوەڵا ئەوە لە نیشتمان ئێمە گەنج بووین لەبەرمان کردووە. وتم ئەوە ئی ئەو کاک زەبیحییەی خۆمانە ئەوە لێرەیە و دەیبینی! جا شێعرەکە باسی سۆڤیەت و ئەو شتانەی تێدا بوو. نووسین، کوردی ئەنووسی، نووسینێکی پتەوی هەبوو بەڵام وەک شتی ئەدەبی لەو ماوەیەدا نەبێ نەیبوو.

**عەلی:** قامووس چۆن دەبینی؟

**دوکتۆر:** قامووس بەلامەوە لە هەرە کارە باشەکانە بەس قاموسی کوردی هێشتا بە لای منەوە هەموو سەرەتایە، هەر یەکە عەیبی خۆی هەیە و گەورەیی خۆی هەیە، بەس ئەو قاموسە ئیستعمالێ بە لای منەوە شتی باشە خاسەتەن ئەو خۆی ئیشارەی کردووە کە ئەمە عەرەبییە، ئەمە فارسییە،... ئەمە کوردییە و... شتێکی باشە، با بچێتە ناو قاموسەوە، تۆ نازانی پاش سەد ساڵان ئەو وشانە چیان بە سەر دێ، ئەوەی کە ئەو لە ئێستاوە ئیشارەتی کردووە زۆر شتێکی باشە. لە بەر ئەوە کۆکردنەوەکەی کارێکی عیلمی چاکە، بە لای منەوە سەرەتایەکی باشە بۆ بناخەدانانی عیلمی قامووسێکی کوردی، ئەوجار فراوانیشە، تۆ دەبینی بە دوو بەرگ هەر هاتووەتە سەر ئەلف و بێ، ڕەنگە تەواو ببیا خۆی لە ١٤ - ١٥ بەرگ دابا! ئەوە یەکێک لەو کارە چاکانەیە کە کراوە. بتهەوێ و نەتهەوێ سبەینێ هەر کەس بیهەوێ فەرهەنگێکی تەواوی عیلمی و زانستی و پێگەیشتووی کوردی دابنێ دەبێ بچێتەوە سەر ئەو!

**عەلی:** کاک دوکتۆر ئێستا ئێوە وەک دۆستێک چتان پێباشە بۆی بکرێ؟

**دوکتۆر:** وەڵا ئەو حەولەی کە درا، شێخ ستار زۆری حەولدا نازانم مەلا عەوڵا چەند بەڵام ئەو حەولەی کە درا شتەکانی دەس کەوێتەوە زۆر شتێکی باشە کە هیچ نەبێ فەرهەنگەکەی دەس کەوێتەوە، مەلا جەمیل لە کۆبوونەوەیەکدا لە گەڵ نووسەرەکاندا داوای ئەوەی کرد کە ئەو شتانە بدرێتەوە، بەرگێکی تری تەواو کردبوو (بەرگی سێهەم)

ئەوانی تریش کارتەکانی حازر کردبوو، ئەویش هەر نووسینەوەی دەویێ، چەند کەسێک سەرپەرشتی بکا و هەر بە نێوی خۆی فەرهەنگەکەی بۆ تەواو کەین. ئەو یادداشتانەی کۆ کرێتەوە و بە سەرێکەوە بنووسرێتەوە، شەخسی خۆی ئەبێ یادی بکرێتەوە کە ئەو یەکێک بوو لە شەخسیاتی گەورەی کورد وەک کاک برایم ئەڵێ ئەو کورد بوو وەک کورد بەڕاستی کە ئیشی بۆ کردووە لە هەموو کوردستانا! ئەبێ حەول بدەین بە بێ زیادی و بە بێ کەمی حەقی خۆی بدرێتێ! ئەبێ شتێکی بۆ بکرێ، پەیکەرێک، شەقامێک،... ئێستا کە لە سابلاغ ناکرێ با لە سلەیمانی بۆی بکەین، فەرقی نییە! دەشبینی کە کراوە لە سلەیمانی لە گەورەترین ساحەی شار رەسمی پێشەوا هەڵاوەسراوە!

**عەلی:** کاک دوکتۆر یەک دنیا سپاست دەکەم بۆ ئەو وەختەی کە بۆت تەرخان کردم و زانیارییەکانت بەلامەوە زۆر بە کەڵک و بە سوود بوون.

**دوکتۆر:** سپاس بۆ جەنابیشت کە دەرفەتت دا بە من کە یادی دۆستێکی خۆشەویستی پیاو و بە وەفا بکەم. بەراستی پیاوەتیم پێوە دیوە، وەفام پێوە دیوە. بە شەخسی خۆم بێ، بەرامبەر بە زۆر برادەر کە لە کاتی خۆی زۆری یارمەتی داون و بە هانای خەڵقەوە دەچوو، ئەمن سپاسی تۆ دەکەم کە ئەو دەرفەتەت روخساند ئەو شتانە زەپت کرێن و ئەوە دنیایە پیاو نازانێ چی بە سەر دێت و ئەو دەرفەتە دەبێتەوە یان نا! هیوادارم هەموی بگا بە خەڵق.

**عەلی:** دیسان زۆر سپاس.

# وتووێژ لە گەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد

لەندەن ١٩٩٦/٣/٢٨

**عەلی:** مامۆستا تکایە بفەرموون کەی وە لە کوێ ئەوەڵجار مامۆستا زەبیحی تان دیوە یان ناوتان بیستووە؟

**مامۆستا برایم:** ناوی مامۆستا زەبیحیم لە ژ.ک وە بیست، تەبعەن لە هینەوە کە ژ . ک دروست بوو، هەولیان دابوو لقێ لای ئێمە دروست کەن، لە کوردستانی بلێین بەشی عێراق. لە پێش منا پێوەنییان کردبوو بە هەندێ کەسەوە کە لەوانە ئەوەی ناویانم بیر بێ، ئیسماعیل شاوەیس و عوسمان دانیش و هەر وەها چەند کەسێکی کە بوون، ئەمانە خەریکی بلاوکردنەوەی بیروباوەڕەکە بوون بە ناو خەڵکا، بە ناو خوێنەوارانی ئەو وەختەی کوردا ئەگەڕان کە بیانکەن بە ئەندام بۆ ئەوەی ڕێکخراوێک پێک بێنن. یەکێ لەو کەسانە کە پێیان وت من بووم. من تازە لە حاکمی وازم هێنابوو. لە ئاغوستی ١٩٤٤ وازم هێنا لە حاکمی. هاتمەوە ببم بە محامی، ماوەیەکی پێچوو، مانگێک، مانگونیوێکی پێچوو بوو، هاتن بۆ لام پێیان وتم. کاغەزێکیان هێن کردم کە وا ئەمە داوامان لێکراوە ئەگەر هینێک دروست کەین، تۆ ئەگەر هینت نییە بیکەی. من وتم یەک شتم ئەوێ، پرۆگرامەکەیان، پەیرەوەکەیان چییە؟ وتیان باشە بۆت ئەهێنین. هێنایان، خوێندمەوە. تەنها نوختەیە بە لای منەوە موهیم بوو لە ئیشەکا ئەوە بوو کە کوردستانێتی بێ، من خۆم بە پێی ئەو ناوچەیەی کە تیا گەورە بووبووم، یانی هونەرێکی نییە بۆ خۆم، فەقەت نازانم هەیبێ یان نەیبێ، چونکە خەڵکی کە هەموو وانەماوە. ئەو ناوچەیەی منی تیا گەورە بووم، ناوچەیەکی کوردستانی بوو. یانی شێخ مەحموود سەورەی ئەکرد، ئەیان وت کورد سەورەی کرد، کوردستان سەورەی کرد، خەڵکی کوردی ئێران، رەئیس عەشیرەت، پیاوی تێگەیشتوو، کە عەشیرەت زۆرتر بوون، وەکوو مەحموود خانی دزلی، وەکوو مەحموود خانی کانی سێنان (کانی سانان-دانەر)، وەکوو ئەوانە،

وەکوو یەک دوانێکی لە بانەوە هاتبوون، ناوەکانم نایە بە بیرا...

**عەلی:** حەمە رەشید خان و وان نافەرمووی؟

**مامۆستا:** حەمە رەشید خان هێشتا نەگەیشتبوو، ئەوە هی ئەوەڵی سەورەی شێخ مەحموود بوو. ئەمانە هاتن وەکوو سەورەی کورد یارمەتییان دا، یانی هیچ هینێکی تیا نەبوو وە لە دەوری ئێمە لە گۆرانی مەکتەبەکەمانا مەسەلا کە ئەمان وت باسی کورد و کوردستان بوو کە باسی کوردمان ئەکرد، باسی شۆڕشی شێخ سەعید ئەکرا، شیوەن بۆ ئەوێ ئەکرا، دوژمنایەتی بەرامبەر بە حکومەتی تورک و هێن پیشان ئەدرا، حەقی نەبوو بە سەر عێراقەوە، عێراق حکومەت نەبوو ئەو وەختە، لە دەوری ئێمەیا شێخ مەحموود بەیاخی حکومەتی دروست کرد، گۆرانیمان ئەوت حەتا گۆرانی وا هەبوو ئەمان وت:

وا نابێ ئینگلیز وا نابێ

ئەو خاکە هەر بۆ تۆ نابێ

بەیاخی کوردستان، دیسان ئەلەرێتەوە

هەستە با بڕۆین بچینە پێشەوە

چەند کەسمان کوژراوە بە گوللە و بۆمبا

چی بێ ئەم داخەمان لە مێشک لاچا

مەسەلەن ئەیگووت:

برای عەزیزی من دە ئینتقامە

خەنجەر هەڵکێشە بۆ کوشتنی تورکان

ئەوەندەش شۆڤێنیانە رۆیبوو، چاری نەبوو لەو زرووفا، چونکە مستەفا کەماڵ توانیبووی هەموو تورک بکا بە دوژمنی کورد. ئێمە لەو دەورەدا، تەبعەن هینەکەی ئەوە بوو، یەعنی من جینسییەتی عێراقیم نییە تا ئێستاش وە شەهادەتی حقووقیشم نییە، چونکە شەهادەتی حقووقیان نەئەدا بە ئینسانێ جینسییەتی عێراقی نەبێ. پێشەکی بە دەفتەرێکی نفووس قەبوڵیان ئەکردی، فەقەت کە شەهادەتت بدەنێ نەیان ئەدایتێ. منیش نەم ئەویست ئەمگوت ئەورۆ پێمان ئەڵێن عێراقی، سبەینێ ئەبێ ببی بە عەرەب. دەوری شتەکەی ئەوە بوو. لەبەر ئەوە ئەوەڵ نوختە بە لای منەوە مووهیم بوو ئەوە بوو

کە ئەو کوردستانێتی بێ، وتیان پرسیارەکەی تۆ ئەوە بوو وە حەتا ئیسماعیل شاوەیس زۆر قسە خۆش و هێمن بوو، وتی کاکە قسەکەی تۆ زۆر سەیرە! وتم بۆ؟ وتی ئەی بۆچی داوایان لە ئێمە کردووە حیزب دروست کەین؟! وتم وا بزانم بۆ پشتیوانی خۆیان داوایان کردووە، ئەگەرچی ئەبێ بۆ پشتیوانی ئەوان بێ هێنەکەی ئێمە. بزانین هی ئەوان بۆ ئێمە ئەبێ، هی ئێمە بۆ ئەوان ئەبێ، فەرقی نییە، ئێمە یەک ئیش ئەکەین. وەڵا منیش چوومە ناویان ئیتر کۆمەڵێک خەڵک کۆبووینەوە لە ماڵی سمایل شاوەیس، ئەوە مەوزوعی باسی لقەکەی لای خۆمان ئەبێ و دوور و درێژ ئەبێ. دوای ئەمە، ئێمە هێندێک ئیقتراح و شتمان کرد بۆیان، لەو کاغەز و کاغەزکارییە و هێنانەوە بۆمان دەرکەوت کە مامۆستا زەبیحی یەکێکە لەو کەسانەی لە دامەزرێنەرەکانی ژ . ک ە.

جا ئێمە پێش دروست بوونی ژ . ک هەوڵ هەبوو کە رێکخستنێک پێک بێنین، حەتا من لە ٤٢-٤٣ یا چووم بۆ رەواندز لەوێ حامیەی عێراقی لێ بوو، ئەمین رەواندزی یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لەوێ بوو، بە هۆی ئەوەوە گەیشتینە حدوود کە بەڵکوو لەوێوە چەند کوردێ لە ئێرانەوە بێن، ئێمە بیانبینین و قسەیان لە گەڵ بکەین، رێکخراوێک پێک بێنین، یەعنی پێوەندییەکەی کە کوردی عێراق لە گەڵ هێن هەیبوو کە ئەویست وابکەین ئەوە لەوێوە دەستی پێکرد، فەقەت ئەوە زابتەکانی عێراقی تووشی غەڵەت بوون یا خۆیان شتێکیان بە دەستەوە بوو یا موئامەرە، شتێک بە دەستەوە بوو، لە پڕ بڵاویان کردەوە وتیان لەشکری روس هات بەرەوخوار، هەموو حدوود گیراوە، هەر ئەو شەوەی کە ئێمە چووین لە سنور دانیشتووین، چاوەروانی ئەو برادەرە ئێرانیانەمان ئەکەین کە بێن، ئیتر ئەوە ئەو کوردایەتییە و هەوڵدانە هەبوو بۆ ئەوە، پێک نەهات. دیارە لە دواییا ئەو ئیتساڵە ببوو لە رێی میرحاج و مستەفا خۆشناوا.

**عەلی:** مامۆستا ئەو دەمەی کە دەفەرمووی کە ئیسماعیل شاوەیس و ئەوان ئیتساڵیان بە تۆوە کرد، کۆمەڵەی هیوا ئینشقاقی تێ کەوتبوو؟

**مامۆستا:** هەر نەمابوو تەقریبەن! وەکوو شتێک نەمابوو، ئەو کۆمەڵە خەڵکە مابوونەوە کە ئەگەرچی بە ناوی "هیوا"وە ئیشیان ئەکرد بەڵام چ پێوەندییەکیان لە گەڵ "هیوا"ی پێشوو نەبوو. ئەوە بە سەرکردایەتی یونس عەبدولقادر ئەندامەتی محەمەدی

شێخ سەلام کە زابت بوو لە گەڵ مەحموود کوردی ئەویش زابت بوو، لە گەڵ رەمزی عەبدولکەریم، لە گەڵ ئەمین رەواندزی، ئەوانە سەرکردایەتی ئەو ئیشەیان ئەکرد، چەند کەسێکی دیکەشیان لە گەڵ بوو کە زابت بوون، مستەفا خۆشناو، میرحاج خۆیان لەو کەسانە بوون، عزەت عەبدولعەزیز، ئەمانەش لەو کەسانە بوون کە لەو هینە تازەیە لەو تەنزیمە تازەیەی دوای پارچە پارچە بوونی "هیوا" ئیشیان ئەکرد.

هینەکەی ئێمە ناوی لقی کوردستانی عێراق بوو، نەک لقی سلەیمانی، چونکە ئێمە تەنزیمان لە زاخۆ، لە شەقلاوا، لە دەهۆک، لە هەولێر، لە جێی وا دووسێ ئەندامان بوایە تەنزیمان دروست ئەکرد، لە سوریا ئێمە بۆمان کردن، کەسی کە نەیکرد، ئێمە لقی کۆمەڵەی ژ . ک مان بۆ دروست کردن لەوێ، فەقەت ئێقتراحەکەی ئێمە ئەوە بوو هی سوریا کوردستان نەبێ، هەر کورد بێ، ئەوە حەتا بۆ پارتی کوردی سوریاش وای لێهات هی سوریا "کوردستان" نەبێ، "کورد" بێ. جا رەئییەکەی ئێمەش ئەوە بوو گۆیا ئەگەر نەڵێین "کوردستان" نەختێک دوژمنایەتییەکە کەمتر ئەبێتەوە لە گەڵ سوریا، یانی ئەبێ بە موشکیلەیەک وەک موشکیلەی ئەقەلییات سەیر بکرێ کە بە ئاسانی حەل کرێ، بە ئاسانتر لەوەی وەکو "کوردستان" حەل ئەکرێ وە ئێستاش تەقریبەن هەروا مایەوە. ئینجا ئێمە کۆبوونەوەیەکمان کرد لە ماڵی سمایل شاوەیس، بێجگە لە ئەو برادەرانەی کە ناوم بردن، عەلی مەدهۆش، هەروا بێتەوە عەزیزی میرزا ساڵح، رەشیدی فەتاح ئەفەنی، فایق بێکەس خوا عافوی کا، هەروا بێتەوە سەدیق شاوەیس برای ئیسماعیل شاوەیس، ئەمانە و یەک دوو ژنیش.

**عەلی:** ژنیش؟

**مامۆستا:** بەڵێ ژنیش! بەهیە فەرەج مردووە وابزانم، خەڵکی سلەیمانییە، لە گەڵ ناهیدە خۆی، ناهیدەی شێخ سەلام ئەمانە بوون بە ئەندام تێیا وە لەو کۆبوونەوەیا منیان هەڵبژارد بەوەی کە سکرتێری لقەکە بم، ئەوان منیان هەڵبژارد.

**عەلی:** یانی خۆتان لە ئیش و کارا خودموختار بوون؟

**مامۆستا:** خۆمان خودموختار بووین!

**عەلی:** یانی لە مەهابادەوە...

**مامۆستا**: نا هیچ تەعلیماتێک، شتێکیان لە ئێمە نەئەزانی، مەعلوماتێکی ئەوتۆیان لە بارەی ئێمەوە نەبوو، تەنیا ئەوەندەیان ئەزانی کە خەبەریان دابووینێ. لە ئاخریدا وای لێهات یەعنی ئێمە ببین بە حەلقەی پێوەندی لە بەینی ئەوان و حەتا پارتیا کە دروست بوو! یانی مەلا مستەفا و ئەوشتانە. جا ئێمە ئەوانەمان دروست کرد، یەکەم جار کە دەستمان پێکرد ئێمە هەندێک هێنمان هەبوو بەرامبەر بە پرۆگرامەکە، بۆمان نووسین لام وایە، نازانم تۆ پرۆگرامەکەیانت لایە؟ ماوە؟

**عەلی**: پچر پچر لە ئۆژمارەی "نیشتمان"دا هەیە، هەندێک جار دەڵێ دوو بەندی مەرامنامە...

**مامۆستا**: یەکێک لەو شتانەی مەسەلەن کە ئێمە داوامان کردبوو بکرێ، لە بەر ئەوەی "هیوا" وابوو، کە ئەو شوێنە یانی کوردستانی ئێران کوردایەتی تێیا لە هەموو شوێنێکی کە گەرمترە و هیوای سەرکەوتنی زیاترە بە حیسابی ئەوەی سۆڤیەت هاتووە داگیری کردووە، وەکوو بێکەس شێعرێکی بۆ نووسیبوون لە نیشتمانا بوو لە یەکێ لە هێنەکانا نووسرابوو:

"لەشکری سوور چەتری کێشاوە بە سەریا وەک هوما"

**عەلی**: هەمو شاعیرەکان نووسیان، هێمن، هەژار...

**مامۆستا**: ئاخر هێنەکەی ئەو لەملاوە هاتبوو، حیسابەکەی ئەوان ئی خۆیان جیایە، ئێمە بڕوامان وابوو کە ئەوە ئەبێ بە بناغەیەک بۆ گچکە دەوڵەتێکی کوردی و ئەوە ئەبێ بە بنکەیەک بۆ هەموو پارتییەکانی کە لقی ژ. ک ن و ئەمانە هەموو سەربەخۆییەکیان هەبێ لە کاروباری خۆیانا هی تەکتیکی، بۆ ستراتیجی ئەبێ پێچەوانەی ئەو ستراتیجییە نەبن کە ساڵێ جارێ یا دوو ساڵ جارێ کۆبوونەوەیەکی گشتی ئەم لقانە لە مەهاباد یا لە جێیەکی کەی ئێرانا کە پێویستە ئەیکا و بریاری لە سەر ئەدا. ئەم شوێنە بە پێی زرووف و زەمانی خۆی ئەو هێنە جێ بە جێ ئەکات. نوختەیەکی کە هەبوو، ئەوان لام وایە نازانم لە کوێیان وەرگرتبوو کە وا ئەندام نابێ واز لە کارکردن لە گەلیان بێنێ، ئەبێ تا ئاخری عومر لە گەڵیان بمێنێتەوە، ئەمەشمان پەسەند نەکردبوو، بەعەکسەوە ئەو کەسەی ئەیهەوێ لاچێ، تۆ ئەبێ بە زووترین وەخت خۆتی لێ رزگار

کەی، تەنها مەسئولییەتێ لە سەرێتی ئەوەیە نهێنی هینەکە نەڵێت، ئەگەر وتی وەکوو خائینێک وەکوو جاسووسێک سەیری کرێ، وەکو ئەندامێکی کۆن سەیر نەکرێ. یانی ئەوەی بە زۆر خەڵک بە خۆمانەوە ببەستینەوە، ئەوە بە لای ئێمەوە غەڵەتی تیابوو، هێندێ ئەوانەم بۆ نووسیبوون، نەختێ لەم نەوعە شتە وردانە. خۆی سوێند خواردنەکە، ئەوە هین نییە! خۆی من ئیعترازم لە هینەکەی "هیوا" ئەوە بوو کە پێیان وتم وەرە ببە هین، کە پێم گوتن جارێ پرۆگرامتان نییە، ئەوە هیچ، خەڵقیان هێنابوو لە بەر چاوی من لە ماڵی رەشید عارف بوو لە بەغا، ئەمین رەواندزی و ئەوان خۆیان لەوێ بوون، منیشیان بانگ کردبوو، هینەکەی من بۆ دەعوەت بوو هینەکەی ئەوان بۆ سوێند خواردن بوو، سوێندیان ئەدان، قورئانێک داندرابوو، دەمانچەیەکیش داندرابوو، سوێندیان ئەدان بەم قورئانە، بەم دەمانچەیە، رەسمێکی سەرۆکی باڵاشیان هەڵاوەسیبوو...

**عەلی:** کێ بوو سەرۆکی باڵا؟

**مامۆستا:** سەرۆکی باڵا رەفیق حیلمی بوو، هەڵیان واسیبوو، سوێند ئەخورا، بەم قورئانە، بەم هینە! چییە سوێندەکە؟! خیانەت لە کورد ناکەم! وتم کاکە من ئەوە ناکەم، من نە سوێند بەو دووانە ئەخۆم، سوێند بەو شتانە ناخۆم نە ئەو سوێندەش ئەخۆم کە خەیانەت بە کورد ناکەم! یانی چی خەیانەت لە کورد ناکەم؟! ئەمە بە هینێکی ئەگوترێ کە گومانت لێیەتی خەیانەت بکا! ئەمە خۆی ئیهانەتە! تۆ ئەبێ سوێندی ئەو کەسە بدەی کە بە سەری، بە ماڵی، بە هەرچی هەیە لە رێی میللەتەکەیا فیدای بکا! خەیانەت ناکەم چییە؟! لە پاشان ئەو هینانە بە کەڵک نایە! گلەیەکەمان ئەوە بوو، لەوەش گلەییمان ئەوە بوو کە سوێند نابێ وابێ، دەبێ هینەکەی بگۆڕێ وە ئەوان هەنێک لە شتەکانی مەیان قەبوڵ کردبوو وە پێوەندێکی باش هەبوو لە بەینمانا وە خەڵکی زۆر لە مەهابادەوە ئەهات ئێمە یارمەتیمان ئەدان، بۆ کتێب، کتێب و گۆڤار و... هیچ شتێک لە ئێران نەبوو، مەسەلەن کتێبی مەکتەبمان بۆ دزین! یانی هەر بە دزین بۆمان دزین، کوڕێکمان لا بوو خەڵکی ئامێدی بوو ناوی سامی بوو، دزی بۆ کردین، خۆی مەسئولی دائیرەکە بوو، لە دائیرەکە دزی بۆ کردین، کتێبەکانی بۆ دزین وە بۆمان ناردن وە پاشان خەڵکەکان کە دەهاتن یارمەتیمان دەدان هەر بۆ شت کرین و شتی تر...

**عەلی:** مامۆستا ئێوە باسی کۆمەڵەی ژ . ک دەکەن کە لە لای ئێوە لقی دامەزراندووە و ئێوە پەیوەندیتان بە سوریاشەوە گرتووە و... چۆنە کە دوکتۆر قاسملو لە کتێبەکەی خۆیدا ئەڵێ کە کۆمەڵەی ژ . ک ڕێکخراوێکی سیکرێت و داخراو بوو، ئەوە چۆنە ؟

**مامۆستا:** خۆی لە ئێرانا چۆنی کردبێ جیایە، لای ئێمە لە کۆبوونەوەی ڕەسمیا ئەچووین و دادەنیشتین و لە هەموو شتێک حیسابێکمان بۆ ئەکرا کە هێن بکەین وە نوێنەری خۆمان سمایل شاوەیس و هێنمان ناردبوو جەمهوریەتی مەهاباد.

ئەوان (کۆمەڵەی ژ . ک) زۆر هێن بوون، چالاکێکی باشیان هەبوو وە ئەو کەل و پەل و هەرا و هوریایەی کە لە ڕوس وەرگیرا زۆرتری حەول و تەقەلای ئەوان بوو، حەتا ئەو کەسانەی کە نێردران بۆ خوێندن دیسان بە دەستور و یارمەتی ئەوان بوو وە ئەگەر ئەوان ئەوەیان نەکردبایە باقرۆف هەر نەیدەهێشت حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش دروست بێ! حەتا بەو زەعیفی و هینە کە هەیە! چونکە باقرۆف کوردی پێشکەش کردبوو بە سۆڤیەت بە وەی کە کورد عەشیرەتییە وە پێشکەوتوو ئازەربایجانییە! کە ئەوە یەکێک بوو لە غەڵەتە هەرە گەورەکانی چونکا ئازەربایجانی با شوعوری هینیشیان هەبێ فەقەت ئازەری حاکمی ئێران بوون لە ڕووی ئیقتسادیش و لە ڕووی سیاسیشەوە، ئیتر حوکمی زاتی زەرەریان لێ ئەدا!

لە بەر ئەوە ئەوەی ئارەزو و تاسۆقی سەربەخۆیی هەبێ کە ڕوسان ئەیانزانی، ڕوسی پێش سۆڤیەت ئەیزانی، ئەوەی ئارەزوو و تاسۆقی بوو بۆ سەربەخۆیی کورد بوو نەک ئازەری! لە بەر ئەوە ئەو غەڵەتە گەورەیە پێی هێن کردن، لە ئاخریا بە نیوە، نیوەچڵ سەپانی بە سەریانا.

**عەلی:** ئەوە هەر ئەوە بوو کە باقرۆف ئازەری بوو بۆ خۆی و...

**مامۆستا:** بەڵێ! شتی تری لە میشکا بوو، ئازەربایجانی گەورەی لە مێشکا بوو...

**عەلی:** دوکتۆر قاسملو هەروەتر دەنوسێ کە کۆمەڵە سەردەمێک بە بریتانیای مەزنی هەڵدەگوت و سەردەمێک بە لێنین و ئاگادار نەبوون لە وەزعی نێونەتەوەیی و

دونیا و...

**مامۆستا**: من ئەڵێم ئاگادار نەبوون لە دونیا! کوردی ئێران هەر هەموویان ناگادار نەبوون لە دونیا وە ئەوەیە ئێستاش کوردایەتی کوردی ئێران ئەبینین ئێرانچێتی بە قەد کوردایەتی تێدایە! یانی هیچ هینت لە گەڵا ناکەم! حیسابەکەی وایە، جا لەبەر ئەوەیە لای ئێمە یانی کوردی عێراق ئەو کەسانەی وەکوو زەبیحی کە پێشڕەویانە وە وەکوو مەلا ئاوارە، وەکوو هەنێک لە برادەرانی تر وەکوو قادر شەریف و ئەمانە کە ئەهاتنە لای ئێمە راست و رەوان حیسابی کوردایەتێکەی خۆیانیان ئەخستە ئەو جێیەی کە ئیشەکەی تێیا لەبارە وە سەرگرتن لە پێشیانە، هیوا هەیە سەرکەوێ، وازیان لەوە ئەهێنا کە هێن بێ، یانی وازیان لەوە ئەهێنا کە بە چوار نەفەرەوە بێنە حدوود لە شاوەدین دوو تەقە لە لەشکری ئێران بکا و لەشکری ئێران بێ سنورەکە لە من بگرێ و نەهێڵێ نانم بۆ بێ! کە ئێمە لە ئابلۆقەی عەبدولکەریم قاسمیش داین! مەسەلەن ئێ، ئەوە کوردایەتێکی تەواو نییە! لەو وەختە، بە لای منەوە ئێستا کوردی عێراق ئەبێ بە هەموو نەوعێ خیلافی خۆی ببڕێتەوە وە بە هەرچی پێشی ئەکرێ یارمەتی کوردی تورکیا بدا! چونکا لەوێ ئەمەلی سەرکەوتن زیاترە وە پارچەکانی تری کوردستان سەرکەوتنیان تێیا نابێ بە هیچ نەوعێ مادام تورکیا شتێکی دەس نەکەوێ!

لە تورکیا نیوەی ئەوەی عێراقی کۆنیان دەس کەوێ ئێمە و کوردی ئێران ئەتوانین تا نیزیکی سەربەخۆیی بڕۆین چونکا ئەوەی بۆتە قورتی گەورە لە رێگای کوردایەتییا تورکیایە! هێشتا خۆ شەری پ . ک . ک لە ئاوەوە نەبوو کە فیدرالی لە کوردستانی خواروو ئیعلان کرا، گورج تورکیا خۆی و ئێران و سوریا و خەریک بوون عێراقیشی بخەنە سەر بۆ ئەوەی دژی ئەو فیدراڵیێ راوەستن وە من زۆر جار لەو قسانە کە لە گەڵ برادەرانا ئەیکەم کە بە چاوی ئێرانیێتی و عێراقیێتی و تورکیێتی و شتی وا سەیری وڵاتەکە ئەکەن ئەڵێم زۆر سەیرن! ئێمە دوژمنەکانمان وەکوو یەک سەیرمان ئەکا، دوژمنەکانمان وڵاتەکەمان بە یەک ئەزانن، دوژمنەکانمان میللەتەکەمان بە یەک ئەزانن، دوژمنەکانمان سەرکەوتنمان، بستێک عەرز دەسکەوتنمان، ئەختێک قازانجمان بە مەسڵەحەتی هەموو میللەتەکە ئەزانن و ئەڵێن تەشەنە ئەکاتە ئێمە، ئێمەش ئەگرێتەوە! ئێمە بۆ خۆمان ئەوەندە کەر بین

ئەوە نەزانین کە عەقلیشمان پێی ناشکێ لە دوژمنەکە فێر بین! ئەوەی دوژمنەکە پێی ناخۆشە بۆ تۆ دیارە بۆ تۆ باشە وە ئەوەی پێی خۆشە بۆ تۆ دیارە بۆ تۆ خراپە با عەقلیشمان نەبێ خۆمان! من تا ئێستا وام ئەزانی هەر مانۆتسەدۆن وای گوتووە لەو بەینەدا گوێم لێ بوو کابرایەک باسی پێغەمبەر ئەکا وا وێدەچێ محەمەدیش وای گوتبێ!

**عەلی:** ئەوە چۆنە کە کۆمەڵەی ژ . ک هەم باسی بریتانیا ئەکا و هەم باسی لێنین و سۆڤیەت و... ئەکا ئەو سیاسەتە چۆن ئەبینی؟

**مامۆستا:** ئەو سیاسەتە لە ناشارەزاییەوەیە. ئەو وەختە کە ئەوان لە گەڵ "هیوا" پێوەندیان پەیدا کرد پێوەندێکەیان لە گەڵ بەشی رەفیق حیلمی بوو، بەشی رەفیق حیلمی سەر بە بریتانیا بوو، ئەوە ئەو بەشەی کە ئی وان بووە، کە مەقالەی دووهەمی نووسیوە ئی بەشەکەی ترە، ئەوان خەبەریان نەبوو لەو شتانە!

**عەلی:** یانی ئەوان تەحتی تەئسیری کۆمەڵەی هیوا بوون؟

**مامۆستا:** بەڵێ لەو سەردەمەدا کە باسی ئینگلیس ئەکەن! شتێکی کە، ئەمن "نیشتمان"م لە کوێ وەرگرت؟! من نیشتمانم لە زابتی ئیستخباراتی بریتانی لە سلێمانی، لای ئەو دیت، لە پێش ئەوەی ئێمە بزانین کە ئێمە گۆیا مەسئولی ژ . ک ین بزانین، لەوێ بوو! چونکا بۆ "هیوا"یان ناردبوو، "هیوا" لە رێی رەفیق حیلمی یەوە دابووی بە ئەو! ئێمە ئاگامان لێی نەبوو کە هەیە من ئێستە زۆر چاکم لە بیرە کە چووم دیم لای موتەسەرفی سلێمانی دیم، مەعروف جەواد، لای ئەو دیم، پاشان بەهائەدین نووری هات بوو بە موتەسەریفی سلێمانی، ئەویش لەبەر گۆرانکارییەک کە کرابوو، لەبەر وەزعی ئێران کە نەوەکا کوردی عێراقیش بیکا بە هەرا، هەندێک کوردایەتی تێکەڵ ببوو، ئەوە بوو زابیتە کوردەکانیان کردبوو بە مەسئول لای مەلا مستەفا و نازانم چێیان کردبوو و... خەریک بوون وەزع بگۆرن بە نەوعێک. جا ئەوە بوو وای لە ژ . ک کرد کە جەریدەکە لای ئەو بێت، کە جەریدەکە لای ئەو بێت تەبعەن باسی بریتانیا دەکا وە ئەو رەئییە هەبوو لە ناو "هیوا"دا. حەتا یەک مەقالە هەیە لە عومریادا لە ناو "گەلاوێژ"، ئەویش عەلائەدین سجادی وەری گرتبوو لە سەر مەلیکەی بریتانیا مەقالەی نووسیبوو، نازانم بە موناسەبەتی رۆژی لە دایک بوونیا ... هاتمە لای لە بەغدا وتم کاکە بێنە! وتی

چی؟! وتم بەشی خۆم! وتی چی بەشی خۆم؟! وتم چەندت وەرگرتووە ئەو مەقالەیەت نووسیوە؟! وتم من بە ٥٠٠ دینار نایینووسم، ٥٠٠ دیناری ئەو زەمانە! وتی بۆ؟! وتم نابروی خۆم نافرۆشم بە ٥٠٠ دینار! ئێمە مجەلەیەکی سیاسیمان نییە، مجەلەیەکی ئەدەبیمان هەیە، شتی وا نابێ بنووسی! وتی ئاخر... ئاخر... ئەدی باسی لێنین و ستالین و ئەوانە بۆ ئەکەین؟! وتم باسی ئەوانە وەک سیاسەت ناکەین، شتێکی تێیا نییە، ئەوەڵ ڕۆژ کە دەستمان پێکرد کە بیکەین کە ئەوان بوون بە حەریف لە گەڵ یەکا، لە بەر ئەوە ئەگەر لەو وەختەیا بتکربایە قەی نەئەکرد فەقەت پێش ئەوە کراوە لەبەر ئەوە قەبوڵ نییە! جا ئەو ئیتجاهە هەبوو وە بریتانیا حەولی ئەدا کە کوردایەتی بە لای خۆیا ڕاکێشێ، بە ئەمری خۆی بجوڵێتەوە، چی ئەوێ ئەوەی بۆ بکا، چی ئەوێ ئەوەی پێ نەکا! حەتا لەو وەختا یەعنی لقەکەی ئێمە چالاکێکی هەبوو لە مەسەلەی مەلا مستەفا، جا ئەوە لە مەی زەبیحی دوور ئەکەوینەوە، خۆی زەبیحی لە دوای رووخانی مەهاباد خەڵک هاتن لە ئێرانەوە، یەکێک لە وانە ئەو برادەرێک بوو کە لە ئاخریا بوو بە زابیت لە سەعودیا، لە ئاخریا بە تەیارە کەوتە خوارەوە لە شام. کێ بوو ئەوە؟! چیان پێ ئەوت؟[1] تەیارەیەک کەوتە خوارەوە لە بەینی شام و سەعودیا وە ئەو برادەرەی تیا بوو، ئەوە من بە تەزویر پاسپۆرت و هەویەم بۆ دروست کرد لە سلێمانی کە ناردمانە دەرەوە. یەکێکی کەشمان ویستی بچێ بۆ جەزائیر لەوێ ببێ بە زابیت، وابزانم ئەوە بوو نەمان هێشت بچێ، وتمان ئەچی چی ئەکەی لە جەزائیر ئەبی بە عەسکەری فەرەنسی، ئەچی باشترە ئەوە بوو چوو بۆ سەعودی. یەک دوانێک لە وانە هاتن حەولمان دا رزگاریان کەین، زەبیحی هات حەولی رزگار بوونی نەبوو، وتی ئێرە وڵاتی خۆمە و هاتوم لێرە دانیشم.

**عەلی:** کۆمەڵەی ژ . ک چۆن تێک چوو ئایا زەبیحی موخالیف بوو یان چی؟ چۆن بوو بە حیزبی دیمۆکرات؟

**مامۆستا:** من بڕوام هەیە کە زەبیحی یەکێک بوو لەو کەسانەی کە موعارزەی

---

١-دەبێ مەبەست تێکۆشەر "برایمی نادری" خەڵکی کرمانشان بێت، کە لە دەزگای کۆماردا کاربەدەستی وەزارەتی فەرهەنگ بوو، لە ڕۆژنامەی "کوردستان"دا نووسراوەی هەیە، دوای تێکچوونی کۆمار ماوەیەک گیرا، پاشان ئێران و کوردستانی بە جێهێشت و چووە شام. (دانەر)

ئەوەی کردبێ، چونکە زەبیحی کوردستانی بوو. ئەو حیزبەی کە دروست بوو ئەگەرچی بە ئێمەیان خەبەر نەدا یانی هێن و پرۆگرامەکەیان بۆ نەناردین، لە ئاخریا کەوتنە جەریدە ناردن بۆمان وە کە حکومەتەکە دروست بوو پەیوەندێکی زۆر پەیدا بوو لە بەینی ئێمەیا، یانی خەڵک ئەیتوانی بە کاغەزی ئێمە هەر مۆری ئێمەی پێوە بێ بچێ بە سنورا و بۆ خۆی چی پێخۆشە بکا و هاتووچۆکەرانێ کە بۆ مەلا مستەفا ئەهاتن هەر بەو ناوە ئەهاتن.

**عەلی**: ئایا مامۆستا هەمزە عەبدوڵا لە لایەن ئێوەوە هات بۆ مەهاباد؟

**مامۆستا**: نا! هەمزە عەبدوڵا وەختی خۆی چوو بۆ مەهاباد، هەمزە عەبدوڵا خۆی شیوعی بوو "هیوا"یی نەبوو، شیوعی بوو کە زانی ئەوە مەهاباد لە لایان شیوعیانەوە داگیر کراوە و مەلا مستەفا بە ناچاری چووە ئەوێ، مەلا مستەفا لە ناچاریا چوە ئەوێ! یانی جێیەکی کەی نەبوو وە نوقتەیەک هەیە لێرە: مەلا مستەفا کە چوو ئەوێ چۆن موقابلەکرا، چۆن قەبووڵ کرا؟!

**عەلی**: وابزانم لە هەوەڵەوە بە باشی قەبوڵ نەکرا!

**مامۆستا**: ئەبەدەن! وەک جاسووس سەیر کرا! لە دێیەک بوون نازانم شەیتان ئاوا هەیە؟! زۆری ئەوان لە شەیتان ئاوا بوون وە توشی وەبا ببون وە توشی رەشە گرانەتایی، ئێمە رەشە گرانەتایی پێ ئەڵێین، داوای دەرمان و مەرمانیان لە ئێمە کردبوو، مەلا مستەفا کاغەزی بۆ من ناردبوو بە خێر کە ئێمە یارمەتیان بدەین، من مەلامستەفام تەبعەن ئەناسی لەوەی پێش، یانی ئاسییاوێکمان لە بەینا هەبوو، کاغەزی نووسیبوو کە یارمەتی بەین وە ئێمە یارمەتیمان کۆکردەوە، ئێمەی ژ. ک! یارمەتیمان کۆکردەوە کە بۆی بنێرین، یەکەم یارمەتی کە لە سلەیمانی چووبێ بۆ مەلا مستەفا لە لایەن ژ. ک وە کۆکراوەتەوە وە جاری دووهەمیش ئێمە بۆمان کۆ کردەوە وە ئەوەی کە کردی بەم قەهرەمانە ئێمە بووین کە نەمان هێشت بگەڕێتەوە بۆ عێراق! چونکا مەلا مستەفا لەو کاغەزەیا کە لە گەڵ هەمزە عەبدوڵایا ناردبووی بۆ من، دوو کاغەزی بۆ من ناردبوو، یەکیان ئەوە حیزبێک دروست ئەکەین ئێمەش وەک ئەو حیزبەی ئێرە -حیزبی دێمۆکراتی کوردستان- ئەوان ناویان نابوو -حیزبی دێمۆکراتی کوردی عێراق- ئەمە یەکەم، من یارمەتی هەمزە

بدەم مەلا ئەڵێ. دووهەمیان کاغەزێکی تێیایە ئەڵێ ئەو کاغەزە بدە بە بابە عەلی کوڕی شێخ مەحموود، وەزیری کردبوو شەخسێکی ناسراو بوو، عەلاقەی هەبوو لە گەڵ دەوڵەتانا و بە حیساب لە ئەمریکا خوێندبووی و پەیوەندێکی هەبوو لە گەڵ ئەو ئەوعە شتانە، ئەو کاغەزە بدەم بە ئەو، کاغەزەکە دانەخرابوو تەبعەن حەقم هەیە بیخوێنمەوە، کاغەزەکە نووسیویێتی ئەڵێ ئێمە کۆبووینەوە قەرارمان دا کە بێینەوە عێراق! ئەو حوکمەی کە دراوە بە سەر ئێمەیا نازانم ١١٠ کەس ١١١ کەس شتێکی ئاوا حوکمی ئیعدام درابوو، ئەو حوکمە ئیعدامە بگۆڕدرێ بە مۆئەبەد یانی ئەبەدی، ئێمە خۆمان ئامادەین بچین بۆ حەپسخانە و تا ماوین لە حەپسخانە بین، فەقەت ئەو کەسانەی کە بە ناحەق دوور خراونەوە بێڵن بچنەوە جێی خۆیان و سەر کار و ئیشی خۆیان وە عەرز و ئاوی خۆیان بدرێتەوە خۆیان و ملک و ماڵی خۆیان بدرێتەوە وە هیچێکی کەمان لەمە زیاتر ناوێ و عەفوێکی عام دەرچێ بۆ وانی کە، ئەگەر لوتف ئەکەن خۆیان ئێمەش عەفو ئەکەن ئەوە باشتر بەس ئێستا ئێمە بۆ خۆمان داوای ئەوە ناکەین و ئامادەین بۆ تەسلیم بوونەوە! ئەوە لە وەختێکا ئەو کاغەزە دێ کە حکومەتی ئێران توانیویێتی هەموو عەشیرەتەکانی کوردی ئێران بکڕێ یان بەشی زۆریان! یانی تەنیا ئەوانەی عەلاقەیان بە عێراقەوە هەبوو نەکردرابوون، حەمە رەشید خان نەکردرابوو مەسەلەن. کتێبەکەی ئەوشیروان گەلێک لەو وەسیقانەی تێیایە کە حەمە رەشید خان تا ئاخر لەحزە لە سەر ئەوە بووە شەر بکرێ، من ئەوەم بە خەیاڵا نەدەهات بۆ حەمە رەشید خان! جا ئەمە من کۆبوونەوەیەکم کرد بە ژ.ک ی خۆمان، کۆبووینەوە وتم من ئەو کاغەزەم بۆ هاتووە چی لێ بکەم؟! یەک دوو برادەر لە پڕ وتیان بیکە، جێبەجێی کە قەی چ ئەکا! وتم بابە هێناومە لێکی بەینەوە، کەوتینە قسە کردن لە سەر مەوزوعەکە، ئەمە لەو وەختەیا، لە وەختێکی کەیا بایە رەنگە قازانجی بوایە چونکا مەلا مستەفا لە عەزابا بوو لە حاڵێکی خراپا بوو وە ئەو خەڵقەی لە گەڵیا بوو دیسان هەروەها بوون وە بە چاوێکی خراپ و ناحەق سەیریان ئەکرا چونکا ئەگەر ئەوان جاسووسی ئینگلیس بوونایە ئاوایان بە سەر نەدەهات! هیچ ئەبێ جاسووسی ئینگلیس نەبوون لەو هەنگاوەیا، لەبەر ئەوە گوناحە وایان لێ بکرێ، ئەبوایە یارمەتیان بدەین بەڵام بۆ ئەم دەورە ئێمە ئەبێ حەول بدەین مەلا مستەفا نەیەتەوە، ئێستە

حکومەتی مەهاباد هێزێکی هەبێ ئەو ٥٠٠-٦٠٠ کەسەیە وە ئەو رەنگە ١٠٠٠ کەسە بێ کە لە دەوری خۆی ئەمێنێتەوە، شتێکی کەی نامێنێ! ئەگەر ئێمە حەول بدەین ئەو ناکۆکی بەینی مەلا مستەفا و وان نەهێڵین شتێکی باش نەبێ! یەک دوو برادەریش عەینی رەئیان لە خۆیان پێشان دا یانی مەلا مستەفا بچێ بۆ لای قازی محەمەد و قازی محەمەد رەئی بگۆڕین بەرامبەر مەلا مستەفا، چی بکەین باشە بۆ ئەمە؟ مەزبەتەیەک بکەینەوە: کوردی عێراق مەلا مستەفا بە نوێنەری خۆی ئەزانێ، مەلا مستەفا سەورەیەکی وەتەنی کردووە دژی داگیرکەرانی کوردستان، لە عێراقەوە ئێستە دەربەدەرە لە پارچەیەکی کەی کوردستانا کە پارچەیەکی وڵاتی خۆیەتی، هاتووە لەوێ بژی و خزمەتی ئەو هینە بکا! ئەو مەزبەتەیە تەبعەن ئێمە مەسەلەن من شەخسی نەمئەتوانی بە هەنێک کەسی ئیمزا کەم، هەنێک کەسی کەمان وەک سمایل شاوەیس نەیئەتوانی بە هەنێک کەسی ئیمزا بکا، بەڵام هەرکەسی وەک سەرۆک عەشیرەت و شتی وا کە منیان بە شیوعی ئەزانی مومکین نەبوو من هینیان لە گەڵ کەم. ئینساف بڵێ پیاو، شێخ لەتیفی شێخ مەحموود زۆر بە کەڵکمان هات لەمە، زۆری یارمەتی داین، یانی توانی وەختە بڵێم لە سەدی حەفتای عەشیرەتەکانی کورد ئیمزایان لێ وەرگرێ بۆ ئەو مەزبەتەیە کە ئێمە نووسیبومان وە ئەم مەزبەتەیە نێردرا بۆ کۆماری مەهاباد بۆ قازی محەمەد خۆی!

مانگێکی پێ نەچوو ئەو کەسەی کە تەتەر بوو لە بەینی هەمزە و هینا، هەمزە لە ماڵی ئێمە بوو، ئەو کەسەی کە تەتەر بوو لە بەینی هەمزە و مەلا مستەفا بە کاغەزی من ئەچوو، مۆرێکم بۆ پێوە ئەنا ئەچوو و ئەهات، ئەم پیاوە گەڕایەوە، لە سەفەری مەهاباد گەرایەوە دوو تفەنگی برنووی پێیە، هیناویتی بە دیاری لەو ٤٢٠-٤٥٠ تفەنگەی کە قازی محەمەد داویتی بە مەلا مستەفا! یەکەم دیاری، یەکەم شت کە بیدرێتێ وە مەزبەتەکەی قەبوڵ کردووە. مەلا مستەفا هاتووە بۆ مەهاباد، بووە بە جینێراڵ و بووە بە چی و... بووە بە چی و...! ئەو قەرارەی تەبعەن جەماعەتەکە نەیان گوتبایە من نەمئەتوانی بیکەم، جارێ واجبە وەک ئەمانەتێک بیکەم، وەکوو حیزبێک قەراری ئەکسەرییەتە من کابرایەکم ئەوان هەڵیان بژاردووم، من کابرایەکم نە رەئیسی عەشیرەتم و نە چەکم هەیە و نە هینم هەیە لەبەر ئەوە مەجبوورم بە قسەیان بکەم، یانی

ئەو قەرارەی ئەوان نەبوایە مەلا مستەفا هەر زوو ئەهاتەوە چونکا عەفوەکە ئەکرا یانی ئەو عەفوەی ئەو داوای کردبوو شتێک نەبوو نەکرێ، ئێعدامەکان بگۆڕدرێ! ئەمە حیسابەکەی یارمەتی ئەم، جارێکی کەش یارمەتی مەلا مستەفامان دا هەر لەو لێقەومانایا بوو بۆ جاری دووهەمیش یارمەتیمان دا ئەوە بوو قازی محەمەد لە گەڵ مەلا مستەفا کەوتنە ئەو هینە و...

نوقتەیەکی کەی تاریخی هەیە، چونکا ئەگەر چی هینەکە عەلاقەی بە زەبیحی نییە فەقەت زۆرتری تەرکیزەکە ئەبێ لەسەر کۆمەڵەی ژ . ک و نەتیجەکەی و کۆماری مەهاباد و ئەوەوە بێ.

پیاوێک هەبوو من ئەمناسی کوردێکی فەیلی زۆر بە خزمەت، خزمەتی ئەهێنی، ناوی محەمەد باشقە بوو، ئەم پیاوە ئینگلیزەکی باشی ئەزانی، نازانم چۆن فێر ببوو، لە گەڵ مێجرسۆن عەلاقەی هەبووە، لە گەڵ مێجرسۆن ئەلف و بێی کوردییان داناوە، ئەلف و بێی کوردی بە لاتین، لەو زەمانە لە سلەیمانی لە مەعاریفا بووە یانی لە بیستەکانا، سەرەتای بیستەکان، ئەم پیاوە لە ئاخریا بوو بە مەئموورێکی زل، ئەم پیاوە بێجگە لەمە پیاو چاکەیەکی کەی بڵێ: گۆڤاری گەلاوێژ نەئەهاتە مەیانەوە، کەس نەیئەزانی شتێک هەیە لە سەر عەرزا ناوی گەلاوێژە محەمەد باشقە نەبوایە! کە خۆی بە ڕەفاقەت نەک بە سیاسەت بە ڕەفیقی بۆی وەرگرتم، ئیجازەکە ئەو دایێ، لە پاش ئەوە کە حکومەت ڕەفزی کردبوو! ئەم پیاوە هاتووچۆم ئەکرد مودیری دعایە و نەشریان پێ ئەوت، دعایە و نەشر وەکو ئیرشاد و میرشادەکانی ئێستە وایە، لەوێ مەسئوولی زمانی بێگانە بوو، هەرچی شتی بێگانەی بۆ هاتبایە ئەخوێندرایەوە بزانن بۆ ئەوەی قەدەغە بکرێ یان نەکرێ، بڵاو بکرێتەوە یان نەکرێتەوە، لەمانە هەرچی قاچاغ بایە ئەیدا بە من، ئەیوت بۆ خۆت! لەوانە تێلگرافێکی پێشان دام وتی ئەم تێلگرافە بخوێنەوە، ئەم تێلگرافە کابرایەک هەبوو لە بەغدا دوکتۆرێکی ئاڵمانی بوو ناوەکەییم باش لە بیر نییە، دوکتۆری ڕەوانی بوو، لەو وەختەیا لە بارزانییەکان یەکێکیان ناوی شێخ برایم بوو، ئەم شێخ برایمە نەخۆشی ڕەوانی هەبوو، ئینگلیزەکان، ئەوەیە ڕەبتەکە کە ئەڵێن لە گەڵ مەلا مستەفا هینیان بووە، مەلا مستەفا و ئەوان تەیارێکی ئینگلیزیان گرتبوو، حورمەتیان گرتبوون، هینیان گرتبوون

ناردبوویانەوە! ئەمانیش تا ئەندازەیەک لە گەڵیان هێنیان ئەکرد، بۆیە رێیان ئەدا ئەم دوکتۆرە بچێ بۆ تەداوی، ئەم دوکتۆرە تومەس دووسەرە سێ سەرە جاسوسە! جامن بەو جاسووسانە ئەڵێم دودەکی کە دووسەرە... سێ سەرە... ئەو تەعبیرەیان بۆ بە کار دێنم! ئەمە چووە بۆ ئەوێ بۆ تەداوی ئەو، هاتۆتەوە ئەمەی هێناوە، گۆیا ئەمە نوسخەی ئەو تێلگرافەیە کە قازی محەمەد لێی داوە بۆ مەلا مستەفا! چییە؟! ئەڵێ: میللەتەکەمان گەیشتووەتە هەنگاوێک کە سەربەخۆیی زۆر لێ نیزیکە وە ئەوە بەندە بە یەکبوونمانا لە بەر ئەوە لە سەر سنور چاوەرێت ئەکەم کە بێی چاوم پێت کەوێ وە بیروڕای خۆمان یەک خەین بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی یەکگرتوی کوردستان. قازی زادە - محەمەد

**عەلی:** یانی ئەوە هێشتا مەلا مستەفا نەچووە بۆ دیوی ئێران؟

**مامۆستا:** نەخێر! لە سەورە دایە بەخێر.

وتی ئەڵێی چی بەرامبەر بەمە؟ وتم ئەمە چییە؟! وتی ئەم پیاوە هێناوێتی، هەموو شتێکی بە من ئەوت، وتی ئەم پیاوە هێناوێتی داوێتی بە مێجر ئەدمۆنس، مێجر ئەدمۆنسیش ناردوویە بۆ من نازانم بۆ ناردوویە بۆ من چونکا ئینگلیزی بە قەد من ئەزانێ و ئەو کوردییەش بۆ ئەوە نابێ کە تێی نەگا نازانم بۆچی بۆ منی ناردووە! وتم رەنگە بۆیەی بۆ ناردبێ پێشانی منی بدەی! وتی باشە دەی، تۆ ئەڵێی چی بەرامبەر ئەمە؟ وتم ئەمە درۆیە وتم نەک هەر ئەمە درۆیە کۆبوونەوەی جاری پێشوو کە وتیان داوای سێ سنور... چی... پەیمانی سێ سنوریش قسەی قۆر و درۆیە و ئەسلی نییە و ئەساسی نییە وە ئەمەش درۆیە! وتی باشە بۆچی ئەمانە دروست ئەکرێ؟! وتم زۆر بەسیتە، بۆ ئەوەی ئیسباتی کەن کە کوردستان شیوعێتی دروستی ئەکات! لە بەر ئەوە وەک پەیمانی سەعدئاباد وەک پەیمانی بەغدا وەک پەیمانی چی... پەیمانی بەغدا هێشتا دروست نەبیوو فەقەت پەیمانی سەعدئاباد لە ٣٧وە کراوە و ئەمە حەرەکەتێکە شیوعێتی بۆ کوردستانی هێن نەکرد و فێعلەن لەم رۆژانەیا سەیرەکەی ئەوە بوو، لەو وەختا لە پارلمانی عێراقی موناقشە بوو لە سەر هینا، ئێمە مەزبەتێکمان کۆ کردەوە بۆ مەسەلەی مەلا مستەفا کە حەل کرێ بە ئاشتی فێعلەن ئێمە وەک ژ. ک ئیشمان ئەکرد، لەوەشا شێخ لەتیف زۆر یارمەتی داین، مەزبەتەیەک کە وا بە ئاشتی حەل کرێ و توانرا شتێک

بکرێ و موناقشەکە بچێتە پارلمانی عێراقی! لە پارلمانی عێراق کە داوای ئەوە کرا بە ئاشتی کرێ وەزیری دیفاعی عێراق ئیسماعیل نامقی ناو بوو، هەستایە سەر پێ وتی ئەبێ بە شەڕ کرێ! ئەوە مونامەرەیە و ئەوە وایە و... و وایە و... دەوڵەتی کورد و جیابوونەوە و شتی وایە.

لە پاش ئەمە کە جەمهوریەتی مەهاباد رووخا، جەمهوریەتی ئازەربایجان لە پێشا رووخا، عەینی کابرا هاتەوە بە رۆژنامە و بە پارلمان و چی و چی وت: گوێتان لێیە قسەکەی من چەند راست دەرچوو، کە جەمهوریەتی مەهاباد دروست بوو (نەک رووخا) لە پارلمانا قیژاندی وتی ئەمەیە رۆژەکە ئەگەر ئەو وەختە ئەم ئاگرەمان نەکوژاندباوە وەکو من ویستم ئێستە ئەم ئاگرە لە تارانەوە ئەڕۆیشت تا بەحری سپی تا ئەسکەندەروونە، ئەمەیە خەتەرەکەی ئێمە لێی ئەترسێین! وە ئەوەیە ئەو خەتەرەی کە ئەوان وایان لێکرد کە مەلا مستەفا بە شیوعی دابنێن، کە چووە سۆڤێت بە جاسووسی ئینگلیز داندرا! ئینجا ئەم کاغەزانە ئەمە کاغەزی درۆیە، چونکا ئەگەر مەلا مستەفا ئەم کاغەزەی لە بەینا بایە و قازی محەمەد ئەم کاغەزەی بۆ مەلا مستەفا نووسیبایە ئەبوو لە خوای بوێ، ئەگەرچی سەورەکەی شکاوە فەقەت خۆ تەسلیم نەبووە، هاتووە بۆ لای ئەو یارمەتی شۆڕشەکەی ئەو بدا، لە بەر ئەوە شتەکە هێن نییە وە کۆماری مەهاباد لە پێشا مەلا مستەفای وەرنەگرت و زۆر خراپ معاملەی لە گەڵا کرد!

**عەلی:** لەسەر پەیمانی سێ سنور بیرورای جیاواز هەیە، ئی وایە دەڵێ هەمزە عەبدوڵا چووە و ئی وایە دەڵێ شێخ عوبێدیلای زینوێ و... رای ئێوە چێ؟

**مامۆستا:** هیچ یەکێک لەم ئینسانانە لە تاریخی کوردایەتی دوای ئەو سەورانەی کە بوون دوای ئەوە دەورێکیان نییە! ناوێکیان نییە! ئەمە پەیمانی سێ سنوری چی دروست ئەکەن؟! ئەم ئینسانانەی دەوری رابەرێکیان نییە یەعنی دەوری ئەوەیان نییە رێگا ئاسان کەن بۆ خەلک بێت و بچێت لە لایانەوە، ئەی ئەمانە پەیمانی سێ سنوری چی دروست ئەکەن؟!

**عەلی:** یانی ئێوە بڕواتان بە پەیمانی سێ سنور نییە؟

**مامۆستا:** ئەمن بڕوام بە گەلێک شت نییە! بڕوام لە خۆمەوە نییە، ئێمە لە

مەوزووعەکە دەرئەچێن فەقەت دیسانەوەکە بۆ حیسابی کوردایەتێکەمان شتێکی هەیە، من خۆم رەفیقم ئەگرت، خەڵکم ئەگرت، دۆستم ئەدۆزێوە رابواردنی ئیعتیادی بکەم بۆ ئەوەی خۆم دوور خەمەوە لە وەی کە لە مراقبە و شت رزگار بم، لە گەڵ خەڵک چووم بۆ پیرە مەگرون بۆ سەیران، چەند بنەماڵەیەکمان لە گەڵە، ژن و ماڵ و مناڵ و هەموو بە یەکەوە چووین، هاتوومەتەوە ئەمنی عێراقی ئەڵێ تەیارەی سۆڤیەتی خەڵقی هێناوە لە پیرە مەگرون برایم ئەحمەد چاوی پێ بکەوێ، ئەمە لە هینا هەیە! بابە ئەمن بۆ سیاحەت چوومە وێ! باشە من چیم؟! چم کردوە؟! چم لە دەس دێ؟! چیم پێ ئەکرێ؟! خۆ پیاو نابێ حیسابەکەی وان، غرورەکەی ئەو ئەمداتێ قەبوڵی کەم بۆ خۆم! ئایا سۆڤیەت ئەم خەتەرە گەورەیە بۆ ئەکا؟! هەزار رێی کە هەیە ئەگەر بیهەوێ ئیستسال بە یەکی وەک منەوە بکا! بۆ ئەمە دروست ئەکرێ؟! ئەمە هەر بۆ ئەوە دروست ئەکرێ بزوتنەوەی کوردایەتی شیوعیەتی تێ باوێن!

مەلا مستەفا لەو وەختە کە لە بەرگی گۆڤاری تایمی ئەمریکایا (رەنگە هەمان بێ) نووسراوە Red Mullah (مەلای سور - دانەر) بەیاخێکی سوری بە چەکوش و داسەوە لە پشتەوە کراوە (لە بەرگەکەیا)، Red Mullah لەو وەختەیا شاگرد قەساب بوو لە ئاڵمانانا و ئەو ناوە!

لەو وەختەیا کە نوری سەعید بۆ پەیمانی بەغدا بۆ ئیمزا کردنی بە عەبدولناسری ئەوت: مەلا مستەفا بارزانی، جینێراڵ بارزانی بە ١٢ فرقە عەسکەری سۆڤیەتی و ٦ فرقەی کوردی سۆڤیەتی و ٦ فرقەی کوردی عێراق ئامادەن بە هەموو چەکێکەوە پەلاماری عێراق بەن! من مەجبوورم دوو هاودەردم هەیە لە گەڵیان رێک کەوم، هاودوژمنین، تۆ ئەتوانی رێک نەکەوی فەقەت زیدی مەبە! ئەو وەختە مەلا مستەفا دەربەدەر کەس نەیئەزانی کێیە! ئەم تۆهمەتە ویستراوە هێن بێ، خۆشمان بە داخەوە هەنێ جار یارمەتیمان ئەدا، یانی شایەتیمان بۆ ئەدا، بە تەسەروفاتی خۆمانەوە یانی لە بەر ئەوە بیگرێ! باشە پەیمانی سێ سنور چی لێهاتە پێشێ؟! نەئەبوو ئەو سێ کەسە یەکیان بێتە پێشێ بڵێ بابە من ساحێبی ئەمەم، حیسێبێکم بۆ بکەن، ئەو سەورانە بوون، ئەو هەمووە هینە، ئەوە لەوساوە لە ٦١وە تا ئێستا بەردەوامە لە عێراقا ئەی لە کوێ بوون

ئەمانە؟! ئەی لە ٥٨وە تا ئەو زیندووبوونەوە، ئەو هینە، نەئەبوو ئەمانە بێنە پێشەوە ل
موزاهیرێکا ئیشتراک بکەن، ئێمە پیرە مێردی ٧٠ سالیمان هەیە لە موزاهیرەدا!
**عەلی**: ئەوەی کە ئەلێن بە هۆی راپەڕینی بارزان بوو کە هیوا وای لێهات تێک
بچێ، راتان چێ؟
**مامۆستا**: خۆی هیوا لە بەر ئەوە تێکچوو نە پەیرەو و پرۆگرامێکی هەبوو و
دەریش کەوت بە بێ ئەمری ئینگلیس ناجولێتەوە وە کوردیش بە ئەمری ئینگلیس
بجولێتەوە وەکو تا ئەو وەختە جولابۆوە و هیچی دەس نەکەوتبوو وە لەمەو پاشیش هیچ
دەس ناکەوێ. لە بەر ئەوە ئەوانی چەپڕەو و کۆمۆنیست بوون هەموو ئەوانە ک
کرابوونەوە لە هیوا وە هیوا سیاسەتێکی فاشیستی هەبوو، یانی رەوتی شتەکەی هێ
بوو، من خۆم زابیتی ئیحتیات بووم لە ٤١-٤٢، سەورەی رەشی عالی و ئەوانە بوو م
زابیتی ئیحتیات بووم نەمویست بچم هێ بکەم، برادەرێکمان هەبوو ئەوە دیسان ناو
نەهات یەکێکە لە زابیتەکانی هیوا لەو کەسانەی کە یاغی ببون و ئەویش وازی لێهێنا
عارفە سوری ناو بوو، ئامر ئینزباتی کەرکووک بوو، جا من بە هۆی ئەوەوە کرام ب
یارمەتی دەری ئەو بۆ ئەوەی نەچم بۆ شەر، رۆژێک چووم بۆ نادی عەسکەری ل
کەرکووکا، نادی عەسکەری بێ، ئی حکومەتی عێراق بێ، بەلێ با ئینگلیس دەس
هەبێ لە کاروبارا، لە پڕ یەکێک دەرکەوت، ئێمە دانیشتبوین لەولا و ئەولا... وەک
کۆمەلێک دانیشتبوین لە چیمەنەکەی نادیکەیا، هەموو راپەڕین و دەستیان بەرز کردەو
(وەک دەس هەلبڕین بۆ هیتلەر) وتیان "بژی سەرۆکی بالا"! بە خوا من و کوڕێک لە گەل
بوو دوکتۆر عەبدولڕەحمانی ناوە ئێستەش ماوە، ئەویش ئەندام نەبوو نەشی ئەزانی
مەسەلە چییە چونکە کوتوپڕ بوو، ئەو رەنگ بوو هەلستێ و رەفیق حیلمی هێ نەئەکرد
نەیئەناسی بەس من هەل نەستام چون ئەو سەرۆکی بالای من نییە و ئەمەش سەلامێکی
فاشیستێ، "بژی سەرۆکی بالا"ش "هایل هیتلەر"ە! وا نییە؟! یانی خۆی هیچ ئیشەکانی
لەوە ناچێ، قورئان و رەسمەکەی ئەو و دەمانچەیەکیش شعارێکی پێشکەوتنخوازان
نییە! یەعنی شۆڕشەکەی هێ فکری بوو، زۆر خەلق ئەهاتن گلەییان ئەکرد لە رێبازی
هیوا، لە بەر ئەوە ئەگەر هیوا تێک نەچووبایە یارمەتی بارزانی نەئەدا، هیوا لەبە

تێکچوونەکەی یارمەتی بارزانی دا یەعنی نەک هیوا لەبەر ئەمە تێکچوو! یەعنی نەک هیوا یارمەتی دا و تێکچوو، هیوا تێک نەچووبایە یارمەتی نەئەدا، تێکچوونەکە وای کرد ئەو بەشە سەرکەون و دەسەلاتدار بن کە کوردایەتیان ئەکرد، جا کوردایەتی بەم چەشنەی خۆیان کە ئەیان کرد، کۆمۆنیستیش نەبوون ئەمانە، زۆربەیان ئەم ناوانە بوون کە باسم کردن، زابیت و هین و... ئەمانە یارمەتیان دا وە ئەم زابیتانەی کە ئیشیان کرد و لەوێوە لە گەڵ بارزانیکان چوون و لەوێشەوە لە گەڵ بارزانیکان نەچوون بۆ روس و هاتنەوە بۆ لای ئێمە و هاتنەوە ئیعدام کران.

جا ئەمەی ئەم لا بەوە نابڕێتەوە، باسەکەمان زەبیحی بوو، بێینەوە سەر باسی زەبیحی.

**عەلی:** ئێوە چۆن گۆڕانی کۆمەڵەی ژ.ک بە حیزبی دێمۆکراتان دەدیت؟

**مامۆستا:** ئێمە زۆر ناگادار نەبووین کە چ گۆڕانکارێکی گەورەی تێدا قەوماوە، هەتا ئاگادار بووین کە حیزبی دێمۆکرات دروست کراوە و ئەوان وتیان لە سەر بناغەی ژ. ک دروست کراوە لە ئاخریا دەرکەوت بەرە بەرە لە رۆژنامە و لە کاغەز و لە هین کە حیزبێکی وەکو ئەوەی کە مەلا مستەفا ئەیهەوێ لە عێراق داینێ، پارچە کاغەزێکی ئەمەندە، نووسراوە کە ئەمە پرۆگرامەکەیەتی و بۆ کوردایەتی حەول ئەدا و ...

**عەلی:** ئایا ئێوە بڕواتان بەو نامەیە هەیە کە گۆیا کۆمەڵەی ژ. ک بۆ بارزانی نووسیوە؟

**مامۆستا:** رەنگە! چون ئەو وەختە لقەکەی ئێمە دروست نەببوو، لەو وەختا حەولێکیان دا حەتا برادەرێکیان نارد، لە کەرکووک وتیان ئەمە نوێنەری ژ. ک ه، حەمەدەمینی شەرەفی، ئەمە لە کەرکووک بوو لەو وەختەیا کە هیوا دوو کەرت ببو، جا رەنگە لە رێی ئەو زابیتانەوە کە ئیتسالیان بوو بە مەلا مستەفاوە ئەو کاغەزەیان بۆ مەلا مستەفا ناردبێ.

**عەلی:** ئایا ئێوە سەردانی مەهابادتان کرد؟

**مامۆستا:** نا! من خۆم نەچووم بۆ مەهاباد چونکە نەمئەتوانی بجوڵێمەوە!

**عەلی:** ئەدی کێتان دەنارد بۆ مەهاباد؟

**مامۆستا**: ئەو هینەمان لەویٚ بوو تا ئاخر، ئیسماعیل شاوەیس نەمایەوە لەویٚ بەس عوسمان دانیش مایەوە تا ئاخر لەویٚ، تا روخانی هیێ، کوری لای مەی لیٚ بوو دیسان، خەلقی خوێندەوار نەک هەر زابیت، سەعید ناکام لە پاشان یەک دوانێکی کەش.

**عەلی**: لە سەر میر حاج، ئایا میر حاج وەک نوێنەری هیوا هاتووە بۆ مەهاباد؟

**مامۆستا**: نا! میر حاج نوێنەری هیوا نەبوو، ئەوە لە پاش تێکچوونەکەی هیوا، دوو پارچە بوونەکەی هیوا هات وە ئەوە ئەو پرۆگرامەی ئەو دای بە وان، لیژنەیەک دانرا لە لایەن ئەو کەسانەوە کە هیوایان تێک دابوو، بلێین سەرۆکی بالا رەفیق حیلمیان لابردبوو، خۆیان ویستیان پارتێکی تازە دروست کریٚ جا یان بە ناوی هیوا یان ناوێکی کەوە بیٚ، پرۆگرامێکی رێک و پێکی بۆ دانریٚ، لیژنەیەکیان بۆ دانا، من یەکێک بوم لە ئەندامانی ئەو لیژنەیە کە ئەندامی وانیش نەبووم (ئەندامی هیوا) فەقەت.وەکوو یەکێکی سەربەخۆ کە ئامادە بووم لە هینە تازەکەیان داخل بم وە میر حاج و مستەفا خۆشناو و چەند کەسێکی کەش لەو برادەرانە ئەندام بوون لەو لیژنەیە، کە ئیمە لە مالی ئەو کورە کە وتم حامید فەرەج معاونی مودیری پۆلیسی کەرکووک بوو لە مالی ئەوانا ئەو هینە کرا وە ئەو هینی رێکخستن و نیزام و شتەی کە دامانا ئەوە بوو کە بردیان بۆ مەهاباد وە ئەوەش هەر پاشماوەی ئەو پەیوەندییە بوو کە ئەمین رەواندزی منی بۆ بانگ کردبوو کە بچم لە ٤٢ رێکی خەین لە رەواندز.

نە میر حاج و نە مستەفا خۆشناو لایەنگری رەفیق حیلمی نەبوون حەتا لایەنگری دروست کردنی پارتی نەبوون. میر حاج لایەنی کوردایەتێکی بیٚ بەستنەوەی گرتبوو.

**عەلی**: مامۆستا با بێینە سەر ئەوە ئەوەل جار زەبیحیتان چۆن دیت؟

**مامۆستا**: وەلا ئەوەل جار لە سلەیمانی دیم، لە مالی خۆمان، دانیشتین قسەمان کرد من وام ئەزانی ئەویش وەکوو برادەرەکانی تر ئەیهەویٚ یارمەتی بدریٚ بچێتە دەر، وتی نا من ئەمهەویٚ لە گەل ئیوە ئیش بکەم، چ ئیشێکم پیٚ ئەسپێرن ئامادەم بیکەم! حەتا خۆ هەژاریش کە هات هەر بەو حیسابە هاتبوو، ئیمە دوکانمان بۆ دانا، هینمان کرد لە پاشان بۆ سیلەکەی، ئیمە یەعنی یەکجار شتێکی هینمان بۆ کرد، ئەمن لە گەل تەقدیرما بۆ ئەو خزمەتانەی بۆ زمانی کوردی کردی بەلام وەکوو شەخسێک وەفای نەبوو،

خوشکم ناوی نووسرابوو لە لیستە چونکا ئەو کەسەی کە سیلی بوو ئەبوو بنێردرێ بۆ لوبنان، ناوی خوشکم نووسرابوو یەعنی بە موناسبەتی یارمەتی ئالی حەیدەر سولەیمانەوە کە وەزیر بوو لەو وەختە ناوی ئەومان گۆڕی ناوی هەژارمان تێخست، هینی عێراقیمان بۆ دروست کرد، لە هۆتێلێکمان دانابوو هۆتێل فاروق، هەموو جارێ کە ئەیویست بێتە خوارەوە کاک عومەر (عومەر دەبابە) خوا عافوی کا بە کۆڵی خۆی ئەیهێنا خوارەوە وە زۆر جار ئەڕشایەوە بە سەر کاک عومەرا! بەو حاڵە ناردمان بۆ هێن کە هاتیشەوە مەکتەبمان بۆ دانا و خانەی دانا و نازانم چی دانا و... یەعنی خزمەتێکی زۆرمان کرد کە چی ئەو لای مەلا مستەفای گرت!

**عەلی:** زەبیحی لە چ ساڵێک وەک پارتی لە گەڵ ئێوە ئیشی کرد؟

**مامۆستا**: وەک لە بیرم بێ ئێمە لە ٤٧وە چووینە پارتێوە (لقەکەمان) چونکا لە کۆبوونەوەی یەکەمی پارتیا من هێنامن بردمن بۆ بەغا دامنان، هەمزە عەبدوڵا و نوێنەرەکەی شێخ لەتیف و ئەوانەم برد و بە قاچاغ هێنامنەوە و... لە دانیشتنەکە منیان قەبوڵ نەکرد و برادەران وتیان تۆ یا ئەبێ داخل بی یان بڕۆی. هەمزە وتی فەقیرە بابە ئەمە وەک چاودێر هاتووە، سەیر ئەکا بزانێ چ ئەکەین و چ ناکەین، خۆ شەرت نییە، میوانە! من وتم بابە ئێمە لە ژ.ک داین، لە دێموکرات داین تا لە مەرکەزەوە خەبەرمان بۆ نەیە، ئیجازەمان بۆ نەیە کە ئەتوانین بچین لەو حیزبەوە، ناچین لەو حیزبەوە و سەر بە حیزبی خۆمانین، لە بەر ئەوە من هاتمە دەرەوە. لە پاش ساڵێک ئەوە بوو جەمهوریەتی مەهاباد رووخا یەعنی دوو رێمان لە پێش بوو یان بچینە حیزبی شیوعیێوە یان بچینە پارتی. ئیتر بڕیار وادرا کە بچینە پارتی، کە چووینە پارتی ئیتر من بووم بە لێپرسراوی لقی سلەیمانی. ئەوە بوو گیرام لە ٤٩دا تا ئەو وەختە هیچ هینێکمان نەبوو لە گەڵ زەبیحی. لە ٥١ دەرچووم لە حەپسخانە، لەوێوە بە هۆی بەربوونی منا کۆبوونەوێکمان کرد بە قاچاغ دیسان، ئەو کۆبوونەوەیەی کە کردمان لە ماڵی عەلی حەمدی لەوێ من بە سکرتێری پارتی هەڵبژاردرام. لە دوای ئەوەی کە ئێمە لە هینەوە لە گەڵ هەمزە عەبدوڵا بوو بە خلافمان و زەبیحی چووبوو سوریا و لە ٥٨ کە هاتەوە لە ماڵی ئێمە لە کۆنگرەی چواری پارتی دەرکەوت. لە پێشا تەبعەن من ئەمناسی و پەیوەندیمان هەبوو، لەوێوە

زەبیحی هەر مایەوە لە گەڵ ئێمە و بە دڵسۆزی ئیشی ئەکرد. سەردەمێک چالاکیەکانی (دوای شۆڕش) زۆر دیارتر بوو لەوەی پێشوی، لە ئەوەڵەوە ئێمە ئیشی حیسابمان دایە دەست، وەکوو کابرایەکی ئەمین جێی باوەڕ و نەختێک دەس قوچاو بوو، دەسی بەڕەڵا نەبوو لە بەر ئەوە من زۆرتر ئەوم هێن کرد کە ئەو بکەین بە مەسئولی مالیەی حیزبمان وە ئەو مەسئولێکی زۆر باش بوو، ئیدارەی ئیش و کاری پارە و هینی بۆ ئەکردین زۆر چاک وە لە شۆڕشیشا خۆی دەورێکی زۆر باشی بوو، مەسئولی کەرکووک بوو مودەیەکی زۆر، چالاکێکی یەکجار باش و رێک و پێکی بوو لە کەرکووکا، شتی خەیاڵی ئەکرد لە کەرکووکەوە، لە بەینی ١٤ هەزار دینارەوە تا ١٧ و ١٨ هەزار دینارمان مانگانە لە شاری کەرکووکەوە بۆ دەهات، ١٧ و ١٨ هەزار دیناری ئەو زەمانە یارمەتی و ئەندامێتی لە شاری کەرکووکەوە بۆ دەهات! وە ئەمە هەموو لە رێی زەبیحی یەوە ئەهات وە ئەو پارەیەی لە رێی زەبیحی یەوە نەهاتبایە پیاو نەکەوتە ترسەوە لێی! ئەگەرچی پیاو بە وێژدانەوە بیڵێ ئینسانی درۆ و ناراست و پارەخۆر بە تایبەت پارەی کورد ئەو کات یەکجار زۆر کەم بوو، لەبەر ئەوە خەڵکەکە زۆر دڵسۆز و پاک و هێن بوون، زەبیحی یەکێک بوو لە هەرە چاک و پاکەکان. لە پاشانا بوو بە مەسئوولی بەغا هەتا ئێمە لە شۆڕشا بووین ئەو مەسئولی بەغا بوو.

**عەلی:** چۆن ئەیتوانی لە بەغدا بێ؟

**مامۆستا:** زۆر چاک! چالاکی دەکرد، بە نهێنی بوو، ئیتسالێکی زۆری دەکرد لە گەڵ زابتەکانا وە برادەران و ئەو زابتانەی کە نەهاتن بە هۆی ئەوەوە ئەهاتنە ناو شۆڕشەوە وەکوو بەکر عەبدولکەریم و ئەوان، سەید عەبدولعەزیز و ئەوان بە هۆی ئەوەوە پەیوەندیان لە گەڵا ئەکردن. یەعنی ئەو مەسئولی لقی حیزب بوو، لە گەڵ سالح یوسفی و ئەوان لە بەغا بوو خەریکی ئەوە بوو هەتا شێستوسێش لەوێ مابۆوە، هەر مەسئول بوو وە یەکێک لە وانەی کە کردی پارەی هێن بوو، ئەو بوو بە سەبەبی ئەوە کە حەبیب کەریمان لێ دوور کەوێتەوە کە شتێکی باشیشی کرد! حەبیب کەریم سەفەری کرد هاتبوو بۆ ئەوێ بە ئیشێکی مەلا مستەفا بۆ رێکخستنەوەی ئێمە گۆیا، خۆمان لیژنەیەک

دینار شتێکی وا، منیش کاغەزم دایە کە زەبیحی ١٦٠ دینارەکەی بداتەوە. زەبیحی حیسابی لە گەڵ کردبوو هەر ٦١ دیناری دابۆوە سەدەکەی تری نەدابۆوە، وەڵا مەلا مستەفا ئەوەی بیستبوو، ١٠٠ دیناری بۆ ناردبۆوە بۆ حەبیب! بەوە حەبیبی کڕی، ئیتر لەو رۆژەوە حەبیب هاتوو لە باتی ئەوە هێن بێ بوو بە سکرتێری حیزبی! لەگەڵ ئەوەیا بە پێی نیزامی ئێمە حەقی نەبوو بێ بە سکرتێری حیزب، حەبیب نەیئەتوانی ببێ بە عوزوی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی چون بەرائەتی نووسیبوو کاتی خۆی!

**عەلی:** دیارە دژایەتی لە ناو ئێوە و مەلا مستەفا بە گشتی هەبوو، ئایا هیچ دژایەتێکی تایبەتی بەینی زەبیحی و مەلا مستەفا هەبوو؟

**مامۆستا:** نا! هیچ نەبوو، تەنیا ئەوە بوو کە مەلا مستەفا هەموو کەسێکی چالاک و هێنی بە جاسوس ئەزانی، زەبیحی کە لە بەغا بوو ئێمە من و عومەر و عەلی و ئەوان، من ئاخر کەسیان بووم کە چووین لە لای مەلا مستەفا دەس بەسەر بووین. زەبیحی کاغەزی بۆ نووسیم لە بەغاوە وتی بە مەلا مستەفا بڵێ، تکام بۆ بکە لە لای مەلا مستەفا کە قەبوڵم کا، منیش دیم وەکوو ئێوە ئیشم پێ نەکا ئەی کەم، دەس بەسەرم دەس بەسەر ئەبم، بێتە لای ئێمە، ئەو جێگایەی مەلا مستەفای لێیە. لە حەفتاکان کە ئەمن چوومەوە لای مەلا مستەفا و بڕایەوە و ئیتر دەوری ئێمە حیسابی نەما.

زەبیحی مجەلەیەکی لە بەغا دەر ئەکرد "باهۆز" پەیوەندی لە گەڵ ئێمە هەبوو، ئێمە لە تاران بووین، کاغەزمان بۆ ئەنووسی وە ئەمن کە هاتمەوە بەو حیسابە هاتمەوە کە لە گەڵ مەلا مستەفا یەک کەوین وە سەورە بکەینەوە وە ئێران رازی بوو بەوە، لەبەر ئەوە هاتینەوە وە زەبیحی ئاگاداری ئەوانە بوو هەمووی، حەتا مەقالەیەک نووسرا لە "باهۆز" دابوو، لە سەر ئەوەی کە بەرەیەکی کوردستانی دروست کەین بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا وە کە هاتینەوە زەبیحیش خۆی لەو رەئیە دابوو کە ئەوە بکەین شتێکی باش نەبێت. ئیتر مەلا مستەفا لەوە رێ نەکەوت و نەی کرد.

**عەلی:** "باهۆز" زەبیحی بە تەنیا دەری ئەکرد؟

**مامۆستا:** لە گەڵ برادەران لە بەغا، برادەری باشمان هەبوو ئیشیان ئەکرد لە

زەبیحی هەر مایەوە لە گەڵ ئێمە و بە دڵسۆزی ئیشی ئەکرد. سەردەمێک چالاکیەکانی (دوای شۆڕش) زۆر دیارتر بوو لەوەی پێشوی، لە ئەوەڵەوە ئێمە ئیشی حیسابمان دایە دەست، وەکوو کابرایەکی ئەمین جێی باوەڕ و نەختێک دەس قوچاو بوو، دەسی بەرەڵا نەبوو لە بەر ئەوە من زۆرتر ئەوم هێن کرد کە ئەو بکەین بە مەسئولی مالیەی حیزبمان وە ئەو مەسئولێکی زۆر باش بوو، ئیدارەی ئیش و کاری پارە و هینی بۆ ئەکردین زۆر چاک وە لە شۆڕشیشا خۆی دەورێکی زۆر باشی بوو، مەسئولی کەرکووک بوو مودەیەکی زۆر، چالاکێکی یەکجار باش و رێک و پێکی بوو لە کەرکووکا، شتی خەیاڵی ئەکرد لە کەرکووکەوە، لە بەینی ١٤ هەزار دینارەوە تا ١٧ و ١٨ هەزار دینارمان مانگانە لە شاری کەرکووکەوە بۆ دەهات، ١٧ و ١٨ هەزار دیناری ئەو زەمانە یارمەتی و ئەندامیتی لە شاری کەرکووکەوە بۆ دەهات! وە ئەمە هەموو لە رێی زەبیحی یەوە ئەهات وە ئەو پارەیەی لە رێی زەبیحی یەوە نەهاتبایە پیاو نەکەوتە ترسەوە لێی! ئەگەرچی پیاو بە وێژدانەوە بیڵێ ئینسانی درۆ و ناراست و پارەخۆر بە تایبەت پارەی کورد ئەو کات یەکجار زۆر کەم بوو، لەبەر ئەوە خەڵکەکە زۆر دڵسۆز و پاک و هێن بوون، زەبیحی یەکێک بوو لە هەرە چاک و پاکەکان. لە پاشانا بوو بە مەسئولی بەغا هەتا ئێمە لە شۆڕشا بووین ئەو مەسئولی بەغا بوو.

عەلی: چۆن ئەیتوانی لە بەغدا بێ؟

**مامۆستا**: زۆر چاک! چالاکی دەکرد، بە نهێنی بوو، ئیتساڵێکی زۆری دەکرد لە گەڵ زابتەکانا وە برادەران و ئەو زابتانەی کە ئەهاتن بە هۆی ئەوەوە ئەهاتنە ناو شۆڕشەوە وەکوو بەکر عەبدولکەریم و ئەوان، سەید عەبدولعەزیز و ئەوان بە هۆی ئەوەوە پەیوەندیان لە گەڵا ئەکردن. یەعنی ئەو مەسئولی لقی حیزب بوو، لە گەڵ سالح یوسفی و ئەوان لە بەغا بوو خەریکی ئەوە بوو هەتا شێستوسێش لەوێ مابۆوە، هەر مەسئول بوو وە یەکێک لە وانەی کە کردی پارەی هێن بوو، ئەو بوو بە سەبەبی ئەوە کە حەبیب کەریمان لێ دوور کەوێتەوە کە شتێکی باشیشی کرد! حەبیب کەریم سەفەری کرد هاتبوو بۆ ئەوێ بە ئیشێکی مەلا مستەفا بۆ رێکخستنەوەی ئێمە گۆیا، خۆمان لیژنەیەک دانیین، ئەو یەکێک بوو لە وانە، لەو لیژنەیە گۆیا پارەی سەرف کردبوو نیزیکی ١٦٠

دینار شتێکی وا، منیش کاغەزم دایە کە زەبیحی ١٦٠ دینارەکەی بداتەوە. زەبیحی حیسابی لە گەڵ کردبوو هەر ٦١ دیناری دابۆوە سەدەکەی تری نەدابۆوە، وەڵا مەلا مستەفا ئەوەی بیستبوو، ١٠٠ دیناری بۆ ناردبۆوە بۆ حەبیب! بەوە حەبیبی کڕی، ئیتر لەو ڕۆژەوە حەبیب هاتوو لە باتی ئەوە هێن بێ بوو بە سکرتێری حیزبی! لەگەڵ ئەوەیا بە پێی نیزامی ئێمە حەقی نەبوو ببێ بە سکرتێری حیزب، حەبیب نەیئەتوانی ببێ بە عوزوی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی چون بەرائەتی نووسیبوو کاتی خۆی!

**عەلی:** دیارە دژایەتی لە ناو ئێوە و مەلا مستەفا بە گشتی هەبوو، ئایا هیچ دژایەتێکی تایبەتی بەینی زەبیحی و مەلا مستەفا هەبوو؟

**مامۆستا:** نا! هیچ نەبوو، تەنیا ئەوە بوو کە مەلا مستەفا هەموو کەسێکی چالاک و هێنی بە جاسوس ئەزانی، زەبیحی کە لە بەغا بوو ئێمە من و عومەر و عەلی و ئەوان، من ئاخر کەسیان بووم کە چووین لە لای مەلا مستەفا دەس بەسەر بووین. زەبیحی کاغەزی بۆ نووسیم لە بەغاوە وتی بە مەلا مستەفا بڵێ، تکام بۆ بکە لە لای مەلا مستەفا کە قەبوڵم کا، منیش دێم وەکوو ئێوە ئیشم پێ نەکا ئەی کەم، دەس بەسەرم دەس بەسەر ئەبم، بێتە لای ئێمە، ئەو جێگایەی مەلا مستەفای لێیە. لە حەفتاکان کە ئەمن چوومەوە لای مەلا مستەفا و بڕایەوە و ئیتر دەوری ئێمە حیسابی نەما.

زەبیحی مجەلەیەکی لە بەغا دەر ئەکرد "باهۆز" پەیوەندی لە گەڵ ئێمە هەبوو، ئێمە لە تاران بووین، کاغەزمان بۆ ئەنووسی وە ئەمن کە هاتمەوە بەو حیسابە هاتمەوە کە لە گەڵ مەلا مستەفا یەک کەوین وە سەورە بکەینەوە وە ئێران ڕازی بوو بەوە، لەبەر ئەوە هاتینەوە وە زەبیحی ئاگاداری ئەوانە بوو هەمووی، حەتا مەقالەیەک نووسرا لە "باهۆز" دابوو، لە سەر ئەوەی کە بەرەیەکی کوردستانی دروست کەین بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا وە کە هاتینەوە زەبیحیش خۆی لەو ڕەئیە دابوو کە ئەوە بکەین شتێکی باش نەبێت. ئیتر مەلا مستەفا لەوە ڕێ نەکەوت و نەی کرد.

**عەلی:** "باهۆز" زەبیحی بە تەنیا دەری ئەکرد؟

**مامۆستا:** لە گەڵ برادەران لە بەغا، برادەری باشمان هەبوو ئیشیان ئەکرد لە بەغا، فیداکاریی باشیان ئەکرد، ئەو فەیلیەکان بە تایبەتی هێنیان ئەکرد و یارمەتیان ئەدا

و ئەویش بەڕێوەی ئەبرد و خۆی حەزی لە چاپ و تایپ و... ئەوە زۆر ئەکرد. ئینجا لە ٧٠ بوو لە پاش ئەوەی کە ئێمە ڕێک کەوتینەوە ئەویش گلەیی هەبوو لە ژیانی خۆی لە بەغا، ویستی بێ بۆ لای ئێمە کە بە مەلا مستەفام وت، وتی ئیبراهیم با نەیەت، با لە وێ بێ باشترە! مەلا مستەفا بە جاسوسی ئەزانی!

**عەلی:** بە جاسوسی...

**مامۆستا:** ئێران! بە جاسوسی ئێرانی ئەزانی، لەبەر ئەوە ئەیوت ئەوەی هەمانە بەسە، تەبعەن ئەوەی هەیانبوو من بووم! جا لەبەر ئەوە ئێستە من زیندووم و قسەت بۆ دەکەم، هونەری ئەوەیە کە مەلا مستەفا دوو سەرە منی بە جاسوس ئەزانی، بە جاسوسی ئێرانیش و بە جاسوسی ئینگلیسیش! وە زەبیحیشی بە جاسوسی ئێران ئەزانی!

**عەلی:** ئەوە لە کەیەوە ئەو فکرە پەیدا بوو لە ناو مەلا مستەفادا؟

**مامۆستا:** هەر زوو کە هاتەوە و دیتی زەبیحی لە گەڵ ئێمە ئیش ئەکا و ئێمە لە گەڵ ئێران ئەتوانین ئیش بکەین و چی بکەین و... حیسابەکەی لێ گۆڕا و لێی بوو بە هێن کە هەموو جاسوسین! جا ئەو ڕەئیە سەیرەی هەبوو جاسوسی نەئەکوشت بە ئەمری ساحیبەکەی نەبێ! مەسەلەن عوسمان هینێک هەبوو، کوردی عێراق بوو هەولێری، خۆشەویستی بوو زۆر نازداری بوو، عوسمان... عوسمان... ناوەکەیم لە بیر چۆتەوە، ئەمە لە حاڵێکا کوشتی کە حەمایل خان ژنەکەی و ئەو پیاوە ئەگەڕان بە شاخەکانا لە جێیەک کە قەسری بۆ دروست کەن، لەو وەختەیا کوشتی! کە ئەمری بۆ هات بیکوژێ کوشتی! زاوای عەونی یوسف بوو... عوسمان... عوسمان... مەشهوور بوو زۆر، ناویم بیر چووەتەوە... شەخسیەتێکی مەشهوور بوو لە بەغا دائەنیشت، جاسوسێکی مەشهوور، لە ئاخریا کرا بە مودیری مەساریف، عەبدولکەریم کردی بە مودیری مەساریف، مەلا مستەفا خۆی بە دەستی خۆی کوشتی! جا لەبەر ئەوە زەبیحی بە جاسوس ئەزانی و قەبوڵی نەکرد کە بێ وە ئەوە زەرەرێکی زۆری لەویش دا و لە زەبیحیش و لە کوردیش چونکا زەبیحی بهاتبایە وێ ئەکەوتە نووسین و خوێندنەوە و...

**عەلی:** باشە مامۆستا ئایا رابیتەیەک لە بەینی زەبیحی و ئێران هەبووە؟ وە ئەگەر هەبووە لە چ رادەیەکدا بووە؟ ئێستا ئەفسەرێکی زەمانی شا کە مەسئولی نیزامی

بووە لە بەغدا، زۆر شتی نووسیوە و زۆر باسی زەبیحی و ئێوە و رابیتەی ئێوە و ئێران و... دەکا، ناوی عیسا پەژمانە، نازانم بیستووتە یان نا...

**مامۆستا**: عیسا پەژمان رەفیقمە هەر رەفیق! عیسا پەژمان لە ١٩٤٧ و ٤٨وە ئەمن دەناسێ، هاتبوو بۆ وێ بە تایبەتی هاتبوو بۆ دیتنی من لە کەرکووک لە پاش بەربوونم لە حەپسخانە...

**عەلی**: چەند کتێبی نووسیوە و باسی رابیتەی خۆی و ئێوە و زەبیحی دەکا لە بەغدا و...

**مامۆستا**: کتێبەکانی هەنێ ناراستی تێدایە، ئەگەر سالی ٦٧ بێ من زەبیحیم نارد بۆ لای...

**عەلی**: دەڵێ یەکەمجار من زەبیحیم لە سوریا دیوە.

**مامۆستا**: درۆ ناکا! هیچ! ئەوەی کە دیوەتیی، دیوەتیی! چونکا نالێم من لە کەرکووک لە حەپسخانە تازە بەربووم مراقبەم لە سەر بوو، پۆلیسەکە لەوێ راوەستاوە، ئەڵێن کابرایەک هاتووە بۆ لات ئەیهەوێ بتبینێ! نایناسم و نازانم کێیە! ئەڵێ وەڵا ناوم عیسا پەژمانە و کوردێکی سنەیم و ناوی جەنابتم بیستووە و مجەلەی گەلاوێژم خوێندووتەوە و هاتووم بۆ تەقدیرتان! ئەو وەختە تەماشا ئەکەم لە پاش کۆمەڵێک ساڵ هاتووەتەوە بە لاماندا ئەیهەوێ بچێ بۆ لای مەلا مستەفا! کورە ئەوە بۆ کێی کابرا؟! (پێکەنین) پاشان کرا بە مەسئولی عێراق.

**عەلی**: هەرچەند عیسا پەژمان باسی پەیوەندی خۆی وەک شەخس لە گەڵ زەبیحی دەکا، ئایا ئێوە کە نیزیکتر بوون و دەبوو بزانن زەبیحی هیچ پەیوەندێکی راستەوخۆی لە گەڵ ئێران هەبوو؟

**مامۆستا**: نا! ئەبەدا! هیچ گومان نییە، شتی وا نەبوو، بەعەکسەوە زەبیحی لە گەڵ بەختیار و مەختیار و ئەوانە عەلاقەی هەبوو کە کوشتیان، حەتا ئەو دەعوەتێکی ئیمەی کرد من بینیم، زۆر دۆست بووین لە گەڵ بەختیار، هینێکی نووسیبوو، بەیانێکی نووسیبو حەقی حوکمی زاتی ئەداینێ، خۆشی ددانی بەوە دائەهێنا کە خۆی کوردە!

**عەلی**: ئەی باشە مامۆستا ئەو کات کە ئێوە لە تاران بوون، زەبیحی چۆن لە

عێراق مایەوە و تەنانەت لە کەرکووک بینیویانە و هاتووچۆی کردووە؟

**مامۆستا**: ئاخر ئیشەکەی ئێمە بوو بە دوو کەرتەوە، ئەو کەسەی ئەیتوانی بڵێ لە گەڵ ئەوان نیم هیچ تۆهمەتێکی لە سەر نەبوو (ئەو کەسەی بڵێ لە گەڵ ئێمە نییە) فەقەت زەبیحی لە بنەوە هەر لە گەڵ ئێمە بوو، ئەو ئیتسالەی کە پەژمان ئەڵێ لەبەر ئەوە بوە کە ئیتسالی بە ئێمەوە هەبێ، چونکا ئێمە کە لە ئێران بین و زەبیحی لە گەڵ ئێمە بێ چۆن ئەتوانێ ئیتسالی بە ئێمەوە بێ لە ڕێیەکی ترەوە؟! مەجبوورە لە ڕێی هێنەوە بێ!

**عەلی**: ئایا زەبیحی قەت بە قاچاغ هاتەوە ئێرانێ ئەو ساڵانەی کە ئێوە لە ئێران بوون؟

**مامۆستا**: نا! ئەبەدەن نا! خۆ ماڵەکەی ئێمە وەک دایرەی ساواک وابوو لە تاران، یانی هەر لە چێشتکەرەوە تا ئۆتۆمبیلچێکە هەمووی ئی ساواک بوو! دائیم ئەمانی لە وێ بوو یا پەژمان لە وێ بوو یا خەڵقی تر لە وێ بوون.

**عەلی**: یانی پێتان وایە لە زەمانی کۆمارەوە کە زەبیحی لە ئێران هاتووەتە دەر نەچووەتەوە تا ڕووخانی شا؟

**مامۆستا**: نا! نەچووەتەوە، ئەوەی من ئاگادار بم بڕوا ناکەم شتێکی وا بووبێت، چونکا هیچ عەیبێکی تێدا نەبوو بە لای ئێمەوە کە من خۆم لە ئێران بم وە بە ڕەزامەندی ئێران هاتمەوە وە هەر بە قەستی بە بەغاشدا هاتینەوە.

**عەلی**: دوای ئەوەی کە هاتنەوە بیستوومە کە زەبیحی بەو جەماعەتە ئێرانێ ڕاگەیشتوە کە ئێوە لە دەوروبەری سەیدسایەق و ئەوانەتان دانابوون...

**مامۆستا**: ئێمە لێرە هێنێکی گەورەمان کرد، ئێمە تەبعەن ئەو دنیایەمان نەدەزانی، ئێمە سیاسەتمان نەکرد، مەبدەئمان هێن نەکرد، دووی مەبدە کەوتبووین، حەقمان نەبوو بە سەرەوە، ئێمە وتمان شەری مەلا مستەفا شەرێکی بێ جێیە، هەر ئەوەندەی ئەکەین کە خۆمان بپارێزین، بەڵام شتێکی دیکە هەیە، ئێران هەیە، ئێران دۆستمان نییە، ئێران ئێمە بۆیە بە دۆست حیسابمان کردووە پێویستێتی یارمەتیمان بدا، ئەو دەقەی یارمەتێکە نەما یان ئەو دەقەی زانی یارمەتێکە لەبەر چی و بۆ چی بووە نەبێ

پشـــتی تێ بکەی و وازی لێ بێنی، تۆش وازی لێ بێنی نە وەک ئەو وازت لێ بێنێ! لەبەر ئەوە دامـاننا لەو کـوردانەی کـە لە ئێـرانەوە دێن تازە و کـۆن لە سـەیدسـایەق بنکەیەکیـان بۆ دابنێین، تەدریبیـان پێ بکەین، هەرچی چەکێکی گەورە و چاک لە مەلا مسـتەفـا دەسـتـمـان ئەکەوێ، ئەیگرین لە مەلا و بیشەین بە وانە، ئەمە یەکێکە لەو تۆهمەتانەی کە حکومەتی بەعس دایە پاڵ ئێمە (بەشی پارتی لای ئێمە) کە ویستی لە ٦٩ لە گەڵ مەلا مستەفا رێک کەوێ، ئەوە یەکێک بوو لە بەڵگەکانی وتی ئێوە لە گەڵ مەلا مستەفا رێکن! عەینی رەئیەکەی کە کابرای ئێرانی، جێنیراڵەکە پێی وتین ئێوە موئامرەتان کردووە هاتوونە ئێران! لە گەڵ مەلا مستەفا ئێمە شەڕمان کردووە لە ٦٤، دوومـان کەوتووە بە خۆی و لەشکری عـێراقـەوە، چووینەتە سنور و هاتوون بە خۆیان و دووستێ عـەسکەری ئێرانەوە وەڵا دەوری ئێمە بگرن! کوڕە بابە ئێمە برای ئێوەین! ئێمە دۆستین، ئێمە واین... ئێمـە واین...! کابرای زابیت بردمی لاوە وتی با بڕۆین بۆ سنە، چووینە سنە قسـەی بۆ کردین وتی تۆ ئەڵێی چی؟! وتم ئێمە ئەڵێین ئێمە ئێرانین، شا فەرمـوویەتی ئێرانی لە هەر وڵاتێک بێ ئی ئێمـەیە! ئێمە براین وە ئێمەش کـوردین، کوردیش ئێرانییە، فارسیش ئێرانییە، ئێمە دوو میللەتی ئێرانین و هیچ فەرقمان نییە وە ئاریامهریش لەبەر ئاریا کەیە لەبەر ئێرانێکە نییە! وتی یانی چی؟! وتم یانی ئێمە ئەگەر ئەو حقوقەی لە عێراق بمان درێتێ لە ئێرانیش بمان درێتێ هیچ مانعمان نییە بێین ببین بە پارچەیەک لە ئێران بە شەرتێک کوردستانی ئێرانیش ئەو حقوقەی بدرێتێ تەبعەن! وتی ئێمە ئەو موسیبەتەمان ناوێ! خێری خۆتان بۆ خۆتان و شەڕی خۆتان بۆ خۆتان! وتی ئەگەر ئەمە بکەین ئێمە، ئەزانی چ ئەبێ؟! کوردی تورکیا دێتە پێشێ، ژمارەی ئێوە زیاد ئەکا، ئەو جەنجاڵ و هەرا و هوریا و شـۆڕشگێـری و بەڵایەی ئێوە دێتـە سـەر ئێشـەکە، ئەم شەیتانیەی ئێوەشی دێتـە سەر! وتم شەیتانی چی؟! وتی ئێوە وەکوو ئەوانی پێشوو ناڵێن، ئەوانەی پێشوو ئەیان وت شیعە پیسە، خراپە، ئێران پیسە، فارس زۆر زاڵمە، مـیللەتێکی پیسن، خراپن... تەبعەن ئێمـە عـەسکەرەکانمان پێمـان ئەوت بیکوژە ئەی کوشت! ئێستا تۆ پێم ئەڵێی برای منیتو، من ئێرانم خۆش ئەوێ، من شام خۆش ئەوێ، من چم خۆش ئەوێ و... من چۆن ئەتوانم بە عەسکەرەکە بڵێم تۆ بکوژێ! وەڵا تۆ ناکوژێ،

تۆ ئەبی بە خەتەر لەسەر من! ئەبی بە خەتەر کوردی تورکیاشم بۆ هێن ئەکەی، تورکیە ئەکەی بە دوژمن، تورکیاش ئەکەوێتە هاندانی ئازەری ئەگەرچی ئازەری ترسی تیا نییە لای من چونکا ئازەری نابن بە تورک و خۆیان بە هینتر ئەزانن، فەقەت ئەوەی ئێوە خەتەرێکی گەورەیە بۆ ئێمە لەبەر ئەوە کاکە... وتم شا کە لێت پرسی لە ئێمە رازیی یە یان رازیی نییە؟ وتی قسەیەکت پێ ئەڵێم شاه رازیی بێ رازیی نەبێ جەیش رازی نییە' سوریا رازیی نییە! وەڵا من تێنەگەیشتم ئەو دەقەیە، بە خەیاڵما هات کە وایە شا جیایە و سوپاش جیایە! کە دەرکەوتیش وایە! وتی ئەمە وا نییە، ئەبێ چەکەکانتان تەسلیم کەن ئەگینا ئێوە بۆیە هاتوون ئەم ئاگرە بێنە ناو ئێمە، مەلا مستەفا لەوێ شتێکی دەس ئەکەوێ ئێوەش لێرە شتێکتان دەس ئەکەوێ و هەردووک شتەکە ئەبێ بە یەک، ئەگەر ئەوەی ئێوە ئێمە قەبوڵ نەکەین ئەوەی مەلا کردوویەتی ئەبێ و دەچنەوە بۆ ئەملا! وتی لەبەر ئەمە ئەوە ناکەم! لەبەر ئەوە قەبوڵیان نەئەکرد ئێمە هێن بێن...

**عەلی:** ئێوە ساڵی حەفتا و ئەوانە چوونەوە بۆ لای مەلا مستەفا و وەک شتێک لەوێ دەست بەسەر بوون...

**مامۆستا:** نێ ئێمە کە لە حەفتا هاتینەوە شەرتەکەی مەلا مستەفا ئەوە بوو کە ئەبێ منیش کە ئاخر کەس بووم بچمە لای دانیشم!

**عەلی:** کە چووشی ئایا بە حورمەتەوە بوو یان...؟

**مامۆستا:** نا! نا! زۆر بە حورمەتەوە بوو، تەینا مەگەر ئێران لەوە زیاتر حورمەتی گرتبم. لە گەڵ منا بێ حورمەت نەبوو، نازانم لە گەڵ خەڵکی ترا چۆن بوویێت، فەقەت لە ئەوەڵەوە زۆر رقی لێم بوو.

**عەلی:** دوایە بەیانی ١١ی ئازار هاتەدەر...

**مامۆستا:** کە بەیانی ١١ی ئازار دەرچوو من لێرە بووم لە لەندەن، نەخۆش بووم. لە ٦٩وە کە دەسی پێکرد بەیانی ١١ ئازار، ئەو وەختە ئەو مەسەلەی هینەمان زیندوو بۆوە، بەعسیەکان لە منیان پرسی پێش ئەوەی بێم بۆ لەندەن کە لە ئاخر مانگی ٦٩وە هاتم، پێش ئەوەی کە بێم لێیان پرسیم کە ئێمە ئەمان هەوێ لە گەڵ مەلا مستەفا رێک کەوین، وەفدی ئاشتی هاتبوو (ئاشتی سۆڤیەتی) میدالیای ئاشتی بدا بە عەبدولوهاب

بەیاتی شاعیری عەرەب وە هەندێک ئیش و کاری تر بکا، عەزیز شەریفیشیان لە گەڵ بوو، ئەمە ئەم جەماعەتە هاتوون وە بە ئەمانیان وتووە کە ئەوان ئامادە بن بە ناوبژیکەر لە بەینی مەلا مستەفا و بەعسا، ئەڵێن چی ئێوە و رەئی ئێوە چییە؟ پێموت بە ئەحمەد حەسەن البکر، وتم رای من ئەوەیە کە ئێوە چی ئەدەن بە کورد ناڵێم بیدەن بە ئێمە کە وا دۆستتانین و بە ناوی ئێوەوە بووین بە جاش! بەڵام خۆتان وەک حیزبی بەعس، حیزبێکی قەومین، بڕواتان بەوە هەیە ئێمەش میللەتێکی پارچە پارچەین، وەکوو خۆتان لێ قەوماوین، ئەم حەقە بە حەقی میللەتی کورد ئەزانن، چی بە حەقی میللەتی کورد ئەزانن لە عێراقا، خۆتان وەکوو هینێک بڵێن ئیعتراف بەو حەقە ئەکەین وە ئەمە بکەن بۆ خۆتان، ناڵێم بیکەن بە هونەر بۆ ئێمە، لە پاشانا روو بکەنە مەلا مستەفا چی ئەوێ شەخسی بۆی بکەن، چونکا ئەگەر ئەو حەقە بدەی بە مەلا مستەفا دە ئەوەندە گەورەی ئەکەی وە جاشێکەی ٦٤ی ئەو ئەبێ بە قەهرەمانی لای خەڵک! لەبەر ئەوە بە لای منەوە رێک ئەکەوی لە گەڵ مەلا مستەفا قەی ناکا فەقەت وا رێ کەوە! ئەحمەد حەسەن البکر جوابەکەی ئەوە بوو وتی ئەگەر ئەمە بکەین و لە گەڵ مەلا مستەفای نەکەین، مەلا مستەفا تەسلیم نابێ، خۆشی تەسلیم ببێ ٥٠ کەس ٢٠ کەس بمێنێتەوە بەو شاخەوە وڵات ئەبێ پێی بڵێی ئەمنی تێدا نییە، کە وڵاتێکیش ئەمنییەتی تێدا نەبوو، ئاسایشی تێدا نەبوو پێی ناڵێن وڵات! لەبەر ئەوە ئێمە ئەوەیان ناکەین! وتم وەڵا بە دەس من نییە، خۆ من دەوڵەت نیم، ئارەزووی خۆتانە، ئەگەر بیکەن وای بکەن چاکترە. من هاتم بۆ دەرەوە، ئیتر ئەو مفاوزاتە دوور و درێژە ئەوە بوو سەری گرتوو و لە ئاخریا مەلا مستەفا داوای لە برادەرانی ئێمە کردبوو کە حەولێکی زۆر هەبوو، برادەرانی هەموو لایەک، حەولیان ئەدا کە رێکمان بخەن، حەتا یەکێک لەوانە فاخری خاڵۆزای خۆی بوو کە حەولێکی زۆری دا بۆ ئەوەی رێکمان خاتەوە لە گەڵ مەلا مستەفا، ئاخر شەرتی مەلا مستەفا ئەوە بوو کە کەسمان نابێ لە دەرەوە بمێنێتەوە، ئەبێ بێنەوە بۆ لای ئەو، منیش ئاخر کەس بووم کە بێمەوە، قەول وا بوو، ئەوە بوو کۆبوونەوێکمان کرد لە بەغا و حیزبەکەمان گۆری و ناومان کرد بە شۆڕشگێری کوردستان و منیش چووم بۆ ئەوێ.

عەلی: زەبیحی دوای ئەوە چۆن لە بەغدا ئەماوە و بە چ ناوێک؟

**مامۆستا**: ئەبێ! چون حکومەتی بەغا و مەلا هینەکەیان ئەوە نەبوو کە لە سەر قسە و ئەمری مەلا خەڵق حەپس کرێ، بە تایبەتی مەسەلەی کوردی ئێرانیش و بەعسیش حیسابێکی بۆ بکا، ئەوەش هاتبوو پێشەوە، لەبەر ئەوە کوردێکی وەکوو زەبیحیان ئەویست کە ببێ و بمێنێ، بە تایبەتی دۆستایەتیکەی لە گەڵ دوکتۆر مراد ئەیپاراست! چونکە دوکتور مراد پیاوی هێن بوو، یەعنی ئیرتباتی توندی بوولە گەڵ K.G.B ئەوە مەعلووم بوو وە هەر ئەوەش دای بە کوشت لە سپانیا ،عێراق کوشتی، بێ گومان بەعس کوشتی! کە زەبیحی ئەو پەیوەندیی لە گەڵ ئەو هەبوو، تەبعەن بەعسێکانیش زیرەکن لەو شتانە، ئەوە ناکەن، زەبیحی چ زەرەرێکی هەیە بۆ ئەوان هێن بکا ؟! کوردایەتی خۆی بکا بە شەرتێک کوردایەتی ئێرانی بکا!

ئەوە بوو کە لە شاخ قەبوڵ نەکرا، کە لە شاخ قەبوڵ نەکرا ئیتر دەسەلات نییە، مەسەلەن یەکێکی وەکوو مەلا ماتۆر قەبوڵی نەکرد بمێنێتەوە لە پارتیا لە گەڵمانا بێ بۆ جەهەنەمیش! ئەی کە ئێمە خۆمان دەری کەین و رەفزی کەین و حکومەت لەولاوە بیکا بە وەزیر چی سەگباب ساواری ناخوا؟! وەکوو کابرای کۆیی ئەڵێ، لەباتی ئەوەی کە ئەمن پێی رازیی نیم بە ئەسیری قەبوڵی کەم، ئەو ئەیکا بە وەزیر، ئەیکا! ئەمیش پەنای ئەداتێ و لێی ئەگەرێ بۆ خۆی بژی و سەربەست و سەربەخۆ، کار و باریش ئەتوانێ چی لە دەست دێ بیکا، بۆ نەیکا ؟!

**عەلی**: دوای ئاشبەتاڵ زەبیحی لە بەغا گیرا، لە سەر ئەو گیرانە ئایا هیچ ئاگادارن؟

**مامۆستا**: ئەو گیرانە زۆرتری لە سەر ئەوە بوو کە لە بەیروت مام جەلالی دیوە. لە پاشان ئەوە بوو هات بۆ لای من لێرە (لەندەن) ساڵی ٧٩.

**عەلی**: کە هات بۆ لای ئێوە ئایا هاتبۆوە بۆ ئێران یان هێشتا نەهاتبۆوە؟

**مامۆستا**: نا! بڕوا ناکەم، کە هات بۆ لای من هێشتا لە ئێران سەورە ئاوا نەببوو، لە بەغاوە یەکسەر هات بۆ لای من.

**عەلی**: بۆ چی هاتبوو؟ ئایا هەر بۆ سەردان؟

**مامۆستا**: نا! زەبیحی وەکوو وتم وەقتی خۆی مەسئولی حیسابی ئێمە بوو،

زۆری پارە و شتمان لای ئەو دائەنا، هەنێ لەو پارانە زەبیحی لای برادەرێکی خۆی داینابوو، ئەم برادەرە پارەکەی سەرف کردبوو، بەمە زەبیحی زۆر سەخڵەت بوو، یەکجار زۆر، لەوانە بوو خۆی بکووژێ! لەم پارەیە لام وایە هەروا ١٥-١٦ هەزار دینارێک بوو، ٥-٦ هەزارێکی دەس کەوتبۆوە، نازانم چۆن، هینەکەی نازانم، لە سەندووقێ، جانتایەک دۆزیبوویەوە، ئەمەی پەیدا کردبۆوە، بە حیسابی ئەوەی نوێنەری پارتی من ئەبم ئەگەر پارتێکی تازەش دروست بێتەوە، ئەم پارەیە ئی مەلا مستەفا نییە، ئی ئەو بەشەی ئێمەیە، لەبەر ئەوە ئەویش حەقی بەسەرەوە نییە، زەبیحی بە ئی خۆی نازانێ و حەرامە لای ئەو، هێناویتی بیدا بە من! لە بابەت قامووس مامووسیشەوە نەختێک قسە بکەین چونکا فیکری قامووسەکەشی من خستمە سەرێوە، ئەو وەختە کە لە بەغا بووین، لە گەڵ حکومەتا رێک بووین ساڵی ٦٧-٦٨ ئەو وەختانە، من خۆم خەیاڵی قامووس دانانم لە گەڵ مجەلەی گەلاوێژا هەبوو، لە مجەلەی گەلاوێژا خەریک بووین، ئیعلامان بۆ دەکرد هەموو مانگێک، ئەمان وت بە هەموو کوردێکی خوێندەوار ئەم مانگە ئەو کەلیمانەی بە ئەلف دەس پێ ئەکەن چی لێ ئەزانن بۆمان بنووسن و ماناکەی بە تورکی، بە فارسی، بە عەرەبی و... بە چی ئەینووسن بینووسن و... خەریکی ئەوە بووم و... نەکرا. لە حەپسخانە برادەرێکم فێری ئەوە کرد قامووسی عەرەبی دروست کا، سێ چوار قامووسم بۆ هێن کرد، ئەو خەیاڵی قامووس دروست کردنم هەبوو، وتم زەبیحی با قامووسێک دروست کەین وتم واو...واو... قامووسێک هەبوو بە لام زۆر خۆشەویست بوو کە ئەوەی دامەوە، یەکیان خوا عافوی کا نەیدامەوە، ماوە لای ئەو، فەرەنسی و تورکی بوو، ئەوەی کە دایەوە ناوی قامووسی لۆغەتی ناجی پێ ئەڵێن، قامووسێکی تورکی - تورکییە، فەقەت تورکێکە عوسمانلییە، کەلیماتی عوسمانلی بەکار هێناوە، مەسەلەن چاکترین شت کە سەرەنجی راکێشام ئەوە بوو کە حەول ئەدا بۆ زۆری کەلیمەکانی زەربولمەسەلێک، شێعرێک، شتێکی هێن بڵێ، بۆ ئەوەی چەشنی بەکار هێنانەکەی هیچ نەبێ بە نەوعێکی پێشان بدا، مەسەلەن یەکێک لەوەی کە بیرم بێ باسی شێخ رەزای تاڵەبانی ئەکا، چۆن کەلیمەی "ناگەهان" بەکار ئەهێنێ، ئەڵێ مەعنای ئەوەیە و ئەوەیە و... وەکوو شێخ رەزا لەم شێعرەدا وتوویەتی: "رەزای تاڵەبانی بیر بەڵای ناگەهانی دی"

جا وتم ئەم قاموسە کە ئەبێ وا بکەین و کەلیمەکانی هەموو لەهجەکان بگرێتەوە وە وابکرێ و... وابکرێ و... ئەختێک پێکەوە خەریک بووین لە ئاخریا من وتم کاکە ئەگەر بیبەستی بە منەوە وەکوو هینەکانی تری منی لێ دێ، لەبەر ئەوە من چیم هەیە کەرەسە ئەتدەمێ لای خۆت بێ و بۆ خۆت بیکە، جا هاتبوو حەرفی یەکەمی کردبوو وەلا ئەلف و بێی کردبوو، منیش دامنا پێموت، بۆشم گێڕاوێتەوە، وتم ئەوە ژوورێکمان هەیە لە خوارێ مەتبەعە و تایپ و هینی تێدایە، رێکی ئەخەین، ئیشمان باشتریش ئەبێ، من و تۆ پێکەوە گۆڤارێکی رێک و پێکی مانگانە دەرئەکەین لە لەندەنا وە حەول ئەدەین بە فارسیش دەری کەین، بە عەرەبیش دەری کەین، بە ئینگلیسیش دەری کەین، شتێکی زۆر باش ئەبێ، لەو وەختەدا ئەو شتانە کەم بوو هەر نەبوو! با بمێنێتەوە. وتی بە خوا ئەچمەوە کتێبەکەم ئەکەم و هەنێ ئیشی کەشم هەیە ئەبێ بیکەم، ئەچم و حەول ئەدەم بگەڕێمەوە. وتم بابە گیان ئەوە بە کەلک نایە، ئەوە هەمزە عەبدولا کردی هاتبوو بۆ هۆلەندا پێمان وت نەگەڕێتەوە و ژن و مالەکەی ئاسان ئەهێندرێ، نەهات! ئەوە بوو ئیتر کەوتە چالەوە و بۆ خۆی لەوێ هەر مایەوە، وتمان بە خوا تۆش ئەکەویتە چالەکەوە، وەلاهی وام پێوت! بە داخەوە نەم ئەزانی چالەکە ئاوا ئەبێ، ئەو قولاییە ئەبێ کە ئەبێ!

**عەلی:** باشە مامۆستا پێتان وایە چۆن تێدا چوو؟

**مامۆستا:** نازانم بە خوا من! بەلام رەنگە مام جەلال زۆری پرسیبێ، ئەوە یانی گومانم نییە کە مام جەلال شتێک ئەزانێ و...

ها ئینجا ئەو نوختەیەت بۆ تەواو کەم، ئەو هینەکە، زۆر سەیرە، ئەوەی کە زەبیحی مەسئولی بوو وە ئەو کوڕەشی تیا بوو، ئەوەی پارەکانی لە لا دانابوو وە ئەو کوڕە خۆی لە تایپ و مایپا نیش ئەکا، ئەو کوڕە لە گەلمانا بوو لە شاخا، لە گردی رەش، لە رۆنیۆ و تایپ و ئەوانە ئیشی ئەکرد...

**عەلی:** دەبێ مەبەستان محەمەدی شاپەسەند بێ، پێیان ئەوت حاجی.

**مامۆستا:** نا! خۆیەتی، لە رۆنیۆ و تایپ و مایپی ئەزانی، زۆر هێن بوو، کوڕێکی زیرەنگ بوو. ئێمە ئەو کۆبوونەوەی کە ئەمان کرد ئەمان ویست لەشکرێک دروست کەین کە بتوانێ ئیشێکی کاریگەر بکا لە کوردستانی ئێرانا. کە بەعس هێن

بوو، وتمان ئەوە ئێوە لە گەڵ مەلا ڕێک کەوتن، وتیان کاکە ئێوە ئەتانویست موئامەرە بکەن، ئێوە لە گەڵ مەلا شەڕتان نەکردووە ئەگینا کوا لەشکر، کوا تۆپەکانتان، کوا ڕەشاشەکانتان، کوا... ئێوە وتتان ئێمە بە مانگێک بڕوا ناکەین لە قەراغا سەرکەوین بەسەر مەلادا! کە چی بە سێ ڕۆژ سەرکەوتن بە سەریا! ئەی وتمان هێنەکەی مە دیارە بڕوای زیاترە بە ئیشەکەی خۆی بۆیە... وتیان نا! ڕێک کەوتوون لە گەڵیا! ئەی ئەوە چییە دروستان کردووە لە سەی سایقا ؟! جەماعەتی ئێرانی، لەشکری بۆ چی دروست ئەکەن؟! حەتا ئێمە کە پێمان وتن، من پێم وتن، وتم ئێمە شتێکی تر ئەکەین، ئێوە دەرمان کەن بۆ ئێران! بمان نێرنە سنور نەک دەرمان کەن، چەکمان چەند هەیە، چەندتان چەک داوینێ لێمان مەستێنەوە، ئێمە تەقریبی ۹۰۰۰ چەکدارمان هەبوو، لێمان مەستێنەوە، ئێمە ئەچینە سنور دەرمان کەن، وەکوو فەیلیتان دەرکرد ئێمەش دەرکەن! ناوایەکی کرد (دەست ڕاوەشاندن) وتی ئەوە لەشکرەکەی ئەوێ بوو کە دروستتان کرد نەتان هەوێ بە خۆمانی دروست کەن ئەو جارە! وا نییە کاکە! موشکیلەی ئێمە و ئێوە ئێرانیش دەستی تێدا هەیە و ئێمەش دەستمان تێدا هەیە وە ئەبێ ئەمە بە نۆعێکی تر ببڕێتەوە، لەبەر ئەوە ئەبی بە سەفیر ئەتکەین بە سەفیر، ئەتنێرین بۆ دەرەوە، نابی، ئەحمەد حەسەن البکر بە دەمی خۆی پێی وتم: ئەلێرە بچی دەرێ گوللەیەکت پێوە نێن، حەفلەیەکی گەورەت بۆ ئەکەم، مالێکیش بۆ منالەکانت ئەکرم، خانوویەک، مانگانەیەکی گەورەشیان بۆ ئەبڕمەوە، ئەگەر کابرای قاتلیشمان گرت لە گێرفانیا ئەمری مەلا مستەفای پێیە لە گەڵ ۲۰۰۰۰ دینار نایگرین، بەڕەڵای ئەکەین! ئەمە لە کیس خۆم نادەم! لەبەر ئەوە ئارەزووی خۆتە ئەچی بۆ لای مەلا مستەفا بچووە، ناچی ئەوە ئەتکەین بە سەفیر بۆ هەر کوێیەک خۆت هەڵی ئەبژێری! چونکا ئەڵێ ئەو لە بەغدا بێ و لە هێن بێ ئیش ئەکا زیدی من وە ئێمەش ئەوە قەبوڵ ناکەین کە ئەو نارازی بێ! خۆی بە دەمی ناموبارەکی خۆی پێی وتم! وتی حەتا ئێستە بچی بەر دەرگا بتکوژن، ئیتر لەوە زیاتر چت ئەوێ، دێم لە تەعزیەکەتا دائەنیشم! (پێکەنین) جا ئەوەیە ئێمە دیسان کوردایەتێکە وای لێ کردین، لە ئێرانا کوردایەتێکە وای لێ کردین کە ئێران لای مەلا مستەفا بگرێ، لای ئێمە نەگرێ!

ئێمە لە چوارچرای مەهاباد من دانیشتووم لە گەڵ زاهیدی و پاکرەوان و سپەهبود...

و سالار...ی ئەو وەختەیان، لە گەڵ گەورەترینی ساواک کە سپەهبود پاکرەوان بوو دانیشتووین قسە ئەکەین، مام جەلال و کاک عومەر و حیلمی عەلی شەریف و... هێناویانن قسە بکەین، ئێمە یەکتریمان نەدیوە لە گەڵ برادەرەکانی خۆمانا، هەر کەسە بە لایەکا هاتووە، من لە گەڵ پاکرەوانا بە ئوتومبیلەکەی ئەو هاتووم تا بردوومیێ ژوورەوە، برادەرەکانی کەش هەر کەس بە هێنێک هاتبوو، قسەمان کرد چیێ و چی نییە و کوردی عێراق چیتان ئەوێ؟ ئێمە قسەی خۆمانمان کرد، برادەرێکمان لەو لاوە هەڵیدایە وتی تەنیا ئێمە یەک شەرتمان هەیە! وتی چیێ؟ وتی ئەو حقووقەی کە کوردی عێراق لە دەوری مەلیکا بوویەتی شا ئەمر بکا ئەو حقووقە بدەن بە کوردی ئێرانیش ئیتر ئێمە سەرمان پێوە نییە بەرامبەر بە ئێوە وە خۆشمان لە عێراق ئەوەمان ئەوێ کە داوای ئەکەین! ئێمە بەتاڵ بوو هێنەکەمان من وتم دەمێنمەوە لەوێ چەند رۆژێک لە مەهابادا، پاکرەوان گەراوە، توومەس جەماعەتێک لەوێوە ئەڕۆن لە پیرانشهەر، لە خانیێ مەلا مستەفا ئەبینن لەو رۆژەیا کە ئێمە چووین! لەوێوە چوون ئەو ئەبینن، مانگێکی پێنەچوو ئەو کابرای رەئیسی وزەرا کوژرا نازانم چی پیێ ئەڵێن...مەنسوور...[1] هەر چۆنێک بیێ وەزارەتی تازە دانرا، پاکرەوان کرا بە وەزیر، یانی مانگێکی پێنەچوو، نەسیری کرا بە رەئیسی ساواک (سپەهبوود نەسیری) مام جەلال لەو وەختەیا ئەیویست بیێ بۆ ئوروپا، عادەتەن بە ئێمەیان وتبوو ئەو کەسەی ئەیهەویێ سەفەرێک، شتێک بکا، ئێمە چەند کەسێک بووین لە تاران، بچیێ بۆ هێن، من بە تەنیا لە خانوویەک دابووم ئەوانیش لە جێیەک بوون هەموویان پێکەوە، بچیێ ئەو جیهەتە هێنی بداتیێ، چووبوو بۆ ئەو جیهەتە وتبوویان مەنع کراوە، سەفەری ئێوە مەنعە! هات بە منی وت، وتی شتێکی وا هەیە، من ئیتسالم کرد بەو تەلەفونەی کە دایانمیێ، وتم ئەمەویێ یان نوێنەری سپەهبوود نەسیری ببینم یان خود خۆی ببینم، وتی با بزانم، چوو هاتەوە وتی باشە کەی ئەڵێی حازرە، سبەینیێ... وتم ئەو کەی ئەڵیێ من حازرم. سبەینیێ چووم بۆ لای، وتی زۆر حەزم ئەکرد بتبینم هەر خۆم داوام ئەکرد بتبینم چوونکا هەنێک شت هەیە ئەبیێ پێت بڵێم، وتی تەبعەن هەموو دەوڵەتێک لە کاروباریا، لە سیاسەتی خۆیا مەسڵەحەتی خۆی ئەخاتە پێش هەموو شتێک وە ئێمەش

---

١- دەبیێ مەبەستی حەسەنعەلی مەنسوور بیێ. (دانەر)

هەروەها، وتی ئێمە سیاسەتمان گۆڕاوە بەرامبەر بە ئێوە لەو ڕۆژەوە کە دانیشتوون لە گەڵ ئەو زابیت و هینانەوە...

**عەلی:** ئەوە چ سالێکە؟

**مامۆستا:** سالی ٦٤...٦٥... مانگێک بوو نەسیری هاتبوو، وتی ئەو وەختە کە دانیشتون لە گەڵ ئێوە، برا زابیتەکان چوون بۆ خانێ و مەلا مستەفایان دیوە، هەر دووک لا تەقریرەکیان تەقدیم کردووە لە سەر ئێوە و مەلا مستەفا، هەر دووکی پێشکەش بە شاهـ کراوە، شا لە مانەیا هینەکەی مەلا مستەفای پەسەند کردووە، ئەوەی مەلا مستەفا ئەیهەوێ ئەوە بکرێ وە ئەوەی ئێوە نەکرێ، وتی من بۆ تاریخ پێتان ئەڵێم پاکرەوان زۆر دیفاعی لە ئێوە کرد، وتی ئەوانە ئینسانی ساغن، ڕاستن، ساحێب مەبدەئن، وان... وان... دیمۆقراتین... نازانم چی و... شتی وان، وتی شا وتی ئیبراهیم ئەحمەد، جەلال تالەبانی... کێ و... کێ سبەینێ حیزب کۆ بۆوە و کۆبوونەوەیان کرد و وتیان ئێوە پیاوی شان دەرئەکرێن، چەند کەس لە گەڵیان ئەمێنێ! ئەوە یەک، چەند کەسیان هەیە خۆیان؟! ئەمە دوو، سێهەم ئەوان هیچیان بە دەس نییە و پەنابەرن لای ئێمە، موحتاجی یارمەتی ئێمەن، هاتوون شەرتمان بە سەرا فەرز ئەکەن بۆ کوردی لای خۆمان! ئەمە بکەین بۆ کوردی ئێران، ئەی ئەگەر ئەوە دەسەلاتی بوو، سەرکەوت لە عێراقا چم داوا لێ ئەکا؟! ئەبێ چی بۆ بکەم؟! ها هینەکەی مەلا مستەفا خۆتان دیوتانە چی داوا کردووە؟! ئەڵێ مەهێڵن ئەمانە هیچ چالاکێک بکەن دژی من، لەبەر ئەوە چەکەکانیان نابێ بدرێتەوە بە ڕەزامەندی من نەبێ، دووهەمیان مەهێڵن بۆ دەرەوە بچن بە تایبەتی هەموویان وە ئەگەر هێشتان ئیبراهیم ئەحمەد نەچێ! وە ئیبراهیم ئەحمەد لە هیچ حالەتێکا نەهێڵن بچێتەوە بۆ عێراق! چوونکا ئەو ترسەشی هەیە لە گەڵ عێراق ڕێک کەوم بە نۆعێکی تر یان فیتنە بکەم و شتی واو... لەمە زیاتر شتێکی کەم ناوێ! ئەم پیاوە لە حالێکا حیزبیشی لە گەڵ نەبێ بە لای کەمەوە ٣٠٠٠ پیاوی خۆی هەیە شەڕی بۆ بکا، بە پارەی ئێمەش ئەتوانێ ٥-٦ هەزارێک بگرێ، بەسمانە! وتی لەبەر ئەوە ئێوە ئەو سیاسەتەتان بە سەرا تەتبیق ئەکرێ لە مەودوا! ئەبێ لێم ببوری بە دەس من نییە، عەلاحەزرەت ئەمەی فەرموە، تەبعەن ئەمری ئەو قانوونە وە ئێمە ئەمە جێبەجێ ئەکەین! ئێستا ئەڵێی جەلال تالەبانی

بچێ بۆ سەفەر؟ وتم نا با بچێ. وتی باشە کەسی کەتان نەچێ، تۆ نەبێ نەچی هەر. وتم باشە من ناچم، بۆیە من لەوێ مامەوە تا هێن بوو. لەو شتانە لای هەڵبژاردنەکە ئەو حیسابەی تیا بوو! جا ئێمە نەبێ لەمە دەرسێک وەرگرین، ئەگەر پەیوەندیمان لە گەڵ جیهەتێک هەبوو، جیهەتی دژی ئەوەمان لە لا بوو ئەبێ ئەو برایانەمان ئیقناع کەین ماوەیەک راوەستێ لە چالاکی خۆی بۆ ئەوەی هیچ نەبێ من کەڵکەکە وەرگرم، من یارمەتیکەم زۆرتر پێویستە لەو! مەسەلەن ئێمرۆ، کوردی تورکیا و کوردی عێراق یارمەتیان زیاتر پێویستە لە کوردی ئێران، کوردی ئێران ئەو حیسابەی نییە جارێ، لەبەر ئەوە هەر کارێکیش لە عێراقا بکرێ دژی ئێران یان لە تورکیا بکرێ دژی ئێران زەرەری بۆ کورد ئەبێ، زەرەری هەیە بۆ هینەکەی دیکە، ئێمە قەت بە خیاڵماندا نایە ئێران دۆستمان بێ وە نابێت بێ، ئێران وەکوو حکومەت، تورکیا وەکو حکومەت، عێراق وەکو حکومەت قەت دۆستمان نابن، میللەتەکان دۆستمانن، برامانن، ئەتوانین پێکەوە بژین وەکو هەزاران ساڵ هێن بوین و کەسمان کەسی نەفەوتاندووە و لە ناو نەبردووە، ئەوە مەوزوعێکی دیکەیە و دەوڵەتەکانیان جیایە، بەڵام ئێمەش ئەبێ سیاسەت بەکار بێنیین، ئەو بۆ حەقی هەیە یارمەتی کورد بدا دژی دەوڵەتێک کە مەسڵەحەتی کورد پێکیانەوە ئەبەستێ بۆ من حەقی ئەوەم نەبێ کوردایەتی خۆم لە جێیەک بوەستێنم کە جارێ مەسڵەحەتم نییە لەوێ دەستی پێبکەم؟! لە وەختێکا کە گەرمەی کوردایەتی لە ئێرانا بوو ئێمە دروست کردنی پارتی دیمۆکراتی کوردمان بە غەڵەت نەزانی! یانی ئەبوو ژ . ک بە قووەت کرێ ئەبوو پارتی تەنیا پارتی ژ . ک بێ وە کوردستانیەتی خۆی بکا! ئەو وەختەی چیتر لەوێ سەرکەوتن نەما دەگوێزمەوە جێیەکی کە، لێرە ئەبوو ئەچمە ئەولای تر... وە ئەمەی کە من ئەو بە کوردی ئێران بزانم وە واقعیش ئەو خۆی بە کوردی ئێرانی حیسێب کا ئەوە ناخۆشترین شتە! یەعنی ئەو ئەبێ ئەوە بە ئیهانەت دابنێ بۆ منیش و بۆ خۆشی کە من پێی ئەڵێم تۆ کوردی ئێرانی، تۆ لێرە جێت نییە! ئەبێ ئەوە نەبێ، کوردی تورکیا چییە و کوردستانی تورکیا چییە؟! بۆچی کوردی تورکیا لێرە بوو کە فیدراڵی بوو بە دوژمن بۆ تورکیا؟! تا ئێستاش هەر دوژمنین، نایان هەوێ هیچ حەقێکمان بێ، نایان هەوێ هەر ناوی کورد بێ! لەبەر ئەوە دەبێ خۆشمان ئەو دەرسە وەرگرین هیچ نەبێ لە

دوژمنەکانمان!

جا خۆی مامۆستا زەبیحی لەو فیکرەیا سەدی سەد لە گەڵ منا بوو، خەباتی ئێمە خەباتی میللەتێکە وە زەبیحی سەدی سەد لەوەیا بوو وە ئەوەی بە کردەوە ئەکرد، لە هەر کوێ بایە لە گەڵ ئەوان کوردی ئەوێ بوو، فەرقی پێ نەئەکرد وە بە چاکی و پاکی و بە دڵسۆزی ئیشی خۆی ئەکرد.

**عەلی:** ئەو نازناوی "عولەما" چۆن بە سەریدا برا؟

**مامۆستا:** ئەزانی مەسەلەکە چ بوو؟ لە زۆر شتی ئەزانی، ئەوە وای لێکردبوو برادەرانی ئێمە پێی بڵێن "عولەما"، ئەوە بوو زەبیحی لە زۆر شتی ئەزانی، لە زۆر شت شارەزا بوو، لە پاشان ئەو شتەی لێشی شارەزا نەبایە زووتر لێی فێر ئەبوو، ئامادەگێکی سەیری هەبوو، یەعنی هەر وەکوو لە کوردایەتێکەیا ئامادەگی ئەوەی هەبوو گورج بێ بە کوردی سوریا، گورج بێ بە هێن.... لە پلەیەکا لای ئێمە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو کە گەورەترین هێن بوو، لە مەرکەزی حیزب بوو. ئی ئەوە بوو کە کوڕێکی زانا و هێن بوو وە هەموو پێمان ئەوت "عولەما" وە بوو بو عولەما!

ئەوەم پێوتی کە حەزی لەو کۆلۆنیایە ئەکرد old spices (نەوعێک بۆنە بۆ پیاوان) ئێستەش من هەر ئەوە بەکار دێنم، هەموو نەوعی دنیام بۆ بێنن نەڵێم بە کەڵک نایە و ئەیبەخشم و ئەچم خۆم ئەوە ئەکرم!

**عەلی:** ئایا هیچ ئاگاداری ئەوە بوون کە هات بۆ لای ئێوە و گەڕاوە بۆ ئێران لە حەولی دروستکردنی حیزب و رێکخراو و شتی وا دابوو؟

**مامۆستا:** خۆی ئێمە ئەو گۆڤارەمان (چریکەی کوردستان) بە حیسابێک دانا لە سەر ئەو هێنە من کەوتمە ئەو خەیاڵە پێش ئەوەی ئەو بێ بە چەند مانگ پێشتر کەوتینە ئەو خەیاڵە کە ئەوە بکەین، من و کاکە حەمە رەسوڵ و چەند برادەرێکی دیکە حەتا وهبی بەگ یەکێک لەو کەسانە بوو کە هانی داین بیکەین وە برادەری کەش هەبوو لەسەر رەئیەکەی لینین لە: ؟What is to be done (چی دەبێ بکرێ) لەمە باسی وە ئەکا کە هاوبیرێک پێکبهێنێ لە ناو خەڵکەکەیا لە رێی رۆژنامەیەکەوە، لە رێی گۆڤارێکەوە وەکوو پریشکەکەی ئەو، یانی ویستمان لە دەرەوەی وڵات کوردایەتێکە وا رێک خەین، وە

هەر سەیریشی بکەی چریکە، کوردستانییەتێ وە حەقی نییە ئەبەدەن بە سەر هینا وە هەروەها "گەلاوێژ" وابوو، بە چ زمانێک بە چ لەهجەیەک ئەنووسرێ بۆمان ئەنووسی... جا لە سەر ئەوە لە گەڵ زەبیحی رێک کەوتبووین کە ئەوە بکەینە بناغەیەک بۆ رێکخراوێک، کە رێکخراوێک بێ لانیکەم هەموو کوردی دەرەوەی وڵات بگرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانن بە دەوری خۆیان هەستن لەو ئەرکە کە لە سەریانە وەکوو کورد.

**عەلی:** بیروباوەڕی لە سەر چلۆنییەتی کوردستان و کوردایەتی چۆن بوو؟

**مامۆستا:** بە بیروباوەری ئەوەی کە کوردستانێکی یەکگرتوو، دێمۆقراتی، سۆسیالیزمی دروست کەین.

**عەلی:** لە سەر بەرەی کۆمۆنیزم رای چۆن بوو؟

**مامۆستا:** بەرەی کۆمۆنیزم لای ئێمە حیسابی بۆ ئەکرا فەقەت ئەو حیسابە کۆنە نا کە بە سەرکردایەتی ئەوان ئەکرێ و بە یارمەتی ئەوان ئەکرێ و... نا ئەوە نەئەکرا. جا لە چریکەشا هەنێک شت ئەبینی، ئانتی ئیمپریالیستی ئاشکرا ئەبینی بەڵام ئەوە مانای ئەوە نەبوو کە ئێمە هین بین، مەسەلەن لە سەر چوونەکەی سەدام بۆ سۆڤیەت دوور و درێژ نووسیومانە کە بە تەما نەبووین سۆڤیەتیش ئاوای بە سەر بێ! ئەگەرچی سۆڤیەت زوو بۆ منی دەرخستبوو کە وا ئەکەن! ئەوان وان! وە مەلا مستەفا یەکێک لە هەرە غەڵەتەکانی کە کردبێتی لە ژیانیا بە لای منەوە ئەوە بوو کە لەو سیاسەتە دوولایانییە وازی هێنا، یانی ١٩٧٤ پریماکۆف لە گەڵ چەند کەسێکی عێراقی ئەچن بۆ ئەوێ، بۆ شاخ بۆ لای مەلا مستەفا، ئەیبینن داوای لێ ئەکەن وەفدێک، چەند کەسێک بنێرێ بۆ سۆڤیەت بۆ مەسکۆ، تەنیا یەک شەرتی بچوکیان هەبوو ئەویش بۆ زمان زانیین بێ رەنگە یاخود بۆ جێ باوەری بوو، دارا تۆفیق لە گەڵیان بێ، لە گەڵ وەفدەکە، دارا تۆفیقیش ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بوو، وەختی خۆی مەسئولی لاوانی ئینترناسیۆناڵ بوو، مەلا مستەفاش هەموو باوەڕی پێ ئەکرد، دیارە جێ باوەری سۆڤیەتیش بوو، ئەی قەی چ ئەکا؟! بەڵام مەلا مستەفا وای ئەزانی ئەمریکای تەئمین کردووە!

**عەلی:** لە گەڵ ئیسرائیل پەیوەندییان هەبوو؟

**مامۆستا:** بەڵێ! هاتووچۆیەکی زۆر، ئەوەتا دوکتور مەحموود خۆی پێی لێ

ئەنێ چەند جار چووە بۆ ئیسرائیل، من نازانم زۆر ئاگام لێ نییە چوون من خۆم نەچووم بۆ ئیسرائیل ئەگەرچی لە گەڵ ئیسرائیل عەلاقەمان هەبوو وە حەوڵمان ئەدا بمان بێت بەڵام ئیسرائیل ئێمەی نەویست، ئەوی هەڵبژارد دیسان! چونکا بە فەسیحی و سەریحی مەلا مستەفا شتێکی وای نەئەویست کە کار بکاتە مەسڵەحەتی ئەوان، نی هەر کەسێک! ئێستەش ئەو جەماعەتە نایان هەوێ شتێکی وا کە کار ئەکاتە سەر سیاسەتی دەوڵەتەکە خۆی! بەڵام جەماعەتێکی وەک یەکێتی حەتا بە قسەش بێ بڵێین ئەڵێ ئەوەم ئەوێ و... ئەمەم ئەوێ... ئەی ئەوە ئەبێت بە سەبەبی ئەوە کە خەڵق ئەولایە پەسەند کا کە هیچی ناوێ! ئەڵێ ئەمریکا چۆنم بۆ دائەنێ باشە! ئەی ئەوە نە ئێمە ئەیلێین نە کەسی کە!

پێی وتبوون ئەگەر رازی نیین برۆن بیری لێ بکەنەوە، شا کە هینی ئازاریان پێ وتبوو، پێی وتبوون خۆت چ بە مەسڵەحەت ئەزانی بیکە مەسڵەحەتی ئێمەشە! (بڕیاری ئاشبەتاڵ- دانەر) حەتا ئەڵێن ساواک بە دڵی نەبووە کە وا کوتوپڕ هینەکە قەبوڵ کەن! چونکا ترساوە لەوەی سەدام وەعدەکانی بە جێ نەهێنێ، یا خود ئەوانیش پارەیان لە کیس نەچوو، بۆچی لەو پارەی کە ئەیاندا بە کورد خۆیان چەندیان ئەدزی؟! ئێوە زیاتریان ئەدزی!

**عەلی:** مامۆستا! پێتان وایە مەعنای حەرفی "ژ" و "ک" چیە؟

**مامۆستا:** ئێمە "ژیاندنەوەی کورد"مان ئەزانی زیاتر لە "ژیانەوەی کوردستان" چونکا ژیانەوە بۆ میللەتە نەک بۆ وڵات، ئەوەتا ئەگەر بەعس لە ئێمەی وەرنەگرتبێ ناوەکەیان وەک ئێمەیە "البعث العربی"! یانی نابێ بڵێی عەرەبستان!

**عەلی:** ئایا ئێوە هیچ لەو سەردەمە لە بیرتان نییە کە هەموو ناوەکەیان بە تەواوی لە جێیەک نووسیبێ یان...

**مامۆستا:** نا! لە بیرم نییە وە ئێمە بە موشکیلەمان نەئەزانی چونکا لەو ئاخریانەدا ئەو وشەی "کوردستان"ی تێچوو.

**عەلی:** جەماعەتێک ئەڵێن "ژیانی کورد".

**مامۆستا:** نا! "ژیاندنەوە"یە "ژیاندنەوەی کورد" وە ئیشەکەش وەراست ئەچوو چوون کورد وەک مردوو وابوو.

**عەلی:** باشە مامۆستا لە باری ئەدەبی زەبیحیتان چۆن ئەدی؟

**مامۆستا:** مامۆستا زەبیحی بە لای منەوە دیسانەوە لە نووسینیشا یەکێکە لەو کوردانەی کە حەقی نییە بە سەر شوێنەکەوە، حەقی هەیە بە سەر خەڵکەکەوە کە چۆن تێ نەگەن! بە چاکترین شێوە بتوانێ تێیان گەیەنێ، کە ئەوە هەموو نووسەرێک نایکەن، لە پێشەوە رەنگە کردبێتیان بەڵام لە پڕ کە زانییان بۆیان ئەلوێ کە بە شێوەیەکی دیکە بیڵێن بە شێوەیەکی کە ئەیڵێن. یەعنی بڵێین خەڵکی سەقزە بە شێوەی سەقز ئەیڵێ، ئەگەر خەڵکی کرمانشانە کوردییەکەی وەکوو کرمانشانییە، فەقەت زەبیحی وا نەبوو، زەبیحی بە کوردییەک ئەینووسی و قسەی پێ ئەکرد کە هەموو کەس بتوانێ بە ئاسانی تێ بگا. ئەو تەقەلایەش کە دای بۆ قامووس شتێکی چاک بوو نازانم گەیشتە کوێ؟!

**عەلی:** جارێک شتێکتان فەرموو سەبارەت بەو دوکتۆر مرادە کە لە سپانیا کوژرا، ئەوە ساڵی چەند بوو؟

**مامۆستا:** دوکتۆر مراد، وەڵا نووسیومە ساڵی چەند کوژرا...

**عەلی:** ئایا زەبیحی لێرە سەردانی ئەویشی کرد؟

**مامۆستا:** نا! ئەیبینی، زۆر، زەبیحی مابوو. دوکتور مراد لە هەشتاکانا مرد، ئەگەر ٨٣ نەبووبێ ٨٢ بوو، فەقەت دیار بوو دوکتور مراد عەلاقەی هەبوو لە گەڵ عێراقیشا لە گەڵ سۆڤیەتیشا هەیبوو، جا نازانم لە گەڵ جیبهەتی ترا هەیبووبێ یان نا! چونکا حەتا ژنەکەی داوای لە من کرد وتی داوای تەقاعودیان کردووە نامان دەنێ حکومەتی عێراق، ژنەکەی خوشکی هێن بوو، ئەو کابرایەی کە سەفیری شا بوو لە بۆن، کێ؟... وەح... نازانم بیرم چووەتەوە حەتا شەریکەی شیر و میر و شتی وایان هەبوو، پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، کچێکی هەبوو ویکتۆری ناو بوو، لە پاش ئەوەی کە مرد کاغەزی بۆ من نووسیبوو وای زانیبوو لەبەر ئەوەی مراد دێ بۆ لای من و هاتووچۆم ئەکا منیش عەلاقەم هەیە لە گەڵ عێراق! کە حەولی بۆ بدەم مەعاشی بۆ بستێنم! قوورەسەر!

**عەلی:** لە لەندەن دەژیا یان لە سپانیا؟

**مامۆستا:** نا! لێرە بۆیان تازە نەئەکردەوە، شەش مانگ شەش مانگ ئەبوو تازەی کاتەوە، بۆ ئەوەی ویزەکەی تازە کاتەوە ئەبوو بچێ بۆ وڵاتێک، چاکترین جێ ئاسان

بوو بۆ ئەو سپانیا بوو، ئەچوو بۆ سپانیا حەفتەیەک، مانگێک ئەماوە دیسان ئەهاتەوە شەش مانگیان بۆ تازە ئەکردەوە. یانی دوکتۆر مراد من هین ناکەم، ئەو خیانەتی لە ئێمە نەکرد، حەتا من نەمئەویست بیبینم، لێرە کە هاتبوو، نەمئەویست چاوم پێی بکەوێ! لە پاشانا بە ڕێکەوت دیم هاتە لامەوە، پێی وتم: کاکە بۆچی نامبینی؟! من بۆ جاسوسی نەهاتووم بە سەر تۆوە! تۆ جاسوسیت ناوێ بە سەرتەوە بکەن! وتم بۆ؟! وتی ناوی تۆ دووهەم ناوە لە ئێعدامی بەعسا! لەبەر ئەوە ئەوەی پێت ئەڵێ بڕۆیتەوە ئەوە دوژمنتە، تۆ مەرۆوە، ئیتر چی ئەڵێی بڵێ، حەز نەکەی ئیتر مەمبینە! من ئەمویست ئەمەت پێ بڵێم!

عەلی: کوێیی بوو دوکتۆر مراد؟

مامۆستا: لام وایە ئازەری بوو[1]، ناوی مرادی ڕەزمئارا بوو، لە گەڵ مەلا مستەفا هاتەوە وەک نوێنەری سۆڤیەت وابوو، ئەو عەلاقەی هەبوو لە گەڵ K.G.B دیار بوو یەعنی! چونکا مەلا مستەفا وتی ئەبێ عوزو بێ لە مەکتەبی سیاسی! ئەی کاکە بۆ؟! وتی ئەبێ بێ!

عەلی: مامۆستا! وەک بزانن چۆن بوو زەبیحی لە گەڵ حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران کە ئەوانیش لە بەغدا بوون زۆر عەلاقەی نەبوو؟

مامۆستا: ڕای ئێمە ئەو وەختە تا ماوەیەکی زۆریش بەرامبەر بە دیمۆکراتی ئێران باش نەبووە، زەبیحیش وابوو، وەکوو ئێمەی بیر ئەکردەوە. ئەوان پێیان وابوو کوردستانی ئێران کوردستان نییە، ئەو کوردستانەیە کە وەکوو ئێرانی بیر ئەکەنەوە! ئەو کوردستانەیە کە ئێران ئەیڵێ! ئێمە هەر وەکوو وتم بۆ هەژار، بۆ کێ ... چیمان کرد، بۆ قاسملو زیاترمان کردووە! لە قەڵادزێ و... لە کوێ و... لە یارمەتی دانی ژنەکەی و... کێ و... کێ... بێ و بڕوا وە لە حیزبایەتیشا! بەڵام بەقەد سەری زەڕەیەک چاکەمان لە وانەوە نەدیوە! مەسئەلەتیان ئەوەیە لە گەڵ عێراق ڕێک بن لە گەڵ عێراقڕێکن! عەلاقەی نییە بە سەر تۆوە، عەلاقەی تۆ لە گەڵ ئێران چۆنە... لە گەڵ عێراق چۆن نییە...

---

١- دوای پرسیار کردن لە خەڵکانی تر بۆم دەرکەوت کە دوکتۆر مرادی ڕەزمئارا کرماشانی بووە و ژنەکەشی خوشکی "بزورگ عەلەوی" نووسەری بە ناوبانگی ئێرانی یە. (دانەر)

کامیان باشە، کامیان باشتر نییە... ئەوان عەلاقەیان نییە! ئەوە مەوزوعی وان نەبووە قەت! وە لەبەر ئەوە حەتا قاسملو مەسەلەن جاری وا هەبوو لێرە لە لەندەن بوو لە حەفتەیەکا چوار جار ئەیویست من ببینێ! شەش مانگی پێ ئەچوو چاوت پێی نەئەکەوت، یەعنی "نە بە این شوری شور نە بە این بی نمکی" یەعنی لە گەڵ هەموو کەسێکمان پەیوەندییەکانیان وابوو، حەتا لە گەڵ مەلا مستەفا بەو چەشنە ئەیانکرد، کە ئەو کەسەی رەبتیان لە گەڵی هەیە چۆنی ئەکا! کەچی خۆیان وا ناکەن، لە خەڵکیان ناوێ وا بکا! جا زەبیحی رای وابوو بەرامبەریان کە ئەوانە نوێنەری کوردی ئێران نین! جا ئەو تەقەلایە کە هەبوو بۆ دروست کردنی شتی تازە هەموو زۆرتر ئەوە بوو کە جێی ئەوانە بگرێ وە شتێکی باشتر بێ لەوانە. قاسملو عەلاقاتی دەرەوەی چالاکتر بوو لەوانە...

**عەلی:** زۆر زۆر سپاست دەکەم بۆ ئەو ماوەیە کە بۆت تەرخان کردم.

**مامۆستا:** وەڵا من نەک بۆ مامۆستا زەبیحی کە زۆر نیزیکم بوو حەتا کوڕەکەی کاک عومەر داوام لێ ئەکا شتێک بنووسم یا بۆی بڵێم لە بیرم نییە و بیرم ئەچێتەوە، سەبەبی وەش زۆرتر ئەوەیە کە من زۆرتر لە گەڵیانا نەبووم، مەسەلەن لە تاران من تەنیا لە خانوویەک بووم و ئەوانیش لە جێیەکی تر، دوایە من زۆرێک لە بەڵگە و وەسیقە و شتەکانم فەوتان.

**عەلی:** دیسان زۆر سپاس بۆ ئێوە.

**مامۆستا:** بەداخەوە پێموانییە شتێکی وامان کردبێ!

# وتووێژ لە گەڵ مام جەلال تالەبانی

**١٩٩٧/٢/١٨**

**عەلی:** بۆ ئەوەی دەست پێبکەین با پرسیارەکەم ئاوا دەست پێبکەم کە لە کوێ و کەی مامۆستا زەبیحیتان ناسیوە؟

**مام جەلال:** وەڵا ئەوە دەسپێکێکی باشە، ئەوەی راست بێ پێش ئەوەی ئەمن مامۆستا زەبیحی بناسم ناویم بیستبوو. ناوەکەشیم لە دو تێکۆشەر بیستبوو کە هاوخەباتی ئەو بوون یەکیان خوداڵیخۆشبو دڵشاد رەسوڵی و ئەوی تریش خوداڵیخۆشبو سەدیق حەیدەری بوون. ئەوانە دوای روخانی جەمهوریەتی کوردستان هاتنە عێراق و هاتنە کۆیە، چون دڵشاد رەسوڵی کاتی خۆی هەر لە کۆیە پەروەردە ببوو. لەوێ کە ئەو دووانە هاتن وەک دوو کەس لە جەمهوریەتی مەهاباد هاتبوون، خەڵک بە کەسانی خۆشەویست و پیرۆزی دەزانین. منیش ئەووەختە لاو بووم لە شەشی ئیبتدائی بووم بەڵام دەمم لە سیاسەت وەردەدا، زۆر جاران دەچوومە مەجلیسەکانیان، دەچوومە ئەو شوێنانەی ئەوان کۆبوونەوەیان لێدەکرد. لەوێدا گوێم لەوە بوو کە مامۆستا عەبدولڕەحمانی زەبیحی و خواڵیخۆشبو هەژاریش هاتوون بەڵام روویان کردووەتە شوێنێ تر، بیستنەکە ئەوها بوو. دوای ئەوە بیستم کە مامۆستا زەبیحی لە گەڵ پارتی ئیش دەکا. ئەووەختە سەرکردایەتی پارتی دیمۆکراتی کوردی عێراق کاک هەمزە عەبدوڵا بوو . گوتیان لە سولەیمانیە لە گەڵ ئەوان کار دەکا، لەوێ چاپخانە بەرێوە دەبا یانی چاپخانەی نهێنی حیزب.

ماوەیەکی پێچوو ئەمن هەر بۆم رێک نەکەوت مامۆستا زەبیحی ببینم هەتا ساڵی ١٩٥٢ لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٥٢ لە سەفارەتی سۆڤیەتی لە بەغدا بە بۆنەی جێژنی ئۆکتۆبرەوە زانیم کە مامۆستا زەبیحی لەوێیە، چوومە لای و خۆم پێناساند و سلاوم لێکرد و لەوێوە یەکترمان ناسی، پێشتر دەمزانی لە بەغدا کار دەکا بەڵام نەمدیبوو بە قسە کردن هەر ئەو هەلەم قۆزتەوە کە لە سەفارەتی سۆڤیەتی بوو کە چوومە لای و خۆم پێناساند و

دیار بوو ئەویش ناوی منی بیستبوو، من خوێندکارێکی چالاک بووم لە جامیعە. مۆعیدمان دانا لە دووکانەکەی خوالێخۆشبو هەژار، دووکانێکی هەبوو ئی رەسم گرتن، لەوێ یەکترمان دەدیت.

ئەووەختە ساردییەک هەبوو لە بەینی مامۆستا زەبیحی و حیزبی دێمۆکراتی کوردی عێراق، ئەو زۆرتر لە مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا بە گلەیی بوو، من توانیم بۆی باس بکەم کە ئێستا مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا لە سەرکردایەتی حیزب نەماوە و سەرکردایەتییەکی نوێ هەیە.

مامۆستا زەبیحی پیاوێکی چەپ بوو تەبعەن مارکسی بوو، ئەو سەردەمە، زۆر بە ئاشکرایی. ئەوەم پێگوت کە سەرکردایەتی پارتیش مارکسیزمی کردووە بە فەلسەفەی خۆی و هێندێک بلاوکراوەم بۆ برد کە چەپ بوو و ئەوانە، کەیفی هات بە وانە و ئیتر وردە وردە نیزیک بۆوە لە حیزب. دوای ئەوە کە من ئەو قسانەم بۆ مامۆستا برایم و وان گێڕاوە مامۆستا برایم زۆری پێخۆش بوو کە ئێمە پەیوەندی پێوە بگرین. دوایە مامۆستا برایمیش دیتی و زۆر نیزیک بۆوە لە ئێمە تا سالی ١٩٥٤. سالی ١٩٥٤ مامۆستا برایم خۆی شاردبۆوە لە بەغدا، مامۆستا زەبیحیش ئاپارتمانێکی هەبوو لە بەغدا، من چووم پێمگوت کە ئەوە مامۆستا برایم لە بەغدایەیە و خۆی شاردووەتەوە، گوتی دەبا بێتە لای من کەس شکی لێ ناکا، جێگاکەی من زۆر باشە و بەلاوەیە. بەراستیش وابوو، مامۆستا برایم چوو بۆ لای، لەو چەند رۆژە کە بە یەکەوە بوون و لە مالەکەی ئەو بوون وادیار بوو هەموو گیروگرفت و شتەکان لاچووبوو، لەوساوە مامۆستا زەبیحی هاتەوە بۆ کار کردن بۆ ناو حیزبی دێمۆکراتی کوردستان - عێراق (ئەودەم "- عێراق" یان لێ زیاد کردبوو) ئیتر لەوساوە هاتەوە خەباتی رێکوپێکی تەشکیلاتی. ئەو موددەتە زۆر لێک نیزیک بووین، ئیشمان دەکرد و زۆر جار زیارەتم دەکرد.

سالی ١٩٥٤ و ١٩٥٥ شالاوی ترور و ئختناق زۆر پەرەی ستاند لە بەغدا. ئەو سالەی ١٩٥٥ من چووبوومە دەرەوە بۆ فستیوالی لاوان و خوێندکارانی دونیا کە هاتمەوە لە سوریا زانیم کە مامۆستا زەبیحی هاتووە بۆ سوریا، ئەو و هەژار چیدیکە نەیان توانیبوو لە کوردستانی عێراق بمێنەوە، ئەوە بوو کە هاتبوون بۆ سوریا. لەوێ یەکترمان

دیتەوە و بەیەکەوە کارمان کرد، لەوساوە ئیدی بەیەکەوە زۆر بووین بە دۆست و نیزیک جگە لەوە بەعزە جار بە شۆخی توڕەم دەکرد لە سەر مەسەلەی عومر دەنا هیچ گیروگرفتێکمان لە بەیندا نەبوو وە بەڕاستی وەک مامۆستایەک تەماشامان دەکرد، وەکوو پیاوێک کە شارەزایە، تێکۆشەرە، هێندێک خاسیەتی هەبوو بەڕاستی زۆر کەم بوو ئەو سەردەمە، پیاوێکی زۆر خاکی بوو، زۆر بە شلۆلی و هەژاری دەژیا یانی هەر چەندت دابایە تەنانەت ئەگەر هەشیبا زۆر بە هەژاری دەژیا، زۆر پاک بوو، زۆر پیاوێکی دەست ڕاست بوو، هەر شتێکی ناڕاست با دەچوو بە گژیدا تەنانەت ئەگەر لە سەریشی بوەستابا، پیاوێک بوو کە سەودای نەبوو لە سەر بیروباوەڕ و لە سەر پرنسیب و شتی وا جگە لەوە پیاوێک بوو خۆشەویست بوو بەڕاستی، لە هەر جێیەک ئیشی کردبا ئیحترامی خەڵکی پەیدا دەکرد بۆ خۆی، ئەمن بەڕاستی بەش بە حاڵی خۆم وەک مامۆستا تەماشام دەکرد یانی پیاوێک بوو جگە لەوانە شارەزاییەکی زۆری هەبوو لە خەبات و تێکۆشان. جا ئەوە بوو کە پرسیارت کرد چۆنت ناسیوە ئێستا چت دەوێ با بۆت باس بکەم.

**عەلی:** لەسەر ئەو قۆناغەی هاتنی بۆ سوریا کە بە توندی پێیدا تێپەر بووی هێندێک پرسیار هەیە، مامۆستا زەبیحی تێکۆشانی لەو ماوەیە لە سوریا چۆن بوو و چی دەکرد؟

**مام جەلال:** کاک زەبیحی کە لە کوردستانی عێراق یانی لە حەقیقەت لە بەغداوە کە هات بۆ سوریا لەو سەردەمەدا کۆزمۆپۆلیتی باو بوو لە ناو کوردەکاندا، لە بن تەئسیری حیزبی"شیوعی سوری کوردایەتی وەکوو شتێکی حەرامی لێهاتبوو، کەس نەیدەوێرا باسی بکا، هەموو دەیان گوت مەسەلەن ئێمە هەموو یەکین، ئینترناسیۆنالی و... حەتا ئەمن لە بیرمە شاعیرێکی گەورەی وەکو جگەرخوێن لە بۆ ڕۆژنامەیەکی حەلەبی قسەی کردبوو لێی دەپرسێ دەڵێ ڕاستە ئەتۆ بۆ قەزیەی کورد ئیش دەکەی؟ دەڵێ نەخێر ئەمن بۆ قەزیەی کورد ئیش ناکەم ئەوە کارێکی خراپە ئەوە جیاکردنەوەی خەباتە، ئەوە تێکدانی ڕیزەکانی نیشتمانی و ئەو شتانەیە و.... تەنیا کەسێکی ئەو سەردەمە لە شام کوردایەتی دەکرد خوالێخۆشبو عوسمان سەبری بوو، لە ناو گەنجەکانیش لە قامیشلی کوڕێک هەڵکەوتبوو کە ئێستا سکرتێری حیزبی دیمۆکراتی پێشکەوتوی سوریایە

ئەووەختە لاو بوو ناوی حەمید دەرویش بوو، ئەویش یەکێک بوو کە بەڕاستی زۆر بە چالاکی ئەو ئیشەی دەکرد.

تەبعەن مامۆستا زەبیحی لە شام هەموو کوردەکانی دەدیت بە تایبەت قەدریجان و مەمدوح سەلیم و ئەو پیاوانەی کە ناویان هەبوو لەو سەردەم لە ناو کوردەکان، زۆر هاتووچۆی مالی رۆشەن بەدرخانی دەکرد. رۆشەن بەدرخان زۆری خۆش دەویست بەڕاستی، زۆریشی ئیحترام دەگرت چونکە مامۆستا زەبیحی فەرەنسی دەزانی و ئینگلیسی دەزانی و هێندێک روسیشی دەزانی. لە بیرمە هێندێک جار لە گەڵ خانم دادەنیشتن بە فەرەنسی قسەیان دەکرد ئەگەر شتێک ویستبایان مەجلیسەکە تێی نەگا!

دیارە کە مامۆستا زەبیحی هاتە سوریا وەک نوێنەری حیزبی عێراقیش ئیشی دەکرد، ئەمن ۱۹۵۷ چوومەوە سوریا، ئەوەی خۆم دیومە بۆت دەگێڕمەوە کە چوومەوە بۆ سوریا دوکتۆر کەماڵ فواد ( ئەووەختی دوکتۆر نەبوو ئەویش هاتبوو دانیشجو بوو دەرکرابوو لە جامیعە دەیویست بچێت لە ئالمان بخوێنێ) و زەبیحی و من کە ئەووەختی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بووم، لە گەڵ هەژار ئەو چوارە بەیەکەوە بووین بەلام زۆرتری زەبیحی کاری سیاسی دەکرد.

مامۆستا زەبیحی و دوکتۆر کەماڵ فواد و من وەکوو هەیئەتێکی وەفدی پارتی ئەو سەردەمە هاتووچۆی هەموو حیزبەکانمان کرد. بە هۆی مامۆستا زەبیحی کە فایق سامرایی دەناسی، جێگری سەرۆکی حیزبی ئیستقلال بوو لە بەغدا، حیزبێکی عەرەبی قەومی بوو وە سەدیق شەنشەلی دەناسی کە سکرتێری ئەو حیزبە بوو، رۆژێک کەماڵ فواد و من و مامۆستا زەبیحی پیاسەمان دەکرد کە توشیان هاتین لە سەر جادە ئەوان مامۆستا زەبیحیان کە دەناسی چاک و چوونیان لە گەڵ کرد ئەویش ئێمەی تەقدیم کرد، بە هۆی ئەوەوە توانیمان ئەو سەردەمە رەئیسی پارلمانی سوری ئەکرەم حۆرانی ببینین، رئیسی حیزبی بەعس میشێل ئەفلەقمان دیت، رەئیسی دائیرەی ئیستخباراتی سیاسی عەبدولحەمید سەراجمان دیت.

لەو موددەتەدا کە مامۆستا زەبیحی چووبوو توانیبووی گەنجەکان هاندا کە بە تەمای دروستکردنی حیزبەکە بوون کە حەمید دەرویش بوو کە بە تایبەتی زۆر چالاک بوو،

مامۆستا عوسمان سەبری بوو، لە گەڵ ئەوانە توانیبووی فکرەی دروست کردنی پارتی دیموکراتی سوریا گەڵاڵە بکا، یانی دەستێکی درێژی هەبوو لە ئەوەدا بەتایبەت کە مامۆستا زەبیحی توانی بچێتەوە بە گژ ئەوەدا کە پێیان دەگوت کۆزمۆپۆلیتی یانی نەتەوە ئیهمال کردن و ئینکار کردن و... کتێبێکی نووسی، کۆراسێکی بچکۆلە، بڵاوی کردەوە دژی ئەوانە و دەنگی دایەوە چونکا ئەوە یەکەم دەنگ بوو لە دژی ئەوە کە دەیانگوت کورد نینە و ئێمە هەموو ئینسانین و کەس فەرقی نییە و... ئەوە دەنگی دایەوە و تەئسیری کردبوو، ئەوانەی هاندا لەوە کە ئەو شتە بکەن. مامۆستا زەبیحی چالاکییەکی تریشی نواند لە گەڵ میسرییەکان، ئەووەختە جەماڵ عەبدولناسر تازە ناوی دەرکردبوو دوای سوئێز و ئەوانە، حەولی دابوو توانیبوی کەماڵەدین رەفعەت ببینێ، بە هۆی کەماڵەدین رەفعەتەوە لە گەڵ میسرییەکانیش قسەی کردبوو کە رادیۆیەکی کوردی بکەنەوە لە قاهیرە، ئەوە بوو کە رادیوی کوردی کراوە لە قاهیرە. هەروەها مامۆستا زەبیحی ناسراو بوو کە یەکەمین کۆنگرەی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا کە لە قاهیرە بەسترا ئەویش چوو لە بۆ ئەو کۆنگەرەیە، وابزانم لە سەرەتای ١٩٥٨ یان ئاخری ٥٧ بوو، چوو بۆ ئەو کۆنگرەیە و حەولێکی زۆری دابوو کە وەفدێکی کوردیش قەبوڵ بکرێ، سادات و ئەوانی دیبوو، وەفدی کوردی سەری نەگرت بەڵام دەوری زۆری نواند و چالاکی نواند و بڵاوکراوەی بڵاو کردەوە و ئەوانە. یانی مەقسەدم ئەوەیە مامۆستا زەبیحی هەم ئەوەی دەکرد و هەم لە گەڵ حکومەتی سوریش ئەووەختە حکومەتێکی دیموکراتیک هەبوو لە سوریا بەڵام زۆرتر ئەفسەرەکانی لشکری سوریا کاربەدەست بوون لە پشتی پەردەوە، پەیوەندییەکمان پەیدا کرد بە هۆی سەدیق شەنشەل و فایەق سامرائیوە. خوالێخۆشبوان ئەو دووانە یارمەتیان داین چووینە لای عەبدولحەمید سەڕاج. عەبدولحەمید سەڕاج لاوێکی زیرەکی (ئەووەختە سەرهەنگ بوو) ناسری بوو. ئێمە کە هەر سێکمان مامۆستا زەبیحی، کەماڵ فواد و من چووین بۆ لای، باسی ئەوەی بۆ کردین کە ئێوەی کورد لە کوردستانی عێراق، لە ئێران، لە تورکیا هەرچی دەیکەن بیکەن جارێ واز لە کوردستانی سوریا بێنن، کوردستانی سوریا بەشێکە لە کوردستانی تورکیا با چالاکیکانی خۆیان ئاراستەی کوردستانی تورکیا بکەن، ئەووەختە ئێمەش پشتیوانیتان لێدەکەین بە هەموو نەوعێک، گیروگرفت بۆ سوریا

دروست مەکەن، ئێمەش بەڕاستی ئەو سەردەمە ئەو رایەمان پێباش بوو، گوتمان کوردی سوریا مافی ئینسانی و دیمۆکراتی و خۆێندەواری هەبێ، ئەوی تریش با ئەوە بکەین.

لەبەر ئەوە مامۆستا زەبیحی ئەو وەختە هەم پەیوەندی هەبوو لە گەڵ سەرۆکی پارلمان کە ئەکرەم حۆرانی بوو هەم لە گەڵ میسرییەکان و هەم لە گەڵ ئەفسەرە ئازادەکانی سوریا و هەمیش لە گەڵ کوردەکان هەیبوو و ئەوشتانەی کە بۆم باس کردی حیزبەکەیان دروست کرد. دەورێکی زۆر گرینگی هەبوو بەراستی هەم لە پەیوەندی دروست کردن لە بەینی ئێمە و سوریا و هەم لە بەینی ئێمە و میسر.

**عەلی:** دوای سوریا کە عەبدولکەریم قاسم هاتە سەرکار لە عێراق دیارە مامۆستا زەبیحیش گەڕاوە بۆ عێراق و بەخێر هاتنی قاسمی کرد و نووسراوەشی پێشکەش کرد ئەوە چۆن بوو؟

**مام جەلال:** گوێت لێ بێ! ئەوە ئینشالا کە بچمەوە رەسمێکت بۆ دەنێرم کە ئێمە وەفدێک بووین بە یەکەوە چووینە لای کەریم قاسم، ئێمە بە نێوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و ئەو و هەژاریش بە نێوی کوردی سوریا، ئێستا رەسمەکەشمان هەیە و ئینشالا بە یەکێکدا بۆت دەنێرم لەوێدا ئەو قسەی کرد بە ناوی کوردی سوریا و پیرۆزبایی لە سەرکەوتنەکە کرد. دەمەوێ پێت بڵێم ئەوێ دەمێ هەموو کەسێکی دیمۆکرات و شۆڕشگێر و کۆمۆنیست و چەپ بە عەبدولکەریم قاسمیاندا هەڵدەگوت، هەر نە تەنیا شتێکی ئعتیادی بوو بەڵکو واجب و وەزیفە بوو. عەبدولکەریم قاسم هات عێراقی رزگار کرد لە حوکمی مەلیکی لە پاشایەتی، عێراق رزگار بوو لە پەیمانی بەغدا، هاتبوو بۆ یەکەم جار لە مادە سێی دەستورا ناوی کورد و عەرب شەریکن لە ولاتا و حەقی کورد لە ناو قانونی ئەساسیدا سەلمێندرا بوو، بارزانییەکانی عەفو کردبوو، مەلا مستەفا و ئەوانە هاتبوونەوە، رۆژنامەی کوردی ئیجازە درابوو، "خەبات" بە ئاشکرا دەردەچوو، دوای ئەوە پاش موددەتێک پارتیش ئیجازەی درا، مودیریەتێک دروست کرابوو بۆ فەرهەنگی کوردی، کوردایەتی بە ئاشکرا دەکرا، قانونی ئیسلاحی زەراعی کرابوو، کەریم قاسم ئەو سەردەمە بەڕاستی نموونەی پیاوی نیشتمان پەروەر و دیمۆکراسی بوو، دیمۆکراسییەکی تەواوی دابوو بەڕاستی بە هەموو حیزبەکان هەر لە شیوعییەوە تا پارتی

تا وەتەنی دیموکراتی تا وەتەنی تەقەدومی تا چەپەکان و... ئەویش رۆژێ کەریم قاسم هەموو کەس مەدحی دەکرد یانی وەکوو سەرکردەکی شۆڕشگێر سەیریان دەکرد، لە بەر ئەوە دەبێ نامەکەی مامۆستا زەبیحی بخەینە چوارچێوەی شەرایتی زەمان و مەکانی خۆی نەک ئی دوای ٦١ و ئەوانە کە ئێمە چەکمان لە سەری هەڵگرت! ئەمن پێموایە شتێکی راستی کردووە هەر چەندی مەدحی کردبێ کەریم قاسم دەیهێنا ئەو سەردەم! بۆ چی خۆ هەر ئەو مەدحی نەکردووە مامۆستا برایم شێعری بۆی هەیە! مەلا مستەفا ئەیگوت ئەمن سەربازی عەبدولکەریم قاسمم! جارێکیان مامۆستا بەهائەدین نوری دەگێڕێتەوە لە موزەککراتی خۆیدا دەڵێ: فەیلەکان کۆبوونەوێکیان کردبوو بۆ مەلا مستەفا ناویان هێنا گوتیان تۆ زەعیمی! هەستا تورە بوو گوتی ئەمن زەعیم نیم! گوتی کەریم قاسم زەعیمە، هەر ئەو زەعیممانە، هیچکەسی دی زەعیم نییە و ئەمن نەک هەر سەربازی عەبدولکەریم قاسمم من قەیتانی قۆندەری کەریم قاسمم! یانی هێندە کەریم قاسم خۆشەویست بوو جا ئەگەر سەرۆکەکەمان ئەو سەردەمە پێیخۆش بووبێ و ئەوەندە عەبدولکەریمی لا مووهیم بووبێ خۆی بە قەیتانی قۆندەرەی کەریم قاسم دابنێ، مامۆستا زەبیحی مەدحیشی کردبێ شتێکی زۆر تەبیعی و ئاسایە!

**عەلی:** ئەو سەردەمە کە هاتنەوە بۆ بەغدا و پارتی دەستی کردەوە بە چالاکی و مەلا مستەفاش هاتەوە، دوایە دژایەتی دەستی پێکرد زەبیحی لەو بەینەدا چیکرد؟

**مام جەلال:** پێش ئەوە مەرحەلێکی زۆرە، زەبیحی کە هاتەوە لە کوردستانی سوریا چالاک بوو، خرایە سەرکردایەتی، کە کرایە سەرکردایەتی دوای ئەوە لە موئتەمەری چوار هەڵبژێردرا بە ئەندامی کومیتەی مەرکەزی. کە هەڵبژێردرا بۆ کومیتەی مەرکەزی ئەووەختە ئیختیلاف نەبوو لە ناو پارتی و نەتەقیبۆوە چون ئیختیلافات لە ١٩٦٤دا تەقییەوە، ئەو ٥٨ هاتەوە لە ٥٨ تا ٦٤ دەکاتە ٦ ساڵ، لەو موددەتە زەبیحی وەک ئەندامێکی چالاکی کومیتەی مەرکەزی کاری دەکرد، موددەتێک لێپسراوی بەغدا بوو، موددەتێک لێپسراوی مالیی پارتی بوو، زۆر پیاوێکی دەست پاک و ئەوە بوو. ئەو موددەتە ئەو بەینی خراپ نەبوو لە گەڵ مەلا مستەفا، منیش یەکێک لەو کەسانە بووم بەینم خراپ نەبوو لە گەڵ مەلا مستەفا.

مەلا مستەفا هەر حیزبایەتی نەدەویست ئەو سەردەمە وە بەڕاستی هاواری دەکرد دەیگوت کاکە وازم لێ بێنن، یانی بە ئاشکرا دەیگوت من حیزبایەتی ناکەم! بە زۆر وازیان لێ نەدەهێنا، ئەمن لە بیرمە یەکەم کۆنگرەی ئاشکرای پارتی کە بەسترا، پارتی کە ئیجازەی وەرگرت بوو بە حیزبێکی رەسمی، مەلا مستەفا نەهات بۆ کۆنگرە، وەفدێکمان نارد بۆ لای شێخ ئەحمەد و شێخ ئەحمەد قانعی کرد بێتەوە، هات و تورە بوو دەیگوت کاکە وەلا ئەمن حیزبی نیمە، دەیگوت پێم بڵێن "حیز" بە پێم مەڵێن "حیزبی" بە! پێم بڵێن وەرە بۆ "مقەڕی قاحبەخانە" و پێم مەڵێن وەرە بۆ "مقەڕی حیزب"! من حیزبایەتی ناکەم! بە زۆر لێی نەدەگەڕان، جا لەو سەردەمەدا ئیختیلافەکە لە گەڵ بارزانی ئەوە بوو کە ئەو حیزبایەتی نەدەکرد و دژی حیزبایەتی بوو تا لە گەڵ کەریم قاسم تێکچوو ئەووەختە نەختێک ئەهمیەتی حیزبی زانی.

مامۆستا زەبیحی لەو چەند ساڵانەی بەغدا دەورێکی زۆری هەبوو لە چەند شتێک:

یەکەم - مەسئولی رێکخراوەکانی بەغدا بوو لە گەشە پێدانیان دەورێکی زۆری هەبوو.

دووهەم- لە رۆژنامە ئیشی دەکرد، لە رۆژنامەی کوردستان و خەبات و لە وانە لە نووسین و لە هەموو شتەکاندا بەشداری دەکرد.

سێهەم- لە چالاکییەکانی پەیوەندییەکان لە گەڵ حیزبەکان دەورێکی زۆری هەبوو.

لە ناحیەی ماڵیش مەسئول بوو، زۆر پیاوێکی چالاک و بەکار و ئەوە بوو دوایەش لە دوا رۆژدا بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیش بەڵام پێش ئەوەی بێتە دەفتەری سیاسی تەبعەن لە ساڵی ٦١دا کە ئێمە و کەریم قاسم تێکچووین یانی پارتی و کەریم قاسم، مامۆستا زەبیحی خۆی شاردەوە نەوەکا بگیرێ. هەژار بەرائەتی دا، بروسکەیەکی لێدا بۆ کەریم قاسم، ئێمە پێی دەڵێن بەرائەت یانی تۆبەی نیشان دا، بروسکەکەی بڵاو کرایەوە و زۆر شتێکی ناشیرین بوو بەڕاستی ئەو سەردەمە! مامۆستا زەبیحی هەڵات و خۆی شاردەوە و ئەوەی نەکرد، دوایە هات و بوو بە مەسئولی کەرکووک، پێیان دەگوت مەسئولی لقی کەرکووکی پارتی، هاتە ئەوێ و بە نهێنی ئیشی دەکرد. دوایە کە شۆڕش

دەستی پێکرد هاتە دەرەوە و لە دەوری کەرکووک بارەگای لقی دانابوو تەنانەت لە بیرمە یەکێک لەو ئیشانەی کە کردی مەشروعی هەڵێنجانی نەوت بوو، بیر هەیە هەروا نەوتی لێ دێتەدەر، ئەو پرۆژێکی دانابوو نەوتەکانی هەڵدێنجا و بەرمیلی پر دەکرد و بە سەر خەڵکدا بۆ زستـــان دابەشی دەکــرد. لەوێش دەورێکی زۆری هەبوو لە بوژاندنەوەی رێکخستنی کەرکووک و یارمەتیدانی شۆڕش و ئەو شتانە.

**عەلی:** دوایە کە شۆڕش دەستی پێکرد و ئیختیلافات پەرەی ستاند لە ناو مەکتەبی سیاسی و پارتی، ئەمن بیستوومە کە مەلا مستەفا زۆری رق لە زەبیحی بووە تەنانەت جائیزەی بۆ کوشتنی داناوە، ئەوە چەندە راستە؟

**مام جەلال:** نا ئەوە راست نییە ! ئەوە درەنگە، هەوەڵێ کە شۆڕش دەستی پێکرد و چەند ساڵێکیش تێپەری کرد و زەبیحی مەسئولی کەرکووک بوو و ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی بوو نێوانی خراپ نەبوو لە گەڵ مەلا مستەفا. نێوانی زەبیحی و مەلا مستەفا لە سەر دوو شت تێکچوو یەک: مەلا مستەفا دژی حیزبایەتی قسەی دەکرد، زەبیحیش وەکوو پیاوێکی حیزبی چەند جارێک هەم لە رووی خۆی و هەم بە نامە بۆی دەنووسی کە تو سەرۆکی حیزبی و چۆن دەبێ دژی حیزبایەتی قسە بکەی و خەڵک هاندەی! هەمیش ساڵی ۱۹٦۳ کە کۆدەتای کەریم قاسم روویدا هەژار کە بەراستی وەکوو شاعیری مەلا مستەفای لێهاتبوو لە خوتبەکانی پەلاماری روسیای دا، هەژار لە شێعرەکانیدا دووسێجار هێرشی "خۆرۆشۆفی" کرد کە ئەو سەردەمە بەراستی تەنیا روسیا دیفاعی لە ئێمە دەکرد حەتا ئیلتیماتۆمی دا بە سوریا و تورکیا و ئێران کە نابێ ئێوە تەداخول بکەن و مەسئەلەی کوردی بە هۆی مەنگۆلیاوە نارده نەتەوە یەککگرتووەکان و پشتیوانی پارەی لێ دەکردین و یارمەتی دەدایین، لەو سەردەمەدا هەژار لە دوو شێعر هێرشی سۆڤیەتی کرد لە شێعرێکدا بە خورۆشۆف نالێ "خورۆشۆف" دەڵێ "خەرە شۆف" "خەرە" یانی "گوو"، ئەوە بوو بە سەبەبی ئەوە کە بەراستی هەم مامۆستا برایم و هەم مامۆستا زەبیحی لە گەڵ هەژار تێکچن. مەلا مستەفا لە دڵی خۆیدا ئەوەی پێخۆش بوو بە دژی سۆڤیەت هەرچەند لەبنەوە عەلاقەی هەبوو لە گەڵ سۆڤیەت بەراستی ئەوە هۆیەک بوو. هۆی دووهەمی ئەوە بوو کە ٦۳و٦٤ کە مەلا مستەفا پێکهات لە گەڵ

عەبدولسەلام عارف ئیتفاقێکی کرد داوای ئاشبەتاڵی کرد یانی بەیانێکی دەرکرد بەرەسمی ئێستاش ماوە دەتوانی پەیدای بکەی دەڵێ: پێشمەرگە بگەڕێتەوە سەر "اعماله هیمل حره کریمه" وە دەڵێ حیزبیش نەمێنێ باشە، ئەووەختە فکرەیەک هەبوو کە ئیتتحادی ئیشتراکی دروست بێ کە هەموو حیزبەکان بتوێنەوە، دەڵێ بەڵێ لازمە هەموو حیزبەکان حەل بکرێن و بتوێنەوە و بچنە ناو ئەوە و هیچیشی نەدەویست یانی هیچ شتێکی تێدا نەبوو رێکەوتنەکەی عەبدولسەلام و مەلا مستەفا. ئەووەختە وای لێهات کە یا دەبێ ئاشبەتاڵ قەبوڵ کەی یا دژی ئاشبەتاڵ بی! یانی خۆی ئاشبەتاڵێکی ئاشکرا بوو، سەرکردایەتی پارتی هەموو بە گشتی دەنگ دژی ئاشبەتاڵ وەستان ئیلا یەک کەس لە گەڵ مەلا مستەفا بوو ناوی هاشم عەقراوی بوو کە پیاوێکی زۆر هیچ و پوچ بوو دوایەش خیانەتی کرد و بوو بە وەزیری دەوڵەت لە حکومەتی عێراق، ئەو و مەلا مستەفا پێکەوە بوون و ئێمەش هەموو ١٥ ئەندامی سەرکردایەتی لە لایەک بووین و هەموو دژی ئەو ئاشبەتاڵە بووین. زەبیحی یەکێک بوو لە وانەی کە مەلا مستەفا وایدەزانی کە هەر وەدوی دەکەوێ لە هەموو شتێکدا، کە ئەوەی نەکرد زۆری لێ پەست بوو جا ئەوجار کەوتە دژایەتی زۆر لە گەڵیی و زۆر دژی بوو. زەبیحیش کە پیاوێکی قسە راست و سەرراست و قسە رەق بوو ئەویش قسەی دەکرد کە ئەوە مەلا مستەفا وایە و نەخوێندەوارە و نازانێ و دەیهەوێ تووشی بەلامان کا و رێبەر نییە و کابرایەکی رێونکەرە و لەو قسانەی دەکرد لەبەر ئەوە بەینیان زۆر خراپ بوو. مەلا مستەفا لە چەند کەسێک زۆر عاجز بوو مەسەلەن یەکێک لەوان دوکتۆر سەید عەبدولعەزیزی شەمزینی بوو کە پێیوابوو دەبێ ئەویش لە گەڵیی بێ، لە شەهید عەلی عەسکەری زۆر عاجز بوو وای دەزانی کە دەبێ لە گەڵیی بێ، دوای ئەوەی کە من و کاک عومەر دەبابەش بە قسەمان نەکرد لە ئێمەش زۆر عاجز بوو چون بە حیسابی خۆی بە دەستەودایرەی خۆی دەزانین کە وەکوو لێی هەڵگەڕابینەوە وابوو. مەسئەلەی مامۆستا زەبیحی ئەوە بوو لە سەر مەبدە و بیروباوەڕ و کوردایەتی بوو.

**عەلی:** ساڵی ١٩٦٤ وای لێهات کە پارتی (مەکتەبی سیاسی) مەجالی نەما و چوو بۆ ئێران، زەبیحی لەو بەینەدا چی بە سەر هات؟

**مام جەلال:** لە بەغدا خۆی شاردبۆوە، چالاکی دەکرد و مەسئولی لقی بەغدا و تەشکیلاتی ناوولات بوو.

**عەلی:** یانی ئەوسەردەم هەم لە عێراق و هەم لە ئێران و هەم لە مەلا مستەفا قاچاغ بوو؟

**مام جەلال:** بەڵێ قاچاغ بوو! خۆی شاردبۆوە، ئێمە ئەووەختی کە ساڵی ٦٤ حیزب بوو بە دوو قیسم، سەدی هەشتای حیزب لە گەڵ ئێمە بوو ئێمە مەکتەبی سیاسی مەشهوور بووین بە باڵی مەکتەبی سیاسی، سەدی دە لە گەڵ مەلا مستەفا بوو، سەدی دەشی دانیشت. هەموو کادیرە باشەکان لە گەڵ حیزب بوون لە بەر ئەوە ئێمە هەر بە ناوی حیزبەوە ئیشمان کرد. مامۆستا زەبیحی لە بەغدا مابۆوە و تەشکیلاتی حیزبی دەکرد هەم ئی بەغدا و هەم ئی شوێنەکانی تریشی سەرپەرشتی دەکرد، یانی وەک لێپرسراوی تەشکیلاتی هەموو حیزب بوو، خۆی شاردبۆوە لە بەغدا و ئیشی دەکرد و خەباتی نهێنی دەکرد، تەبعەن هەم لە حکومەتی بەغدا قاچاغ بوو هەم لە بارزانی هەم تەبعەن لە ئێرانیش قاچاغ بوو!

**عەلی:** ئەمن هەم لە کاک سەلاح موهتەدیم بیستووە کە دەڵێ :"جەوان بووم لە تاران باوکم رۆژێک زۆر بە نهێنی مامۆستا زەبیحی دیوە" یانی ساڵانی ٦٤ و ئەوانە هەم دوکتۆر شیرازی لە پەیوەندی نامەییدا دەڵێ کە زەبیحی ئەوکات بە نهێنی سەردانی ئێرانی کردووەتەوە، ئایا ئەوە راستە؟

**مام جەلال:** ئەمن قەت ئەوەم لە بیر نییە کە مامۆستا هاتبێتەوە! حەز دەکەم ئەوەی بزانی کە ئێمە چووینە ئێران ئەمن زۆر لە ئێران نەمامەوە، ئەمن خۆم پێم ناخۆش بوو بچینە ئێران لە سەر سنور برادەران بە زۆر بردیانم! لەوێ کە چووم گوتم دەڕۆم، دەستبەجێ داوای رۆیشتنم کرد لە ئێران و دەستبەجێ مانم گرت حەتا ماوەیەک نانم نەخوارد هەتا ئێرانییەکان ریگایان دام دەرچم! پاش ئەوەی من دەرچووم ئاگام لێی نییە بەڵام نەمبیستووە قەت زەبیحی چووبێتە ئێران لەو سەردەمەدا! نا! باوەڕ ناکەم! دەتوانی لە مامۆستا برایم پرسی ئەو دەزانێ.

**عەلی:** عیسا پەژمان لە کتێبەکانیدا باسی رەوابیتی زۆر نیزیک لە گەڵ زەبیحی

و کاک عومەر دەبابە و کاک عەلی عەسکەری دەکا ئەوە چۆن بووە؟

**مام جەلال:** ئەوە درەنگە، دوایەیە، ئەتۆ ئەوە بزانە رابیتەی ئێمە لە گەڵ ئێران کەی دروست بوو، با من قسەت بۆ بکەم: رابیتەی پارتی و ئێران ئەوەڵ جار بەوە دروست بوو کە مەلا مستەفا وەفدێکی نارد بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان روتە کە کادێرێکی چالاکی پارتی بوو، کوڕی خالی ئەو کاک عەلی عەبدوڵلایە، ناردی بۆ مەهاباد، ئەووەختە تیمسار نازانم کێ لەوێ بوو ئەگەر بپرسی کێ بووە، ئەو سەردەمە لەوێ ناردبووی بۆ لای ئەو کە پەیوەندی دروست کا، ئەمە لە ئەواخری ساڵی ١٩٦١ بووە...

**عەلی:** دەبێ وەرهرام بووبێت!

**مام جەلال:** ئەی زار خۆش! وەرهرام. بۆ لای وەرهرامی ناردبوو. ساڵی ٦٢ جارێکی دی ناردبۆوە. دوابەدوای ئەوە لە بەغدا ئەو عیسا پژمانە کە باست کرد وابەستەی نیزامی بوو، لە گەڵ ماڵی جاف پەیوەندی هەبوو. بورهان جافێک هەبوو هەزار رەحمەتی لێ بێ عەمری خوای کرد، لە گەڵ بورهان جاف پەیوەندی هەبوو، بە هۆی بورهان جافەوە خوالێخۆشبوو ساڵح یوسفی دیت، ئەووەختە ئەویش لە بەغدا موختەفی بوو. زەبیحی ئەووەختە لە بەغدا نەبوو لە کەرکووک بوو. ساڵح یوسفی لە بەغدا مەسئولی پارتیش بوو.

خوالێخۆشبوو ساڵح یوسفی هەستابوو لە گەڵ پەژمان قسەی کردبوو کە پەیوەندییەک دروست بێ لە بەینی ئێمە و ئەواندا، کاغەزی نووسی بۆ مەکتەبی سیاسی، ئەمن زۆر چاکم لە بیرە لە کانوونی ساڵی ١٩٦٣دا ساڵح یوسفی هات لە بەغداوە و ئەو پێشنیارەی هینابوو کە وا ئێران ئامادەیە یارمەتیمان بدا و ئەوشتانە، سەرۆکی حیزب مەلا مستەفا بوو، تەبعەن خەبەر درا بە مەلا مستەفا و ئێران داوای کردبوو وەفدێک بچێ لە پارتییەوە و یەک نوێنەری مەلا مستەفا بێ و یەک نوێنەری مەکتەبی سیاسی بێ، چون ئێران دەیزانی دوو باڵ هەیە لە ناو حیزبەکەدا. مەلا مستەفا شەهید عەلی عەسکەری دانا بە نوێنەری خۆی و مەکتەبی سیاسیش شەهید عومەر دەبابەی دانا بە نوێنەری خۆی. ئەو دووانە چوون، وەک بزانم شوبات بوو کە چوون بۆ ئەوێ، وام لە بیرە ئەوان لەوێ بوون کە کودەتا رووی دا لە سەر عەبدولکەریم قاسم.

ئەوانە چوون بۆ ئێران هەم بە ناوی مەلا مستەفا و هەم بە ناوی مەکتەبی سیاسییەوە، هێشتا زەبیحی داخلی ئەوشتانە نەبووە، ئەوەی کە عیسا پەژمان دەیڵێ دوای ١٩٦٦ە.
بەڵێ دوای ١٩٦٦ کە زەبیحی چووبۆوە بەغدا و بوو بە مەسئولی تەشکیلات لەوێ کاک عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری بە تایبەت زۆر دۆستی عیسا پەژمان بوون کە دەچوونە بەغدا دەچوون بۆ لای و کاک زەبیحیش دەیدیت یانی لە ماڵی ئەو دادەنیشتن، ئەو دەهاتە ماڵی وان، ئەوە راستە بەڵام قۆناغی یەکەم ئەو ئاگای لێ نییە، قۆناغی یەکەم مەرحوم ساڵح یوسفی داینا و دوایە کاک عومەر و ئەوان چوون بۆ ئێران. دوای ئەوە کە شەر هەڵگیرسایەوە شەوکەت عەقراوی چوو جارێک، من کە لە ئورووپا هاتمەوە لە ١٩٦٣ بە تاراندا هاتمەوە بەڵام ئێرانییەکان منیان نەدیت، من ئەووەختە لە لای ئێرانییەکان بە دۆستی جەماڵ عەبدولناسر مەشهوور بووم و ئێران جەمال عەبدولناسری زۆر خۆش نەدەویست لە بەر ئەوە هەر رێگایان دام هاتمەوە حەتا قسەشیان لە گەڵ نەکردم لە تاران و ئەوانە! دوایە وەفدێکی تر مامۆستا برایمیان دەعوەت کرد و چوو بۆ ئێران جا دوایە یەکسەر لە گەڵ مەلا مستەفا تەماسیان گرت و پەیوەندیان گرت و ئەوانە.

**عەلی:** هەروەک دەزانن لە ساڵانی ٦٠دا جەماعەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەک ئەحمەد تۆفیق و ئەوانی تر لە لای مەلا مستەفا بوون و لە کوردستانی عێراق بوون، زەبیحی ئایا لە گەڵ ئەو جەماعەتە هیچ پەیوەندی هەبوو یان نا؟ ئەگەر نەیبووە چۆنە ئەو کە کوردی ئێرانیش بووە و ئی سەردەمی کۆمار بووە هیچ پەیوەندی بە حیزبی دێمۆکراتی ئێرانەوە نەبووە؟

**مام جەلال:** گوێت لێ بێ قسەت بۆ بکەم! لە ١٩٥٨وە ئەوانە هاتنەوە بەغدا لە ٥٨ رەحمەتی قاسملو هات و مەرحوم ئەحمەد تۆفیق هاتوو و.... مامۆستا زەبیحی پیاوێک بوو وەکوو پێمگوتی ساغڵەم و سەرراست و سەررەق. با! پەیوەندیان پێوە گرتبوو بەڵام نە ئەحمەد تۆفیقی بە دڵ بوو نە قاسملو! ئەووەختە خیلاف هەبوو لە بەینی ئەحمەد تۆفیق و قاسملو، یەکتریان ئیتهام دەکرد، ئەحمەد تۆفیق قاسملوی بە خائین و جاسوس ئیتهام دەکرد، دەیگوت چۆکی داداوە و ساواکییە و لە بەرامبەر تەیموری بەختیار بەرانەتی داوە و لەو شتانە، ئەویش ئەحمەد تۆفیقی ئیتهام دەکرد بە کابرایەکی سەرکەشی

سەرلێشێواوی هەڵەشە و ئەوانە.... ماموستا زەبیحی رای لە هیچیان نەبوو لەبەر ئەوە لە گەڵ هیچیان بەینی نەبوو بەڵام لە گەڵ خەڵکی دیکە عەلاقەی هەبوو. ماموستا زەبیحی قەراری دابوو داخلی ئەو گێژاوەیە بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران نەبێتەوە، ئێستا ئیتر ئەو لە ناو کوردستانی عێراقە و جێگای خۆی لە ناو پارتیدا کردووەتەوە و درێژە بە خەباتی خۆی دەدا و خۆی تووشی ئەو سەرئێشە و ئەو ئیختلافاتانە نەکا کە زۆر توند بوو لە ناو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا! مەلا مستەفا سەردەمێک پشتیوانی لە قاسملو دەکرد، دوای ئەوە پشتیوانی لە ئەحمەد تۆفیق کرد، دوکتور مرادیش پشتیوانی لە ئەحمەد تۆفیق دەکرد زیددی قاسملو. مەلا مستەفا لە گەڵ دوکتور مراد هەستان چوون بۆ لای وەزیری داخیلیەی عێراقی و قاسملویان دەرکرد! لە عێراقیان دەرکرد، شکایەتیان لێکرد و دەریان کرد، کە دەریان کرد ئەحمەد تۆفیق بوو بە عەبدی مەلا مستەفا، وەکوو زوڕناژەنی ئەو بوو، وەکوو دەهۆڵ لێدەری ئەو بو، لەسەر ئەوەش تەبعەن لە گەڵ زەبیحیش نەدەگەیشتنەوە یەک! پاشان ئەحمەد تۆفیق بەڕاست زۆر کۆنەپەرەست بوو ئەو سەردەمە، بەلای ئێمەوە ئەو ئەفکارانەی ئەو هەیبوو وەکوو کفر وابوو! ئیتر حەقم نییە لەسەر ئێستا! مەسەلەن ئەو زۆر دژی سۆڤیەت بوو، ئەحمەد تۆفیق دژی مارکسیزم بوو، دژی هەموو نەوعە هاوکارییەک بوو لە گەڵ حیزبی کۆمونیستی عێراق و حیزبی تودەی ئێران و ئەو شتانە، لایەنگری ئەوە بوو لە گەڵ ئەمریکا هاوکاری بکەین و ئەو چوو لە وەختی خۆی دانا ئادام شمیتی هێنا لە ١٩٦٢ لە لوبنان و ئەوانە. کە شۆڕشیش هەڵگیرسا ئەحمەد تۆفیق بوو بە زوڕناژەنی مەلا مستەفا و زیددی حیزب قسەی دەکرد و شتێکی دەردەکرد "دیسان بارزانی" کە هەر بارزانی هەیە و هەر بارزانی خەبات دەکا و وا دەکا و ئاوا دەکا و... لەبەر ئەوە لە گەڵ ماموستا زەبیحی و هەموو ئەوانی تر بەینیان خراپ بوو. رەحمەتی لێبێ ئەحمەد تۆفیق دەورێکی یەکجار خراپی گێرا، فیتنەیی، تێکدان لە بەینی مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفا، بەڕاستی دەورێکی زۆر خراپی گێرا لەو سەردەمە!

**عەلی:** ئەدی ئەوە راستە کە قاسملو دەرکراوە لە بەغدا پەنای بۆ مقەری پارتی هێناوە و ئەو کات زەبیحیش لەوێ کار بەدەست بووە بەڵام هیچیان بۆ نەکردووە!

**مام جەلال:** راست نییە! ئەسلەن بیلعەکس، قاسملو لە گەڵ ئێمە هیچ بەینی نەبوو، کە قاسملو دەرکرا حیزبی شیوعی پەنای دابوو، قاسملو ئەو وەختەش تودەیی بوو بۆ مەعلووماتت! حیزبی تودە لە بەغدا بوون، ئەو لە گەڵ حیزبی تودە بوو و یەکێک لە تۆهمەتەکانی کە ئەحمەد تۆفیق لە سەری بوو دەیگوت قاسملو تودەییە وە ئەووەختە دوکتۆر قاسملو لە گەڵ تودەییەکان بوو جگە لەوە لە گەڵ تودەییەکان بوو لە گەڵ حیزبی شیوعی بوو یەعنی لە گەڵ ئێمە ئەسڵەن مەرحەباشی نەبوو بۆ مەعلووماتت!

**عەلی:** ئایا ئەگەر ئەوە راستبا و قاسملو هاتبا بۆ لاتان ئێوە هیچتان پێدەکرا کە دەری نەکەن وە یان یارمەتی بدەن بەتاییەت زەبیحی ئایا هیچی بۆ دەکرا؟

**مام جەلال:** وەڵاهی باوەڕ ناکەم هیچمان پێکرابایە چونکا دەزانی لەبەر چی؟! چونکە رەئیسەکەمان شکایەتی لێکردبوو، ئێمە چۆن دەمانتوانی بڵێین دەری مەکەن، رەئیسەکەمان مەلا مستەفا بوو ئەو چووبوو لە لای وەزیری داخیلیە گوتبووی دەرکرێ ئێمە چۆن دەمانتوانی بڵێین دەرنەکرێ؟! (پێکەنین) نە زەبیحی پێی دەکرا نە مامۆستا برایم نە کەس! مەلا مستەفا گوتبووی دەرکرێ!

**عەلی:** دوای ئەوەی کە ئێوە لە ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق و خەلافەکە ئیدی تەقیبۆوە لە ناو پارتی و مەکتەبی سیاسی، نەقشی زەبیحی چ بوو و شێوە تێکۆشانی بە چ چەشنێک بوو؟

**مام جەلال:** کاکە! زەبیحی هەر لە سەرەتاوە نە هاتە ئێران و نە هاتە دەرێ، کە مەلا مستەفا شەری حیزبی کرد و سەرکردایەتی حیزبی دەرپەڕاند زەبیحی چۆوە بەغدا و دەستی کردەوە بە کاری نەهێنی خۆی. لەوێ کاری نەهێنی دەکرد و تەشکیلاتی حیزبی دەکرد و رۆژنامەی حیزبی و شتی وای یانی دەنگ و باس و بلاوکراوەی ناوخۆی بلاو دەکردەوە و ئاوا ئیشی دەکرد هەتا ساڵی ١٩٦٦ کە ئێمە هاتینەوە لە شاخ، من و کاک عومەر و حیلمی شەریف و ئەوانە هاتینەوە، کە ئێمە هاتینەوە کاک حیلمی شەریف چووە بەغدا و ئەو و کاک زەبیحی بەیەکەوە هاوکارییان دەکرد و بەدزی ئیشیان دەکرد و هەتا بەعس نەهاتە سەرکار ئێمە بە ئاشکرا ئیشمان نەکرد.

**عەلی:** زەبیحی لە ساڵی ١٩٧٥ لە بەغدا گیرا، ئەوە چۆن بوو و لەسەر چی

بوو؟

**مام جەلال:** زەبیحی سالی ١٩٧٤ هاتە بەیروت، لە بەیروت لە گەڵ من ئیتسالی کرد کە گەڕاوە گرتیان، بە تۆهمەتی ئەوەی کە لە گەڵ من عەلاقەی کردووە و شتیوا بەڵام دوای ئەوە ماوەیەک هێشتیانەوە و بەریان دا. کە هاتە بەیروت ئەو موددەتە ئێمە بەیەکەوە بووین، جاسوسێکی عێراق ئێمەی بە یەکەوە دیت کە ناوی شێخ جەبار بوو، برای شێخ ستار، ئەو چووبۆوە خەبەری لێدابوو کە ئەوە لە بەیروت دائیم لە گەڵ جەلالە و ئەوەیە و ئەوەیە... لە سەر ئەوە گیرا بەڵام دوایە بەریاندا.

**عەلی:** لەسەر کاری ئەدەبی و نووسینی مامۆستا زەبیحی چ دەزانن؟

**مام جەلال:** وەڵاهی هیچ ئاگام لێی نییە، دەمزانی خەریکی زمان و ڕێزمان و فەرهەنگی کوردی و ئەو شتانەیە، ئەمن بەش بە حالی خۆم زۆر موهتەم نەبووم بەو شتانە و ئاگام لێی نییە، دەمزانی هەر کۆی دەکاتەوە و دەینووسێ و ئەوشتانە.

**عەلی:** لەسەر کتێبەکەی خۆتان کە لەوێدا باسی کۆمەڵەی ژ . ک دەکەن، ئەو مەعلووماتانەتان لە سەر کۆمەڵەی ژ . ک لە کوێ وەرگرتووە؟

**مام جەلال:** ئەمن زۆرتری مەعلووماتەکەم لە مامۆستا زەبیحی وەرگرت، زۆرتری ئەو شتانەم لە دوو کەس بیستووە ئەوەی چوونەکە لە میر حاجم بیستووە کە لە گەڵ شەهید مستەفا خۆشناو چوونەتە وێ کە لە باغی حاجی داود کۆبونەوەیان کردووە و... ئەوەی تریشم لە مامۆستا زەبیحی بیستووە، مەعلووماتەکەی من هەمووی لە زمان زەبیحی یەوە بووە (هەژاریش)

**عەلی:** هەروەک ئاگادارن سالی ١٩٧٩ شاه رووخا و زەبیحی هاتەوە کوردستانی ئێران لەو هاتنەوەیە چۆن ئاگادار بوون و چ دەزانن؟

**مام جەلال:** ئەمن دەمزانی زەبیحی خەریکی قامووسەکەیەتی. ئەمن پێمخۆش بوو بەش بە حالی خۆم لایەنگری ئەوە بووم کە زەبیحی بێتە دەرێ، مامۆستا برایم عەینی بیروڕای هەبوو، جارێکیان زەبیحی توانیبووی پاسپۆرت وەرگرێ و بێتە دەرەوە، مامۆستا برایم داوای لێکردبوو کە نەچێتەوە و لێرە بن لە لەندەن بۆخۆیان ئیش بکەن وقامووس و شتەکانی بێنێتو و ئەوانە. زەبیحی بە رای من ئیشتباهێکی کە بووی ئەوەیە چونکە

خۆی خەریکی سیاسەت نەبوو و ئەو موددەتە خەریکی قامووس و ئەوانە بوو پێیوابوو کە بەعس دەستی لێ نادەن و ئەو دەتوانێ قامووسەکەی جێبەجێ کا و چاپی کا و ئەوە دواشاکاری فەرهەنگی و شتی وای بێ، بۆیە زۆر حوسنی زەینی هەبوو بۆ ئەوەی کە لە بەغدا بمێنێتەوە، دوو هۆشی هەبوو یەکێکیان ئەو کاربەدەستە کوردانەی بەغدا هەموو دۆستی بوون، تەها محێدین مەعروف دۆستی بوو، بابەکرئاغا، مەلا ماتۆر و... پێیوابوو لە گەڵ ئەوان و لە سێبەری ئەواندا دەتوانێ بمێنێتەوە، پاشان هیچ چالاکییەکیشی نەبوو دژی حکومەت، هەر چەند لە گەڵ ئێمە پەیوەندی هەبوو و ئێمەی خۆش دەویست بەڵام کاری نەدەکرد، کاری سیاسی و ئەوە کە بترسێ لە خۆی.

کە هاتە دەرێ پاش ئەوەی هاتەوە بۆ ئێران، تەبعەن ئێمە زۆر زۆرمان پێخۆش بوو. من دیتم لە پێشەوە لە سەر سنور، تەشویقم کرد کە لە گەڵ مامۆستا ئیش بکا، بەڕاستی! چون مامۆستا شێخ عیزەدین ئەووەختە بە ناوی دەفتەری مامۆستا ئیشی دەکرد و زۆر ناو و ناوبانگی هەبوو. من پێمخۆش بوو کە لە گەڵی ئیش بکا و گوتی باشە و چوو بۆ ئەوێ.

**عەلی**: ببورە! پێت وانییە یەکەمجار ئێوە لە بۆکان چاوتان بە مامۆستا زەبیحی کەوت؟! چون خۆم لە گەڵی هاتم، ئێوە یەکەمجار کە هاتن بۆ کوردستانی ئێران دوای روخانی شا، شەوێک کاک دلێری سەید مەجید هات بۆ لام و گوتی مامە هاتووە لە ماڵی کاک سەلاح یا کاک سەعدی موهتەدی لە بۆکانە و پێیخۆشە چاوی بە مامۆستا زەبیحی بکەوێ.

**مام جەلال**: دەبێ وابوبێت، ئەمن شتەکانم زۆر چاک لە بیر نییە مادام تۆ دەڵێی وایە دەبێ وابێت، ئەتۆ دەبێ باشترت لە بیر بێ چونکا ئەمن مامۆستا زەبیحیم دووسێ جار دیت، جارێک لە بێوران، وابزانم لە گەڕانەوەیدا لە بێوران دیتم. ئەوەی من لە بیرمە کە دیتم ئەمن خۆم تەشویقم کرد کە لە گەڵ مامۆستا ئیش بکا، زۆرم تەشویق کرد و پێمـوابوو کە ئەوە شتێکی باشە، تەبعەن خۆی دڵی گرمێ ببوو لە قیادەی حیزبی دیمۆکرات یانی پێیوانەبوو کە ئەو دەتوانێ ئیش بکا و ئەوانە، ئیدی گوتمان ئەوە جوڵانەوێکی گشتی جەماهیری گەورە هەیە کە مامۆستا شێخ عیزەدینە و دیارە ئێمە

ماموستا شێخ عیزەدینمان خوش دەویست. پاش ئەوە کە دیمەوە لە بیوران دڵی رەنجا بوو، دەیگوت لە گەڵ ماموستا شێخ عیزەدین ئیش ناکرێ یانی باوەڕی بەوەش نەمابوو کە دەتوانێ لە گەڵ ماموستا شێخ عیزەدین ئیش بکا! ئێمە پێمان گوت دەباشە کاکە وەرە لە گەڵ خومان ئیش بکە، گوتی باشە وەعدی دا بچێت و بێتەوە و لە گەڵ خومان ئیش بکا، ئیتر چووە گیرا! هەرچی کەسێک لێم بیستووە دەڵێن حیزبی دێموکرات بە گرتی داوە!

**عەلی:** ماموستا عەبدوڵلاش دەڵێ یەقینم کە بەدەستی قاسملو تێدا چووە!

**مام جەلال:** ئەمن ناتوانم بڵێم بە دەستی قاسملو بەڵام موتەئەکیدم کە حیزبی دێموکرات قسەیان لەسەر کردبوو لە لای عێراقییەکان!

**عەلی:** لە سەر جەریانی کوشتنی حامید بەگی جوانروش بە دەستی چریکەکانی فیدایی خەڵق کە ئێعلامیەیان دا "حامید بەگی جوانرو خائین و خوفروشی بەعسی سەر بە عەبدولڕەحمانی زەبیحی بە دەستی چریکەکانی فیدایی خەڵق گیرا" ئەمن پێموایە ئەوەش جێگای لێکوڵینەوەیە چونکا ئەوکات کە چریک بەو هێزە کەمەی خوی لە سابلاغ کە جورئەتی دا بە خوی ئەو کارە بکا لە گەڵ حیزبی دێموکرات ستادی موشتەرەکیان دانابوو وە زور لێک نیزیک بوون!

**مام جەلال:** بەڵێ! چریکەکان کوشتیان، ئەو حامید بەگە زور دوستی ئێمە بوو ئاموزای شەهید ئازاد هەورامی ئێمە بوو، پیاوێکی تێکوشەر بوو، ئەوەی جافر سوڵتانی هەورامان بوو، وەختی خوی لە لای ئێمە پێشمەرگە بوو، لە لای ئێمە سەرلق بوو، زور پیاوێکی ئازا بوو، ئێستاش بنەماڵەکەی لە سولەیمانیە وەک شەهیدی ئێمە حیسابیان بو دەکەین. ئەوە ماموستا زەبیحی هێزێکی چەکداری لێ دروست کردبوو لە مەنتەقەی هەورامان و ئەوە بەڵام بە کوشتیاندا، منیش پێموایە حیزبی دێموکرات بە کوشتیدا. ئێمە کاتی خوی ئەوەمان بە چریکەکان گوت و ئێعترازمان پێکردن، گوتیان نەمانزانیوە و نەوانە! پێموایە لە مەسەلەی حامید بەگ ماموستا شێخ عیزەدینیش کەمتەرخەمێکی هەبوو، دەیتوانی داوای بەردانی بکا و نەوانە! دوایەش کە ئێمە بە چریکەکانمان گوت تازە تەواو ببوو، گوتیان نەمانزانیوە و ئەگەر زانیبامان دوستی ئێوەیە بەرمان دەدا و نەوشتانە، پێشموایە ئەگەر چریک زانیبایان دوستی ئێمەیە بەریان دەدا چون ئەوکات

عەلاقەمان باش بوو لە گەڵ چریکەکان.

**عەلی:** مامۆستا شێخ عیزەدین دەفەرموێ کە ئێمە خەریک بووین حیزبێک وەک خەتی گشتی دروست کەین لە گەڵ مامۆستا زەبیحی، ئەو خەتەش ئەوە بوو کە هەموو کەس بگرێتەوە و خەتێکی پان و کوردایەتی و ئەوە بێت، ئەوەش پێشنیاری مام جەلال بووە و هەر ئەویش زەبیحی پێشنیار کردووە کە باشترین کەسە کە بتوانێ ئەو حیزبە هەڵسوڕێنێ بەڵام دەوروبەرەکەم کە زۆربەیان سەر بە کۆمەڵە بوون نەیان هێشت دروست بێت، ئێوە لە سەر ئەوە چ دەفەرموون؟

**مام جەلال:** من ئەوەم ئاگا لێ نییە! هیچ ئاگام لێ نییە کێ تێکی داوە، ئەمن تەنیا ئەوەندەم ئاگا لێیە کە مامۆستا راست دەکا قەرار بوو کە خەتێکی گشتی دروست بێ حەتا ئێمە پێمان وابوو وەکوو یەکێتی دەکرێ یەکێتێک دروست کەن کە کۆمەڵەشی تێدابێ چۆن کۆمەڵەی ناو ئێمە هەیە ئەو کۆمەڵەیەش ئەوها بێت بەڵام ئاگام لێ نییە چۆن تێکچوو تەنیا هەر ئەوەندەم ئاگا لێیە کە مامۆستا زەبیحی هاتەوە گلێیەکی زۆری لە دەفتەری مامۆستا هەبوو وە گلەیشی لە مامۆستاش هەبوو کە مامۆستا تەسمیمگیر نییە و دەوروبەرەکەی ئەوعێکن و ئەو لەو جەوە هەڵ ناکا! ئەمن ئەوەندەم ئاگا لێیە ئیتر ئەوەم ئاگا لێ نییە کۆمەڵە دەوری چ بووە و چەندە بووە، ئەوەی دەبێ لە کۆمەڵە پرسی! بەڵام ئەمن لە کۆمەڵە هیچم نەبیستووە دژی مامۆستا زەبیحی یا دژی ئەو شتە، راستییەکەی بۆ تاریخ! ئەمن دەبێ شەهادەتی سادق بدەم!

**عەلی:** گۆیا چەکێکی زۆر لە لایەن زەبیحییەوە وەرگیراوە بە نێوی شێخ جەلال و حامید بەگ و ئەوانە بەڵام دراوە بە ئێوە، ئەوە چۆن بووە؟

**مام جەلال:** راست نییە! ئەمن ئاگام لێیەتی. هەمووی دوسەد سێ سەد پارچە چەک بوو قەول بوو حامید بەگ هێزێکی وا دروست کا، دوسەد سێ سەد پارچە چەکیان دابوونێ هەوەڵجار. دوایەش قەرار بوو چەکی تریشیان بدەنێ و مامۆستا زەبیحی چەکەکان بێنێ بۆ دەفتەری مامۆستا و ئەوانە بەڵام نەیان دانێ، ئەمن پێموایە ئەوە هۆیەکی بوو کە حیزبی دێمۆکرات زیددی بوو!

**عەلی:** هەوەڵجار ئێمە خەبەری تێداچوونی مامۆستا زەبیحیمان لە ئێوە بیست

ئایا چۆن لەبەین چوو؟ گیرا؟ تیرۆر کرا؟ ئیعدام کرا یان چی؟

**مام جەلال:** وەڵا ئێمە وەکی بیستمان ئاوامان بیست کە مامۆستا زەبیحی لە ماڵێ بووە شەو چونەتە سەریی، خۆی و ماڵ و هەرچی بوویەتی پێچاویانەتەوە و بردوویانە بۆ دایرەی ئەمن یان موخابرات بەڵام بۆت دەپرسم بزانم چۆن بووە.

**عەلی:** ئەگەر لە بیرتان بێ ساڵی ١٩٨٤ کە مفاوزاتی ئێوە و بەغدا بوو جارێکیان منیش لە گەڵتان هاتم بۆ بەغدا تا بەڵکو سوراغێکی مامۆستا زەبیحی و نووسراوەکانی بکەین، ئێوە منتان بە فازیل بەڕاک ناساند لە دانیشتنێکدا و ئەویش زۆر بە حورمەتەوە جوابی پرسیارەکان و دانەوەی نووسراوەکانی زەبیحی هێشتەوە بۆ سەرگرتنی مفاوزات، پێتان وایە ئێستا کە سالیان بە سەر چووە بتوانین کارێک بکەین بۆ وەدەست خستنەوەی نووسراوەکانی مامۆستا زەبیحی؟

**مام جەلال:** ئەمن پێم باشە ئەگەر بۆت بکرێ نامەیەک بۆ سەدام حوسێن بنووسی، بڵێی کە من ئەوە خوارزای فلانەکەسم و ئەو کەسە قامووسێکی ئاوای داناوە، کاتی خۆی کە مفاوزات هەبوو لە بەغدا ئەمن هاتم بە هۆی فلان کەسەوە، دوکتۆر فازیل بەڕاک پێی وتم شتەکان لای ئێمەیە بەڵام ئەگەر مفاوزات سەری گرت دەتان دەینەوە، بڵێ زۆر مەمنون دەبم کە ئەو شتانەم بدەنەوە یان هیچ نەبێ خۆتان قامووسەکەی چاپ کەن. کاغەزێکیش بنووسە بۆ تەها محیّدین مەعروف کە زۆر دۆستی زەبیحی بوو، کاغەزەکەی سەدام بخە ناو کاغەزەکەی ئەو و بزانە دەڵێن چی؟! هیچ رێگای تر نییە رەنگە سەدام عەقڵی بیبرێ و بڵێ بیاندەنەوە!

**عەلی:** وەک پرسیارێک کە بۆ زۆر کەسی دیکەش مەترەحە ئەوەیە کە هەموو باش دەزانین کە زەبیحی زۆرتر نی ئێوە بوو تا کوردی ئێران، ئێستاش کە لە ساڵی ٨٠-٨١وە تێدا چووە و لە ساڵی ٩١وە کوردستان بە دەست خۆتانە و حکومەتی پارلمان و کوردان هەیە بۆچی تا ئێستا هیچ یادێک و شتێک لە لایەن ئێوەوە بۆ زەبیحی نەکراوە؟!

**مام جەلال:** لەبەر یەک سەبەب کە ئێمە خەبەرێکمان بیستووە کە ماوە! خەبەرێکمان بیستووە کە مەجموعەیەک لەو کەسانە گیراون و لە زیندانێکی تایبەتی دان، حکومەت دەیهەوێ بزانێ ئەوانە چ بوونە؟! یانی دەیهەوێ بزانێ کە مەسەلەن راستە

زەبیحی لە گەڵ ئێمە بووە تا سەری ببڕێ! وەکو بیستوومانە ئەو براوە و ون کراوە، نەکوژراوە! تا ئێستا لە هیچ مەسدەرێکی کە ئێمە دیومانە، لە مفاوزات قسەمان کردووە نەیان گوتوە کوژراوە! ئینجا گوتمان ئێمە ئەووەختە قسەکەمان ئەوە بوو ئەگەر بێتو هەڵای بۆ بکەین نەوەکا بکوژرێ و لێی لە هەڵا بدەین! ئەوە سەبەبی حەقیقەتی. دەڵێن مەجموعە کەسێکی وا هەیە کە دەڵێن شورتگوم کراون ئەگەر رۆژێک لە سەریان سابیت بوو ئەوە دەیان کوژن یانی قسێکی وامان بیستووە بۆیە هیچمان نەکردووە. مەسەلەن ئەمن کاتی خۆی لەو فازیل بەراقەم پرسی بۆ عوبێد و ئەوان گوتی نەماون بۆ زەبیحی گوتی نازانم! جا بۆیە گوتمان نەوەکا بە کوشتی بدەین، بەڵام پێموایە ئیستا وەختی وەهاتوە کە پیاو باسی بکا.

**عەلی:** چونکا ئەگەر لەبەر عومرەکەشی بێت دەبوو ئێستا چون زۆر پیر بووە یان مرد بێ یان بەریان دابا!

**مام جەلال:** ئێنسیکلۆپێدیای روسی کە لە سەر مامۆستا زەبیحیان نووسیوە پێموایە دەڵێن مامۆستا زەبیحی مەوالیدی ١٩١٤ یان ١٩١٦یە ئەگەر چاوی لێ بکەی دەزانی، جا ئەوە لە ئێنسۆکلۆپێدیای روسی هەیە چون ئەوانە لە مەهاباد و ئەوناوە شتیان کۆ کردووەتەوە و دەزانن، جا ئەمن لە بیرمە هەموو جارێ گاڵتەمان لە گەڵ دەکرد و تورەمان دەکرد لە سەر مەسەلەی عومر، مەسەلەن ئەمن لە خۆیم بیستووە کە دەیگوت ئەمن لەو موزاهیرانە ئیشتراکم کردووە کە کراوە دژی قاجار و دژی سەڵتەنەتی و بۆ جەمهوری! جا ئێمە گاڵتەکەمان ئاوا دەکرد دەمان گوت ئەوە ١٩٢٠ و ٢٢ە لەو سەردەمەدا یەکێک زانیبێتی جەمهوری باشترە لە سەڵتەنەت دەبێ بیست ساڵ بووبێت! تورەمان دەکرد و دەمان گوت کە وابێ تۆ مەوالیدی ١٩٠٢ی، مەسەلەن لەو بابەتانە، بەهەرحاڵ رەنگە ئەو سەردەمە مناڵ بووبێت و ئەوانە. پاشان پێموایە لە سییەکانا لە حیزبێک دابووە و تێکۆشانی بووە!

**عەلی:** رابیتەی زەبیحی لە گەڵ ئەو حیزبە کوردانەی کە لە بەغدا هەبوون و سەر بە دەوڵەت بوون چ بوو؟ ئایا کاری لە گەڵ دەکردن یان ئەندامیان بوو چی؟

**مام جەلال:** نا! ئەندامیان نەبوو. دەزانی چ بوو؟ ئەو حیزبە کارتۆنیانە بە

تایبەت ئەوەی مەلا ماتۆر ئەوە بوو کە مەلا ماتۆر خۆی بە شاگرد و شتی زەبیحی دەزانی، زەبیحیش هاتووچۆی دەکردن بەلام لە گەلیان نەبوو، باوەڕ ناکەم قەت ئەندامیان بووبێت جاریّ لە گەلّ شێخ ستار هەر بەینیان نەبوو بەلام لە گەلّ مەلا ماتۆر بەینی زۆر خۆش بوو. تۆ لە مەلا ماتۆرت نەپرسی لە سەر ئەوە؟

**عەلی:** بەلێ! ئەو دەیگوت زەبیحی زۆر لەوە گەورەتر بوو کە ئەندامی ئەو حیزبانە بێت بەلام پرسمان پێ دەکرد.

**مام جەلال:** منیش دەتوانم سەدی سەد بڵێم لەو حیزبانەدا نەبووە بەلام رەنگە لە گەلیان نیزیک بووبێ. منیش دەتوانم سوێند بخۆم کە قەت زەبیحی ئەندامیان نەبووە!

**عەلی:** زەبیحی وەک چی دەیتوانی لەو ئاخریانەدا لە بەغدا دانیشێ؟ وەک لاجیئی سیاسی، وەک عێراقی، ئایا سەر بە وان بوو؟

**مام جەلال:** دەزانی چییە؟! خۆ هەموو دەیانزانی ئەو عێراقی نییە بە ئەسڵ و کوردی ئێرانە، ئەما لەو موددەتەدا شتی عێراقی وەرگرتبوو، پاسپۆرت و ماسپۆرت و ئەوە، وەکوو سیاسییەک لە حیزبێک بووە کە ئێمە بووین، ئەو حیزبە سەردەمێک عەلاقەی باش بووە لە گەلّ حکومەت. ئەو حیزبە کە ئێمە بووین مەجموعە خەلکێکی لێ هەلوەری کە هەموو موناسبیان هەبوو لە دەولەتدا، یەک نایب رئیس جەمهوری بوو، یەکدوویەک وەزیر بوون و... ئەوانە دەیانزانی کە ئەویش ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی ئەو حیزبە بووە کە ئەوانە ئێستا وەزیری ئەوانن و هەروەها دەیانزانی کە پیاوێکی زۆر ئەزیهو خاکی و سادە و هێنە، خەریکی کاری سەقافی و ئەوەیە و هیچ شتی سیاسی بەدەستەوە نییە، لەبەر ئەوە ئەوها تەماشایان دەکرد. ئەمن پێموایە بۆ ماوەیەکی زۆر بە ئیحترامەوە تەماشایان دەکرد لەو دوکتۆر فازیلەم بیستووە کە دەیگوت پیاوێکی عالم بوو، بەسیت بوو، هیچ داوای نەبوو یەعنی لەو بابەتانە.

عەلی: یانی ئەوە بەوێوە نانووسێ کە کاتی خۆی پێیان دەگوت بەعسی و...

**مام جەلال:** نا! ئەهو...ئەهو... فەرقی ئاسمان و عەرزە، قەت قەت شتی وای نەکردووە، قەت نە بەعسی بووە نە سەر بە حکومەت بووە نە دۆستی حکومەت بووە. پیاوێک بوو ویستوویەتی بیگوزەرێنێ لە وەزعی بەغدادا، هەروەک ئێستا چەندین

خوێندەوار و موسەقەفی کورد هەیە لە بەغدا کە سیاسەت ناکەن، حیزبایەتی ناکەن، دژایەتی حکومەتیش ناکەن بەڵام حورمەتی خۆیان پاراستووە، چەندین پیاوی کورد هەیە لە بەغدا دانیشتون ئەویش یەکێک بوو لەوان! وەڵاهی ئەمن بەعسی بووبم! تۆ بەعسی بووبی! ئەو بەعسی نەبووە! ئەو تۆهمەتە بە هیچ نەوعێک مەعقوڵ نییە لەسەر زەبیحی!

**عەلی:** کە هاتەوە بۆ کوردستانی ئێران ساڵی ١٩٧٩ ئەوە باو بوو کە بە ئیجازەی ئەوان هاتووەتەوە و بۆ دروست کردنی موعارەزەی ئێرانی ناردویانەتەوە و ...

**مام جەلال:** بەڵێ ! ئەوە قەی ناکا هەموو ئەو کوردانە بە ئیجازەی بەعس لە بەغدا دانیشتوون و بە ئیجازەی بەغدا دەبێ هاتووچۆ بکەن، بەبێ ئیجازە چۆن دەتوانن بێن و بڕۆن قابیلە سەنگەریان گرتووە لە بەغدا دانیشتوون! ئەوە شتێکی تەبیعی یە کە بە ئیجازەی بەعس هاتووچۆی کردووە، دەزانی چییە ؟ یەک شت هەیە با پێت بڵێم: مامۆستا زەبیحی کە هاتووەتە دەر بە تەئکید بە وانی گوتوە کە ئەوە من دەچمەوە ئێران، ئەوانیش پێیان گوتوە بچۆوە بزانە چ دەکەی و ئەوانە، مامۆستا زەبیحی کە هاتووەتەوە بە لای کێیدا شکاندوە ؟ بە لای شێخ عیزەدین، شێخ عیزەدین بە چی موتەهەم بووە ؟ بە کۆمەڵە، کومەڵە بە چی موتەهەم بووە ؟ بە دوژمنی عێراق. حیزبی دێمۆکرات دۆستی عێراق بووە و هاوکاری کردووە و ئەوانە، لەبەر ئەوە ڕەنگە ئەوەیان بە عێراق گوتبێ کە فەرموو ئەوە ئێوە ناردتانەوە بۆ ئەوەی لە گەڵ ئۆپۆزسیونی ئێران ئیش بکا بەڵام ئەوە لە گەڵ دوژمنەکانی ئێوە ئیش دەکا نەک لە گەڵ دۆستەکانی ئێوە! هەر وەها دروست کردنی حامید بەگ و هێزی چەکدار، حیزبی دێمۆکرات زۆری پێ ناخۆش بوو چونکا دەترسان زەبیحی بە پشتیوانیی ئێمە بتوانێ هێزێکی گەورە دروست کا لە کوردستانی ئێران بە تایبەتی ئەگەر عێراق بە چەک یارمەتی بدا، چەکدار و پێشمەرگە و ئەوە دروست کا و ببێتە هێزێک موقابیل بە وان! بۆیە ئەمن حەتمەن بە دووری نازانم کە دژی بووبن! ئەمما نازانم بەڕاستی کێیان چووە شکایەتی لێکردووە لە عێراق! وەختی خۆی بە ئێمەشیان گوت کە حیزبی دێمۆکرات قسەیان لەسەر کردووە. ئەمن ناتوانم بڵێم قاسملو بەڵام دەزانم کە لە لایەن حیزبی دێمۆکراتەوە موشاغبەی لێکراوە.

**عەلی:** ئەمن پرسیارێکی وام نەماوە ئەگەر خۆتان شتێکی تایبەتیتان هەیە تکایە بفەرموون.

**مام جەلال:** وەڵاهی دەزانی چی؟ ئەمن دەمەوێ باسی زەبیحی ئاوا بکەم کە مامۆستا زەبیحی پیاوێکی تێکۆشەری کوردپەروەری خەباتگێری شۆڕشگێری لە خۆبوردو، خۆنەویستی، دەتوانم پێی بڵێم سەربازی گومناوی کوردایەتی بوو. پیاوێک بوو هەموو ژیانی خۆی بۆ مەسەلەی رزگاری کوردستان و گەیاندنی خەڵکی کورد بە جورێک بە مافەکانی خۆی تەرخان کردبوو، هیچ تەماحێکی لە دونیادا نەبوو یانی باوەڕ بکە کە ئێمە ئەگەر ویستبای ئوتومبیلمان بۆ دەکڕی، خانومان بۆ دابین دەکرد، ژنمان بۆ دەهێنا و هەموو شتێکمان بۆ دەکرد، رازی نەبوو هیچ یەک لەو شتانە قەبوڵ بکا! لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی مەسەلەن ماشێنیان هەبوو ئەو بە باس دەهاتوودەچوو، لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی خانوویان هەبوو ئەو ژوورێکی قوڕی پیسی گرتبوو لە کونێکدا دەژیا! پارە هەموو لە دەس خۆی دابوو، دیارە ئەووەختە معاشی هەمووومان کەم بوو بەڵام هەرە کەمەکە ئی ئەو بوو، مەسەلەن موومکینە برادەرێکی سەرکردایەتی بڵێین مانگێ ٦٠ دیناری وەردەگرت ئەو ١٠ دیناری وەردەگرت، ١٥ی وەردەگرت، ئەمر و ئەژی! پیاوێک بوو بەڕاستی کوردستانیش بوو یانی بۆ ئەو کوردستانی ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا فەرقی نەبوو، لە هەر جێیەک با ئەو خەباتەکەی دەکرد و پێشی وابوو تەواوکەری خەباتەکەی ترێتی!

پیاوێک بوو تا بڵێی هوشیار بوو، پیاوێکی زیرەکی هوشیاری دووربین. سەڕاست بوو یانی لەو کەسانە بوو کە فرتو و فێلی سیاسی و شتی وای نەدەزانی یانی تۆی خۆش نەویستبا بە زەنجیر بەستباتەوە نەیدەتوانی تەماشات بکا! خۆی بە سادقی لە گەڵ خەڵک معاملەی دەکرد، ئەوەی خۆشی نەویستبا دەیگوت بڕۆ...هیچە...وایەکی لێدەکرد و بە جێی دەهێشت جگە لەوە پیاوێک بوو بەڕاستی نەترس بوو زۆر ئازا بوو، هیچ نەدەسڵەمیەوە لە هەرچی پێی دەڵێن ریسک! خۆ بشارێتەوە، بگیرێ، بکوژرێ، دەیکرد. سنور ببەزێنێ، بێت، بڕوا، هەرچی کاری شۆڕشگێرانە هەیە پێویست بایە دەیکرد بێ ئەوەی گوێ بداتێ ئەنجامەکەی چییە! مردنە؟! ژیانە؟! چییە؟! ئەو دەیکرد.

کابرایەکی خۆش بوو لە دوستایەتیدا یانی لە گەڵ خەڵک سادق بوو، لە گەڵ دۆست و ئەوانەی. پیاوێک بوو بەڕاستی چەند زمانێکی دەزانی، شارەزایەکی زۆری هەبوو لە مێژووی کورد، لە زمانی کوردی، لە فەرهەنگی کوردی. ئەتۆ ئەگەر تەماشای کەی کابرایەک کە هیچی نەخوێندووە ئەو هەموو شتانەی چۆن زانیوە؟! دەبێ چ بلیمەتێک بووبێ؟! بە گاڵتە نەبوو بەشیر موشیر پێی دەگوت "عولەما" ئاخر ناوەکەی لەوەوە هاتبوو، دەیگوت ئەو پیاوە عولەمایە! تۆ سەیر کە مەسەلەن روسی فێر ببوو، ئینگلیسی فێر ببوو، فەرەنسی فێر ببوو، عەرەبی دەزانی، تورکی دەزانی، فارسی دەزانی، کوردی دەزانی، حەوت زمانی دەزانی بە چەندێکیان دەینووسی و مەقالەی پێدەنووسین، ئەو هەمووە شارەزایەی پەیدا کردبوو لە سیاسەت و لە خوێندنەوە و لە کتێب و ئەوانەدا.

پاشان پیاوێک بوو لە پێناوی ئەوەی کە بیروباوەڕێتی نەدەسلەمییەوە چی پێویستە بیکا! خۆی کابرایەکی بێ تەماح و بێ غەرەز بوو لە غەیری کوردایەتی و خزمەتی گەلی کورد و کوردستان زیاتر هیچ هیوا و ئاواتێکی دیکەی نەبوو وە بە رای من خەسارەتێکی زۆر گەورە بوو لە دەست چوو، خۆزیا ئەو دوو ئیشتبایەی نەکردبا: یەکیان نەهاتە دەرێ یانی ئەو سەردەمەی مامۆستا برایم پێی گوتبوو هاتبا دەرێ لێرە لە گەڵ مامۆستا برایم شتی نووسیبا و ئەوانە، دووهەم پێموایە زیادە لەحەد حوسنی زەینی بە بەعس هەبوو، پێیوابوو دەستی لێ نادەن، پێیوابوو چونکا ئەو زەرەری بۆیان نییە و شەریان ناکا و ئەوانە دەستی لێنادەن و ئەو حوسنی زەینە هێشتییەوە و نەیدەزانی کە زۆر کەس قسەی لەسەر دەکەن، شتی بۆ دروست دەکەن و درۆی بۆ هەڵدەبەستن و ئەوانە، ئەوەی وەک خۆی تەقدیر نەدەکرد!

دەمەوێ ئەوەش بڵێم لە تاریخی کورددا گەورەترین زەرەری سۆڤیەت کە لە کوردیدا ئەوە بوو کە نەیهێشت ژ. ک بە تەریقەی خۆی گەشە بکا و هەروەها لە عێراقیش وای کرد، لە عێراق شۆڕش و رزگاری هەبوو نەیانهێشت ئەو دوو حیزبە بە شێوەی تەبیعی خۆیان گەشە بکەن، هاتن سەرکردایەتێکی عەشایریان هێنایەوە سەر جوڵانەوەی کورد، لە ئێران قازی محەمەد و دەوروبەرەکەی تەماشایان بکە هەموو لەو بابەتانەن مالکین و ئاغا و... لە کوردستانی عێراقیش مەلا مستەفا و شێخ لەتیف و کاکە زیاد و ئەوانەیان هێناوە

بە زۆر، مەسەلەن کاکە زیاد ئاغا ئەمن دەیناسم، پیاوێکی زۆر موحتەرەم و کوردپەروەر و ئەوە بوو، خۆی نەیدەویست دەیگوت کاکە ئەوە بە من ناکرێ، رازی بوو ئەندامێکی موحتەرەمی حیزبەکە بێ، هێنایان، نا! ئیلا دەبێ جێگری سەرۆک بێ! ئاخر کاکە پێم ناکرێ! لێی نازانم! نا هەر دەبێ ببی! پیاوێکی زۆر موحتەرەم بوو، زۆر کوردپەروەر بوو، تەماحی دەوەدا نەبوو جێگری سەرۆک بێ، کە چی مەلا مستەفا کاتی خۆی ناردی هەمزە عەبدوڵلا چوو کاکە زیاد و شێخ لەتیفیان هێنا و هەیئەتێکیان دانا و سەرۆکایەتی عەشایری کۆنینەی کلاسیکیان هێنایەوە سەر جولانەوەی کوردەواری. کۆمەڵەی ژ . ک خۆی ببا بە حیزبی دیموکرات شتێکی تر دەردەچوو و ئاوا نەدەشکا چون هەموو پیاوی تێکۆشەری خۆنەویست بوون و هیچیان نەبوو لە دەستیان بچێ! ئەمن پێموایە ئەوە هەنگاوێکی پاشەکشە بوو، ئەمن لە کتێبەکەشدا ئەوەم نووسیوە و ئەوە گەورەترین زەرەر بوو کە سۆڤیەت لە کوردی دا. کاتی خۆی کاک نەوشیروان شتێکی هەبوو دەیویست بینووسێ "زیانەکانی شۆرشی ئۆکتۆبر بۆ کورد" ئەمن پێموایە زیانی زۆر لە کورد داوە سۆڤیەت، لێی بگەرابا ژ.ک دەبوو بە حیزبێکی رێک و پێکی ژیکەلەی زۆر چاک و جەماهیری بلێین بە ئیستلاحی خۆمان وردەبورژوا و جوتیار و کریکار و دووکاندار و خوێندکاری کۆ دەکردەوە! پاشەکشێکی گەورە بوو، ئەتۆ تەماشا بکە خۆسەرکردایەتی حیزبی دیموکرات ئاشبەتالی کرد! قازی محەممەد ئێعدام نەکرابا یانی شا ئەو کەرایەتەی کرد ئێعدامی نەکردبا دەبوایە مێژووی کورد بە ئاشبەتاڵ و شتێکی تر ناوی بەرێ! بە قارەمانی خۆی لە مەحکەمە و بە ئێعدام کردنی، خۆی کرییەوە ئەگینا سەرۆک جەمهوری وڵاتێک بچێ بە پیر لەشکری دوژمنەوە و مەڕی بۆ سەر ببرێ ئەوە چییە ؟!

خەتی سۆڤیەت خەتێکی غەڵەت بوو پێیوابوو موجتەمەعی کوردی هێشتا موجتەمەعێکی عەشایریە و هێزی نەسا.ی هێشتا عەشایرن و لەو قسە قۆڕانەی لە ناو سۆڤیەت باو بوون.

جا پرسیاری دی چی .کە هەیە ئە.موو ئەمن لە خزمەتت دام، ئەمن زۆرم پێخۆشە ئەتۆ کارێکی وا دەکەی بۆ ...مە. .ا زەبیحی وە ئەمن بەڵێنیت دەدەمێ تو بینێرە ئێمە لە کوردستان چاپی دەکەینەوە

بەڕاستی لە کیسمان چوو، بە ڕەئی من پیاوی وا لە بابەتی ئەو وەکوو ئەو لە باری کوردستانی بوون دروست نابێتەوە، ئەمن پێموایە تاکە کەسی هەڵکەوتوو، خەباتگێری هەڵکەوتووی کوردستانی، بێ ئاوات و ئامانجی تایبەتی خۆی کە هەموو ژیانی بۆ کوردستانی بوون تەرخان کردبوو وەک زەبیحی لە چەرخی بیستدا بەدی ناکرێ! یانی لەوەدا فەریدە، تاقانەیە! تەنیا کوردێک بوو لە هەموو کوردستانەکانا خەباتی کرد، ئەمن پێموایە بۆ تورکیاش حەولی دا ئەوکات کە لە سوریا بوو.

**عەلی:** بەڕێز مام جەلال! یەکجار زۆر سپاس بۆ ئەو وەختەی بۆتان تەرخان کردم.

**مام جەلال:** سپاس بۆ ئێوەش و ئەو شتانەشت حەتمەن بە یەکەم کەسدا بۆ دەنێرم و ئەوەی کە تۆ کردووتە زۆر بە کارێکی پیاوانەی دەزانم و دەستەکانت خۆش بێ، حەول بدە تەواوی کە و سەرکەوتوو بیت، بەڕاست نوقسانێکانی ئێمەش پڕ دەکەیتەوە و ئەگەر خۆشت بیکەی ئەوە ئەو خەتەرەش نامێنێ کە لێی دەترساین هەرچەند تازە ئەو زەمانە بەسەر چووە کە لێی دەترساین.

## هاتنەوەی زەبیحی بۆ مەهاباد

لە هەستان و خرۆشانی خەڵکانی ئێران ساڵی ١٣٥٦ هەتاوی (١٩٧٧زایینی) لە تەورێز قوتابی بووم لە یەکەمین موزاهەرەی ئێران لە تەورێز لە گەڵ هاوڕێ و هاومزڵم کوڕێکی خەڵکی مەهاباد بەشداریمان کرد. هاوڕێکەم برینداربوو و لە بازاری تەورێز بە تیری ژاندەرمەی شا پێکرا بە هۆی ئەو رووداوە رەوتی ژیانی قوتابیێتیم لە تەورێز شێوا و ساواک پێی زانی کە بەشداری موزاهرەمان کردووە.

بەرەو مەهاباد هاتمەوە و لە نیزیکەوە لە پەیوەندی لە گەڵ پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی دا بووم. ساڵانی ئەوەڵی دەست پێکردنی شۆڕشی نوێ لە کوردستانی عێراق کە بە هۆی دامەزرانی یەکێتی نیشتمانی هەڵگیرسابۆوە وەزعیەتی پێشمەرگە و شۆڕش تا بڵێی ناخۆش و دیشوار بوو، شۆڕشی تازە لەوپەڕی فەقیری و بێ پشتیوانی دابوو، ئێمە تاقمێک گەنجی مەهابادی ئەوەمان دەزانی و بە هەموو حەول و تێکۆشانەوە خەریکی یارمەتی بە پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی بووین. وردە وردە وای لێهات رێگای هاتنی ئەو برادەرانە پاش چەندین جار سەردانی ئەوان لە لای قەندیل و خڕی ناوزەنگ بۆ لای ئێمە کراوە، یەکێتی نیشتمانی کادرێکی سەرووی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی (دوایە کرا بە کۆمەڵەی رەنجدرانی کوردستان) بە ناوی کاک دلێر (ئەکرەمی سەید مەجید) یان نارد بۆ لای مەهاباد و شنۆیە. هەر دەهات و شۆڕشی گەلانی ئێران پەرەی دەستاند و وەزعیەت بۆ نیش و کار لە بارتر دەبوو و هاتووچۆ نازادتر ببوو و کەس شەرمی لە ژاندەرم و ساواک نەدەکرد، هاتووچۆی برادەرانی یەکێتی بۆ لای ئێمە لەو پەڕی گەرمی و بێ سنووری دا بوو، ماڵی ئێمە و چەند برادەرێکی دی لە مەهاباد وەک مقەڕی یەکێتی و پێشمەرگەی بریندار و کادرەکانی شۆڕشی لێ هاتبوو کە بۆ نیش و کار وە یان حەسانەوە دەهاتنە کوردستانی ئێران.

لە یەکەمین پەیوەندی لە گەڵ یەکێتی و مام جەلال و بیستنیان لەوەی کە خوارزای

زەبیحیم دۆستایەتی و قەدر و حورمەت و تەنانەت مالی زەبیحی لە مەهاباد بە مالی خۆیان زانین و هەستی نیزیکی و برایەتی لە نێو ئێمەدا سەد ئەوەندە بۆوە. بۆم دەرکەوت کە بە تایبەت مام جەلال و برادەرانی کۆنی تر لە ناو یەکێتی وەک کاک عومەر دەبابە، دوکتۆر کمال و کاک نەوشیروان و... زۆر بە گەرم و گوڕی و بەو پەڕی ڕێزەوە باسی زەبیحی دەکەن و زۆر بە باشی دەیناسن. ئەوە بۆ من جێگای فەخر و شانازی بوو بە تایبەت لە وەزعیەتی ئەوکاتی ڕۆژهەلاتی کوردستان بۆ ئێمە ئەوە شتێکی یەکجار زۆر گەورە و مووهیم بوو کە پەیوەندیت هەبێ لە گەلّ پێشمەرگە و شۆڕشی خوارووی کوردستان و ئەوە ئیتر ئەوپەڕی "سیاسی بوون" و "مووهیم بوون" بوو لە ناو خەلکدا!

ڕۆژەکان زۆر بە توندی تێپەڕ دەبوون، دەزگای حکومەتی شا وەک شەق شەقەی لێ هاتبوو، وردە وردە خەلکانی دوورە ولات دەنگیان لەو لاوئەولا دەهات، لە نێو خەلکانی سیاسی و تێکۆشەری شارەکەمان دەمان بیست فلان کەس بە دزی لە عێراقەو هاتووەتەوە و فەلان کەس بە دزی لە لای منگوڕانە و... وای لێهات چەندین کەسێک هاتنەوە و ولات بە تەواوی بۆنی ئازادی و کوردایەتی لێ دەهات.

ڕۆژێک لە مالەوە دایکم کە ئەو خەبەرانەی دەبیست و هەموو ڕۆژێک خەبەری هاتنەوەی کەسێکیان دەدا بە چاوی گریانەوە گلەیی لە خودای خۆی دەکرد کە بۆچی خەبەری کاکی ۆی لە هیچ کوێوە نایە؟ هەرچەند بە هۆی برادەرانی یەکێتی دایکم خاترجەم کردبوو کە وەزعی باشە و زیندووە و لە بەغدا دەژی بەلام دلی خاترجەم نەبوو چون هیچ خەبەرێکی نەبوو. لەو ڕۆژانە دابوو کە برادەرێکی سەرەوەی یەکێتی بە ناوی کاک زێڕۆ لە مەهاباد میوان بوو لە قسە و باس و هاتنە پێشی بەحسی زەبیحی باسی وەم کرد کە دایکم زۆر تامەزرۆیە خەبەرێکی کاکی بزانێ، کاک زێڕۆ گوتی تۆ چەند کەلیمەیەک و ژمارەی تەلەفونی خۆتان بنووسە ئەمن حەول دەدەم بە دەستی بگات.

هەرچەند زۆر بەلامەوە زەحمەت و شتێکی بەعید دەهاتە پێش چاو کە کاک زێڕۆ لە شاخەوە و بە نەهێنی بتوانێ ئیشێکی وا بکا، بەلام لە لای خۆم گوتم ئەگەر قازانجی نەبێ زەرەری نییە. وا بوو چەند دێڕێک و ژمارەی تەلەفونی خۆمان لە کاغەزێک نووسی و دام بە کاک زێڕۆ.

قـرچەقـرچی گـەرمـای هاوینی ١٣٥٨ (١٩٧٩-ز)) بوو مـانگی پوشـپـەڕ، زەماوەندی برای گـەورەم بوو، خەڵـک و میـوان لە جەنگەی هەڵپـەڕین و چۆپی کـیشـان دابوون کە هاواری خۆشکم نەرمین (ساڵی ١٩٨٣ لە زیندانی جەمهوری ئیسلامی لە ژێر ئەشکەنجـە و ئازاردا شـەهیـد بوو) لە ژووروەوە هات و بانگی کـرد گـوتی پێـمـوایە کابرایەکی عێراقی لە ڕێگای دوور لە سەر تەلەفون بانگی تۆ دەکات و وا حالیی بووم کە خالە ڕەحمانە! تەواوی لەشم سڕ بوو و نەمەدەزانی چۆن تەلەفونەکەی لێ وەرگرم، هاوارم کرد خالم بوو، گوتی کاغەزەکەم پێ گەیشت و تەلەفونم کردووە، باش لە قسەکان حالی نەدەبووم کـە سەرم هەڵبـڕی هەمـوو خزم و تایفـە و میـوان خەریک بوون پەلامارم بدەن و دەیان ویست تەلەفونەکە لە دەستم بفڕێنن لەو کێشەکێش و فڕان فڕانەدا تەلەفونیان کێشا و قـەتعیـان کرد، ئێسـتـاش کە ئێـستـایە ڕەنگە چەند خزمێـک لە سەر ئەو گـوڕان و تووڕە بوونەی من هەر لێم عـاجـز بن! تەلەفـونم بردە ناو ژوورێـک و دەرگـام لە خـۆ داخـست و حەولی وەسل بوونی تەلەفونەکەم دا بە خۆشیەوە خالم هەر لە پشت تەلەفون بوو، بە تێر و پڕی قسـەمـان کرد و داوای هاتنەوەم لێ کرد وەعدی هاتنەوەی پێ دام و قـەرار و مەداری ڕۆژێکی تایبـەتیـمـان دانا، قەرار سنوری حاجی ئومەران لە لای سنوری خـانێ بوو. ئەو چەند ڕۆژە زۆر بە بێ قـەراری لە من گـوزەرا و دائیم دڵم سـوار و حـەجـمـینم لێ بڕا بوو.

ڕۆژی مـەوعـوود هات، نیـوەڕاستی مـانگی گـەلاوێژی ١٣٥٨ (ئووتـی ١٩٧٩-ز) چەند سـەیارەیەک سـوار بووین بەرەو خـانێ و لەوێشـرا بەرەو سنوور، سـەری سـەعـات هات و کـەس پەیدا نەبوو، چەندین سـەعـات لە چاوەڕوانیـدا گـوزەرا کـەس پەیدا نەبووا ئێـوارە داهات و دەبوو لەو دەشتە نەمێنینەوە و بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتین نیزیک ماڵی باپیرم، لە دوورەوە هەستم بە قەرەباڵغی و جەماعەت کرد و بۆنی هەڵیماوی برینج کە بە کوچەیان داکردبوو دەهات، سەرنجم دا دەرگای ماڵی باپیرم هەر دووک لای لە سەر گازی پشتێیە و حەشیمەت دیارە، سەرم سووڕ ما، بە هەر جۆرێک بێت لە سەیارەکان دابەزیین و خۆمان بە ژوور داکرت، بەڵێ! مامۆستا زەبیحی لە لای سەرەوە بە کەیفی خۆی پاڵی لێ دا بۆوە و ئەننەهوو ئێـمە لە ئەوەڵی بەیانیـوە لە سەر ئەو سنورە چاوەڕێی ئەومان کردووە، هەمـوو پێش برکـەیان بوو بچن و خـۆیان بناسێنن، لە پەناوە دایکم گرت و چاو و دڵ ڕوونیم لێ

کرد و گوتی کە ئێوە رۆیشتوون ئێمە لێرە خەریکی خۆ ئامادە کردن بووین کەلە ناکاو وانێتێک رای گرتوو و کاکم بە تاق و تەنیا لێی دابەزیی و یەکسەر هاتە ژوور و هەمووومان لە خۆشیان و لە تەعەجوب وڕ و کاس بووین! هەم پوورم و هەم دایکم ئەو دوو خوشکە ئاو لە چاویان رانەدەوەستا و وەک منالێک لە هاتووچۆ دابوون.

هەر کە بۆ لای خالم چووم گوتی دەبێ عەلی بی، یەکترمان لە باوەش گرت و یەکەم شت گوتم کوا وا دەبێ برادەر؟ گوتی عەلی گیان دوای قسە کردنمان بە تەلەیفون بیستم کە هەرکەس هاتووەتەوە مەهاباد بەرەو پیری چوون و بە هەزاران کەس چەند شار ودێ پێشوازیان لێ کردوون و بە خۆپێشاندان و دروشم دان و بەزم و چۆپی بە ساعەتها گەیاندوویانەوە مالی خۆیان، ئەمن تاقەتی ئەو شتانەم نییە، ئەوەم کە بیست بڕیاری خۆم دا کە بە دزی بێمەوە. چەند ساعەت پێش لە مەوعیدێک کە بۆم دانابووی هاتمە خانێ و یەکسەر پیکابێکم دەربەست گرت و گوتم لێ خوڕە بۆ مەهاباد کە هاتینە مەهاباد بە کابرای سایەقم گوت بڕۆ بۆ دەواخانەی سالح زادە، کە هاتە راستی دەواخانە مالی خۆمانم ناسیەوە و یەکسەر چوومە ژوور. رەعنا و هاجەر لە حەوشە بوون و پەلاماریان دام. بەلێ! پاش زیاتر لە ٣٣ سال خوشک و برا بە یەک شاد و شوکر بوون. ئەو شەوە، شەوێکی یەکجار خۆش بوو دەست بە جێ برادەرانی یەکێتی هاتن و بەخێر هاتنیان کرد و دەستەدەستە پیاوە کۆنەکانی مەهاباد دەهاتنوو و لە لای دادەنیشتن. ماوەی چەند رۆژان هەر یەک دەهات و یەک دەرۆیشت، ئەو ماوەیە زۆرتر هەر لە مال بوو یان لە بەر دەرگاوە دەچوو بۆ لای دەواخانەی سەید تەهای ئەییوبیان و لەوێ دادەنیشت و دۆست و برادەری کۆنی خۆی کۆمەلیان لێ دەکرد، دەنا لە کتێبخانەکەی سەید قادری جەعفەری لە کتێبان دەگەرا. دانیشتن لە گەل سەید قادری زۆر پێ خۆش بوو، سەرنجم دا لەو ماوەیە حیزبی دیمۆکرات کە لەو پەری قودرەت و جم و جۆلی دا بوو نەهاتن و بەخێر هاتنیان نەکرد، بۆم دەرکەوت نابێ زۆریان خۆش بوێ، نەمەدەزانی بۆ؟! تەنیا کاک حەمەدەمین سیراجی و مام هێمن چەند جارێک هاتنە لای و قەد ئەوەم لە بیر ناچێ، هەوەل جار کە مام هێمن هات، ئەو جووتە پیرە چۆن بە یەکەوە گالتە و شۆخی و دەست بازیان دەکرد و بە چەپۆکان بە سەری یەکتریان دادەدا و قاقا پێدەکەنین.

هەمـوو رۆژەکـان بە دەعـوەت و رابواردن لە مـالـی خـزم و دۆسـتـان تێـدەپەری، ئێوارەیەک لە مـالـی دۆسـتێک دەعـوەتیان بۆ کـردبوو، ئەمن نەچووبووم لە مـالەوە بووم، کاک دلێر پەیدا بوو، زۆر بە تالووکە گوتی مامۆستا لە کوێیە،گوتم دەعـوەتە، هاتە بن گوێم گوتی مام جەلال لێرەیە و بە خاتری دیتنی مامۆستا زەبیحی هاتووە و شتەکە زۆر نەهێنییە. یەکسەر غارم دا و چووم بۆ ئەو مالە کە دەعـوەتیـان بۆ کـردبوو کە چووم لە حەوشە لە بن دارە مێو سفرە ئەو سەر ئەو سەری دیار نەبوو، هێشتا دەستیان بە خواردن نەکردبوو، بەلێ! فەرموو فەرموو، گوتم ئێشم بە خالمە، چوومە بن گوێ و گوتم مام جەلال لێرەیە. لە خۆشیان لە سەر کورسێکە هەستا حەوا و یەکسەر گوتی دەبا برۆین، هەموو خەلکەکە مات و ور چاویان لە ئێمە بری بوو، خاوەن مال زۆری پێ ناخۆش بوو کە وا خەریکم دانیشتنەکەیان لێ تێک دەدەم، گوتم جارێ نانیان لە گەل مەیل بفەرموو دەبێ لە حەولی سەیارەیەکی باش دابم تۆزێک رێگامان دوورە، بە یارمەتی کاکم سەیارەکەی خۆمان کە پیکاب بوو لە گەل سەیارەی برادەرێک هەر بەو شەوە گۆرییەوە و ساعەت بەرەو ١١ و ١٢ی شەو دەچوو، هاتمەوە بە دوایدا گوتی بچۆ مالە خۆمان دەبێ جانتا و شتی وا لە گەل خۆم بێنم چوومە بەردەرگای مالی باپیرم، خالم لە قادرمان وەسەر کەوت، منیش لە خوارەوە لە دالانێکی تەنگ و بچووکدا چاوەرێی بووم. بیری لاوەتی ئەو سەردەم، فکری پێشمەرگە و پارتیزانی هەموو بیر و هۆشی داگرت بووم و هەر چەند هێشتا پێشمەرگایەتی لە رۆژهەلاتی کوردستان دەستی پێ نەکردبوو بەلام هەموو شێوە و رەفتارم و تەنانەت جل لە بەر کـردنم پێشمەرگانە بوو، بە دانیم چەکم پێ بوو، ئەو شەوە چاردەخـورەکـەی خـالم پێ بوو لە سـەر پێم دانا بوو لە پشت پشتێندێ بوو، هەروا کـە چاوەرێی خـالم بووم و کـاک دلێر لە ناو سەیارەکە لە کـوچە چاوەرێ بوو یەکسەر خـالە محەمەدم لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەر و بە چاوی خەوالووە گوتی ئەوە چییە عەلی؟! گوتم خالە رەحمان دەروا بۆ سەفەر و دەیگەیەنم، گوتی بۆ کوێ؟ گوتم نازانم ئەو دەزانێ، گوتی کوا؟ گوتم لە سەرەوە جلەکانی دەگۆرێ، گوتی ناهێلم برۆن، گوتم بە دەست من نییە، گوتی هەموو فیتنەی ئەو شارە لە بن سەری تۆ دایە! گوتم وا نییە، دەستی بە جنێودان کرد، هەلبەت جنێوەکە هەر "کۆمۆنیست" بوو. هەر لە من و هەی لە ئەو قەناعەتمان بە

یەک نە دێنا، لە پڕ کە وام زانی پەلاماری چاردەخۆرەکەی لە سەر پێی پشت پشتێندمی دا و لە سەر سەری راگرتم، هاواری کرد پاش سی چل ساڵ کاکم دەست کەوتووەتەوە تۆ سەری بە فەتەرات دەدەی! ئەمن لە لایەک پێکەنین و لە لایەکیش چون دەمزانی دەمانچەکە لە سەر پێیە و لەرزە لەرزی دەستی خاڵە محەمەدم، لە ترسان نەمدەزانی چبکەم! بە کورتی و زۆر بە سادەیی ئەو "پیاوە دلێرە" و ئەو "پێشمەرگەیەی" خۆی زۆر بە ئازا و توانا دەزانی بە دەستی پیرە پیاوێک چەک کرابوو!

لە گورەی دەتکووژم و ناهێڵم کاکم بەری، لە هاواری من خاڵە گیان وریا بە لە سەر پێیە، خاڵە رەحمان لە سەرێ هاتە خوار و لە سەر پلیکانان کە چاوی بەو وەزعە کەوت ئەمن چەک کراو و یەخسیر لە ژێر دەستی خاڵە محەمەد دام یەکسەر سوور بۆوە وگوتی ئەوە چییە؟! خاڵە محەمەد گوتی کاکە ناهێڵم ئەو کۆمۆنیستە بتبا، سەرت بە فەتەرات دەدا، ریشی خۆت مەدە دەستی ئەو منداڵانە، ئەوانە مەستی نەزانین و کۆمۆنیستن و نازانن چ دەکەن، ئیتر ئەو قسانەو هەڵچوونی خاڵە رەحمان یەک بوو، بە سەری دا گوڕاند و گوتی محەمەد ئەوە دەڵێی چی؟ ئەوە منم کە ئەو بەستەزمانە لە گەڵ خۆم بۆ ئەولاوئەولا دەبەم، تۆ دەبێ مەمنوونی بی، من ئیشی خۆم چاکتر لە تۆ دەزانم، قسەی زۆر توندی پێ گوت، خاڵە محەمەد گوتی باشە بۆ بە من ناڵێی خۆم تاکسیم هەیە و بە شوفیرەوە دەینێرمە خزمەتت، گوتی نە تاکسی تۆ و نە شۆفیری تۆ بە کەڵکی من نایە، ئیتر خاڵە محەمەد وەک سەتڵێک ئاوی ساردی پێداکەن دەمانچەی فڕێ دا و چۆوە ژوورێ. خاڵم دڵخۆشی منی داوە و منیش لە لایەک لە ترسان ئازای بەدەنم دەلەرزی و لە لایەکیش لە خۆشی ئەوەی کە بە خێر گوزەرابوو پێدەکەنیم، خاڵم گوتی بۆ پێدەکەنی؟! گوتم نازانم بڵێم چی ئاخر بە راست بە تەمای کوشتنم بوو تۆ نازانی دەمانچەکە لە سەر پێیە و فیشەکم لە بەر ناوە! ئیتر خاڵم لەوە سەری سوڕ ما، گوتی باشە بۆ فیشەک لە بەر دەمانچە دەنێی؟ گوتم پێویستە پیاو لە گەڵ یەکی وەک تۆ لە هاتووچۆ دا بێ وا بێت، پێکەنی و دیار بوو دەیزانی چ رێبازێک چاوەڕێم دەکا!

بەرەو میاندواو و لەوێش را بەرەو بۆکان وەڕێ کەوتین لە رێگا باسی ئەوەی بۆ کردم کە چەند لە سەیارە و سایق دەترسێ، بەڵام ئاژواندنی منی بە دڵ بوو.

لە بۆکان بەرە و ماڵی کاک سەلاح موهتەدی و کاک سەعد ڕۆیشتین. کاتژمێر بەرەو ١ و ٢ی نیوەشەو بوو کە نیزیک بووینەوە هەستمان بەوە کرد کە دەوروبەری ماڵی کاک سەلاح پێشمەرگەی بە نەهێنی لێ دامەزراوە، کە چووینە ژوور مام جەلال لەوێ بوو ئیتر زۆر بە گەرمی یەکتریان لە باوەش گرت و بەخێرهاتنی یەکتریان کرد. دوای چا خواردن و شوتی خواردن ئەو جووتە چوونە ژوورێکی تر و خەڵوەتیان کرد و هەتا سبەینێ کاتی خواردنی نیوەڕۆ لە ماڵی کاک سەعد هەر بە یەکەوە بوون. ڕۆژی دوایە مام جەلال بەرەو مقەڕەکانی خۆیان چۆوە و ئێمەش بەرەو مەهاباد کەوتینە ڕێ. لە ڕێگا کە نیزیک سابلاغ بووینەوە خاڵم گوتی کە چووینەوە بچۆ خزمەت مامۆستا شێخ عیزەدین و قەراری چاو پێکەوتنی منی لە گەڵ دا بنێ، ئەو ماوەیە قەت باسی مامۆستا شێخ عیزەدینم لێ نەبیستبوو، زانیم دەبێ پەیوەندی بەو چاوپێکەوتنەی مام جەلالەوە بێت، ئەمن ئیشی خۆم کرد و چوومە خزمەت مامۆستا گوتم خاڵم دەیەوێ بتان بینێ، زۆری پێ خۆش بوو و بەخێرهاتنی کرد. لەو ڕۆژەوە وردە وردە هەستم بەوە دەکرد کە شتێک لە بەینی خاڵم و مامۆستا دا پێک هاتووە و هاتووچۆیەکە گەرم و گوڕە! دەبێ بڵێم کاڵی و کەم عومری ئەو سەردەمە نەی دەهێشت زۆر لەو شتانە حاڵی بم بەڵام ئەوەی کە زۆر سادە و عەیان بوو بۆ من ئەوە بوو کە دیتنی مام جەلال و زەبیحی لە بۆکان لە ماڵی کاک سەعد و کاک سەلاح موهتەدی، شێوە و ڕەفتاری زەبیحی گۆڕی، چونکە:

ماوەیەک بوو زەبیحی لە مەهاباد لێمان میوان بوو لەو ماوەیەدا مەهاباد مەرکەزی هاتووچۆ و جوڵانەوە و ڕمبازێنی سیاسی لە ناو جەمعیەت و حیزب و چریک و مامۆستا و ئەو شتانە بوو، ڕۆژ نەبوو شتێک نەقەومێ و مەوزوعێک لە سەر سیاسەت و کوردستان لە ناو خەڵک و کۆمەڵە سیاسییەکان قاو نەبێ و باسی لێ نەکرێ، کە چی زەبیحی تەنیا لە ماڵەوە و زۆرتر خەریکی ئیش وکاری قامووس و خوێندنەوە و بە میوان ڕاگەیشتن بوو وەک شتێک بەلامەوە سەیر بوو خۆ لە هیچ نادا! ڕۆژی وا بوو کە دەچوویە ناوشار و دەهاتییەوە یەک باقە بەیان و ئێعلامیە و گۆڤار و نووسراوەی جۆراوجۆری حیزب و سازمانەکانت لە گەڵ خۆ دێناوە ژوور. باش لە بیرمە ڕۆژێک دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ لە ژووری خوارەوە لە گەڵ خاڵم دانیشتبووین و خاڵم خەریکی نووسین بوو،

شەهید سولەیمان بلوری وەژور کەوت، سولەیمان دۆستی نیزیکی من بوو، خالم بە هۆی شۆخ و شەنگی و قسەی خۆش و توند و تۆلی و کوردایەتی کردنی، زۆری خۆش دەویست و سولەیمانیش هەر لە زمان ئێمەوە پێی دەگوت خالە، رۆژ نەبوو سەری لێ نەدا و باس و خەبەری شاری بۆ نەگێرێتەوە. سولەیمان ئێعلامیەیەکی پێ بوو گوتی خالە بزانە چ نووسراوە، ئەو خەڵکە بەکەیفی خۆی شت دەنووسێ و راستی و ناراستی لە ئێمە تێکەڵ بووە، تۆش کە هەموو شتێک دەزانی و ئاگات لە هەموو جەریانات بووە هیچ دەنگ ناکەی و راستییەکان بۆ ئێمە روون ناکەیەوە، گوتی چیە سولەیمان چت پێیە؟ گوتی خالە کۆمەڵێک پەیدا بووە بە نێوی "کۆمەڵەی یەکسانی" و ئەوە لێرە باسی کێشەی کۆمەڵەی ژ . ک و حیزبی دیمۆکرات دەکا! کە ئەوەی بیست وەک شتێک راچڵەکی و ئێعلامییەکەی لە سولەیمان ئەستاند وخوێندییەوە و دێڕ بە دێڕ پێی دەگوتین ئەوە راستە و ئەوە ناراستە، ئەوە وابوو ئەوە وانەبوو... .

گوتم خالە باشە ئەوە مێژووی ئێمەیە و بۆ ئێمە روون نییە! تۆ بۆ ئەو شتانە بۆ ئێمە روون ناکەیتەوە و نایاننووسی؟! گوتی جارێ زوویە، دەستی بۆ چەمەدانەکەی کە بە دائیم لە گەڵی بۆ درێژ کرد و گوتی هەموو لە ناو ئەو چەمەدانەی دا هەیە و نووسراوە هەر کات رۆژی هات بڵاویان دەکەمەوە!

زۆر جاران دایکم کە دەیبیست فلان کەس لە چوارچێی قازی محەمەد قسان دەکا و وتار دەدا، هەر رۆژە کەسێک لە سەر تەلەڤیزیون پەیدا دەبوو و قسەی بۆ خەڵک دەکرد، رۆژێک گوتی کاکە ئەوە تۆ بۆ قەت هیچ ناڵێی و ناچی جارێک وتارێک بدەی، شتێک بڵێی؟ خۆ ئەو کەسانەی کە ئێستا نێویان لە سەر زارانە ئەو کات کە تۆ شت بووی ئەوانە هەر نەبوون گوتی رەعنا دەتەوێ بچم بۆ خەڵک درۆیان بکەم!؟ ئەوە ئیشی من نییە!

بەڵام بە دوای چاوپێکەوتنی لە گەڵ مام جەلال جم و جۆلێک لەودا پەیدا بوو چەند جار سەفەری عێراقی کردەوە و زۆر جار بۆ لای بانە و مەریوان دەچوو، بە کورتی بە جۆرێک بە مامۆستاوە بەند بوو. لە گەڵ شێخ جەلال عەلاقاتی خۆشی پەیدا کرد بوو.

رۆژەکان بە توندی تێپەر دەبوون، خومەینی فەرمانی هێرشی بۆ سەر کوردستان دا و "بەنی سەدر"یش، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئێران دەستوری دا کە ژاندەرمەکان هەتا

**عەلی:** ئەمن پرسیارێکی وام نەماوە ئەگەر خۆتان شتێکی تایبەتیتان هەیە تکایە بفەرموون.

**مام جەلال:** وەڵاهی دەزانی چی؟ ئەمن دەمەوێ باسی زەبیحی ئاوا بکەم کە مامۆستا زەبیحی پیاوێکی تێکۆشەری کوردپەروەری خەباتگێری شۆڕشگێری لە خۆبوردو، خۆنەویستی، دەتوانم پێی بڵێم سەربازی گومناوی کوردایەتی بوو. پیاوێک بوو هەموو ژیانی خۆی بۆ مەسەلەی رزگاری کوردستان و گەیاندنی خەڵکی کورد بە جورێک بە مافەکانی خۆی تەرخان کردبوو، هیچ تەماحێکی لە دونیادا نەبوو یانی باوەڕ بکە کە ئێمە ئەگەر ویستبای ئوتومبیلمان بۆ دەکڕی، خانومان بۆ دابین دەکرد، ژنمان بۆ دەهێنا و هەموو شتێکمان بۆ دەکرد، رازی نەبوو هیچ یەک لەو شتانە قەبوڵ بکا! لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی مەسەلەن ماشێنیان هەبوو ئەو بە باس دەهاتوودەچوو، لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی خانوویان هەبوو ئەو ژوورێکی قوڕی پیسی گرتبوو لە کونێکدا دەژیا! پارە هەموو لە دەس خۆی دابوو، دیارە ئەووەختە معاشی هەموومان کەم بوو بەڵام هەرە کەمەکە ئی ئەو بوو، مەسەلەن موومکینە برادەرێکی سەرکردایەتی بڵێین مانگێ ٦٠ دیناری وەردەگرت ئەو ١٠ دیناری وەردەگرت، ١٥ی وەردەگرت، نەمر و نەژی! پیاوێک بوو بەڕاستی کوردستانیش بوو یانی بۆ ئەو کوردستانی ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا فەرقی نەبوو، لە هەر جێیەک با ئەو خەباتەکەی دەکرد و پێشی وابوو تەواوکەری خەباتەکەی ترێتی!

پیاوێک بوو تا بڵێی هوشیار بوو، پیاوێکی زیرەکی هوشیاری دووربین. سەڕاست بوو یانی لەو کەسانە بوو کە فرتو و فێلی سیاسی و شتی وای نەدەزانی یانی تۆی خۆش نەویستبا بە زەنجیر بەستباتەوە نەیدەتوانی تەماشات بکا! خۆی بە سادقی لە گەڵ خەڵک معاملەی دەکرد، ئەوەی خۆشی نەویستبا دەیگوت بڕۆ...هیچە...وایەکی لێدەکرد و بە جێی دەهێشت جگە لەوە پیاوێک بوو بەڕاستی نەترس بوو زۆر ئازا بوو، هیچ نەدەسڵەمیەوە لە هەرچی پێی دەڵێن ریسک! خۆ بشارێتەوە، بگیرێ، بکوژرێ، دەیکرد. سنور ببەزێنێ، بێت، بڕوا، هەرچی کاری شۆڕشگێرانە هەیە پێویست بایە دەیکرد بێ ئەوەی گوێ بداتێ ئەنجامەکەی چییە! مردنە؟! ژیانە؟! چییە؟! ئەو دەیکرد.

کابرایەکی خۆش بوو لە دوستایەتیدا یانی لە گەڵ خەڵک سادق بوو، لە گەڵ دۆست و ئەوانەی. پیاوێک بوو بەڕاستی چەند زمانێکی دەزانی، شارەزایەکی زۆری هەبوو لە مێژووی کورد، لە زمانی کوردی، لە فەرهەنگی کوردی. ئەتۆ ئەگەر تەماشای کەی کابرایەک کە هیچی نەخوێندووە ئەو هەموو شتانەی چۆن زانیوە؟! دەبێ چ بلیمەتێک بووبێ؟! بە گاڵتە نەبوو بەشیر موشیر پێی دەگوت "عولەما" ئاخر ناوەکەی لەوەوە هاتبوو، دەیگوت ئەو پیاوە عولەمایە! تۆ سەیر کە مەسەلەن روسی فێر ببوو، ئینگلیسی فێر ببوو، فەرەنسی فێر ببوو، عەرەبی دەزانی، تورکی دەزانی، فارسی دەزانی، کوردی دەزانی، حەوت زمانی دەزانی بە چەندێکیان دەینووسی و مەقالەی پێدەنووسین، ئەو هەمووە شارەزایەی پەیدا کردبوو لە سیاسەت و لە خوێندنەوە و لە کتێب و ئەوانەدا.

پاشان پیاوێک بوو لە پێناوی ئەوەی کە بیروباوەڕێتی نەدەسڵەمییەوە چی پێویستە بیکا! خۆی کابرایەکی بێ تەماح و بێ غەرەز بوو لە غەیری کوردایەتی و خزمەتی گەلی کورد و کوردستان زیاتر هیچ هیوا و ئاواتێکی دیکەی نەبوو وە بە رای من خەسارەتێکی زۆر گەورە بوو لە دەست چوو، خۆزیا ئەو دوو ئیشتبایەی نەکردبا: یەکیان نەهاتە دەرێ یانی ئەو سەردەمەی مامۆستا برایم پێی گوتبوو هاتبا دەرێ لێرە لە گەڵ مامۆستا برایم شتی نووسیبا و ئەوانە، دووهەم پێموایە زیادە لەحەد حوسنی زەینی بە بەعس هەبوو، پێیوابوو دەستی لێ نادەن، پێیوابوو چونکا ئەو زەرەری بۆیان نییە و شەڕیان ناکا و ئەوانە دەستی لێنادەن و ئەو حوسنی زەینە هێشتییەوە و نەیدەزانی کە زۆر کەس قسەی لەسەر دەکەن، شتی بۆ دروست دەکەن و درۆی بۆ هەڵدەبەستن و ئەوانە، ئەوەی وەک خۆی تەقدیر نەدەکرد!

دەمەوێ ئەوەش بڵێم لە تاریخی کورددا گەورەترین زەرەری سۆڤیەت کە لە کوردیدا ئەوە بوو کە نەیهێشت ژ . ک بە تەریقەی خۆی گەشە بکا و هەروەها لە عێراقیش وای کرد، لە عێراق شۆڕش و رزگاری هەبوو نەیانهێشت ئەو دوو حیزبە بە شێوەی تەبیعی خۆیان گەشە بکەن، هاتن سەرکردایەتیکی عەشایریان هێنایەوە سەر جوڵانەوەی کورد، لە ئێران قازی محەمەد و دەوروبەرەکەی تەماشایان بکە هەموو لەو بابەتانەن مالکین و ئاغا و... لە کوردستانی عێراقیش مەلا مستەفا و شێخ لەتیف و کاکە زیاد و ئەوانەیان هێناوە

بە زۆر، مەسەلەن کاکە زیاد ئاغا ئەمن دەیناسم، پیاوێکی زۆر موحتەرەم و کوردپەروەر و ئەوە بوو، خۆی نەیدەویست دەیگوت کاکە ئەوە بە من ناکرێ، رازی بوو ئەندامێکی موحتەرەمی حیزبەکە بێ، هێنایان، نا! ئیلا دەبێ جێگری سەرۆک بی! ئاخر کاکە پێم ناکرێ! لێی نازانم! نا هەر دەبێ ببی! پیاوێکی زۆر موحتەرەم بوو، زۆر کوردپەروەر بوو، تەماحی دەوەدا نەبوو جێگری سەرۆک بێ، کە چی مەلا مستەفا کاتی خۆی ناردی هەمزە عەبدوللا چوو کاکە زیاد و شێخ لەتیفیان هێنا و هەیئەتێکیان دانا و سەرۆکایەتی عەشایری کۆنینەی کلاسیکیان هێنایەوە سەر جولانەوەی کوردەواری. کۆمەڵەی ژ . ک خۆی ببا بە حیزبی دیمۆکرات شتێکی تر دەردەچوو و ئاوا نەدەشکا چون هەموو پیاوی تێکۆشەری خۆنەویست بوون و هیچیان نەبوو لە دەستیان بچێ! ئەمن پێموایە ئەوە هەنگاوێکی پاشەکشە بوو، ئەمن لە کتێبەکەشدا ئەوەم نووسیوە و ئەوە گەورەترین زەرەر بوو کە سۆڤیەت لە کوردی دا. کاتی خۆی کاک نەوشیروان شتێکی هەبوو دەیویست بینووسێ "زیانەکانی شۆرشی ئۆکتۆبر بۆ کورد" ئەمن پێموایە زیانی زۆر لە کورد داوە سۆڤیەت، لێی بگەرابا ژ.ک دەبوو بە حیزبێکی رێک و پێکی ژیکەڵەی زۆر چاک و جەماهیری بڵێین بە ئیستلاحی خۆمان وردەبورژوا و جوتیار و کریکار و دووکاندار و خوێندکاری کۆ دەکردەوە! پاشەکشێکی گەورە بوو، ئەتۆ تەماشا بکە خۆ سەرکردایەتی حیزبی دیمۆکرات ئاشبەتاڵی کرد! قازی محەمەد ئیعدام نەکرابا یانی شا ئەو کەرایەتەی کرد ئیعدامی نەکردبا دەبوایە میژووی کورد بە ئاشبەتاڵ و شتێکی تر ناوی بەرێ! بە قارەمانی خۆی لە مەحکەمە و بە ئیعدام کردنی، خۆی کرییەوە ئەگینا سەرۆک جەمهوری ولاتێک بچێ بە پیر لەشکری دوژمنەوە و مەری بۆ سەر ببرێ ئەوە چییە ؟!

خەتی سۆڤیەت خەتێکی غەڵەت بوو پێیوابوو موجتەمەعی کوردی هێشتا موجتەمەعێکی عەشایریە و هێزی نەسا.ی هێشتا عەشایرن و لەو قسە قۆڕانەی لە ناو سۆڤیەت باو بوون.

جا پرسیاری دی چی .کە هەیە نە.موو ئەمن لە خزمەتت دام، ئەمن زۆرم پێخۆشە ئەتۆ کارێکی وا دەکەی بۆ .مە. .ا زەبیحی وە ئەمن بەڵێنیت دەدەمێ تو بینێرە ئێمە لە کوردستان چاپی دەکەینەوە

بەڕاستی لە کیسمان چوو، بە ڕەئی من پیاوی وا لە بابەتی ئەو وەکوو ئەو لە باری کوردستانی بوون دروست نابێتەوە، ئەمن پێموایە تاکە کەسی هەڵکەوتوو، خەباتگێری هەڵکەوتووی کوردستانی، بێ ئاوات و ئامانجی تایبەتی خۆی کە هەموو ژیانی بۆ کوردستانی بوون تەرخان کردبوو وەک زەبیحی لە چەرخی بیستدا بەدی ناکرێ! یانی لەوەدا فەریدە، تاقانەیە! تەنیا کوردێک بوو لە هەموو کوردستانەکانا خەباتی کرد، ئەمن پێموایە بۆ تورکیاش حەولی دا ئەوکات کە لە سوریا بوو.

**عەلی:** بەڕێز مام جەلال! یەکجار زۆر سپاس بۆ ئەو وەختەی بۆتان تەرخان کردم.

**مام جەلال:** سپاس بۆ ئێوەش و ئەو شتانەشت حەتمەن بە یەکەم کەسدا بۆ دەنێرم و ئەوەی کە تۆ کردووتە زۆر بە کارێکی پیاوانەی دەزانم و دەستەکانت خۆش بێ، حەول بدە تەواوی کە و سەرکەوتوو بیت، بەڕاست نوقسانێکانی ئێمەش پڕ دەکەیتەوە و ئەگەر خۆشت بیکەی ئەوە ئەو خەتەرەش نامێنێ کە لێی دەترساین هەرچەند تازە ئەو زەمانە بەسەر چووە کە لێی دەترساین.

# هاتنەوەی زەبیحی بۆ مەهاباد

لە هەستان و خرۆشانی خەلکانی ئێران سالی ١٣٥٦ هەتاوی (١٩٧٧زایینی) لە تەورێز قوتابی بووم لە یەکەمین موزاهەرەی ئێران لە تەورێز لە گەل هاورێ و هاومزلم کورێکی خەلکی مەهاباد بەشداریمان کرد. هاورێکەم بریندار بوو و لە بازاری تەورێز بە تیری ژاندەرمەی شا پێکرا بە هۆی ئەو رووداوە رەوتی ژیانی قوتابیێتیم لە تەورێز شێوا و ساواک پێی زانی کە بەشداری موزاهرەمان کردووە.

بەرەو مەهاباد هاتمەوە و لە نیزیکەوە لە پەیوەندی لە گەل پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی دا بووم. سالانی ئەوەلی دەست پێکردنی شۆرشی نوێ لە کوردستانی عێراق کە بە هۆی دامەزرانی یەکێتی نیشتمانی هەلگیرسابۆوە وەزعیەتی پێشمەرگە و شۆرش تا بلێی ناخۆش و دیشوار بوو، شۆرشی تازە لەوپەری فەقیری و بێ پشتیوانی دابوو، ئێمە تاقمێک گەنجی مەهابادی ئەوەمان دەزانی و بە هەموو حەول و تێکۆشانەوە خەریکی یارمەتی بە پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی بووین. وردە وردە وای لێهات رێگای هاتنی ئەو برادەرانە پاش چەندین جار سەردانی ئەوان لە لای قەندیل و خڕی ناوزەنگ بۆ لای ئێمە کراوە، یەکێتی نیشتمانی کادرێکی سەرووی کۆمەلەی مارکسی - لێنینی (دوایە کرا بە کۆمەلەی رەنجدرانی کوردستان) بە ناوی کاک دلێر (ئەکرەمی سەید مەجید) یان نارد بۆ لای مەهاباد و شنۆیە. هەر دەهات و شۆرشی گەلانی ئێران پەرەی دەستاند و وەزعیەت بۆ نیش و کار لە بارتر دەبوو و هاتووچۆ نازادتر ببوو و کەس شەرمی لە ژاندەرم و ساواک نەدەکرد، هاتووچۆی برادەرانی یەکێتی بۆ لای ئێمە لەو پەڕی گەرمی و بێ سنووری دا بوو، مالی ئێمە و چەند برادەرێکی دی لە مەهاباد وەک مقەری یەکێتی و پێشمەرگەی بریندار و کادرەکانی شۆرشی لێ هاتبوو کە بۆ نیش و کار وە یان حەسانەوە دەهاتنە کوردستانی ئێران.

لە یەکەمین پەیوەندی لە گەل یەکێتی و مام جەلال و بیستنیان لەوەی کە خوارزای

زەبیحیم دۆستایەتی و قەدر و حورمەت و تەنانەت مالّی زەبیحی لە مەهاباد بە مالّی خۆیان زانین و هەستی نیزیکی و برایەتی لە نێو ئێمەدا سەد ئەوەندە بۆوە. بۆم دەرکەوت کە بە تایبەت مام جەلال و برادەرانی کۆنی تر لە ناو یەکێتی وەک کاک عومەر دەبابە، دوکتۆر کمال و کاک نەوشیروان و... زۆر بە گەرم و گوڕی و بەو پەڕی ڕێزەوە باسی زەبیحی دەکەن و زۆر بە باشی دەیناسن. ئەوە بۆ من جێگای فەخر و شانازی بوو بە تایبەت لە وەزعیەتی ئەوکاتی ڕۆژهەلاتی کوردستان بۆ ئێمە ئەوە شتێکی یەکجار زۆر گەورە و مووهیم بوو کە پەیوەندیت هەبێ لە گەلّ پێشمەرگە و شۆڕشی خوارووی کوردستان و ئەوە ئیتر ئەوپەڕی "سیاسی بوون" و "مووهیم بوون" بوو لە ناو خەلّکدا!

ڕۆژەکان زۆر بە توندی تێپەڕ دەبوون، دەزگای حکومەتی شا وەک شەق شەقەی لێ هاتبوو، وردە وردە خەلّکانی دوورە ولات دەنگیان لەو لاوئەولا دەهات، لە نێو خەلّکانی سیاسی و تێکۆشەری شارەکەمان دەمان بیست فلان کەس بە دزی لە عێراقەو هاتووەتەوە و فەلان کەس بە دزی لە لای منگوڕانە و... وای لێهات چەندین کەسێک هاتنەوە و ولات بە تەواوی بۆنی ئازادی و کوردایەتی لێ دەهات.

ڕۆژێک لە مالەوە دایکم کە ئەو خەبەرانەی دەبیست و هەموو ڕۆژێک خەبەری هاتنەوەی کەسێکیان دەدا بە چاوی گریانەوە گلەیی لە خودای خۆی دەکرد کە بۆچی خەبەری کاکی ۆی لە هیچ کوێوە نایە؟ هەر چەند بە هۆی برادەرانی یەکێتی دایکم خاترجەم کردبوو کە وەزعی باشە و زیندووە و لە بەغدا دەژی بەلّام دلّی خاترجەم نەبوو چون هیچ خەبەرێکی نەبوو. لەو ڕۆژانە دابوو کە برادەرێکی سەرەوەی یەکێتی بە ناوی کاک زێڕۆ لە مەهاباد میوان بوو لە قسە و باس و هاتنە پێشی بەحسی زەبیحی باسی وەم کرد کە دایکم زۆر تامەزرۆیە خەبەرێکی کاکی بزانێ، کاک زێڕۆ گوتی تۆ چەند کەلیمەیەک و ژمارەی تەلەفونی خۆتان بنووسە ئەمن حەول دەدەم بە دەستی بگات.

هەرچەند زۆر بەلامەوە زەحمەت و شتێکی بەعید دەهاتە پێش چاو کە کاک زێڕۆ لە شاخەوە و بە نەهێنی بتوانێ ئیشێکی وا بکا، بەلّام لە لای خۆم گوتم ئەگەر قازانجی نەبێ زەرەری نییە. وا بوو چەند دێڕێک و ژمارەی تەلەفونی خۆمان لە کاغەزێک نووسی و دام بە کاک زێڕۆ.

قرچەقرچی گەرمای هاوینی ١٣٥٨ (١٩٧٩-ز)) بوو مانگی پوشپەڕ، زەماوەندی برای گەورەم بوو، خەڵک و میوان لە جەنگەی هەڵپەڕین و چۆپی کیشان دابوون کە هاواری خۆشکم نەرمین (ساڵی ١٩٨٣ لە زیندانی جەمهوری ئیسلامی لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردا شەهید بوو) لە ژوورەوە هات و بانگی کرد گوتی پێموایە کابرایەکی عێراقی لە رێگای دوور لە سەر تەلەفون بانگی تۆ دەکات و وا حالیی بووم کە خاڵە رەحمانە! تەواوی لەشم سڕ بوو و نەمەدەزانی چۆن تەلەفونەکەی لێ وەرگرم، هاوارم کرد خاڵم بوو، گوتی کاغەزەکەم پێ گەیشت و تەلەفونم کردووە، باش لە قسەکان حالی نەدەبووم کە سەرم هەڵبڕی هەموو خزم و تایفە و میوان خەریک بوون پەلامارم بدەن و دەیان ویست تەلەفونەکە لە دەستم بفڕێنن لەو کێشەکێش و فڕان فڕانەدا تەلەفونیان کێشا و قەتعیان کرد، ئێستاش کە ئێستایە رەنگە چەند خزمێک لە سەر ئەو گوڕان و تورە بوونەی من هەر لێم عاجز بن! تەلەفونم بردە ناو ژوورێک و دەرگام لە خۆ داخست و حەولی وەسل بوونی تەلەفونەکەم دا بە خۆشێوە خاڵم هەر لە پشت تەلەفون بوو، بە تێر و پڕی قسەمان کرد و داوای هاتنەوەم لێ کرد وەعدی هاتنەوەی پێ دام و قەرار و مەداری رۆژێکی تایبەتیمان دانا، قەرار سنوری حاجی ئومەران لە لای سنوری خانێ بوو. ئەو چەند رۆژە زۆر بە بێ قەراری لە من گوزەرا و دائیم دڵم سوار و حەجمینم لێ بڕا بوو.
رۆژی مەوعوود هات، نیوەراستی مانگی گەلاوێژی ١٣٥٨ (ئووتی ١٩٧٩-ز) چەند سەیارەیەک سوار بووین بەرەو خانێ و لەوێشرا بەرەو سنوور، سەری سەعات هات و کەس پەیدا نەبوو، چەندین سەعات لە چاوەڕوانیدا گوزەرا کەس پەیدا نەبووا ئێوارە داهات و دەبوو لەو دەشتە نەمێنینەوە و بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتین نیزیک ماڵی باپیرم، لە دورەوە هەستم بە قەرەباڵغی و جەماعەت کرد و بۆنی هەڵیماوی برینج کە بە کوچەیان داکردبوو دەهات، سەرنجم دا دەرگای ماڵی باپیرم هەر دووک لای لە سەر گازی پشتێیە و حەشیمەت دیارە، سەرم سووڕ ما، بە هەر جۆرێک بێت لە سەیارەکان دابەزیین و خۆمان بە ژوور داکرت، بەڵێ! مامۆستا زەبیحی لە لای سەرەوە بە کەیفی خۆی پاڵی لێ دا بۆوە و ئەننەهوو ئێمە لە ئەوەڵی بەیانێوە لە سەر ئەو سنورە چاوەڕێی ئەومان کردووە، هەموو پێش بڕکەیان بوو بچن و خۆیان بناسێنن، لە پەناوە دایکم گرت و چاو و دڵ روونیم لێ

کرد و گوتی کە ئێوە رۆیشتوون ئێمە لێرە خەریکی خۆ ئامادە کردن بووین کەلە ناکاو وانێتێک رای گرتوو و کاکم بە تاق و تەنیا لێی دابەزیی و یەکسەر هاتە ژوور و هەمووومان لە خۆشیان و لە تەعەجوب وڕ و کاس بووین! هەم پوورم و هەم دایکم ئەو دوو خوشکە ئاو لە چاویان رانەدەوەستا و وەک منالێک لە هاتووچۆ دابوون.

هەر کە بۆ لای خالم چووم گوتی دەبێ عەلی بی، یەکترمان لە باوەش گرت و یەکەم شت گوتم کوا وا دەبێ برادەر؟ گوتی عەلی گیان دوای قسە کردنمان بە تەلەیفون بیستم کە هەرکەس هاتووەتەوە مەهاباد بەرەو پیری چوون و بە هەزاران کەس چەند شار ودێ پێشوازیان لێ کردوون و بە خۆپێشاندان و دروشم دان و بەزم و چۆپی بە ساعەتها گەیاندوویانەوە مالی خۆیان، ئەمن تاقەتی ئەو شتانەم نییە، ئەوەم کە بیست بریاری خۆم دا کە بە دزی بێمەوە. چەند ساعەت پێش لە مەوعیدێک کە بۆم دانابووی هاتمە خانێ و یەکسەر پیکابێکم دەربەست گرت و گوتم لێ خورە بۆ مەهاباد کە هاتینە مەهاباد بە کابرای سایەقم گوت برۆ بۆ دەواخانەی سالح زادە، کە هاتە راستی دەواخانە مالی خۆمانم ناسیوە و یەکسەر چوومە ژوور. رەعنا و هاجەر لە حەوشە بوون و پەلاماریان دام. بەلێ! پاش زیاتر لە ٣٣ سال خوشک و برا بە یەک شاد و شوکر بوون. ئەو شەوە، شەوێکی یەکجار خۆش بوو دەست بە جێ برادەرانی یەکێتی هاتن و بەخێر هاتنیان کرد و دەستەدەستە پیاوە کۆنەکانی مەهاباد دەهاتنوو و لە لای دادەنیشتن. ماوەی چەند رۆژان هەر یەک دەهات و یەک دەرۆیشت، ئەو ماوەیە زۆرتر هەر لە مال بوو یان لە بەر دەرگاوە دەچوو بۆ لای دەواخانەی سەید تەهای ئەییوبیان و لەوێ دادەنیشت و دۆست و برادەری کۆنی خۆی کۆمەلیان لێ دەکرد، دەنا لە کتێبخانەکەی سەید قادری جەعفەری لە کتێبان دەگەرا. دانیشتن لە گەل سەید قادری زۆر پێ خۆش بوو، سەرنجم دا لەو ماوەیە حیزبی دیمۆکرات کە لەو پەری قودرەت و جم و جۆلی دا بوو نەهاتن و بەخێر هاتنیان نەکرد، بۆم دەرکەوت نابێ زۆریان خۆش بوێ، نەمەدەزانی بۆ؟! تەنیا کاک حەمەدەمین سیراجی و مام هێمن چەند جارێک هاتنە لای و قەد ئەوەم لە بیر ناچێ، هەوەل جار کە مام هێمن هات، ئەو جووتە پیرە چۆن بە یەکەوە گالتە و شۆخی و دەست بازیان دەکرد و بە چەپۆکان بە سەری یەکتریان دادەدا و قاقا پێدەکەنین.

هەمـوو رۆژەکـان بە دەعـوەت و رابواردن لە مـالّی خـزم و دۆسـتـان تێـدەپەری، ئێوارەیەک لە مالّی دۆستێک دەعوەتیان بۆ کردبوو، ئەمن نەچووبووم لە مالەوە بووم، کاک دلێر پەیدا بوو، زۆر بە تالووکە گوتی مامۆستا لە کوێیە،گوتم دەعوەتە، هاتە بن گوێم گوتی مام جەلال لێرەیە و بە خاتری دیتنی مامۆستا زەبیحی هاتووە و شتەکە زۆر نەهێنییە. یەکسەر غارم دا و چووم بۆ ئەو مالە کە دەعوەتیان بۆ کردبوو کە چووم لە حەوشە لە بن دارە مێو سفرە ئەو سەر ئەو سەری دیار نەبوو، هێشتا دەستیان بە خواردن نەکردبوو، بەلێ! فەرموو فەرموو، گوتم ئێشم بە خالمە، چوومە بن گوێ و گوتم مام جەلال لێرەیە. لە خۆشیان لە سەر کورسێکە هەستا حەوا و یەکسەر گوتی دەبا برۆین، هەموو خەلکەکە مات و وڕ چاویان لە ئێمە بڕی بوو، خاوەن مال زۆری پێ ناخۆش بوو کە وا خەریکم دانیشتنەکەیان لێ تێک دەدەم، گوتم جارێ نانیان لە گەل مەیل بفەرموو دەبێ لە حەولی سەیارەیەکی باش دابم تۆزێک رێگامان دوورە، بە یارمەتی کاکم سەیارەکەی خۆمان کە پیکاب بوو لە گەل سەیارەی برادەرێک هەر بەو شەوە گۆرییەوە و ساعەت بەرەو ١١ و ١٢ی شەو دەچوو، هاتمەوە بە دوایدا گوتی بچۆ مالە خۆمان دەبێ جانتا و شتی وا لە گەل خۆم بێنم چوومە بەردەرگای مالی باپیرم، خالم لە قادرمان وەسەر کەوت، منیش لە خوارەوە لە دالانێکی تەنگ و بچووکدا چاوەرێی بووم. بیری لاوەتی ئەو سەردەم، فکری پێشمەرگە و پارتیزانی هەموو بیر و هۆشی داگرت بووم و هەر چەند هێشتا پێشمەرگایەتی لە رۆژهەلاتی کوردستان دەستی پێ نەکردبوو بەلام هەموو شێوە و رەفتارم و تەنانەت جل لە بەر کردنم پێشمەرگانە بوو، بە دانیم چەکم پێ بوو، ئەو شەوە چاردەخورەکەی خالم پێ بوو لە سەر پێم دانا بوو لە پشت پشتێندێ بوو، هەروا کە چاوەرێی خالم بووم و کاک دلێر لە ناو سەیارەکە لە کوچە چاوەرێ بوو یەکسەر خالە محەمەدم لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەر و بە چاوی خەوالووە گوتی ئەوە چییە عەلی؟! گوتم خالە رەحمان دەروا بۆ سەفەر و دەیگەیەنم، گوتی بۆ کوێ؟ گوتم نازانم ئەو دەزانێ، گوتی کوا؟ گوتم لە سەرەوە جلەکانی دەگۆرێ، گوتی ناهێلم برۆن، گوتم بە دەست من نییە، گوتی هەموو فیتنەی ئەو شارە لە بن سەری تۆ دایە! گوتم وا نییە، دەستی بە جنێودان کرد، هەلبەت جنێوەکە هەر "کۆمۆنیست" بوو. هەر لە من و هەی لە ئەو قەناعەتمان بە

یەک نە دینا، لە پڕ کە وام زانی پەلاماری چاردەخۆرەکەی لە سەر پێی پشت پشتێندمی دا و لە سەر سەری راگرتم، هاواری کرد پاش سی چل ساڵ کاکم دەست کەوتووەتەوە تۆ سەری بە فەتەرات دەدەی! ئەمن لە لایەک پێکەنین و لە لایەکیش چون دەمزانی دەمانچەکە لە سەر پێیە و لەرزە لەرزی دەستی خاڵە محەمەدم، لە ترسان نەمدەزانی چبکەم! بە کورتی و زۆر بە سادەیی ئەو "پیاوە دلێرە" و ئەو "پێشمەرگەیەی" خۆی زۆر بە ئازا و توانا دەزانی بە دەستی پیرە پیاوێک چەک کرابوو!

لە گوڕەی دەتکووژم و ناهێڵم کاکم بەری، لە هاواری من خاڵە گیان وریا بە لە سەر پێیە، خاڵە رەحمان لە سەرێ هاتە خوار و لە سەر پلیکانان کە چاوی بەو وەزعە کەوت ئەمن چەک کراو و یەخسیر لە ژێر دەستی خاڵە محەمەد دام یەکسەر سوور بۆوە وگوتی ئەوە چییە؟! خاڵە محەمەد گوتی کاکە ناهێڵم ئەو کۆمۆنیستە بتبا، سەرت بە فەتەرات دەدا، ریشی خۆت مەدە دەستی ئەو منداڵانە، ئەوانە مەستی نەزانین و کۆمۆنیستن و نازانن چ دەکەن، ئیتر ئەو قسانەو هەڵچوونی خاڵە رەحمان یەک بوو، بە سەری دا گوڕاند و گوتی محەمەد ئەوە دەڵێی چی؟ ئەوە منم کە ئەو بەستەزمانە لە گەڵ خۆم بۆ ئەولاوئەولا دەبەم، تۆ دەبێ مەمنوونی بی، من ئیشی خۆم چاکتر لە تۆ دەزانم، قسەی زۆر توندی پێ گوت، خاڵە محەمەد گوتی باشە بۆ بە من ناڵێی خۆم تاکسیم هەیە و بە شوفیرەوە دەینێرمە خزمەتت، گوتی نە تاکسی تۆ و نە شۆفیری تۆ بە کەڵکی من نایە، ئیتر خاڵە محەمەد وەک سەتڵێک ئاوی ساردی پێداکەن دەمانچەی فڕێ دا و چۆوە ژوورێ. خاڵم دڵخۆشی منی داوە و منیش لە لایەک لە ترسان ئازای بەدەنم دەلەرزی و لە لایەکیش لە خۆشی ئەوەی کە بە خێر گوزەرابوو پێدەکەنیم، خاڵم گوتی بۆ پێدەکەنی؟! گوتم نازانم بڵێم چی ئاخر بە راست بە تەمای کوشتنم بوو تۆ نازانی دەمانچەکە لە سەر پێیە و فیشەکم لە بەر ناوە! ئیتر خاڵم لەوە سەری سوڕ ما، گوتی باشە بۆ فیشەک لە بەر دەمانچە دەنێی؟ گوتم پێویستە پیاو لە گەڵ یەکی وەک تۆ لە هاتووچۆ دا بێ وا بێت، پێکەنی و دیار بوو دەیزانی چ رێبازێک چاوەڕێم دەکا!

بەرەو میاندواو و لەوێش را بەرەو بۆکان وەڕێ کەوتین لە رێگا باسی ئەوەی بۆ کردم کە چەند لە سەیارە و سایق دەترسێ، بەڵام ئاژواندنی منی بە دڵ بوو.

لە بۆکان بەرە و ماڵی کاک سەلاح موهتەدی و کاک سەعد رۆیشتین. کاتژمێر بەرەو ١ و ٢ی نیوەشەو بوو کە نیزیک بووینەوە هەستمان بەوە کرد کە دەوروبەری ماڵی کاک سەلاح پێشمەرگەی بە نەهێنی لێ دامەزراوە، کە چووینە ژوور مام جەلال لەوێ بوو ئیتر زۆر بە گەرمی یەکتریان لە باوەش گرت و بەخێرهاتنی یەکتریان کرد. دوای چا خواردن و شوتی خواردن ئەو جووتە چوونە ژوورێکی تر و خەڵوەتیان کرد و هەتا سبەینێ کاتی خواردنی نیوەڕۆ لە ماڵی کاک سەعد هەر بە یەکەوە بوون. رۆژی دوایە مام جەلال بەرەو مقەرەکانی خۆیان چۆوە و ئێمەش بەرەو مەهاباد کەوتینە رێ. لە رێگا کە نیزیک سابلاغ بووینەوە خاڵم گوتی کە چووینەوە بچۆ خزمەت مامۆستا شێخ عیزەدین و قەراری چاو پێکەوتنی منی لە گەڵ دا بنێ، ئەو ماوەیە قەت باسی مامۆستا شێخ عیزەدینم لێ نەبیستبوو، زانیم دەبێ پەیوەندی بەو چاوپێکەوتنەی مام جەلالەوە بێت، ئەمن ئیشی خۆم کرد و چوومە خزمەت مامۆستا گوتم خاڵم دەیەوێ بتان بینێ، زۆری پێ خۆش بوو و بەخێرهاتنی کرد. لەو رۆژەوە وردە وردە هەستم بەوە دەکرد کە شتێک لە بەینی خاڵم و مامۆستا دا پێک هاتووە و هاتووچۆیەکە گەرم و گوڕە! دەبێ بڵێم کاڵی و کەم عومری ئەو سەردەمە نەی دەهێشت زۆر لەو شتانە حاڵی بم بەڵام ئەوەی کە زۆر سادە و عەیان بوو بۆ من ئەوە بوو کە دیتنی مام جەلال و زەبیحی لە بۆکان لە ماڵی کاک سەعد و کاک سەلاح موهتەدی، شێوە و رەفتاری زەبیحی گۆری، چونکە:

ماوەیەک بوو زەبیحی لە مەهاباد لێمان میوان بوو لەو ماوەیەدا مەهاباد مەرکەزی هاتووچۆ و جوڵانەوە و رمبازێنی سیاسی لە ناو جەمعیەت و حیزب و چریک و مامۆستا و ئەو شتانە بوو، رۆژ نەبوو شتێک نەقەومێ و مەوزوعێک لە سەر سیاسەت و کوردستان لە ناو خەڵک و کۆمەڵە سیاسییەکان قاو نەبێ و باسی لێ نەکرێ، کە چی زەبیحی تەنیا لە ماڵەوە و زۆرتر خەریکی ئیش وکاری قاموس و خوێندنەوە و بە میوان راگەیشتن بوو وەک شتێک بەلامەوە سەیر بوو خۆ لە هیچ نادا! رۆژی وا بوو کە دەچوویە ناوشار و دەهاتییەوە یەک باقە بەیان و ئێعلامیە و گۆڤار و نووسراوەی جۆراوجۆری حیزب و سازمانەکانت لە گەڵ خۆ دێناوە ژوور. باش لە بیرمە رۆژێک دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ لە ژووری خوارەوە لە گەڵ خاڵم دانیشتبووین و خاڵم خەریکی نووسین بوو،

شەهید سولەیمان بلوری وەژور کەوت، سولەیمان دۆستی نیزیکی من بوو، خالم بە هۆی شۆخ و شەنگی و قسەی خۆش و توند و تۆلی و کوردایەتی کردنی، زۆری خۆش دەویست و سولەیمانیش هەر لە زمان ئێمەوە پێی دەگوت خالە، رۆژ نەبوو سەری لێ نەدا و باس و خەبەری شاری بۆ نەگێرێتەوە. سولەیمان ئێعلامیەیەکی پێ بوو گوتی خالە بزانە چ نووسراوە، ئەو خەڵکە بەکەیفی خۆی شت دەنووسێ و راستی و ناراستی لە ئێمە تێکەڵ بووە، تۆش کە هەموو شتێک دەزانی و ئاگات لە هەموو جەریانات بووە هیچ دەنگ ناکەی و راستییەکان بۆ ئێمە روون ناکەیەوە، گوتی چیە سولەیمان چت پێیە؟ گوتی خالە کۆمەڵێک پەیدا بووە بە نێوی "کۆمەڵەی یەکسانی" و ئەوە لێرە باسی کێشەی کۆمەڵەی ژ . ک و حیزبی دیمۆکرات دەکا! کە ئەوەی بیست وەک شتێک راچڵەکی و ئێعلامییەکەی لە سولەیمان ئەستاند وخوێندییەوە و دێر بە دێر پێی دەگوتین ئەوە راستە و ئەوە ناراستە، ئەوە وابوو ئەوە وانەبوو... .

گوتم خالە باشە ئەوە مێژووی ئێمەیە و بۆ ئێمە روون نییە! تۆ بۆ ئەو شتانە بۆ ئێمە روون ناکەیتەوە و نایاننووسی؟! گوتی جارێ زوویە، دەستی بۆ چەمەدانەکەی کە بە دائیم لە گەڵی بۆ درێژ کرد و گوتی هەموو لە ناو ئەو چەمەدانەی دا هەیە و نووسراوە هەر کات رۆژی هات بڵاویان دەکەمەوە!

زۆر جاران دایکم کە دەیبیست فلان کەس لە چوارڕێی قازی محەمەد قسان دەکا و وتار دەدا، هەر رۆژە کەسێک لە سەر تەلەڤیزیۆن پەیدا دەبوو و قسەی بۆ خەڵک دەکرد، رۆژێک گوتی کاکە ئەوە تۆ بۆ قەت هیچ نالێی و ناچی جارێک وتارێک بدەی، شتێک بڵێی؟ خۆ ئەو کەسانەی کە ئێستا نێویان لە سەر زارانە ئەو کات کە تۆ شت بووی ئەوانە هەر نەبوون گوتی رەعنا دەتەوێ بچم بۆ خەڵک درۆیان بکەم!؟ ئەوە ئیشی من نییە!

بەڵام بە دوای چاوپێکەوتنی لە گەڵ مام جەلال جم و جۆڵێک لەودا پەیدا بوو چەند جار سەفەری عێراقی کردەوە و زۆر جار بۆ لای بانە و مەریوان دەچوو، بە کورتی بە جۆرێک بە مامۆستاوە بەند بوو. لە گەڵ شێخ جەلال عەلاقاتی خۆشی پەیدا کرد بوو.

رۆژەکان بە توندی تێپەر دەبوون، خومەینی فەرمانی هێرشی بۆ سەر کوردستان دا و "بەنی سەدر"یش، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئێران دەستوری دا کە ژاندەرمەکان هەتا

گرتنەوەی کوردستان پۆستاڵەکانیان نەکەنەوە. هێرش لە لای جنوب و شاری سنەوە دەستی پێکرد، ئێمە هەموو لایەک خۆمان بۆ پێشمەرگایەتی ساز دەکرد، کۆمەڵە (کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) کە دەمان زانی دۆستی یەکێتی یە، وردە وردە خۆی ئاشکرا دەکرد و لە قالبی جەمعیەتەکان دەهاتە دەر، ئەمن بە هۆی هاتووچۆی یەکێتی چەند کەسێکم وەک دوکتۆر عەزیز (جەعفەر شەفیعی)، کاک عەبدوڵڵای موهتەدی و کاک عەبدوڵڵای بابان دەناسی و کاتی خۆی بە نهێنی دەزگای چاپێکی تازەم لە لایان یەکێتی یەوە لە کاک عەبدوڵڵای موهتەدی وەرگرتبوو و لە مەهاباد بە نهێنی خەریکی وەکار خستنی بووین لە گەڵ چەند کادری یەکێتی و کاک عەبدوڵڵای بابان بە نهێنی دەهات و یارمەتی دەکردین. لە سەروبەندی شەڕی مەریوان بوو کە یەکێتی بڕیاری دا ئەو چاپخانەیە بەرین بۆ ناوزەنگ. دیار بوو ئەوان دەیانزانی کە مەهابادیش بەدەست حکومەتی جەمهوری ئیسلامی دەگیرێتەوە. پیکابێکی یەکێتی نیشتمانی لە مەهاباد بە دەست منەوە بوو هەمووم لێ بار کرد و بەرەو سەردەشت ساز بووم، بێنزین نەبوو چووم بۆ خانووی خوداپەرست کە مقەڕی ئەسڵیی حیزبی دێمۆکرات بوو، کە وەژوور کەوتم کاک کەریم حیسامی و دوکتۆر قاسملو لە لای پەنجەرەکە سەیری فانتۆم و تەقە و هەرای لای نەغەدەیان دەکرد و قسە لە سەر دیفاع لە مەهاباد بوو، تازە وەژوور کەوتبووم گوێیم لە دوکتۆر قاسملو بوو بە کاک کەریمی گوت مەهاباد دەکەینە ستالینگراد! سلاوم کرد و خۆم ناساند و مەوزووعی ئیشەکەم بە کاک کەریم ڕاگەیاند و داوای بێنزینم کرد، زۆر بە نابەدڵی دوو چەلەنگی بێنزین دامێ، وەڕێ کەوتم بەرەو سەردەشت لە ڕێگا خەبەری شەهید بوونی کاک فواد مستەفا سولتانی و برایم جەلال (پاشان مەعلووم بوو برایم جەلال شەهید نەبووە) کادری یەکێتی نیشتمانییم پێ گەیشت هەر ئەو ڕۆژە چوومە بێوران و بە ولاغان بە هۆی کاک عەلی نێشکۆلانەوە چاپخانە بار کرا بۆ ناوزەنگ و تووژەلە. شەو لە لای مام جەلال خەبەری مەهابادیان لێ پرسیم و خەبەری شەهید بوونی کاک فواد و برایم جەلالم پێ ڕاگەیاندن، مام جەلال بە دڵ نارەحەت بوو و تێکچوو. باسی مەهابادی کرد گوتی چ باسە، گوتم خەڵک خۆی ئامادە دەکا بۆ شەڕ و جەریانی چوونم بۆ حیزبی دێمۆکرات و قسەکەی دوکتۆر قاسملوم بۆ گێڕاوە.

بەیانی زوو لەبەر ئەوەی سەیارەکەم لە لای بنوخەڵف بە جێ هێشتبوو گەڕامەوە بۆ مەهاباد. هێزی تاران نیزیک ببۆوە و فانتۆم لە ئاسمانی مەهاباد رمبازێنیان دەکرد و خەڵکیان دەترساند چەندین پێشمەرگەی یەکێتی هاتن و زەبیحی لە گەڵیان ساز بوو رۆیشتن بەرەو بانە. دیار بوو هەر ئەو رۆژە مام جەلال بە خۆی وجەماعەتێکی یەکجار زۆرەوە هاتبوو بۆ بانە، رۆژی دوایی لە گەڵ کاک دلێر ئێمەش بەرەو بانە وەڕێ کەوتین. لە بانە لەماڵی شێخ جەلال مام جەلال و زەبیحیم دیتەوە، شار شلوق بوو هەر پێشمەرگە بوو دەهات و دەچوو، هەموو وڵات پێشمەرگەی یەکێتی و پێشمەرگەی تازە پێک هاتووی کوردی ئێران بوو ئێمە لە حەوشەی ماڵی شێخ جەلال چاوەڕێ بووین کە خالم و مام جەلال لە ژوور هاتنە دەر و بڕیاری رۆیشتن بۆ سەردەشتیان دا. ئەمن لە چوونەوی مەهاباد رۆژی پێش لەندرۆوەریەکی تازە و نۆیم کە چریکەکانی ئەشرەفی دێهقان لە تارانەوە لە گەڵ خۆیان هێنابوو دەست کەوتبوو و پیکابەکەی یەکێتیم لەو رۆژە رەشەی دا بە کابرایەکی نەجار بە بیست و یەک هەزار تمەن فرۆشتبوو، هەموو سوار بوون و خەریکی ئەوە بوون هەر کەسە لە سەیارەکان شوێنی خۆی دیاری بکا، خالم بۆ لای من هات و گوتی ئەمن لە گەڵ عەلی سوار دەبم، دیار بوو مام جەلال دەیزانی زەبیحی لە سەر ئەو شتانە چۆنە ئەویش بڕیاری دا لە گەڵ زەبیحی سواری لەندرۆوەری من بێ. دیارە بە هۆی بیری ئەو سەردەم و ئێحساسات و هەستی لاوەتی ئەوە بۆ من زۆر مووهیم و جێگای شانازی و بەخۆڕاپەرموون و... بوو، لە لایەکی ترەوە پڕ لە ترس و نیگەرانیی لەوە کە شتێکم لێ نەقەومێ.

بە چەندین سەعات و بە تەپ و تۆزێکی یەک جار زۆر رێگای بانە - سەردەشت مان بڕیو و یەکسەر بەرەو بەردەپان چووین، لە پاسگاە کۆتەکەی بەردەپان مام جەلال مقەڕی کردەوە و دابەزی و دەستوری دا بچین لە گەڵ کاک دلێر بۆ سەردەشت ونان بکڕین،کە هاتینە ناو شاری سەردەشت، سەردەشت چ سەردەشتێک، باب ئاگای لە کوڕی خۆی نەبوو! دەرزیت هەڵاویشتبا وەعەرز نەدەکەوت، دەرکەوت هەمووی سابلاغ هاتووەتە سەردەشت، وا دیار بوو سابلاغەکەمان لێ گیرابۆوە. بە هەر جۆرێک بێت بە کەبابخانەکاندا هاتینە خوار و هەر چی خواردن هەبوو کڕیمان و بەرەو بەردەپان چووینەوە.

لە ڕێگا چەند سەیارەم لە پێش بوو، شور و شەوقی جەوانی وعەجولی ئەو سەر دەم دەبوو وە پێش ئەو سەیارانە بکەومەوە، بۆم دەرکەوت کە یەکێک لە سەیارەکان مامە غەنی و دوکتۆر قاسملو بوون بە تەپ و تۆز بەجێم هێشتن و خۆم گەیاندەوە بەردەپان، بە مام جەلالم گوت ئەوە ئەو کەسانە بەرەو ئێرە بە ڕێگاوەن بە کوردی و بە کورتی بڵێم ئەم هێشتبوو کەباب سارد بنەوە لە پێشم دانانن. لە پشت بورجەکەی پاسگای بەردەپان خاڵم و مام جەلال خەریکی خواردن بوون کە پێشمەرگەیەک هات و گوتی ئەوە جەماعەتی حیزبی دێمۆکرات هاتوون، گوتی پیان بڵێ ئێستا دێم و مام جەلال جارێ ئیشی هەیە. باش لە بیرمە نیزیکەی چارەگە سەعاتێک دوکتۆر قاسملو، غەنی بلوریان و چەند کەسی تر وەک کاک حەمەدەمین سیراجی و... لە حەوشەکەی پاسگای بەردەپان چاوەڕێی مام جەلالیان دەکرد.

مام جەلال هات و لە دوورەوە بە شێوەی خۆی چاک و چۆنی و تەعاروفاتی لە گەڵا کردن و یەکسەر پرسیاری ستالینگرادی لە دوکتۆر قاسملو کرد! ئای چۆن زمانی خۆم گەست و بیرم کردەوە ئەو قسەی دوو شەو لەوەی پێش چۆن ئیستفادەی خۆی لە جێگای خۆی لێ کرا؟!

بەڵام زەبیحی خۆی پێشان نەدان و هەر ئەو ئێوارەیە لە گەڵ کاک زێڕۆ و پێشمەرگەی یەکێتی بەرەو قەڵادزێمان ڕەوانە کرد.

ئەمن بە ئامۆژگاریی برادەرانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتی نیشتمانی پاش چەند ڕۆژێک کە لە تووژەڵە بووین و ببوو بە دۆڵی ئەحزاب، بووم بە پێشمەرگەی کۆمەڵەی شۆڕشگێر و بەرەو ناوچەکانی دەوروو و بەری سابلاغ گەڕاینەوە و خەبەرم لە خاڵم برا و خەریکی پێشمەرگایەتی خۆم بووم، یەک دوو مانگ تێپەڕی، ڕۆژێک دوکتور جەعفەری شەفیعی لە خانەقاکە کۆبوونەوەی بۆ دەکردین پاش کۆبوونەوە گوتی دەچم بۆ ئالان و کۆبوونەوەی کومیتەی مەرکەزیمان هەیە وعەلی لە گەڵ خۆم دەبەم. گوتم بۆ ئەمن؟ گوتی: یەکێک لە بێژوێیە، حەتمەن پێت خۆش دەبێ بیبینی. گوتم کێیە؟ گوتی خاڵتە. گوتم بۆ لە بێژوێیە!؟ گوتی بۆتە مەسئولی سیاسی دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین و ئێستا لە بێژوێیە و مقەڕی هەیە. ساز بووم و لە گەڵ پێشمەرگەکان ماڵ ئاواییم کرد و لە

گەڵ دوکتۆر جەعفەر بەرەو ئالان وەڕێ کەوتین. ئێواریّ درەنگ گەیشتینە بێژوێ و مقەڕی کۆمەڵە لە ناو دێ بوو، دوای چاک و چۆنی و حەسانەوە خەبەری زەبیحیم پرسی، گوتیان لە لای خوارووی بێژوێ لە ناو ڕەزەکان مقەڕیان هەیە. وەڕێ کەوتم بۆ لای مقەڕی مامۆستا شێخ عیزەدین و خێوەتی زەبیحیان پێ نیشان دام و چووم بۆ لای، زۆری پێ خۆش بوو گوتی چ دەکەی؟ گوتم پێشمەرگەی کۆمەڵەی شۆڕشگێرم و خەریکی پێشمەرگایەتیم. لە گەڵ کاک سەعدی موهتەدی لە یەک خێوەت دا بوون. شەو لە لای خاڵم نووستم، هێشتا چاومان لە خەو نەچووبوو کە تەقەی تفەنگ و شڕوخڕ پەیدا بوو، یەکسەر فیشەکدانم لە خۆ بەست و رام کردە تفەنگەکەم کە بۆ دەرێ بچم، خاڵم خۆی پێ دادام و گوتی بۆ کوێ؟ گوتم شەڕە چۆن! بچین بزانین چ باسە؟ گوتی بۆ هیچ کوێ ناچی ئەوە شەڕی دەوڵەت و هجومی حکومەت نییە، لێرە دانیشە و چاوەڕوان بە، ئەوە ببێ و نەبێ شەڕی ناو خۆ و شڕە خۆرییە! عەلاقەی بە ئێمەوە نییە. پاش بەینێک تەقە وەستا و وڵات بێ دەنگ بوو هاتوو و هاواری پێشمەرگەکانی مامۆستا شێخ عیزەدین پەیدا بوو، ئەوانیش هیچیان نەدەزانی بەڵام پێیان وابوو چوونە سەر مقەڕی شێخ جەلال، دەیان گوت تەقەکە لەوێرا دەهات. تا رۆژ بۆوە کەس نەنووست و هیچمان بۆ دەرنەکەوت، کە رۆژ بۆوە بۆمان دەرکەوت کاک سمکۆی عەلیار کە لەوێ مقەڕی خۆی کردبۆوە و لە حیزبی دێمۆکرات هاتبووە دەر و خۆی سەربەخۆ پەیوەندیی بە دەوڵەتی عێراقەوە گرتبوو و چەک و تەقەمەنی وەرگرتبوو و چەند کەسێکی لە لا بوو، شەو جەماعەتێک، کەس نەیزانی کێ بوون هاتبوونە سەری و ویستبوویان چەکی کەن و شڕەخۆری بکەن، قسەکەی مامۆستا زەبیحی لە ناو خێوەت لە سەرەتای تەقەکە وەدی هات!

بە خۆشێوە بەیانی دوکتۆر جەعفەر گوتی بە کەیفی خۆت لە گەڵ مامۆستا زەبیحی بە و ئەمن لێرە چەند رۆژێکم پێ دەچێت. مزگێنێکی خۆش بوو، مانەوەی ئەو چەند رۆژە زۆر شتی لێ حالی کردم. دەوروو بەری مامۆستا پڕ بوو لە هەموو جۆرە ئینسانێک، لە مەلای توند و تیژەوە بگرە هەتا فەقێی تازە پێگەیشتوو و سوختە و لە مەلای کۆمۆنیست و لە دین وەرگەڕاو و لە ترۆتسکیست و مائۆئیستەوە بگرە هەتا وردە بورژوا و مامۆستای قوتابخانە و کۆمەڵەی تۆخ لە بنەوە و بە ڕەواڵەت مشاوری مامۆستا هەتا

بگرە نی وەک مامۆستا زەبیحی کۆنە کار و دونیا دیدە! بەڕاستی نی وا لە دەفتەری مامۆستا لە هاتووچۆ دابوو کە بە هیچ جۆرێک گۆشتیان بە یەکەوە لە مەنجەڵێک دا نەدەکوڵا! کەس نەیدەزانی کێ مەسئولە و کێ پێشمەرگەیە، بانگی هەر کەست دەکرد دەبوو بڵێی مامۆستا فلان! لە قسە و باسەکان وام بۆ دەرکەوت کە پێک هاتنی حیزبێک بە ناوی مامۆستا لە ئارا دایە و لە پشت ئەو فکرە مامۆستا زەبیحی خەوتووە. بیری ئەوە کە دەبێ مامۆستا چیتر هەروەک شەخس نەمێنێتەوە و دەبێ لە ناو حیزبێک دا ئیش بکا، حیزبێک کە بۆ کوردستان ئیش بکا وکوردستانی بێ و هەموو چین و توێژێکی کوردستان بگرێتەوە، وە بیر کۆبوونەوەکەی مامۆستا زەبیحی و مام جەلال کەوتم و یەکسەر وەبیر خەتە پانەکەی ناو یەکێتی کەوتم، بەڵێ! دیار بوو لە فکری پێک هاتنی حیزبێکی وا دابوون کە کەلێن و بۆشایی ناو کۆمەڵە و حیزبی دیمۆکرات پڕ بکاتەوە، بەڵام هەرچی مامۆستا زەبیحی بوو لە سەر ئیش و کاری حیزبایەتی و تەشکیلاتی سوور بوو، هەر چی مامۆستاش بوو خۆی ئامادە نەکردبوو بۆ مسئولییەتێکی ئاوا! لە لایەکی ترەوە دەورو بەری مامۆستا کە پڕ بوو لە لایەنگرانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ، بە توندی دژی پێک هێنانی حیزبێکی ئاوا بوون!

پاش چەند رۆژێک مانەوە لە بێژوێ و هەڵا و گرمەی شەڕوەستان و پەیامی دەوڵەت و هات و چۆی نوێنەرانی حکومەتی تاران کە ماوەیەک بوو لە ئارا دابوو، رۆژێک کۆمەڵێک لە مامۆستای قوتابخانەکانی سابلاغ و جەماعەتێک لاو پەیدا بوون و بەزمیان بە مامۆستا گرت کە ئەوە مەهاباد لە دەست پێشمەرگە دایە و حکومەت فزەی نایە و تۆ دەبێ بێیەوە بۆ سابلاغ و خۆ بە خەڵک نیشان بدەی. مامۆستا زۆری پێ خۆش بوو بچێتەوە بەڵام زەبیحی بە تووندی دژی چوونەوەی رابەران بۆ شار بوو، دەیگوت لێ گەڕێن رەوەندی موزاکرە هەر وەک خۆی بەردەوام بێت و رەوەندی کاری پێشمەرگە و شەڕیش لە لایەکی تر تا دەگەینە ئەنجام لە موزاکرە. بە کورتی زۆر دژی راوەستانی شەڕ بوو لە کاتی موزاکرە دا، ئەو پێیوابوو دەبێ لە عەینی موزاکرە پێشمەرگە زەربەی قورس بوەشێنێ تا ئەوان لە سەر مێزی موزاکرە بە گورچووی پڕ دانیشن. هەر چەند زۆربەی خەڵک دەیانزانی کە حکومەتی ئیسلامی لە زەعفەوە پەیامی ئاشتی داوە و لە فورسەت

دەگەڕێ تا خۆی تەیار کاتەوە و جا ئەوجار بە هێزێکی زۆرترەوە هێرش بێنێتەوە سەر کوردستان، بەڵام زۆربەی ڕابەران لە سەر ناوەڕۆکی جەمهوری ئیسلامی لە شک و گومان دابوون!

ئەمن لە گەڵ دوکتۆر جەعفەر بەرەو ناوچەی سابلاغ هاتینەوە و هێندەی پێ نەچوو مامۆستا شێخ عیزەدین ڕۆژی جومعە بە هەڵا وگرمە خۆی بە مزگەوتی سوور داکرد و لە شاخەوە هاتەوە بۆ نوێژی جومعە!

شار دیسان وەک ڕۆژانی ڕووخانی حکومەتی شای لێهاتبۆوە هەر پێشمەرگە بوو لە هاتووچۆ دا بوو. ماملۆستا لە مزگەوتی سوور خوتبەی دا و هەموو مەهاباد لە مزگەوتی سوور خزا بوو. خاڵم کە لە گەڵ جەماعەت لە بێژۆیوە بە نابەدڵی و دیار بوو بەو پەڕی تووڕە بوونەوە هاتبۆوە، یەکسەر دێتەوە ماڵ و دایکم بەرەو پیری دەچێ و دەڵێ کاکە دیسان وەک زەمانی کۆمار هەموو شتێک لە سەر شانی تۆ بوو بەڵام نیوت قەت دیار نەبوو، ئێستاش سەری خۆت داخستووە و هاتوویەوە ژوور، بۆ چی ئەتۆش ناچی لە چۆارچرایە لە سەر مەنبەرێ قسە بکەی و خەڵک چەپڵەت بۆ لێدن؟! ئاخر ئێمەش دڵمان پێیخۆش دەبێ ! زۆر توووند لە دایکم قەڵس دەبێ و دەڵێ: ئەوە نییە ماملۆستا لە شاخەوە هاتۆتەوە نوێژی جومعە و قسە بۆ خەڵک بکا! دیارە ئەو جورەی دایکم باسی دەکا زۆر قەڵس و تووڕە بووە و لەبەر خۆیەوە هەر قسەی کردووە و گوتوویەتی نازانم خەڵک سیاسەت دەکا یا نوێژ کردن!!!؟

وەک دەردەکەوێ ئەوە ئاخر پەیوەندیی نێوان ماملۆستا و زەبیحی بووە و لەو ڕۆژەوە زەبیحی خۆی لە ئیش وکاری دەفتەری ماملۆستا نەگەیاندووە. هەر وەک خوێنەری بەڕێز شارەزایە پاش ئەو هاتنەوەیە شەڕی سێ مانگە تەواو بوو و تەقەوەستان دەستی پێکرد و هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد لە مەهاباد دامەزرا و وتووێژ لە گەڵ حکومەتی تاران بەردەوام بوو. هەروەک باش دەزانن کە لە لایەن دەفتەری ماملۆستاوە لە ناو هەیئەتی نۆێنەرایەتی گەلی کورد هیچ نێوێک لە زەبیحی نەبوو!

ئێستاش سەرنجی خوێنەرەوەی خۆشەویست بۆ وتووێژ لە گەڵ ماملۆستا شێخ عیزەدین کە لە سوێد لە گەڵما کردووە ڕادەکێشم:

# وتووێژ لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەدینی حوسێنی

١٩٩٥/٨/٤

**عەلی:** جەنابی مامۆستا تکایە بفەرموون لە کەیەوە مامۆستا زەبیحی تان ناسیوە و لە کوێ ئەوەڵین جار بینیوتە؟

**مامۆستا:** دیارە مامۆستا زەبیحی شەخسیەتێکی ناسراو بوو لە ڕەهبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک و شەخسیەتێک بوو لە مێژ بوو لە دوورەوە دەمناسی. بەڵام ئەوەڵین بەرخووردمان ئەودەمە بوو کە ئێمە لە تووژەڵە بووین. ڕۆژێک مام جەلال کە لەوێ بووین و دەفتەرمان دامەزراند، دیارە هەڵبەت مام جەلال دەفتەرەکەی دامەزراند، خۆ ئێمە هیچمان نەبوو مام جەلال خێوەت و شتی داینێ، ئێمە نە نانمان بوو نە ئاومان بوو ئەسڵەن با ئاوای بگێرمەوە:

هەوەڵجار لە بانەوە کە هاتین بۆ سەردەشت و لە سەردەشتەوە هاتینە داوداوێ، منداڵەکانم ناردە کاولان، وەزعمان زۆر خراپ بوو، نەمان دەزانی ئاوارەی و لێ قەومان چۆنە و چۆن لە گەڵی رابێین. بەشێک لە برادەرانی حیزبی دێموکرات بە پێی بۆچوونی خۆیان کە خومەینی زیددی ئیمپریالیستە لە هان دانی خەڵک دژی ئێمە کۆتایان نەدەکرد. بەڵام دیار بوو خەڵک زۆریان بە قسە نەدەکردن، ئێمە لە داوداوێ بووین لە ماڵە کوڕێک کە بە داخەوە شەهید بوو، کوێخا عەولایان پی دەگوت دووسێ ڕۆژان لەوێ بووین، دیارە ئەویش وەزعی باش نەبوو، ئێمە فکرمان نەدەکرد کە دەبێ پووڵمان پێ بێ و شتێکمان بێ، ئەسڵەن زۆر سادە و سەتحی بووین، وەک ئێستا کە زۆر شت دەزانین ئاوا نەبووین، ئەمن ناردم بۆ لای دوکتۆر قاسملو کە ئێمە چ بکەین؟ پێم خۆش بوو لێک نزیک ببینەوە تازە کە هاتووینە دەرێ، حەددی ئەقەل تەفاهومێک بێ و هاوکاری و لێک نزیک بوونەوەیێک بێ (پێشتریش ئەمن لە سەردەشتێ لە گەڵ دوکتور قاسملو قسەم کردبوو و لەوێ کۆبوونەوەیێکمان بوو). دوکتۆر قاسملو جوابێکی وای نەداوە، ئێمە لە داوداوێ لە

مەترسی دا بووین و شەوی هەوەڵ کە لە بانێک دانیشتبووین و خەڵکی زۆر لێ بوو، دوو نەفەری ناشناس لەوێ بوون و لێیان نیگەران بووین و پشکنینیان، دەمانچەیان پێ بوو، وادیار بوو بۆ ترۆری من هاتبوون، وەک بۆ خۆیان گوتبوویان. جا لەو وەختە دا بوو کە مام جەلال خەبەری زانیبوو. پاشان تەماشام کرد ئێوارێکی مام جەلال دەپانزدە پێشمەرگە و دوو ولاغی ناردبوو کە ئەمن بچم بۆ ئەوێ. ئێمەش چووین. دووسێ سەعات رێگا بوو، دوای نوێژی شێوان گەیشتیینە ئەوێ، زۆر بە قەدر و حورمەت مام جەلال وەریگرتین، ئیتتیفاقەن ئەمن هێرۆ خان م نەدەناسی ئەویش زۆر بە ئێحترامەوە هات و بەخێرهاتنی کردین.

ئەمن زۆرم پێ خۆش بوو، دووسێ رۆژان لەوێ بووین، پاشان دوکتور قاسملو شەوێکی هات و بەڵام هەر قسەی مەعمولی، ئەوە نەبوو کە ئێمە بە یەکەوە چ بکەین و چ نەکەین و رۆیشت. دوای دووسێ رۆژان ئەمن بە مام جەلالم گوت: ئێمە نابێ لێرە بین دەبێ جێگایەکی بۆخۆمان پەیدا بکەین. گوتی جا فلانکەس دەچێ کوێ؟! گوتم ئاخر لە حەیسی سیاسییەوە باش نییە من لە لای ئێوە بم و ئەتۆ ئێستا لە خاکی ئێران دای! جا تووژەڵە خاکی ئێرانە! گوتم جا رەنگە ئەتۆ لە گەڵ ئێران رابیتەیەکت بێ و ئێران ئیجازەی داوی لێرە بی، ئێمە ناکرێ لێرە بین خۆ ئێران وەک چاوئێشەدار لە ئێمە دەگەرێ. دیارە مام جەلال کە ئینسانێکی مۆحتەرم و پیاوە، غەیرە جەنبەی سیاسی جەنبەی روحی، مەردانەگی و کوردایەتیشی بە هێزە، گوتی پاراستنی تۆ لە جەنبە سیاسییەکە مووهیمترە! گوتی بۆ کوێ دەچی، دەبێ هەر لێرە بی، ئەمنیش تەماشام کرد هیچ دەرەتانێک نییە و خۆ هیچ کەس هیچ یارمەتییەک ناکا، وەڵا لەوێ بووین و چەند چادرێکی داینێ و چەند نەفەرمان لە گەڵ بوو لەوێ ماینەوە و دەفتەرمان دامەزراند. بەڵام هەم ئێمە و هەم ئەوان بە نەمرنەژی دەژیاین.

ئێمە چەند مانگێک لەوێ بووین دوایە چووینە شێنێ. جا حیزبی دێمۆکرات ئەغلەب لە وێ بوو دەهات لە گەڵ کۆمەڵە و ئەوان شتێک پێک بێنێ. هەموو جارێ دەهات بە ناو لێکۆڵینەوە، هەموو کەرەتێک دەهات قەراردادەکەشمان دەنووسی و ئیمزا دەکرد بەڵام دوایە پاشەکشەی لێ دەکرد و بۆ خۆی دەچوو بە دزی لە گەڵ دەوڵەت دادەنیشت

و دەست و پێوەندی لە ناو دەوڵەت زۆر بوو.

هەمیشە هەدەفی ئەوە بوو کە خۆی بە تەنیا لە گەڵ دەوڵەت موزاکرە بکا و ئێمە بە حیساب نەهێنێ و خۆی تاقە حیزبی کوردستان بێ! ڕەوشەکەی ئەوە بوو، جا ئەمن کارم بە وە نییە چاک بوو؟ خراپ بوو؟ یا...

ڕۆژێک مام جەلال گوتی پێمخۆشە مامۆستا زەبیحی (جا ئەمن نەم دەزانی مام جەلال لە گەڵ مامۆستا زەبیحی عەلاقەی هەیە و...) بێتە ئێرە و لێرە دەفتەرێک دانێ و دەفتەرەکە وسعەت پەیدا بکا لە کوردستاندا، ئەویش بێتە سازمانێک، ئەما وەک نێوی "دەفتەر" وە لە هەموو جێگایەک عوزو و ئەندام پەیدا بکا و پرۆگرامێکی هەبێ.

**عەلی:** شتێک وەکوو خەتە گشتییەکەی خۆی.

**مامۆستا:** ئا وەک خەتەکەی خۆی، جا ئەمن ئەو وەختی نەم دەزانی ئەوە چەندی کۆسپ لە سەر ڕێ یە و موشکیلاتی چییە؟ بەڕاستی ئەو دەم ئەمن زۆر سادەتر بووم لە ئەلئان، کە ئەلئانیش ئەو ئەندازە فڕ و فێڵی سیاسی نازانم. من موافقەتم کرد، یانی زۆرم قسە لە سەر نەکرد، پێشم وا بوو هەر فەورەن ئێقدام ناکا! بەڕاستی! جیددەن!

بەڵام پاش بەینێک مامۆستا زەبیحی پەیدا بوو لە توژەڵە، پاشان چووینە شێنێ. لەوێش لە گەڵمان بوو بەڵام لە گەڵ حیزبی دێمۆکرات بەینی نەبوو. حیزبی دێمۆکراتیش ئەوی ناخۆش دەویست، تەبلیغاتی دەکرد کە ئەو بەعسییە و فلان و...، ئەو جار ئێمە رابیتەیەکمان لە گەڵ عێراق بەرقەرار کرد، دیارە بە موافقەتی مام جەلال!

مام جەلال خۆی دەیزانی؛ دیارە ئەودەم ئەمنیش و شێخ جەلال هەر چی دەمان کرد مام جەلال ئاگای لێ بوو.

ئازاد هەورامی مان (کە شەهید بوو بەڕاستی ئینسانی چاک بوو) نارد بۆ لای هەورامان و جافێتی و ئەو دەوروبەرە کە خۆی خەڵکی هەورامان بوو کە لە وێ تەبلیغات بکا و بزانێ ئاخۆ وەزعەکە چۆنە و... کە هاتەوە بەو جۆرەی چووبوو بەو ئومێدەوە نەهاتەوە، پاشان دوای بەینێکی بە منی گوت کە بە مام جەلالی گوتووە بە خودای فایدەی نییە. جا مەسەلەی ئازاد هەورامی بۆیە موهیمە کە ئێمە، دوای هاتنی مامۆستا زەبیحی بیرمان لەوە کردەوە کە بزانین تاقی بکەینەوە کە تا چەندە ئەو بەرنامەی ئێمە ئیمکانی

پێشرەفتی هەیە.

بەڕاستی ئەمنیش وەک ئێستا کە سیاسەت دەرک دەکەم وا نەبووە. پێموابوو ئەوانەی سیاسەت دەکەن زۆر لێ هاتوون و سیاسەت زۆر دەرکی ژیری تێدایە و ... ەداقەت و هاوکاری تێدایە و... بە ئەو شێوەی ئێستام نەدەزانی بەڵام دیارە عەقیدەم بە کوردایەتی و رزگاری کوردستان بوو و پێشموابوو ئەگەر کۆمەڵە روشد بکا باشە، سازمانێکی تازەیە و ئەگەر روشد بکا لە حیزبی دێمۆکرات باشتر دەبێ، ئەمن پێم وابوو.

چون ئەمنیش و مام جەلالیش و ئەو پیاوە رۆشنفکرانەی کوردستان، ئەو پیاوانەی مەسلەحەتی کوردستانمان دەویست هەموو پێمان وا بوو لە گەڵ ئەوەشدا کۆمەڵە جەوان و گەنجە بەڵام زۆرمان هومێد پێیبوو و پێمان وا بوو دەبێتە هێزێکی گەورە و سەربەخۆیی سیاسی و کوردایەتی خۆی دەپارێزێ! لە بەر ئەوەی زۆرمان یارمەتی دەدا. ئەوەش بڵێم کۆمەڵە موخالیف بوو ماموستا زەبیحی بێتە لای من (دەفتەری من) و ئەعزای دەفتەریش کە هەموو جیا لە دووسێ نەفەر بە دڵ لە گەڵ کۆمەڵە بوون و، چارەیان لە ماموستا زەبیحی نەدەهات و پێیان خۆش نەبوو دەفتەرەکە بەدەستەوە بگرێ و دەفتەر گەشە بکا.

پاشان چووینە بێژوێ و ماموستا زەبیحی لە گەڵمان بوو قەرار وابوو هەموو ئەعزای دەفتەر بەرنامەکە بنووسن و تەوافوقی لە سەر بکەین و ئیعلامی بکەین و بڵاوی کەینەوە. دانیشتینوو و هەموو بووین: محەمەد موهتەدی، کاک سەعدی موهتەدی، ئەحمەد ئەسکەندەری، فاتح شێخولئیسلامی، مەلا محەمەد، مەلا عومەر و رەحمان شکاک و چووزانم هەموو ئەو جەماعەتە...

عەلی: بەڵام عونسوری ئەسڵی کاک فاتح و کاک ئەحمەد ئەسکەندەری بوون؟

ماموستا: نا! ئیشتبا مەکە! ئەوانی دیش بە بەرنامەکە موخالیف بوون. ئەوان راست و رەوان دەیان گوت موخالیفین بەو بەرنامە. ئەوانە زۆر چالاک بوون، بە منەوە ماندوو بوون هەم بۆ یارمەتی من و هەم بۆ کۆمەڵە. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا موخالیفەتی ئەوانە زۆر موئەسیر بوو، ئەگەر ئەو موخالیفەتەش نەبایە، بەرنامەکە سەری نەدەگرت. غەیریی کاک سەعدی موهتەدی نەبێت بەرەحمەت بێت کە لە گەڵ ماموستا زەبیحی

نێوانی زۆر خۆش بوو، ئەو زۆری پێ ناخۆش بوو کە جەریانەکە تێک چوو و هەروەتر یەک دوو نەفری دی کە لە گەڵ کاک رەحمان زۆر دۆست بوون و هەم منزل بوون.

ماموستا زەبیحی ماوە لەوێ، مام جەلالیش زۆری پێ ناخۆش بوو، ئەو جار پاش بەینێک بە منی گوت: برادەران (کۆمەڵە) نەیان هێشت کارەکە جێ بەجێ بێت.

**عەلی:** ئەمن بۆ خۆم ئیحساس دەکەم کە مام جەلالیش لە بەعزە شتێک پەشیمانە.

**ماموستا:** بەڵێ، بەڵێ موسەللەم! دیارە شێخ جەلالیش زۆری پێ ناخۆش بوو ئەمن پێموابوو هەموو کوردن و هەموو کوردایەتی دەکەن و دەبێ هەموو لە خزمەتی خەڵک دابین و ئەو شتانەم نەدەزانی! نەیان هێشت ماموستا زەبیحی ئەو شتە دروست بکا، دیارە شێخ جەلالیش زۆری پێ ناخۆش بوو.

ماموستا زەبیحی ئینسانێکی ئارامی، عاقلی، مەتین، خودداری... قەد باسی کەسێکت لێ نەدەبیست، جارێکی ئەمن گوتم دەچم سەری حیزبی دێمۆکرات دەدەم، گوتم ماموستا زەبیحی نایەی؟ گوتی: نا! هەر ئەوەندەی گوت، ئەمن ئینسانی ئاوا ئارام و خوددار و لە سەرخۆ و مەتین و بە مشوور و ...م نەدیوە، ماموستا زەبیحی زۆر موخلیس بوو بە کورد و کوردستان. میللەتی کورد یانی نەک هەر بە کوردی ئێران یان عێراق ئەو بۆ میللەتی کورد بە گشتی موخلیس بوو، فەرقی پێ نەدەکرد، زۆر مۆخالیفی کۆمۆنیست و چەپ و... ئەوە بوو دەیگوت خراپن، درۆ دەکەن، کوردیان ناوێ، هەل پەرستن. زۆر زەمی خالید بەگداش و شیوعی سەر بە شورەوی دەکرد.

ماموستا زەبیحی لە گەڵ یەکێتی زۆر دۆست بوو، لە گەل ئەوان بوو، جا لە زەمانی مەلا مستەفاش لە گەڵ مەلا مستەفا نەبوو بە دڵی نەبوو، لە گەڵ برایم ئەحمەد و مام جەلال و ئەوان بوو.

ماموستا زەبیحی راستە لە گەڵ دەولەتی عێراق گونجانێکی بووە ئەمما لە گەڵ مام جەلال و ئەوانە یەک بووە بە جورێک ئەو لای راگرتووە جا نازانم چۆن؟ بەڵام بەعسی بەو مەعنایە لە خزمەت ئەوان دابێ و کار بۆ وان بکا وەک ناحەزەکانی بلاویان دەکردەوە و تەبلیغیان پێوە دەکرد، ئەوە نەبوو؛ بەڵام لە بەغدا دادەنیشت و قەتعەن بە عینوانی ئەوەی

کـە لە بەغـدایەیە، دەوڵەتی بەعس دەیناسی؛ بەڵام لە مـەعنادا لە گـەڵ مـام جـەلال و یەکـێـتی رابیـتـەی تەواوی هەبوو. ئەمنیش بەو پێ یە باوەڕم پێی بوو و ئیعـتـمـادم پێ دەکرد بەو ئیعتباره کە کوردی ئێرانە و باشە. لە راستیش دا بۆ یەکێتی کاری دەکرد، بەڵام ئێمە فەرقی کوردستانەکانمان نەدەکرد.

حـیـزبی دێمـۆکـرات و ئەمن بە جـوێ جـوێ لە گـەڵ دەوڵەت تەمـاسـمـان هەبوو و هەیئـەتی دەوڵەت هاتووچۆیان دەکرد بۆ لای هەر دووکـمـان کە فـرووهەر لە گـەڵ هەیئـەتی خۆی هێندێک لە ئەفسەر و مەقامات دوو دەفعە هاتنە لای من لە بنووخەڵەف و بێورانی سەروو یەکترمان دی و گفتگۆمان کرد و ئەمن پێم گوتن کە بە تەنها بێ حیزبی دێمۆکرات مـوزاکرە ناکـەم و حـیـزبی دێمـۆکراتیش لە گـەڵ زیبـا کـەلام و مـەقـامـاتی دی لە وتوویژ و تەماس دا بوون.

بۆ ئەوەی کـە بەرنامەیێکی موشـتـەرەکـمـان بێ و دەسـتـە جـەمعی لە گـەڵ دەوڵەت دابنیـشین و موزاکرە بکـەین چەند دەفـعـە لە گـەڵ حـیـزبی دێمۆکرات دانیـشـتین و کـەوتینە بەحسـەوە ئەمما لەبەر هێندێ مـەسـەلە بە نەتیـجەی تەواو نەگـەیشـتین. ئێـمـە بەرەو بێـژوێ رۆیشـتـینو پاش بەینێک رۆژێک ئەبووبەکری حەسـەنزادە و موهەندیس ئاریا و شـەهـید سـەوجە هاتن و قـەرانامـەیەکـیـان هێنابوو کـە بەو پێـیـە لە گـەڵ دەوڵەت دەسـتـەجـەمـعی موزاکرە دەکەین کە رەئیس هەیئەت ئەمن بم و دوکتـۆر قاسملوو سوخەنگوو بێ و کۆمەڵە و چریکی فـیدایی (شاخەی کـوردسـتـان) عوزو بن و حەقی هـیچ قسـەیێکـیـان نەبێ و وەک نازر دابنیـشن و ئەگـەر قسـەیێکـیـان بوو بە قـاسـملو بڵـێن و ئەو رای بگـەیێنێ. حـیـزب و چریک لە پێشدا ئیمزایان کردبوو و ئێمەش و کۆمـەڵەش لە بێژوێ ئیمـزامان کرد کە پێـیـان گـوت "هەیئـەتی نمایەندەگی خـەڵکی کـورد". دوای ئەوە لە سـەرتاسـەری کـوردسـتـان ئەو شیـعـارە لە هەمـوو کوچە و کۆڵانان و خـیـابانی کـوردسـتـان دووپات دەکـراوە: "مـامـۆسـتـا، دێمـۆکـرات، کـۆمـەڵە، فـیـدائی یەکگرن!" و دەوڵەتیش کـامـیلەن دەیزانی کـە "هەیئـەتی نمایەندەگی خـەڵکی کـورد" ئەو چوار لایەنانەن. بەڵام بەداخـەوە ئەو بەشـە لە حـیـزبی دێمـۆکـرات، کـە بە نێـو حـیـزبی دێمـۆکـرات بوون و لە ناوەرۆک دا توودەیی بوون، سەباغـیـانیـان وادار کرد کە لە سـەر مـیزی مـوزاکرە بە بیـانووی ئەوە کە لە گـەڵ چریک و

کۆمەڵە موزاکرە ناکەم هەیئەتەکەی تێک دا. لە لایێک توودەکراتەکان ئێستا دەڵێن، دەنووسن کە فلان کەس کە نێوی چریک و کۆمەڵەی هێنا نەیهێشت دەوڵەت حەقمان بداتێ و تێکی دا. بەڵام خودی کەیانووری لە خاتراتی دا دەنووسێ کە ئەو تەرحە (تەرحی خودگەردانی) ئێمە دامان رشتبوو و فرووهەر کە هاتەوە لە کوردستان هاتە لای ئێمە و زۆری دەردی دڵ کرد قبووڵیان نەکردووە و کارەکە تێکچوو. جا کەیانووری دەڵێ قاسملوو و حیزبەکەی پێیان سپێردرابوو کە ئەو تەرحە قبووڵ نەکەن و تێکی دەن.[1] ئەو قاسملوو بە خەتابار دەزانێ و توودەکراتەکانیش ئەمن کە هیچیان راست نین. دەوڵەت نەیدەویست موزاکرە بکا ئەمما لە هەموو کوێیێک لە مقابلی هێرشی پێشمەرگە و تەزاهوراتی خەڵک شکستی خواردبوو و دەیەویست پشوویێک بدا و خۆی ساز بکاتەوە. ئەوە بوو کە لە بەهار دا لە هەموو لایێکەوە هێرشی خۆی دەست پێکردەوە و تا ئێستاش زۆر دەفعە دەعوەتی کردووە بۆ موزاکرە و ئەمما هەمیشە درۆی کردووە و خەیانەتی کردووە و حیزبی دێمۆکرات چەند جار دانیشتووە لە گەڵ دەوڵەت و ئامادەی موزاکرە بووە بەڵام دەوڵەتی ئاخوندی درۆی لە گەڵ کردووە و فریوی داوە. بەڵام دەوڵەت دیار بوو بیانووی دەگرت و حازر نەبوو قەت هیچ ئیمتیازێک بدا؛ ئاخر پاش ئەوەی حیزبی دێمۆکرات چەند جار دانیشت و ویستی سازش بکا لە گەڵ دەوڵەت، تەرحی شەش مادەییان دا و حیزب بۆ خۆی چەند جار لە گەڵ دەوڵەت دانیشت و دەوڵەت هیچی بە قسە نەکرد و ئاخر هەر ئەوە نەبوو لە سەر میزی موزاکرە خائینانە دوکتۆر قاسملوی ترۆر کرد؟ تازە خەڵق چۆن ئەوە دەڵێ کە دەوڵەت دەیدا بەڵام فلانکەس نەیهێشت! ئەدی بۆ دەیان گوت ئەوە مامۆستا بوو نەیهێشت موزاکرە سەر بگرێ چون کۆمەڵە و چریکی هێنا نێو موزاکرە؟!

---

١- کەیانووری لە بیرەوەرێکانی دا لاپەڕەی ٤٢٧ دەنووسێ:

دوای سەرکەوتنی شۆرش، فرووهەر لە کابینەی بازرگان دا وەزیری کار و دوایەش وەزیری راوێژکار بوو. لەو سەردەمە - بەتایبەت لەو کاتە کە رووداوەکانی کوردستان لە ئارا دابوو - ئێمە لە گەڵ فرووهەر لە پەیوەندی دابووین. چەند جار لە گەڵ ئاغای عەموویی چووینە ماڵی فرووهەر و بە یەکەوە بە تێر و پڕی نە تەنیا لە سەر کوردستان بەڵکوو لە هەموو بوارەکاندا قسە و باسمان هەبوو. ئەو لە مەسەلەی کوردستان دا لە سەباغیان و موهەندیس سەحابی لە گلەیی بوو کە مەسەلەکەی بە جدی وەرناگرن. هەر چۆنێک بێ ئیمام فرووهەری بە تەنیایی کردە بەرپرسی مەسەلەی کوردستان. فرووهەر تەرحێکی تەقدیم کرد کە بە تەواوی ئێمە قەبوڵمان بوو و لە بڵاوکراوەکانی خۆمان دا پشتیوانیمان لێ کرد. بەڵام قاسملو و تاقمەکەی پێیان راسپێردرابوو کە لە گەڵ هەر پێشنیارێک دژایەتی بکەن. (تەرجمە لە فارسییەوە دانەر)

غەیرەز ئەوە بوو کە دیانهەویست هەموو بە ئیستقبالی خومەینییەوە بچین چونکە ئەو زیددی ئیمپریالیستە و حیزبی دێمۆکرات بەرن دەباوەش خومەینییەوە (بەعزێکیان هەر چوونەوە پاڵ خومەینی) دەنا هیچ ئەو قسە قوڕانە نییە، ئەو جورە قسانە یان ئینسانی موغریز یان سادە لەوح دەیکا کە گویا فلانە کەس نەیهێشت موزاکرە سەربگرێ!

دوای ئەوەی کە ئێمە بۆ گفتگۆ و موزاکرە ئامادەی گەڕانەوە بۆ مەهاباد و شارەکان بووین، مامۆستا زەبیحیش لە گەڵ ئێمە هات بۆ مەهاباد، هەم بۆ ئەوە کە لە گەڵ ئێمە بێت و بەجێ نەمێنێ و هەم کە زۆر لە مێژ بوو سەری خزم و کەسی نەدابوو. لە مەهاباد لەبەر ئەوە کە ئێمە سەرگەرمی وتووێژ لە گەڵ دەوڵەت بووین و هاتووچۆ بۆ ماڵە ئێمە زۆر بوو، مامۆستا زەبیحی فرسەتی ئەوەی نەدەکرد کە زۆر بێتە لای من بەڵام جارجار سەری دەدام و قسەمان دەکرد و زۆریش بەینمان خۆش بوو. ئەمما ئەحزاب و سازمانەکان بەدگۆیان لێ دەکرد و دژی دەدوان. جا تەبلیغاتی ئاوایان دەکرد جا ئەو جۆرە تەبلیغانە هەم مامۆستا زەبیحیان پێ خراپ دەکرد، هەم من و هەم مامۆستا شێخ جەلال. جا ئەوە بوو بە تیرێک سێ نیشانیان دەنگاوت. جا ئەوە سەیر بوو زۆرتری ئەوانەی کە ئەو تەبلیغەیان دەکرد تازە لە باوەشی بەعس هاتبوونەوە مەهاباد.

ئیدی من لە مامۆستا زەبیحی بێ خەبەر بووم تا وەختێکی کە زانیم هاتۆتەوە و ئەسلەحەییێکی زۆریان هێناوە. دوایە مەعلووم بوو کە ئەسلەحەکە زۆر بە خسووسی بەشێکی زۆری گەیشتووە بە یەکێتی و بڕێکیش بە کۆمەڵە دراوە.

بەڵام لە سەر مامۆستا زەبیحی ئەمن ئاوای تێدەگەم ئەوەی ئەمن دەیزانم ئەوەیە کە مامۆستا زەبیحی و جەماعەتی کۆمەڵەی ژ.ک زۆر موخالیف بوون کە کۆمەڵە تێک بچێ و ببێتە حیزبی دێمۆکرات، پێیان وا بوو زەرەری میللەتی کوردە چونکوو بەینێکی زۆر عروسیش و ئینگلیسیش دەیان هەویست سەر رشتەیەکی لە کۆمەڵە ی ژ.ک وەدەس بێنن، نەهێنی بوو، زۆریش نەهێنی بوو، دەیانزانی لە ناو خەڵکدا هەن و هیچیان لێ نەدەزانی.

کۆمەڵەی ژ.ک بە حەددێک پاک و ئازا و ئەندامەکانی زۆر بە ئیمان و راست بوون بەڕاستی هەر کەس بۆ خۆی کۆمەڵەی ژ.ک نەبووبێت و نەی دیبێت نازانێ چۆن بوو!

حیزبی ئاوا پاک و خاوێن تەنانەت لە حەیسی ئیجتیماعییەوە و لە حەیسی عاتفییەوە و لە حەیسی پاکداوێنی و بێ نەزەریەوە کەم وێنە بووە.

وەختێک کۆمەڵەی ژ.ک بوو بە حیزبی دێمۆکرات ئەسڵەن هەر سەرەوبن بوو! دەرکەی کراوە، سەرکردەی عەشایر و بنەماڵە شێخە گەورەکانی تەریقەت تا مەلای بە دەسەڵات و با نفووزی شار و دێ، پیاوە ماقووڵ و بەدەسەڵاتەکانی شار هاتنە روو. پیاوچاکانی ژێ کاف کەنار نران و یان بوونە دەرەجە دوو و سێ. کۆمەڵەی ژ.ک کۆمەڵێکی کوردستانی بوو بۆ سەرتاسەری کوردستان کاری دەکرد و هەدەفی سەربەستی و ئیستقلالی کوردستان بوو و بۆیەش لە هەموو پارچەکانی کوردستان رێکخراوەی هەبوو و لە هەڵبژاردنی ئەندام دا دیقەتی دەکرد و ئینسانی باش نەبوویایە و تاقی نەکردباوە وەری نەدەگرت.

**عەلی:** ئێوە چ ساڵێک بوون بە کۆمەڵە ی ژ.ک؟

**مامۆستا:** ئەمن کە هاتمە موکریان کۆمەڵەی ژ.ک لە هەڕەتی خۆی دابوو، بە واستەی هێندێک دۆستان "نیشتمان"م دەخوێندەوە و روحی کوردایەتیم زۆر گەشەی کردبوو و جارجاریش خەیاڵم دەکرد شێعر بڵێم. رۆژێک دەستەیێک شێعرم دانابوو لە کن حەوزی بۆکان تووشی مامۆستا هەژار بووم. هەر دەمناسی، شێعرەکەم پێ نیشان دا خوێندییەوە و گوتی ئەوە شێعر نییە ئەمما هەستەکەت پیرۆزە. زۆر تێکەڵ بووم لە گەڵ ئەوانەی کۆمەڵەی ژ.ک بوون وەک خوالێخۆشبووان حاجی مەلا محەمەدی وەلزی و حاجی رەحمان ئاغا. پاش چەند مانگێک لە گەڵ حاجی مەلا محەمەد چوومە ماڵی قازی کاکە حەمەی قزلجی لە بۆکان. لەوێ سوێندم خوارد و بوومە ئەندام. بە پێی توانای خۆم چالاکیم دەکرد و زۆر کەسم لە مەلا و فەقێ داخلی کۆمەڵەی ژ.ک کرد. رۆژێک بە شێخ جەلالی برام کە فەقێ بوو گوت "ببە کۆمەڵەی ژ.ک" ئەویش حاجی رەحمان ئاغا هاتبووە حوجرە، شێخ جەلال پێی گوت "حاجی رەحمان ئاغا کاکم دەڵێ ببە بە کۆمەڵەی ژ.ک ئەتۆ دەڵێی چی؟" ئەویش جوابی داوە: "جا ئەو برا گەورەتە دەبێ بیکەی. ئەمنیش پشتیوانی لێ دەکەم."

کۆمەڵەی ژ.ک لە گەڵ ئەوش دا کە دەوڵەت دوای شەهریوەری ١٣٢٠ لە کوردستان هیچ نفووزێکی نەمابوو بە دزی کاری دەکرد. نهێنکاری خۆی بە تەواوی

دەپاراست؛ دەتگوت هەیە و نییە؛ هەموو کەس دەیزانی شتێک لە جەریان دایە؛ وەزعی ئیجتماعیش گۆڕابوو ئەمما نەیان دەزانی سەرەتای لە کوێ یە و چۆن کار دەکا. یادی بەخێر سازمانێکی زۆر ڕێکەڵە و جوان و پاک بوو. ئەو هەموو نووسەر و شاعیرە گەورانەی لە داوێنی خۆی دا پێگەیاند وەک هەژار و هێمن و زەبیحی و سەید کامیلی ئیمامی و حەقیقی و خاڵە مین و دەیان کەسی دی.

**عەلی:** وا بوو کە هەموو ئەندامەکان بناسی؟

**مامۆستا:** نا! نا! ئەمن عوزوەکی زۆر سادە بووم، ئەمن نام هەوێ خۆم زل کەمەوە ئەمن وەک فەقێیەک کە عەلاقە و عیشقی زۆرم بە کوردایەتی بوو، دیارە هەژارم لە بۆکان دەناسی. ئەمن لە بۆکان بووم بە تایبەت ئەو ڕۆژەی ئاڵای کوردستان لە بۆکان هەڵکرا، ئەمن لەوێ بووم، یەکێک لەو شتانەی کە لە زندەگیدا زۆرم پێ خۆش بووە ئەو ڕۆژە بوو پاشان سالی ١٣٢٥ کە چوومە مەهاباد لە خزمەت مامۆستا مەلا حوسێنم دەخوێند ٤-٥ مانگ لەوێ بووم.

**عەلی:** مامۆستا مەلا حوسێنی مەجدی؟

**مامۆستا:** ئا، مامۆستا مەلا حوسێن وەزیری عەدلییە بوو، لەبەر ئەوە بە خوێندنەوە خەریک بووم، کەمتر وەدەر دەکەوتم بۆ نێوشار و بازار، تەنیا جارجار دەچووم کە پێشەوا نوتقی دەکرد یان لە تاران دەگەڕاوە. ئەودەم ناوی مامۆستا زەبیحیم زۆر دەبیست، بەڵام وەک لە نیزیکەوە بیناسم وانەبوو.

**عەلی:** ناوی مامۆستا زەبیحیت وەک چی دەبیست؟

**مامۆستا:** وەک یەکێک لە ڕەهبەرانی کورد، یەکێک لە کاربەدەستان.

**عەلی:** دەتزانی کێ سکرتێری کۆمەڵەی ژ.ک بوو؟

**مامۆستا:** بەعزێک دەیان گوت مامۆستا زەبیحییە، بەعزیک دەیانگوت زێرینگەرانە، ئەمما پێموایە زێرینگەران بوو.

بەداخەوە هێمنیش ئەوەی شاردووەتەوە کە دەڵێ: "پاش ئەوەی پێشەوا هات بوو بە سەرۆکی حیزبی دێمۆکرات ئەو پیاوە جەوانمەرد و ڕشیدە لاچوو و ڕۆیشت بە شهامەتەوە قەبوڵی کرد و قەتی هیچ نەگوت، هێستاش هیچ ناڵێ" جا هێمن ناڵێ کێ بوو؟!

**عەلی:** دەبێ حوسێنی زێرینگەران بێت!
**مامۆستا:** جا نازانم بەڵام هێمن نەیگوتووە کێ بوو.
کۆمەڵەی ژ.ک کاڵ بوو لە گەڵ ئەو هەموو سەداقەت و پاکی سازمانێکی کاڵ بوو تازە بەخۆی دادەهات و گەشەی دەکرد. هەڵبەت ئەودەم خەڵکی باسەواد لە کوردستان کەم بوو، هیچ بەرنامەیەکی موشەخەس نەبووە، دیار نییە کە چیان گوتووە، بەڵام ئەمن دەڵێم کاکڵێکی باش بوو گەڵاڵەیەک و بناخێکی باش بوو کە دەکرا لە سەر ئەوی بڕۆین و زۆر باش دەبوو.
موشکیلێکی گەورەی ئێمە کە کەس باسی ناکاو ناوێرین بیلێین قەت ئیشارە بە جنایەتی شورەوی ناکەن، قەت ئەوان رۆژی ئەوەڵیش بەو هەدەفە نەبوون کە شتێک بۆ کورد بکەن، حەتا ئەگەر ئازەربایجانیان مەنزوور بوو بێت، کوردستانیان مەنزور نەبووە هەدەفی ئەوان ئەوە بوو لە مەرحەلەی ئەوەڵدا ئازەربایجان مولحەق بکەن بە ئازەربایجانی شورەوی، ئەگەر بۆیان کرا! دەنا ئەگەر هیچ نەبێ ئیمتیازێک لە ئێران بستێنن. کوردستان؟! عروس نەیان دەهێشت، ئێستاش کە کاک ئەوشیروان نووسیوێتی و ئەمنیش بیستوومە، جەماعەتی زۆر پێیان وا بوو کە دەبێ بڕۆن تا سنە و ئەوانە بگرن، قازی محەمەد هیچوەقت ئیجازەی نەداون لە سەراوە بەو لاوە بچن، بۆ؟! عروسان نەیان هێشتووە، نەک قازی محەمەد بۆ خۆی پێیخۆش نەبووبێ! بەڵام قازی محەمەد نەیتوانیوە بەرهەڵستی عروسان بکا. ئەمما حاجی بابە شێخ، مەلا مستەفا، حەمەرەشید خان هەموو تەرەفداری ئەوە بوون کە بڕۆن تا سنە بگرن، دەوڵەتی ئێران نەیدەتوانی هیچ بکا، چی دەکرد؟! تۆ زۆرت لە بەر دەستدا هەیە، ئەودەم باشتر دەکرا لە گەڵت رێک کەوێ و ئیمتیازت بداتێ. عروس پێیان خۆش بووە ئازەربایجان بەو قسمەتە کوردستانەشەوە بخەنە سەر ئازەربایجانی خۆیان، هەر کەسیش ئەوە نەسەلمێنێ دیارە....
باقرئوف تەواوی هەدەفی هەر ئەوە بووە، حەتا وەختێک ویستیان ئەوە بکەن کە کوردستان بکەنە ئوستانێکی ئازەربایجانی ئێران و قازی محەمەد وەک ئوستاندارێک وا بێت. قازی محەمەد گوتی جا ئێمە ئەگەر هەر نۆکەریی بکەین بۆ ئێوە دەکەین و ئی ئێران بۆ نەکەین؟! بۆ لەبەر دەستی فارسەکان نەبین کە ئاریایین بۆ لەبەر دەستی تورکان

بین کە نە رابیتەی نژادی و نەرابیتەی مەزهەبیان لە گەڵ ئێمە هەیە ؟! ئەگەر هەر نۆکەری بێت، نۆکەریی ئێران دەکەین! ئەوە حەق بوو. حەتا ئەوەڵ خەیاڵیان بوو کە قازی محەمەد لە بەین بەرن کە تەسلیمیان نەدەبوو، ئەوە کابرایەک بۆی گێرامەوە کە لە خودی حکومەتی کۆمار دا بوو دەیان هەویست قازی محەمەد بکوژن دەیان گوت دیکتاتۆر و کۆنەپەرستە ئەوە کابرایەک کە بۆ خۆی دەکار دابوو بۆی گێرامەوە!

ئەمما هەدەفەکە ئەوە بوو کە قازی نەیدەویست تەسلیمی پیشەوەری بێت. عروس نەیان دەویست کوردستان هیچی لێ پەیدا بێت، هەمیشە ئەگەر پێشرەفتێکیان دەکرد دەیگێڕانەوە، جا ئەوە ئەڵشان ناگوترێ بەڵام دەبێ بگوترێ ئەمن پار ئیشارەم پێکرد لەو دەمەوە توودەکراتەکان توندتر هێرشم دەکەنە سەر، ئەوە نییە هەژار دەڵێ:"دۆستە بیگانەکە ئەودەم قزە بوو..." عروسان خیانەتیان پێکرد.

**عەلی:** وەڵا مامۆستا بە داخەوە زۆرێک لە نووسەرەکان حەقیقەت ناهێنە سەر کاغەز.

**مامۆستا**: ئەوە بزانە غەیرەز کاک ئەوشیروان کە بە شەهامەتەوە ئەوە دەڵێ کەس باسی ناکا! هەژار ئەوەندەی گوتووە: دوستە بیگانەکە ئەودەم قزە بوو...

**عەلی**: دەڵێن مەلا مستەفا زۆری پێ گوتووە چووەتە بەر دەرگا بە دوایدا بەڵام لە گەڵی نەچووە؟

**مامۆستا**: مەلا مستەفا زۆری حەول داوە و زۆری پێ گوتووە، زۆر کەسی تریش پێیان گوتووە شەو کۆبوونەوەیان بووە کە چ بکەن هەموو لەوێ بوون، سەرانی حیزبی هەموو بەشداری کۆبوونەوە بوون لە مەحکەمەی پێشەوا گوتوویانە موقاوەمەت دەکەین کە چی بەیانی دەبینن ئەو لەو لاوە خۆی شاردۆتەوە، ئەو لەولاوە بۆی دەرچووە، ئەوەندە نە ئەوانە کە عروس کشانەوە، کە ئەودەم کە نیروی دەوڵەت تا قەرەموسالیان هات و گیرایانەوە بەهار بوو لەو وەختەوە سەرۆک عەشیرەکان و پیاوە ماقوولەکان پەیوەندییان بە حکومەتەوە بوو! هەموو ئیرتباتێکی ژێرزەمینیان لە گەڵ حکومەتی تاران بووە.
وەڵاهی ئەوەی بۆ تاریخ دەڵێم، کوڕێک بوو لە مزگەوتی ئێمە (مزگەوتی حاجی سەید بایزی) کولێرەی دەفرۆشت، حەمە گورگەیان پێ دەگوت ئەودەم نوکەری ئاغاکانی گەورکان

بوو دەیگوت ئەمن دە دەفعەش زیاتر کاغەزم بردووە بۆ سەقز، کاغەزەکەم لە ناو چەلەنگی رۆن، کێتەڵەی ماست ناوە، دەمگوت ماست و رۆن و پەنیرە دەیبەم دەیفرۆشم و بردوومە بۆ لای سەرهەنگێک یا کاربەدەست و شتی وای حکومەت لە سەقز، کاغەزی فلان شێخ و فلان ئاغا بووە، ئێستا پێمخۆش نییە نێویان بێنم کابرا مردووە یان تازە پیرە و... تازە فایدەی نییە، هەموو پەیوەندیان هەبوو جا شتەکە ئاوا بووە خۆ هیچی بەراستی لە گەڵ قازی محەمەد نەبووە زۆربەیان هەر بە نێو بوون و لە بنەوە لە گەڵ حکومەت بوون! ئەوجار ئەوەی دەبوو لە گەڵ قازی محەمەد بێت یانی توودەی خەڵکەکە خۆ نەیان دەهێشت لە گەڵی بێت، ئاغا رابیتی بەینی کۆماری مەهاباد بووە لە گەڵ رەعێتەکە، ئاخر ئاغایەکی کە خەڵک دەخوا چۆن دەتوانێ نمایەندەی رەعێت بێت؟! ئەوانە هەمووی عیللەتی ئەوە بوو کۆمەڵەی ژ.ک یان لەبەین برد. سەرۆک عەشیرەت و کەسانی بانفووز لە سەر کار بوون و مەسلەحەتیان لە گەڵ کۆماری کوردستان نەدەهاتەوە و پیاوە چاکەکان زۆرتریان لە ریزی خواری بوون.

**عەلی:** مامۆستا ئەمن ئەوەم بۆ پرسیارە کە بەداخەوە زۆرێک لە نووسەرانیش لەو بەشە زوو باز دەدەن ئەویش ئەوەیە: خۆ هەموو دەزانین کە پێشەوا ماوەیەک داوای بوونی ئەندامێتی لە کۆمەڵەی ژ.ک دەکرد لە پێشدا نەیان دەکرد پاشان بوو بە ئەندام بە هەر حال خۆ هەمووش دەزانین کە لە هەموو نوسراوەکانی ژ.ک ئەوان دژی ئاغا و شێخ و... بوون دیارە پێشەواش کە داوای ئەندام بوونی ژ.ک ی کردووە یانی ئەو شتانەی قەبووڵ بووە ئەدی بۆچی دوایی کە حیزبی دێمۆکرات دروست دەبێت و پێشەواش دەبێتە سەرۆک هەموو رەهبەران و کاربەدەستانی کۆمار و دێمۆکرات لە ئاغا و شێخ هەڵدەبژێردرێن؟!

**مامۆستا:** ئیشتباى ئێمە لە یەک شت دایە لە کوردستان ئەویش ئەوەیە ئەگەر کەسێکمان پێ گەورە و باش بوو پێمان وایە نابێ هیچ عەیبی هەبێت و ئەگەر کەسێکیشمان پێ خراپ بوو پێمان وایە نابێ هیچ چاکەی هەبێ، ئەوە هەڵەیێکی گەورەیە. کابرایەکی زۆریش خراپ بێت حەتا جاش بێت لەوانەیە جارێک کەسێکت بۆ رزگار بکا! ئی وا هەیە زۆر گەورەیە، ماقوڵە، خزمەتی کوردایەتیش زۆر دەکا ئەمما منافێعی تەبەقاتی خۆی مەحفوز دەکا، قازی محەمەدیش وەک شەخسییەتێکی روحانی با

نفووز و بە دەسەڵات زۆر کورد و نەتەوەپەروەر بووە بەڵام مەنافیعی تەبەقەی خۆی هەر لە نەزەر گرتووە. ئەوە نەزەرێکە لەو بارەیەوە. نەزەرێکی دی هەیە کە دەڵێن عرووسان دەیانەویست وەک لە ئێران حیزبی توودە هەیە لە ئازەربایجان فرقەی دێمۆکرات هەیە لە کوردستانیش حیزبێکی دێمۆکرات بێ کە لە ژێر نفووزی خۆیان دابێ. بۆیە هاتن تەوسیەیان کرد کە کۆمەڵەی ژ.ک بگۆڕدرێ بە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان و ئەو هەل و مەرج و قەیدوبەندەی کە کۆمەڵەی ژ.ک بۆ وەرگرتنی ئەندام قایل دەبوو ئازاد بکرێ. مەلەلیان دەگێڕا کە خەڵک ئیمزای بکا کە ناوی خۆی لە حیزبی دێمۆکرات بنووسێ. بۆچوونێکی تریش ئەوەیە کە دەڵێن کات و شەرایت وای تەقازا دەکرد کە کۆمەڵەی ژ.ک خۆی بکا بە حیزبی دێمۆکرات. فاسیلەی بەینی گۆڕانی کۆمەڵەی ژ.ک رەسمەن بە حیزبی دێمۆکرات هەتا دامەزرانی کۆماری کوردستان نزیکەی سێ مانگ بووە کە وابێ کۆمەڵەی ژ.ک کە هەڵوەشاوەتەوە ئەندامەکانی بیروباوەڕی کۆمەڵەی ژ.ک یان لە بیر نەچۆتەوە. جا بۆیە دەبینین لە کۆماری مەهاباد دا نەوعێک تێکەڵ پێکەڵی هەیە. لە لایێک دەبینین ئەفکار و ئەندیشەی کۆمەڵەی ژ.ک بەسەر کۆمار دا زاڵە وەک جەمهوری مەهاباد وەک دەنگی ئیستقلال، دەنگی سەربەخۆیی لە پەرچەم و هێزی بەرگری و بوونی کابینە و وەزارتخانە، بوونی کوردی بە زمانی رەسمی لە مەداریس و ئیدارات دا. لە لایێکی دیکەوە، دەبینین ناوەرۆکی حکوومەتەکە بە تایبەتی لە دوایی دا ناوەرۆکی خودموختاری بە خۆیەوە گرتووە کە لە بەعزێک لە ئەدەبیاتی مەقاماتی حیزبی دا، کەلیمەی خودموختاری و ئۆتۆنۆمی دەبیندرێ، هەروەک لە قەتعنامە هەشت مادەییەکەدا هاتووە کە زۆر لە سەران و روحانیان ئیمزایان کردووە. ئەوەی کە لە حکوومەتی کوردستان دا نەقشی بووە و کاربەدەست بووە سێ دەستە بوون: یەک، ئەندامانی پێشووی کۆمەڵەی ژ.ک کە بوونە حیزبی یا هەر بە موستەقیلی ماونەوە و هاوکاری کۆماریان کردووە کە بە گیان و بە دڵ خزمەتیان بە کۆمار و خەڵکی کورد کردووە. دەستەی دوو، ئەو رەئیس عەشیرەت و روحانی با نفووزی بە دەسەڵات و مالیک کە زۆرتری کارەکان لەبەر دەستی ئەوان دا بووە. سێهەم، کەسانێکی کە فکری کۆمۆنیستی و وابەستگی جیدی بە شوورەوی زاڵ بووە بەسەر بیروباوەڕیان دا و هەدەفی ئەسلییان بووە. هەرچەند لە کوردایەتیشیان دیفاع

کردووە. جا کۆماری مەهاباد لەو مەجموعەیە پێکهاتووە. قازی محەمەدیش پێشەوای کۆماری مەهاباد بووە. جا ناتوانین بلێین کە بۆ قازی محەمەد کە ئەندامێکی کۆمەڵەی ژ.ک بووە و پیاوێکی رووناکبیر و کوردپەروەر بووە بۆ ئەو سەرۆک عەشیرەت و ئەو روحانییە بانفووز و بەدەسەڵاتانەی هێناوەتە کۆماری مەهابادەوە کە لە گەڵ بیروباوەڕی کۆمەڵەی ژ.ک نەهاتۆتەوە! جا ئەوە مەعنای ئەوە نییە کە ئەوانە خزمەتی کۆماریان نەکردووە یان نەقشیان نەبووە بەڵکوو زۆریش لەوانە خلووسیان بووە. قازی محەمەد کۆمەڵەی ژ.ک ی قەبوڵ بووە ئەمما هەر ئەو کەسانەش کە دەیان گوت قازی محەمەد نەبێتە کۆمەڵە هەر زوو دەیان گوت قازی محەمەد قودرەتی هەیە، کۆمەڵەی ژ . ک دەخاتە ژێردەستی خۆی، دەنا لە بەر ئەوە نەبوو کە پێیان وابێ قازی محەمەد کورد نییە و کوردایەتی ناکا. هەر چۆنێک بێ تەقدیر و سەرنوشت وای دانابوو کە قازی محەمەد پێشەوا و شەهیدی کوردستان بێ!

**عەلی**: مامۆستا لە سەر پەیمانی سێ سنور چ دەزانی؟

**مامۆستا**: وەڵا ئەمن لە سەر پەیمانی سێ سنور هیچ نازانم هەر ئەوەی کە هەموو بیستوومانە بۆ خۆم هیچ نازانم زۆر شت لە کۆمەڵەی ژ.ک مەجهوولە. ئەودەم ئەو شتانە زۆر نەهێنی بوو لە کۆمەڵەی ژ.ک، ئەو جار حیزبی دێمۆکرات هەمیشە ویستوویەتی ئاسەواری کۆمەڵەی ژ.ک بشارێتەوە، لە هیچ کوێ نێوی نەبێ، ئەو جار ئەعزای کۆمەڵەی ژ.ک قسووریان کردووە دوای ئەوەی کە حیزبی دێمۆکرات دروست بووە پێیان وابوو کە مەسەلەکە تەواو بووە و هیچیان نەگوتووە و رابردووی خۆیان بۆ خەڵک روون نەکردۆتەوە.

**عەلی**: مامۆستا با بگەڕێینەوە سەردەمی ئێستا، ئەمن بۆ خۆم دەزانم رابیتەی مامۆستا زەبیحی و شێخ جەلال هەبوو ئایا ئەو رابیتەیە لە رێگای دەفتەری جەنابتەوە بوو یان خۆیان رابیتەیان هەبوو؟

**مامۆستا**: وەڵا لە ئەوەڵەوە لە گەڵ دەفتەری من بوو پاشان بۆخۆیان سازمانی خەباتیان پێک هێنا یانی ئەوان لێک نیزیکتر بوون تا لە من؛ شێخ جەلال کەسی لە دەورە نەبوو کە موخالیفی نیزیک بوونەوەی مامۆستا زەبیحی بێت.

**عەلی:** ئایا دروستە بڵێم دوای ئەوەی شێخ جەلال سەلبی ئومێدی لە دەفتەری ئێوە کرد، چوو بەرەو ئەوە کە حیزب و تەشکیلاتی خۆی دروست بکا؟

**مامۆستا:** بەڵێ، ئا، زۆر دروستە. ئەمن پێمخۆش نەبوو مەلا شێخ جەلال حیزب دروست بکا، چونکە لەو باودۆخەدا بۆی نەدەکرا حیزبێکی ئیسلامی میللی موسەلەحانە دروست بکا چونکە پێویستی بە ئینسانی موخلیس و لێهاتوو و موسلمان بوو. ئەو حیزبێکی وا کە ئایەندەیێکی ببێ پێی هەڵنەدەسوورا. بەڵام مەلا شێخ جەلال ئینسانێکی ئازا، کورد و باسەواد و موئمینە و زۆریش لە ڕێی کوردایەتی دا هەم لە زەمانی شا و هەم لە زەمانی ئینقلاب دا خزمەتی کردووە، خوسوسیاتی باشی یەکجار زۆرە، ئەمما زۆر سوئی ئیستفادەی لێ دەکرێ. ئەو جار مامۆستا زەبیحی کە لە مەهاباد ڕۆیشت رابیتەی لە گەڵ من قەتع بوو.

**عەلی:** یانی رابیتەی لە گەڵ دەفتەری مامۆستا هەر نەما؟

**مامۆستا:** رابیتە لە گەڵ من. خۆ مامۆستا زەبیحی قەت رابیتەی وای لە گەڵ دەفتەر نەبووە، نە بە کاغەز و نە هیچ. مامۆستا زەبیحی هەر چۆن لە گەڵ حیزب نەدهاتەوە، لە گەڵ کۆمەڵە نەدەهاتەوە، لە گەڵ ئەو جەماعەتەی دەوری منیش هەر نەدەهاتەوە. ئەمن ئەلئان زۆر لە جاران باشتر تێدەگەم. ئەگەر ئەوجورەی کە ئێستا هەم ئەودەم بامایە هەموو شتێک نۆعێکی دیکە دەبوو مەسئەلەکە زۆر فەرقی دەکرد. ئەمن قەد ئەم دەزانی ئەسڵەن جەماعەتێک کە هاومەرامن، دەشتوانن نسبەت بە یەکتر ئەوەندە خراپە بکەن! نسبەت بە یەک بەدبین نین! هەر بەڕاستی پێموابوو حیزبی دێمۆکرات، ئەو سازمانانە بە حەددێک لە گەڵ یەکتر، خۆ بە خۆ پاکن قەت ئەو شتانە نسبەت بە یەکتر ناکەن. خۆ ئەمن ئەو شتانەم نەدەزانی، دیارە ئەمن کورد بووم و کوردایەتیشم کردووە و زەربەشم لە سەر کوردایەتی خواردووە، ڕژێمی ئێرانێ زۆری ناخۆش دەویستم ئەمما ئەمن سیاسەتم ئاوا نەدەزانی!

یەکێک لە عولەماکانی گەورە زەمی ئەوجۆرە سیاسەتە دەکا دەڵێ: پەنا بە خودا، لە سیاسەت و لق و پۆپەکانی، لە سینەکەی و لە ددانەکانی. جا مەنزووری ئەو سیاسەتە غەڵەتەیە کە ریعایەتی هیچ ئوسوولێکی تێدا ناکرێ. ئێستا دەزانم بۆ وا دەڵێ، دەزانم

ڕاست دەکا ئەمن پێموا نەبوو سیاسەت ئاوایە، بەڵام سیاسەت لە کوردستان و لەو وڵاتە دواکەوتوانە ئاوایە، ئەڵئان چاو لێ بکە لێرە (ئوروپا) سیاسەت زۆری فەرق هەیە لە گەڵ لای ئێمە، بەڵام لەوێ لە لای خۆمان درۆ دەکەن، ئەمن ئەو دەم دەمدیت بەیانی لە خەو هەستاوی درۆیەکیان بڵاو دەکردەوە، هەزار قسە بە نێوی من بڵاو دەبۆوە و بۆ پێشرەفتی کاری خۆیان و شکستی تەرەفەکەیان لە هیچ شتێکی نەدەپرینگانەوە.

**عەلی:** ئەو حیزبەی قەرار بوو دروست بکرێ بە نێوی ئێوە چتان لە بیر ماوە، ئەسڵەن چۆن بوو، کێ نووسی و قەرار بوو چۆن بێت؟

**مامۆستا:** مامۆستا زەبیحی نووسی و نووسراوەکەی لە لای کاک محەممەدی موهتەدی هەیە ئەگەر بتداتێ باشە.

**عەلی:** ئەو سەردەم کە لە بێژوێ خەریکی ئەو حیزب دروست کردنە بوون ئایا کاک محەممەدتان لە گەڵ بوو؟ ئەو چی لە سەر ئەو حیزب دروست کردنە دەگوت؟

**مامۆستا:** با، پێموایە لە گەڵمان بوو، وەڵا ئەو پێی خۆش بوو.

**عەلی:** قەرار بوو چون بێت ئایا وەک حیزبێک وەیان وەک چی؟

**مامۆستا:** قەرار بوو بەرەیەک بێت زۆر فوشوردە نەبێت خەڵک بخاتە چوار چێوەیەکەوە، بەرەیەکی گشتی بێت وەک ئەوەی یەکێتی نیشتمانی (خەتی پان).

**عەلی:** ئایا ئێوە لە گەڵ هەموو شتەکانی موافیق بوون یان موناقشە و شت کرا یان هەمووی هەر حازر و نووسرا بوو؟

**مامۆستا:** ئەرێ وەڵا، گەلالەیێکی باش بوو بەڵام بەداخەوە نەگونجا.

**عەلی:** مامۆستا پاشی ئەوەی کە مامۆستا زەبیحی بزر بوو ئێوە چتان بیستووە و یان چتان بۆ کردووە؟

**مامۆستا:** وەڵا ئەمن کە بیستم زۆرم پێ ناخۆش بوو لە گەڵ شێخ جەلالیش بەحسمان کرد و پێمگوت ئەتۆ بپرسە، تەحقیقێک بکە بزانە چۆن بووە؟ ئەویش گوتی لەو کابرایەم پرسیوە و ئەویش رەنگێکی هیناوە و بردووە و چی نەگوتووە بەڵام ئەمن یەقینم هەیە لە بەغدا تێدا چووە، کوشتوویانە وەک هەموو کەس کە شورت و گووم دەبێ هەر پێشموایە لەو ناحییەوە کە داویان بۆ داناوە و....

**عەلی:** مامۆستا پرسیارێک هەیە ئێوە پێتان وایە بۆ چی مامۆستا زەبیحی دوای کۆمار لە گەڵ کوردی ئێران هەر نەگونجا و هەر ئیشی نەکرد؟

**مامۆستا:** ئەو ئەسڵەن حیزبی دێمۆکراتی بەر دڵ نەدەکەوت و لێی رازی نەبوو. پێی وابوو، حیزبی دێمۆکرات بەشێک لە حیزبی توودەیە جا منیش پێموایە. دوکتۆر قاسملو نەقشی چاکی بوو کە حیزبی دێمۆکراتی لە حیزبی توودە جوێ کردەوە.

مەلا عەوڵلا و دوکتۆر شەرەفکەندی کاری باشیان کرد کە حیزبی دێمۆکراتیان دوور خستەوە لە حیزبی توودە. دیارە فەرهەنگی توودە هەر بوو لە ناو حیزبی دێمۆکرات، بەڵام لە باری تەشکیلاتی و سەربەخۆبوونەوە دووریان خستەوە لە حیزبی توودە.

**عەلی:** باشە مامۆستا، هەروەک دەزانین زەبیحی کە هاتەوە دیارە دوژمنی هەبوو بەڵام دۆستیشی زۆر بوو وە کاریشی دەکرد، ئایا پێتان وایە ئەوە تەنیا لە زیرەکی دوژمنەکانی بوو کە تێدا چوو یان دوستەکانیشی ئەوە نەبوون کە بتواندرێ لە سەریان حیساب بکرێ؟ چون ئەمن پێموایە هەڵەی سیاسی کرد و تێشدا چوو! هەر ئەو کارە بوو بە باعیسی مەرگی!

**مامۆستا:** مامۆستا زەبیحی بۆ ئەو کارەی پێیان کرد نەدەبوو، مامۆستا زەبیحی ئینسانێک بوو کاری وی کاری سیاسی بوو، کاری ئەو ئەوە نەبوو کە رابیتە بێت و بچێت چەک بێنێ و... ئەو کاری ئەوە نەبوو کاکە! کاری مامۆستا زەبیحی کارێ سیاسی بوو، هەر کەسە شەخسیەت و بلیمەتی لە یەک شتدا هەیە، مامۆستا زەبیحی قەد ئەوە نەبوو یەک فیشەک باوێ، کاری ئەو نەبوو، بەربەرەکانی قەت لە گەڵ هیچ کەس نەکردووە غەیرەز بەربەرکانی بە نووسین و بە قەڵەم و سیاسەت. ئەو هەموو شەڕە بوو لە کوردستانی عێراق قەت لە هیچ کۆیەک ئەو وەک شەڕکەر نەبووە، بەڵام بە بیروباوەر و بە قەڵەم شەڕی لە گەڵ دەکردن و موبارەزی دەکرد، ئەو کارە کاری ئەو نەبوو ئیشتبای گەورە ئەوە بوو کە ناردیان بۆ ئەو کارە، ئەوە ئیشتبای گەورە بوو بەڕاستی! وە شتەکەش ئەوە نەبوو بە عومووم، بەڵام بیری لێ نەکراوە. مامۆستا زەبیحی ئەو ئینسانە نەبوو، مامۆستا زەبیحی دەبوو بیهێنی کاری سیاسی پێ بکەی، مامۆستا زەبیحی کوا بۆ ئەوە دەبوو بینێری بۆ دەوڵەتی بەعس و ئەو هەمووە چەکەی پێ بهێنی.

**عەلی:** لە سەر حامید بەگی جوانڕۆ چ دەزانن؟ رابیتەی ئەو و زەبیحی چۆن بوو؟

**مامۆستا:** ئەمن زۆر نازانم هەر ئەوەندە دەزانم چریکەکان گرتیان و کوشتیان، دوایە شیخ جەلال زۆری حەول دا و زۆری یارمەتی ژن و منالی دا. ئەوەی من بیستوومە عەولای ئیقدامی دەخالەتی تیدا بوو.

ئەوجار لە لایەکی دیکەوە کەس هیچی بۆ نەکراوە، هەر هەموو شکەستیان خواردووە، هەموو نەیزانیوە، خۆ حیزبی دیمۆکرات ئەو هەموو ئینسانە گەورانەی لە دەست داوە، هەر وەدووی ئەوە کەوت خومەینی حەقی بداتێ! خۆ هیچی نەدایە! هەموو پیاوە گەورەکانیشی بە کوشت چوون!

ئەو شکەستە، شکەستی یەک نەفەر و دوو نەفەر نییە، هەموو ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی لە بەرامبەر جەمهوری ئیسلامیدا شکەستی خوارد و یەک دوو نیرو و جەهەتێک و دوو جەهەت نییە، هەر هەموو لە موقابیل واندا شکەستیان خواردووە، ئەمما لە کوردستان گەورەترین زەربە ئەوە بوو کە ئێمە ئەو کەسانەی لە دەست خومەینی هەڵ دەهاتن ئی ئێمە نەبوون، ئێمەش باوەشمان بۆ دەگرتنەوە و لە باوەشی خۆمان داویشتن، ئەوە یەکێک لە گەورەترین هەڵەکانە، ئەوە ئێستاش دەستی لێ هەڵناگرین، ئەوەنییە هەر ئێستاش وادەکەین!

ئەمن دەڵێم ئەوجار ئەگەر شتێک لە کوردستانی ئێران ببێ دەبێ حەرەکەتی میللی بێ، غەیرە حەرەکەی میللی حەتمەن روو بە شکەستە، پاریش بۆ پەیامی نەورۆز گوتم لەوەی بەولاوە دەبێ دەرس وەربگرین و خۆمان بین و غەیرەز خۆمان هیچکەس ڕێگا نەدەین! مەنزوورم ئەوەیە کە میللەتی کورد بۆخۆی بۆ مەسئەلەی میللی و بەدەست هێنانی حقوقی نەتەوایەتی کار بکا و لە گەڵ بێگانە تێکەڵ نەبێ و ئیعتیماد بەوان نەکا.

هەر بە کۆمەڵە کە ئەو جەماعەتە هاتن(مەنسوری حیکمەت و ...)رۆژی هەوەڵ پێمگوتن لە خوراسانەی بوون هاتن گوتم مەیکەن، ئیشتبا دەکەن! هەر رۆژی هەوەڵ منیش و مام جەلالیش لە سەر ئەوە موتتەحید بووین پێمان گوتن مەیکەن، لە گەڵ وانە تێکەڵ مەبن، ئەوەندەی من نەسیحەتی کۆمەڵەم کردووە کە گلەم نەیەتەوە سەر. زۆرم پێ خراپ بوو، زۆرم پێ ناخۆش بوو!

**عەلی:** باشە مامۆستا! کۆمەڵە ئێستا کە بۆی دەرکەوتووە بۆ رەخنەیەک لە خۆ ناگرن؟

**مامۆستا:** ئەوە پرسیارێکە دەبێ لە خۆیانی بپرسی!

**عەلی:** پێتوایە مامۆستا زەبیحی بە چ هۆیێک لەبەین چوو؟

**مامۆستا:** ئەمن شکم لەوە دانییە کە تۆتەنە بوو، گوزارشی لێدرا بوو، کە گەراوە تەحتی تەعقیب بوو و دوو هۆ لە نێو خەڵک دا باس دەکرێ. یەک کە دەڵێن لە گیرفانی دا نامەی مام جەلالی لە باغەڵ دابووە کە ئەوە نازانم راستە یان نا؟ هۆیەکی دیکە ئەوەیە کە وەختێکی چوون و ئەو ئەسلەحەیان هێناوە و قیسمەتێکی زۆری کەوتۆتە دەست یەکێتی نیشتمانی، لەسەر ئەوەی موتەهەم بووە و لەبەر ئەوەی ئێعدام کراوە. دیارە ئەوەش وێدەچێ وابێ چونکە ئینسانی خراپ لە دەوروبەریان بووە و شتی ئاواش ناشاردرێتەوە و بەهەر شێوەیێک بێ دەگاتەوە بە مەرکەز. جا ئەوە هۆی ئەوە بووە کە شەهید بێ.

**عەلی:** زۆر سپاس مامۆستا، ئامۆژگاریتان چییە؟

**مامۆستا:** وەلا حەول بدە هەر چی مامۆستا زەبیحی نووسیوێتی وەدەستی بخە لەلای مام جەلال و... ئەو جار ژیانی خانەوادەگی و لە سەر کۆمار و کۆمەڵەی ژ.ک و....

ئەوجار بزانە ئەو شتانەی نووسیوێتی وەک قامووسەکە لە لای کێیە؟ هەر چەند تا بەعسی عێراق نەرووخێ زۆر شت دیاری ناکا. ئەوجار هەر کەس قسەت بۆ دەکا، ئەمنیش کە قسەم بۆ کردووی تەحتی تەئسیری قسەکان واقیع مەبە بۆ خۆت تەحلیلی بکە و لێکی بدەوە، چون دەبێ ئەگەر شت دەنووسی جەنبەی عیلمی هەبێت، دەبێ لێکدانەوەت هەبێت هەر کەس لە سەر بینشی خۆی قسە دەکا، حەتا ئەگەر بۆت بکرێ لە گەڵ چەند نەفەرێک ئەو کارەی بکە.

**عەلی:** مامۆستا گیان زۆر، زۆر سپاس و زۆر مەمنوونم بۆ ئەو وەختەی بۆت تەرخان کردم.

**مامۆستا:** زۆرم پێخۆش بوو، وەلی ئەسڵێن ئەتو کە ئەو هەمووە کارانەت کردووە، ئەمن پێموانەبوو، تو یەکجار زۆرت بۆ ئەو شتە کار کردووە، ئەمن ئەسڵەن

پێموانەبوو ئەتو ئاوا جیددی وەدوای کەوتووی، ئەوەی کردووتە یەکجار زۆرە، بەڕاستی زۆرم پێخۆشە، بیستبووم شتێکی وات بە دەستەوەیە وەلی پێموانەبوو ئاوا بە ڕێک و پێکی و جیددی کردووتە.

**عەلی:** وەڵا ئەمن یەک هەدەفم هەیە، ئەویش ئەوەیە تا ئەو جێگایەی دەکرێ مێژوو بۆ منالانی ئێمە بەڕاستی بنووسرێ و ببێتە دەرس بۆ نەسلی داهاتوو، پێمخۆش نییە تاریخ تەنیا تەعریف و تەمجید بێ، پێمخۆشە حەقیقەتەکان روون بکرێنەوە.

**مامۆستا:** دیارە ئەوە ئامانجێکی گەورەیە و پیرۆزە و ئومێدەوارم ئەوانەی دەست دەبەنە قەڵەم ئەو ئامانجەیان هەبێ.

**عەلی:** دیسان زۆر سپاس.

# نامەی کاک سەلاحوددینی موهتەدی

خۆشەویست و بەڕێز کاک عەلی کەریمی

نامــەی دووهەمت گـەیشت و چاوم روون بۆوە. ســوپاس بۆ ئەوەی بە سـەرت کردوومـەوە، سوراغت گرتووم و پرسیارت لێکردووم. بۆ ئاگاداریت نامەکەی یەکەمیشت کە زووتر نەمدیبوو سەرەنجام دۆزرایەوە!

من هەوڵ دەدەم سـەبارەت بە مـامۆستـا زەبیـحی چیـدەزانم و چەندم ئاگـا لێیـە، بە کورتی بەڵام بە رۆشنی بیخەمە بەردەستت.

هەندێک لەو زانیاریە -کە رەسمی و گشتین- لە راستیدا بەشێکن لە بەسەرهات و مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد، چونکە زەبیحی خۆی یەکێکە لە یاریکار و پاڵەوانەکانی سەر شانۆی سیاسەتی کورد بە درێژایی نزیک بە نیو سەدە.

ئێسـتـا کە تۆ قۆڵت لێهەڵماڵیوە بۆ کۆکـردنەوە و سـاغکردنەوەیان جێگای رێز و سوپاسە.

هەندێکی دیکە پێداچوونەوە و زیندوکردنەوەی برێک یاد و یادگاری خۆشەویستی خۆ من کە ئەگەر جار و بار و بە دەگمەن، وەها بۆنە و بیـانوویەک هەڵنەکەوێ، کێ بڵێ، لە حەشارگەی دڵەوە یەکسەر بارگە لێ نەنێن بۆ هەوارگەی گڵکۆ؟!

بۆ بـووژاندنـەوە و هاروژاندنی هەنگی بیـرەوەریەکـانم، بۆ وەگـەڕ خـسـتنـەوەی قەڵەمی شەکەت و شکاوم دیسان سوپاس!

لێت پرسیوم: چۆنم زەبیحی ناسی و لە کوێ یەکەم جار چاوم پێی کەوت؟

دوو کەس لە ژیانی منداڵیمەوە، لە ناو خێزان و بنەماڵەی ئێمەدا حازری غـایب بوون. حـوزوورێکی بێ پسـانەوەی بەردەوامیـان هەبووە بێ ئەوەی خـۆیان لە وێ بن: زەبیحی و هەژار.

لە دانیشتن و باسکردن، لە گێڕانەوەی نوکتە و بیرەوەری، لە شێعر خوێندنەوە و کێشەی سیاسیدا - کە هەمیشە بازاڕیان گەرم بوو چە لە کۆڕی ناوخۆ و چە لە مەجلیسی میوانداری دیوەخاندا - هەرگیز سایەی سنگینی ئەو دوو ناوە، نە وەلانراوە و نە لە یادکراوە.

هەموو وردەکاری سەبارەت بە ژیان و بەسەرهات و رەفتار و گوفتار و قەد و باڵا و سەر و سیمای ئەو دوانە لە ئاوێنەی خەیاڵمدا نەخشی بەستبوو.

هەر بۆیەش کاتێک خۆم گەورە بووم و هاتمە ناو کۆڕی خەبات و کوردایەتی و پاشان چوومە رێزی شۆڕش لە کوردستانی عێراقدا و لەوێ ئەو دوو پیاوە ئەفسانەیی و ئەفسوناویەم دیت، هەروەک کتێبێک وابوون هێندەت پێشەکی و رەخنە و لێکۆڵینەوە لەسەر خوێند بێتەوە، بەر لە دیتن و بە دەستەوە گرتنی دەزانی چەند لاپەرەیە و چەند فەسڵە و لە کوێ باسی چیدەکا!!

من چەند مانگێک بوو لەسەر بڕیاری «کۆمیتەی بەڕێوەبەری یەکیەتی خوێندکارانی کورد لە زانستگاکانی ئێران» و «کومیتەی تارانی تەشکیلاتی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران» کە لە یەکەمین دا ئەندامی دامەزرێنەر و لە هەر دووکیاندا ئەندامی بەرێوەبەر بووم چووبووم بۆ کوردستانی عێراق کە هەروا ساڵێک کەمتر بوو شۆڕشی چەکدارانەی ئەیلوول دەستی پێکردبوو.

کاتێک لە بەغدا کودیتا کرا و عەبدولکەریم قاسم کوژرا و عەبدولسەلام عارف و حیزبی بەعس هاتنە سەرکار من لە گەڵ سەید عەبدوڵای ئیسحاقی (ئەحمەد تۆفیق) و سولەیمانی موعینی (فایق ئەمین) لە لای مەلا مستەفا بارزانی بووین و تازە خەریک بووین لە ناوچەی ئاکۆ و پیرانەوە بپەڕینەوە بۆ سەنگەسەر و پشدەر.

شەر وەستا، تەقەی تۆپ و تەیارە بڕا و زۆری پێنەچوو گوفتوگۆی کوردان لە گەڵ دەوڵەتی تازەی بەغدا دەستی پێکرد.

لە گەڵ وەفدێکی تێکەڵ لە نوێنەرانی رێکخراوەی حیزبی و پیاوانی سیاسی و کۆمەڵایەتی عێراق بە ناوی "وەفدی شەعبی" چەند کەسێکیش لە کوردەکانی بەغدا دەرفەتیان هێنا و خۆیان گەیاندە کوردستان. بەمجۆرە لە شاری "چوار قورنە" بۆ یەکەم جار

چاوم بە هەژار کەوت و "ئەمە چەرخی بە هەمـوو ژینم دا"! ئەم چاو پێکەوتنە بوو بە مایەی پێکەوە ژیان و هاومالییەکی چەند سالەمان و تا کاتی گەڕانەوەی من بۆ کوردستانی ئێران (١٩٦٥) مەگەر ئیش و کاری پێویست لێکی جیا کردبینەوە دەنا لێک دانەبڕاوین.

کاتێک جەولەی پشدەر و بیتوێن تەواو بوو، نۆرەی کۆیە هات کە هەم یەکەمین نەورۆزی بە ئازادی لێ بگیرێ و هەم یەکەمین کۆنگرەی گشتی شۆڕشی کوردستانی تێدا ببەسترێ.

ماوەی مانەوە و حەسانەوەمان لەو شارەدا تەواو توولانی بوو، دیار بوو خانەخوێی روو خۆش و مالخۆش دنەی میوانی تامەزرۆ و ژەم مردووی دەدا کە خۆی بە وردەکارانەوە خەریک کا و مالاوایی وەدوا بخا.

مامۆستا هەژار و من لە گەل جەماعەتی تایبەتی دەوروبەری مەلا مستەفا لە مالی «کاکە زیاد» میوان بووین و من بە چاوی خۆم هەموو ئەو شتانەم دەدیت کە کاتی خۆی لە زمان بابم و خزمەکان و خەلکی دیکەش سەبارەت بە بەخشەندەیی و دلاوایی و بالا دەستی «حەمە ئاغای کۆیە» بیستبووم و لەسەر دەمی لاوی و مێردمندالیدا هەر وام دەزانی کە شێعر و نەقل و نوکتەی سەبارەت بە حەمە ئاغا، چیرۆک و ئەفسانەیە و وەک باسی ئازایەتی روستەم و سەخاوەتی حەتەم تەنیا بۆ گەرم کردنی مەجلیس و پەروەردە کردنی لاوان دەگێڕدرێتەوە!! بەلام ئێستا ئەو شتانەی لە خەون و خەیالی مندالانەمدا سالەها کوروشمەیان کردبوو وا خەریک بوون دەبوونە واقیع و وەدی دەهاتن:

مەلا مستەفای بارزانیم هەموو رۆژێ دەدیت و لە مەجلیسی دادەنیشتم و نامە و فەرمانەکانیم دەنووسین. کاکە زیادی کوڕی حەمە ئاغای کۆیە خانە خوێمە، هەژار هاودەمی هەمیشەییمە و وا ئێستا نۆرەی زەبیحی یە!!

کۆیە یەکەم دیدار:

من لە گەل مامۆستا هەژار بۆ نوستن و حەسانەوە دەچووینە مالی «مام قادر» کە زۆر خۆشەویست و بەرێز بوو لە لای کاکە زیاد و هەر لە بەشێک لە قەسرەکەی کاکە زیاد دا گۆشەیەک بۆ ژیانی خۆی و مال و مندالی تەرخان کرابوو. چەند رۆژی یەکەم

نەمدەزانی مام قادر کێیە بەڵام دەمزانی کوردی ئێرانە و ناشیەهەوێ زۆر لەسەر رابوردووی خۆی قسە بکا. ماڵی هەژار ئاوەدان بێ چما دەیهێشت کەس بە نهێنی و نەناسراوی بمێنێتەوە؟ بەڵێ مام قادریش لە کۆنە پیاوەکانی دەورەی جومهووری کوردستانە و هەر ئەو کەسەیە کە من زۆرم شت لەسەر بیستوە. ئەوە «سەعیدی حەمە قالەی» مەشهوورە کە دەگوترا یەکەمین و تەنیا ترۆری سیاسی دەورەی جومهووری ئەنجام داوە و تەقەی لە «مەحموودیان» کردووە و دوای رووخانی کۆمار رووی کردووەتە کوردستانی عێراق.

ماوەیەک لە پشدەر و بیتوێن خەریکی کشت و کاڵ و تووتنەوانی و سەوزیخانەداری بووە و سەرەنجام بە ناوی «مام قادر» لە لای کاکە زیاد لە کۆیە خۆی گرتووەتەوە. مام قادر دەوڵەمەند نەبوو، بە کاری رۆژانە و ئارەقی ناوچاوانی خۆی لە رێگای باغەوانی و گوڵکارییەوە دەژیا، بەڵام هەر چیم لە هەرکەس بیستبوو یا لە هەر کتێبێک دا خوێند بووە لەسەر جوامێری و ماڵخۆشی و پیاو چاکی و دڵپاکی هەموویم لەو پیاوە و ژن و منداڵە میهرەبانەکەیدا بەدی کرد کە خۆی پەنا نشین بوو بەڵام ببوو بە داڵدەی ئاوارە و هەژاران!

ئێوارەیەک مام قادر پێی راگەیاندین کە مامۆستا هەژار و من زووتر دیوەخانی کاکە زیاد بە جێ بهێڵین و بۆ نانی شەو بگەڕێینەوە ماڵی ئەوان.

لە بەردەرگای ماڵی مام قادر، پێیەک لە ژوورێ و پێیەک لە سەر ریسمەی دەرگا، کابرایەک بە جل و بەرگی ئەفەندی یەوە، دەستە پیاو رەشتاڵە، سەر کەمێک رووتاوە، لچ و لێو ئەستوور و پڕ لە زەردەی پێکەنین بەرامبەرمان راوەستا بوو. مامۆستا هەژار لە پێشەوە بوو، یەکتریان لە ئامێز گرت و ئەوجار نۆرەی من هات:

– "پێش ئەوەی ماچت کەم با لێت بپرسم ئەو کاتی من لە کوردستانی ئێران بووم کاکە رەحمان کوڕێکی منداڵی هەبوو ناوی سەلاحوددین بوو تۆ هەر ئەوی و ناوی خۆت ناوە «مستەفا» یا کوڕێکی دیکەی"؟

دیار بوو مام قادر ئەوەندەی زانیبووی بۆی گێڕابۆوە. باس و بیرەوەری یە کۆنەکانم بۆ زیندو بوونەوە و زانیم خەونێکی دیکەی دێرینم هاتۆتە دی

– "مستەفا چی لە بێژەن کەمترە"؟

- "ئافەرین دیارە وەک بابت زیرەکی"!

هەژار هەڵیدایە: "هەرچی لە مشکی بێ هەمبانەی دەبڕێ"!

شەو و ڕۆژێک پێکەوە بووین. زەبیحی بە نهێنی هاتبوو دەبوو زوو بگەڕێتەوە.

لەو ماوەدا جگە لە زۆر نەقڵی کۆن و نوێ و گاڵتە و نوکتە کە ئەو سێ پیاوە ناودارەی دەورەی ژ . ک و جومهووری دەیان گێڕایەوە و منیش گوێگرێکی گەنجی ئارەزوومەند بووم، چەند نوکتەم لە مامۆستا زەبیحی و هەژار بیست کە خۆم قەتم لە بیر ناچێتەوە و بۆ تۆش کە بیۆگرافی نووسی زەبیحی، زانینیان پێویستە:

١- هەر کە کودیتای دژی عەبدولکەریم قاسم دەستی پێکردووە، ژمارەیەکی زۆر ئەفسەر و فەرماندەی لەشکر بە تایبەت هێزی هەوایی و فڕۆکەخانەی کەرکووک ویستوویانە لە دژی کودیتا ڕاپەرن و بە یارمەتی کوردان کەرکووک بگرن، زەبیحی کە مەسئوولی کەرکووک و بەغدا بوو لە ناو پارتیدا، لە گەڵیان ڕێک دەکەوێ و نەخشەکە دەکێشێ و ئەم خەبەرەش رادەسپێرێ و داوای وەڵامی بە پەلە دەکا. مەکتەبی سیاسی پارتیش داوای موافەقەتی سەرۆک دەکەن، بەڵام مەلا مستەفا پێشنیارەکە پەسند ناکا و پیلانەکە سەر ناگرێ.

٢- لەسەر نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری نیشتمان دەیگوت:

"لەسەر داخوازی کۆمەڵەی ژ.ک کاک قاسمی ایلخانی زادەماڵێکی بەکرێ گرتبوو لە تەورێز کە بە ڕواڵەت مەنزڵ و دیوەخانی ئەو بوو، بەڵام لە واقیعدا شوێنی دەستەی نووسەرانی نیشتمان بوو. دوای ئەوە کە گۆڤارەکە ئامادەی چاپ دەبوو، دەبرایە چاپخانەیەک کە سەر وە «خەلیفەگەری ئەرامنەی ئازەربایجان» بوو لە تەورێز و لەوێ چاپ دەکرا. جارێکیان میوانێکی زۆر هاتن و هەندێکیان سەرۆک عەشیرەت و پیاوی کۆنەپەرستی ناسراو بوون کە بە دەستووری دەوڵەتی ئێران لە هەموو جێگایەک دەگەڕان و جاسووسیان وە وڵاتی خستبوو بزانن سەرۆکەکانی کۆمەڵە کێن و نیشتمان لە کوێ چاپ دەکرێ. من و هەژار و دڵشادی ڕەسووڵی لە ژووری پەنای ئەم دیوەخانە خەریکی نووسین و ڕێکخستنی نیشتمان بووین و دەرگایەکمان لەبەیندا بوو کە لە لای خۆمانەوە دامان خستبوو نەوەکوو کەسێک دەستێکی پێوە نێ و بکرێتەوە. گوێمان لێبوو باسی کۆمەڵە

دەکرا و سەرەنجام قسە گەیشتە سەر نیشتمان. یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان کوتی: وەک بیستوومە ئەو رۆژنامەیە هەتیوی سۆفی مینە و هەتیوی مەلای بۆر هەڵیدەسوورێنن! کاک قاسمیش کوتی: باوەڕ ناکەم وابێ، ئەو رۆژنامەیە مەقالەی زۆر موهیمی تێدایە، حەتمەن پیاوی زۆر گەورە و زانا دەینووسن، بەڵام ئەگەر راست بێ و ئەو دوو هەتیوە خوێرییە بە سەری رابگەن دەوڵەتی ئێران نەدەبوو لێیان بترسێ و خۆشیان تێ بگەیەنێ! ئێمە گوێمان بە دەرکەوە نابوو دەستیشمان بە دەممانەوە گرتبوو ناکا خۆمان پێ رانەگیرێ و پرمەی پێکەنینی ئێمە ئەو شاکارە سەیر و گرینگەی نهێنی کاری کۆمەڵە ئاشکرا بکا".

٣- یەکێک لەو ئەقڵانەی گرینگی مێژوویی هەیە بەڵام لەو مەجلیسەدا هەژار هەر لە بەرگی گاڵتە و نوکتەدا دەیگێڕایەوە ئەوە بوو: کاتێک زەبیحی دەکەوێتە بەر بێ میهری و تووڕەیی پێشەوا قازی محەممەدەوە، هەژار دەچێتە لای پێشەوا و دەست دەکا بە گێڕانەوەی نوکتەیەکی سەیر کە بەسەر سەیدە شینەی خاڵۆزای هاتبوو، لە جەنگەی دڵشادی و پێکەنینی پێشەوادا هەژار داوای لێخۆشبوون و ئازادی و ئاشتبوونەوە لە گەڵ زەبیحی لێدەکا و پێشەواش قەبووڵی دەکا. بەڵام لەسەر چی پێشەوا لە زەبیحی تووڕە بوو؟

ئەوەی لە کاتی گەنجی و لە بنەماڵەی خۆمانم بیستبوو، هەر ئەوە بوو کە ئێستا هەژار بۆی دەکوتم:

زەبیحی دامەزرێنەر و بەڕێوەبەر و شەخسی یەکەمی کۆمەڵەی ژ. ک بووە، بەڵام پێش دامەزرانی کۆمەڵەش هەژار هەر هاتوچووی ماڵی زەبیحی کردووە. ئەو کاتەش زەبیحی لە ماڵی خۆیان ژوورێکی ناو ناوە «وەتاغی سوور» و لەوێ کتێبی خوێندووەتەوە و مەشقی مەقالە نووسینی کردووە. هەژار کە بە تەمەن چووکەتر بووە زۆر کەوتووەتە ژێر تەئسیری بیر و بەرنامەکانی زەبیحی یەوە. وا دیارە پەیوەند لە گەڵ حیزبی هیوا و بانگ کردنی ئەفسەرانی ئازادیخوازی کوردستانی عێراق بۆ بەشداری کردن لە دامەزراندنی کۆمەڵە، نەخشەی زەبیحی بووە و زۆر کار و پەیوەندی سیاسی و میللی و دیپلوماسی گرینگ کە هەمووی لە ژێر رێبەریی زەبیحی دا کراوە. ئەو دەور و دەسەڵاتەی زەبیحی

بەردەوام بووە تا کاتی ئەندامەتی پێشەوا قازی محەمەد لە ناو کۆمەڵەی ژ.ک دا
قازی محەمەد داوای ئەندامەتی دەکا و زەبیحی لە دژی ئەم داوایە رادەوەستێ و
زۆربەی سەرکردایەتی ئەو کاتەی کۆمەڵە لەو هەڵوێستەی زەبیحی پشتیوانی دەکەن.
پاشان نۆرە دەگاتە روسەکان کە بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە و بۆ زەبیحی فشار دێنن و
ئەم گێرە و کێشەیە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ و سەرەنجام زەبیحی و سەرکردایەتی کۆمەڵە
تەسلیم دەبن و قازی محەمەد لە ژێر نازناوی «بینایی» دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک.
ئەم هەڵوێستە سایەیەکی سارد و سەنگین دەخاتە سەر پەیوەندی شەخسی نێوان پێشەوا و
زەبیحیدا. هۆی دووهەم دەگەڕێتەوە سەر جیاوازی ستراتیژ و دوورنومای سیاسی ئەو دوو
شەخسییەتە. لە کاتێکدا زەبیحی لایەنگری یەکگرتنەوە لە گەڵ پارچەکانی ـیکەی
کوردستان و راگەیاندنی سەربەخۆیی بووە، پێشەوا لایەنگری هاوکاری لە گەڵ گەلانی
دیکەی ناو ئێران و وەرگرتنی خودموختاری یا هەر چەشنە مافێکی مومکین لە چوارچێوەی
ئێراندا بووە. نە پێشەوا دژی هاوکاری لە گەڵ پارچەکانی دیکەی کوردستان بووە و نە
زەبیحی دژی هاوکاری لە گەڵ گەلانی ئێران، بەڵام هە دووکیان وەک دوو سیاسەتمداری
خاوەن نەزەر، لایەنگری دوو ستراتیژی جیاواز بوون و هەر بۆیەش "سەر پشکی یەکەم" یا
"اولویت"ەکانیان یەکی نەدەگرتەوە.

تاران، دیداری دووهەم

من لە سەرەتای سالی ١٣٤٤ شەمسی بەرامبەری ١٩٦٥ میلادی دوای ئەوەی
کە رێگای هەموو هەڵسووڕانێکی سیاسیم لێ بەسترا و دەرگای کاری نهێنیشم بە هۆی
چاوەدێری توندی ئەحمەد تۆفیق و دەسەلاتی تاقانەی بارزانی و وەرچەرخانی سیاسەتی
ئێران بەرەو پشتیوانی لەو دەسەلاتە نوێیە، لێداخرا بریارم دا بگەڕێمەوە ئێران و دەستم
کرد بە تەواو کردنی خوێندنە نیوە چڵەکەی دانیشکەدەی حقوق لە زانکۆی تاران.
مەکتەبی سیاسی پارتییش کە پێشووتر لە دژی رێک کەوتنەکەی مەلا مستەفا و
عەبدولسەلام عارف دەستیان دابووە چەک، لە بەرامبەر هاوکاری سیاسی و عەسکەری
بارزانی و بەغدادا تاق مانەوە و پشتیوانیی ئێرانیش بە درۆ دەرچوو، ناچار پاشەکشەیان
کرد بۆ ناو خاکی ئێران و لە هەمەدان و تاران نیشتەجێ بوون. وام لە بیرە هاوین بوو کە

مامۆستا «عومەر مستەفا-عومەر دەبابە» داوای دیداری باوکمی لێکردم و کوتی ئاشنایەکم لە گەڵە. کاک عومەری رەحمەتی ئوتومبیلێکی دوو دەرکەی لێدەخوری و کابرایەک لە پشتەوە دانیشتبوو کە دانەبەزی و داوای لە باوکم کرد کە ئەویش بچێتە پشتەوە و من و کاک عومەر لە پێشەوە دانیشتین.

نازانم چەندی خایاند و نازانم کەی ئارام بوونەوە، بەڵام من و عومەر دەبابە بێدەنگ و حەپەساو دوو پیاومان دەدیت کە دەستیان لە ملی یەک کردبوو بە گوڕ و بە کوڵ دەگریان.

مامۆستا زەبیحی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکرات و لە کاتی رۆیشتنی جەماعەتدا وا بزانم مەسئوولی ئەو باڵەی پارتی لە ناوخۆی کوردستانی عیراق بوو. دەمزانی هاتووە رەفیقەکانی ببینێ و سەبارەت بە کاری خۆیان کۆبوونەوە و تەگبیر بکەن. لە گەڵ ئەوەش دیار بوو ریسکێکی زۆر گەورەی کردووە بەڵام لەو کاتەدا من هۆشی ئەوەم برابوو، سەرم داخستبوو، بیرم رۆیشتبوو، ببومە رێبواری مێژوو:

دەورەی پەهلەوی یەکەم و دیکتاتۆری و وەحشەتم دەدیت و سرت و خورتی هێشتا کاڵ و کرچی لاوان، دیتم دوو فرۆکەی رەش گەیشتنە سەر شاری مەهاباد و "بۆمی رەحمەتیان" بەرداوە

به بلاو بوونی دوو پەر ئاگاهی بوو بلاو ئەرتەشی شەهەنشاهی!

مەهاباد -دڵە هوشیار و زیندووەکەی موکوریان- میوانداری نیشتمانپەروەرانی گەرمێن و کوێستانە. باغی مکاییل قەرەباڵغە، هەر یەک دێ و یەک دەروا و کەس نازانێ چە باسە و چە دەقەومێ، سەرەنجام دایکی نیشتمان لەو زگەش دەبێتەوە و کۆمەڵەی ژ . ک چاوی بە دونیای روون دەپشکوێ!

بە هۆی یاری و نومایشی «میر میرێن» کۆمەڵە دەسەلاتی خۆی دەردەخا و رۆژنامەکانی تاران زیرەیان لێهەڵدەستێ: "با میر مهاباد شوخی نکنید!"

منداڵەوردکە بە کۆلانانداﺍ رادەکەن و بە هەموو هێزیان هەرا بەرز دەکەنەوە:

"ئەگەر مەردی، کوڕی کوردی ..." و رۆژنامەکانی ئێران دیسان ترسیان لێدەنیشێ: "پسر کرد چه می گوید؟" ئەوجار سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیار دەدا وەڵامی بداتەوە.

ئەو پیاوەی ئەورۆ بەرگی مەلایانی پۆشیوە و ریشی هێشتووەتەوە و لە زانکۆی تاران دەرسی حەدیس و قورئان دەڵێتەوە دەیبینم لەبەردەم ناوەندی کۆمەڵە بە جل و بەرگی کوردی دەمانچە لەبەر پشتێن بە سیمای گەنجانەوە وەستاوە و مەقالەکەی دەخوێنێتەوە:

"جواب پسر کرد". هەژار وەک خۆی دەڵێ نووسراوەکەی خۆی لە گیرفانی دەخاتەوە و زەبیحیش مەقالەکە وەردەگرێ، لە خۆشیان ماچی دەکا و بە پەلە دەیبا بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی، هیچی پێ ناچێ لە هەموو کوردستان باس هەر باسی "جواب پسر کرد"ە!!

کاک عومەر هەودای خەیاڵی پساندم و پرسیاری کرد: کوێ باش و بێ شکە؟

من تەجریش و نیاوەرانم پێشنیار کرد. بەشی زۆری ئەو رۆژە پێکەوە بووین و ئەو دوو کەڵە پیاوەی جیهانی سیاسەت و ئەدەب و فەرهەنگ و کوردایەتی -دوور لە چاوی چەتە- خەمی کۆنیان بە بادا و هیوای نوێیان هێنا گۆڕێ و سەرەنجام زەبیحی هەر چۆن لە ناکاو هەڵ قولیبوو، هەروا بێدەنگیش بزر بوو.

بێوران، دیداری سێهەم

شەری سێ مانگە لە ئاخری هاوین و سەرەتای پایزی ساڵی ١٣٥٨ (١٩٧٩) خەریک بوو بە قازانجی کوردان دەشکاوە. هێرشی ئەرتەش و پاسداری ئێرانی رووی کردبووە کزی و لاوازی، پەلاماری پێشمەرگەی کوردستان بەرەو بەرزی و بە هێزی دەرۆیشت. دەوڵەت خوازیاری مۆڵەت و ماوەیەک بوو بۆ پشوو تازە کردنەوە و خۆسازدانی نوێ داوای وتووێژی دەکرد. ئەوکات حیزبی دیموکرات پێی خۆش بوو بە تەنێ بچێتە موزاکەرات و ئامادەی وەفدێکی هاوبەش نەبوو. مام جەلال کەوتە بەینەوە و هەیئەتێک بە سەرۆکایەتی، مامۆستا شێخ عیزەددین و نوێنەرانی کۆمەڵە و چریکی فیدایی لە دێی بێورانی ناوچەی سەردەشت موفاوەزاتی دەست پێکرد.

لە لایەن دەوڵەتیشەوە داریوشی فروهەر وەزیری کار، عیزەتوڵڵای سەحابی جێگری سەرۆک وەزیر، هاشمی سەبباغیان وەزیری ناوخۆ و چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی لەشکری بەشدار بوون.

لەو کۆبوونەوەدا لە نێوان داریوشی فروهەر کە سەرۆکی وەفدی دەوڵەت و منیش کە "کەچە ڕیەی!" وەفدی کوردستان بووم قسە هەڵ بەزیەوە: من پێم چەقاندووە لە

"خودموختاری" نایەمە خوارێ و ئەویش لەسەر ئەوە پەلاماری توندم دێنێتە سەر و دەڵێ تۆ تێکدەری! سەرەنجام من هەم بە دژایەتی وەفدی دەوڵەت و هەم بۆ رەخنە لە وەفدی کوردستان کە بێدەنگ و بێهەڵوێست بوون مەجلیسم بە جێ هێشت!

وا دیارە کاک ئەوشیروانیش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا هەر ئەوەندە ناوی منی وەبیر دەکەوێتەوە کە گوناهی رێک نەکەوتن و بە ئاوات نەگەیشتنی کوردان بخاتە ئەستۆی من!!

لە هەر حاڵدا ئەو رۆژە دوای تۆران و بە جێهێشتنی موزاکەرات شانسی ئەوەم پەیدا کرد کە بۆ جاری سێهەم لە ژیانمدا کورتوبڕ مامۆستا زەبیحی ببینمەوە.

ئەو جارەیان دیدارەکەمان درێژخایەن تر، تێراديوتر و تێر و تەسەل تر بوو. دوای کۆتایی کۆبوونەوەکان، هەموو لایەک لە بێوران را روومان کردە گوندی بێژوێ لە ناوچەی ئالان و لەوێ هەرکەس بۆ خۆی ماڵ و مەقەررێکی ساز کرد.

وەک بزانم دوای تەگبیر و لەسەر پەسند و پێشنیاری مام جەلال لەو کاتە بەدوا زەبیحی هاوکاری خۆی لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەددین و دەفتەرەکەی دەست پێکرد و لە گەڵ مامم کاک سەعدی موهتەدی کە دۆستی دێرین و هاورێی کۆن و زۆر خۆشەویستی یەکتر بوون یەکیان گرتەوە و بە جووتە خانوویەکی چکۆلەیان بنیات نا و زۆرتری کاتەکان هەر پێکەوە بوون.

زەبیحی هەڵوەدای چی بوو؟

ئەگەر بتەوێ بە تەسەلی وەڵامی ئەو پرسیارەت وە دەست کەوێ دەبێ بچینە ناو قووڵایی و بەرینی خەباتی میللی و رزگاریخوازی گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستاندا بە درێژایی نزیک بە نیو سەدە.

من نە توانا و نە تەمای ئەوەم هەیە. پرسیارەکەی من تەنیا بۆ ئەو ماوە کورتەی سەردەمی شۆرشە کە مامۆستا زەبیحی گەڕابۆوە بۆ کوردستانی ئێران ١٣٥٨ (١٩٧٩).

ئەوەندەی من تێی گەیشتم زەبیحی دوو ئامانجی بۆ خۆی دیاری کردبوو لەوپەری دژواری و ئاڵۆزیدا بەڵام بەوپەڕی دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری یەوە.

ئامانجی یەکەمی ئەوە بوو بە تیرێک دوو نیشان بشکێنێ یانی چەک و یارمەتی

لە دەوڵەتی عێراق وەرگرێ بۆ ئوپوزیسیۆنی کوردستانی ئێران و لە هەمان کاتدا بە نهێنی بەشی شۆرشگێرانی کوردستانی عێراق بە تایبەت یەکیەتی نیشتمانی کوردستانی لێ بدرێت.

یارمەتی وەرگرتن بۆ حامید بەگی جاف تەنیا یەک نموونەیە لەم سیاسەت و ستراتیژییە.

زەبیحی کە مامۆستا یا باشتر بڵێم خوای کاری نهێنی و پلان و نەخشە دانانی ورد و فریو دانی دوژمن بوو، ئەگەر لە هەر ولاتێکی دیکەی جیهاندا ژیا بایە، تا ئێستا بە دەیان کتێب و رۆمان و فیلمی لەسەر ساز دەکرا. وەک زۆر کەسی دیکەش کە لەو جیهانە مەرمووز و پرمەترسییەدا کار دەکەن، سەری خۆی لەسەر باوەڕ و مەرامی کوردانە و نیشتمانپەروەرانەی خۆی دانا و ئەوەش چاوەڕوان نەکراو نەبوو. بەتایبەت کە ژمارەی ئەو کەسانەی دژی ئەم ئامانجە بوون و دەنگ و دەستیشیان دەگەیشتە دەوڵەتی عێراق، کەم نەبوون.

سەیر ئەوەیە لەسەر داخوازی مام جەلال و بەرنامە و دەستووری زەبیحی بۆ حامید بەگی جاف کە بەشی زۆری چەکەکانی بە سەر پێشمەرگەکانی یەکیەتی نیشتمانیدا دابەش بکات، زەبیحی دەکەوێتە بەر شەپۆلی غەزەبی دەوڵەتی عێراق و سەری تێدا دەچێ، جا هەر خێرخوایەک خەبەرەکەی بە گوێی «موخابەرات» راگەیاندبێت! کەچی ئوپوزیسیۆنی چەپرەوی ئێران لە کوردستان (چریکی فیدایی) جا بە عەقلی خۆیان یا بە فیتی خەڵکی خۆماڵی حامید بەگ دەگرن و دەیکووژن بە تاوانی خزمەت بە دەوڵەتی عێراق! بەڕاستی مێژوو کەڕ و کوێر و لاڵە!!

دووهەمین ئامانجی زەبیحی ئەوە بوو کە لە رووخانی رژێمی شا و بۆشایی لە کوردستانی ئێراندا کەڵک وەربگرێ بۆ وەدیهێنانی خەون و ئارەزووە لە مێژینەکەی کە بە دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ک دەستی پێکرد و تا کۆتایی ژیانی دەستی لێهەڵنەگرت ئەویش بەرپا کردنی «حیزبێکی جەماوەری شۆرشگێری میللی و سەربەخۆیی خواز» بوو.

لە بیژوێ مامۆستا زەبیحی و کاک سەعدی موهتەدی دوای پرس و تەگبیر لە گەڵ مامۆستا شێخ عیزەددین لەسەر دامەزراندنی حیزبێکی وەها تەوافوق دەکەن. ئەو بیرە

پاشان لە کۆبوونەوەیەکی گشتی ئەندامانی دەفتەری مامۆستادا هەر لە بێژۆێ بە دوور و درێژی گوفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

بە پێی ئەو قسەی مامۆستا مەلا عومەری عەسری بۆی گێڕاومەتەوە -جگە لە خۆی- تێکرای ئەندامان و بەشدارانی کۆبوونەوەکە لەسەر پێکهاتنی حیزب رازی و یکدەنگ دەبن. من نە لە پێشدا پرسم پێکراوە و نە لەو کۆبوونەوەشدا بەشداریم کردووە و نە ئاگاداری بڕیار و بەرنامەیەکی وەها بووم.

لە راستیدا سەرەرای هەموو دردۆنگی و دەنگۆی ناو هێزە سیاسی یەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان من قەت نە ئەندامی کۆمەڵەی شۆرشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بووم و نە هەرگیز ئەندامی دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەددین. هەرچەند لە گەڵ هەر دووک لا دۆستایەتی و هاوکاری نزیکم هەبوو.

دوای ئەو کۆبوونەوە و بڕیاردانە گشتییە من لە لایەن مامۆستا زەبیحی و کاک سەعدەوە بانگ کراوم بۆ سەردانیان لە خانووە چکۆلەکەیان لە دەرەوەی دێی بێژۆێ و لەسەر چۆنیەتی بەرنامە و بریارەکان ئاگادار کراوم. منیش وەعدەم پێدان لە دەرەوەی تەشکیلات هەر یارمەتییەکم لەدەست بێ دریغی نەکەم.

مامۆستا زەبیحی دوای ئامادە کردنی گەلاڵەی پەیرە و پرۆگرامەکە نامەیەکیشی رەگەڵ خستبوو بۆی ناردبووم و داوای لێکردبووم بۆچوونەکانی خۆم و گۆڕانکاری پێویست هەر لەسەر دەقی نووسراوە دەسخەتەکەی ئەو بنووسم تا باشتر بتوانێ بەراوەردیان بکات. منیش ئەو داخوازییەم بەجێ گەیاند و نامەکەی هەر چۆن بە عومەری کاک سەعدا بۆ ناردبووم، دوای دەست لێدان هەر بەودا بۆم بەرێ کردەوە.

ئایا بەشداری نەکردنی من -وەک دەڵێن- خەڵکێکی زۆری دلسارد و سەرەنجام پرۆژەکەی پووچەڵ کردووەتەوە؟ ئەو قەزاوەتە هاسان نییە. بەڵام لەو قەزاوەتەدا ئەوە لەبەر چاو ناگیرێ کە ئەو حیزبە ئەندامانی دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەددین بڕیار بوو بێکی بێنن، من نە ئەندامی دەفتەر بووم و نە لە کۆبوونەوە و بڕیارەکەدا بەشدار بووم. تەنانەت مامۆستا عومەری عەسری -بە پێی گێڕانەوەی خۆی- لە کۆبوونەوەی گشتی دووهەمدا کە پەیرە و پرۆگرامەکە ئامادە و پێشکەشی بەشداربوان کراوە یەکێک لەو

ڕەخنانەی ئەو خۆی گرتوویەتی ئەوە بووە کە سەلاحوددینی موهتەدی کە ئەندامی دەفتەر نییە بۆچی دەستی لە گەلاڵەی پەیڕە و پرۆگرامەکە داوە!

بەڵام دوای لەبەر چاو گرتنی ئەو خاڵە و تەنانەت بە فەرزی بەرفراوان کردنی حیزبەکە من بۆ بەشداریم نەکرد؟

لە ڕاستیدا بەشێکی شەخسی و بەشێکی سیاسی بوو. بەشە شەخسییەکەی ئەوە بوو کە من دوای ساڵەها سەربەخۆیی سیاسی و لە سەر پێی خۆ ڕاوەستان، کورد کوتەنی "فێری کاسەی بە جوێ" ببوم و زۆر بە زەحمەت دەمتوانی لە چوارچێوەی ئەو حیزبە یا هەر حیزبێکی دیکەدا خۆم قەتیس کەم.

خانووە ڕملێنە لە لام خۆش بوو بەڵام لێم دەڕووخایەوە، ئێستەش هەر وام!!

بەشە سیاسییەکەی لەوەدا خۆی دەنواند کە ئەو حیزبە تازەیە لەسەر ئەو قەناعەتە دادەمەزرا کە: بۆشاییەکی گەورەی سیاسی لەناو جەماوەردا هەیە کە لە دوو جەمسەرەکەیدا دێمۆکرات و کۆمەڵە چەقیون و لە ناوڕاستدا جێگایەکی هەراو هەیە بۆ حیزبێکی سێهەم.

ڕاستی ئەو کاتە من باوەڕم بەو بۆشاییە نەبوو. شەڕی سێ مانگە ڕووداوێکی گرینگ و کاریگەر بوو لە نەخشاندن و دیاریکردنی سیمای سیاسی کوردستاندا. خەباتی سیاسی و دێمۆکراتیکی بەرفراوانی ناو توودەی خەڵک، جێی خۆی دابوو بە شەڕی پارتیزانی و موقاوەمەتی نیشتمانی. ئەوانەی شەڕەکەیان ڕەهبەری دەکرد یانی حیزبی دێمۆکرات و کۆمەڵە جەماوەری خەڵک و خوێندەوارییان لە ناو خۆیاندا بەش کردبوو.

ئەوە ڕاستە و حاشای لێ ناکرێ، سەرەڕای ئەوە دانەمەزراندنی ئەو حیزبەش هەڵەیەکی گەورەی سیاسی بوو کە من هەرگیز حاشا لەوەش ناکەم. بەڵام هەڵەی گەورەتر ئەوە بوو کە ئەم پرۆژەیە لە چوارچێوەیەکی زۆر فراوانتر، بە شێوەیەکی ڕەسمی و ئاشکرا و بە بەشداری زۆربەی ژنان و پیاوانی زانا و سیاسی و میللی و شۆڕشگێری ناسراو و باوەڕ پێکراوی ناو خەڵک و جەماوەری ئەوسای کوردستان لە ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٨-١٩٧٩) کە فەزایەکی سیاسی لەبار و کراوە هەبوو، شوور و شەوقی گشتی هەبوو، داخوازی و ئامادەیی میللەت هەبوو، هێشتا هاوکاری و یەکیەتی ناو ڕیزەکانی

گەل پێەو بوو ئەنجام نەدرا. بۆچی نهێنی کاری، وردەکاری و خەباتی چەکداری بەسەر کاری ئاشکرا و گشتی و سیاسیدا زاڵ بوو؟

تەنیا لەم حاڵەتەدا بوو کە نەخشەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستانی ئێران گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا دەهات. بەڵام ئەگەر ئەو پرۆژەی کە مامۆستا زەبیحیش پێشنیاری دەکرد سەری گرتبایە ئەویش تەئسیر و شوێنەواری خۆی هەر دەبوو هەر چەند بە رادەیەکی کەمتر و لە چوارچێوەیەکی تەسک تردا.

لە هەر حاڵدا بۆچوونی من کە لە کۆمەڵگای ئەوسای کوردستان لە نێوان کۆمەڵە و دێمۆکراتدا گوایە «بۆشایی نەماوە» ناواقیع بینانە بوو.

دریژەی تێکۆشان بۆ دامەزراندنی حیزب:

شەڕی سێ مانگە بە سەرکەوتنی پێشمەرگە و ئازاد کرانەوەی شارەکان و گەڕانەوەی سەرکردایەتی و خەڵکی سیاسی هەموو لایەنەکان بۆ سەر جێ و ڕێی خۆیان کۆتایی پێهات و بیری پێکهێنانی ئەو حیزبە هەر درێژەی هەبوو بێ ئەوەی من ئاگایەکم لەو کەین و بەینە هەبێ چونکە من دوای ڕووداوەکەی کۆبوونەوە و موزاکەرەی بێوران تازە لە هیچ هەیئەتێک و دەستەیەکی وتووێژی کوردان لە گەڵ دەوڵەت بەشداریم نەکرد و هەر بەو پێیە هاتوچووم بۆ شاری مەهاباد و باقی شارەکانی کوردستان زۆر کەم کردەوە و زیاتر لە ماڵە خۆم لە بۆکان خەریکی سەرپەرشتی کردنی ژیانی خۆم و خانەوادەکەم بووم. بەڵام بە پێی گێڕانەوەی محەممەدی موهتەدی برام کە ئەندامی دەفتەری مامۆستا بوو بەڵام لە کۆبوونەوەی یەکەمی دەستەی دامەزرێنەر لە بێژوێ ئامادە نەبوو چونکە ئەو کاتە ناردرابوو بۆ سەفەری ئورووپا و دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان بۆ ماوەیەک سەرپەرشتی دەفتەری پێ سپێردرابوو، گوایە دوای نیشتەجێ بوونەوەی سەر لە نوێی مامۆستا و دەفتەرەکەی لە مەهاباد، دیسان باسەکە بووژاوەتەوە. محەممەدی موهتەدی زۆر لایەنگری ئەم پێشنیارە و دامەزراندنی حیزب بووە و بە توندی پشتیوانی لێ کردووە، بەشێک لە ئەندامانی دەفتەر ڕۆیشتن لەسەر ئەم پرۆژەیان بەلاوە پەسند نەبووە و مامۆستاش بۆ خۆی لە نێوان ئەو دوو بۆچوونەدا دوو دڵ بووە. بە پێی گێڕانەوەی محەممەد، مامۆستا لای وابووە "لە گەڵ دامەزراندنی حیزبێکی وەهادا، حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە هەر دووکیان

دژایەتیمان دەکەن و ئێمەش هێزمان نییە بۆ پاراستنی خۆمان" محەممەد پێشنیار دەکا پرس بە مام جەلال بکرێ و داوای یارمەتی سیاسی و عەسکەری لێ بکرێ. مامۆستا پێشنیارەکەی بەلاوە پەسند دەبێ و محەممەد لە گەڵ جەماعەتێک وەڕێ دەکەون بۆ ناوزەنگ و تووژەڵە بۆ دیداری مام جەلال. لەوێ لەگەڵ مام جەلال و کاک نەوشیروان دادەنیشێ و راسپاردەکانی مامۆستا و بۆچوونەکانی خۆی و دەوری مامۆستا زەبیحی یان بۆ باس دەکا.

بە گوێرەی گێڕانەوەی محەممەد کە من ئەوکات ئاگادار نەبووم و ساڵەها دواتر زانیمەوە مام جەلال دەڵێ "لێی رامەوەستن و دڵنیا بن لە هیچ یارمەتی و پشتیوانییەک دریغیتان لێ ناکەین بە تایبەت بۆ پەروەردە کردنی کادری سیاسی و عەسکەری و هەر پێداویستییەکی دیکەشتان" کاک نەوشیروان دەڵێ "دڵنیا بن ئەوەندە خەڵکتان لێ کۆ دەبێتەوە ئەو کات خۆتان نازانن چۆنیان بحاوێننەوە، هەر ئێستا بە سەدان کەسی خوێندەوار و رووناکبیر و شاری و دێهاتی روو دەکەنە ئێمە و پرسمان پێدەکەن، ئێمە هەموو ئەوانە بەرەورووی ئێوە دەکەینەوە" محەممەد دەڵێ لە گەڕانەوەدا گوزارشی سەفەرەکەی خۆی و راسپاردەکانی مام جەلالی بۆ مامۆستا شێخ عیزەددین گێڕاوەتەوە، بەڵام تا ئەو گەڕاوەتەوە ئەندامانی دەفتەر بە خودی مامۆستاشەوە، ساغ ببوونەوە لەسەر رەدکردنەوەی پرۆژەی دامەزرانی حیزب، لە باتیان قەرار کرابوو لە هەر شارێک مامۆستا نوێنەرێک دابنێ و خەڵکی عەلاقەمەند با لە دەوری ئەو نۆێنەرایەتییە کۆ ببنەوە. محەممەد دەڵێ "لە ئەنجامدا مامۆستا زەبیحی ناهومێد بوو رۆیشتەوە بۆ ئەو دیو منیش سارد بوومەوە لە کارکردنی جیددی لە چوارچێوەی دەفتەری مامۆستادا و سەرەنجام بڕیاری گەڕانەوەی ئورووپام دا بێ ئەوەی کە پەیوەندم لە گەڵ دەفتەریش یەکجاری پساندبێ".

هەڵوێستی دێمۆکرات و کۆمەڵە بەرامبەر ئیدەی دامەزراندنی حیزبێکی سێهەم:

من ئەوکات ئەوەندە نزیک نەبووم لە حیزبی دێمۆکرات تا لە نزیکەوە شتێک لە سەرکردایەتی خۆیانەوە ببیستم بەڵام لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵە -سەرەرای جیاوازی بیر و باوەر و ستراتیژی سیاسی- دۆست بووم و زۆر جار لەسەر رووداوی سیاسی ئەوسەردەمە گوفتوگۆ و پرس و را گۆڕینەوەمان دەبوو. لە هەموو ئەو ماوە دا قەت لە لایەن

سەرکردایەتی کۆمەڵەوە پێکهێنانی حیزبی سێهەم یا هەڵوێست و بۆچوونی کۆمەڵە لە گەڵ من کەم تا زۆر باسی لێ نەکراوە.

من ئەوەندەی لەناو برێک خەڵک دا بە چەپ و لایەنگر و تەنانەت بە سەرۆکی کۆمەڵە لە قەڵەم دەدرام ئەوەندەش لە ناو کۆمەڵەدا بە ناسیونالیست و لایەنگری کوردستانی گەورە دەناسرام هەر بۆیەش من لەو بابەتانەدا «مەحرەمی ئەسرار» نەبووم.

لە وەڵامی پرسیارەکەتدا دەبێ بڵێم ئەگەر کەسانی دۆستی کۆمەڵە لە ناو دەفتەری مامۆستادا لەو بارەوە لە لایەن کۆمەڵەوە ئامۆژگارییان پێدرابێ بۆ دژایەتی و تێکدان، بەڕاستی ئاگادار نیم و ناتوانم بە گۆترە رایەک دەرببڕم!

برای خۆشەویستم کاک عەلی! من بەو هەمووە بێوازی و دوورە پەرێزییەوە، وا لەسەر داوای تۆ تووشی مێژوو نووسین و بیرەوەری گێڕانەوە بووم. ئەگەر جاری وا هەیە باسێکی لاوەکیم هێناوەتە گۆڕێ مەبەستم کردنەوەی دەلاقەیەک بووە بۆ رۆشنی خستنە سەر باسەکەی مەربووت بە مامۆستا زەبیحی. ناچار ناوی زۆر کەسم بردووە کە بەشێک لەوانە زیندوون. رەنگە هەندێک لەو قسانەی من بە مەسڵەحەتی خۆیان یا گونجاو لە گەڵ راستی نەزانن و بیانەوێ رەدی کەنەوە یا راستی کەنەوە. هەقی خۆیانە و گەردنیان خۆش و ئازا بێ!

من بە نیاز نیم بەرپەرچی کەس بدەمەوە و لە گەڵ کەسیش شەرە بیرەوەری ناکەم. تەنیا ئەوەی پێم راست بووبێ و لە بیرم مابێ بۆم نووسیوی. لە هەر جێگایەکیش بیر و هۆشم یارمەتیان نەدابم و هەڵەیان پێکردبم داوای لێبوردن لە خەڵک و مێژوو دەکەم بەڵام بە هەرحاڵ خۆم بەرپرسی نووسراوەکەی خۆمم بە شەرتێک نامەکەم بێ کەم و زیاد بڵاو بکرێتەوە و نەکەوێتە بەر تێلای سەر و گوێ شکێن و نەخرێتە ژێر یاسای گوڵبژێر!!

لێبوردن خوازی!

لە کۆتاییدا دەمەوێ ساڵەها دوای شەهید بوونی زەبیحی داوای لێبوردن بکەم نەک هەر لە لای خۆمەوە بەڵکو لە لایەن هەموو گەلی کورد و شۆرشی کوردستانیشەوە کە بەڕاستی قەدری ئەو سیاسەتمدار و زمانەوان و نووسەر و رۆژنامەوانە زانا و گەورەیەمان نەزانی. قەدری ئەو سازدەر و رێکخەر و بەڕێوەبەرە پڕ توانا و بە ئەزموونەمان نەزانی کە

ئەو کات لە هەموو زەمانێکیش زیاتر پێویستیمان بە کەسی وا هەبوو. هەموومان تێدەکۆشاین تەشکیلات ساز کەین، شۆرش بەرپا بکەین و میللەت رزگار کەین، بەلام بەراست و چەپەوە، بە سوسیالیست و ناسیونالیست و دێمۆکراتەوە، وەها چووبووینە ناو وردەکاری بێ کەلک و شەرە دندووکەی ناوخۆوە، وەها خنکا بووین لە ناو دەریای گیروگرفتەکانی رۆژانەی شۆرش و ئیدارەدا و وەهاش کوێر ببووین بە پەتای خۆپەرستی و پاوانخوازی یەوە کە هەموو ئەو کەسانەمان فەرامۆش کردبوو کە سی ساڵ و چل ساڵ پێش ئێمە رێکخەر و هاندەر و بەرێوەبەری حیزبێک و شۆرشێک و جومهوورییەک بوون زۆر لەوەی ئێمە رێکوپێک تر، بەرچاو روون تر، بە بەرنامەتر و یەکگرتووتر!

هەر ئەوانە بە سەرۆکایەتی پێشەوا قازی محەممەد لە ماوەی کەمتر لە ساڵێک حوکمرانیدا لە پاناوکێکی بەرتەسکدا توانیان جومهوورییەک رابگەیەنن کە ئێستاش مایەی شانازی هەموو کورد و بەڵگەی ئێمەشە بۆ رەوایی داخوازییەکانمان و سەلماندنی توانامان بۆ ئیدارەی کوردستان، کە چی ئێمە، بە حیزبەکەی قازی محەممەدیشەوە، بۆ ماوەی چەند ساڵی رەبەق لە ئارازەوە تا ئیلام ولاتمان لە داگیرکەر بۆ چۆل کرابوو، بەخشداری شاروچکەیەک و کوێخای دێیەکیشمان دیاری نەکرد و بەردێکمان لەسەر بەردێک دانەنا بۆ چەسپاندن و راگەیاندنی کیانێکی کوردی میللی و دێمۆکراتیک بەلام زمانمان دەرهەق بەو سەرکردە و زانا گەورانەی پێشوو تا بلێی درێژ بوو:

هەژار مریدی مەلا مستەفا و کۆنە پەرستە!

زەبیحی دۆستی مام جەلالە و پیلان گێرە!

قزلجی سەر وە حیزبی توودەیە و سازشکارە!

هێمن لادەر و ساویلکە و سەرخۆشە!

ئای لەو گەنج و گەوهەرە گرانبەهایانەی بە خۆرایی و بە نەزانی لە کیسمان چوون!!

ئێمە کە بەرامبەر سەرکردەکانی پێش خۆمان ئاوا بێ وەفا و بێ ئەمەگ بووین چە چاوەروانییەکمان دەتوانێ هەبێ لە نەسلی نوێ تر بۆ قەدر گرتن و پێزانین؟!

سەلاحوددینی موهتەدی

# نامەی کاک عەبدوڵلای موهتەدی

بەڕێز کاک عەلی کەریمی خۆشەویستم

لە گەڵ گەرمترین سڵاو و بە هیوای شادی و سڵامەتی و سەرکەوتنت. زۆر سوپاس بۆ نامە جوان و گەرم و گوڕەکەت. بەڕاستی پێی شاد بووم. هەرچەند بەداخەوە دەست خەتەکەتم چاو پێ نەکەوت، بەڵکوو شەوی پێش هاتنەوەم بۆ کوردستان بە تلیفون بۆیان خوێندمەوە. لە هەر حاڵ دا زۆری پێ شاد بووم و لەوەش کە کاری کتێبەکەت لەسەر ژیانی مامۆستا زەبیحی لە تەواو بوون دایە زۆر خۆشحاڵ بووم، ماندوو نەبی.

هەروەها داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەوەی نەم توانی وەڵامی پرسیارەکانت زووتر لەمە بدەمەوە. بێجگە لە ڕێ و بانی ناخۆش، سەرقاڵی زۆری ڕۆژانی هەوەڵی گەیشتنەوەم بەڕاستی نەیهێشت لەوە زووتر فریای خەم. لە هەر حاڵ دا هیوادارم بە کەڵکت بێ و کەلێنێکی چکۆڵەت بۆ پڕ کاتەوە.

سڵاوی زۆرم هەیە بۆ پرشنگی هاوسەرت و چاوی منداڵ (یا منداڵەکانت) ماچ دەکەم.

هەر بژی بە خۆشی،

بۆ برات: عەبدوڵلا موهتەدی

چواری ژوئیەی ١٩٩٨

١- پرسیار: لە سەردەمی شەڕی سێ مانگەدا، ڕەوابیت و پەیوەندی ئێوە لە گەڵ دەفتەری مامۆستا شێخ عزالدین لە چ ڕادەیەک دابوو؟ لەو پەیوەندییەدا، ئێوە را و بۆچوونتان لەسەر مامۆستا زەبیحی چ بوو؟

وەڵام: مەسەلەی پەیوەندی کۆمەڵە لە گەڵ مامۆستا شێخ عزالدین و هەر وەها

دەفتەری مامۆستا مەسەلەیەکی بەرفراوانترە لەوەی کە بکرێ ئێستا لەم فرسەتەدا باسی هەموو لایەکانی بکەین، هەر ئەوەندە دەڵێم کە ئەگەرچی ئەو پەیوەندییە لە لایەنی لاوازیش بێ بەری نەبووە بەڵام سەرجەم دەورێکی چاکی گێرا لە بزوتنەوەی شۆرشگێرانەی کوردستانی ئێران دا و نیشانەیەک بوو لەوەی کە هەر دووک لا مەسئوولانە جووڵاونەتەوە، پاوان خواز نەبوون و سەرەڕای جیاوازی بیروباوەر ئامادە بوون بۆ قازانجی بزوتنەوەکە هاوکاری بکەن.

مامۆستا شێخ عزالدین ساڵەها پێش شۆرش لە ئێران لە مەسائیلی ئایینی، فیکری و کۆمەڵایەتی دا لایەنێکی پێشکەوتنخوازی گرتبوو وە بە دەست پێکردنی شۆرش و بزوتنەوەی جەماوەری لە کوردستانیش دا یەکێک لە هەوەڵین کەسایەتییەکان بوو کە هاتە مەیدان و دەورێکی زۆر چاکی گێرا. بە لەبەر چاوگرتنی ئەوانە زۆر سروشتی بوو کە مامۆستا لە گەڵ لایەنی شۆرشگێر و پێشکەوتنخوازی بزوتنەوەی کوردستان، یانی خە... کۆمەڵە، خوی بە نزیک تر بزانێ وە ئەمە تەنیا بە مامۆستا شێخ عزالدین یش مەحد... نەدەبۆوە، لە راستی دا بەشی زۆری رووناکبیران و تێکۆشەرانی شۆرشگێر، کە ... نەبوو خۆشیان گشتیان مارکسیست بن، دۆستایەتی و هاوخەباتی کۆمەڵە... هەڵبژاردبوو.

پەیوەندی دۆستانە و هاوکاری نێوان مامۆستا شێخ عزالدین و دەفتەری مامۆ... ئەگەرچی هەمیشە وەکوو یەک پتەو نەبوو، بەڵام سەرجەم دەورێکی چاکی گ...ا و من ئێستاش دیفاعی لێ دەکەم. ئەندامانی دەفتەری مامۆستاش لە راستی دا کۆمەڵێک تێکۆشەرانی قەدیمی و خۆش نێو بوون کە ئێمە لە دۆستایەتیان پاش گەز نەبووین و ...

لە بارەی مامۆستا زەبیحی یەوە دەبێ بڵێم کە ئێمە لە رەهبەریی ... کۆمەڵەدا ئەومان وەکوو تێکۆشەرێکی قەدیمی، یەکێک لە بناغەدانەرانی کۆمەڵەی ژ ک و هەروەها بە زانایەکی ئەدەبی و زمانەوانی دەناسی. من باسی مامۆستا زەبیحی ساڵەها پێش شۆرشی کوردستانی ئێران، لە سەرەتای لاویم دا لە بابم بیستبوو... هەمیشە باسی مامۆستا زەبیحی وەکوو ئینسانێکی تێکۆشەر و وەکوو هاوکارێکی قەدیمی خۆی کە دەستی زەمانە لێکی دوور خستوونەوە دەکرد. هەر بۆیەش وەختێک کە ...

یەکەم جار چاومان بە مامۆستا زەبیحی کەوت بێجگە لە خۆشەویستی و ڕێز شتێکی دیکە لە دڵمان و لە کردەوەمان دا نەبوو.

بەڵام هەر لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوە زیاد بکەم کە سەرەڕای ئەوانەش مامۆستا زەبیحی هیچ کات، لانی کەم تا ئەو جێگایەی من لێی ئاگادار بم، تێکەڵاوییەکی ئەوتۆی لە گەڵ کۆمەڵە پەیدا نەکرد و تەنانەت پەیوەندییەکی سیاسی جیددیشی لە گەڵ کۆمەڵە نەگرت، ئەو قەت داوای بەڕێوەبردنی پرۆژەیەکی سیاسی هاوبەشی لە ئێمە نەکرد، وە یان پرۆژەی سیاسی خۆی لە گەڵ ئێمە نەهێنایە گۆڕێ، بۆ ئێمە مامۆستا زەبیحی هەمیشە لە پەراوێزدا مایەوە. ئایا ئەو مارکسیست بوونی ئێمەی بە دڵ نەبوو و جیاوازی بیروباوەڕ لەم بارەیەوە ڕێی لەوە گرت کە ئەو دەروازەی دیالۆگێکی جیددی و قووڵی سیاسی لە گەڵ ئێمە بکاتەوە؟ ئایا سەرقاڵی شەوورۆژیی ئێمە مەجالی بۆ ئەوە نەدەهێشتەوە؟ ئایا جیاوازی تەمەن دەورێکی هەبوو؟ بە دیقەت لێم روون نییە، بەڵام لە بیرم نییە هیچ کات مامۆستا زەبیحی بۆ نموونە داوای لە خۆم کردبێ کە وتووێژێکی سیاسی ڕاستەوخۆ بکەین.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ڕاستیانە، دیارە من ناتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە دەوری مامۆستا زەبیحی چ بوو یا ئەو چ دەورێکی بۆ خۆی دانابوو. ئایا ئەو وەکوو تێکۆشەرێکی قەدیمی کە ساڵەها بوو کاری سیاسی لە پێناو کاری ئەدەبی و زمانەوانی نابوو، ئێستا بە دیتنی شۆڕش لە کوردستانی ئێران هەستی کردبوو جارێکی دیکە دەبێ دەوری خۆی لەو قۆناخەش دا ببینێ؟ یان وەکوو دۆستێک و دڵسۆزێک تەنیا بۆ دیتن و بیستن و دڵ روون بوونەوە یا زیاتر لەوەش بۆ تەگبیر و ئامۆژگاری هاتبوو؟ ئایا ڕاسپاردەی لایەنێکی پێ بوو؟ هیچکام لەوانە بە دیقەت بۆ من روون نین و بەڵگەیەکەم لەسەر هیچ کامیان نییە.

٢- **پرسیار:** لەسەر دروست کردنی حیزبێکی کوردی بە ئاریکاری مامۆستا زەبیحی تا چ ڕادەیەک ئاگادار بوون و ڕاتان لە سەری چ بوو؟

**وەڵام:** سەبارەت بە مەسەلەی دروست کردنی حیزبێکی کوردی کە مامۆستا زەبیحیشی تێدا بێ، دووپاتی دەکەمەوە کە مامۆستا زەبیحی هەرگیز بۆخۆی ڕاستەوخۆ

شتێکی ئاوای لە گەڵ کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە یا شەخسی من نەهێناوەتە گۆڕێ و نەی داوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەڵام لە لایەن مامۆستا شێخ عزالدین و دەفتەری مامۆستاوە بۆ سەردەمێک ئەو باسە لە گۆڕێ دا بوو. وەکوو بیستوومەتەوە بەداخەوە هێندێک کەس تاوانی دروست نەبوونی حیزبێکی ئاوا دەدەنە پاڵ کۆمەڵە وە یا هیچ نەبێ دەڵێن کۆمەڵە دژایەتی لە گەڵ شتێکی ئاوا کردووە. پێشەکی با ئەوە بڵێم کە موخالەفەتی سیاسی حیزبێک یا رەوتێکی سیاسی خۆی لە خۆی دا تاوان نییە و گوناه نییە، بەڵام مەسەلەی دژایەتی کۆمەڵە لە گەڵ پرۆژەی دروست کردنی حیزبێکی وەها نە وەکوو فاکتێکی مێژوویی دروستە و نە لە گەڵ لێکدانەوەیەکی هەل و مەرجی سیاسی ئەو کاتی کوردستان و پەیوەندی و پارسەنگی نێوان هێزە سیاسی یەکانی ئەو ناوچەیە دێتەوە.

زۆر چاک لە بیرمە کە ئەمن وەکوو نوێنەری کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی دەفتەری مامۆستادا کە بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەبەستە ساز کرابوو بە حوزووری شەخسی مامۆستا شێخ عزالدین بە راشکاوییەوە رام گەیاند کە ئێمە هیچ موخالەفەت و پێ ناخۆش بوونێکمان لە گەڵ ئەوەی مامۆستا و دەفتەری مامۆستا حیزبێکی سیاسی پێک بهێنن نییە و ئامادەین یارمەتیشی بکەین. هەروەها لە گەڵ شەخسی مامۆستا شێخ عزالدین یش لە دووبەدوویی دا زیاتر لە یەک جار لەو بارەیەوە قسەم کردووە و عەینی شتم پێ راگەیاندووە. دەشزانم کە هاورێیانی دیکەی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەش لەو سەردەمەدا لە کۆبوونەوە و دانیشتنەکانی دیکەدا، کە لەو کاتدا بەینی ئێمە و دەفتەری مامۆستا کەم نەبوون، هەر ئەم هەڵوێستەیان دووپات کردۆتەوە، چونکە ئەوە تەنیا رای شەخسی من نەبوو بەڵکوو هەڵوێستی رەسمی کۆمەڵە و بریاری هەمووومان بوو و نەوعی تێگەیشتنی هەمووومانی دەنواند.

ئەمە واقیعییەتی رووداوەکانە، بەڵام هەر وەکوو گوتم مەنتیقی سیاسیش هەر ئەو جورە هەڵوێستە تەئید دەکا. بۆچی ئێمە دەبێ دژایەتی پێکهاتنی حیزبێکی ئاوامان کردبێ؟ لە نەبوونی چ قازانجێکمان دەکرد و لە بوونی چ زەرەرێک؟ هەموو کەس دەزانێ کە ئەو حیزبەی ئێستا باسی لێ دەکەین حیزبێکی چەپ نەدەبوو، بۆیە ئەگەر پێکهاتبایە

و سەری گرتبایە و جێی خۆی لە نێو جەماوەردا بکردایەتەوە، هێزی لە ئێمە کەم نەدەکردەوە و جەماوەری ئێمەی بۆ لای خۆی رانەدەکێشا، بەڵکوو زۆرترین ئیحتیمالی ئەوە بوو کە بەشێک لە هێزی جەماوەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێ، چ عەقڵێک قبووڵ دەکا ئێمە ئەو کات دژایەتی وەها شتێکمان کردبێ؟ ئەویش لە حاڵێک دا کە پێکهێنەرانی دۆستی خۆمان و ئینسانی سیاسی پاک و چاکی کوردستان بوون؟ ئایا کەس هەیە بە هەل و مەرجی ئەو کاتی کوردستانی ئێران ئاشنا بێ و بتوانێ بڵێ کە بە مەسلەحەتی کۆمەڵە بوو کە لە گەڵ حیزبە پچووکەکان دژایەتی بکا یا بە دروست بوونی حیزبێکی تازەوە ماندوو بێ؟ ئایا پاوان خوازی و دژایەتی و تەنگ پێهەڵچنین بە ڕێکخراوە سیاسییە جۆراوجورەکانی ئەو کاتی کوردستان سیاسەتی ئێمە و بە مەسلەحەتی ئێمە بوو؟

کە وابێ دژایەتی لە گەڵ پرۆژەی پێکهێنانی حیزبێکی وەها نە لە گەڵ واقعییەتی ڕووداوەکان دێتەوە و نە لە گەڵ مەنتقی سیاسی و بەرژەوەندی سیاسی ئێمە دەگونجێ، بەڵام ئەمە هێشتا هەموو شتێک لەو بارەیەوە روون ناکاتەوە. ڕاستە ئێمە دژایەتی مان نەکرد و بەڵکوو مەیلی هاوکاریشمان هەبوو، بەڵام لێکدانەوەمان ئەوە نەبوو کە مامۆستا شێخ عزالدین و دۆستانی دەتوانن وەها حیزبێک پێک بهێنن. من ئەوکات و ئێستاش پێموایە کە لە بەراوردێکی زانستیانەی سیاسی و دوور لە ئیحساسات دا دەردەکەوێ کە ئەوان مەرجەکان و پێویستییەکانی پێکهێنانی حیزبێکی جەماوەریيان نەبوو وە ئەگەر دەستیان بدایەتە ئەو کارە ڕەنگە سەرکەوتنی سیاسی یان بەدەست نەهێنابایە، هەڵبەت هەموو کەس دەتوانێ گرووپێکی چکولە پێک بێنێ و نێو و در... ـمەکانیشی ڕاگرێ، بەڵام پێکهێنان و بە تایبەت ڕاگرتنی حیزبێکی سیاسی جەماوەری مەرجی خۆی و پێویستی خۆی و کات و سەردەمی لەباری خۆی دەوێ. لە نێو ئەوانەدا تەنیا کات و سەردەم دەکرێ بڵێین تا ڕادەیەک لەبار بوو.

پێک نەهاتنی حیزبێکی ئاوا چەندین هۆکاری نێوخۆیی و زاتی هەبوون کە زۆر لە پێخۆش بوون و پێناخۆش بوونی ئەم یا ئەو کەس کاریگەرتر بوون. پێش هەموو شتێک مامۆستا شێخ عزالدین خۆی لەسەر ئەو مەسەلەیە ساغ نەبوو و ئەمە هۆکارێکی گەورەی

سەرنەگرتنی کارەکەیان بوو. من وەبیرم نایە هیچ کات مامۆستا ساغ بوویێتەوە و بە هەواوی قۆلی بۆ پێکهێنانی حیزبێکی ئاوا و بۆ فەراهەم کردنی مەرجە سیاسی و مادییەکانی لێ هەڵ مالیبێ. تا ئەو جێگایەی من بزانم بیرۆکەی دروست کردنی حیزبێکی وەها خۆی لە لایەن مامۆستا شێخ عزالدینەوە نەهاتبوو و قەتیش بە شێوەیەکی جیددی نەچووە نەخشەی کاری سیاسی ئەوەوە. ئەمە فیکرێک بوو کە، وەک ئەو کات دەکوترا، لە لایەن مامۆستا زەبیحی یەوە هاتبوە گۆڕێ و بەشێک لە دۆستانی مامۆستا لە ژێر تەئسیری هەل و مەرجی سیاسی ئەوکات و هەڵچوونی جەماوەری دا بڕوایان پێ پەیدا کردبوو. ئایا دەوری مامۆستا زەبیحی دەقیقەن چەند و چۆن بوو، خەڵکی نزیکتر لە مەسەلەکە و شارەزاتر لەو بارەیەوە هەن کە دەتوانن روونی بکەنەوە. هەر وەکوو باسم کرد، مامۆستا زەبیحی قەت بۆخۆی پەیوەندێکی راستەوخۆی لە گەڵ ئێمە نەگرت.

مامۆستا شێخ عزالدین ئینسانێکی دێمۆکرات بوو و پێی خۆش بوو نەزەری خەڵکی جۆراوجۆر ببیستێ. هەر بۆیەش، بۆ ماوەیەک، پرۆسەیەکی هێنان و بردن و هەڵسەنگاندن و تەنانەت رووی خۆش نیشان دان بەو بیرۆکەیە لە ئارادا بوو، بەڵام بەرداشتی من ئەوە بوو کە مامۆستا خۆی قەت بەشێوەیەکی جیددی لەسەر ئەو مەسەلەیە ساغ نەبووەوە، دواتریش کە یەکسەر وەلای نا. کەوابێ گەورەترین کۆسپ لە رێگای وەدی هاتنی ئایدیای پێکهێنانی حیزبێکی سیاسی جەماوەری، ساغ نەبوونەوە، وە دوایەش وەلانانی یەکجاری، ئەم بیرۆکەیە لە لایەن فەردی یەکەم و ئەو رەهبەرە سیاسییە بوو کە دەبوایە خۆی بناغەدانەر و بەڕێوەبەری جەریانەکە بوایە.

لەڕاستی دا مامۆستا شێخ عزالدین بۆ درێژەدانی کاری سیاسی خۆی لە بەرابەر هەڵبژاردنێک دا راوەستا بوو، ئەویش هەڵبژاردنی مۆدێلی کاری سیاسی خۆی بوو: ئایا دەبوو وەکوو هەڵسووراوێکی سیاسی ئاسایی کە کاری حیزبایەتی دەکا و هەموو مەرجەکان و ئەرکەکانی ئەو کارە بە جێ دێنێ ئیش بکا یان وەکوو کەسایەتییەکی تاک دەوری رەهبەرێکی سیاسی و مەعنەوی ببینێ کە خەڵک لە دەوری ئەو، نەک حیزبێک یا رێکخراوێک کە ئەو هەڵسووراویەتی، کۆ دەبنەوە؟ مامۆستا رێگای دووهەم و مودێلی دووهەمی هەڵبژار[illegible] ـچاو پێداخشاندنەوەیەکی ئەمرۆدا پێموانییە مامۆستا، بە لەبەر

چاوگرتنی وەزعی خۆی و باشترین شێوەی تەئسیر دانانی لەسەر سیاسەت و رای گشتی لە کۆمەڵی کوردستان دا، تەسمیمێکی نادروستی گرتبێ.

هۆکاری دووهەم مەسەلەی خەباتی چەکداری و پێشمەرگانە بوو کە لەو کات دا بەرەورووی هەموو حیزبێکی سیاسی دەبووەوە. هەل و مەرجی ئەو کاتی کوردستانی ئێرانمان لە بیر نەچێتەوە. خومەینی تازە فەرمانی هێرشی بۆ سەر کوردستان دابوو و چارەنووسی جەماوەر و بزوتنەوەکەی لە کوردستان لەبەر چاوی هەموو کەس بە خەباتی چەکدارییەوە بەسترابووەوە. دیارە مەسەلەی شکل و شێوەی خەبات شتێک نییە تاکە کەسێک یا حیزبێک بریاری لەسەر بدا، بەڵکوو مەسەلەیەکە کە لە ئاستێکی کۆمەلایەتی دا دیاری دەکرێ. سەرجەم چۆنایەتی و رەوتی خەباتی سیاسی ولاتێک لە سەردەمێکی دیارکراودایە، ئەویش لەسەر زەمینەی مێژووی تا ئێستای، کە ئەم یا ئەو شکلی خەبات دێنێتە گۆرێ یا وەلای دەنێ. لەو کات دا هیچ کەس نەی دەتوانی حیزبێکی سیاسی جەماوەری پێک بهێنێ و رای بگرێ بە بێ ئەوەی جواب دەرەوەی ئەم شکلە لە خەباتیش بێ و خۆی بۆ ئامادە بکا و بە کردەوەش کەلێنێکی گەورە لەم مەیدانەدا پر بکاتەوە. ئەوەش شتێک نەبوو کە مامۆستا شێخ عزالدین یان دەفتەری مامۆستا خۆیانیان بۆ ئامادە کردبێ وە یان خەریکی ئامادە کردنی مەرجەکانی بن.

دیارە بێجگە لەوانە حیزبێکی سیاسی بەرنامە و رێبازی سیاسی دارژاویشی دەوێ. وام بیستووە کە مامۆستا زەبیحی بەرنامە و مەرامنامەی وەها حیزبێکیشی نووسیوە و تەحویلی مامۆستا شێخ عزالدینی داوە. بەلام هەرگیز مامۆستا یان دەفتەرەکەی بەرەسمی شتێکی ئاوایان بە ئاگاداریی ئێمە نەگەیاندوە و رای کۆمەڵەیان لەسەری نەخواستووە. بەش بەحاڵی خۆم، من بەراستی وەبیرم نایە قەت شتی ئاوام دیبێ.

٣- پرسیار: ئایا ئەوە راستە کە چەندین ئەندام و لایەنگری کۆمەڵە لە ناو دەفتەری مامۆستا بوون و ئەوان دژایەتی ئەو حیزبەیان کردووە؟ وەکوو کاک ئەحمەد ئەسکەندەری، کاک فاتح شێخ الاسلامی، مامۆستا مەلا عومەری عەسری؟

وەلام: نێوی دووسێ کەس براون کە گویا دەبێ وەکوو ئەندام و لایەنگری کۆمەڵە

لە دەفتەری مامۆستا دژایەتی پڕۆژەی دروست کردنی حیزبەکەیان کردبێ. بۆ ئاگاداریتان هیچ کام لەو کەسانەی نێو براون لەو کات دا ئەندامی کۆمەڵە نەبوون. هەر وەک باسم کرد، ئەندامانی دەفتەری مامۆستا بە گشتی دۆستی کۆمەڵە بوون. ئەوەش راستە کە هێندێک کەس لە دەفتەری مامۆستادا هەبوون کە لە باری فیکری یا سیاسییەوە خۆیان لە کۆمەڵە بە نزیکتر دەزانی وە ئەوەش شتێکی ئاسایی بوو و شاردراوەش نەبوو، بەڵام کۆمەڵە هیچ ئەندامی لە دەفتەری مامۆستا نەبوو. تەنیا ئەو کەسانەی کە بۆ پارێزگاری مامۆستا دیاری کرابوون بە شێوەیەکی رەسمی ئەندام و پێشمەرگەی کۆمەڵە بوون. هاتنی کاک ئەحمەدی ئەسکەندەری و کاک فاتح شێخ الاسلامی بۆ نێو کۆمەڵە مەسەلەیەکی زۆر دواترە، دوای هاتنیان بۆ نێو ریزی کۆمەڵەش ماوەیەکی پێچوو تا ئەوان بە ئەندامی کۆمەڵە وەرگیران. ئێمە بە دوور لە پڕەنسیپی سیاسیمان دەزانی کە لە نێو دەفتەری مامۆستا بە نهێنی ئەندام وەربگرین وە ئەو کارەمان نەکردووە. ئایا رای هەرکام لەو کەسانە سەبارەت بە مەسەلەی پێکهێنانی حیزبێکی تازە چۆن بووە با بۆخۆیان باسی بکەن، بەڵام رای کۆمەڵە ئەوە بوو کە عەرزم کردی.

٤- پرسیار: لەسەر گرتن و کوژرانی حامید بەگی جاف بە دەستی چریکی فیدائی چۆن ئاگادارن و بۆچی کوشتیان؟ ئایا پێتان وایە چریکی فیدائی ئەو سەردەمە بە بێ پشتیوانی هێزێکی ناوخۆیی کوردستان لە خۆی رابدیبا ئیشێکی وا بکا؟

وەڵام: ئێمە لە گرتنی حامید بەگ موخالیف بووین و چ بە نامە و چ بە قسە لە چریکی فیدائی مان راسپارد و داوامان لێکردن کە ئازادی بکەن. چریکی فیدایی نەک تەنیا ئەو کارەیان نەکرد، بەڵکوو داواکەی ئێمەیان کرد بە ئامرازێک بۆ «ئیفشاگەری» لەسەر کۆمەڵە و دەرکردنی بەیان لەسەر ئێمە. شایانی باسە کە ئەمانە لە کاتێک دابوون کە چریکەکان زۆرتر و زۆرتر بەرەو سیاسەتی پشتیوانی لە کۆماری ئیسلامی ئێران دەڕۆیشتن وە لە سیاسەتی ناوخۆیی کوردستانیش دا کەوتبوونە دژایەتی ئێمە و لە حیزبی دێمۆکرات چوبوونە پێشێ و بەیانیەی هاوبەشیان لەسەر هاوکاری دابوو. بەداخەوە ئێستا لەو فرسەتە کەمەدا ناتوانم بگەرێم و بەڵگە لەسەر مەسەلەی حامید بەگ کۆ بکەمەوە وە یا لە خەڵکی شارەزا بپرسم، بەڵام دەزانم کە کاک عبداللە بابان ئەوکات

نوێنەر و مەسئولی کۆمەڵە لە هەورامان بوو. رەنگە ئەو لە هەموو کەس باشتر بزانێ و بتوانێ بۆ ئەو مەبەستە یارمەتیتان بکا.

ئەوەی ئاشکرایە چریکی فیدائی ئەو کارەی لە درێژەی سیاسەتی بە دزێو نیشان دان و خەوشاندنی روخساری بزوتنەوەی شۆرشگێرانەی کوردستان دەکرد، هەر وەکوو ئەوەی کە حکوومەتی کۆماری ئیسلامیش هەوڵی دەدا وا نیشان بدا کە شۆڕشی کوردستان فیتی ئیسرائیل یا ئەمریکایە و کەسانی وەکوو پالیزبان و ئەوانە وەرێیان خستووە. ئێمە خراپەیەکمان لە حامید بەگ نەدیتبوو و پێمان وابوو سزای گرتن و کوشتن نییە. لانی کەم هیچ نەبێ بەڵگەیەکمان بە پێچەوانەکەی نەبوو. بێجگە لەوە ئەگەر خراپەیەکیشی کردبێ چریکی فیدائی هیچ بەڵگەیەکی بە کەس نیشان نەدا. لە هەر حاڵ دا کارێکی زۆر نامەسئولانە بوو.

بێجگە لەم هۆیە، رەنگە چریکی فیدائی ویستبێتی نیشان بدا کە ئەویش هێزێکە دەبێ حیسابی لەسەر بکەن و دەتوانێ خەڵک بگرێ و بکوژێ و حامید بەگی کرد بە قوربانی ئەو سیاسەت و رەوشتە چەوتانە. ئایا هێزێکیش لە کوردستان هەبوو کە چریکی فیدائی بە پشت ئەستووری ئەو دەستی بەو کارە دابێ، ئەمە شتێکە کە من ئاگادارییەک یان بەڵگەیەکم لەسەری نییە.

## نامەی کاک یۆسفی ریزوانی

ئاخر و ئۆخری سالی ١٩٩٥ بوو کە بیستم کاک یۆسفی ریزوانی "عەبدوللا شلێر" گەیشتووەتە دەرەوە. بە هۆی دوستێکی ئازیزم جێگا و شوێنیم دیتەوە و نامەیەکم ئاراستە کرد و لە مەر ژیانی زەبیحی داوای زانیاری و یارمەتیم لێکرد. لە گەل سپاسی لە رادە بەدەرم بۆ کاک یۆسف، جوابێکی دوور و درێژ و نامەیەکی زۆر دۆستانە و برایانەی بۆ ناردمەوە. نامەکەی کاک یۆسف چێژ و تامێکی یەکجار خۆشی هەیە و بە دل پێمخۆش بوو کە هەمووی وەک خۆی بلاو کەمەوە بەلام چون نامەکە زۆر خۆمانەیە و دەردی دلی برایەکی گەورە لە لای برای پچوکێتی، پرە لە بابەتی تر کە پەیوەندێکی ئەوتۆی بەو باسەوە نییە. زۆر قسەی تێدایە کە هەلدەگرن کتێبی تایبەتیان لە سەر بنوسرێ، باسی زۆر کەس کراوە کە بە پێویستی نازانم من ناویان بدرکێنم، پرە لە گێرانەوەی کوێرەوەری و ئاوارەیی خودی کاک یۆسف کە لە رێگای سیاسەت و کوردایەتی بەسەری هاتووە. من لە گەل دووپاتە کردنەوەی رێزم بۆ کاک یۆسف کە ئەو متمانەیەی بە من کردووە و ئەو دەردەدلانەی لەبۆ نووسیوم، لێرەدا تەنیا ئەو بەشانەی کە دەگەرێتەوە سەر باسی زەبیحی و سەردەمی کۆماری کوردستان دەخەمە پێش چاوی ئێوەی ئازیز و هیواداریشم کە کاک یۆسف دەست بۆ قەلەمە جوانەکەی بەرێ و رۆژێک ئەو سەرگوزەشتە پرروداوەی خۆی بگێرێتەوە بۆ مێژووی گەلەکەمان.

"برای بەرێز کاکە عەلی کەریمی

وێرای زۆر رێز و حورمەت جوانترین ئاواتت بۆ دەخوازم. بەو هیوایە هەر لە خۆشیدا بژین. کاکی گەورەم! نووسراوەکەت گەیشت، زۆر خۆشحال بووم کە لە بیرتان نەچوومەوە و یادت کردووم. ئومێد دەکەم هاوتات زۆر بن و بیرێک لە رێبازیان بکەنەوە و یادی هەلوەداوێک لە بیر نەکەن...

با زۆر سەرت نەهێشێنم، راستە من زۆر لە خاڵت نیزیک بووم و زۆر شت لە بارەی ئەو دەزانم. خوالێخۆشبوو تا ئەو رادەیە بڕوای بە من بوو کە ئیبراهیم ئەحمەدی ناسراو و جەلال تالەبانی و مامۆستا مەلا عەبدوللا ئیسماعیل (وەزیر) و زۆر کادری بەڕێوەبەرایەتی جەلالییەکانی ئەو سەردەم و یەکێتی نیشتمانی ئێستا ئەگەر ویستبایان چاویان پێ بکەوێ دەبا بێن بۆ لای من و من وەعدی دیداریان بۆ دیاری بکەم و چاویان پێ بکەوێ، بە بێ ئەوەی من هیچ کارەیەک بم. تەنیا ئیعتمادی بە من هەبوو. دەبوایە من خانووی بۆ بگرم و هەر من بزانم لە کوێ دەژی. بەرانبەر هاوڕێکانی زۆر بێ باوەڕ بوو، تا ئێستاش لای من هیچی دەرنەدەبڕی، هەمیشە بێدەنگ و سادە دەژیا. وابزانم مەسئولی ماڵی حیزبەکەیان بوو، هێندە لەو بارەوە بە ساکاری دەژیا کە جل و بەرگ و خواردن و کرداری لە پیاوێکی نەدار و بێکارە دەچوو کە مرۆڤ زگی پێدەسوتا، کەچی ئەوانی تر های لایف و شایانە رایان دەبوارد و هەر یەکەی چەند ماشێن و چەند کەسیان بۆ ئاگاداری دەگەڵ بوو کە پووڵێکی زۆریان خەرج دەکرد و خانوو و تەشریفاتی تایبەتیان هەبوو. ئەویش یەک دوو ژووری لە ماڵێکی فەقیر بەکرێ دەگرت و هەمیشە وەک راهیبەیەک دوور لە هەموو خۆشییەک دەژیا. بەرانبەر هەموو شتێک بێ ئیعتماد دەیڕوانی. تەنیا لە پاکی من بێ شک بوو، رووحی هاوولاتی و هاوشاری و ناسیاوی کەس و کارم ئەو ئیعتمادەی بۆ پێک هێنابوو. لەباری ئەخلاقی یەوە پاکی و نەزیهی بێ وێنە بوو. بە گوێرەی کارەکەم کچ و ژن و خانەوادەیەکی زۆر و کچانی دەبیرستان هاتووچۆیان دەکردم تا ئێستاش تەنانەت بۆ جارێکیش نەمدی چاو بەرز بکاتەوە، هەمیشە سەری شۆر دەکردەوە و لە پاکی دا مەگەر حەزرەتی عیسا هاوتای بایە. دەیتوانی هەموو شتێک بکا بەڵام خواریی تێدا بەدی نەدەکرا، زۆرجار بە زۆڵێتی دەمکووت مامۆستا عولەما تەماشا کە خودا چی خولقاندووە! لە وەڵام دا لیچ و لێوی تێک دەنا و خۆی گرژ دەکردەوە و منیش بە بزەیەکەوە بێدەنگ دەبووم و ئیتر لە فزوولی دەکەوتم و لاپەڕەیەکی ترم هەڵدەدایەوە. هەمیشە لێی لە فێڵ بووم نەمدەهێشت بزانێ کە حیزبایەتی دەکەم و خەریکی بووژاندنەوەی حیزبم. هەر ئەوەش هۆیەک بوو کە زیاتر بڕوام پێ بکا. لە ماڵەکەی سەرم لێدەدا هەر چەندێک دانیشتبام لێوی نەدەجوولایەوە، هەر

خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو. هەرکات بەرەو کۆبوونەوە دەرۆیشت بە ئیحتیاتەوە ڕێگای دەبڕی و بەرەو کۆبوونەوەی حیزبەکەیان دەرۆیشت. هەر چەند من لە باری ڕەوانی گورج و گۆلیم هەبوو و بە زیندان و لە تێکۆشانی حیزبی دا و لە تەحقیقاتی پۆلیس و بازجوویی دا وریاییەکی باشم دەست کەوتبوو هیچی لێ تێنەگەیشتم. شەخسیەتێکی تایبەتی بوو. ئەوەی بۆ من سەیر بوو و عەلامەتی سوئال و پرسیاری بۆ دەهێنامە گۆڕێ ئەوە بوو کە بلێی ئەو پیاوە خۆی ناسیبێ؟ تا ئێستاش هیچم بۆ روون نەبۆوە. زۆرجار ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتی حیزبەکەیان لە بارەی ئەودا پرسیاری زۆریان لێدەکردم بەلام من هەر سەرم دەلەقاند و چاوم بز دەکردەوە، لێرەدا بۆم دەرکەوت ئەوانیش لە بارەی ئەودا هەر وەک من گێژن و وڕ ماون. تەنیا کەسێکی لەو نیزیک بوو هاوکارەکەی بوو کە : "محمدی شاپسندی" خەلکی مهاباد بوو. گشت نەهێنیەکانی لای ئەو بوو، کە دەتوانێ چۆنایەتی ئەو رووناک بکاتەوە، بەداخەوە ئەوانیش تێکچوون، وابزانم هەرچی هەیبوو لای ئەو ماوەتەوە و ڕەنگە وەک باس دەکەن باقی فەرهەنگەکەی لای ئەو ماوەتەوە. کاک محمدی ناو براو زۆر کورتە بالا و ڕەقەلەیە بەلام دەزانم هێندەی لە دەرەوە بە دیارە وە چەند هێندەی لە بن عەرزدا شاراوەیە و هیچ هێزێک ناتوانێ بیدۆزێ، ئەویش جلدی دووهەمی خالتە و وا ئێستا لە شاری سولەیمانی دەژی. چەند هێندەی جەنابتان بە تاسەوە بووم شتێکی لێ هەلکڕێنم، نەمتوانی بایی قڕانێک بیجوولێنم و ئیتر فاتیحام بۆ خوێند. لەو کەسانەی زۆر مامۆستا عولەمایان خۆش دەویست و بەرانبەر ئەو وەفادار بوو مامۆستا مەلا عەبدوللا ئیسماعیل بوو کە ئاگاداری هەموو شتێکی مامۆستا زەبیحی بوو، تا ڕۆژی کوشتنی ئاگاداری وەزعی ژیانی بوو، تا ئاخر دەقیقەش بەرانبەر ئەو وەفادار و دلسۆزی بوو وە ڕەنگە تا ئاخرین هەناسەی لە بیری نەکا. بەلام ئەگەر زاریش نەکاتەوە ڕەنگە گوناحبار نەبێت و ئەوە سیاسەتی حیزبێکی سەر بە دەرەوەیە و هیچ لە دەستی خۆیاندا نییە و ئەگەر خواریش بجولێنەوە تووشی ئەو چارەنووسە نادیارە دەبن کە تا ئێستا هەر بە ڕێوە چووە.

کاکە عەلی گیان با ئێمە ئاورێک لە خۆمان بدەینەوە، رابردووی خۆمان هەلدەینەوە، چما ئینسانێکی رووناک بیر و خاوەن بیرورا و زەحمەتکێشی وەک شەهید

کاک سەدیقی ئەنجیری جارێکی تر لە دایک دەبێتەوە؟ کە حیزبێکی خاوەن هەزاران شەهیدی وەک "حدکا"ی خۆمان لە بیری بکاتەوە؟ کاک سەدیق ئەنجیری بە مەزلوومی لە دایک بوو و بە مەزلوومی بە هۆی سازمانی ئەمنیەتی شاهنشاهی لە عێراق بە دەستی ئەندامی سەرکردایەتی پارتی دێمۆکراتی عێراق "زەکی کامل" خەڵکی ئاکرێ کە پێشمەرگەیەکی کار بە دەستی پ.د.ک بوو شەهید کرا و کوژرا. کاک سەدیقی ئەنجیری لە لایەن کاک هەژاری موکریانی دەعوەت و بانگ کرابوو کە وەک باس دەکەن حسن اسحقی ش دەستی لەو تاوانەدا هەبووە. بەڵام لە هەمووی سەیرتر بۆ دەبێ کاک هەژاری شاعیر و دڵسۆزی کورد!! بە خۆی ئیجازە بدات ئەو جینایەتە گەورەیە بشارێتەوە؟!!...

پێش هاتنی ئایەتوڵڵا خومەینی، خاڵت مامۆستا زەبیحی ناردرا بۆ خاریج و لە تورکیا بە پاسپۆرتی بێ ئیشارە و ئیمزا چوو بۆ سوریا و دە گەڵ حافظ اسد کۆ دەبێتەوە، دیارە دەزانی بەعثی عێراق و سوریا بە خوێنی سەری یەکتر تینوین و هێندەی ... و... و... دوژمنایەتیان هەیە. هێشتا مامۆستا زەبیحی نەگەرابۆوە کە نەواری مزاکراتی ئەو و حافظ اسد دەگاتە دەستی کاک صدام و مخابەراتی عێراق، ئەو داماوانە!! لە فرودگای بەغدا دادەنیشن و ئینتزار و چاوەڕوانی کاکی زەبیحی دەکەن و دەزانن کەی دەگەڕێتەوە.
ئەوە لەو کاتە دایە کە مامۆستا زەبیحی وا دەزانێ کە کاری سیاسی دەکا و هیچکەس لە غەیری بەڕێوەبەرایەتی حیزب لە جم و جۆڵی ئەو ئاگادار نییە!! هەر کە پێ دەخاتە فرودگای بەغدا چاوی دەبستن و بەرەو زیندانی "فضیلیە" لە خاریجی بەغدای دەبەن و نەواری وت و وێژەکەی دە گەڵ حافظ اسد بۆ لێدەدەن و دەکەوێتە بەر لێدان و ئیهانەت بەڵام لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە مامۆستا عولەما هیچ وریا نابێتەوە و حیسابێک بۆ ئەو نمایشە ناکات. ئەوەی بەرچاوە کە برای وەزیر مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل هەر بە مامۆستا عولەما بەوەفا دەمێنێتەوە، هەموو رۆژێ دوای دەوامی وەزارت دەگەڕێتەوە ماڵێ و سندووقی ماشێنەکەی پڕ لە خواردن و میوە دەکا و بێ حەسانەوە بەرەو زیندانی "فظیلیە" دەڕوا و درەنگانێک لای دەمێنێتەوە. دیارە دیتنی حافظ اسد سەرکۆماری سوریە لە گوناحە هەرە گەورەکان دەژمێردرێ، ئەو تاوانە لە روانگەی بەعثی عێراق گوناحی کەبیرەیە و دەبێ چەند جار ئێعدام بکرێ مامۆستا هێمن کە هێشتا ناوی

جاشێتی پێ خەلات!! نەکرابوو بۆ رزگاریی کاک عولەما دەکەوێتە ناراو. و گۆیا وەک من لە زمانی خۆیم بیستووە لە دیدارێک دە گەڵ صدام دەڵێ ئێمە حەز لە ڕەبیحی ناکەین و حەز ناکەین کە چارەشی ببینین بەلام ئەگەر بێتو بەری نەدەن و سان ئێعدامی بکەن لە دوارۆژدا تاریخ دەنووسێ صدام عالم و زانا و نووسەرێکی کوردی ئێعدام کرد گۆیا ئەو قسەیە گورچووی کاک صدام دەگرێ و خێرا بەری دەدا. بەلام خودا شاهیدە مامۆستا عەبدوللا ئیسماعیل زۆری پێ خۆش بوو ئەو بگرن و مامۆستا ڕەبیحی بژەن و هیچ کەسی تر خەمباری نەبوو. دوای ئەو کارەساتە لە شۆرشی ١٣٥٧ی ئێران مامۆستا عولەما دەگەرێتەوە ئێران و دەگەڵ مامۆستا مەلا شێخ عیزەدین خەریکی کورد بەسی دەبێ وابزانم ئەگەر درۆ نەبێ لە ئەندامانی حدکا تەنیا من بووم بە پێشوازی چووم و ر حەقی بە سەرمەوە بوو دەبوایە من سپلە نەبم. بەلام ئەو جارەش سەرم وە بەرد کەوت هەرچی ویستم بزانم بەرنامەی بۆ گەلەکەم چیە و دەیەوێ چبکا و ئەگەر پێویستی هەبێ سوێنی بکەم و ئەوەی لە چەنتەم دایە خزمەتی بکەم، دیسان هیچم لێ نەزانی و هیچ ی نەگەیشتم. ئەگەر مامۆستا شێخ عیزەدین بیەوێ شتێک لە هەموو شتەکان بزانی رەنگە بتوانێ یارمەتیت بکا. بەلام مامۆستا ڕەبیحی هێندە گرێدار بوو گرتی ئەو بە کەس نەدەکرایەوە مەگەر خوا بزانێ چۆن بوو ئەگینا کاری بەشەر نەبوو و هیچ کامپیوتڕێکیش هێشتا دروست نەکراوە کە حافیزە و هۆشی ئەوی هەبێت. هێندە دوورە پەرێز بوو کە دەی ٦٥ ساڵ عومر هێشتا شتی وام بەرچاو نەکەوتووە...

... زۆر لات سەیر نەبێ لەو نیو چەرخەدا چ رووداوێکی خوێناوی بە ناوی دێمۆکراسی رووی داوە.

١- ئێمە بە گشتی شانازی بە حکومەتی کوردستان دەکەین و دەبێ هەر بیشی کەین چونکو سەرکەوتووترین بەرهەڵستی مێژوویی بووە لە تاریخی کورد دا بە گشتی. لە زەمانی قازی محمدی شەهید دا دەگەڵ ئەوەی بە ناوی دێمۆکراتی حوکم مان بە سەر خەڵک دا دەکرد و وەزارەتی عدلییەمان بە سەرۆکایەتی خائن و خۆفرۆش مەلا حسینی مجدی هەبوو هەر ئەوکاتە بە بێ محاکمە و لێ پرسینەوە بە دەستووری شەخسی قازی محمد لە کۆلانی جوولەکان نیزیک کارێزی میهەن تور لای مالی دەدە نیسانی جوولەکە

ئاقای محمودیان، گەورە رووناک بیری مهابادی ئەو زەمان تیرۆر کرا. تا ئێستاش ئەم کارە سەدان پرسیاری هێناوەتە گۆڕێ کە بە بێ ولام ماونەوە. ئاقای محمودیان رووناک بیرێک بوو کە زۆر لە تاران ژیا بوو، لە باری بیروباوەروە دژ بە قازی محمد بوو. ئێمە وەزارەتی دادگوستەری و شارەبانی مان هەبوو، رەئیسی گشتی شارەبانی خوالێخۆشبوو سەید پیرە بوو، ئاقای کوردستانی خەڵکی بۆکان رەئیسی ئیتلاعاتی شارەبانی بوو، ئەوەی بۆت دەنووسم لە بۆکان بانگم کردووە و لە زمانی ئەوم بیستووە. ئەیکووت دەستورم بۆ هات بە نەهێنی محمودیان بکوژم، من پیاو کوژ نەبووم دەستورەکەم ئیجرا نەکرد و چوومە لای قازی محمد و پێم کووت ئەو کارە ناشەرعی یە چۆن دەبێ بە بێ پرسیار و محاکمە بی کوژم؟ فەرمووی دەستور دەبێ ئیجرای کەی، منیش بە تورەیی هاتمە دەر و وتم هەرگیز شتی وا ناکەم و چ دەبێ با ببێ. بۆ بەیانی محمودیان تیرۆر و شەهید کرا. قاتلەکان مام قادر و هاشم سەعید بوون و دوای کۆماری کوردستان هاتنە عێراق و مام قادر لە کۆیە و رانیە مایەوە و کاک هاشم لە هەولێر، وا ٥٠ ساڵە لە وەتەن دوور کەوتوونەوە و تاوانی ئەو ستەمە دەکێشن. وەک بیستوومە ئاقای محمودیان هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی بووە، نیزیکی زۆری بە حیزبی تودە هەبووە. لە ١٩٦٧ لە بەغدا لە دوکتۆر رادمنیش سکرتێری حیزبی تودەم پرسی وتی تاریخەکەی زۆر کۆنە و نایناسم.

بەرەبەیانی کە قازی محمد شەهید کرابوو من و باوکم و براکەم رامان کردە چوارچرا و بە دڵی پڕ لە زام و ئێش و ئازار و فرمێسک روانیمانە جەنازە شەهیدەکان کە هەڵواوەسرابوون. تەواوی مهاباد بە پیاو و ژن و لاو و مناڵ لە چوارچرا کۆ ببوونەوە و بە دزێوە دەگریان و فرمێسکیان هەڵدەرشت، لەو کاتە ناخوش و نالەبارەدا براگەورەی ئاقای محمودیان کە پیاوێکی نیوە ساڵ و شەل بوو، بە گۆچانەکەی جەنازەی قازی محمدی وەبەر گۆچانان دا تا شل بوو بە گۆچان تەرمی شەهیدی کووتا و هەر گۆچانەی کە دەیوەشاند دەتکوت بە تۆپ و هاوەن لە دڵی خەڵک دەدرێ. دوای ئەو هەموو ساڵانەش تا ئێستا نەدیتراوە تایفەی محمودیان کەماڵەکەیان لای ماڵی حاجی صالحی شاطری بوو دەوڵەتخوا یان خراپ بن. ئەوەش لاپەڕەیەکی مێژوویی یە کە تەواوی خەڵکی شاری مهاباد بە چاو دیتیان.

٢-بۆ ئەوەی حکومەتی خائینی ئێران وا پێشان بدا کە حکومەت ئەوانە شەهید ناکا کەوتنە بازار و ئیمزایان کۆ دەکردەوە کە دەبێ قازی ئێعدام بکرێ. یەکەم ئینسانی کە پەنجەی خستە سەر کاغەز وەزیری دادگوستەری مەلا حسین مجدی و مەلا صدیق صدقی بوو کە داوای ئێعدامی قازی محمد و هاورێکانی یان کردبوو. لە قەیسەری مهاباد بۆ ئیمزا کۆ کردنەوە دەگەڕان تەنیا کەسێکی حازر نەبوو ئیمزای بکات ئاغای رەیانی بوو! هەرچەند پێیان وت ئەگەر ئیمزای نەکەی ئێعدام دەکرێی فەرمووی چم لێ دەکەن بیکەن و یەک کەلام ئیمزای ناکەم و ئەوە قەنارەی ئێوە و ئەوش ملی من چم بەسەر دێ با بێ. مالی ئیلخانی زادەکان کە لە حکومەتی کوردستاندا بەشدار بوون هەرچی بۆیان کرا دژی کورد و جوتیاران دریغیان نەکرد و گەورەترین پشتیوانی حکومەتی تاران بوون.

٣-بە چاوی خۆم دیتم کە قازی محمد خەلکی لە مزگەوتی مهاباد کۆ کردەوە و فەرمووی ئەوە حکومەتی ئازربایجان تەسلیم بوو، من تا ئێستا کە سەرۆک کۆمار بووم وا ئێستا پێشمەرگەیەکی ساکارم و تفەنگ بە دەست، پشتیوانیم بکەن، واجبی نیشتمانیە دەبێ کۆمار بپارێزین. لە ناو تەواوی خەلکی شاری مهاباد حاجی حسن زبیری کە لە دەولەمەندەکانی مهاباد بوو دەنگی هەلبڕی و وتی قازی دەتەوێ شارەکەمان ویران بکەی، ئێمە حازر نین لە بەرانبەر حکومەتی تاران بوەستین و خیانەت بە نیشتمان بکەین!! خەلکی ترساند بەلام قازی دەرگای سەربازخانەی کردەوە هەرچی چەک و ئالەتی دیفاع بوو تەسلیمی خەلکی مهابادی کرد و وتی کێ پیاوە با دیفاع بکات. لەو کاتەدا حەمەی مەولود بە خۆی و پێشمەرگەکانی هاتە گۆڕەپانی کۆبوونەکەوە و بەو لەهجەیە وتی ژنو ... سابلاغی ئەوە بۆ پیاوتان تێدا نەماوە، چۆن سەر شۆڕ دەکەن. هەرچی چەکی قورس بوو بردی و وتی ئەوە من دەچم بۆ میاندواو پردەکەی دەروخێنم و با شاه پیاو بێ و بتوانێ پێ بنێتە مهابادەوە. تەواوی مێشە و باغەکانی مهاباد و ئیندرقاشی داگیر کرد و مسلسلەکانی دامەزراند و چەند جنێوی توندی بە حاجی حسن دا و لە مەیدان دەرچوو و دەگەل بارزانیەکان دەرچوون. ئەوەی زۆر بەرچاو بوو هەرچی پێچ و شەدە و بالتۆ و کەوشی تازە بوو بە زۆری لە خەلکیان هەستاند و لە شار دەرچوون. شەر لە لای نەغەدە دەستی پێکرد و بە عێراق و ئێران و تورکیا بارزانیەکان و دەستەی حەمەی مەولودیان بە

گسب چەکی قورس ـاکو.. و جارێکی تر هێزی ئیرتجاع کوردستانیان داگـ کرد و بە
سەدان ئینسان شەهید کران

٤-قادر شەریف هاشم اقل الطلاب" کە ئێستا شۆرەتیان گۆڕاوە لە سولەی
ـاو مزگەوتێک دا بە بۆمبی دەستی شەهید کرا و ناوی لە دەفتەری هیچ حیزبێک
و ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی کاتی خۆی بوو. قاتڵەکەی یوسف لووتە ناوێک بوو
بەر بوو وا ئێستاش یوسفە لووتە هەر ماوە و بڕێکیش داواکارە. چەندان ئەندامی
کوژران و تەحویلی ئێران دران و سولەیانی موعینی بە دەستی قادر تەگەرانی و کادربـ
ناسراوی پارتی پێش فرۆش کرا و لە ئەدەبیاتی حیزب دا سڕاوەتەوە و یادی ناکرێتەوە.

خوالێخۆشبوان کاک هەژار و مامۆستا عبدالرحمن زەبیحی لە کوردستانی ئێمەد
دوو ئینسانی زەق و لێ هاتوو بوون بەڵام بەداخەوە دوای ئەوەی ئاوارەی هەندەران بوور
حیزبی دێموکراتیان لە بیر چۆوە و بوون بە شیوعی، هێندەی پێ نەچوو بوون بە ئەندامی
بەرزی پارتی دێموکراتی عێراق و لە ئاکام دا لێک هەڵگەڕانەوە، هەژار پارتی مایەوە و
مامۆستا زەبیحی لە ریزی پارتی هاتەدەر و دەگەڵ مام جەلال تاڵەبانی ڕێبازێکی تریان
گرتە بەر و بۆ هەمیشە دژ بە "حدکا" وەستان و ئەوە بوو کە بە سەر خۆیان هێنا و دەتوانم
بڵێم کە سەرگەردان و پەشێواو ڕێگایان دەبڕی و دژایەتی تا سنوری لێک کوشتن کەوتە
ناویانەوە و بۆ هەمیشە ڕێبازی حیزبی دێموکراتی کوردستانیان بە جێ هێشت و لە ئێرانی
شۆڕانەوە. بە هەژاریان دەکووت شاعیری دەرباری و مامۆستا زەبیحی ش بە تۆمەتی
جاشی ٦٦ کەوتە بەر تۆمەتی جوراوجور، یەکیان لە بودجەی ئێران کەڵکی وەردەگرت و
ئەوی تر لە میزانیەی عێراق. بەڵام ئەوەی زۆر بەرچاو بوو و دەکرا پەنجەی بخەیە سەر لە
واقیع دا شەڕی ئێران و عێراق و دژایەتی ئەوانیان شان دابوویە و شەڕی ئەوانیان
خستووەتە ئەستۆ لە ئاکام دا ئێران و عێراق ڕێک کەوتن و یەکیان بۆ تاران و ئەوی
تریشیان بەرەو بەغدا هەڵکشان.

... با زۆر سەرت نەهێشێنم و زیاتر لەوە وەختت نەگرم، ئەو هەموو ریس و کوریسە
بۆ ئەوەم رستووەتەوە کە بگەینە ئەو ئامانجە کە جووڵانەوەکانی خۆمان لە رابووردوو و
حازردا بناسین و دواکەوتوویی خۆمان بناسین. لە هەر بوارێک دا کە دەست پێ دەکەین

یەکەم جار خۆمان بناسین و لایەنی بەرانبەریشمان دەست نیشان و بناسین و بەرەو تەکامول و پێگەیشتن بڕۆین، هەر نەچەقین و تورمز نەکەین. ڕەحمەتی خاڵت دەگەڵ ئەو هەموو شارەزای یە و تەجاروبە روحی ناسیۆنالیستی بە سەر تەواوی تێبینیەکانی دا سەپی بوو تا ڕۆژی نەمانی هەرگیز لایەنەکانی خۆی نەناسی و دەگەڵ ئەوەش لەبەر بێ باوەڕی بەوان دوورە پەرێز ببوو. ئێستا مەلیک حسین پادشای ئوردۆن تەواوی ئۆپۆزیسیونی بانگ کردووە کە حکومەتی عێراق دروست بکا، جا ئەوانەی دوای مەلیک حسینی عامیل و نۆکەری ئەمپریالیزم دەکەون دەبێ ماهییەتیان چبێ؟ ئەوەی نوێنەرایەتی یەکێتی قبوڵ بکا چارەنووسی هەر ئەوە دەبێ کە خاڵت پێیدا ڕۆیشتووە و ئاخریش سەر بە نیست دەبێ و پیاو خراپ دەردەچێ و زۆریش قەرزدار دەبێ، بەڵام هەر نوێنەرێک نوێنەری هەموو حیزبەکەیەتی ئیتر مەسئولییەتی فەردی لەسەر نامێنێ، چونکو لە خۆیەوە بەو کارە هەڵنەستاوە. خاڵت باش یان خراپ نوێنەری هەمووان بووە، ئیتر دەبێ مەسئولیەت موشتەرەک بێ، ناکرێ هەر ئەو پیاو خراپ یان پیاو چاک بێ. ئێستا ئەو ڕەوشتە هەموو لایەنە حیزبەکانی گرتووەتەوە و بە چارەنووسی خەڵک یاری دەکەن. جارێکی تر سڵاوی گەرمم پێشکەش دەکەم و هیوام وایە لە کارەکانتدا سەرکەوتوو بی.

شەهیدی هێشتا نەمردوو    یوسفی رضوانی ١٤/١/٩٦

# عەبدولڕەحمانی زەبیحی و سەرەتای برایەتی

عەبدولقادر دەباغی

لە سەرەتای مانگی نەورۆز یا خاکەلێوەی سالی ١٣٢٢ی هەتاوی (١٩٤٣- ز) کە مالمان لە شارۆچکە خنچیلانەکەی بۆکان بووکی رازاوەی موکریان بوو بەهەشتی کاک حەمەدەمینی شەرەفی میوانمان بوو لە گەڵ وتوویژ و قسە و باس ماوەیەک بوو دەیزانی کە من هەستێکی بەتینی کوردایەتیم هەیە و گۆڤاری گەلاوێژ و دیوانی حاجی قادری کۆییم هەیە و کوردی باش دەخوێنمەوە.

من نەمدەزانی کە منی بۆ ئەندامەتی کۆمەڵەی ژێ - کاف بە کۆمیتەی ناوەندی ناساندووە و ماوەیەکە لە ژێر چاودێری مەلا عەبدولڕەحمانی شەرفکەندی دام.

ئەو سەفەرە داوەتی کردم کە بچمە مەهاباد و لە مانگی گوڵان یا بانەمەڕدا چوومە مەهاباد، بۆ سبەینێکەی چووینە دوکانی کاک سەدیقی حەیدەری و منی پێناساند و شەخسێ بە ناوی عەبدولڕەحمانی زەبیحی هات و کاک سەدیق منی پێناساند و گوتی با بچین شیرچایەکی وەخۆین و قسانیش بکەین. پاش نەختێ قسەی لێر و لەوێ گوتی ئەگەر کۆمەڵەیەکی کورد بیهەوێ بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی و حەسانەوەی نەتەوە و بەختەوەری گەلەکەی حەول بدا، جەنابت قەبوولی دەکەیت؟ گوتم بە گیان و دڵ. گوتی مەرجی ئەندامەتی گرانە و خودای نەخواستە خەیانەت بکەی بە گورجی دەکوژرێیت! گوتم قەبوولمە و دەبێ وابێ، گوتی دوای نوێژی عەسر لە کن کاک سەدیق چاومان پێک بکەوێت.

لە وەختی خۆیدا چووم و لە مزگەوتی سەید نیزام دەستنوێژم گرت و چووینە مالێ، کاک سەدیق منی بە وان ناساند و ئەوانیشی بە ناوی حوسەین فروهەر و عەبدولڕەحمان کەیانی بە من ناساند و خاوەن ماڵ کە فروهەر بوو شیرینی هێنا و گوتی زارت شیرین کە.

پاش شیرینی خواردن گوتی دەستنوێژت هەیە؟ گوتم بەلێ، لە سەر مێزێ

قورئانێکی پیرۆز لە بەرگی سەوزدا کرایەوە و ئاڵای پیرۆزی کوردستانیشی لە گەڵ شمشێرێ هێنا و بە ٧ مادەی بە ناوبانگ و موقەدەسات و بە شەرەفی خۆم سوێندی وەفاداریم خوارد و بە ناوی سیامەک ٥٧ شەرەفی ئەندامەتیم وەرگرت و گوتیان دەبێ لە گەڵ زەبیحی دا بیت و دەستوری کارت بەوە.

بۆ بەیانی زەبیحیم دیتەوە و چووینە چاخانەیەک و بە تێر و تەسەلی بەرنامەی کاری بۆ دارشتم و نامەیەکی دووردرێژی بۆ کاک هەژار دامێ، گوتم هەژار ناناسم، گوتی دەیناسی و رەفیقی خۆتە و جەنابی مەلا عەبدولڕەحمانی شەرەفکەندیە کە چەند مانگە تۆ هەڵدەسەنگێنێ و ئاگاداری هەڵس و کەوتی جەنابتە.

بە کورتی لە گەڵ کاک هەژار کەوتینە کار و چەندین کەسمان بۆ ئەندامەتی لەبەر چاو گرت و لەو بەینەدا رەحمەتی حاجی رەحمان ئاغای ئیلخانیزادە لە مەهاباد شەرەفی ئەندامەتی وەرگرتبوو، یەکترمان ناسی و سێ بە سێ بە چەشنێکی بەرچاو کۆمەڵەمان پەرە پێدەدا کە بە منیان راگەیاند بچمەوە مەهاباد و چاوم بە زەبیحی بکەوێت، کاتێ چاوم پێیکەوت گوتی بەیانی لە کن کاک سەدیق دانیشە تا من دێم.

زەبیحی لە گەڵ دوو کەسی دیکەدا هاتن و گوتی فلانی ئەمانەتێکم لای کاک سەدیق داناوە، وەریگرە و ئەوەی پێویست بێ پێت دەڵێ. ئەمانەتەکە ١٠٠ بەرگ پەرتووکێ بوو بە ناوی (دیاری کۆمەڵەی ژێ - کاف) پێی راگەیاندم کە دەبێ بە نهێنی بە کەسانی بڕوا پێکراوی بفرۆشیت و ٢٠٠ تمەن کۆکەیتەوە! منیش بە پێکەنینەوە گوتم ئەگەر زیاتر بێ چی؟ گوتی تا زیاتر بێ چاکترە.

بە کورتی لە ماوەیەکی کەمدا "دیاری"م لا نەما و ٣٥٠ تمەنیشم وەرگرتبوو، بردمەوە بۆ مەهاباد و تەحویلی زەبیحیم دا، زۆری پێخۆش بوو و لەو ماوەیەدا خۆشەویستی زەبیحی لە دڵمدا جێگیر ببوو، ئەویش زۆر رێزی دەگرتم.

رۆژێکیان لێم پرسی کاکە گیان پرسیارێکم هەیە نازانم پێت خۆشە یان نا؟ گوتی فەرموو، گوتم حەز دەکەم ناوی نهێنی خۆتم پێ بڵێیت، گوتی هەرگیز پرسیاری وا لە کەس مەکە ئەوەندەی کە لازم بێ خۆمان پێت رادەگەیەنین بەڵام لەبەر ئەوە لە تۆ دڵنیام دڵت ناشکێنم ناوم "بێژەن ژمارە ٢"ە.

لەو ئامۆژگاریە و لە فرۆشتنی بە نەهێنی "دیاری" هەستم کرد کە رێگاکە هەروا سووک و سانا نیە و مەترسی زۆرە. بۆیە کاتێ کە بانگیان کردم و لەوەی کە لقی کۆمەڵەم لە سەقز و بانە دامەزراندبوو رەزامەندییەکی لە رادەبەدەریان لێکردم و سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری "نیشتمان" راوێژیان لە گەڵ کردم، بە کاک بێژەنم گوت ئەوە کارێکی پڕ مەترسیە و دەبێ بەو پەڕی نەهێنیکاریەوە بڵاو بکرێتەوە و بەش بە حاڵی خۆم دەتوانم لە بۆکان و سەقز و بانە بە باشی بڵاوی بکەمەوە و خوا یار بێت بۆ جێگای دیکەشی دەنێرم.

زەبیحی زۆری پێخۆش بوو ئیدی دەستووریان دامێ کە گشت کارێکت هەر لە گەڵ ئەو دایە، لەو ماوەدا من سەفەرێکی سلەیمانیم کرد و لقی کۆمەڵەم دامەزراند و گەڕامەوە، گوزارشەکەم بە زەبیحی پێشکەش کرد و لە ژمارە ٥ یا ٦ی نیشتمان بە رەسمی شانازی سپاسیان بۆ نووسیم بەڵام کۆمیتەی ناوەندی پەروەندەی گەرمێنیان جوێ کردەوە.

بەداخەوە زەبیحی و دڵشادی رەسوڵی و ئاغای قادری کەوتنە داو و گیران. چ لەو ماوە و چ لە دەوری کۆماری ئازیزدا من وەک موریدی زەبیحی وابووم و لام وایە ئەگەر وەزعی زەمانە ئەو گشتە ئاڵ و گۆڕەی بە سەردا نەهێنابا زەبیحی بەو ماندوویی نەناساییە و بەو دەست و داوێن پاکییە کەسایەتییەکی گەورەی لێ دەردەهات، داخی گرانم داگیرکەران ئەو جۆرە کەسانە بە هەر ناو و نرخێ بێ لە بەینی دەبەن وەکوو لە بەینیان بردن.[١]

---

١- ئەو نامەیەی مامە قالەی دەباغیم لەو ئاخریانەدا بە دەست گەیشت کە لەمەر دۆستایەتی خۆی و زەبیحی بۆی نووسیوم. وتووێژێکی تێر و تەسەلیشم لە سەر کۆمەڵەی ژ.ک و کۆماری کوردستان لە گەڵا کردووە کە هیوادارم بتوانم بە جیا بڵاوی کەمەوە. (دانەر)

خوێنەرەوی هێژا!

ئەوەی کە تا ئێستا خوێندتانەوە چەند لاپەڕەیەکی ژیانی زەبیحی بوو، بیروبۆچوونی چەند کەسایەتێکی کورد بوو لە سەر ئەو مرۆڤە. بە دڵ پێمخۆش بوو لە ناو وتووێژەکاندا توانیبام لە گەڵ کەسایەتێکی وەک حەمید دەرویش لە کوردستانی سوریاش وتوویژ بکەم و ئەو بەشەی کتێبەکەی پێ دەوڵەمەندتر بکەم، بەداخەوە بۆم نەلوا و رێک نەکەوت بچم بۆ ئەو شوێنانەی کوردستان کە لە پەنجاکاندا زەبیحی کوردایەتی تێدا کردووە.

من حەولم داوە لە زۆربەی قۆناغەکانی ژیانی زەبیحی تا ئەو جێگایەی کە بواری داوە و بۆم لواوە زانیاریتان بخەمە بەردەست. یەکێک لەو قۆناغانەی کە زۆرم حەولدا و چم دەس نەکەوت سەردەمی پێش دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ک بوو کە حیزبێک لە کوردستان بە نێوی "حیزبی ئازادیخوازی کوردستان" لە مەهاباد دامەزراوە و لە زەمانی رەزا شادا تێکۆشانی هەبووە. لە رووی ئەو کاغەز و بەڵگانەی کە زەبیحی لە مەر دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ک بۆ کاربەدەستانی سۆڤیەتی ناردووە و دامەزراندنی کۆمەڵە دەباتەوە بۆ سالانی ١٩٣٨ و ١٩٣٩ دەبێ مەبەست هەر "حیزبی ئازادیخوازی کوردستان" بێ و زەبیحیش تێدا بەشدار بووە و سەرئەنجام بەشێک لە ئەندامانی ئەو حیزبە بوون کە کۆمەڵەی ژ.ک یان دامەزراندووە.

لە سالانی ١٩٩٢ و١٩٩٣ سەرهەنگ عیسی پەژمان مەسئولی نیزامی ساواک لە بەغدا لە سالانی ٦٠، چەند کتێبێکی لە مەر رووداوەکانی خواروی کوردستان و پێکهێنانی پەیوەندی لە نێوان کوردەکانی خوارووی کوردستان و دەوڵەتی ئێران و دەستێوەردانی ساواکی ئێران لە ناو شۆڕش و ئەحزابی خوارووی کوردستان بلاو کردەوە. لە زۆر جێگا باسی زەبیحی و تەنانەت رەفاقەتی خۆی و زەبیحی دەکا. پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبانە هاتمە سەر ئەو رایە کە پەیوەندی پێوە بگرم و زۆرتری لێ بکۆڵمەوە. بەخوشێوە سەرهەنگ عیسی پەژمان بە پیر داواکارییەکمەوە هات و چەند نامەمان ئالوگۆر کرد.[1] من حەولم دا چەند هەڵەی زەق کە لە نووسراوەکانی دا بوو بۆی

---

١-بەشێک لەو نامانەم بە تەرجەمەی کوردییەوە لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا چاپ کردووە. (دانەر)

دەسنیشان کەم وەک: بە هەڵە نووسینی ناوی زەبیحی کە ئەو بە "عیسی"ی تۆمار کردووە، ژن خواستنی مەلا مستەفا لە تایفەی زێباری بۆ چارەسەری کێشەی نیوانیان، کە سەرهەنگ پەژمان پێیوایە کە ئەو ژن خواستنە دوای هاتنەوەی مەلا مستەفا لە سۆڤیەت بووە و لە دوای سالی ١٩٥٨ و کاتی دەسەلاتداریەتی عەبدولکەریم قاسم بووە و ئیتر نازانێ کە بەرهەمی ئەو ژن خواستنە کاک مەسعوود بارزانیە و کاک مەسعود لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە دایک بووە! من دوای پەیوەندی لە گەل سەرهەنگ پەژمان و خوێندنەوەی هەموو کتێبەکانی کە چەند دانەی خۆی بۆی ناردم و سپاسی دەکەم، گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە بەشی زۆری زانیارییەکانی سەرهەنگ پەژمان بۆ ئەوە نابن کە وەک بەلگە حیسێبیان بۆ بکرێ، هەر وەک ئەو نموونانەی سەرەوە زۆر لە باسەکانی تێکەل کردووە و مەبەستی زۆرتر خۆی و گەورەکردنەوەی رۆلی خۆی لە رووداوەکاندا بووە. هەروەک لە ناو وتووێژەکاندا هەستتان پێکرد من حەولم داوە لەسەر ئەو نووسینانەی سەرهەنگ پەژمان لە مەر زەبیحی، لە گەل ئەو کەسانەی کە شارەزای ئەو قوناغەن و خۆیان لە نیزیکەوە ئاگاداری پەیوەندی نێوان حکومەتی ئێران و بزوتنەوەی خوارووی کوردستان بە هەموو لایەنەکانیەوە (پارتی، بالی مەکتەبی سیاسی، مەلا مستەفا) بوون بدوێم و ئەوان زۆرتر زانیاریان لە مەر چلۆنایەتی عەلاقاتی زەبیحی و هێزە ئێرانیەکان لە بەغدا (بە حکومەت و ئۆپۆزیسیۆنەوە) بدەنە دەست. (بڕوانە وتووێژ لە گەل بەرێزان: کاک حەمەدەمین سیراجی، مەلا عەبدوللا، مامۆستا برایم ئەحمەد، مام جەلال)

ئیتر من لێرەدا ئەو بەشەی کتێبەکەم کە زۆرتر لە سەر چالاکی سیاسی و خو و رەوشت و کەسایەتی زەبیحی بوو کۆتایی پێدێنم و ئاکام و حاسلی ئەو باسانە بە تۆ خوێنەرەوەی هێژا و وردبین دەسپێرم، خوت لێکی بدەوە و شی بکەوە و بیدە بەر بیری تیژت و ئینجا خۆت سەر پشک بە و قەرار بدە کە زەبیحی کێ بوو و چی بەسەرهات و چۆن و بەدەستی کێ تێدا چوو؟!

ئەو بەشەی کتێبەکەم زۆرتر تەرخان کردووە بۆ چەند نووسراوەیەکی زەبیحی. بەداخەوە نەمتوانیوە هەرچی نووسراوەی زەبیحی هەیە کۆی کەمەوە و وەدستیان خەم. زۆربەی نووسراوەکانی زەبیحی جیا لە قامووسەکەی و تەرجەمەی کتێبی "جوغرافیای

کوردستانی ئێران" بە شێوەی نامیلکە و وتار لە گۆڤارەکانی کوردی و عەرەبی لە سەردەمی جیاجیا بلاو بوونەوە، کۆکردنەوەی ئەوانەش بە هۆی پەرش و بلاویی ئارشیوی کوردەواری ئیشێکی فرە زەحمەت و لە توانای تاکە کەس دا نییە. من حەولم داوە لەو نووسراوانەی کە وە چەنگم کەوتوون چەند دانەیەکیان هەلبژێرم و لێرەدا چاپیان بکەمەوە تا زۆرتر لە گەل شێوەی نووسین و زمانناسی و بیروڕای زەبیحی ئاشنا بین. زەبیحی جیا لە "نیشتمان" گۆڤاری کۆمەلەی ژ.ک و "کوردستان" رۆژنامەی سەردەمی کۆمار لەو بلاوکراوانەی خوارەوەشدا نووسینی هەیە:

"خەبات" ئورگانی پارتی دێمۆکراتی کوردستان چاپی بەغدا، کوردستان، روناکی، النور، هاوکاری، باهۆز، رزگاری، حەوت پرسیار لە گەل نووسەران (شاکر فتاح، محمدی ملا کەریم)، چریکەی کوردستان و...

# پەراوێزی ٨٧

(جەمال نەبەز)

ئەورەحمانی زەبیحی خەڵکی مەهاباد بوو، و یەکێک بوولە دامەزرێنەرانی "کۆمەڵەی ژێکاف" و بەرێوەبەری گۆڤاری "نیشتمان"یش بوو. لە پاش گۆڕینی نێوی "ژێکاف" بە "حیزبی دیمۆکراتی کوردستان"، بووبوو بە ئەندامی کۆمیتەی نێوەندیی ئەم حیزبە. لە دووای رووخانی کۆماری کوردستان لە زستانی ١٩٤٧دا، لە گەڵ چەند کەسێکی دی دا رایان کردە سیتەک و لای شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود بووبوو بە پەنابەر. لە سیتەک ژمارەیەک "نیشتمان"ی دەرکرد کە بە ژمارە (١٠)ی دانا. پاش ماوەیەک چوو بۆ بەغدا و بە نێوی "قادر"ەوە لە گازینۆی عەبدوڵلا کە خاوەنەکەی کوردێکی سنەیی بوو، کاری دەکرد. زەبیحیم بۆ یەکەمین جار لە بەغدا لە پاییزی ١٩٥٤دا ناسی، ئەوەش لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە "بەغدا جدیدە" لە ماڵی "قادر" (زەبیحی) ساز کرا، بۆ ئەوەی "تاقمی مەرکەز" (لایەنگرانی برایم ئەحمەد) و "تاقمی بەرەی پێشکەوتوو" (لایەنگرانی هەمزە عەبدوڵلا) رێک بکەونەوە کە لە وێ دا دەوری نێوبژیکەرم بینیبوو. برایم ئەحمەد لەو کاتەدا خۆی لە حکومەت شاردبووەوە، چونکە لە زەمانی وەزارەتی ئەرشەدولعومەری دا خۆی پاڵاوتبوو ببێتە نوێنەری سلەیمانی و لەوە دەترسا کە بیگرن. بەڵام بۆ ئەو کۆبوونەوەیە هاتبوو. بێجگە لە برایم و زەبیحی، حیلمی عەلی شەریف و عەلی شەریف و کوردێکی مەهابادی سەر بە حیزبی دیمۆکراتی کوردستانیش -کە نێوەکەیم بیر نەماوە- بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە بوون. لە ساڵی ١٩٥٦دا زەبیحی و هەژار -کە هەژار ئەو دەمە لە بەغدا لە گەرەکی فەزڵ وەک وێنەگر کاری دەکرد- رایان کرد بۆ سوریا. هەژار لە رێ ی کەرکووکەوە و بە مووسڵدا خۆی گەیاندە توورپاسپی، جا لەبەر ئەوەی ئەز لەو کاتەدا لە کەرکووک "معلم" بووم، چاوم بە هەژار کەوتەوە. کە لە هاوینی ساڵی ١٩٥٦دا چووم بۆ دیمەشق زەبیحیم بە رێکەوت لە

هوتێلی "فلسطین و شرق الاردن" چاو پێکەوتەوە، کە ئەو دەمە بە نێوی "عیسی عرفات"ەوە بۆ خاوەن هوتێلەکە کاری دەکرد کە کوردێکی دیمەشقی بوو و نێوی "ئەبوو ئەییوب" بوو. پاش کودەتای قاسم لە ١٩٥٨/٧/١٤دا زەبیحی گەڕایەوە بۆ بەغدا و ئەم جارە خۆی نێونا "عیسی الذبیحی" و بە نێوی "گەلی کوردی سووریا" وە لە بەردەم قاسمدا ووتارێکی خوێندەوە. لە ١٩٥٩ و ١٩٦٠دا خۆی نیزیک کردەوە لە داوودەزگەی قاسم و ئەمنی عێراق و کەوتە راپۆرتدان لە دژی ئەوکوردانەی کە وەک ئەو "محافەزەی جمهووریت"یان بە "سەرکردەیەتی ی کاکە کەریم" نەدەکرد، و لە نێو ئەوانەدا نووسەری ئەم ووتارە. زەبیحی لە شەستەکاندا خۆی خستە نێو دەستەی جەلال تالەبانی یەوە و لەوەشەوە خۆی لە دەزگەی رژێمی عارف و بەعس نیزیک کردەوە، کە ئەودەمە بە یارمەتی ی جەلال شەری بارزانی یان دەکرد و ئەمجا کەوتە ووتار نووسین دژی بارزانی و هەژاری کۆنە هاورێ ی. لە پاش بەیانی ئازار، خۆی خستە نێو دەزگەی "کۆڕی زانیاری ی کورد"ەوە، ئەو دەزگەیەی کە بارزانی بەخشیبووی بە ئیحسان شێرزاد و مەسعوود محەممەد و ئەمجارە خۆی کردە "زمانەوان". زەبیحی کابرایەکی زۆرزان و فیلباز بوو، بەلام هەتا بلێیت لە خۆبایی و خۆبەزلگرتوو بوو. ئەمەش هۆیەک بوو لەو هۆیانەی کە گیروگرفتیان دروست دەکرد بۆی. بێجگە لەوەش سووروشتێکی بۆقلەموونی یانەی هەبوو لە گچکەترین شت کە بە دلی نەبووایە توورە دەبوو و دەستی بە جنێودان دەکرد. بۆ وێنە هەر کەسێک تەماتەی بە کالی بخواردایە دەستی دەکرد بە جنێوپێدانی. لەباری خۆکەسی (شخصی)شەوە، زۆر سپلە و پێنەزان بوو. لە پەنجاکاندا، چ لە بەغدا و چ لە دیمەشق، بە نێوی ئەوەوە کە پێم وابوو مرۆڤێکی دەربەدەرە، خزمەتم کردبوو، ئەویش ئەو دەمە وا خۆی پێشان دەدا کە نەک هەر دۆستمە بەلکوو براشمە، کەچی لە دەورانی قاسمی دیکتاتۆردا نەپرنگایەوە لە جاسووسی کردن بە سەرمەوە بۆ دەزگەی قاسم و رژێمە دیکتاتۆری یەکەی. زەبیحی هەر چەندە خۆی بە شانازی یەکەوە بە مارکسیست دەدایە قەلەم، بەلام نە لەباری تیۆری یەوە و نە لە باری پراکتیکەوە فری بە سەر مارکسیزمەوە نەبوو. سەری زمان و بنی زمانی جنێوی پیسدان بوو بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق کە بە "کۆزمۆپۆلیت" نێوی دەبردن و تەنانەت نامیلکەیەکیشی بە نێوی "بەرپێچدانەوەی

کۆزمۆپۆلیتیزم"ەوە لە دژی کۆمۆنیستە عێراقی یەکان دەرکردبوو، و وای پێشاندابوو کە خۆی لەوان کۆمۆنیستترە. زەبیحی چونکە زۆر حەزی بە خۆ دەرخستن دەکرد، لووتی لە هەموو شتێک دەژەند و لە هەموو ئاشێکدا بەرداش بوو، و ئەوەش بوو بە هۆی لە نێو چوونی لە سەرەتای هەشتاکاندا. لە بارەی بێ سەر و شوێنی زەبیحی یەوە چەند چیرۆکێک دەگێرنەوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە زەبیحی پاش رووخانی رژێمی شایەتی لە ئێراندا هەل هەڵکەوت بۆی، خۆی بخاتە کایەی ناکۆکی نێوان رژێمی بەعسی ی عێراق و رژێمی ئیسلامی ی ئێرانەوە و بە نێوی ئەوەوە کە گویا دەتوانێ کوردی ئێران لە رژێمی ئیسلامی هان بدات کەوتە جرتوفرت، و چەک و پارەیەکی زۆری لە بەعسی یەکان وەرگرت. یەکێک لەوانەی کە ئاگای لە هەڵسوکەوتی ئەم دووایی یەی زەبیحی بوو، پێمی راگەیاند کە زەبیحی هێندێکی لەو چەکانەی لە بەعسی یەکانی وەرگرتبوو دابووی بە جەلال تاڵەبانی کە ئەو دەمە هاوکاری سووریا بوو و هەوڵی خۆ نێزیککردنەوەشی دەدا لە رژێمی ئیسلامی ئێران. ئەو سەرچاوەیە گوتی کە بەعسی یەکان بەمەیان زانی، بە خشکەیی شوێنەوونیان کرد.

خوێنەرەوی هێژا ئەوەی کە خوێندتانەوە پەراوێز (یا باشتر بڵێم "ووتار")ی ژمارە ٨٧ لاپەڕەی ٦٨ لە کتێبی "گۆڤاری نیشتمان" نووسینی "مامۆستا دوکتۆر جەمال نەبەز" بوو.

ئەوەی کە دەڵێن کورد بێ کەسە و مەیدانی سیاسەتی کوردەواری بۆتە دەشتێکی کاکی بە کاکی، درۆیان نەکردووە. ئەگەر وا نەبوایە نەدەبوو "دوکتۆر و مامۆستا و زانا و سیاسەتمدار و زمانەوان و بە درێژایی عومر لە فەرەنگستان ژیاو و..." یەکی وەک "دوکتۆر جەمال نەبەز" هەر وا بە ئەهوەنتە و بە نووکی خامەکەی، بە بێ بەڵگە و پشتیوانەیەک بۆ فەرمایشەکانی، مرۆڤێکی وەک زەبیحی تاوانبار کا بە "جاسوس" و "فێڵباز" و "سپلە" و...

یەکێکی وەک "دوکتۆر جەماڵ نەبەز" کە زیاتر لە نیوەی تەمەنی لە ئوروپا ژیاوە بەبێ شک چاک دەزانێ کە لەو ولاتانە کە تۆسقالێک بۆنیان لە دێمۆکراسی و شارستانیەتی بردووە و یاسا حکومەتیان بە سەردا دەکا و مافە سەرەتایەکانی مرۆڤ پێشێل ناکرێ، تۆهمەت لێدانی ئاوا بێ بەڵگە و لە خوڕا لە هاوولاتێک، لەوانەیە زۆر قورس بوەستی لە سەریی!

بەس "قەی ناکا" کورد بێ کەس و بێ ولاتە، مامۆستا زانا و پرۆفیسۆرەکانیشمان وەک "دوکتۆر جەمال نەبەز" لە "رووی دڵسۆزی" و "کورد پەروەری"یەوە لە دوورەوە و لە ولاتانی فەرەنگەوە بەو چەشنە میللەتە "بێکەس و دواکەوتۆکەیان" فێری دێمۆکراسی و حورمەت دانان بۆ مافی مرۆڤ و بەرەو شارستانی چوون دەکەن!

"سپڵە"یی هەر کەس باسی کردبا نەدەبوو "دوکتۆر جەمال نەبەز" باسی کردبا چونکوو ئەو هیچ نەبێ ماوەیەکی زۆر خوی بە کتێبی "گۆڤاری نیشتمان"وە خەریک کردووە کە هەمووی لەسەر کۆمەڵەی ژ . ک و بیری ناسیونالیسم و گۆڤاری نیشتمانە. خۆشی لە هەموو کەس رەنگە باشتر بزانێ کە یەکێک لە کۆڵەکە گرینگەکانی بیری ناسیونالیزم لەو سەردەمی رۆژهەلاتی کوردستان زەبیحی بوو، ئەو "نیشتمان"ەی کە "دوکتۆر جەمال نەبەز" کتێبێکی لە سەر نووسیوە و ژمارەی بەرهەمەکانی خۆی پێ زیاد کردووە، ئەوە زەبیحی بوو کە بە بەرهەمی هانی، ئەو ناسیونالیزمەی کە "دوکتۆر جەمال

نەبەز" خۆی زۆر پێوە هەڵداوەسێ، ئەوە کۆمەڵەی ژ.ک بوکە وەگەری خست لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و زەبیحی بڕبڕەی پشتیی بوو.

بەڕاستی وەفا بە دژی "سپڵە"یی هەروا دەبێ! کە مرۆڤێکی وەک زەبیحی کە بووەتە کەرەسەی نووسینی کتێبەکەی کاک دوکتۆر و هیچ نەبێ ئەوەندەی کە خۆی (دوکتۆر جەمال نەبەز) باسی دەکا خزمەتی بە نەتەوەکەی و "نیشتمان"ەکەی کردووە، ئاوا "نەبەزانە" باسی بکەی!

خۆ لە نێو کورداندا دەڵێن "پاش مردووان ڕەحمەت چاکە"، "دوکتۆر جەمال نەبەز" بە هۆی دوور ژیان لە کوردستان ئەو "نەریت"ەشی بیر چۆتەوە و بە درێژایی ئەو هەموو ساڵانە هەتا زەبیحی بۆ خۆی لە ژیان دابوو لێوی لە عاست ئەو تۆهمەتانە هەڵنەپچکریی و نووکی خامەکەی ئاوا تیژ نەکرد و ڕاوەستا هەتا زەبیحی ئێسقانەکانیشی بوو بە خۆڵ جا ئەو جار ئەو "برایەتی"یەی کە زەبیحی لە گەڵی نەکردبوو، ئەو دەرحەقی کرد!

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە وەبیر هەموو ئەو کەسانە بێنمەوە کە بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە هاوخەوباتی زەبیحی بوون و بە یەکەوە و لە سەنگەرێکدا خەباتیان بۆ کورد کردووە کە دوای مەرگی زەبیحی نەدەبوو لە عاست ئەو هەمووە بوختان و تۆهمەتانە بێ دەنگ بن و هیچ نەڵێن، چونکە خۆشیان دەگرێتەوە!

زۆر لە مێژ بوو کە ئەو "ووتار"ەی "دوکتۆر جەمال نەبەز"م خوێندبووە، بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ چ شتێک ئاوا کاک دوکتۆری ئێشاندبێ، چونکوو باش دەمزانی کە یەکێک لە خوورەوشتە نالەبارەکانی ئێمەی کورد ئەوەیە کە تەحەمولی ڕەخنە و ئیراد گرتنمان لە لایەن خەڵکانی ترەوە نییە. یەکێک کە ڕەخنەیەکی لێ گرتین، هەرچەند کە بە جێ و ماقووڵیش بێ، هەرچی تۆهمەت و بوختانە بۆی ساز دەکەین و برینەکەی خۆمانی پێ ساڕێژ دەکەین و گوێ نادەینە ئەوە کە هیچ حورمەتێک بۆ کەسایەتی ئەو شەخسە ڕابگرین و ئەوە بووەتە دابێکی زۆر دزێو و ناڕەوا بە تایبەت لە ناو چینی ڕووناکبیر و سیاسی ناو میللەتەکەمان. هەروا کە پرسیارم دەکرد لەم و ئەو هیچم بۆ ساغ نەدەبۆوە لە سەر "ووتار"ەکەی کاک دوکتۆر و بە هەر کەسم دەگوت کە لە سەر زەبیحی و جەمال نەبەز چ دەزانن شتێکم دەست نەدەکەوت و هەر ئەوەندە کە زۆربەی ئەو خەڵکانە دەیان گوت

گوێ مەدەیە و جەمال نەبەز هەر وایە و زمان شڕە و ددانی خێری بەکەس دانایە و قەبوڵی نییە کەس لە خۆی شارەزاتر، زمانەوانەتر، ئەدیبتر، شۆڕشگێڕتر، کوردتر و...بێ! بەڵام من دەمزانی کە دەبێ شتێک بووبێ کە برینی "دوکتۆر جەمال نەبەز"ی وا قووڵ کردووە.

هەتا ڕۆژێک لە کۆڕێک کە باسی ئەو مەوزوعەم کردماڵی کاک کەریم حیسامی ئاوەدان بێ و ئارشیوی هەروا دەوڵەمەند بێ، ئەو موشکیلەیەی بۆ حەل کردم و وەعدی پێدام کە چۆوە بولغار نووسراوەیەکی زەبیحیم بۆ بنێری کە جوابی ئەو پرسیارەی خۆمی تێدا بدۆزمەوە. زۆری پێنەچوو کاک کەریم وەک مەردان وەعدی خۆی بە جێ هێنا و بە پۆستدا ئەو نووسراوەیەی پێگەیاندم.

جا خوێنەرەوی خۆشەویست خۆت ئەو نووسراوەیەی زەبیحی بخوێنەوە و خوت حەکەم بە و خۆت قەرار بدە لە مابەینی "ووتار"ی زانستیانەی کابرای "دوکتۆر" و "خاوەن شەهادە" و "ئورووپا دیتوو" و هەروەتر زەبیحی "نەزان" و "بێ شەهادە" و...!

هیواداریشم کاک "دوکتۆر جەمال نەبەز" حەولێک بدا و ئەو "ووتار"انەی کە زەبیحی لەسەر "هەژاری کۆنە هاوری"ی نووسیوە بۆمان دەست نیشان کا تا بۆ مێژوو بمێنێتەوە و ئەو بەڵگانەش وەدەرخا کە زەبیحی "جاسوسی لە سەر کردووە و ڕاپۆرتی" لێداوە!

# ڕەخنەی زانستییانە یاخود شەلم کوێرم هیچ نابوێرم

عبدالرحمن زەبیحی

" *ڕۆشنبیری نوێ*، ژمارە ٧١، تشرینی دووەم و کانونی یەکەم ١٩٧٨"

ساڵێک زیاترە بەرگی یەکەمی «قامووسی زمانی کوردی» بڵاوبۆتەوە، هەموو ئەو ماوەیە هەر چاووم لە ڕێگا بوە کە خوێندەوار و زانایانی کورد، تەکانێ بدەنە خۆیان و دەست کەن بە ڕەخنە گرتن لێی.

بەداخەوە لەم ماوە دوور و درێژەدا تەنیا برای خۆشەویستم کاک مەحموود زامدار لە ڕۆژنامەی «هاوکاری»دا شتێکی لەسەر (قامووس) نووسی کە ئەویش زیاتر (پەسن) و پێ هەڵاکوتن بو لەوەی ڕەخنە لێگرتن و دیار خستنی کەم و کووڕیەکانی، هەر چۆنێ بێ زۆر سوپاس بۆ کاک مەحموود.

لەم دوایانەدا بیستم کە کاک جەمال نەبەز لە ڕووی لوتف و بەندەنەوازیەوە «قامووسی» بەسەر کردۆتەوە و لە «گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات، ژمارە ٢٢، ساڵی ١٩٧٨»دا ڕەخنەی لێگرتووە، ووتم ئۆخەیش! ئەوە ئاواتەکەم هاتە دی، هیچ نەبێ ئەوا کاک جەمال ڕچەی شکاند و لە وانەیە خەڵک چاوی لێ بکەن و بە نەشتەری «ڕەخنەی زانستی»یانە هەموو کەم و کووڕی «قامووس» - کە خۆم لە چەند جێگای سەرەتاکەیدا دانم پێیدا هێناوە- ئاشکرا دەکەن و منیش بە یارمەتی ئەوان و لە بەر تیشکی ڕەخنەکانیان، لە بەشەکانی دیکەی «قامووس»دا ئەوی پێی بڵێن کەم و کووڕی نایهێڵم.

هەوڵم دا گۆڤارەکەم وەدەست خست و خۆشی خۆشیم بوو کە شتێکی تازە لە ڕەخنەکانی کاک جەمال فێر دەبم، بە تایبەتی کە بیستبووشم دکتۆرای لە سەر (زمانانی ئێرانی) وەرگرتووە(١) کاتێ گۆڤارەکەم پەڕ پەڕ هەڵدایەوە دیتم ووتارێکی بە ناوی «سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بە کارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد» تێدایە و لە

لاپەڕەی ٧٩دا تا لاپەڕەی ١١٥ی داگرتووە، کە «دوکتۆر جەمال نەبەز» لە «بەرلین»را نووسیویەتی، خوێندنەوەی ئەم ووتارە بۆی دەرخستم کە ئەسڵی «ڕەخنە» گرتن یا باشتر بڵێم (شەڕی) کاک جەمال ڕووی دە (کۆڕی زانیاری کورد)ە و کاکی دوکتۆر «پاشی ساڵێ سلا ماڵی» تازە پاش حەوت ساڵ وەکوو مەتەڵەکەی عەرەبی دەڵێ «یدور دفاتر عتگ» و بە کارەکانی (کۆڕ)دا دەچێتەوە کە لە ڕۆژی دامەزرانیەوە تا ئێستا کردوویە و «دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا» و «ووشک و تەڕ پێکەوە دەسووتێنێ» و دەیەوێ هەرچی لەم ماوەیەدا کراوە بە (ساروخی دوور هاوێژ)ی ووتارەکەی لە (بەرلین)ەوە بپێکێ و بە هیچیان دەربێنێ، هیچ هەقیشی بەسەر ناوەڕۆکی ئەو کارانەوە نیە، (چاک) بن یان (خراپ) کاک جەمال (رەخنەی هاتوە) و دەیگرێ. چونکو ئەمە چەند مانگێک دەبێ بڕیاریان داوە هەر کارێکی (کۆڕ) بیکا خراپە و بێ سوود، ئینجا (قامووسی زمانی کوردی)ش کە لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد) چاپکراوە، بە ئاگری ئەم (شەڕ)ەوە سووتاوە و دوکتۆرج . ن . وای زانیوە «هەر کەس سمێڵی سوور بوو هەمزاغایە» و چونکوو «قامووس»یش بە ئیملای (کۆڕ) نووسراوە و لە (چاپخانەی کۆڕ)یش چاپ کراوە، دەبێ هەر بە کارەکانی «کۆڕی زانیاری کورد» دابندرێ، ئیتر سەرنجی ئەوەی نەداوە کە وەکوو کارەکانی کۆڕ لێی نەنووسراوە: «لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد». خوێنەرانی بەڕێز دەبینن کە (موتلق) کردنی کاران چۆن پیاو تووشی (هەڵە) دەکا و بە (سەهوو)ی دەبا، من وا تێدەگەم کە ئەگەر (قامووسی زمانی کوردی) لە چاپخانەی کۆڕ چاپ نەکرابایە و بە ئیملای کۆڕ نەنووسرابا، نەک گوڵێ «هەزار گوڵ بە جەماڵی مەولا»، کاک جەمال «کە هەر چەندە مرۆڤێکی زۆرزانە»(٢) لێی تێک نەدەچوو ڕەخنەی ناوا (زانستی)یانەی لێ بگرێ، هیوام وایە خوێنەرانی بەڕێز وای لێک نەدەنەوە کە من «قامووسی زمانی کوردی» بە (کار)ێک دەزانم کە ڕەخنەی لێ نەگیرێ، نەخێر قەت مەبەستم لەو قسانەی سەرەوە و ئەوانەش کە پاشان بۆ وەلام دانەوە دەیانکەم، ئەوە نیە کە بیبەمە مێشکانەوە قامووس کارێکی بێ عەیبە، نەک هەر بێ عەیب و کەم و کووڕی نیە بەڵکوو زۆریشی هەیە و «...ئەز هەوڵم داوە و هیواشم وایە قسەیێکی وام نەکردبێ بۆنی ئەوەی لێبێ کە ئەم قامووسە هیچ کەم و کورتی نیە و لە هەموو بابەتێکەوە نیشانەی پێکاوە...» (بڕوانە:

قاموس، سەرەتا، ل ١٠٠)، بەڵێ «قاموسی زمانی کوردی» ناتەواوی زۆرە. بەڵام ئەوە نییە کە دوکتۆر ج. ن بە (موتڵەق کاری) و (سەفسەتەبازی) دەیەوێ بیخاتە بەرچاوان، من لێرە ئەو شێعرە (فارسی)یەم بیر دەکەوێتەوە کە ماناکەی ئاوایە: «خراپترم لەوەی کە تۆ دەتەوێ پێم بڵێی ئاوای! بەڵام تۆ عەیبی من وەکوو من نازانی!».

(پێخوێ)ی (موتڵەقایەتی) و (موتڵەقکاری) قوڕێکی ئەوتۆ چیرە کە کەسی بۆ من لێ دەرنایە، جا بۆیە دەگەڕێمەوە سەر باسی ئەو (ڕەخنە زانستی!)یانەی کاک ج. ن لە «قاموسی زمانی کوردی» گرتوە و بۆیەشی گرتوە چونکوو بە یەکێک لە بڵاوکراوەکانی (کۆڕ)ی داناوە.

ڕەخنەکانی کاک جەمال کە لەژێر ناوی (هەڵەی زلەزلەی زمانەوانی دایە، چوار دێڕی لاپەڕەی ٨٦ و هەموو لاپەڕەی ٨٧ و حەوت دێڕی لاپەڕەی ٨٨ و بە تێکڕایی ٤٣ دێڕی گۆڤارەکەی داگیر کردوە، بەڕاستی ئاوا دەبێ (ڕەخنەی زانستییانە)، قاموس نەڵێم کاری خۆمە، سەرەتاکەی ١٠٠ لاپەڕەیە و پڕە لە بیروڕای وا کە هەڵدەگرن (دەبان و کوشتەری) ڕەخنەیان لێ بخرێتە کار، بەڵام وا دیارە بەلای کاک (ج. ن)ەوە کاری کابرایەکی «نەخوێندەوار» و «بێ شەهادە» ئەوە نایەنێ «دوکتۆر»ێکی خاوەن چەند «دوکتۆرا» خۆی پێوە ماندوو بکا و هەر ئەوەندە بەسە یەک دوو قسە لە گیرفانی خۆی دەرێنێ و پاشان بفەرموێ: «هەر لە لاپەڕەی یەکەمییەوە لە سەر بنچینەی هەڵە...» دامەزراوە.

من تێدەکۆشم نووسینەکەی کاک جەمال، ئەوی پێوەندی بە «قاموس»ەوە هەیە بڕگە بە بڕگە بخەمە پێش چاوی خوێنەران و پاشان ڕای خۆشمی لەسەر دەردەبڕم، لە لاپەڕەی ٨٦ ژمارە ٢٢ی گۆڤاری کولێجی ئەدەبیاتدا، کاک ئەبەز ئاوا دەست پێدەکات:

«١- کۆڕی زانیاری کورد لە ١٩٧٧دا فەرهەنگێکی بە نێوی «قاموسی زمانی کوردی» بۆ کاک ئەوڕەحمانی زەبیحی لە چاپ دا، قەی ناکا کە کاک زەبیحی گەلێک ووشەی کە کورد بە کاریان ناهێنێ بەسەر کوردا سەپاندوونی.»

لە پێش هەموو شتێکدا (کۆڕ) قاموسی بۆ من چاپ نەکردووە، هەر بۆیەش وەکوو بڵاوکراوەکانی دیکەی کۆڕ لەسەری نەنووسراوە: «لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری

کورد» ، قەی ناکا چونکوو کاک جەمال دەگەڵ (کۆڕی زانیاری کورد) ئیعلانی شەڕی کردوە و لە جەنگەی شەڕا لەوانەیە -لەبەر هەر هۆیەک بێ- ئینسان سەری لێ بشێوێ، یان تەپ و تۆزی مەیدانی شەڕ بەرچاوی بگرێ و چاوی بقووچێنێ و «شەلم کوێرم ناپارێزم» هەر چی بەردەستی کەوت بە تۆیان دایگرێ. بەڵام دەربارەی «گەلێک وشەی کە کورد بە کاریان ناهێنێ» و من بەسەر کوردا سەپاندوومن ئایا نەدەبوو کاک جەمال ڕوونی کاتەوە مەبەستی کامانەن؟ ئایا نەدەبوو هەروا بە دزی لە گیرفانیا چەمبۆڵە لە خەڵک نەنێ؟، سوپاس بۆ خوا نەمردووین و (ڕەخنەی نەبەزانە)شمان بە چاو دیت.

«قامووسی زمانی کوردی» هیندێک ووشەی (عەرەبی) تێدایە وا دەزانم مەبەستی دوکتۆر ج . ن ئەوان ووشانە بن، ئەگینا باوەڕ ناکەم ووشەگەلی فەرەنگی وەکوو: ئاتمۆسفۆڕ، ئیسکلێت، ئاتۆم، ئەلەکتریک، ئەلەکترۆن و دەیان ووشەی دیکەی لەم جسنە، ببنە جێی ڕەخنەی کاک جەمال و ئاڵۆزیان بکا، چونکوو خۆی هەر لە سالانی پەنجاکانەوە خەریکە ووشەی چەشنی کەلچەر (ئێستا کردوویە بە کولتوور) لە باتی (الثقافە) و ماتماتیک لەبری (ریاضیات) و دەیان ووشەی لەم بابەتە بەسەر کوردا بسەپێنێ، هەموو مرۆڤێکی بە ئینساف ئەوە دەسەلمێنێ کە من (ووشە)م بەسەر کوردا نەسەپاندوە، داخوا گوناهی منی تێدایە؟ کە لە سەرەتای ئیسلامەتی یەوە تا ئێستا لەبەر هۆی دینی و سیاسی و فەرهەنگی ووشەی (عەرەبی) دێنە ناو زمانانی فارسی، ئەفغانی، تورکی و کوردی یەوە و ئێستاش هەردێن. «گەلێک ووشەی کە کورد بەکاریان ناهێنێ» قسەیەکە کاک جەمال خۆی بە ئیسپات کردنییەوە ماندوو نەکردووە، با سەرنجێکی ئەم ووشانە بدەین و بزانین نەک کوردی خەڵکی شارەکان بەڵکوو کوردی لادێ پیش لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاریان دێنن یان نا؟ ئیستیقالە، ڕەفز، تەبیعی، تەبعەن، مەرحەبا، ئەوزاع، وەزع، وەزعیەت، ئیزافە، ئیرادە، ئیددیعا، دەعوا، ئیستیفادە، ئیستیقبال، ئیشتراک، ئیشکال، موشکیل، موشکیلە، ئیعتیبار، ئیفادە، ئیعتیراف، ئیزڕاب، ئیعلان، ئیقناع، ئیمتیحان، فەحس و دەیان ووشەی تری لەم چەشنەن کە «کورد بەکاریان ناهێنێ» و من لە «قامووس»دا نووسیومن و بە فەرموودەی کاک جەمال بەسەر کوردا سەپاندوومن. ئەگەر لەباتی «قامووسی زمانی کوردی» من ناوی «قامووسی ووشەی کوردی»م لە کتێبەکەم

نابا، ئەو دەمی کاک جەمال و غەیری کاک جەمالیش بۆیان هەبوو بڵێن نەدەبوو «ووشەی عەرەبی» تێدابا، بەڵام کە ووتمان (زمان) یانی بەرو بووی گۆڕان و پەرەسەندن و گەشە کردن و کارتێکردنی زمانی نەتەوەیەک دەزمانانی دەوروبەری خۆی و کارتێکرانی لە لایەن زمانانی دیکەوە، من لە سەرەتای قامووسا لەم بابەتە دواوم پێویست بە دووپاتە کردنەوە ناکا، تەنیا ئەوەندە دەڵێم هەر ووشەیەکی تا ئێستا هاتۆتە ناو زمانی کوردی یەوە و خەڵک لە قسەکردنی ڕۆژانەیان دا بەکاری بێنن لەهەر زمانێکەوە هاتبن من بە مڵکی زمانی کوردیی دەزانم و چ بە عەیبیشی نازانم بۆ زمانەکەمان، بەڵام کە قسە هاتە سەر (سەپاندن) مەسەلەکە تەواو هەڵدەگەڕێتەوە و ئەو کەسەی لە پەنجاکانەوە ووشە و زاراوە دادەتاشێ و هەوڵ دەدا بەسەر کوردا بیان سەپێنێ کاک جەماڵ خۆیەتی نەک من، ئەگەرچی لەو کارەیدا -خۆی لە هەموو کەس چاتر دەزانێ- سەرکەوتنێکی وای دەست نەکەوتووە.

«با لەوەش بگەڕێین کە کاک زەبیحی لە ژێر پەردەی ئەوەدا کە ووشەی تازە داتاشراوی بە دڵ نیە، چووە گەلێک ووشەی بێگانەی بەکار هێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لەنێو زمانی کوردی دا هەن وەک: قامووس، عامل، لەهجە، فرق، طبیعی، فعل هەنگامە، سەراسو...هتد کەچی چووە هێندێ ووشەی داتاشراوی کۆڕی بەکار هێناوە... ئەمانە هەمووی قەی ناکا و بۆ ئەو».

دەربارەی داتاشینی ووشە لە لاپەڕەی ٦١ی سەرەتای «قامووسی زمانی کوردی»دا ئاوام نووسیوە: «تعصب، خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپە لە هەر کارێکی بێ و بۆ هەر چێکی بێ، لە سالانی دوای شۆڕشی چاردەی تەمووزەوە بەڵکوو پێش ئەویش تعصبی ووشە داتاشین پەیدا بووە، هەر کەسێ دەستی قەڵەمی گرتوە، لە بەر خۆیەوە دەستی کردوە بە ووشە داتاشین، گەلێکیان هەر تەرجومەی ووشە یا زاراوەییێکی بێگانە بوون کە حەزیان لێ نەکردوە، داتاشینی ووشەی تازە بۆ زمانێک بەتاییەتی لەم زمانەدا کە هەموو ڕۆژێ شتی تازە دێتە گۆڕێ، کارێکی خراپ نیە هیچ بەڵکوو پێویستیشە، بەڵام بەمەرجێ دەگەڵ دەستووری زمانی کوردیدا بگونجێ نەک هەر کەسێ دەستی قەڵەمی گرت هەق داتە خۆی و بە ڕاستە و چەپەدا وەک ئاشی کرێوە ووشە دەرفرتێنێ، یا زاراوەی زمانێکی تر وەرگێرێتە کوردی کە ئەمیان هەر ئێجگار ئێشێکی نالەبارە.

ئەمە ڕای منە لەسەر ووشەی داتاشراو، بەڵام بۆچی کاک جەمالی پێ ئاڵۆز بووە؟ بەلای منەوە نابێ لەو هۆیانەی خوارەوە بەدەربێ، جا ڕەنگە یەکیان بێ یا هەموویان پێکەوە کۆبووبنەوە و بووبنە مایەی هەڵچوونی کاک جەمال، هۆیەکانیش ئەمانەن:

١- من ووتوومە (تعصب) شتێکی خراپە، کاک جەمالیش (تعصب)ی هەیە بۆ هەموو شتێک و لە هەموو کارێکدا.

٢- من هاتووم باسی (تعصبی ووشە داتاشین)م کردوە، کاک جەمالیش ووشەی داتاشیوە و هەموو کەس دەزانێ چەندە تعصبی هەیە بۆ ئەو ووشە داتاشراوانەی.

٣- من هەقی ئەوەم نەداوە بە تاقە ئینسانێک ووشە دابتاشێ، کاک جەمال بە تاقی تەنێ «زاراوەی زانستی» و (خۆماڵەکانی ماددە)ی داتاشیوە یان تەرجومە کردوە.

جا، کاک ج. ن وای زانیوە کە من ئەم قسانەم هەموو ڕووی لەوە، بەڵام من دڵنیایان دەکەم هەموو کاتی نووسینی سەرەتا و ڕێکخستنی بەشی یەکەمی قاموسەکە کاک جەمالم بە خەیالیش دا نەهاتووە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هیچ نامیلکەیەکی (ووشە)کانی ئەو دایتاشیون لەبەر دەستم نەبوون و لە ڕیزی سەرچاوەکانیشا ناویان نەهاتوە -هیوادارم کاک جەمال ئەو قسانەم وا لێک نەداتەوە کە پاکانەی بۆ دەکەم- تۆ بڵێی ئەو لە بیرنەبوونە یا بە خەیاڵ دا نەهاتنەش یەکێک لەو هۆیانە نەبێ کە کاک جەمالی شێواندبێ، ئاخر پیاوێکی «زورزان»ی وەک ئەوان، بەتایبەتی لە کاروباری زمانەوانیدا بۆ ئەوە نابێ بە بیرانەیەت چونکوو ئەمە گوناهێکی نەبەخشراوە.

کاک نەبەز دەفەرموێ من لە ژێر پەردەی بە دڵ نەبوونی ووشەی داتاشراوا چووم ووشەی بێگانەم بەکار هێناوە «کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە زمانی کوردی دا هەن وەک: قامووس، عامل،... هتد» من باش تێدەگەم کە دوکتۆر جەمال لە «ژێر پەردە»ی ئەم قسانەی دا دەیەوێ بفەرموێ چی! بەڵام نامەوێ «ڕۆنی خۆی دەسەری خۆی دەمەوە» و قسەکانی خۆی بە هەق و لە جێی خۆی -نەک وەک ئەوان بە خەیاڵ و نابەجێ- ئاڕاستەی خۆی بکەمەوە، بۆیە ئەم لایەنەی قسەکەی بێ وەڵام دەهێڵمەوە هەر ئەوەش هەڵدەگرێ.

پاش ئەوەی (تیر و توانج)ی کاک جەمالمان کە لە ڕستەی «... لە ژێر پەردەی ئەوەدا کە ووشەی تازە داتاشراوی بە دڵ نیە...»دا شاردۆتەوە خستە پاش گوێ یان، دەمێنێتەوە

ئەوەی کە ڕاست و ڕاست لەم رستەیە دەچێتە مێشکەوە، دیارە دوکتۆر جەمال گوێ ی لەوە نیە کە هەر کەسە لە نووسینا شێوەیەکی تایبەتی هەیە و هەر کەسە جورێک دەنووسێ، خۆشیان شێوەیەکی تایبەتییان هەیە، نووسینی هەر نووسەرێک تام و چێژێکی هەیە کە لە نی نووسەرانی تر ناچێ، ئەوانەی هێندێ نووسینی منیان خوێندبێتەوە -سەرەڕای ئەوەی کە نووسینم زۆر کەمە- تێگەییشتوون کە بۆ بەکار هێنانی ووشەی عەرەبی وەکوو ئەوانەی کاک جەمال ناوی بردوون، تعصبێکی ئەوتۆم نیە و بە شوێن زمانێکی کوردیدا کە هیچ ووشەی بێگانەی تێدا نەبێ، سەرم لە خۆم نەشێواندووە. نامەوێ زمانی کوردی ببێتە زمانێکی ئیشک و سەیر کەسی تێ نەگا، بەڵکوو هەر شتێک دەنووسم هەوڵ دەدم جۆرێک بێ ئەگەر بۆ کابرایەکی نەخوێندەوار خوێندرایەوە، لێی حاڵی بێ. ئەمە لایەکی مەسەلەی بەکار هێنانی ئەوان ووشە عەرەبییانە کە بە درێژ ساڵان هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و خەڵکیش تێیان دەگەن. بێ گومان هەموو نەتەوەیەک هەوڵ دەدا ئەوەندەی بۆی بکرێ ووشەی خوازراوە لە زمانەکەیدا (بژار) و (داتاشینی ووشەی تازە) نە کاری تاقە ئینسانێکە و نە هەقیشێتی، هەر بۆیەشە کە من بە لای (بژار)ی زمانی کوردییەوە ناچم و ئەگەر بزانم بەو بژار کردنە ناتوانم ئەو مانایەی دەمەوێ دە خوێنەرانی بگەیەنم ووشەی خوازراوە لە شوێنی پێویستی نووسینەکانم دا دەبیندرێن، کاک جەمال دەبوایە ئەوە زۆر چاک بزانێ کە بەکار هێنانی ووشەی خوازراوە ناتوانێ ببێتە سەپاندن. لە لایەکی دیکەوە مەبەستی کاک جەمال لەوەی کە من ووشەی (بێگانە)م بەسەر کوردا سەپاندوە، هەروەکوو خۆی گوتوویە، ئەوان ووشانە دەگرێتەوە کە پێوەندییان بە (دەستووری زمان)ەوە هەیە، وەکوو ووشەگەلی (مصدر، فعل، ضمیر، اسم،... هتد) هەموو کەس دەزانێ کە بەرانبەر بەم ووشانە چەند جۆر ووشە داتاشراون و «بە ئەنقەست زاراوە عەرەبیەکانم بەکار هێناوە، چونکوو نەم ویستوە خۆم بە هیچ کامێک لەو زاراوانەی ڕێزمانی کوردی کە تازە داتاشراوون ببەستمەوە.» (قاموس، سەرەتا ل ٩٨) و بە کفریشم نەزانیوە. دەمێنێتەوە ڕەخنەی کاک جەمال لە ووشەی (هەنگامە) و (سراسۆ) جارێ پێش ئەوەی مەسەلەی ئەو جووتە ووشە ڕوون کەمەوە، لە خوێنەرانی بەڕێز تکا دەکەم بینە (حەکەم) و بفەرموون ئەگەر من ووشەی کوردی مەڵبەندێک لە مەڵبەندەکانی کوردستان نەزانم داخوا ئەو

ووشەیە دەبێتە ووشەیەکی (بێگانە) هەر لەبەر ئەوەی کە (من!) نایزانم!؟ ئینجا منی بێچارە گوناهم چیە لەم ناوەدا کە دوکتۆر ج . ن یا لەبن لەهجەی (موکریانی) ئەوەندە نازانێ یاخۆ (موکریانی) بە بێگانە دادەنێ، من ووشەی (ئەنگامە)م لە (تحفە مظفریە)ی (ئوسکارمان)دا دۆزیوەتەوە و لە لاپەڕەی ١٨٢ی بەشی یەکەمی (قامووس)دا نووسیومە (چەند لەشکرێکی ئەنگامەیە، بە قۆشەن و زەمزەمەیە) و ئەو ڕستەیەم لە لاپەرە (٢٠٦)ی بەرگی یەکەمی (تحفە مظفریە)ی کە (هێمن)ی موکریانی هێناویەتەوە سەر ڕێنووسی کوردی لە (بەیتی دم دم) وەرگرتووە و لە تێبینی ووشەی (ئەنگامە)ش دا (ل ١٨٢ قامووس) نووسیومە کە: «من ئەم ووشەیەم هەر بە (هەنگامە) بیستوە».

ووشەیەکی (بێگانە)ی دیش بەر ڕەخنەی کاک ج . ن کەوتوە ئەویش (سراسو)یە من هەرچی هەوڵم دا ئەم ووشەیەم نەدۆزیەوە کە لە کوێ بەکارم هێناوە، مێشکی خۆشم پێک گوشی ووشەیەکی ئاوای تێدا نەبوو، بەڵام ووشەی (سەرانسوێ)م بەکار هێناوە و لە لاپەڕەی (٥ی سەرەتای (قامووس)دا گوتوومە: «هێشتا منداڵ بووم گڕ و گاڵی زمانەوانی سەرانسوێی خانووی مێشکمی لێگرتم...»، وا تێدەگەم کە هەر ئەم ووشەیە بێ و بەهەڵە (سەراسو) چاپ کرابێ، (سەرانسوێ) ووشەیەکی موکریانییە بە مانای (گوێ سوانەی بانی خانوو)، لە گۆرانی دا ووتراوە: «بەسمان لێ بگرە سەرانسوێ ی بانی، خانمی مەزەدار کراس قاقانی». دەمێنێتەوە ووشەی (قامووس) دەبوایە کاک جەمال زۆرتر بیری لێ بکاتەوە ئینجا مۆری (بێگانە)یی لێ بدا چونکوو لەوانەیە کە لەم ووشانە نەبێ ئەو بە دڵی نین و، ئەوەش کە بۆچی ئەم ووشەیەم بەکار هێناوە چونکوو (فارسی) ماوەیێکی دوور و درێژە لەباتی (ووشەنامە) فەرهەنگ بەکاری دێنێ کە بە پێی ئەو کەرتانەی لێی پێکهاتووە یەکێکە لە ماناکانی، مانایەکی دیکەی (الثقافە و المعرفە)ی عەرەبییە کە لە ساڵانی پێش شەڕی دوەما (فەرهەنگستانی ئێران = کۆڕی زانیاری ئێران) بووژاندوویەتەوە و (وەزارەتی فەرهەنگ = وزارة المعارف)ی داتاشیوە و بۆ کوردی من بە مانای (الثقافە)ی عەرەبی بە کاری دێنم و لام وایە بەو مانایە لە دوو ووشەی پەهلەوی (خڤەررە = نووری خوایی) و (هەنگەت = کۆ، جەمع) پێکهاتوە کە بە تێکڕایی دەبێتە (کۆمەڵی نووری خوا) جا ئەمە بۆ (الثقافە) دەست نەدا ئەی بۆچی

دەست دەدا، بەلام (فەرهەنگ) بە مانای قامووس بێجگە لەم مانایە لە فارسی دا بە مانای : ئەدەب (دژی بێ ئەدەب)، عاملاندن (تربیە)، داب و دەستوور و زانست و هونەرەکانی نەتەوەیەک بە تێکرایی، کارێزی ئاو، هاتوە لەوانەش بگەڕێتەوە هەروەکوو لە شوێنی ترا باسم کردوە من بۆیە دەنووسم خەڵک تێی بگەن جا ئەگەر ووشەی (فەرهەنگ) و (قامووس) لای کابرایێ نەخوێندەوار باس کەین، داخوا لە کامیان حاڵی دەبێ؟

ڕەخنەیەکی تری کاک نەبەز لە من ئەوەیە کە دەڵێ: «کەچی چووە گەلێک ووشەی داتاشراوی کۆڕی بەکار هێناوە...» وا دیارە (سەرەند)ەکەی کاک جەمال ئەوەندە درەشتە گلمەتی نیوحۆقەییش ناگیرێتەوە و هەموو شتێ دادەدا، ئەوەندەی پێم شک بێ ئەوان ووشانەی کۆڕ خۆی دایتاشیون بەکارم نەهێناوون، بەلام ڕەنگە ووشەی کۆنی کوردی کە (کۆڕی زانیاری کورد) مانایەکی تازەی بۆ دیاری کردوە دەکارم کردبێ و، قامووسی زمانی کوردی ووشەی داتاشراوی کۆڕی تێدا نیە، ئەگەرچی (کۆڕ) وەکوو دەزگایەکی زانستی و فەرهەنگی کوردی بۆ ئەوە داندراوە یەکێک لە کارەکانی ئەوە بێ ووشەی نوێ دابتاشێ.

کاک جەمال ئەم برگەیەی ووتارەکەی بە ڕستەیەکی (سەروەرانە) دەبڕێتەوە و بەوپەری دڵ فراوانیەوە لە گوناهەکانم خۆش دەبێ و دەفەرموێ: «ئەمانە هەمووی قەی ناکا و بۆ ئەو» و وای زانیوە کە ئەم خەڵکە هیچ ئیش و کاریان نیە و چاوەڕوانی (لوتف و مەرحەمەت)ی ئەوانن تا بڵێ «قەی ناکا». تێناگەم چۆن بە خۆی ڕادەپەرموێ، گوناهی گەورەی وەکوو: بەکار هێنانی ووشەی بێگانە! بەکار هێنانی ووشەی دەزگایەکی زانستی و فەرهەنگی وەک (کۆڕی زانیاری کورد) کە ئەو ڕای لە کارەکانی نیە و لەهەموو ئەوانە زیاتر پاش گوێ خستنی ووشە داتاشراوەکانی خۆی، هەموو ئەو «تاوانە زلە زلانە» عەرەب گوتەنی (بجرة قلم) ببەخشێ، وا دەردەکەوێ ئێمە ناگامان لێ نیە دوکتۆر جەمال بۆتە (وەکیلی زمانی کوردی) چونکوو هەر خاوەن ماڵ یا (وەکیل)ی بۆیان هەیە لە هەقی خۆیان خۆش بن.

«بەلام ئایا جێ ی داخ و خەفەت نیە لە فەرهەنگێکی وادا کە د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە لای خۆی دوکتۆرای لە «زانستی فەرهەنگ نووسینی کوردی»دا وەرگرتوە

بە ئاووتاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزرابێ...»

لە پێشەوە تکای تایبەتیم لە خوێندەوارانی کورد ئەوەیە سەرنجێک لەم بڕگەیە بدەن و بزانن لە لانەی دەستووری زمانی کوردییەوە چۆن داڕێژراووە و ڕستەی (لە فەرهەنگێکی ئاوادا) لەو شوێنە بۆچی قوت بۆتەوە؟ منیش لەبەر خۆمەوە دوعا دەکەم کە (یاخوا هەڵەی چاپ بێ) و کاک جەمال کاتی نووسینی ووتارەکەی بە (ئەڵەمانی) بیری نەکردبێتەوە و لە مێشکی دا وەری گێڕابێتە سەر کوردی. لە سەرەوەتر باسی ئەوەم کرد کە ئەم پیاوە لای وایە هەر قسەیەکی لەدەم دەرپەڕێ، بۆ دەلیل و بەڵگەی ئیسپات هەر ئەوەندەی بەسە کە قسەی دوکتۆر جەمال نەبەزە و هیچی تر. هەروەکوو فەرموویانە کە دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف «بە ئاوو تاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا»، ئیتر کەنگێ؟ لە چ ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا؟ و (ئاوو تاو)ەکەی چۆنە؟ ئەوانە ئەو پرسیارانەن کە کاک جەمال بە پێویستی نازانێ وەڵامیان بداتەوە، من ئەوەندەی دیتبێتم پێش دەرچوونی قامووس، دوکتۆر ئەوڕەحمان لە دوایی ووتارێکی دا لە ڕۆژنامەی (بیری نوێ) بڵاوی کردەوە، یەک دوو دێر باسی «قامووس»ی کردوە، لە خۆشیم پرسی ئاخوا دوای دەرچوونی شتێکی لەسەر قامووس نووسیوە من نەم دیتبێ؟ ووتی نەخێر نەیان نووسیوە، من دڵنیام خوێنەرانی بەڕێزیش هیچ شتێکیان، نە «بە ئاوو تاو» نە «بێ ئاوو تاو» لەسەر قامووس بە قەڵەمی دوکتۆر حاجی مارف، نەخوێندۆتەوە. ئەدی کەوایە کاک جەمال ئەم قسەیەی لە کوێ هێناوە و کردوویە بە ڕەخنەیەک لە دوکتۆر ئەوڕەحمان، وەڵامەکەی زۆر سادەیە، دوکتۆر ج. ن کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە، دوا ڕۆژ دەبینێ و کارێکی هێشتا ڕووی نەداوە دەیزانێ. بەلای ئەوانەوە دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف -بە خەیاڵی خۆی لەبەر گەلێ هۆیان- نابێ بە قامووسەکەی من هەڵنەڵێ و پەسنی نەدا، ئەگەر تا ئێستاش ئەم کارەی نەکردبێ لە دوارۆژێکی دوور یا نیزیکا هەر دەیکا، کە وابێ با هەر لە ئێستاوە، بە (کردوو) دابندرێ و پەلاماری بدرێ، صەت هەزار ماشەڵلا لە ڕەخنەی ئاوا زانستییانە!!

ئەو جار دێینە سەر باسی ئەو (گا-ڕەخنە)ی کاک جەمال لە (قامووسی زمانی

کوردی) گرتوە تا ئیسپاتی کا «... هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە...» دامەزراوە.

ویستم ئەم بەشەی ووتارەکەی کاک جەمال بە چەند پارچە بخەمە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز بەڵام پارچە پارچە کردنی لەوانەیە کار دە ماناکەی بکا و کاک جەمالمان لێ بشالۆزێنێ و بفەرموێ ئەوە بە ئانقەست وای کردوە تا خوێنەران ماناکەی -بەو جۆرەی ئەو مەبەستێتی- تێ نەگەن بۆیە نووسینەکەی دوکتۆر ئەوەی پێوەندی بە قامووسەوە هەیە هەر وەکو خۆی دەنووسمەوە و لە کاتی وەڵامدانەوەیدا پارچە پارچەی لێ وردەگرم، کاک جەمال ئاوای نووسیوە:

«... بۆ وێنە تەواوی فەرهەنگەکەی زەبیحی بە بەشی «هەمزە» دراوەتە قەڵەم، لە لاپەڕە یەک دا دەڵێ: «هەمزە دەنگێکە لە دەنگەکانی زمانی کوردی لە گەرووەدا دێتە دەر... هتد.» کە چی باسی (ئا) دەکا و دەڵێ «یەکەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردییە کە بە خەتی لاتینی بنووسرێ و دەنگێک پێشان دەدا کە لە تێکەڵاوبوونی (هەمزە) و (ئەلف) پێکهاتوە.»

لێرەدا پیاو هەر دەبێ بڵێ «هەمزە لە هەباسی چی!» ئەو دەنگانەی کە کاک زەبیحی بە هەمزەیان دادەنێ یان بە هەمزە و ئەلف یان بە هەمزە و شتێکی دی یان تێدەگا وەک: ئا، ئە، ئو، ئوو، ئۆ، ئی، ئێ. ئەمانە هەمزە نین، ئەمانە هەموو تیپی دەنگداری کورت و درێژن کە نیگارە لاتینی یەکانیان بەم جۆرەیە: ê, î, u, o, ü, e, a. هەمزە دەنگێکی تایبەتی یا جۆرە بزوێنەیەکی یەکجار کورتە لە عەرەبی دا کە لە بزرۆکە (الکسرە المختلسە Murmelvokal)ی کوردی دەچێ. ئەم دەنگە لە هێندێ لەو ووشە عەرەبی یانەدا کە هاتوونەتە نێو کوردی یەوە بووە بە (ی e) - سەرنجی (بئر) بدەن کە بووە بە (بیر)، یا بووە بە (ێ e) - سەرنجی (مئزر) بدەن کە بووە بە (مێزەر). هەمزە لە ئامراز (اداة)ی (نە ء)دا هەیە کە ئەویش لە بنچینەدا لە (نها) و (نە) و (نۆ)وە هاتووە. ووشەی (ئاسمان)، (ئەمە)، (ئومێد)، (ئووچ) و (ئۆخەی)، (ئیش)، (ئێش) بە هەمزە دەست پێ ناکەن، هەروەها بە هەمزە و ئەلف یا هەمزە و واووو... هتد دەست پێ ناکەن، بەڵکوو بە تیپی دەنگداری ê, î, o, ü, u, e, a دەست پێ دەکەن. نووسینی ئەم

دەنگانە بە هەمزە لە زمانی کوردی دا کارێک بوو لە سەرەتای پەنجاکاندا کرا بۆ ئەوە لە هەڵکشاوی (مدة) و سەر (فتحە) و بۆر (ضمە) و ... هتد لە ووشەکانی آسمان، ئەحمەد، اومێد و... هتد رزگار بکرێن. جا با بڵێین کاک زەبیحی کە هەرچەندە مرۆڤێکی زۆرزانە و ئەمەی لێ تێکچووە ئەی چۆن دەبێ کوڕێکی زانیاری زل و زەلام شتێکی وای لێ تێک بچێ!».

ئەگەر ئەم نووسینەی دوکتۆر کورت کەینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە بەلای کاک جەمالەوە (هەمزە) دەنگێکی کوردی نیە و «هەمزە دەنگێکی تایبەتی یا جۆرە بزوێنەیەکی یەکجار کورتە لە عەرەبی دا» و ئا، ئە، ئوو، ئۆ، ئیـ، ئێـ، کە من بە هەمزەیان دادەنێم یا بە هەمزە و (شتێکی)دی یان تێدەگەم «... ئەمانە هەمزە نین، ئەمانە هەموو تیپی دەنگداری کورت و درێژن کە نیگارە لاتینی یەکانیان بەم جۆرەیە a, e, ü, o, u, i, ê»

من نازانم کاک جەمال کە دەڵێ هەمزە دەنگێکی تایبەتی زمانی عەرەبییە، بەڵگەی چییە؟ خۆ ئینشائەڵلا لەو باوەڕەدا نیە کە گەرووی ئینسانەکانی هەر نەتەوەیەک وا دروست کراوە هێندێ دەنگی پێ (تلفظ) نەکرێ!؟ ئومێدم وایە کە کاک جەمال بیروڕای وا نەبێ (پیانۆ) کە ئامرازێکی مۆسیقای فەرەنگی یە ئاوازی حەیرانی کوردی پێ لێ نادرێ، یا کەمانچە و تار و عوود کە ئامرازی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتین ناتوانن هەوایەکی گۆرانی ڕۆژئاوایی دەرخەن تێ ناگەم کاک جەمال چۆن دەتوانێ ئیسپاتی کا کە هەمزە دەنگێکی تایبەتی زمانی عەربیە و زمانی کوردی ناتوانێ یا نابێ ئەو دەنگەی هەبێ؟ داخوا گۆڕان و گەشە کردن و پەرەسەندن لە بیروڕای کاک جەمال دا هیچ جێگایەکیان هەیە؟ من لام وانیە کاک جەمال باوەری بەمانە نەبێ چونکوو دەڵێ «هەمزە لە ئامراز (اداة)ی (نەء)دا هەیە...» لە لایەکەوە (هەمزە) دەنگێکی تایبەتی زمانی عەرەبییە، بەڵام کاک جەمال دەنگی دوایی ووشەی کوردی (نەء) بە هەمزە دەزانێ ئەمە وا دەگەیێنێ کە گەرووی ئینسانی (کورد)یش وەک گەرووی ئینسانی (عەرەب) توانستی ئەوەی هەیە دەنگی (هەمزە)ی (عەرەبی) دروست کات. من لە لاپەڕەی ٥٨ی سەرەتای (قامووس)دا ئاوام نووسیوە: «نابێ لەو قسانە وا تێبگەین کە بەعزە دەنگێک مەخسووسی بەعزە زمانێکن و میللەتەکانی دیکە ناتوانن ئەو دەنگانەیان لە زمانەکەیاندا بێ، (دەنگ)یش

لە زماناندا دیاردەییێکی زیندوە، پەیدا دەبێ و گەشە دەکا و دەگۆڕێ و لە ناویش دەچێ.»

سەرنجێیک بدەن هەموو کەس دەزانێ کە دەنگەکانی: پ، چ، ژ، گ لە زمانی عەرەبی دا نەبوون، بەڵام ئێستا ئینسانێکی (عەرەب) ناتوانێ ئەو دەنگانە (تلفظ) بکا؟ زمانی کوردی، فارسی،... ئەوەندەی تا ئێستا دەیزانین لە پێشدا دەنگی: ق، ح، ص، ط، ظ یان نەبووە، ئایا ئێستا ئینسانێکی (کورد) ئەم دەنگانەی بۆ ناگوترێ؟ ئەگەر بۆ عەرەبی ئەوەمان بە دەستەوە بێ کە بڵەین دەنگە نارەسەنەکانی (پ، چ، ژ، گ) لە (العربیە الدارجە)دا بەکار دێت، خۆ زمانی کوردی (فصحی و دارجە)ی نیە، مەگەر دوکتۆر جەمال بیەوێ بۆمان دروست کات. ئەوجار با مەسەلەی هەبوون و نەبوونی هەمزە لە زمانی کوردیدا، بە بارێکی دیکەدا هەڵسەنگێنین، ئەوە گریمان کاک دوکتۆر ڕاست دەکا و دەنگی (هەمزە) لە زمانی کوردیدا نەبوە، خۆ ئێستا لە قووڵایی ئەوکەوە دەنگێکی ئاوا دێتەدەر شایەدیشمان ئامرازی (نەء)ە کە کاک نەبەز خۆی بە نموونە هێناویتەوە و نەوەک ئەم قسەیەی تۆسقاڵێ لە تیۆریەکەی بڕووشێنێ، وەکوو «جۆڵا بەسەر دڕی خۆی ڕازی نیە» و هەر خێرا دەڵێ «کە ئەویش لە بنچینەدا لە (نها) و (نە) و (نۆ)وە هاتوە.» ووشەی (نە، نەء)ی ئێستای زمانی کوردی لە پەهلەویدا «نێ» و لە (ئاوێستا)دا بە شێوەی (نۆئێت) و (نۆئێذ) هاتوە وە کاک جەمال هیچ پێمان ناڵێ دەنگێکی لە دوایی (نەء)دا هەیە دەگەڵ ئەوەی لە سەرەتای ووشەگەلی: ئاسمان، ئەمە، ئومێد، ئووچ، ئۆخەی، ئیش، ئێش دا دەیان بیسین، جیاوازیان چیە؟ ئەگەر چی دوکتۆر جەمال ئەو مەسەلەیەش دەکا بە ژێر لێوە و نافەرموێ لەبەر چی دەنگی (هەمزە) دەگەڵ دەنگ بزوێنەکانی (ا، سەر، بۆر، ژێر، ۆ، وو، ی، ێ) تەرکیب دەکا و دەیانکا بە «دەنگداری کورت و درێژ»ی «ئا، ئە، ئو، ئۆ، ئوو، ئی، ئێ»ی زمانی کوردی، بەڵام ئەم بە ژێر لێوەوەکردنە قەت ناتوانێ ئەو پەردە ئەستوورە بێ کە (ڕاستی)یان لە بەرچاو بشارێتەوە، بەلای منەوە کاک جەمال لەبەر دوو هۆی بنچینەیی (بە ڕای خۆی ئەم کارە دەکات).

یەکەم هۆ ئەوەیە، کە بە ڕای ئەوان، هەمزە دەنگێکی تایبەتی یا جۆرە بزوێنەیەکی یەکجار کورتە لە عەرەبی دا و... زمانی کوردی دەنگی (هەمزە)ی تێدا نیە و «ئەم دەنگە

لە هێندێ لەو ووشە عەرەبی یانەدا کە هاتوونەتە نێو کوردی یەوە بووە بە (ی-E) سەرنجی (بئر) بدەن کە بووە بە (بیر)، یا بووە بە (یٚ-E) سەرنجی (مئزر) بدەن کە بووە بە (مێزەر)». بەداخەوە دەبێ بڵێین کە لێرەش دوکتۆر ج . ن «کەوی لێ بۆتە زڕەکەو» و نەیزانیوە ئەوەی بۆتە (ی و یٚ) (هەمزە)ی ووشەکانی (بئر) و (مئزر) نیە بەڵکوو ژێر (الکسرە)ی دەنگی (ب) و (م)، کە بوەتە دوو دەنگ بزوێنی کوردی، جا ئەگەر کاک نەبەز مەیلیان دەیکێشێ با لێرەدا بڵێ: «هەمزە لەژێری چی!».

من لە سەرەوەتر ووتم لام وانیە کە کاک جەمال باوەڕی بە گەشە کردن و گۆڕان نەبێ، بەڵام جێی داخ و خەفەتە کە دەردەکەوی من لەو ڕایەی خۆما بەسەر چۆم و کاک جەمال لای وایە ئەگەر شتێک دوێنێ نەبووبێ، ئیمڕوش نابێ و سبەینێش نابێ و هەتا هەتایەش هەر نابێ، جا کەللە ڕەقی (الجمود الفکری) ئاوا نەبێ بۆچی باشە!؟

هۆی دوەم کە کاک جەمالی هێناوەتە سەر ئەو ڕایەی بڵێ (ئا، ئە، ... هتد) لە هەمزە و ئەلف و یا هەمزە و شتێکی دی پێک نەهاتوون ئەوەیە تا دەگەڵ «نیگارە لاتینی یەکان» کە خۆی بۆ ئەم «هەمزە و ئەلف و هەمزە و شتێکی دی» دیاری کردوون ڕێک بکەوێ لام وانیە کەسێک هەبێ ئەو ڕاستی یە نەزانێ کە دەنگ دەستکردی ئادەمیزاد نیە و پیت (الحرف) بۆیە داهێنراوە دەنگێک پێشان بدا، بەڵام دوکتۆر جەمال نیشەکە چەواشە دەکا و دەیەوێ یا وا دەزانێ کە «دەنگی تەبیعی» وا هەڵبژێردرێ بچێتە قالبی (پیت)ی دەستکردی ئینسانەوە و دەڵێ: «نووسینی ئەو دەنگانە بە هەمزە لە زمانی کوردیدا... هتد» جا نازانم خوێنەرانی بەڕێز دەگەڵم هاوڕادەبن کە بڵێم ئەم کارەی کاک جەمال بەربا کردنی «= الاخضاع» (جەوهەر)ی، شتانە بۆ (شکڵ و قالب) و بەم کارە هیچ شتێ لە مەسەلەی هەبوونی هەمزە لە زمانی کوردیدا دەگۆڕێ ئەگەر قالبێکی (لاتینی) نەبوو ئەو «دەنگ» هەمزەیەی تێدا جێ ببێتەوە. کاک نەبەز لە مێژە شەیدای ئەوەیە کوردی بە لاتینی بنووسرێ «قەی ناکاو بۆ ئەو» هیوام وایە کە لێی تێک نەچووبێ کە ئەم «نیگارە لاتینیانە» ناوەکانیان (ئا، ئۆ، ئی... هتد)یە و ئەو ناوانە (دەنگ)ەکانیان نیشان نادەن تا (هەمزە)کەیان لێ نەکەیتەوە، هەروەکو لە (BI, BO, BA ،با، بۆ، بێ) دەنگی (هەمزە)مان بە گوێ ناگا، بەڵکوو دەنگی «شتێکی دی»یە

کە کاک جەمال نایەوێ بیسەلمێنێ. هەروەکوو لەو ئەلفوبێکەیەدا کە ئێستا زمانی کوردی پێ دەنووسین، ئەم پیتانە (ب، د، ل) ناویان (بێ، دال، لام)ە، جا نازانم دەگونجێ کە (ل) نوێنەری سێ دەنگی (ل، ا، م) بێ و بۆ نموونە لە ووشەی (لاواز)دا دەنگی (ل)ەکە وەکوو نێوی پیتەکەی بڵەین ئەوجار ووشەکە ببێتە (لاماواز) تا بیسەلمێنین کە (ئا-A)ی کاک جەمال نوێنەری دوو دەنگی (ء و ا) نیە یا پیتی (ل) تەنیا دەنگی (لـ) پێشان دەدا کە لە سەرەتای ووشەی (لاو، لاواز)دا هەیە و پێش ئەوەی دەنگی (ا)ە لە دەم دەربچێ دەبیسترێ، ئینجا هەر ئەو (تیپە دەنگدارە کورت و درێژانە)ی کاک جەمال، لە زمانانی جیا جیای فەرەنگی دا ناوی جیا جیایان هەیە بەڵام نوێنەری یەک دەنگن، بۆ نموونە لە زمانی یونانی دا ناویان ئاوایە (ئالفاA، ئێپسیلۆن E، یۆتا E، تۆمیکرۆن O، ئومپسیلۆن U، ئێتا I) جا بۆ چی کاک جەمال ئەو ناوانەی لە (تیپە دەنگدارە کورت و درێژ)ەکانی خۆی ناوە؟، ئایا دەتوانێ بفەرموێ تەنیا لەبەر ئەوە نیە کە ئەو زمانەی ئەو ناوانەی بۆ (دەنگە بزوێن)ەکانی زمانی کوردی لێ وەرگرتوە بەو «نیگار»انەیان ئاوا گوتوە کە ئەو ساڵەهایە دەیەوێ بەسەر کوردیدا بسەپێنێ!؟، ئەوە دامان نا کە کاک جەمال ئەو کاتەی هەوای نووسینی کوردی بە لاتینی کەوتۆتە سەر لە باتی زمانی ئینگلیسی خوا نە خواستە زمانی (ڕووسی) زانیبایە، داخوا ناوی (دەنگدارە کورت و درێژ)ەکانی خۆی بە شێوەی (ئەوان)ی (ڕووس) نەدەهێنا مەیدانەوە و وەک ئێستا بۆ ئەو (ناوە نازانم چییانە) دەیکا، پێی لێمان دە پیسۆلێ نەدەکرد کە ئیللان و بیللان لەوەتی زمانی کوردی هەیە ناوی دەنگەکانی ئاوا بوە و هەر ئاواش دەبێ.

کاک نەبەز بە ئانقەست خۆی لە ڕاست ئەم (ڕاستی)یە گێل دەکا، کە (دەنگ)ەکانی هیچ زمانێک ئادەمیزادێک دروستی نەکردوون و دروستیشیان ناکا بەڵکوو لە دەزگای دەنگسازی ئینسان دێنەدەر کە لە (ئەوک)ڕا تا ئەو شوێنەی (دوو لێو) پێکەوە دەنووسێن دەگرێتەوە و هەر زمانەش (دەنگ)ی وای تێدایە کە دەزگای دەنگسازی زمانەکانی دیکە بە دروست کردنیان ڕانەهاتوە، بەڵام ئەمە هیچ ئەوە ناگەیێنێ کە توانستی دروست کردنی ئەو دەنگانەشی نەبێ، بەڵکوو بە مەشق پێ کردن و ڕاهێنانی دەزگای دەنگسازی، هەموو نەتەوەیەک دەتوانێ هەرچی (دەنگ) لە زماناندا هەیە -بە

هێندێک جیاوازی یەوە- (تلفظ) بکا، ئەوەتا دەبینین بە هێزی پێداویستەکانی ئیسلامەتی (کورد) فێری دروست کردنی دەنگی (ح، ص، ط، ظ،ق) بوە، فارسەکانیش هەر فێری بوون بەڵام وەکوو کورد بۆیان نایەت. بۆیە تەنانەت ئەگەر کاک ئەبەز -ئیشاڵلا لێ ی تێک نەچو بێ- ڕاست بکا و دەنگی (هەمزە) تایبەتی زمانی عەرەبی بێت، ئەوا دەڵێین (کورد) چۆن فێری دروست کردنی دەنگی (ح، ق،... هتد) بو هەروەهاش فێری دروست کردنی دەنگی (هەمزە)ش بوە، بەڵام بەداخەوە (ئیشاڵلا)کەمان لە جێی خۆی نەبوو، چونکوو کوردی دەنگی (هەمزە)ی بوە و صەت مەخابن کە کاک جەمال لێی شێواوە، با سەرنجی ئەوان ووشە (ئاویستایی)یانە بدات:

* هام ئەئیبی میتە = ڕێکادان، قبوول کردن
* شۆئیتهرە = لادییی، خەڵکی دێ
* شیە ئوتهەنە = ڕەفتار، کردار
* مەئۆ ذەنۆ - کەرە = ئەو کەسەی کاری خراپ دەکا
* ئەئۆ جەنگ هروەنت = بەهێز، زۆردار
* پەئۆ ئورفیم = یەکەم = لوخشە، پێشەوە
* ئەشی ی = پاداشت

[هەموو ئەم ووشانە لە بەرگی دوەمی (یادداشتهای گاتها)ی پرۆفیسۆر پوورداود وەرگیراون].

لەوانەیە ئەو جار کاک جەمال بڵێ: جا با لە (ئاوێستا)ش دا دەنگی (هەمزە) بووبێ ئەوانە هەر (ئا، ئە، ...هتد)ن کە «نیگارە لاتینی یەکانیان» بەم جۆرەیە (E, A, ... هتد). ئا لێرەدا پیاو لووتی دەتەقێ بە لووتی (منطق)ی سەیر و سەمەرە -ئەگەر ڕاست بێ پێی بڵێین منطق-ی.

«وەڵڵاهی بش فرێ هەر بزنە». ئەمەش «قەی ناکا و بۆ ئەو» ئەدی بۆ ئەو ڕاستی یانە دەفەرموێ چی!؟

* (دەنگ)ی زمانان دەستکردی ئینسان نین

* ئادەمیزاد نووسینی بۆ تۆمار کردنی بیروڕای خۆی داهێناوە
* نووسین لە سەرەتاوە وەکوو ئێستا سادە نەبوە کە هەر پیتێک نیشانەی دەنگێک بێ، لە پێشدا بۆ نووسینی (دار) وێنەی دار و بۆ نووسینی (مار) شکڵی ماریان کێشاوە (خەتی هێرۆگلیفی)، پاشان نووسین سادەتر بۆتەوە و هەر نیشانەیەک، لە قۆناغێکی خەتی بزماری دا، ووشەیەکی پێشان داوە، دیسان نووسین هەر بەرەو ساکاری چوە و لە قۆناغێکی دی خەتی بزماری دا هەر نیشانەیەک نوێنەری دەنگێک و دەنگ بزوێنێک بوە، (د، د، د، ج، ج، ر، ر ...) هەر یەکەش نیشانەی تایبەتی خۆیان هەبووە هەر بەو جۆرە نووسین رووی دە سادەیی و هاسانی بوە تا گەیوەتە ئەو دەورەی باپیرەکانی ئەو (ئەلفوبێ)یانەی ئێستا هاتوونە مەیدان پەیدا وە کە هەر (پیت)ەی دەنگێکی پێشان داوە خۆکاک جەمال ئیشاڵلا خەیاڵی ئەوەی نیە بە (تیپ) و (نیگار)ەکانی خۆی بمان گێڕێتەوە دەوری (خەتی بزماری)!؟.
* پیتی ئەلفوبێتکەی ئێستا هەر یەکەی نیشانەی (دەنگ) یا (دەنگ بزوێن)ێکن.
* (دەنگ) بێ یارمەتی (دەنگ بزوێن) توانستی ئەوەی نیە بێتە دەرەوەی دەزگای دەنگسازی و لە نێوان دوو لێوان بترازێ.
* (دەنگ بزوێن)ەکانیش بێ ئەوەی (دەنگ)ێکیان لە پێشووە بێت ناتوانن دەرکەون، دەبا کاک جەمال ئەزموونی بکا و هەرچی توانستی هەیە بیخاتە کار، بزانین (دەنگدارە کورت و درێژ)ەکانی خۆی بێ یارمەتی دەنگێک لە پێشەوە -جا ئەو دەنگە (هەمزە) بێ یا (ب) یا (ج)- کەیفی خۆیەتی- دەتوانێ لەزار بترازێنێ؟
* ئەوەی کە (نیگارە لاتینی یەکان)ی E, A... هتدە، لە هەر ئەو (شتێکیدی) یە کە کاک جەمال نایسەلمێنێ و (هەمزە)ی بۆیە خراوەتە پێش تا (تلفظ) بکرێ، بەڵام بۆ چی زیاد لە هەموو دەنگەکان (هەمزە) بەلای منەوە بۆیە یەکە (خانی دەنگ)ی هەمزە لە دەزگای دەنگسازیدا دەکەوێتە خوارووی (ئەوەک)ی ئینسانەوە. با کاک ئەبەز سەرنجێکی ئەم خانۆک (جدول)ەش بدا تا پاشان قسەی لێدەکەین.

| | دەنگ بزوتنەکان | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دەنگەکان | ا-هەڵکشاوی | سەر | ێ | ی - ڕاکشاوی | ۆ | و-بۆر | وو |
| ١ | ٠ | ئا | ئە | ئێ | ئی ی | ئۆ | ٠ | ئوو |
| ٢ | ب | با | بە | بێ | بی ی | بۆ | بو | بوو |
| ٣ | پ | پا | پە | پێ | پی ی | پۆ | پو | پوو |
| ٤ | ت | تا | تە | تێ | تی ی | تۆ | تو | توو |
| ٥ | ج | جا | جە | جێ | جی ی | جۆ | جو | جوو |
| ٦ | چ | چا | چە | چێ | چی ی | چۆ | چو | چوو |
| ٧ | ح | حا | حە | حێ | حی ی | چۆ | حو | حوو |
| ٨ | خ | خا | خە | خێ | خی ی | خۆ | خو | خوو |
| ٩ | د | دا | دە | دێ | دی ی | دۆ | دو | دوو |
| ١٠ | ر | را | رە | رێ | ری ی | رۆ | رو | روو |
| ١١ | ڕ | ڕا | ڕە | ڕێ | ڕی ی | ڕۆ | ڕو | ڕوو |
| ١٢ | ز | زا | زە | زێ | زی ی | زۆ | زو | زوو |
| ١٣ | ژ | ژا | ژە | ژێ | ژی ی | ژۆ | ژو | ژوو |
| ١٤ | س | سا | سە | سێ | سی ی | سۆ | سو | سوو |
| ١٥ | ش | شا | شە | شێ | شی ی | شۆ | شو | شوو |
| ١٦ | ع | عا | عە | عێ | عی ی | عۆ | عو | عوو |
| ١٧ | غ | غا | غە | غێ | غی ی | غۆ | غو | غوو |
| ١٨ | ف | فا | فە | فێ | فی ی | فۆ | فو | فوو |
| ١٩ | ڤ | ڤا | ڤە | ڤێ | ڤی ی | ڤۆ | ڤو | ڤوو |
| ٢٠ | ق | قا | قە | قێ | قی ی | قۆ | قو | قوو |
| ٢١ | ک | کا | کە | کێ | کی ی | کۆ | کو | کوو |
| ٢٢ | گ | گا | گە | گێ | گی ی | گۆ | گو | گوو |
| ٢٣ | ل | لا | لە | لێ | لی ی | لۆ | لو | لوو |
| ٢٤ | ڵ | ڵا | ڵە | ڵێ | ڵی ی | ڵۆ | ڵو | ڵوو |
| ٢٥ | م | ما | مە | مێ | می ی | مۆ | مو | موو |
| ٢٦ | ن | نا | نە | نێ | نی ی | نۆ | نو | نوو |
| ٢٧ | و | وا | وە | وێ | وی ی | وۆ | و | ووو |
| ٢٨ | هـ | ها | هە | هێ | هی ی | هۆ | هو | هوو |
| ٢٩ | ی | یا | یە | یێ | یی ی | یۆ | یو | یوو |

ئەم خانۆکەی کە خوێنەرانی بەرێز چاویان پێ کەوت ٢٩ دەنگ (Consonant) پێشان دەدا کە دەگەڵ (٧) دەنگ بزوێن (Vowel) یا ئەوانەی کاک نەبەز پێیان دەڵێ «دەنگداری کورت و درێژ» لە یەک دراون بە تێکڕایی ٢٠٣=٧ . ٢٩ حاڵەت پێشان دەدا کە لە هەموویان دا دەنگێک دەگەڵ ئەلف یا «شتێکی دی» تێکەڵ بوە، بێ گومان کاک جەمال ڕەخنەی تەنیا لە (٧)یان : (ئا، ئە، ئو، ئوو، ئۆ، ئی، ئێ) هەیە «کە نیگارە لاتینی یە کەیان بەم جۆرەیە: E, I, U, O, U, E, A و هاواری لێ بڵێند دەبێ کە لە هەمزە و ئەلف یا هەمزە و شتێکی دی پێک نەهاتوون و مەسەلەی «هەڵەی زلە زلەی زمانەوانی» دێتە گۆڕێ، جا خوێنەرانی بەرێز با خۆیان (حەکەم) بن ئەمەش پێی دەڵێن (منطق) کە ١٩٦ حاڵەتی کارێک ڕاست بێ و (٧)یان هەڵەی زلە زلە بن!؟

---

پەراوێز:

(١) دەربارەی زاراوەی «زمانانی ئێرانی» بڕواننە: سەرەتای قامووس. ل ١٢/ پەراوێز.

(٢) ئەوەی لەناو دوو کەوانەی پچکۆلەدا نووسراوە قسەی کاک جەمال خۆیەتی و «مالی قەلب سەر وە ساحێبی».

بۆ زیاتر روون کردنەوەی کێشەی زمانەوانی د. نەنەز و زەبیحی و یارمەتی دانی بەپەرۆشانی زمان و وشەی کوردی ویستم پەنا بەرەمە بەر چەند شارەزا و زمانەوانی تری کورد. بۆ ئەو کارە دوو کەسم لە لای خۆم دیاری کرد: ١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کە هەم زمانەوان و پسپۆری فەرهەنگنووسیی کوردییە و هەمیش لەو کێشەیەدا ناوی هاتووە. بەداخەوە بۆم نەگونجا پەیوەندی پێوە بکرم، بەڵام وتارێکی ئەو بەرێزم وەدەست کەوت کە ساڵی ١٩٧٩ هەر لەسەر ئەو بابەتە نووسیویەتی کە لێرەدا لە گەڵ ڕێز و حورمەتم بۆی، وەک خۆی چاپی دەکەمەوە. ٢) د. ئەمیری حەسەنپوور، کە هەم زمانەوانە و بەشێک لە تێزی دوکتورای خۆی تەرخان کردووە بۆ زمانی کوردی و فەرهەنگنووسین و هەمیش نەسلی تازەترە و لەو قۆناغانەی تازەی زمانی کوردی کە پێیدا تێپەڕیوە و تێدەپەڕێ شارەزا و خاوەن ڕایە. هیوادارم یارمەتی زیاتر روون کردنەوەی ئەو کێشەیەم دابێ.

# با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین

د.ئەورەحمانی حاجی مارف

رۆشنبیری نوێ ژمارە ٧٢ شوباتی ١٩٧٩

تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر ناو ناوە هەندێ رەخنەگر کەمێک لە سنووری شێوازی زانستانە دەردەچوون و لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمدا توند و تیژ دەوەستان. بەڵام دوای ئەوەی ژمارەیەک وتار و راوێژ دەربارەی چۆنیەتیی رەخنەی راست و زانستانە بڵاوکرانەوە و پاش ئەوەی خوێندواری گەشەی کرد و شارەزایی پتر پەرەی سەند، ئیتر ئەو جۆرە رەخنانە وەختە بڵێم ناویان لە کوولەکەی تەڕیشدا نەما... کەچی تازە بە تازە د.جەمال نەبەز لە وڵاتی ئەڵمانیای فرە پێشکەوتوو و مەڵبەندی شارستانی یەتەوە لە ژێر پەردەی زانست دا و بە ناوی رەخنەوە وتەی پڕ لە بوختان و قسەی ناڕاست دەهۆنێتەوە و ئاراستەی زانایانی کورد و ئەندامان و فەرمانبەران و دۆستانی کۆڕی زانیاری کوردی دەکا.

بەڵێ د.نەبەز لە نووسینەکانی زووی دا هەمیشە بەو شێوە ناڕاستە دوور لە زانستە هەڵس و کەوتی کردووە. یەکێک لەو نموونە دیارانەی کە لە بیر خوێندەوارانی کورد ناچێتەوە، کتێبە پڕ جوێنەکەیەتی، کە بە ناوی «کوردایەتی»یەوە دژی محەمەدی مەلا کەریم نووسی (١). ناشیرینی و ناڕەوایی وتەکانی ئەو کتێبە بە رادەیەکە کە لە ناو بازاڕیشدا وێنەیان کەمە و من بەش بە حاڵی خۆم شەرم دەکەم نموونەیان بخەمە پێش چاوی رووناکبیران. تەنانەت وا دیارە د.نەبەز خۆشی کەمێک شەرم گرتوویەتی، بۆیە نەیویستووە ئەو کتێبە بە ناوی خۆیەوە بڵاو بکاتەوە و ناوی (زەردەشت)ی لەسەر داناوە.

رەنگە خوێن گەرمی و هەرزەکاری بە شەرمەوە کەمێک پاکانە بۆ ئەو هەڵس و کەوتەی زووی د. نەبەز بکەن، بەڵام پاش چەند ساڵ خوێندن و ژیان لە ئەورووپا هیچ بەڵگەیەک نی یە رووی بێ تکاکاری بۆ ئەوە بکا کە هێشتا هەر بەو شێوە ناشیرینەی جاران بنووسێ. بە وێنە جگە لەو کتێب و وتار و نامانەی ئەم ماوەیەی دوایی (٢)،

چەند مانگێک لەمەوبەر بە ناوی «سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد»ەوە لە گۆڤاری «کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگەی بەغدا»دا وتارێکی بڵاو کردەوە(٣)، کە پڕە لە هێرشی ناڕەوا و وتەی سووک و ناشیرین و ڕێز نەگرتنی کاری خەڵکی و شێواندنی راستی و بوختان و خۆ هەڵکێشان. ئەوەی پتر سەرنج رابکێشێ، ئەوەیە گۆڤاری ناوبراو، کە گۆڤاری مەڵبەندێکی بەرزی زانستە، ئەو وتارەی بڵاو کردۆتەوە. هەموو مرۆڤێکی دڵسۆز سەرزەنشتی ئەو جۆرە کارانە دەکا و منیش لەم بارەیەوە تەنیا ئەوەندە دەڵێم، کە با لە پێناوی خۆپەرستی دا حورمەتی لێکۆڵینەوەی زانستی نەشکێنین.

د.نەبەز کە لە وتاری ناوبراودا رەخنە لە (شێوەی پێکهاتنی کۆڕ) و (کارەکانی کۆڕ) دەگرێ، هەموو سنوورێکی شکاندووە. بەڕاستی ئەگەر لەو کارەی د.نەبەز بێ دەنگ بم، لام وایە نە زانست و نە کوردایەتی لێم خۆش نابن. جا بۆیە وا بە پێی زانین و ئاگاداریی خۆم بە کورتی وەڵامی د.نەبەز دەدەمەوە.

لە ژێر سەرباسی «هەڵەی زلە زلەی زمانەوانی»دا نووسەر دەربارەی فەرهەنگەکەی ماموستا عەبدولڕەحمانی زەبیحی نووسیوێتی: «کۆڕی زانیاری لە ١٩٧٧دا فەرهەنگێکی بە نێوی (قاموسی زمانی کوردی)یەوە بۆ کاک ئەوڕەحمانی زەبیحی لە چاپ دا. قەی ناکا کا کاک زەبیحی گەلێک وشەی کە کورد بە کاریان ناهێنێ بەسەر کورددا سەپاندوونی. با لەوەش بگەڕێین کە کاک زەبیحی لە ژێر پەردەی ئەوەدا کە وشەی تازە داتاشراوی بە دڵ نییە، چووە گەلێک وشەی بێگانەی بەکار هێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە نێو زمانی کوردی دا هەن، وەک: قاموس، عامل، لهجە، فرق، طبیعی، فعل هنگامە، سراسو... هتد. کەچی چووە هێندی وشەی داتاشراوی کۆڕی بەکار هێناوە... ئەمانە هەمووی قەی ناکا و بۆ ئەو. بەڵام ئایا جێی داخ و خەفەت نییە لە فەرهەنگێکی وادا کە د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە لای خۆی دوکتۆرای لە (زانستی فەرهەنگ نووسینی کوردی)دا وەرگرتووە و بە ئاووتاوەوە باسی فەرهەنگەی زەبیحی دەکا، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزرابێ؟ ...» (ل ٨٦-٨٧).

بە داخەوە، ئەو چەند دێڕەی د. نەبەز لە بریتی ئەوەی هانم بدەن بۆ لێدوانێکی زانستانە،

بەرە و گێڕانەوەی هەڵەق مەڵەقم دەبەن... دەگێرنەوە پیاوێک بە هەڵەداوان دەچێتە لای شێخ وەسمان و پێی دەڵێ: میرزا مەحمود، عەلی ئامۆزات کرا بە موتەصەریفی چوارتا... شێخ وەسمانیش بە زەردەخەنەیەکەوە روو دەکاتە پیاوەکە و دەڵێ: کاکە برا من میرزا نیم و شێخم، ناوم مەحمود نییە و وەسمانە، ئەو کوڕەش کە تۆ دەڵێی ئامۆزام نییە، پوورزامە، ناویشی عەلی نییە و فەتاحە، بە خودای کراوەتە قایمقام نەک موتەصەریف، ئەویش لە هەڵەبجە نەک لە چوارتا... هەر بەو چەشنە منیش روو دەکەمە د.نەبەز و دەڵێم:

١- کۆڕی زانیاری کورد فەرهەنگی بۆ مامۆستا زەبیحی چاپ نەکردووە.

٢- مامۆستا زەبیحی بۆ دەرمانیش زاراوەی کۆڕی - واتە ئەوەی تۆ ناوت ناون وشەی داتاشراو - بەکار نەهێناوە.

٣- من نەک هەر بە ناووتاوەوە، بەڵکو بە هیچ چەشنێک لەو فەرهەنگەدا باسی فەرهەنگەکەم نەکردووە.

بەڵێ ساویلکەیی ئەو جۆرە هەڵانە بە مرۆڤ دەکا و تەنانەت کەسانی زیرەکیش تووشی هەڵە دەبن. بەڵام جێگەی داخە کە زانایەکی وەک د.نەبەز، نەک هەر هەڵە بەڵکو بوختانیش بە نووسەرانی کورد و دەزگا کوردی یەکان دەکا. بەو بۆنەیەوە کەمێک لەو سێ بوختانەی کە راستی یان شێواندووە، دەدوێم:

کاتی خۆی مامۆستا زەبیحی داوای لە کۆڕ کرد فەرهەنگەکەی بۆ چاپ بکا، بەڵام بە داخەوە لەبەر هەنێ هۆی نابەجێ کۆڕ بڕیاری لە چاپ دانی نەدا و رەتی کردەوە. بێ گومان بەلای هەموو دڵسۆز و شارەزایەکەوە ئەمە کارێکی ناڕەوابوو لە لایەن کۆڕەوە... بەڵام لەو دەمەدا کە چاپخانەی کۆڕ فراوان کرابوو و کاریش کەم بوو، ئەنجومەنی کۆڕ بڕیاری دا بۆ ئاسان کردنی ئەرکی نووسەرانی کورد، ئەگەر کتێبێکیان دەربارەی زمان یان ئەدەب یان مێژوو و یان کولتوور... ی کورد هەبێ بە پارە بۆیان چاپ بکا. جا مامۆستا زەبیحی لە سەر ئەرکی خۆی ئەو فەرهەنگەی لە چاپخانەی کۆڕ لە چاپ دا و ئەمەش هەر وەک ئەوە وایە کە لە هەر چاپخانەیەکی دی چاپ بکرایە. شایانی باسە مامۆستا زەبیحی زۆر مەردانە هەڵس و کەوتی کرد، ئەویش ئەوە بوو کە بەرژەوەندی خودی وای لێ نەکرد دژی بەرژەوەندی میللەتەکەی بووەستێ.

لە راستی دا ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی کۆڕ بۆ پەسەند نەکردن و لە چاپ نەدانی فەرهەنگەکەی زەبیحی منی زۆر دڵگیر کرد و نەمتوانی هەڵوێستی خۆم نیشان نەدەم. بێ گومان هەڵوێستی راستیش، هەوڵی راست کردنەوەی هەڵەیە، نەک هەوڵی رووخاندن... بەو بۆنەیەوە دەربارەی فەرهەنگی زەبیحی و بڕیاری کۆڕ راپۆرتێکم بۆ ئەنجومەنی کۆڕ نووسی کە ئەوە دەقەکەیەتی:

ئەندامانی بەرێزی ئەنجومەنی کۆڕ!

ماوەی چەند مانگێک لەمەوبەر فەرهەنگی کوردی-کوردی مامۆستا زەبیحی هاتە بەر دەستتان، بەڵام بەداخەوە بڕیاری بۆ نەدرا لەسەر ئەرکی کۆڕ چاپ بکرێ. ئێستا نووسەرەکەی لەسەر ئەرکی خۆی خستوویەتیە ژێر چاپ. من لە ساڵی ١٩٧٣وە ئاشنایەتیم لە گەڵ ئەو فەرهەنگەدا هەیە و ئاگاداری هەموو ئەو قۆناغانەیم کە لەو دەمەوە پیایدا تێپەڕیوە. وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕ و لاپەڕە بە لاپەڕەیم بە وردی و بە چاوی موشتەری خوێندۆتەوە. چەند جار را و تێبینی و سەرنجم لە بارەیەوە بۆ نووسەری دەربڕیوە و بە دڵی فراوانەوە بەشی هەرە زۆری بە گوێ کردووم... گومانم لەوە دا نییە کە بە نیسبەت کاری فەرهەنگ نووسیی کوردی یەوە لە هیچ روویەکەوە بە هیچ چەشنێک فەرهەنگی وا سەرکەوتوو دانەنراوە (ئەگەر پێویست بکا، ئەوە ئامادەم بە بەڵگەی تەواو ئەم وتانەم بسەلمێنم، یاخود لە گەڵتان گفتوگۆ بکەم) و بەڕاستی جێگەی شایان و شانازی یە کە کورد ببێتە خاوەنی ئەو جۆرە فەرهەنگانە. تەنانەت ئەو فەرهەنگەی کۆڕ کە من خەریکیم و هێشتا هەر خەوە، مەگەر بە کار کردنی چەند کەسێکی شارەزا و کارامە و ئیشکەر بە ماوەی دە ساڵێک بتوانرێ لەوەی مامۆستا زەبیحی تێ بپەڕێنرێ. جا ئەو کارەی رەنجی هەموو ژیان و شارەزایی مامۆستا زەبیحی بێ و لە کوردی دا وێنەی نەبێ و بە ئاسانیش هەنگاوی لەو گەورەتر (بەتایبەتی بە خۆشمان) نەنرێ، ئیتر بۆ دەبێ ئەوە چارەنووسی بێ؟

بەداخەوە لێرەدا نە شوێنی ئەوەیە و نە مەودای ئەوە هەیە لە هەموو روویەکی ئەو فەرهەنگە بدوێم، بەڵام ئەگەر کاتی خۆی ئەنجومەن نووسەری ئەم چەند دێڕەی لەو مەسەلەیەدا بخوێنایەتەوە و وەک فەرهەنگ ناسێک لەو بارەیەوە پرسیاری لێ بکردمایە،

هەڵبەت ئەوساکە بە دوور و درێژی رای خۆم دەردەبڕی....

لێرەدا تەنیا ئەو راستی یە دەخەمە پێش چاو، کە کۆڕ بەرانبەر فەرهەنگی ناوبراو هەلێکی چاک و پڕ سوود و لەباری لە دەست داوە... ئەگەر ئەنجومەن لەسەر لێکۆڵینەوەی تەواو، چاوێک بەو باسەدا بگێڕێتەوە و بڕیارێکی واقیعی بدات، ئەوە لەو رایە دام کە خزمەتێکی گەورە بە کورد و زمانی کوردیی دەکا و ئەرکێکی گەورەی کۆڕیش بە جێ دێنێ.

لە گەڵ ئەوپەڕی رێزدا

ئەوڕەحمانی حاجی مارف

١٩٧٧/٤/١٢

ئەنجومەنی کۆڕ لە بڕیاری خۆی پەشیمان نەبووەوە، بەڵام نە من بوومە دوژمنی کۆڕ و نە کۆڕیش دوژمنی من. جا ئەمەیە راستی و دروستی چاپ کردنی فەرهەنگی زەبیحی. بوختان و مەبەستی د.نەبەزیش لە هەموو کوردێکی دڵسۆز ئاشکرایە.

بوختانی دووەم، ئەوەیە کە د.نەبەز دەڵێ: زەبیحی چووە «هێندێ وشەی داتاشراوی کۆڕی بەکار هێناوە» (ل ٨٧). مەبەستیشی لە وشەی داتاشراو ئەو زاراوانەن کە کۆڕ دایناون. لێرەدا وەڵامی ئەوە نادەمەوە کە زاراوەکانی کۆڕ داتاشراون یان نا، چونکە دواتر لە شوێنێکی دی دا لێ یان دەدوێم. بەڵام پەنجە بۆ ئەو راستی یە رادەکێشم کە زەبیحی بۆ خۆیی چێشتیش نەک زاراوی کۆڕ، بەڵکو زاراوی هیچ دەزگا و کەسانێکی بەکار نەهێناوە. لەمەشدا چاکی کردووە، چونکە زۆربەی زۆری ئەو زاراوانە هێشتا نەچەسپاون، جا مامۆستاش وتاری نەنووسیوە، بەڵکو فەرهەنگی داناوە. ئەگەر چاوێک بە نووسینی کوردی دا بگێڕین، دەبینین بەرانبەر (فعل)ی عەرەبی (کار، کردار، فرمان...) بەکار دەهێنرێن و هەر کەسە یەکێکیانی بەلاوە پەسەندە و ناشتوانرێ رێگە لە هیچ کەسێک بگیرێ و ئەمە قۆناغێکە لە ژیانی زانستی میللەتی کورد. جا زەبیحی کە فەرهەنگی نووسیوە ئایا راستە لە فەرهەنگەکەیدا هەموو وشەکانی (کار، کردار، فرمان ...) بەرانبەر (فعل) دابنێ؟ یاخود راستە یەکێکیان هەڵبژێرێ و ئەوانی دی دوور بخاتەوە؟ بێ گومان ئەگەر زەبیحی هەر رێگەیەکی لەو دوو رێگەیە بگرتایە، ئەوە

د.نەبەز خۆشی پێی رازی نەدەبوو. بەڵێ لەبەر ئەوەی هێشتا ئەو زاراوانە ساوان و کێشە و رای جیاوازیان لەسەر هەیە، راستتر وایە جارێ نەکەونە ناو فەرهەنگەوە، چونکە زاراوەیەک کە لە فەرهەنگێکی گەورەی زماندا تۆمار کرا، ئەوە وا دەگەیەنێ کە ئەو زاراوەیە چەسپاوە و جێگەی خۆی گرتووە و کێشەی لەسەر نەماوە... زاراوەیەکی نارێک کە دەکەوێتە نووسینەوە، لابردنی چەندە گرانە، دەرهاویشتنی لە فەرهەنگ صەد هێندە ئەرکی پتر پێ دەوێ.... لە هەندێ شوێنی نووسینی د.نەبەزدا ئەوە بەدەردەکەوێ کە ئەو زاراوانەی خۆی دایناون یاخود ئەوانەی خۆی بەکاریان دەهێنێ و پەسەندیان داکا، بە چەسپاویان دادەنێ. بێ گومان، ئەم خەیاڵەی د.نەبەز لە راستی یەوە دوورە.

سەرەڕای ئەو دوو بوختانە، ئنجا بە زمانێکی بازاڕیانە، وەک هەموو خەڵک چاوەڕوانی خێری ئەو بن، روو دەکاتە زەبیحی و دەڵێ: «ئەمانە هەمووی قەیناکاو بۆ ئەو» (ل ٨٧) ... بە دوای ئەو وشانەدا کەمێک واز لە زەبیحی دێنێ و بەرۆکی من دەگرێ و بوختانی سێ یەمی دەهۆنێتەوە و دەڵێ: «بەڵام ئایا جێی داخ و خەفەت نییە لە فەرهەنگێکی وادا کە د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە لای خۆی دوکتۆرای لە (زانستی فەرهەنگ نووسینی کوردی)دا وەرگرتووە و بە ئاووتاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزرابێ؟» (ل٨٧).

ئەوەی بە کەم و کورتی یەکی گەورەی خۆمی بزانم و یەکێک بێ لەو ئەرکانەی هێشتا بەجێم نەهێناون، ئەوەیە کە تا ئێستا بە نووسین بەرانبەر فەرهەنگەکەی زەبیحی رای خۆم دەرنەبڕیوە (٤). جا من کە نەک لە فەرهەنگی ناوبراودا، بەڵکو لە شوێنی دیش دەربارەی نەدوابم، ئیتر د.نەبەز چۆن ئەو بوختانە بە دەممەوە دەکا. ئەگەر د.نەبەز راستی دەکرد، خۆ دەبوو بنووسێ لە چ لاپەڕەیەکدا باسم کردووە، یاخود دەبوو چەند وشەیەک لەو وتارەم بێنێتەوە و ئەگەر لە شوێنێکدا بە هەڵە چووبم وەڵامم بداتەوە... . بێ گومان، د.نەبەز ئەمانەی نەکردووە، چونکە وتار لە ئارادا نییە. تا ئێستە کەسێکی دیم نەبینیوە کە وا بە قەڵەمی بوختان ئەو جۆرە نارەوایی یە لە گەڵ زانستدا بکا... کەی و لە کوێ رووی داوە بەو چەشنە حورمەتی لێکۆڵینەوەی زانستی بشکێنرێ؟ ... دیارە مابەستی د.نەبەز لەو بوختانە ئەوەیە، پێشەکی پێم رابگەیەنێ کە ئەو فەرهەنگە پەسەند نەکەم.

بێ گومان، ئەگەر بەڵگە و ڕەخنە و سەرنجی ڕاست و دروستی بۆ ڕەت کردنەوەی هەبوایە، ئەوە کاری تێ دەکردم، بەڵام قسەی رووت و بەتایبەتی رەق و ناشیرین کار ناکەنە سەر قەڵەمی من و رێی ڕاستم لێ ناگۆڕن....

سەرەڕای ئەو سێ بوختانە، ڕەخنەیەکی لاواز و هەڵەیەکی گەورە و بێ ویژدانی و وشەی سووک و ناشیرین لە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دا ئاشکرا و زەق لەبەر چاون.

ڕەخنە لاوازەکەی ئەوەیە کە دەڵێ: «چووە گەلێک وشەی بێگانەی بەکار هێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە نێو زمانی کوردی دا هەن...» (ل٨٧) بەڵێ لە فەرهەنگی زەبیحی دا گەلێ وشە هەن، کە بە ڕەسەن بێگانەن، بەڵام زۆربەی ئەو وشانە لە کوردی دا بنجیان داکوتاوە و خەڵکی گوند و شار بەکاریان دێنن، لە بەرهەمی شاعیران و ئەدیبانی کورددا دەبینرێن.... جا ئیتر هەر لەبەر ئەوەی بەڕەسەن کوردی نین، دەبێ لەو فەرهەنگەدا تۆمار نەکرین؟ بەتایبەتی کە فەرهەنگەکە فەرهەنگی زمانی کوردی یە، نەک فەرهەنگی وشەی کوردی. بۆ دەبێ وشەی بێگانەمان بەلاوە هێندە ناحەز بێ؟ دیارە د.نەبەز دەیەوێ هەموو شتێکمان لە میللەتانی سەر رووی ئەم زەمینە جیا بێ. ئەگینا وەنەبێ فەرهەنگەکانی زمانی ئینگلیزی و رووسی و ئەلمانی... وشەی بێگانەیان کەم تێدا نەبێ. بە وێنە لە لاپەڕە (٣)ی «فەرهەنگی زمانی رووسی»دا (٥)، (٣٦) وشە تۆمار کراون، کە (٣٣)یان بێگانەن. جا پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین، کە لەسەر رووی زەمیندا هیچ زمانێک نییە کە زمانی بێگانە کاری تێ نەکرد بێ، یاخود تەئسیری زمانی بێگانەی لەسەر نەبێت. هەروەها هیچ میللەتێک یاخود هەڵگری هیچ زمانێک بە ڕەهایی و بە شێوەیەکی تایبەتی و جیاواز و دوور لە میللەتان ناژی.

خاسیەتی کۆمەڵایەتیی وتوێژی مرۆڤ و رووداوی مێژوویی، کە پێشکەوتنی کۆمەڵ دیاری دەکەن، دەبنە هۆی ئەوەی کاری تێ کردنی زمانێک بەسەر زمانێکی ترەوە بێت و زمانێک لە زمانێکی ترەوە شت وەربگرێ. ئەم دیاردەیەش پتر لە موفرەداتی زماندا دەردەکەوێ.

لە ئەنجامی پەیوەندی دوور و درێژی ئابووری و سیاسی و جەنگی و کولتووری... میللەتی کورد لە گەڵ میللەتانی تردا، گەلێک وشە و پارچەی وشە هاتوونەتە زمانی

کوردی یەوە و لە دەستووریشیدا بنجی خۆیان داکوتاوە.

ئەم دیاردەیە - واتە کاری زمانی بێگانە و وەرگرتنی وشەی بێگانە - وەنەبێ شتێکی خراپ و زیان بەخش بێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە زمانی ئێمەیان دەوڵەمەند و فراوان و بەرین کردووە. بێ گومان، ئەوەی کورد لە بێگانەی وەرگرتووە خستوویەتیە ژێر باری فۆنەتیک و وشەڕۆنان و دەستوور و ڕێزمانی کوردی یەوە و بەمە بەرگێکی کوردانەی بە بەردا کردووە.

لە گەڵ هەموو ئەوشدا، بێ گومان پێویست ناکا بە بێ هۆ وشەی بێگانە بەکار بهێنرێ - واتە کاتێک بۆ دەربڕینی مەبەستێک وشەی ڕەسەن و جوان و لەبار و بەکارهێنراو و ئاشکرای کوردی هەبێت، ئیتر بۆ پەنا بۆ وشەی بێگانە ببرێت - بۆچی بڵێین «دەماغ، فەقەرە...» لە کاتێکدا کە خۆمان «مێشک، بڕبڕە...»مان هەیە و چی یان لە «دەماغ و فەقەرە...» کەمتر نییە. جگە لەوە پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە بەکارهێنانی وشەی بێگانە، بەتایبەتی لە شوێنی پێویستی خۆیدا کارێکی ڕاست و ڕەوانە و هەر وەک وشەی کوردی ڕەسەن جێی خۆی دەگرێ.

منیش لەو رایەدام کە مامۆستا زەبیحی هەندێ وشەی بێگانەی ئەوتۆی لە فەرهەنگەکەیدا تۆمار کردووە کە نەدەبوو بکەونە ناوەوە، بەڵام نەک بەو شێوەیەی د.نەبەز دەڵێ (گەلێک).

لە باسی نەبوونی (هەمزە) لە کوردی دا تووشی ئەو هەڵە گەورەیە بووە، کە (فۆنێم) و (دەنگ) و (پیت)ی تێکەڵ کردووە. نەزانین و لێک جیانەکردنەوەی ئەو سێ مەفهومە کە سەرەتایەکی ئەلفوبێی زمانەوانی یە، نەک هەر لەم شوێنەدا، بەڵکو لە سەرپاکی وتارەکە و تێکڕای نووسینەکانی تری د.نەبەز دا زۆر روون و ئاشکرا دیارە. جا لەبەر ئەوەی ئەم هەست نەکردنەی د.نەبەز پەیوەندی بە گەلێ شوێنی ترەوە هەیە، بۆیەکا ئێستا کەمێک لە باسە سەرەکی یەکە دوور دەکەومەوە و بە کورتی لەوە دەدوێم، کە چۆن د.نەبەز تا ئێستاش سێ مەفهومی (فۆنێم) و (دەنگ) و (پیت) لێک جیا ناکاتەوە.

د.نەبەز لە زۆربەی زۆری نووسینەکانیدا (دەنگ)ی بە (پیت - کە ئەو تیپی پێ دەڵێ) ناو بردووە. ئەم هەڵەیەی لە سەرپاکی وتاری «سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی

تازە بەکار هاتوو و کۆڕی زانیاری کورد» و کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا کوتاوەتەوە. بێ گومان جێگەی رەخنەیە د.نەبەز لەو سەرەتایەی زمانەوانی بێ ئاگایە و مەفهوومی (دەنگ) و (پیت)ی وا تێکەڵ کردووە و لە یەکتری جودا نەکردوونەتەوە.

وەک ئاشکرایە (دەنگ) لە رێگای ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕێت و بە هۆی بیستنەوە هەستی پێ دەکرێ. (پیت) وێنەی دەنگەکە بە نیشانە لە نووسیندا دیار کراوە و بە هۆی بینینەوە وەردەگیرێ. راستە مرۆڤ نەک تەنها دەتوانێ وشە بە دەمدا بێنێ، بەڵکو هەروەها دەتوانێ بیشینووسێ، یاخود چاپی بکات. بەڵام کاتێ ئێمە دەنووسین یا خود چاپ دەکەین، ئەوە وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتن بە پیت نیشان دەدەین. بەڵێ زمان دوو دیوی هەیە: ئاخاوتن و نووسین. بەڵام ئاخاوتن رەسەنترە و پێش نووسین کەوتووە. منداڵ لە سەرەتادا فێری قسە کردن دەبێ و دوایی نوسین. زۆر کەسانیش هەن سەد ساڵ دەژین و رەوان و پاراو بە زمانەکەیان دەدوێن بێ ئەوەی فێری خوێندنەوە یان نووسینی پیتێک بووبن. لەم سەدەی بیستەمەشدا هێشتا میللەتی ئەوتۆ هەیە کە لەو دەستکەوتە مەزنەی شارستانی یەت بێ بەشە.

جا جێگەی رەخنەیە کە د.نەبەز لەم سەرەتا زمانەوانی یە بێ ئاگایە و بەڵگەشم بۆ سەلماندنی ئەم وتانەم، ئەوەیە کە کەرەستەی ئاخاوتنی تێکەڵ بە کەرەستەی نووسین کردووە - واتە دەنگەکانی ئاخاوتن کە لە زارەوە دەردێن لە گەڵ کەرەستەی نووسین بە یەک شت تێ گەیشتووە:

بە وێنە لە لاپەڕە (٦٥)ی کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا، لە یەکەم دێڕی ژێر سەرباسی «دەنگی (ک) و (گ)...»دا، دەڵێ: «کاتێک تیپی بێ دەنگی (ک) و (گ) لە وشەیەکدا پێش هێندێ تیپی دەنگدار بکەوێ، بە تایبەتی (ئی - i) و (ئێ - e) و (ئوێ - o) ئەو کاتە دەنگەکانیان نەختێک نازک دەبێتەوە». لەسەر باسدا دیارە کە دویەوێ لە (دەنگ) بدوێ، کەچی لە یەکەم دێڕی باسەکەدا دوو جار (تیپ)ی لە جێی (دەنگ) بەکار هێناوە. دوای ئەو هەڵەیە ئنجا لە دێڕی دووەمدا (ک) و (گ) بە (دەنگ) ناو دەبا. لێرەدا سەرنج راکێش ئەوەشە کە (ی، ێ، وێ)ی بە (ئی، ئێ، ئوێ) ناوبردووە، واتە بە ناوی پیتەکانەوە، دەنگەکانی ناو ناوە.

لە لاپەڕە (١١٤)ی وتاری «سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکار هاتوو و کۆڕی زانیاری کورد»دا، نووسیوێتی: «ئەمجا دەمێنێتەوە سەر **دەنگی** (a) لە بازاڕدا و **دەنگی** (e) لە وشەی باژێڕدا (واتا: ئا و ئێـ) بە پێی دەستووری زمانەوانی بە زۆری لە وشەی فارسی ی تازەدا **تیپە** دەنگداری درێژ (a) کە پاش **تیپێکی بێ دەنگ** بێ...».

لە سەرەتای ئەو چەند دێڕەدا ئاشکرا دیارە کە مەبەست لێکۆڵینەوەی دوو دەنگی (ا - a) و (ێ - e)یە و د.نەبەز راست دەستی بە باسەکەی کردووە، کەچی دواتر بە پیت (نووسەر وتەنی تیپ) ناوی بردوون. لەم باسەدا مەبەست گۆڕانی دەنگە بە دەنگێکی تر، کە دیاردەیەکی فۆنەتیکی زمانە. هەرچی (پیت)ە لێرەدا هیچ پەیوەندی یەکی بەو کێشەیەوە نییە... هەر لەم شوێنەدا هەڵەیەکی دی سەرنج ڕاکێش، ئەوەیە کە بۆ دەنگی کۆنسۆنانت (Consonants) زاراوەی (تیپی بێ دەنگ)ی بەکار هێناوە. هەرچەندە لە بریتی (تیپ) دەبوو (دەنگ) بەکار بهێنێ، بەڵام لێرەدا مەبەستم تەنیا هەڵەی جیا نەکردنەوەی (پیت) و (دەنگ)ەکە نییە، بەڵکو مەبەستم نالەباری و نەگونجانی زاراوەی (بێ دەنگ)ە، کە بەرانبەر (کۆنسۆنانت - Consonants) بەکاری هێناوە. وەک ئاشکرایە، هەموو دەنگێک، دەنگی هەیە. جا با ئەو دەنگە بەرز بێ یان نزم، کۆنسۆنانت بێ یان بزوێن. بەڵام کە وترا (بێ دەنگ) ئەوە وا دەگەیەنێ کە دەنگی نییە. جا کە (د، ت، ز، س، ژ، ش، ڤ، ف...) و تێکڕای دەنگە کۆنسۆنانتەکانی دی دەنگ بن و بە دەمدا بێن، ئیتر چۆن دەکرێ بوترێ (بێ دەنگ)ن. خۆ د.نەبەز بە دەگمەن زاراوەیەک پەسەند دەکا کە خۆی دای نەنابێ، کەچی وا بە ساکاری زاراوەی (بێ دەنگ)ی وەرگرتووە.

تا ئێرە ئەوەم ئاشکرا کرد کە د.نەبەز تاکو ئێستا جیاوازی لە نێوان (پیت) و (دەنگ)دا ناکات. ئنجا با بێینە سەر بەراورد کردنی (دەنگ) و (فۆنێم) کە هەڵەی گەورەی د.نەبەزی تێدا دەردەکەوێ. وەک ئاشکرایە، فۆنێم بەو دەنگانە دەوترێ کە لە زماندا وشە پێک دەهێنن و بە گۆڕان و لاچوونیان واتا دەگۆڕێن. بۆ نموونە، ئەگەر فۆنێمی (ا) لە وشەی «باز»دا بگۆڕێت بە (ە، ۆ، ێ...)، ئەوە ئەم وشانە «بەز، بۆز، بێز...» پەیدا دەبن، کە جیاوازی یەکی تەواو لە مانایاندا هەیە - واتە لێرەدا فۆنێمی (ە، ۆ، ێ...)

دەوری گۆڕینی مانای وشەی «باز» دەبینن. ئەگەر فۆنیمی (ز)یش لە وشەی «ناز»دا بگۆڕێت بە (ن، ڵ، ف، خ...)، ئەوە ئەم وشانە: «نان، ناڵ، ناف، ناخ...» دروست دەبن، کە هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیە - واتە بەم جۆرە دەبینین کە وا فۆنیمی (ن، ڵ، ف، خ...) مانای وشەی «ناز» دەگۆڕن.... لێرەدا پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین، کە هەرچەندە فۆنیم کاری جیاکردنەوەی گۆڕینی مانا بە جێ دەهێنێ، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا بە تەنیا خۆی خاوەنی مانا و واتا نییە.

(فۆنیم) لە (دەنگ) گرنگترە، چونکە جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوە. هەموو فۆنیمێک، دەنگە، بەڵام هەموو دەنگێک، فۆنیم نییە. بە وێنە: (قیژە، هاوار، قۆڕەی سک، قەقێنە، نزگەرە، پرخەپرخ، کۆکە...) هەموو دەنگن، بەڵام هیچیان فۆنیم نین. یاخود کاتێ (گ، ک) لە پێش (ی، ێ، وێ، وی)دا دەگوترێن، شێوەی تەلەفوزیان وەک (چ) یان (ج)ی لێ دێت - واتە (گ) و (ک) لە حالەتی ئاسایی دا لە بنی ئەوکەوە تەلەفوز دەکرێن، بەڵام لە حالەتی دووەمدا زمان نزیک مەلاشوو دەخاتەوە -. بەو پێ یە دەبنە ەدنگی جیاواز، بەڵام نابنە فۆنیمی جیاواز.

لە نووسینە زمانەوانی یەکانی د.نەبەزدا وشەی (فۆنیم) بەرچاو ناکەوێ و نەک هەروا تێ گەیشتووە کە دانەی گرنگی زمان دەبێ (دەنگ) بێ، بەڵکو لە گەڵ (پیت)یشدا تێکەڵی کردووە. جا ئەو جیانەکردنەوەیە تووشی ئەو هەڵەیەی کردووە کە (هەمزە) بە دەنگ دانەنێ و رەخنە لە مامۆستا زەبیحی بگرێ، کە چۆن فەرهەنگەکەی بە پیتی هەمزە دەست پێ کردووە.

هەر چەندە من لەو رایەدام کە لە زمانی کوردی دا هەمزە (فۆنیم) نییە، بەڵام وەک (دەنگ)ێک بۆ یاریدەی دەربڕینی بزوێنەکان، بەتایبەتی لە سەرەتای وشەوە دێت. جا بەو پێ یە لەو ئەلفوبێ کوردی یەی لە ئەلفوبێ ی عەرەبی - فارسی دەستکاری کراوە وەرگیراوە، وێنە بۆ دەنگی (هەمزە) دانراوە. جا لەبەر ئەوە مامۆستا زەبیحی ئەگەر نەک هەر بە (فۆنیم)، بەڵکو بە (دەنگ)یشی دانەنایە، ئەوە هەر ناچار دەبوو لە رێکخستنی فەرهەنگەکەیدا وەک (پیت)ێک حیسابی بۆ بکا، چونکە وەک ئاشکرایە، لەو ئەلفوبێ یەی ئێستا ئێمە پێ ی دەنووسین، هەمزە بە یەکەم پیتی ئەلفوبێ دانراوە، ئەمەش لە

فەرهەنگە کوردی یەکان(٦) و نووسین دا تەواو رەچاو کراوە و بۆ پتر سەلماندنی ئەو رایەم، هەر لەو لاپەڕەیەدا کە د.نەبەز لەو بارەیەوە رەخنەی لە زەبیحی گرتووە، چەندین وشە دەبینرێن کە بە پیتی هەمزە دەست پێ کراون و نیگار و وێنەیان کێشراوە، وەک: (ئەو، ئەلف، ئەمانە، ئامراز...). ئایا هێشتا کەس لەو ئیملا ستاندارتەدا ئەوەی بینیوە کە ئەو وشانە بەم جۆرە (ەو، ەلف، ەمانە، امراز...) بنووسرێن؟ نەخێرا چونکە وا رۆیشتووە. راستە لە ئەلفوبێ ی لاتینی دا هەمزە وێنەی بۆ دانەنراوە، بەڵام ئەمە هیچ کارێکی لەو ئەلفوبێ عەرەبی - فارسی یە دەستکاری کراو و وەرگیراوە، نەکردووە و هیچی لێ نەگۆڕیوە. لەبەر ئەوە ئەگەر زەبیحی وەک هەموو ئەو خەڵکە هەمزەی بە یەکەم پیتی ئەو ئەلفوبێ یە دانابێ، دەبێ گوناهی چی بێ؟ ... خۆ ئەگەر د.نەبەز نووسینی هەمزە بەلایەوە راست نی یە، ئەوە با بە وتارێکی زانستی رەتی کاتەوە.

بەو پێ یە دەرکەوت کە هەڵە گەورەکەی د.نەبەز لەوە دایە کە هەمزە بە دەنگ دانانێ. بێ گومان، وا نییە و هەمزە دەنگە و لەو ئەلفوبێ یەی ئێستە پێ ی، دەنووسین وێنەی (ئـ) بۆ دانراوە. دانەنانی هەمزە بە دەنگ راست نییە، چوونکە تەلەفووز دەکرێ و دەبیسترێ، بەڵام دانەنانی بە فۆنێم شتێکی راستە، چونکە دەوری واتا گۆڕی و وشەپێکهێنان نابینێ. وەک وتیشم، هەموو دەنگێک فۆنێم نییە، بەڵام هەموو فۆنێمێک دەنگە.

جا د.نەبەز کە خۆی بە پسپۆری زمانەوانی دادەنێ و هەردەم باسی شارەزایی و فراوانی زانینی خۆی دەکا، کەچی ئەو سەرەتا ئاسانەی زانستی زمان نازانێ، هێشتا بە خۆشیدا رادەپەرموێ توند و تیژ هێرش بباتە سەر خەڵکی و بە لووت بەرزی یەوە پێ یان بڵێ:«کە ئەمانە لە زانستی زمانەوانی دا بە کفر دەژمێررێن و هەرچی ئەلفوبێ ی زمانەوانی بزانێ نابێ بکەوێتە هەڵەی لەم جۆرە» (ل ٨٨).

ئەو چەند بوختان و هەڵانەی تا ئەم شوێنە لێیان دوام لە لایەک، بەڵام ئێستا سەرنجی خوێنەر بۆ بێ ویژدانی یەکی د.نەبەز رادەکێشم، کە خوێنەر هەزار خۆزگە بۆ بوختان و هەڵەکانی بخوازێ. ئەویش ئەوەیە کە فەرهەنگی زەبیحی بە یەکجاری رەت دەکاتەوە و دەڵێ: هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزراوە (ل ٨٧).

سەیر ئەوەیە، کە هەموو بەڵگەی رەت کردنەوەی ئەو فەرهەنگەش ئەو دوو سەرنجەن کە خۆی تیایاندا بە هەڵە چووە. ئەگەر رەخنەی زانستی و بنەڕەتیشی بەرانبەر ئەو هەموو زانیاری یەی مامۆستا زەبیحی لەو پێشەکی یە دوور و درێژەی فەرهەنگەکەیدا تۆماری کردووە، هەبوایە، یاخود نیشانیشی بدایە کە زەبیحی لە دیاری کردنی رەسەنی وشەکاندا هەڵەی زۆری کردووە، یاخود ئەوەشی بخستایەتە پێش چاو کە واتای گەلێک وشەی راست یان باش لێک نەداوەتەوە، یاخود نموونەی لەبار و گونجاوی نەهێناوەتەوە... ئەوە هێشتا نەدەبوو ئەوەی وتوویەتی بیڵێ، چونکە نەک ئەو بەرهەمە شاکارەی زەبیحی بەڵکو هیچ بەرهەمێک سەرلەبەری خراپ نییە. هەر بەو شێوەیەش کاری وەها نییە بێ کەم و کورتی بێ... ئەم جۆرە حوکمە ناڕەوا دوور لە زانستی یەی د.نەبەز نەک هەر لێرەدا، بەڵکو لە گەلێ شوێنی تری وتارەکەیدا دەبینرێ. بە وێنە لە پەراوێزی ژمارە (٢٠)دا کاتێ دەیەوێ گلەیی لە کۆڕی زانیاری کورد بکا، لەسەر ئەوەی لەو وتارەیدا کە بە ناوی «کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا» وە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕ دا بۆی بڵاو کراوەتەوە، گوایا لە وشە ئەڵمانی یەکاندا هەڵەی چاپ رووی داوە. جا بەو بۆنەیەوە د.نەبەز نووسیوێتی، دەڵێ: «هەموو وشە ئەڵمانی یەکانی بە هەڵە لە چاپ دا» (ل ١١١). زمانەوانێکی وەک د.نەبەز نەدەبوو بۆ ئەو مەبەستە وشەی «هەموو» بەکار بهێنێ، چونکە ئاشکرایە کە «هەموو» واتایەکی مطلق دەدات. جابەو پێ یە دەبێ وشەی راستی تێدا نەبووبێ. بێ گومان، ئەمەش هەر وەک حوکمەکانی تری نارەوایە. بەڵام سەیر و سەمەرە ئەوەیە کە دەربارەی هەمان باس لە وتارێکی زووتریدا دەڵێ: «وشە ئەڵمانی یەکانی نێو وتارەکە بە زۆری بە هەڵە و ناتەواوی چاپکراون» (٧). پێویست بەوە ناکات ئەو دوو رستەیەی د.نەبەز کە لە دوو وتاری جیاوازدا بەکاری هێناون بەراورد بکەم، هیوام وایە خۆی بە سەریاندا بچێتەوە... لێرەدا تەنیا ئەو راستی یە دەڵێم کە د.نەبەز ئەودەم کە هێشتا رقی لە کۆڕ هەڵنەستابوو، یاخود هێشتا بە دەنگ و باسی ناڕاست و بوختانی هێندێ کەس گەرم نەبووبوو، دەیوت «بە زۆری... »، کە چی ئێستا رق و کینە وای لێ کردووە راستی تێدا نەبینێ. بەڵێ ئەنگە زانایەک بە داخی دڵی خۆی زانست بەو دەردە بەرێ و بە ئارەزووی

خۆی حوکم بدا. (۸)

جـا بەم جۆرە بێ ویژدانی د.نەبەز لە ڕەت کـردنەوەی گـەلێ شـتـدا دەبینرێ و لە نێوانیاندا فەرهەنگی زەبیحیشی بەرکەوتووە.

هەمـوو ئەوەی تا ئێـرە لێ ی دوام لە لایەک و شـێـوازی بازاڕی و قـسـەی سـووک بەکـار هێنانی لە لایەک. بە وێنە لە باسی (هەمـزە)دا ڕوو دەکـاتە زەبیـحی و دەڵێ: «هەمزە لە هەبسی چی» (ل ۸۷). دواتر وتەی ناشیرینی خەستتر دەکاتەوە و دەڵێ: «... زەبیحی کە هەر چەندە مرۆڤێکی نۆزانە» (ل ۸۸). بەڕاستی مەگەر هەر د.نەبەز وا بە چاوی سووک تەماشای ئەو کەسانە بکا کە خزمەتی زمانی کوردی دەکەن... نووسەری وتار بەو وتانە هێشـتـا دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە و ڕوو دەکـاتە کۆڕی زانیـاری کـورد و دەڵێ: «ئەگەر زەبیـحی زۆرزان ئەمەی لێ تێکچوو، ئەی چۆن دەبێ کۆڕێکی زانیاری زل و زەلام شـتـێـکی وای لێ تێـک بچێ!» (ل ۸۸). وەک ڕوونم کـردەوە د.نەبەز ڕاست نـاکـا و کـۆڕ فەرهەنگی بۆ مامۆستا زەبیحی چاپ نەکردووە و مامۆستا زەبیحیش (هەمزە)ی لێ تێک نەچووە. خۆ ئەگەر زەبیحی هەڵەشی کردبێ، ئەوە کابرایەکە لە هیچ زانستگەیەکی وڵات و هەندەران نەی خـوێندووە و هێندەی لێ دەزانێ. هەرچی کـۆڕیشـە، وەک هەمـوو دەزگـایەکی دی کـوردی هەر ئەوەندەی لەبار دایە. بەڵام ئەی یەکـێـک: مـامـۆسـتـای ئێـتـمـۆلۆژیای گـەلانی ئێـران، هەروەها زمـان و کـولتـووری کـورد لە زانسـتگەی بەرلین و ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستانە لە ئەڵەمانیای ڕۆژئاوا بێ (۹)، چۆن بەو شێوەیە بوختـان دەکـا و بەو ڕادەیە بێ ویژدان دەبێ و هێندە وشەی سووک و ناشیرین بە زانایانی کـورد دەڵێ و هیچ ڕێزی ڕەنج و بەرهەمـیـان نـاگرێ و لای وایە کـەس هیچ نازانێ و کـەچی خۆشی لە گەلێک سەرەتای ئەلفوبێ ی زمانەوانی بێ ئاگایە... یاخود چۆن لە چوار دیواری مەڵبەندێکی فرە گەورە و پێشکەوتووی وەک «زانسـتگەی ئازاد لە بەرلین»دا ئەو چەشنە بەرهەمـانە دێنە ئەنجام. نەخێر من وەک د.نەبەز، خوم و خەڵک تەفرە نادەم و دەزانم کە «زانسـتگەی ئازاد لە بەرلین» ئاگـاداری ئەو کـەین و بەینە و ئەو هەڵا و بگرەی د.نەبەز نییە.

- ماوێتی -

## پەراوێزەکان

١- زەردەشت، کوردایەتی بزوتنەوە و بڕوا و رژێم، ١٩٦٠

٢- لە هەموو نووسراوەکانی دی ئەم دوایی یەدا هەر ئەوە شێوەی نووسینی د. ئەبەزە، بە وێنە:
ا- لە کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا، کە ساڵی ١٩٧٦ لە بامبێرگ بڵاوی کردۆتەوە، هەر هێرش و وتەی ناشیرین و ڕێز نەگرتنی بەرهەمی خەڵک و خۆ هەڵکێشانە.
ب- وتاری «رەخنەی زمانەوانی و لیستی کورتانە هاویشتن»، کە لە ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری «ئاسۆی زانکۆیی»دا چاپ کراوە، تەنیا ناوی وتارەکە بەسە بۆ بەڵگەی ئەو جۆرە هەڵس و کەوتە.
ج- نامەیەکی بۆ جێگری پێشووی سەرۆکی کۆڕ- مامۆستا مەسعوود محەمەد ناردووە، مەگەر هەر د. ئەبەز رووی بێ، ئەو وشانە بخاتە سەر کاغەز. خوا هەڵناگرێ برادەرەکانیشی لەمەشدا دریغی یان نەکردووە و وێنەی ئەو نامەیەیان بۆ گرتۆتەوە و بەسەر رووناکبیراندا بڵاویان کردۆتەوە.
... و هەندێکی تر

٣- د. ئەبەز، سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات»، بەغدا، ١٩٧٨، ژ ٢٢، ل ٧٩ - ١١٥.

٤- تەنیا لەو وتارەدا کە دەربارەی فەرهەنگی ئەستێرەگەشە لە ژمارە (٢٤٨)ی ساڵی (١٩٧٧)ی رۆژنامەی «بیری نوێ»دا بڵاوم کردۆتەوە، بە دوو دێڕێک هەواڵی دەرچوونی فەرهەنگەکەی زەبیحیم بە خوێنەران راگەیاندووە.

٥- د. ن. ئوشاکۆڤ، فەرهەنگی زمانی رووسی، ب١، مۆسکۆ، ١٩٣٥.

٦- بە وێنە بڕوانە:
ا- شێخ محەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، ب١، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ٤٠-٨٩.
ب- گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد، هەولێر، ١٩٦١، ل ٢١-٥١.

٧- د. جەمال ئەبەز، خوێندنی کوردەوانی لە زانستگەی ئازاد لە بەرلین، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات»، بەغدا، ١٩٧٦، ژ ١٩، ل ١٩٢.

٨- دواتر دەگەڕێینەوە سەرباسی ئەو وتارەی و هەندێ شتی دی دەربارەی دەخەینە پێش چاو.

٩- ئەمانە، ئەو پایە زانستی یانەن کە د. ئەبەز وەری گرتوون، وەک خۆی لە لاپەڕە (٦)ی کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی»دا نووسیوێتی.

## بەربینگی زمانی کوردی بەربدەن!

ئەمیری حەسەنپوور

لە نووسینەکانی د. جەماڵ نەبەز لەمەڕ زەبیحی و قامووسەکەی (بڕوانە لاپەڕەی ٤٠٦) و وەڵامی زەبیحی (ل ٤١٢) چەند باسی زماناسی و سیاسی هاتوونە گۆڕێ کە شیاوی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی بەرین ترن. من لێرەدا تەنیا باسی سێ بابەت دەکەم - ئەویش بە کورتی: (١) هەمزە: دەنگ و حەرف، (٢) وشە خوازین و داتاشین و، (٣) دابی رەخنە گرتن.

### (١) هەمزە: دەنگ و حەرف

بە بۆ چوونی من، ***قامووسی زمانی کوردی*** زەبیحی بەرهەمی هەرە گرینگی فەرهەنگنووسیی کوردییە.[١] بەڵام ئەنجومەنی "کۆڕی زانیاری کورد" پێی وابوو ئەو قامووسە بایەخی وەی نییە کۆڕ پشتیوانی لێ بکا و بە خەرجی خۆی بڵاوی بکاتەوە (بڕوانە ل ). ئەو بۆچوونەی "کۆڕی زانیاری" رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە ***قامووس*** وشەی وەرگیراو لە زمانی عەرەبی و تورکی تێدا تۆمار کراوە. رەنگە موکریانی بوونی زەبیحیش دەورێکی لە بڕیاری ئەنجومەنی کۆڕدا گێڕابێ، سەرباقی ئەوەی زمانی نووسینی زەبیحی تێکەڵاوێکی نۆرمی موکریانی و سلێمانییە.[٢] د. جەماڵ نەبەزیش ***قامووسی*** زۆرتر بە پێوانەی سیاسی و ئیدەئۆلۆژی هەڵسەنگاندووە و، بە بڕوای من، دەستکەوتەکانی ئەو بەرهەمەی بۆ روون نەبۆتەوە و نەیتوانیوە دەوری قامووس لە مێژووی سێ سەدەیی فەرهەنگنوسیی کوردی دا شی بکاتەوە.

تەنیا دوو بەرگ لە دە بەرگی ***قامووس*** بڵاو بۆوە. بەرگی یەک تەواوی ئەو

وشانەی تێدایە کە بە حەرفی هەمزە دەست پێدەکەن. لێرەدا دوو رەخنەی د. نەبەز لە ***قامووس*** بە کورتی شی دەکەمەوە: (١) زەبیحی هەمزە بە دەنگێکی کوردی دادەنێ بەڵام ئەو دەنگە عەرەبییە و لە کوردی دا نییە، و (٢) زەبیحی وشەی بێگانەی - زۆرتر عەرەبی - لە قامووس دا تۆمار کردووە. زەبیحی و د. ئەورەحمانی حاجی مارف وەڵامی ئەو رەخنانە و چەند رەخنەیەکی تری د. نەبەزیان داوەتەوە (بڕوانە ل ٤١٢ و ٤٣١). من لێرەدا بەشێ لایەنێکی کێشەی هەمزە شی دەکەمەوە.

لە باسی ئەلفووبێ و رێنووس و دەزگای دەنگی کوردی دا، زۆر کەس دەنگ و حەرف تێکەڵ دەکەن. زۆر کەس پێیان وایە حەرف، دەنگێکی تایبەتی و نەگۆڕی لە خۆی دا راگرتووە و هەر کاتێک ئەو حەرفە بنووسرێ یان وەبەر چاو بکەوێ، دەنگەکەش لە گەڵ خۆی دەخاتە سەر زار. بەڵام حەرف، نیشانە یان نیگارێکە کە بە قەرار و مەدار داندراوە بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەری دەنگێک (جاری وایە زیاتر لە یەک دەنگ). کەوابوو دەنگەکانی هەر زمانێک دەکرێ بە هەر ئەلفووبێیێک بنووسرێن. بۆ وێنە زمانی کوردی تا ئێستە بە چەند ئەلفووبێی جۆراوجۆر وەک هەرمەنی، عەرەبی، لاتینی، و سیریلی (Cyrillic کە رووسی و چەند زمانی تری پێ دەنووسرێ)، سوریانی (Syriac) و... نووسراوە.

لە گەڵ ئەوەشدا لە باسی هەمزە دا، حەرف و دەنگ زۆر جار تێکەڵ کراون، زەبیحی توانیوێتی ئەو جیاوازییەی لە بەرچاو بێ و رەخنە لە جەمال نەبەز دەگرێ و دەڵێ: "پیت (الحرف) بۆیە داهێنراوە دەنگێک پێشان بدا" (بڕوانە ل ٤٢٢).

"هەمزە" نێوی حەرفێکە لە ئەلفووبێی عەرەبی، و لە زمانی عەرەبی دا بۆ نووسینی دەنگێک دەکار دێ کە لە زانستی دەنگناسی (فۆنێتیک phonetics) دا پێی دەڵێن دەنگی "بەستی گەروویی" (glottal stop؛ د. کەماڵ فواد پێی دەڵێ "دەنگی گەروویی وەستاو"). با بزانین ئەو دەنگە چۆن دروست دەکرێ. کاتێکی هەوا لە سییەکان دێتە دەرێ، ئەگەر دوو دەنگژێیەکان (vocal cords یان vocal folds) لێک نزیک ببنەوە و بۆ ئانێک رێگەی دەرچوونی هەوا بگرن و دوایە لە پڕا لێک جوێ ببنەوە و هەوا پەنگاوخواردووەکە بەڕەڵا بێ و بەرەو زار و پەرەکەی ناو لووت بڕوا و بچێتە دەرێ، دەنگێک ساز دەبێ کە لە فۆنێتیک دا پێی دەڵێن بەستی گەروویی و لە عەرەبی دا بە

دەنگ و حەرفی "هەمزە" ناسراوە. دەنگی بەستی تر لە کوردی دا (لەهجەی سۆرانی ئەدەبی) بریتین لە / ب/، /پ/ و /ت/، /د/ و /ک/، /گ/ و /ق/ (من بۆ جیا کردنەوەی فۆنێم لە حەرف، هەر کاتێک مەبەستم فۆنێم بێ لە ناو جووتە // دەینووسم لە گەڵ ئەوەش دا هەر دەنگێک فۆنیم نییە، لێرەدا دەنگیش وەک فۆنیم لە ناو //دا دەنووسم). بۆ وێنە لە دروست کردنی دەنگی /ب/ و /پ/ شدا، دوو لێوەکان رێگەی دەرچوونی هەوا لە سییەکان دەگرن و دوایە لە پڕرا لێک جوێ دەبنەوە و هەواکە لە زار دەچێتە دەرێ. بەو دوو دەنگانە دەڵێن دەنگی "بەستی دوولێوی" (bilabial stop). جیاوازی /ب/ و /پ/ لەوە دایە کە لە دروستبوونی /پ/ دا، دەنگژێیەکان نالەرێنەوە بەڵام لە /ب/ دا دەلەرێنەوە.[٣]

دەنگی "بەستی گەروویی" لە زۆر زمانان دا هەیە (کوردی، عەرەبی، ئەلمانی، فارسی و ...) بەڵام لە هەموو زمانێک دا وەک فۆنێم (phoneme) - دەنگێکی بنچینەیی و ئینتیزاعی زمان - داناندرێ. جا با لە پێشدا بە کورتی باسی فۆنێم بکەم و دوایە بگەرێمەوە سەر باسەکەمان.

فۆنێم، بە قسەی د. کەماڵ فواد، "پچووکترین یەکانەی (واحد) دەنگی زمانە، کە گۆڕینی لە وشەیێک دا ئەبێتە هۆی گۆڕینی مانای ئەو وشەیە".[٤] بۆ وێنە دو دەنگی /ر/ و /ڕ/ لە کوردی دا (سۆرانی ئەدەبی) هەر کامەی فۆنێمێکی جیاوازن چونکە لە جووتۆکانەی /کەر/ (حەیوان) و /کەڕ/ (کەسێکی نەتوانێ ببیستێ)دا دەوری جیاکردنەوەی مانا دەگێڕن.[٥] لە هەرکام لەو جووتۆکانەدا سێ دەنگ هەیە. دەنگی هەوەڵ و دووەمیان وەک یەک وایە و تەنیا بە دەنگی سێهەم لێک جیاواز دەبنەوە. هەروەها /ل/ و /ڵ/ لە کوردی دا، فۆنێمن چونکە لە جووتۆکەی وەک /پەلە/ - /پەڵە/ یان /کەل/ - /کەڵ/ دا دەبنە هۆی جیاواز بوونی مانای ئەو وشانە. ئەگەر ئەو دەنگانە لە زمانی تردا هەبن، بەڵام جیاوازی مانا دروست نەکەن بە فۆنێم داناندرێن. بۆ وێنە لە ئینگلیسی دا دوو جۆر /l/ هەیە وەک لە leaf و لە pool دا. بە l ی وشەی leaf دەڵێن l ی روون ("clear l") و بە l ی وشەی pool دەڵێن l ی تاریک ("dark l"). بەڵام لە ئینگلیسی دا ئەو دوو l یانە وەک فۆنێمی جیاواز داناندرێن

لەبەر ئەوەی کە جووتۆکەیێک لەو زمانەدا پەیدا نابێ کە جیاوازی دوو l تییەکان بتوانێ دوو وشەی جیاوازیان لێ ساز بکا. بەلام لە رووسی دا کە دوو l ی وەک ئینگلیسی هەیە، هەرکامەی بە فۆنێمی جیاواز حیسێب دەکرێ. بەو دوو شێوە فۆنێمانە کە وێکرا فۆنێمی l لە ئینگلیسی دا پێکدێن دەڵێن (allophone).[٦] جا با بێینەوە سەر باسی هەمزە.

بە فۆنیم دانان یان دانەنانی دەنگی بەستی گەروویی (هەمزە) بەستراوەتەوە بە (١) دەوری ئەو دەنگە لە پێکهێنانی وشە و گۆڕینی مانادا و (٢) بە روانگە تیۆرییەکانی فۆنۆلۆژی (phonology) یان فۆنێمناسی (phonemics). کەس شکی لەوەدا نییە کە ئەو دەنگە لە عەرەبی دا فۆنێمە و لە سەرەتا و نێوان و ئاخری وشەدا دەکوترێ و دەنووسرێ. ئەوانەی توێژینەوەیان لە فۆنێمی کوردی کردووە (لە روانگەی فۆنێتیکەوە نەک لە روانگەی سیاسی و رەگەزییەوە)، گشتییان پێیان وایە کە **دەنگی** بەستی گەروویی (هەمزە) لە کوردی دا هەیە بەلام کە دێنە سەر لێکدانەوەی فۆنێمناسی (phonemics)، دوو بڕیاری جیاوازیان هەیە. بۆ وێنە، ئێرنست مەک کارووس و عەبدولمەجید رەشید ئەحمەد دەنگەکە بە فۆنێم دادەنێن بەلام د. ن. مەک کێنزی، ئەورەحمانی حاجی مارف، کەریمی ئەیووبی و سمیرنۆڤا، یووسپۆڤا، و کەمالّ فواد پێیان وایە ئەو دەنگە لە کوردی دا فۆنیم نییە.[٧] جیاوازی لێکدانەوەی ئەو لێکۆڵەرەوانە لەبەر ئەوە نییە کە لایێک پێی وابێ بەستی گەروویی (هەمزە) دەنگێکی کوردی رەسەنە یان لایێکی تر بلێ دەنگێکی "بێگانە" و ناکوردییە. فۆنیمناس گوێ دەگرێتە ئەو کەسانەی بە زمانێک قسە دەکەن و هەر دەنگێکی لەو زمانەدا هەبێ تۆماری دەکا و لێکی دەداتەوە. فۆنیمناس گوێ ناگرێتە چەند کەسێکی کە، لەبەر بۆچوون و بەرژەوەندی سیاسی و ئیدەئۆلۆژی خۆیان، بڕیار بدەن کە هەمزە یان /ق/، /ح/، /ع/ و /غ/ دەنگی بێگانەن و زمان بەدەریان بکەن. لە زانستی فۆنۆلۆژی یان فۆنێمناسی دا، تیۆری و مێتۆدی جۆراوجۆر هەیە بۆ دیاری کردنی فۆنێمەکانی هەر زمانێک جا بۆیە جاری وایە فۆنێمناسەکان ناتوانن سەبارەت بە ژمارەی فۆنێمەکانی زمانێک یەک بڕیاریان هەبێ.

د. ئەبەز لە نووسینی خۆی دا، حەرفی هەمزە دەکار دێنێ (لە سەرەتای ئەو وشانەی

کە بە دەنگی بزوێن دەست پێدەکەن). ڕەخنەی وی لە **قاموس** زۆرتر لەبەر ئەوەیە کە زەبیحی، هەمزە وەک دەنگێکی کوردی دادەنێ. دوایەش دەڵێ:

"ئەو دەنگانەی کە کاک زەبیحی بە هەمزەیان دەزانێ یان بە هەمزە و ئەلف یان بە هەمزە و شتێکی دی یان تێ دەگا وەک ئا، ئە، ئو، ئوو، ئۆ، ئی، ئێ، ئەمانە هەمزە نین. ئەمانە هەموو تیپی دەنگداری کورت و درێژن کە نیگارە لاتینی یەکانیان بەم جۆرەیە a e, i, u, o, u, D". د. نەبەز لێرەدا دەنگ و حەرف، فۆنێم و دەنگ، و فۆنێم و حەرفی تێکەڵ کردووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو دەنگە بزوێنانە، چ بە ئەلفوبێی لاتینی بیانووسی چ بە ئەلفوبێی سیریلی، هەرمەنی یان گورجی، لە سەرەتای وشەدا بە دەنگی بەستی گەروویی (هەمزە) دەکوترێن. هیچ چەشنە نووسینێک ناتوانێ ڕێگە لە دەربڕینی ئەو دەنگە بگرێ. بەڵام د. نەبەز، هەروەک ئەورەحمانی حاجی مارف دەستی بۆ ڕاکێشاوە، لە تێکۆشانی زمانەوانی خۆیدا حەولی نەداوە وەدوای زانستی دەنگناسی (فۆنێتیک) و فۆنێمناسی بکەوێ. ئەو لە بەرهەمی زمانەوانی خۆی و لە ڕەخنەکەی زۆرتر یەک ئامانجی هەیە: ئەوەندەی بۆی دەکرێ کوردی پەتی بکا - لە وشە و لە دەنگ و ئەلفوبێ دا - ئەویش زۆرتر بە وەدەرنانی هەر دیاردەیێکی زمانی کە، بە خەیاڵ یان بە ڕاستی، بتوانێ ڕەچەڵەکی بگێڕێتەوە سەر زمانی عەرەبی. بەڵام سیاسەتی دژایەتی کردنی زمانی عەرەبی وێڕای تێکەڵاوکردنی دەنگ و حەرف ڕێگە بە د. نەبەز نادا کە کێشەکانی زمانی کوردی بە شێوەیێکی زانستی و بەکارهاتوو شی بکاتەوە و چارەیان بۆ بدۆزێتەوە. بۆ وێنە، لە کتێبی **زمانی یەکگرتووی کوردی** دا دەنووسێ:

> کوردەکانی نەوێ [یەکێتی سوڤیێت] لە پاش شۆڕشی ئوکتۆبەرەوە، هەلیان بۆ هەڵکەوت بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن. لە ١٩٢١دا ئەلفوبێ یەکی لاتینی بە تیپی ئەرمەنی بلاوکرایەوە، بەڵام پاش ئەوەی تاکە کتێبێکی پێ دەرچوو، زانراکە ئەم ئەلفوبێ یە بەکاری نووسینی کوردی نایەت. ئەوش بوو بە هۆی ئەوەی تا ١٩٢٩ هەموو جۆرە نووسینێکی کوردی بوێستێ. هەتا لەو ساڵەدا دوو کەس: عەرەبی شامۆ و مارەگۆلێف، ئەلفوبێ یەکی لاتینی یان دانا و لە ١٩٣٠/١/١دا بە شێوەیەکی ڕەسمی خرایە کار، بەڵام ئەم ئەلفوبێ یە بەداخەوە زۆر نەژیا و گۆڕا بە

ئەلفەووبێ ی سریالی، کە لە گەڵ سروشتی زمانی کوردی دا بە هیچ جۆرێک رێک ناکەوێ ... (ل ٨٤).٨

لێرەدا دەنگ و حەرف یان قسە کردن و نووسین تێکەڵ کراوە. هەروەک لەپێشدا باسم کرد، زانستی زمانناسی پێی وایە هەر زمانێک بە هەر ئەلفووبێییێک دەکرێ بنووسرێ. چاکی و خراپی ئەلفووبێش هیچ پێوەندی نییە بە رەچەڵەک و بنەچەکە و رەگەزی ئەلفووبێیەکە یان ئەو خەڵکەی کە دایان هێناوە. کەس ناتوانێ بیسەلمێنێ کە ئەلفووبێی عەرەبی یان سیریلی لە ئەلفووبێی لاتینی (یان رۆمی Roman) خراپترە - جا چ بۆ نووسینی کوردی بێ چ بۆ نووسینی زمانی تر. لەهجەی ستانداردی کوردی (لە سەر بنچینەی سلێمانی) سی ونۆ فۆنێمی هەیە کە ئەو فۆنێمانە - چ بە ئەلفووبێی عەرەبی بیانووسین چ بە ئەلفووبێی تر - نە خسلەتیان دەگۆردرێ نە "سروشتی زمانی کوردی" تێکدەدەن.٩ دیارە نە ئەلفووبێی عەرەبی نە ئەلفووبێی لاتینی و سیریلی هیچ کامیان سی ونۆ حەرفیان بۆ نووسینی کوردی نییە. جا ئەگەر بمانەوێ کوردی بە ئەلفووبێیێکی فۆنێمیک (یەک حەرفی جیاواز بۆ هەر فۆنێمێک) بنووسین دەبێ یان نیشانە لە حەرفەکانی ئەو ئەلفووبێیانە زیاد بکەین یان حەرفی تازەیان بۆ دابنێین. هیچ پێوانەیێکی زمانناسی نییە بۆ ئەوەی کەسێک بتوانێ بیسەلمێنێ کە حەرفی *f*ی لاتینی لە حەرفی *Ф*ی رووسی یان حەرفی **ف**ی عەرەبی باشترە. د. نەبەز پێی وایە ئەلفووبێی لاتینی تەنیا ئەلفووبێیێکە کە "لە گەڵ سروشتی زمانی کوردی" رێک دەکەوێ. ئەوە بڕواییێک یان بڕیارێکی سیاسی و ئیدەئۆلۆژییە. زۆربەی رۆشنبیری کوردی باکووریش پێیان وایە ئەلفووبێی عەرەبی شتێکی "سامی" و "دواکەوتوو" و "ئیسلامییە". جیاکردنەوەی ئەو بۆچوونانە لە بۆچوونی کەمالیستی کارێکی هاسان نییە.

زەبیحی لەگەڵ ئەوەشدا زانستی دەنگناسی و فۆنێمناسی نەخوێندبوو، بۆچوونەکانی لە لێکدانەوەی فۆنێمناسی دوور نەکەوتوونەوە. ئەوەش تا رادەیێکی زۆر سەرچاوەی لە بۆچوونە سیاسییەکەی دایە کە دژی شۆڤینیسمی نەتەوەیی و رەگەزپەرستی بوو. بێجگە لە روانگەی سیاسی دیمۆکراتییانەی، زەبیحی لە کێشەکانی زمانی کوردی

دا، زەین و هۆشێکی تیژ و وردبینی هەبوو. بۆ نموونەی لێکدانەوەییێکی فۆنێمناسانە با بەشێک لە لێکۆڵینەوەکەی کەماڵ فواد بگێڕمەوە. لە کورتە نووسراوەکەی دا لەمەڕ فۆنێمەکانی زمانی کوردی ("زمانی ئەدەبی کوردیی رۆژهەڵاتی - کرمانجی خواروو") دەنووسێ:

> هەر ڤاولێک [بزوێن یان vowel] بکەوێتە سەرەتای وشە یان سەرەتای برگەوە دەنگێکی گەروویی وەستاو (glottal stop) پێشی ئەکەوێت. ئەو دەنگە لە عەرەبی دا پێی ئەڵێن (الهمزە). لە ئیملای نوێ ی کوردی دا بە تیپی عەرەبی ڤاولەکان کە بکەونە سەرەتای وشەوە بەم جۆرە ئەنووسرێن: ئـ، ئە، ئیـ، ئو، ئا، ئێ، ئیـ، ئۆ، ئوو، ئو. لە ئەڵمانی دا بەم دەنگە (هەمزە) ئەوترێت ڤاول هەڵگر vokal-trager. نووسینی هەمزە پێش ڤاولەکان لە سەرەتا و ناوەراست و کۆتایی وشەدا بە هەر دوو تیپی عەرەبی و لاتینی بەم جۆرە دەر ئەکەون...[١٠]

د. فواد نموونەی ئەو "ڤاول هەڵگرانە" لە کوردی دا لەو وشانەدا دێنێتەوە: ئەو، ئیمرۆ، ئومێد، ئاو، ئێستا، ئیتر، ئۆخەی... و دەڵێ دەنگی گەروویی وەستاو (بەستی گەروویی - هەمزە) لە سەرەتای وشەدا پێش ڤاولەکان بەدی ئەکرێت، لە کۆتایی وشەدا تەنیا لە وشەی /نە ء/ دا ئەبینرێت و لە وشە لێکدراوەکاندا دەکەوێتە سەرەتای برگەوە (وەک /سەرئەنجام/) کە زۆر جار دەنگەکە هەڵئەگیرێت و وەک **سەرەنجام** دەکوترێ و دەنووسرێ. لە جێیێکی تردا، د. فواد دەڵێ:

> بەم جۆرە ئەبینین کە هەمزە دەنگێکی بڕبڕەی زمانی کوردی نییە. بەڵکوو بەستراوەتەوە بە بەکارهێنانی ڤاولەکانەوە. هەر وشەیەک بە ڤاول دەست پێ بکات دەنگێکی گەروویی وەستاو (glottal stop)ی ئەکەوێتە پێش. ئەمەش تایبەتی نییە بە زمانی کوردی. لە هەموو زمانێک دا هەروایە.[١١]

خوێنەرەوە لێرەدا بۆی دەردەکەوێ کە زۆربەی بۆچوونەکانی زەبیحی سەبارەت بە کێشەی هەمزە لە گەڵ لێکدانەوەی فۆنێمناسی یەک دەگرێتەوە.

## (٢) وشە خوازین و داتاشین

کێشەی پەتی کردن پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی بەرین و قووڵە.[١٢] لەو کتێبەی لە بەردەستی خوێنەرەوە دایە، چەند لایەنێکی ئەو کێشەیە باس کراوە (بڕوانە لاپەڕەی: ١٥، ٤١٢، ٤٣١، ٤٦٨). من پێم وایە ڕێبازی زەبیحی، سەبارەت بە وشەی خوازراو و داتاشراو ڕێبازێکی دروستە و یارمەتی دەدا بە ستاندارد کردن و دەوڵەمەند کردنی زمانی کوردی. زەبیحی وشەیێکی لە زمانی بێگانە - چ زمانی نەتەوە زاڵ و زاڵمەکان (عەرەبی، فارسی، تورکی) و چ زمانی تر - وەرگیرابێ و لە نووسین و قسە کردن دا باو بووبێ وەک وشەی خوازراو تۆماری کردووە و وەک بەشێک لە وشەگەلی زمانی کوردی داناوە. وشەی داتاشراویش ئەگەر باو بووبێ وەک وشەی کوردی چاو لێکردووە. بۆ وێنە:

> ئابووری - (تتد. )، (نا. ) - چاوە دێری ڕاگرتنی ڕێک و پێکی داهات و خەرجی ماڵ، ئیدارە و دەوڵەت. ئیقتیصاد. تێب - نازانم ئەم ووشەیە لە کوێڕا هاتوە و چۆن داتاشراوە، بەڵام ئەوەندە بڵاو بۆتەوە، بەم مەعنایە جێگای خۆی کردۆتەوە.

بەڵام زەبیحی بەعەزە دینامیسمێکی زمانی باش بۆ ڕوون نەبووبۆوە. زمان دیاردەیێکی ئاڵۆز و هەمیشە لە گۆڕاندایە و ئەوانەی کە بۆ ستاندارد کردنی حەول دەدەن لە گەڵ دینامیسمی زمان دا تووشی ناکۆکی دەبن. بۆ وێنە زەبیحی دەنووسێ:

> داتاشینی ووشەی تازە بۆ زمانێک بەتایبەتی لەم زەمانەدا کە هەموو ڕۆژێ شتی تازە دێتە گۆڕێ، کارێکی خراپ نییە هیچ بەڵکوو پێویستیشە، بەڵام بە مەرجێ دەگەڵ دەستووری زمانی کوردیدا بگونجێ نەک هەر کەس دەستی قەڵەمی گرت هەق داتە خۆی و بەڕاست و چەپدا وەک ئاشی کرێوە ووشە دەرفرتێنێ، یا زاراوەی زمانێکی تر

وەرگێڕێتە کوردی کە ئەمیان هەر ئێجگار ئیشێکی نالەبارە.[١٣]

لە گەڵ ئەوەشدا ئەوە راستە کە وشەی داتاشراو دەبێ لە گەڵ دەستووری زمانی کوردی دا بگونجێ بەڵام دەستووری زمان خۆی ژیانێکی دینامیکی هەیە و هەم لە قسە کردن دا و هەم لە نووسین و خوێندنەوەدا گشت کاتێ دەگۆڕێ و دەگۆڕدرێ. لەو پرۆسە نەوەستاوەدا، هەڵە دەبێتە راست و راست دەبێتە هەڵە. زەبیحی خۆی لە ساڵانی ٤٤-١٩٤٢دا، بە هەڵە، ناوێکی خاصی - بەرواری (کە ناوی ناوچە بوو) - وەک ناوی گشتی خوێندەوە و بە مانای "بەتاریخ"ی فارسی تێگەیشت و هەر بەو مانایە دەکاری هێنا (لە گۆڤاری **نیشتمان** دا). هەڵەی زەبیحی (کە خۆشی تا ماوەیێکی زۆر نەیدەزانی هەڵەیە) لە لایەن رۆشنبیر و رۆژنامە و گۆڤار و رادیۆی کوردییەوە وەک راستیی وەرگیرا و بەو مانایەی کە زەبیحی لە خەیاڵی خۆی دا خوڵقاندبووی دەکار هێندرا. ئێستەش بیست ساڵ دوای ئەوەی کە زەبیحی بەراشکاوی باسی ئەو هەڵەی کرد و خۆی دەستی لێهەڵگرت، ژیانی نوێی "بەرواری" (بە مانای "بەتاریخ") درێژەی هەیە.[١٤]

"هەڵە و راستی" هەم لە قسە کردن دا و هەم لە نووسین دا وەک پێوانەییێک بۆ هەڵسەنگاندنی زمان هاتۆتە گۆڕێ بەڵام ئەو کێشەیە لەو کاتەوە نووسین پەیدا بووە دەورێکی تایبەتی لە زمان و کوولتوور و سیاسەت دا گێڕاوە. ئەو دیاردەیە لە زمانی ستانداردا بایەخێکی یەکجاری پێدەدرێ ئەویش زۆرتر بە هۆی ئەوەی کە زمانی ستاندارد دەبێ دوان و لێکدوانی ئاخێوەرانی لەهجە جیاوازەکان بە هاسانی و رەوانی پێک بێنێ. لەباری سیاسییەوە، زمانی ستاندارد دەبێ یەکگرتنی نەتەوە خێراتر بەدی بێنێ و درێژەی پێبدا. بەڵام "هەڵە" یان "راست" پێوانەیێکی تاقانە و موتلەقی نییە. پێوانەی زەبیحی پێوانەیێک بوو کە زانستی زمانناسی و پراتیکی زمان چێکردن (language reform) پێی لێ دادەگرێ: (١) هەر وشەیێک لە هەر زمانێک وەرگیرابێ و باو بووبێ وشەیێکی خۆماڵی و کوردییە و (٢) هەر وشەیێک لە چوارچێوەی رێزمانی کوردی دا داتاشرابێ و باو بووبێ وشەیێکی راست و "رەسەنە". ئەو

پێوانانە، پێوانەی زمانیین نەک سیاسی. ئەوەش ئاشکرایە کە هیچ دەست تێوەردانێکی زمان لە سیاسەت جوێ ناکرێتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە: کام سیاسەت ؟لەباری سیاسییەوە، بۆچوونی زەبیحی یارمەتی دەدا بە بووژاندنەوە، دەوڵەمەندکردن و ستانداردکردنی زمانی کوردی.

د. نەبەز، بە پێچەوانەی زەبیحی، لەباتی پێوانەی زمانیی وەدوای پێوانەی تەواو سیاسی کەوتووە. ئەو پێی گرینگ نییە خەڵک - خوێندەوار و نەخوێندەوار - چۆن زمانی کوردی دەکار دێنن، چۆن وشە دەخوازنەوە، چۆن جل و بەرگی کوردی لەبەر وشەی خوازراو دەکەن، یان شەو و رۆژ /ح/، /ق/، /ع/ و /غ/ وەک دەنگی کوردی بەسەر زاریان دادێ. د. نەبەز و هاوبیرانی تەنیا یەک پەیمانەیان هەیە: کوردی بوون یان نەبوونی وشە و دەنگ و ئەلفووبێ. بەڵام هەڵسەنگاندن و بڕیاردان سەبارەت بە کوردی بوون خۆی پێویستی بە پێوانە هەیە. پێوانەکەشیان، پێوانەیێکی رەگەزییە. مەرجی هەرە گرینگی کوردی بوون، لای ئەوان، عەرەب (سامی) نەبوون و تورک (تورانی) نەبوونە. ئەوەش وەنەبێ تەنیا لەباری سیاسییەوە پڕ لە مەترسی بێ. زانستی زمانناسی دەڵێ هیچ پێوەندییێک لە نێوان رەگەز و پێکهاتەی (structure)ی زمان (پێکهاتەی گرامێر، مۆرفۆلۆژی، فۆنۆلۆژی) بەدی ناکرێ. زۆربەی گەلی کوردیش قەت وەدوای رەگەز (عرق، نژاد، race) نەکەوتووە، و کێشەی "ئاریایی" بوونی کورد و "سامی" بوونی عەرەب و "تورانی" بوونی تورک لە ساڵانی ١٩١٠ بەولاوە لە لایەن رۆشنبیری کورد هاتووەتە گۆڕێ و، ئەوەش میراتی رەگەزپەرستی ئورووپاییەکان بوو.

لەباری سیاسییەوە، هەڵسەنگاندنی زمان و دەست تێوەردانی بە پێوانەی رەگەزیی، شێوەیێکی خۆماڵی کوشتنی زمانی کوردییە. زمانی کوردی لە سەدەی بیست دا، بەتایبەتی لە دوای شەڕی جیهانی هەوەڵ، بە دوو شێوەی سەرەکی سەرکوت کراوە - یەکیان، سیاسەتی زمانکوژی (linguicide) دەوڵەتی تورکیە، ئێران، عێراق و سوریە و ئەوی تر، سیاسەتی رۆشنبیری رەگەزخواز یان رەگەزپەرستی کوردە کە بە شێوێکی رووت و ژەهراوی وەگیانی زمانی کوردی کەوتووە و خەریکی قەتڵ و بڕی وشە و دەنگ و حەرفی زمانەکەمانە. لە تورکیە، دیوانی مەلای جزیری بە خەتی لاتین بلاو دەکەنەوە و هەرچی

حەرفی ع، ق، خ و ح ی وەدەستیان بکەوێ بە مەیلی خۆیان سەری هەڵدەقەنن یان حەرفی دی لە جێگەی دادەنێن. لە کوردستانی خواروو، وشەی خوازاراو لە زمانی عەرەبی فڕێ دەدەن و زمانەکە وەبەر لێشاوی وشەی فارسی دەدەن ئەویش بەو خەیاڵە کە فارس "هاورەگەزی" کوردن و زمانی فارسی هاورەچەڵەکی زمانی کوردییە. ئی وایە بەجارێکی شووی لێ هەڵدەکێشێ و نووسینەکەی خۆی لە خوێناوی لەشی لەت و کوتکراوی زمانی کوردی دا نوقم دەکا: نووسەرێک لە ڕۆژنامەی **هەتاو** چاپی لەندەن ئاوای کردووە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| عێراق | ئیراک | عەبدورەحمان | ئەبدورەهمان |
| ئەفریقا | ئەفریکا | عیفەت قازی | ئیفەد قازی |
| عەرەب | ئارەب | قازی محەمەد | قازی مهەمەد |
| شیعە | شیئە | حوسێن | هوسێن |
| مەسعوود | مەسئوود | ساواک | ساڤاک[١٥] |

لێرەدا رەگەزپی کردنی زمانی کوردی گەیشتۆتە ئەوپەری خۆی. نووسەر ئەوەندە قینی لە زمانی عەرەبییە کە "و" و "ت" ش وەک "ح، ع، ق" رەجم دەکا و دەیانکاتە "ڤ" (ساڤاک) و "د" (ئیفەد).

رەگەزپەرستی هیچ سنوورێک ناناسێ و لە سیاسەت و زمان و ئابووری و گشت گۆڕەپانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا دەسەڵاتی دەوێ و بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتدارێتی لە کوشتار و خوێن رشتن ناپرینگێتەوە. گەلی کورد تووشی رەگەزپەرستی تورک (کەمالیسم)، فارس (ئێرانیگەری و پان ئێرانیسم)، و عەرەب (بەعس و غەیری بەعس) بووە، بەڵام کەسێکی بڕوای بە ئازادی و دێمۆکراسی بێ چۆن دەتوانێ رەگەزپەرستی و شۆڤێنیسمی تورک و فارس و عەرەب بە رەگەزپەرستی کوردی - "ئاریایی" بوون و زەردەشتی بوون - وەڵام بداتەوە؟

وەنەبێ زەبیحی توانیبێتی تەواوی کێشەکانی زمانی کوردی چارە کردبێ یان رێگەی چارەی دیاری کردبێ. بەڵام رێبازی زمانی وی رێگە نادا بە شەڕی "خۆکوژیی"

زمانی. ئەو ڕێبازە، بە فڕێ دانی شۆڤێنیسمی زمانی و ڕەگەزپەرستی ئاریایی، زمانی کوردی پتەو دەکا و یارمەتی دەدا بۆ ئەوەی لە بەرەنگار بوونی شەڕی زمانکوژی چوار دەوڵەتاندا سەر بکەوێ. وشەخوازتنەوە و وشەداتاشین دوو پرۆسەی وشەرۆنانن و، وشە وەرگرتن لە زمانی تر زیندووبوونی زمانی کوردی رادەگەیێنێ. هەرکەس، بە هەر بیانوویێک پرۆسەی وشەدانانی زمانی کوردی دابمرکێنێ ناتوانێ خزمەت بەو زمانە بکا.

کوردی لەباری نفووسەوە (ژمارەی ئاخێوەران) یەکێک لە زمانە گەورەکانی دنیایە. لە دنیادا نزیکەی ٦٦٠٠ زمان هەیە و زمانی کوردی ٤٠مین زمانی دنیایە و لە باری چەندێتی ئاخێوەران لە زۆر زمانی پێشکەوتووی وەک دانمارکی، هولەندی، سویدی و فنلاندی لە پێشترە. بەڵام زمانەکەمان لەباری کوولتوورییەوە لە ئەو زمانانە وەدواکەوتووە و ڕەنگە لە داهاتوویێکی دووریش دا - ئەگەر باری ئێستە نەگۆڕدرێ - نەگاتە رادەی سەرهەڵدانی ئەو وردە زمانە دەوڵەمەندانە. گیروگرفتی زمانی کوردی زۆرن بەڵام ئەوانە کێشەی زمانی کوردی نین:

١- بنەچەکەی زمانی کوردی (وەک ئەوێستایی یان مادی بوونی کوردی)

٢- "ڕەسەنایەتی" دەنگ و حەرف و وشە

٣- لاتینی کردنی ئەلف و بێ

ئەوانە و زۆر کێشەی تری لەو چەشنە (بە تایبەتی ١ و ٢) دەستکردی بەرژەوەندی سیاسی و ئیدوئۆلۆژی چەند ڕۆشنبیرێکی پەتیگەری توندوتیژن کە لەسەر ئەو باسانە دەڕۆن، گەورەی دەکەنەوە و، بە هەڵاوبگری "نەتەوە پەرستانە" و "کورد پەروەرانە" کێشە سەرەکییەکانی زمانی کوردی لە تۆز و خۆڵی شەڕی دۆنکیشۆتانەی کوردی و عەرەبی دا بزر دەکەن.

کێشەی سەرەکی زمانی کوردی ئەوەیە: نووسینی کتێبی دەرسی زانستگایی و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری شیمی، ئەستێرە ناسی، مەنتیق، فەلسەفە، ئابووری، بیۆلۆژی و زانستی جۆراوجۆر بە هەر دوو لەهجەی ستانداردی کورمانجی و سۆرانی؛ دانان و بڵاوکردنەوەی فەرهەنگێکی تێر و تەسەلی زمانی کوردی؛ دانانی دائیرەتولمەعاریفێکی بە پێزی کوردی بە هەر دوو لەهجەی ستاندارد؛ تۆمار کردن و بڵاوکردنەوەی ئەدەبی

زارێکی کوردی و دەستنووسە چاپ نەکراوەکان؛ دانانی فەرهەنگی جۆراوجۆر - ئەدەبی، زانستی، منداڵان، وشەی هاومانا و دژمانا و ...؛ وەرگێڕانی بەرهەمە گرینگەکانی کوولتووری رۆژاوا و رۆژهەڵات.

کێشەکانی تر گشتیان لە بەرامبەر ئەو کێشەیەدا هەڵدەبزرکێن. وەدەرنانی /ح/، /ع/ و /ق/ لە نووسین دا کارێکی هاسانە بەڵام بەرهەم هێنانی زانستی نوێ بە زمانی کوردی ئەرکێکی یەکجار گرانە. سەرکەوتن لەو خەباتەدا پێویستی بە بزوتنەوەیێکی رۆشنبیری و سیاسی بە هێز هەیە بەڵام مەرجێکی گرینگی ئەوەیە کە پەتیگەرە توندوتیژەکان بەربینگی زمانی کوردی بەر بدەن و پشووی زمانی کوردی - زمانی مەلای جزیری و مەلا مەحموودی بایەزیدی و نالی و قانیع و عەلی بەردەشانی - نەبڕن.

## (٣) دابی رەخنە گرتن[١٦]

لە نەریتی کۆنباودا، ئەگەر کەسێک قسەیێک یان بۆچوونی کەسێکی تری پێ خۆش نەبێ یان پێی چاک نەبێ، ئەگەر دەستی بڕوا بە کوشتن یان ئەتک کردن بێدەنگی دەکا. ئەگەر بێت و دەستی نەڕوا، حەول دەدا بە جنێودان و بوختان و بێ حورمەت کردن ئابڕووی ببا و قسە و بۆچوونەکانی لەبەرچاو بخا. لە گەڵ ئەوەشدا ئەوە شێوەیێکی کۆنی کۆمەڵگەی عەشیرەیی و دەرەبەگییە، لە پڕۆپاگاندای سەردەمی نوێباویش دا - بە شێوەی دی - لە ئارا دایە.

لە کوردەواری ئێستەدا، وا هەیە ئەگەر قسە و لێکدانەوەی کەسێکیان پێ خۆش نەبێ، لەباتی رەخنەگرتن (هەڵسەنگاندنی لایەنی باش و خراپ، راست و ناراست، کز و بەهێز و ...) و لێکدانەوە و بەرپەرچدانەوە، حەول دەدرێ ئەو کەسە تاوانبار بکەن و بە تاوانبارکردنی ئەرکی رەخنە و وەڵام دانەوە و بەرپەرچدانەوە لەسەر شانی خۆیان هەڵبگرن؛ پڕۆپاگەندەچی خۆماڵی لە گشت تێکنیک و شێوەی ناسراوی پڕۆپاگەندە کەڵک وەردەگرێ. لە زانستی پڕۆپاگەندەناسی دا، لە ساڵانی ١٩٣٠ بەولاوە، باسی حەوت شێوە یان تێکینیکی پڕۆپاگەندە کراوە کە دوانیان لە پڕۆپاگەندەی خۆماڵی دا زۆر باون:

«جنێودان» و «ڕەگەڵکەوتن».[١٧] بۆ وێنە، پڕۆپاگەندەچی بەرەی ڕاست لەباتی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و بەرپەرچدانەوەی فکری و سیاسی و عیلمی کۆمۆنیسم و مارکسیسم، حەولی داوە بە لێشاوی جنێو - "کافر"، "خراپ"، "دیکتاتۆر"، "دژی کورد" و هتد - ڕێگە لە خەباتی سیاسی و فکری بگرێ و خەڵک لە گەڵ خۆی بخا. جا هەرکەس (چ کۆمۆنیست بێ چ ئازادیخوازێکی غەیری کۆمۆنیست) پەل ببزێوێ و ڕەخنە لە شۆڤێنیسم (نەتەوەیی و پیاوانە)، ڕەگەزپەرەستی، چەوساندنەوە، و زوڵم و زۆری ناوخۆیی بگرێ یان باسی خەباتی کرێکار و جووتیار بکا مۆری کۆمۆنیستی و مارکسی لە نێوچاوانی دەدا. لە هەمان کاتدا، پڕۆپاگەندەچی هەزار میدالی "پاکی"، "کوردپەروەری" و "کوردستانی" بوون خەڵاتی خۆی دەکا و دەم و چاو و سەرسینگی خۆی پێ دەرازێنێتەوە و بە خەڵک دەڵێ: "ئەوان خراپن، ئێمە باشین! چاوتان بقووچێنن و ڕەگەڵمان بکەون!".

کزبوون یان نەبوونی نەریتی ڕەخنە گرتن وای کردووە ئەگەر کەسێک کۆمۆنیستیش نەبێ، ئەگەر "کوردپەروەر"یش بێ و بە زمانی کوردیش باش قسان بکا و بنووسێ، حەول دەدرێ بە تاوانی کوردی نەزانین بێ ئابروو بکرێ.[١٨]

چل ساڵ ژیانی سیاسی و ئەدەبی زەبیحی پڕە لە ئاڵۆزی، بەرزی و نزمی، پێشکەوتن و پاشکەوتن، بەربەرەکانی و سەردانەواندن و گشت جۆرە ناکۆکی تر. لەو کتێبە دا چەند گۆشەیێک لەو ناکۆکییانە باس کراوە و ئەزموون و بۆچوونی جۆراوجۆر سەبارەت بە ژیانی وی تۆمار کراوە. د. نەبەز لە دوو نووسراوەکەی خۆی دا (ل ٤٠٦ و ٤١٤ )، ژیانی ئەدەبی و سیاسی و خۆکەسی زەبیحی موتلەق و سادە و ماهەویی کردووە: زەبیحی لە ژیانی سیاسی دا، لە سەرەتاوە تا دواهەناسەی خائین و خۆفرۆش و جاسووس و فێلباز بوو، لە ژیانی خۆکەسی دا، "سپڵە"، "پێنەزان"، "خۆبەزلگرتوو"، "جنێوفرۆش"، و "بۆقەلەموون سروشت" بوو. بەرهەمی زمانەوانی زەبیحی، وەک بەسەرهاتە سیاسییەکەی، "هەر لە لاپەڕەی یەکەمی یەوە لەسەر بنچینەی هەڵە دامەزرا" بوو (بڕوانە لاپەڕەی ). بەڵام ئەو دێو و درنجەی کە د. نەبەز، بە موتلەق کردن و سادە کردنی ژیانی زەبیحی، تەنیوێتی لە ساویلکەیی دنیای فکری و لە نزمیی رادەی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەکەی دا هەڵدەپرووزێ و بزر دەبێ و ئەو پرسیارە دەخاتە سەر زار: کێ دێو و

درنجه ؟

## پراوێزەکان

١- تا ئێستە لێکۆڵینەوەیێکی بە پێز سەبارەت بەو قاموسە نەکراوە. بۆ کورتە باسێک بڕوانە لاپەڕەی ٤١-٣٥ ی ئەو کتێبە. لە لێکۆڵینەوەی خۆم لەمەر پرۆسەی ستاندارد بوونی لەهجەی سلێمانی، دەوری ئەو بەرهەمەم لە فەرهەنگنووسیی کوردی و گۆڕانی زمانی ستانداردی کوردی دا باس کردووە:

Amir Hassanpour, Nationalism and Language in Kurdistan, 1918-1985, San Francisco, Mellen Research University Press, 1992, pp. 406-13.

٢- ئەوانەی لە بڕیاردانی ئەنجومەنی کۆڕدا بەشدارییان کردووە دەتوانن ئەو کێشەیە روون بکەنەوە. بەڵام ئەو بۆچوونە - لەهجەی ستاندارد تەنیا سورانییە و ئەویش بن لەهجەی سلێمانی - زۆر باوە. مەسعوود محەمەد دەنووسێ:

> گوێم لێ بوە، لە نامەی تایبەتیشدا خوێندوومەتەوە، ئەدیب و خوێندەواری سلێمانی بە صەراحەت گوتوەتی و نووسیوەتی هەر نووسینێکی لە شێوە نووسینی سلێمانی لابدات دەبێ وەلاوە بنرێت ... هەر ئەم بیرورایەشە لە پەنا پشتگیری کردن لە زمانی ئەدەبی کوردییەوە شێوازی کتێبی وەک (تحفه، مظفریه) تاوانبار دەکات.
>
> مەسعوود محەمەد، "رێنووسی کۆڕ". گۆڤاری کۆڕی
> زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، ١٩٧٦، ل ٢٤٦

٣- زمانناسی نوێ لە سالانی ١٩١٠ەوە دەستی پێکرد و ئێستە، لەباری تیۆری و مێتۆدەوە، یەکێک لە زانستییە کۆمەلایەتیە هەرە ئالۆز و پێشکەوتووەکانە. لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لەسەر بنچینەی زمانناسی نوێ لە یەکێتی سوڤیێت و لە ولاتە رۆژاواییەکان دەستی پێکرد بەلام زۆربەی ئەو بەرهەمانە، هەتا سالانی ١٩٧٠، لە چوارچێوەی زمانناسی وەسفی (descriptive linguistics)دا نووسرابوون. دەنگ و فۆنێمی کوردیش هەر زۆرتر لە چوارچێوەی ئەو مەکتەبە زمانناسییەدا لێکدراوەتەوە. سەرباقی وەی تیۆری و مێتۆدی دەنگناسی و فۆنێمناسی زۆر گۆڕاوە و بۆچوونی نوێ پەیدا بووە، منیش لێرەدا دەنگ و فۆنێم لە روانگەی زمانناسی وەسفییەوەشی دەکەمەوە.

٤- کەمال فواد، *فۆنێمەکانی زمانی کوردی*، یۆنشۆپینگ، سوێد، کتێبی ئەرزان، ١٩٩٥، ل ٢. ئەو بەرهەمە لە پێشدا لە گۆڤاری *چریکەی کوردستان* (ژ ١، ١٩٧٩؛ ژ ٢، ١٩٨٠؛ ژ ٣، ١٩٨٠؛ ژ ٤، ١٩٨١) بلاو ببۆوە.

٥- مەبەست لە جووتۆکانە (minimal pair) دوو وشەیە کە فۆنێمەکانیان وەک یەک وایە و تەنیا لە یەک فۆنێم دا جیاوازییان هەیە، وەک هەل/هەڵ، کەل/کەڵ یان پەلە/پەڵە. لەو نموونانەدا جیاوازبوونی یەک فۆنێم جیاوازی مانا دروست دەکا. جووتۆکانە وەک ئامێرێک بۆ تەبەقە کردنی دەنگ و دیاری کردنی فۆنێمەکان دەکار دەهێندرێ.

٦- فـۆنێم دەتوانێ چەند فۆرم یان شێوەی هەبێ کە پێیان دەڵێن allophone یان شێوە فۆنێم. ئەو فۆرمانە وێـــکڕا فۆنێمێک پێک دێنن. بۆ وێنە لە لەهجەی سلێمانی و موکریانی دا، فۆنێمی /گ/ دوو شێوە فۆنێمی هەیە وەک [گ] لە گاسن و لە گێوژ دا. دیارە جیاوازی ئەو دوو شێوە فۆنێمانە بەستراوەتەوە بە ئەو بزوێنانەی کە بە دوای واندا دەکوترێن. بۆ باسی دوو شێوە فۆنێمی l لە ئینگلیسی دا بڕوانە:

David Crystal, The Cambridge Encyclopedia of Language, Cambridge Universi Press, 1992, p. 161..

٧- بڕوانە:

Abdul-Majeed Rashid Ahmad, The Phonetic System of Modern Standard Kurdish, Ph.D. Dissertation, University of Michigan, Ann Arbor,1986, pp. 62-63.

Ernest McCarus, A Kurdish Grammar: Descriptive Analysis of the Kurdish of Sulaimaniya, Iraq, New York, American Council of Learned Societies, 1958, p. 20..

Z. A. IUsupova, Suleimaniiskii Dialekt Kurdskogo IAzyka, Moskva, Nauka,1985, s. 28..

K. Eiiubi & I. Smirnova, Kurdskii Dialekt Mukri, Leningrad, Nauka, 1968, s. 14-15.

D. N. MacKenzie, Kurdish Dialect Studies-I, London, Oxford University Press, 1961, pp. 6-7.

بیروڕای کەماڵ فواد لە لاپەڕەی ٤٥٢ دا باس کراوە. د. ئەورەحمانی حاجی مارف بۆچوونی خۆی لە لاپەڕەی ٤٣١ دا دەربڕیوە.

٨- د. ئەبەز دەنووسێ "لە ١٩٢١دا ئەلفوبێتی یەکی لاتینی بە تیپی ئەرمەنی بڵاو کرایەوە." ئەوە قسەیێکی سەیرە. ئەلفوبێتی لاتینی چۆن بە تیپی هەرمەنی دەنووسرێ؟ ئەو ئەلفوبێیەی لە سالی ١٩٢١، هاگۆپ گازاریان لازۆ دای رشتبوو و لە کتێبی وینەداری "شەمس"دا بلاو بۆوە (بڕوانە فەرهاد پیرباڵ، "ئەلفابێ جێ یا کورمانجی و ئەرمەنی ئەستەمبوڵ ١٨٦١، پەیڤین، سالی یەکەم، ژمارەی ١، ئەمووزی ١٩٩٧، لاپەڕەی ٢٥٤-٢٥٨). لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ئەلفوبێیە بۆ ئەوەی کوردی باش پێ بنووسرێ، دەستی تێوەردرابوو، بەڵام ئەلفوبێتی هەرمەنی بوو نەک لاتین.

٩- د. عەبدولمەجید رەشید ئەحمەد پێی وایە کە لەهجەی سلێمانی ٤٠ فۆنێمی هەیە (٣١ کۆنسۆنانت و دە بزوێن؛ مەک کارووسیش وا دەڵێ) بەڵام "کوردی ستانداردی نوێ" (Modern Standard Kurdish) کە لەسەر بنچینەی لەهجەی سلێمانی پێکهاتووە ٢٩ کۆنسنانت و ١٠ بزوێنی هەیە (لە لەهجەی ستانداردا دەنگی /ŋ/ کە بە جووت حەرفی نگ دەنووسرێ نییە). بڕوانە:

Abdul-Majeed Rashid Ahmed, The Phonetic System..., p. 12..

لە لێکۆڵینەوەی ئەورەحمانی حاجی مارف دا، دەنگەکانی "زمانی کوردی" بریتین لە ۲۸ کۆنسۆنانت، ۸ بزوێن و سێ "بزوێنی دوولانە" (diphthong) کە وێکڕا دەکاتە ۳۹ فۆنێم. بڕوانە:

ئەورەحمانی حاجی مارف، ***زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا***، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، ۱۹۷٦، ل ۲۸، ۳٤، ۳٥.

۱۰- **کەماڵ فواد، *فۆنێمەکانی زمانی کوردی*، ل ۱۰.**

۱۱- هەمان سەرچاوە، ل ۱٥.

۱۲- هەوڵ لێکۆڵینەوەی زمانناسیانە بزووتنەوەی پەتیکردن، تێزی دوکتورای جەماڵ جەلال عەبدوللا بوو کە لە ساڵی ۱۹۸۰ پێشکەشی زانستگای یۆرک (ئینگلستان) کرا. لێکۆڵینەوەیێکی تر، تێزی دوکتورای جەعفەر حەسەنپوورە لە زانستگای ئوپسالا:

Jamal Jalal Abdulla, Some Aspects of Purism Among Kurdish Speakers, Ph.D. dissertation, University of York, 1980..

Jafar Hasanpoor, A Study of European and Persian Loanwords in Kurdish (Sorani), Ph.D. dissertation, Uppsala University, 1999..

۱۳- بڕوانە لاپەڕەی ٤۱٦

۱٤- بڕوانە لاپەڕەی ٤۷۷ و، هەروەها، **قامووسی زمانی کوردی**، ل ٦۱-٦۲

۱٥- بڕوانە ***هەتاو***، ژ ۱۸-۱۹، ل ۸ و ۱۹؛ ژ ۲۳، ل ۱٤ (ساڵی ۱۹۸۸)

۱٦- ڕەخنە (critique , criticism)، چ لە ئەدەبیات داچ لە زەمینەی تردا، خۆی بابەتێکی گرینگی لێکۆڵینەوەیە و، زانیارێکی زۆر سەبارەت بە مێژوو و ترادیسیون و تیۆری ڕەخنە لەبەر دەست دایە. مەبەستی من لێرەدا هێنانە گۆڕی ئەو باسانە نییە. لێرەدا تەنیا دەمەوێ دەست ڕاکێشم بۆ ئەو دیاردە باوەی دنیای ڕۆشنبیری کورد کە شایەنی ناوی ڕەخنە نییە.

۱۷- پڕۆپاگەندە بە شێوەی جۆراوجۆر دەکرێ. زانستی پڕۆپاگەندە ناسی لە ساڵانی ۱۹۳۰ بەولاوە پەرەی ستاند و لێکۆڵینەوەیێکی زۆر سەبارەت بە مێژوو، شێوە، و نەریتی پڕۆپاگەندە بلاو کراوە. هاندەری ئەو شەپۆلی لێکۆڵینەوەیە هێرشی پڕۆپاگەندەی نازیسم و فاشیسم بوو. لە زانستگاکان، لێکۆڵەرەوەی ئازادیخواز و تێکۆشەر بۆ بەربەرەکانی کردنی بانگەشەی فاشیستی دەستیان کرد بە توێژینەوەی ئەو دیاردەیە. بۆ وێنە، لە ئەمریکا "ئەنستیتووی لێکدانەوەی پڕۆپاگەندە" (Institute of Propaganda Analysis) دامەزرا کە بە بلاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار، بەرەنگاری پڕۆپاگەندەی فاشیستی بوو. یەکێک لە بلاوکراوەکانی ئەو ڕێکخراوەیە کتێبی «هونەری ناسکی پڕۆپاگەندە» بوو کە باسی حەوت تێکنیک یان شێوەی

پڕۆپاگەندەی هێنا گۆڕێ. ئامێری هەوەڵ، جنێودان (name calling) بوو کە بریتییە لەوەی کە "تیۆرێکی خراپ لەسەر ئیدە یان فکرێک دادەنێین بۆ ئەوەی ئەو بیرە وەلا بنێین و مەحکوومی بکەین بێ ئەوەی بەڵگە و شاهیدەکە لێک بدەینەوە". تێکنیکێکی تر "رەگەڵکەوتنە" (band wagoning)، واتــە بە خەڵک دەڵێین "زۆربەی خەڵک لە گەڵ ئێمەن تۆش رەگەڵمان بکەوە". ئەو دوو تێکنیکە و ئەوانی تر تایبەتی فاشیستەکان نین و لە هەمـوو ولاتێک و لە رابردوو و ئێستەدا دەکار هێندراون و تەنانەت لە رێکلامیش دا (advertising) کەڵکی لێوەردەگرن. لـە ولاتە رۆژاواییەکان، ئامرازی گشتی (رادیۆ، تلویزیون، رۆژنامە، فیلم ...) بە شێوەیێکی زۆر ئاسکتر ئەو تێکنیکانە دەکار دێنن:

"Propaganda," in W. J. Severin and J. Tankard, Communication Theory. New York, Longman.1988, pp. 103-119.

Alfred M. Lee and Elizabeth Lee, The Fine Art Propaganda, Orlanda, Fla. , Harcourt Brace. Jovanovich,1939.

١٨- تاوانی کوردی نەزانین ئاخر چەکێکە کە بۆ کپ کردنی دەنگێکی رەخنە گرانە دەکاری دێنن. بۆ وێنە کاتێک د. عەبباسی وەلی باسی نوێ بوونی بزووتنەوەی ناسیونالیستی کورد و نەتەوەی کوردی کرد، ئەوانەی کە بەو باسە تووڕە بوون، لەباتی حەول دان بۆ تێگەیشتنی باسەکە و چوارچێوە تیۆرییەکەی و شیکردنەوە و لێکدانەوە و رەخنە گرتنێکی شیاوی باسەکەی وی، ویستیان بە تاوانی کوردی نەزانین قسـەکانی بێ بایەخ بکەن ( **گزینگ**، ژ ١٢، هاوینی ١٩٩٦، ل ٢١). وێنەیێکی تر: لەگـەڵ ئەوەشـدا عەبدولسەتار تاهیر شەریف چەند رەخنەی بە جێی لە کتێبی **حاجی قادری کۆیی** مەسعوود محەمەد گرتووە، دەنووسێ: مەسعوود محەمەد "زمانی کوردی لە تیپی ئەلفەوە تا تیپی (ی)ی شێواندووە و شکاندوویەتی بەسەر یەکا". هەروەها دەڵێ بەکار هێنانی "کۆمەڵێک ووشەی پەتی دانیشتووانی شاری کۆیە ... گوناهێکی گەورەترە بەرامبەر بە جۆری نووسینی زمانی کوردی یا زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، دوور نی یە هەر مەبەسیش بۆ شێواندنی زمانەکە بێ."

عـــەبدولسەتار تـاهیر شەریف، **حاجی قادر: شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتی ی نەتەوەی کورد**، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٨١).

# نامەی کاک ئەمیر حەسەنپوور بۆ مامۆستا زەبیحی وجوابی مامۆستا بۆ کاک ئەمیر

بەرێز کاک ئەمیری حەسەنپوور لە ساڵی١٩٧٨ لە ئەمریکاوە لەسەر نووسینی تێزی دوکتۆراکەی نامەیەکی بۆ مامۆستا زەبیحی نووسیوە و لەو نامەیەدا چەند پرسیارێکی لە بابەت زمانەوانی و قامووس نووسین و... لە مامۆستا زەبیحی کردووە و مامۆستاش لە گەڵ ئارەزووی سەرکەوتنی کاک ئەمیر لە پرۆژەکەیدا جوابێکی تێر و تەسەلی بۆ ناردۆتەوە.

لێرەدا لە گەڵ دووپاتەکردنەوەی سپاسم بۆ کاک ئەمیر کە ئەو نامانەی بۆ ناردم و یەکەمجارە کە بڵاو دەکرێنەوە، دەیخەمە پێش چاوی ئێوەی خۆشەویست.

لەسەر تێبینی خودی کاک ئەمیر وشەی "ئیستاندارد" کە کاک ئەمیر لە نامەکەی خۆیدا بەکاری هێناوە و مامۆستا زەبیحیش هەر لەسەر نامەکەی کاک ئەمیر عەینی شتی بەکار هێناوە، کراوەتە "ستاندارد".

## زانای بەریز ماموستا ع . زەبیحی

ویرای سلاو و ریز، خوێندکارێکی کوردم و خەریکی نوسینی اطروحەم سەبارەت بە زمانی نەتەوەیی کوردی. بەشیک لە فەرهەنگەکە باسی فەرهەنگ نوسیی کوردیە. لەو بەشەدا بیجگە لە باسی فەرهەنگەکان بە تێکرایی، باسی سێ فەرهەنگ و سێ فەرهەنگ نوس (گیو، خال، زەبیحی) دەکەم. تکایە ئەو پرسیارانەم وەلام بدەوە و هەر شتیکی دیشت بە پیویست زانی بۆم بنوسە.

١ – چ بن لەهجەیێکت بە بنکە یان بناغە داناوە بۆ زمانی ئیستانداردی کوردی، مەبەستم لە بنکە ئەوەیە کە لە زماننانسیی دا پێی دەلێن نۆرم(norm).

[ تێبینی: وادیارە لە "قاموس" دا "لەهجەی ناوەندی"ت بە نۆرم داناوە (لاپەرەی ٩ – ١٠، ٤٠). بەلام ئەو لەهجە خۆی چەند بن لەهجەی هەیە کە لە لاپەرەی ٤٢، نیوی حەوتیانت نوسیوە: موکریانی، سورانی، سلیمانی، شوانی، جافی، سنەیی، گەروسی. لەو باسەی کە لە لاپەرەی ٤٠ و ٩ – ١٠ کردوتە وا دەردەکەوێ کە "لەهجەی ناوەندی" لە عیراق بە بناغەی ئیستاندارد دادەنێی. لە لاپەرەی ١٠٧ "کورتە نیشانەکانی ریزمان..." لەهجەی ناوەندیت دیاری نەکردوە بەلام هەشت بن لەهجەت نیشانە کردوە – جافی، سنەیی، سلیمانی، شنویی، کەرکوکی، کویی، موکریانی، هەولێری. ]

٢ – لە لاپەرەی ٤٠ نوسراوە: "زمانی یەکگرتوی نوسین..." کە "بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق، هەنگاوی باشی بەرەوپیشەوە هەلیناوەتەوە...". لاپەرەی ٩: "... زمانی کوردی کەوتوتە سەر رچەی (زمانی ئەدەبی) و بەرەوپیش دەچێ... ئەمامی (زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتو) گووراوە و شین بوە..." پرسیاری أ: "قاموس" لە بەرامبەر ئەو زمانە ئەدەبیە یەکگرتوە چ بەرنامە و سیاسەتیکی هەیە؟ "قاموس" چۆن یارمەتی دەدا بە پەرەپێ دان و تشبیتی ئەو زمانە؟ پرسیاری ب: لە بن لەهجەکانی دو لەهجەی دی –

باکوری و جنوبی - و هەروەها زازایی و هەورامی چۆن کەلک وەردەگری؟ پیوەندی زمانی یەکگرتوی ئەدەبی لە گەل ئەو لەهجانەی دی چیە؟ چ وشەییک لەو لەهجانە لە قاموس دا تومار دەکرێ؟ ملاک و معیاری هەلبژاردنی ئەو وشانە چیە؟

٣ - ئایا ئەو "زمانی یەکگرتوی نوسین" خۆی لە باری زمانی کومەلایەتی یەوە چەند نەوع یان شیوەی هەیە یان نا؟ وەک شیوەی ئەدەبی/قسەکردن، رەسمی/غەیری رەسمی، عیلمی/غەیری عیلمی و شتی وا... ئەگەر ئەوانەی هەیە بۆ لە قاموس دا دیاری نەکراون؟

٤ - سەبارەت بە تت. (وشەی تازە داتاشراو) چ سیاسەتیکت هەیە:

ئەلف - چ وشەییکی تازە داتاشراو تومار دەکەی؟

ب - بۆچی وشەی تت تۆمار دەکەی؟

ج - سەرچاوەی ئەو وشانە چن؟

د - ئایا وشەکانی "کوری زانیاری" دەخەیە نیو قاموس یان نا؟ بۆ؟

ه - ئایا وشە داتاشراوەکانی پیش دامەزرانی کۆڕ وەک "زاراوەی زانستی کوردی" (نەقابەی ماموستایان) یان "هەندیک زاراوەی زانستی" (جەمال نەبەز - ١٩٦٠) دینە نیو قاموس؟

٥ - وشەکان چۆن کۆ دەکەیەوە؟ نزیکەی ٨٠ سەرچاوەت نوسیوە (لاپەرەی ١٠١ - ١٠٦). بیجگە لەوانە چون لە زمانی خەلکی وشە کۆ دەکەیەوە؟ لە فەرهەنگی خال و مەهاباد چون کەلک وەردەگری؟

٦ - بۆ روژنامە و گوڤاری کوردی جیگەییکت داناوە یان نا؟

٧ - لە نوسینی (کۆکردنەوە تا نوسینی) قاموس بیجگە لە خۆت کەسی دی بەشدارە؟

٨ - بە بێ یارمەتی کۆڕی زانیاری دەت توانی "قاموس"ەکە دابنێی و چاپی بکەی؟

٩ - تکایە ئەگەر دەکرێ بەسەرهاتی خۆت بە کورتی بنوسە - ئەو شتانەی کە یارمەتی بدا بە رونکردنەوەی ئەوشتانەی کە لە دانانی "قاموس" دا تەئسیری هەیە.

لە"قاموس" دا زور شتت نوسیوە کە بۆ رونکردنەوەی ئەو مەسەلە باشە. بەعزە شتیک کە نەنوسراوە: لە کوێ دەرست خویندوە؟ فەقێیەتی؟ مەدرەسە؟ چ سالیک لە لای ماموستا گیو فەرانسەت خویندوە؟ بیجگە لە چاپی "نیشتمان" و ئەو قاموسە، لە زمان و ئەدەبیات دا چ شوینەواریکت هەیە - وەک شیعر و چیروک و شتی وا؟

[تێبینی: مەنزور لەو بەسەرهاتە ئەوەیە: زوربەی فەرهەنگ نوسی کورد لە روی هەستی نیشتمانیەوە ئەو کارەیان کردوە بۆ پاراستن و گەشاندنەوەی زمان؛ زوربەیان بیجگە لە فەرهەنگ نوسی ئیش و کاری دیکەیان بوە - معلم، مەلا، خەباتی سیاسی و...]

١٠ - پیت وایە دانان و چاپ کردنی تەواوی قاموس چەند سالان دەخاینێ؟

١١ - بەرگی ١ قاموس چەند وشەی تێدایە؟

لە گەل سپاسیکی زور - چاوەروانی وەلامت دەبم

بە ئاواتی سەرکەوتنت

ئەمیر حەسەن پور

برای بەریز و خۆشەویست کاک ئەمیر حەسەن پور

لەپاش عەرزی سلاو و ئەحوال پرسی، لەم ئەرکە پیروزە گرانەدا کە وەئەستۆی خۆتان گرتوە و دەتانەوی (تیز)ی دوکتورای خۆتان لە سەر زمانی نەتەوەیی کوردی بنوسن داوای سەر کەوتنتان بۆ دەکەم و لەوەش کە بریارتان داوە لە بەشی فەرهەنگی (تیز)ە کەتاندا یادیکیش لە بەندە بکەن زۆر سوپاستان دەکەم ئەگەر چی خۆشم بە شایانی ئەم شانازیە نازانم.

نامەکەتانم دە پازدە رۆژیکە بە دەست گەیشتوە، چەند پرسیاریکتان فەرمویو ئەوا لە خوارەوە وەلامەکانیانتان بە عەرز دەگەیێنم:

أ- پرسیاری یەکەمتان "چ بن لەهجەییکت بە بنکە یان بناغە داناوە بۆ زمانی ستانداردی کوردی. مەبەستم لە بنکە ئەوەیە کەلە زمانناسیدا پێی دەڵێن (norme)"

١ـ لەپیش هەمو شتیکدا دەمەوی روونی کەمەوە کە (بن لەهجە) بۆ ئەوە دەست نادا بەلای منەوە ببیتە نۆرمی زمانیک بەلکو لەهجەیەکی سەرەکی لە هەر زمانێکدا دەتوانی ببیتە بنکەی زمانی ستاندارد، ئەو جار بۆ وەلامی پرسیارەکەتان، ئەوەی ڕاست بێ و خۆشتان باش دەزانن کە تەنیا لە (عیراق) زمانی کوردی بە شیوەیەکی هەراو بەربلاو پێی دەنوسرێ و هەر لە دامەزرانی دەولەتی عیراقەوە زمانی کوردی زمانێکی ڕەسمی و قانونییە و بەپێی قانون، ئیستا لە هەریمی ئۆتۆنومی کوردستان زمانی خوێندن و نوسین و دادگا و دەوایری تری دەولەتیشە بۆیە تەنیا ئەو لەهجەیەی کە لە نیو قەرن زیاترە شیوەیەکی رەسمی وەرگرتوە و کەم و زۆر خزمەتی کراوە و تاڕادەیەک گەشەی کردوە و پەرەی سەندوە بۆ ئەوە دەبێ ببیتە نۆرمی زمانی ستانداردی کوردی ئەویش لەهجەی ناوەندی زمانی کوردییە کە بە غەلەت لیرە پێی دەلێن لەهجەی (سۆرانی) کە ئەمەی دواییان خۆی بن لەهجەییکی لەهجەی ناوەندیێ دیتە حیساب و منیش هەر وەکوو فەرمووتانە راستە لەهجەی ناوەندیم بۆ (نۆرم)ی زمانی ستاندارد داناوە و (قاموس) شایەدی ئەمەیە، چونکو: "... هەموو ئەوانە بە تێکڕایی توانایی زمانی لەم مەلبەندەدا

بۆ گۆڕان وگەشە کردن زیاد کردوە وکۆسپ و بەر هەڵستەکانی سەر ڕێگای ئەم گۆڕان و گەشەکردنەشیان تەخت کردوە ..." (قاموس، سەرەتا، ل ٤٨ )

٢ــ لەو تێبینیەدا کە بۆ پرسیاری یەکەمتان نوسیوتانە، هەر چەند شێوەی پرسیاری نیە و زیاتر ڕەنگی بیرخستنەوەی هەیە، بەم حاڵەشەوە بۆنێکی پرسیاری هەر لێ دێت بۆیە لە خوارەوە چەند شتێکیشتان دەربارەی ئەو مەبەستانەی کە باست کردون بۆ دەنووسم.

A ــ من لە قاموسدا ئەوەم کردوە کە لە دەستم هاتوە و توانیومە و زانیومە لێی بدوێم هەر بۆیەشە کە حەوت بن لەهجە( subdialecte )م دەست نیشان کردوە چونکو هەر ئەوەندەم زانیوە و ڕەنگە لەو ژمارەیە زیاتر بن.

B ــ ئەو مەسەلەیەی کە حەوت بن لەهجەم دیاری کردوە وکورتە نیشانم بۆ هەشتان داناوە، بێگومان خۆتان دەزانن کە بن لەهجەکانیش لق و پۆپیان لێ دەبێتەوە بۆ نموونە بن لەهجەی سۆرانی: (هەولێری)، (کۆیی)، (خۆشناوەتی) و... لێ دەبێتەوە، جا نازانم ئەم لق و پۆپی بن لەهجەکانی زمان چیان پێ بگوترێ باشە؟

من بە ئانقەست بو (هەولیری) و (کۆیی) و (کەرکووکی) کورتە نیشانم داناوە چونکو بەراستی لەو ناوچانەدا تووشی ووشەی ڕەسەنی کوردی ئەو تۆ دەبین کە لە شوینەکانی دیکەدا لە بیر چوونەوە، وەکو ووشەی( ئەزموون) کە هەر لە ناوچەی خۆشناوەتی دا دەکار دەکرێ. دەبێ ئێوەش هەستتان پێ کردبێ کە لە مەڵبەندی بن لەهجەی موکریانیدا شێوەی قسە کردن لە (مەنگورایەتی) و (لاجان) و (محاڵ) و (شارویران) کەم و زۆر ئەوەندە لێک جیاوازن کە بۆ ئەوە دەشێن پیاو هەروا بە سەریاندا تێ نەپەڕێ و هەقی خۆیان بداتێ. بە کورتی هەڵژماردنی لەهجە و بن لەهجە (بە لق و پویەکانیانەوە) کانی زمانی کوردی بەلای منەوە کارێکی هێندە هاسان نیە و پیویستی بە گەشت و گێڵ بە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانا و تۆمارکردنی فەرق و جیاوازی ئاخافتن لەو ناوچانەدا هەیە. ئەم کارەش دەبێ بە شێوەیەکی عیلمی لە لایەن هەیئەتێکەوە بکرێ، چونکو کاری تاقە ئینسانێک ناتوانێ کەم وکۆری نەبێ، ئەمەش لە شرایطی ئێستاماندا هەر لە عیراق ئیمکانی هەیە کە تا ئێستا نەکراوە، هیوام وایە کۆڕی زانیاری کورد لە

دوارۆژێکی نیزیکا ئەم ئەرکە پیرۆزە ئەنجام بدات .

C ـ کاتێ (قاموس) خۆی لە سەر بنگەی لەهجەی ناوەندی داندرابێ، دیارکردنی کورتە نیشانی تایبەتیم بۆ ئەو لەهجەیە هێندە بە پیویست نەزانیوە، سەرەڕای ئەمە دەبوایە هەر بۆی دانێم، خۆزگە کەم وکووری هەر ئەمە بایە، (قاموس)گەلێ کەم و کووری دیکەشی لەم بابەتە و لە بابەتی فەننی و عیلمیەوە هەیە کە هیوام وایە لە بەشەکانی دیکەدا بتوانم ئەوەندی لە دەستم بێت نەیان هێڵم .

ب ـ (پرسیاری ٢/أ) "قاموس" بەرامبەر ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتوە چ بەرنامە و سیاسەتێکی هەیە؟ " قاموس" چون یارمەتی دەدا بە پەرەپێدان و تەثبیتی ئەو زمانە؟

١- من کە لە لاپەرەی ٩ و ٤٠ ی سەرەتای قامووس باسی زمانی (ئەدەبی) و (زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتو)م کردوە مەبەستم ئەو زمانەیە کە لە وەلامی پرسیاری یەکەمتانا باسم کرد و ئەویش لەهجەی ناوەندی زمانی کوردییە کە لە سالانی سەرەتای ئەم چەرخەڕا لە کوردستانی عیراق بۆتە زمانی رەسمی وکتیب و گۆڤار و رۆژنامەی پێ دەنوسرێ و ئەو کوردانەش کە بە لەهجەی باکوری یا جنوبی قسە دەکەن و لە پێشدا وەک زمانێکی بێگانە دەهاتە بەرچاویان، ئێستا زۆر لە جاران زورتر کەلک لەم کتیب و رۆژنامە و... انە وەردەگرن کە پێشان ئەمە لە حوکمی (محال) دابوو، هەر چەند ئەم دوایانە دە سالێک زیاترە هەندێ رۆشنبیر ـ ئەگەر هەلبگرێ پێیان بکوترێ روشنبیر ـ ی لەهجەی باکوری لە روی تعصبێکی کویرانەی غیر عیلمی منطقە پەرستییەوە ناوبەناو دەنگیان بەرز دەکەنەوە و بە ناوی ئەوەی کە:

A ـ ئەوکوردانەی بە لەهجەی باکوری قسەدەکەن ژمارەیان گەلێ لە ئی لەهجەی ناوەندی زورترە .

B ـ گۆیا بە قسەی ئەوان لەهجەی ناوەندی زمانێکی (مفراش)ە، وشەکانی لە زمانانی فارسی، عەرەبی، تورکی و تەنانەت (فرەنسی)ش وەرگیراون.

C ـ زمانی لەهجەی ناوەندی (گراماتیکا)ی نیە، مذکر ومؤنثی تیدا نیە (وەکو زمانانی عەرەبی، فرەنسی، ئەڵمانی و... و...)و لەهجەی باکوری هەیەتی.

داوادەکەن کە لەهجەی باکوری بکرێتە باو و ببێتە بناغەی زمانی کوردی ستاندارد، کە ئەم بروبیانوانە ناتوانن ببنە بناغەیەکی ئەوتو بۆ خانوی زمانی ئەدەبی یەکگرتوی کوردی چونکو زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی بە لەهجەیێ لە لەهجەکانی زمانێک قسە دەکەن، ئەو هەقەیان ناداتێ تطوری هەزار ساڵ زیاتری لەهجەیەکی دیکەی زمانەکە بسترنەوە و لەهجەکەی خۆیانی لە جێگە دانێن کە هێشتا لە سەرەتای دروست بوونی خوی هێندە دور نەکەوتۆتەوە، کە بو تەعبیر لە (خانی دەنگ = مخرج حرف) کەلک وەرنەگرێ و چونکو لەهجەی ناوەندی ئەو (فراش)ە ش نیە کە ئەوان باسی دەکەن بگرە لەم بابەتەوە ــ خواستنەوەی ووشەی بیگانە ــ گەلێ پاک و خاوێنترە و هەر وەک ئێوەش ئاگادارن گەلێ رۆژهەلاتناس بن لەهجەی موکریانیان ــ ئەوان بە لەهجەی ناودەبەن ــ بە ساف و بێگەردترینی لەهجەکان و ئەساسی زمانی کوردی داناوە بەلام (مذکر) و (مؤنث) ــ کە لە لەهجەی باکوریدا هەر وەک زمانی فرەنسی وایە ــ بەلای منەوە لە هیچ زمان و لەهجەیەک دا ناتوانی نیشانەی پیشکەوتنی ئەو زمانە یان لەهجەکە بێت بەلکو مەعلولی ئەو عیللەتانەیە کە لە خوارەوە باسیان دەکەم:

یەکەم ــ مذکر ومؤنث لە زمانانی پاشکەوتوی وەکو کوردی دا دەگەرێتەوە بۆ: تطور نەکردنی زمانێ یان لەهجەی زمانێک و هەر وەک خۆی مانەوەی کە لە دەورانێکا خەلک ناچار بون بۆ دقتی تەعبیر فەرقی ژن و پیاو بکەن، ئەو دەورەش لام وایە ئەو وختەیە کە ئافرەت لە ناو کومەلی ئادەمیزادا قەدرو قیمەتی ئینسانی نەبوە و (پیاو) بە ئەنگی زانیوە دەگەل ژن فەرقی نەکرێ و چۆن دەگەل ژن قسە دەکرێ دەگەل ئەویش هەروا قسە بکری، خۆ ئەوەش دەزانین کە عەرەب هەر بۆ ئەوەی سەرشۆری هەبونی (ئەولادی مێیینە)ی بە سەرا نەیەت کچانی خۆیان زیندە بەگۆڕ دەکرد تا ئیسلام هات و گوتی "واذا المؤودة سئلت بأی ذنب قتلت" و لەم کارە نارەوایەی مەنع کردن.

دوەم ــ مذکر ومؤنث لە زمانانی پێشکەوتوی وەکو (فرەنسی)دا ــ هەبونی مذکر ومؤنث لە هەندێ زمانانی فەرەنگیدا وەکو (فرەنسی، ئەلمانی، عرووسی و... و...) هەر وەکو دەشزانن زمانی ئەلمانی و ڕووسی لە باتی دو جنس (gendre)ی نێر و مێ جنسی سێیەمیش، نەنێرنەمێ (مخنث neutre) یان هەیە، ئەم فینۆمێنە بەلای منەوە لە

زمانان دا ئەنجامی ئەوەیە پێش ئەوەی عیللەتی ئەساسی وجودی مذکر ومؤنث (ئەوەی کە لە ـ یەکەم ـ دا باسمان کرد) لە ناوبچێ، ئەوان زمانانە لەبەر شرایطی تایبەتی میللی کەوتوونەتە قۆناغی یەکگرتن و نوسینیان بە نسیب بوە و تثبیت بون، لەواقعیدا وجودی مذکر ومؤنث لەم چەشنە زمانانەدا (فۆسێل)یکە لە دەورانیکی پاشکەوتە ماوەتەوە پاشانیش محافظەکاری مانعی ئەوە بوە تطوراتی دوایی کاریان تێ بکا و لە ناویان بەرێت، هەر وەکو وجودی مذکر ومؤنث لەعەرەبی دا دەگەرێتەوە بۆ دینی ئیسلام و قورئان کە پیشی هەمو دەستکاریکی لەم بابەتەی لە زمانی عەرەبیدا گرتوە. ئەگەر ئەو زمانانە لە زەمانێکی نسبتا (زوو) نەکەوتبانە حالی نووسین و گراماتیکایان تۆمار نەکرابا، گومانم نیە ئەوانیش وەکو لەهجەی ناوەندی و جنوبی زمانی کوردی و زمانی فارسی و... و... لە وجودی (مذکر) و (مؤنث) پادەبوونەوە و تەنیا شوینەوارێکی بچوکی لێ بە یادگار دەمایەوە، هەر وەک لە سیغەی بانگ هێشتن (vocative) لەهجەی ناوەندی زمانی کوردیدا دەبنیرێ ودەڵێن:کورە، کچێ، پیاوەکە، ژنەکێ، هەتیوە، کچەتیوێ. بەڵام ئەو دەنگە ناسازانەی کە داوا دەکەن لەهجەی باکوری بکرێتە (نۆرم)ی زمانی ستانداردی کوردی، لە سەر دیواری بەرزی لەهجەی گەشە کردووی پەرە سەندوو دەبێتە (عەکسی صدا ECO) و دەگەرێتەوە، بەروبووی تەنیا ئەوەیە ناوبەناو کتێبێ بە (باکوری) دەردەچێ یان لە رۆژنامەکانا لاپەرەیەک یا کەمتری بۆ تەرخان دەکرێ، ئیستگەکانی رادیو کە بە زمانی کوردی قسە دەکەن رەوتی کاریان خزمەتی زمانی کوردی ناکا و بێ گومان مەبەست هێشتنەوەی فەرق و جیاوازی لەهجەکانی زمانی کوردی و (کریستالیزە) کردنیانە لەم قۆناغەدا کە کەوتۆتە خۆی و "نەمامی زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتو گووراوە" تا ئەو خەڵفە ساوایەی زمانی کوردی پەرە نەگرێ و گەشە نەکا و لە ئەنجاما ئیشک ببێ. بۆیە بەلای منەوە دەبێ هەموو جۆرە هەوڵ و تەقەلایە بدرێت بۆ تەثبیتی بەروبوی زیاتر لە پەنجا ساڵی تطوری زمانی نەتەوەیی کوردی و ئەمە ئەرکیکە زیاتر لە هەمو کەس دەکەوێتە سەرشانی زانایان و خوێندەوار و روشنبیرەکانی کورد کە ئەوەی پێیان دەکرێ و لەدەستیان دێ لە پیناو پەرە پیدان و گەشەپیکردنی ئەو نەمامە ساوایە درێغی نەکەن ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە کە خۆشتان باش دەزانن قوانینی

تطور بە شێوەیەکی (جەبری) کاری خۆیان دەکەن و هیچ هێزێ ناتوانێ ببێتە بەرهەڵست لە سەر ڕێگایان، تەنیا جارجارە نەبێ ئەویش ڕێگایان لێ وەردەگێرن و ڕوویان دەکەنە لایەکی ترەوە بەڵام ئەم کارە ناتوانێ هەتا سەر بێ و درەنگ یا زو دەگەڕێتەوە سەر شاڕێی تەبیعی خویان وکاری خۆیان دەکەن بۆیە من هیچ گومانم لەوە دا نیە کە زمانی ستانداردی کوردی لە دوا ڕۆژ دا هەر لەهجەی ناوەندی زمانی کوردیە کە بە تەنسیری قوانینی تطور و یارمەتی و هەوڵ و تەقەلای زانایانی کورد گەشە دەکا و پەرە دەستێنێ.

ئەو مەبەستە زۆر درێژ بۆوە بەڵام لە سەر فەرمودەی خۆتان کە لە سەرەتای نامەکەتاندا نوسیوتانە: "هەر شتێکی دیشت بە پیویست زانی بۆم بنوسە" بەلامەوە پیویست بو لەم مەبەستانەی کە باسم کردوە ئاگادار بی و بزانی گەشە کردن وپەرەسەندنی زمانی نەتەوەی کوردی چ جورە گیروگرفتێکی لە سەر ریگایە .

٢ـ بۆ وەڵامی بەشی دوەمی ئەم پرسیارەتان، وەکو خۆتان دەزانن کتێبێک چەند دەتوانێ یارمەتی پەرەسەندن وتەثبیتی زمانێک بدات، "قاموس"یش هەوڵ دەدا ئەو خزمەتە بکات، نیشاندانی حەقیقەت ولێهاتوویی لەهجەی ناوەندی زمانی کوردی، گەشە کردن و پەرەسەندنی ووشەکانی و لێک و لووس بونی تلفظیان و دورکەوتنەوەیان لە قۆناغی (بەدویی) زمان و زیاتر مطابق بوونی دەگەڵ قوانینی گۆران و گەشەکردنی ئەم قۆناغەی زمانی کوردی، بەرنامەی قاموسە.

ج ـ پرسیاری ٢/ب، کە خۆی دەبێتە چەند پرسیار یان چەند بەش، هەر بەشەی بەجیا وەڵام دەدەمەوە.

١ـ "لە بن لەهجەکانی دو لەهجەی دی ـ باکوری و جنوبی ـ و هەر وەها زازایی و هەورامی چۆن کەلک وەردەگری؟" من لام وایە ـ واقعیش هەر وایە ـ کە زۆربەی ووشەکانی سێ لەهجەی زمانی کوردی یەکن و تەنیا تلفظ یان فەرق دەکا، لە لەهجەی باکورییدا وەکو زمانی عەرەبی دەنگەکان لە قوولایی خانی دەنگەوە (مخرج حرف) دەردەخرێن و هێندێ دەنگی وەکو (ق، ط، ص، ظ)ی زۆر تێدایە و لە لەهجەی ناوەندیدا ئەم دەنگانە گۆڕاون و بوونە (و، ت، س، ز) و لە لەهجەی هەوارمی و زازاییدا کە لە ئەسلا یەکن هێشتا هیندێ دەنگی ئاوێستایی کە وەکو (ث، ذ)ی ئیمرۆی زمانی عەرەبی

دەچن، هەرماون کە ئەمانەش لە لەهجەی ناوەندیدا بوونە (س) و (ز) کاتێ کابرایەکی هەورامی قسە دەکا یەکێکی ناشارەزابێ دەڵێ ئەم پیاوە زمانی (پسک)ە، ئەگەر لە ووشەکانی هەموو لەهجەکانی زمانی کوردی وورد بینەوە و دەگەڵ ئی لەهجەی ناوەندی بەراوەردیان کەین دەبینین کە:

یەکەم ــ هەندێک ووشەکانی باکوری، جنوبی و هەورامی هەر وەکو خۆیانن یا بەکەمێ تطور و گۆڕانەوە لە لەهجەی ناوەندیش هەن، وەکو: ئاف (بک.)، ئۆو (جنو.)، ئاو (هو.) بەلای منەوە ئەم جورە ووشانە نابێ وەربگیرێن وبخرینە زمانی ستانداردەوە و لە "قاموس"یش وەک واحیدیکی سەربەخۆ نایان نووسم. لە لایەکی ترەوە هەندێ ووشە کە لە لەهجەی ناوەندییدا دەنگەکانی تطوریکی زیاتریان هەیە و لە لەهجە و بن لەهجەکانی ترا بە شیوەیەکی کۆنتر ماونەوە، وەکو: ئاوور، ئاگر (ناوەندی)، ئایەر، ئاهیر (هو.) ئەوانە بەلای منەوە دەبی بنوسرێن چونکو یارمەتی زانینی ڕێبازی گۆڕان و گەشە کردنی دەنگەکان دەدەن.

دوەم ــ هەندێ ووشە هەن کە لە یەکی لە لەهجەکاندا دەبیندرێن و لە لەهجەی ناوەندیدا هەر نین، وەکوو: ئیزنگ (بک.)، ئێزم یاهێزم (هو.) = داری سووتەنیی کە لە لەهجەی ناوەندیدا (دار)ی پێدەڵێن، بەلای منەوە دەبێ (ئێزنگ) بنوسری و (ئێزم یا هێزم)ی هەورامی بخرێتە پاش گوێ لە بەر ئەوەی بە ریبازی تطوری فارسیدا ڕۆیشتوە، یا: بژیشک (بک.) = پزشک (فر.) من وای بەراست دەزانم کە (بژیشک )ی باکوری دەبێ بنوسرێ و (پزیشک) کە هێندێ نوسەر دەینووسن وازی لێ بهێندرێ چونکو وەک ووشەیەکی فارسی دەقی گرتوە .

سێ یەم ــ لەهجەی هەورامی بۆ ضمیری ئیشارە کۆمەڵێ ووشەی وەکو: (ئیر، یە...، ...)هەیە، هەندی ووشەشی هەیە کە نەگەیشتوتە ئەو قۆناغەی نیشانەی مەصدەری وەربگرن بەلام دەلالەت لە سەر فیعل دەکەن وەکو: (وانا) بە مانای خوێندن و "وانای وانۆ" = خوێندن دەخوێننی بەلای منەوە ئەوانەش نابێ بنوسرێن چونکو گەڕانەوەیە بۆ پاشەوە. هەر وەها لە لەهجەی باکوریدا ضمیری مؤنث و مذکر هەیە و ئەسلەن هەر ووشەیەک یا (مذکر) و یا (مؤنث)ە ــ لە سەرەوە بە درێژی باسم کردوە ــ

ئەوانەش پاش گوێ خستنیان تطوری زمانی ستانداردی کوردی خێراتر دەکا. لە لەهجەی باکوریدا کۆمەڵێ (مصدر جعلیی) هەیە کە لە (ئیسم) یا (ریشەی مەصدەری عەرەبی) و نیشانەی مەصدەری کوردی پێکهاتون وەکو: قوصاندن = تاشین، هەڵپاچین، طەمراندن = کوژاندنەوە، لەبطین = خێرا کردن لە رۆیشتنا، ئەو مەصدەرە جەعلیانەش دەبی وەلابندرێن.

٢- "پەیوەندی زمانی یەکگرتوی ئەدەبی لە گەڵ ئەو لەهجانەی دی چیە؟" ئەوەی ڕاست بێ لە سەرەتای کارەوە بن لەهجەی سلەیمانی کە دەتوانین بڵەین تەنیا ئی شاری (سلەیمانی)یە، وەکو زمانی پێنوسین هاتۆتە مەیدانەوە، ئەمە ماوەیەک درێژەی کێشاوە، ئەم روو داوەش ـ کە بێ گومان شرایطی سیاسی و مێژوویی پێکی هێناوە ـ خۆی بۆتە هۆی ئەوەی کە نیمچە تعصبیک لە لای هەندێ خوێندەواری کوردی خەلکی سلەیمانی پەیدا ببێ و هەر بن لەهجەی سلەیمانی بە نۆرمی زمانی یەکگرتو بزانن کە لە جێی خۆی نیە ،بەلاّم چەند ساڵێکە ئیشەکە روی لەوەیە کە ئەم زمانە ئەدەبییە دەبێ بە ووشەی لەهجەکانی دی دەوڵەمەند بکرێ، بە تایبەتی بن لەهجەی موکریانی زۆر تەئسیری کردوە و بەرەبەرە ئەو ریبازە ئاواڵە بوە کە لە هەمو لەهجەکان کەلک وەربگیرێ و رۆژبەرۆژیش ئەم ئیشە پەرە دەستێنێ. [تکایە تەماشای شەرەفنامە وەرگێرانی هەژار، ئەفسانەی چیای ئاگری و قەلای دمدم تەرجومەی شوکور مستەفا بفەرمون].

٣ـ"چ ووشەیەک لەو لەهجانە لە قاموسدا تۆمار دەکرێ؟ مەلاک و معیاری هەڵبژاردنی ئەو ووشانە چیە؟" لە سەرەوە (ج/١) تۆزێ لەم بابەتە دواوم کە چ ووشە گەلێ پیویستە بخرێتە پاش گوێ، لە وانە بگەرێتەوە هەمو ووشەیەک پیویستە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی یەکگرتوی ئەدەبی کەلکی لێ وەربگیرێ، دەمێنێتەوە سەر ئەوان ووشانەی لەهجەکانی دی کە لە قاموسا تۆمار دەکرێن، ئەوەی ڕاست بێ "قاموس" تۆمار کردنی هەمو (مفردات)ێکی لە بن لەهجەکانی لەهجەی ناوەندیدا هەن ـ بە پێی لێزانین و زانین ـ وەئەستۆ گرتوە و دایناوە ببێتە قاموسێکی (نسبتا) کامڵی ئەم لەهجەیە و هیوا داریشم کە خوێندەوارانی کورد چاکی مەردایەتی بەلادا بکەن و قاموسێکی کامڵ بۆ هەر لەهجەیەک دابنێن تا ببێتە بناغەی دانانی قاموسی یەکگرتوی زمانی کوردی بە هەمو

لەهجەکانیەوە، من هەر ووشەیەکی لەهجەکانی دی کە لەم ماوەیەدا هێنراوەتە ناو زمانی یەکگرتو، لە قاموسا تومار دەکەم.

کۆری زانیاری کورد لە سەرەتای دامەزرانیەوە، جێ بەجێ کردنی ئەرکی دانانی قاموسێکی یەکگرتوی گرتۆتە ئەستۆ، بەلام کەنگێ جێ بە جێی دەکا نازانم. ئەوە کارێکە لە ووزەی تاقە ئینسانیک دا نیە، هیچ نەبێ من توانستی ئەوە دە خۆم دا نابینم.

د ـ (پرسیاری ٢) "تایا ئەو زمانی یەکگرتوی نوسین خۆی لە باری زمانی کۆمەلایەتیەوە، چەند نەوع یا شێوەی هەیە، یان نا؟ وەک شێوەی ئەدەبی/قسە کردن، رەسمی/غەیرە رەسمی، عیلمی/غەیرعیلمی و شتی وا... ئەگەر ئەمانەی هەیە بۆ لە قاموسدا دیاری نەکراوە؟"

ئەگەر وورد بنەوە من نوسیومە: "...ئەمامی (زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتو) گووراوە وشێن بوە" هەر بەدوای ئەو رستەیەدا دەلێم: "بەلام هێشتا پێی دەوێ تا دەبێتە درەختێکی خاوەن سایە و لق وپۆپ داری ئەوتۆ کە پیاو ماندویی رێگای سەختی لە ژێردا لە خوی دەرکا و لەبن سێبەرییدا بحەسێتەوە" (ل ـ٩) ئەو قسانە دەگەیێنن کە هێشتا (زمانی یەکگرتو) ئەو هەمو شێوە یان نەوعانەی لێ پەیدا نەبوە و نەبۆتە "دارێکی لق وپۆپ دار" چونکو ئەوانەی ئێوە لە پرسیارەکەتاندا باستان کردوە زمانێکی کاملە کە زۆر گەشەی کردبێ و پەرەی سەند بێ، خۆتان باش دەزانن بە هەر بارێکدا کە لێکی بدەینەوە، زمانی کوردی ئەو دەرفەتەی بۆ هەلْ نەکەوتوە تا بگاتە ئەو پلەیەی کە زمانی نەتەوەکانی دیکەی گەیوەتێ، بۆ زمانی کوردی فارسی کوتەنی: "هنوز اول عشق است یا علی مددی" سەرەرای ئەوەش بە راشکاوی دەتوانین بلەین (زمانی یەکگرتوی نوسین) شێوەی ئەدەبی و قسە کردنی هەیە.

هـ ـ(پرسیاری ٤) "سەبارەت بە (تت.) (ووشەی تازە داتاشراو) چ سیاسەتیکت هەیە"؟ ئەم پرسیارەتان چەند لقی لێ دەبێتەوە کە لە شوێنێکی دیکەدا باسیان دەکەم.

دەرباری ووشەی تازە داتاشراو لە قاموسدا (ل/ ٦١)زور بە توندی دواوم، من مخالفی ئەوەم هەر کەس دەستی قەلەمی گرت هەق بدا بە خۆی ووشەییکی نوێ بۆ زمانی کوردی دابتاشێی، بەلام تعصبی کوێرانەی میللی لە لایەک و(اظهار فضل) و (فضل فروشی)

بە سەر خەڵکا لە لایێکی ترەوە کارێکی وایان کردوە کە ووشە داتاشین (بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٥٨ەوە) چەشنی (وەبا)و (تاعون) بڵاو بێتەوە و لەم ماوەیەدا بە صەتان ووشەی نارەسەنی بێ سەروپێی بێ دایک وباب بپەستێورێنە ناو زمانی کوردی کە لە (نارەسەنی) دا هیچیان لە (بەروار)ە کەی من (تم: قاموس، سەرەتا، ل / ٦١)کەمتر نین. ملاحظە بفەرمون، ووشەی (باکوور = شمال) کە بەلای منەوە ووشەییکی رەسەنە و زیندو کراوەتەوە سەر سەروسەرچاو، بەڵام نازانم کێ هاتوە لەسەر وەزنی (مشرق، مغرب) لە بەرانبەر (باکوور)ی رەسەندا (باشوور)ی نارەسەنی لەباتی (جنوب) داتاشیوە، هەر وەها ووشە گەلی (رامیاری = سیاسەت) و(راژە = خزمەت)، (وێژە = ئەدەب، ئەدەبیات)، (پەراو = کتێب) و صەتان ووشەی تری لەم بابەتە.

کاری داتاشینی ووشەی تازە بۆ هەر زمانێک دەبێ بەو ڕیبازە مێژوویی یەدا بروا کە ووشەکانی ئەو زمانە لە سەفەری تاریخی خۆیاندا پێیدا ڕۆییشتون، هەر وەها رێکخستنی دەستور بۆ هەر زمانێک دەبی لە سەر بناغەی ئەو (قاعدە)انە بێ کە بە تێپەربونی رۆژگاران و لە ئەنجامی گەشە کردنی زمانەکەدا بە شیوەییکی تەبیعی دروست بوون، بەڵام بەداخەوە هەم داتاشینی ووشە و هەم دانانی دەستوری زمانی کوردی کەوتۆتە ژیر تەئسیری زمانانی بێگانە، وای دابنێ کە خوێندەوارێکی کورد زمانی ئینگلیسی باش دەزانێ ئەم خوێندەوارە دێنی ووشە و اصطلاحاتی زمانی ئینگلیسی تەرجەمە دەکا بە کوردی و وشەیەک دادەتاشێ، یا خۆ بابەتەکانی(گرامر)ی زمانی ئینگلیسی بە سەر زمانی کوردیدا تطبیق دەکا و دەست دەکا بە گرامر نوسین بۆ زمانی کوردی. یا خۆ یەکێکی دیکە لە زمانی (فرانسە) یا (ئەلمانی) یا (عەرەبی) شارەزایە، هەقی ئەوە دەدا بە خۆی کە لەم زمانانە دا ـ لە ووشە و بابەتەکانی دەستوری زمان ـ هەرچی عەقلی گرتی بۆ زمانی کوردی بخوازێتەوە، لێرەدا من خۆشم بەلاوە نانێم و دەڵێم کە لە لایەن دەستوری زمانەوە، دەستوری زمانی فارسی تا رادەیەک کاری لێ کردوم بەڵام سەرەرای خزمایەتی زۆر نیزیکی (کوردی) و (فارسی) خۆتان دەزانن کە زانا بە ناوبانگەکانی فارسی زمان لەو باوەرە دان کە هێشتا (فارسی) خۆی دەستورێکی کامڵی نیە و هێشتا دە هەوڵی ئەوە دان دەستوریکی ریک و پێکی بۆ دانێن. قسەمان لە سەر ووشەی تازە

داتاشراو بو کە کەوتینە باسێکی تری پیوەندی هەیە بەم جورە ووشانەوە، پرسیارەکەتان دەبارەی ووشەی (تت .) پینج پرسیاری فرعی لێ بوونەوە بەم جۆرە:

ئەلف - چ ووشەییکی تازە داتاشراو تومار دەکەی؟
ب - بۆ چی ووشەی (تت .) تۆمار دەکەی؟
ج - سەر چاوەی ئەو ووشانە چن؟
د - ئایا ووشەکانی "کوڕی زانیاری" دەخەیە نێو قامووس یان نا؟ بۆ؟
هـ -ئایا ووشە داتاشراوەکانی پێش دامەزرانی کۆر وەک "زاراوەی زانستی" کوردی، (نەقابەی مامۆستایان)، یان "هەندێک زاراوەی زانستی" (جەمال نەبەز - ۱۹٦۰) دینە نیوقامووس؟

ووشەی داتاشراو دەکرێنە چەند بەش:
۱ـ ئەوان ووشانەی کە لە زمانی کوردیدا هەبون و لەم دوایانەدا (زیاتر لە کاتی شەری دوەمەوە) لە لایەن نوسەران و ئەدیبانی کوردەوە، دەلالەتێکی تازەیان بۆ دۆزراوەتەوە و بە مانایەکی تازە لە نوسین دەکار کراون وەکو:

**لیژنە** = کۆمەڵێ داری سوتەنی کە لە سەریەک کەڵەکە کرابێ. لە مەڵبەندی شاربازێری سلەیمانی کە لێرەوارە خەلکی سادە و نەخوێندەوار بەو مانایە دەیلێن، نوسەران وئەوانەی بە کاری سیاسییەوە خەریک بون، ئەم ووشەیان لەباتی (کۆمیتە) یا (کومیسیون) دەکار کردوە.

**کۆمار** = لە ئەسلا لە ناو خێلاتی کۆچەری کورد ووشەی مرکبی (سەر کۆمار) بە مانای رەئیسی تیرەیەک لە عەشیرەتێکی کوچەری کورد، دکار دەکرێ: (سەر کوماری

عیلی ڕۆغزایی، ڕۆغزایی تیرەیەکن لە عەشیرەی جاف)
ئێستا ووشەی (کومار) لە باتی ڕێژیمی جەمهووری و
(سەرکومار) لە جیاتی (پریزیدنت) دەکار دەکرێ و جێگەی
خۆشیان گرتوە، تەنانەت خەلکی نەخوێندەواریش قبوولیان
کردوە.

٢- هەندیک ووشە لە لەهجەکانی دیکە ـ زیاتر باکوری ـ خوازراونەوە و لە زمانی یەکگرتوی ئەدەبیدا بە مانای خۆی یا مانایەکی تر برەویان سەندوە، وەکو:

**خەبات** = لە لەهجەی باکوریدا بە مانای (کار، شغل)ە
و مەصدەری(خەبتین) بە مانای کار کردن، کە خوازراوە تەوە
بۆ زمانی یەکگرتو، مەصدەرەکەی نا بەلکو (نێتو)ە کە
هاتوە و بە مانای (مبارزە سیاسی) دەکار کراوە، مەصدەری
مرکبی (خەبات کردن) و (خەباتکەر، خەباتکار) یش لێ
داتاشراوە و زۆر باش چەسپیوە و تەنانەت بۆتە ناو بۆ
کوران و کچان.

**هەڤاڵ** = ئەم ووشەیەش لە لەهجەی باکوریڕا هاتوە و بە
مانای (ئاواڵ)ی موکریانی خۆمانە، بەلام ئێستا تەنیا بە
مانای (ڕەفیقی حزبی) جێگەی خۆی کردۆتەوە وهاوتا
ناوەندیەک ئەو مانایە نادات، بۆتە ناویش بۆ کوڕان.

**مرۆڤ** = پیاو، ئینسان، بەشەر.
زور ووشەی دیکەش لەم چەشنە هەن کە خوازراونەوە یا دەلالەتێکی تازەیان بۆ هاتۆتە گۆڕێ و برەویشییان سەندوە و لە ڕێزی ووشە ڕەسەنەکانی کوردیدا جێگای خویان

کردوتەوە، ئەو جورە ووشانە لە قاموسدا تۆمار دەکرێن.

٣ـ هەندێ ووشە واصطلاحاتی (زانستی، سیاسی، کۆمەلایەتی و...)ش هەن کە راستەوخو لە زمانانی ترەوە وەرگێردراونە سەرکوردی. ووشەکانی "زاراوەی زانستی کوردی" (نەقابەی مامۆستایان) و "هەندێک زاراوەی زانستی" (جەمال نەبەز) و هەروەها ووشەکانی "کوری زانیاری کوردی" بەشێ لە ووشەکانی "ئەستێرە گەشە" فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی (فاضل نظام الدین) کە وەک من بیزانم بێ ئەوەی ناوی بێنێ زوربەی زوری ووشە زانستییەکانی هەر لە (جەمال نەبەز) وەرگرتوە و هەر وەها ووشەکانی "فەرهەنگی زانیاری وینەدار عەرەبی ـ ئینگلیزی ـ کوردی" ش لەوانەن. ووشە گەلێ کە لە سەرەوە باسم کردن و پاشانیش هیندێک نمونەتان عەرز دەکەم زوربەی زوریان رێگەیان لە "قاموس" ناکەوی، چونکو هیندە نارەسەنن هیندە نالەبار داتاشراون کە پاش چەند سالێکیش (هیندیکیان ـ ئی جەمال نەبەز ـ نیزیکەی بیست سال) هێشتا نە لە نووسێن و نە لە سەر زاروزمانی خەلکی نەیانتوانیوە جێگەیەک بۆ خۆیان بکەنەوە ژمارەیەکی کەمیشیان لەوانەن کە وەبەر تاریفی (١، ٢) دەکەون ولە قاموسا دەنوسرێن، تکایە سەرنجیکی ئەم ووشانەی خوارەوە بدەن:

بازنە دراوە، بازنە دراوەکە = الدائرة المفروضە

بازنەی کارەبایی = الدورة او الدائرة الکهربائیە

بازنەی لی کەوت، بازنەلی کەوتەکە = دائرة القاس

( ئەستێرە گەشە، ل / ٤١ )

سێ گۆشە = مثلث، شکل ثلاثی او مثلث الاضلاع

سێ گۆشەی جوت لا = مثلث متساوی الساقین

سێ گۆشەی جیا لا = مثلث مختلف الاضلاع

سێ گۆشەی گوشە تیژ = مثلث حاد الزاویە

سێ گۆشەی گۆشە کراو = مثلث منفرج الزاویە

سێ گۆشەی وەستاو = مثلث قائم الزاویە

سێ گۆشەی یەک لا = مثلث متساوی الاضلاع
سیانە = الثالوث، ثلاثی
سیانەی جوت باسک = مثلث متساوی الساقین
سیانەی جیا باسک = مثلث مختلف الاضلاع
سیانەی یەک باسک = مثلث متساوی الاضلاع
( **ئەستێرە گەشە: ل ٤٦٠، ٤٦٦، ٤٦٧** )
دەزولکەی خوینین = الشعیرات الدمویە (رەگی زور باریک)
دەریا لوش = المحیط (ئوقیانوس)
دلە ماسولکە = العضلە القلبیە
رە نوس = الرقم (عدد ــ فارسی ــ)
(ئەستێرە گەشە: ل / ٣١٧ ، ٣٦٢)
اکلیل الملک (crown imperial) کنێرە، شاگولبەند،
گولبەندی شا، حندقوق melilot، sweet clover
سێ پەرەی شیرین، کنێرە
(فەرهەنگی زانیاری وینەدار، ل ١١، ٣٣)

ملاحظە دەفەرموی (شاگولبەند و گولبەندی شا) تەرجەمەی راستە و خۆی (crown imperial) وئەویش تەرجەمەی (اکلیل الملک) و(سێ پەرەی شیرین)یش ئی (sweet clover)ە کە کوردی هیچ کاتی (گولبەند)ی بە مانای دەسکە گول یا تاج گل (فارسی)، کە مانای (اکلیل)ی عەرەبییە دەکار نەکردوە.

٤- کۆمەڵێک "ووشەی" دیکە هەن کە "تعصبی میللی کویرانە" و "قیاسی غەلەت" دایتاشیون و ناچنەوە سەر ئەسلێکی کە دەگەل مانای ئێستایان تەنانەت بۆرە پێوەندیکیشی هەبێ:

**راژە** = خزمەت: دەبێ لە (راژاندنی لانک)ە وە وەرگیرابی کە گۆیا ئەم راژاندنە خزمەتی مندال دەکا!؟

**وێژە** = ئەدەب، ئەدەبیات: پەیوەندیکی دەگەل (بوێژە = بلێ و قسەبکە) هەیە، بەلام ئەدەب وئەدەبیات قسەکردن نیە.

**باشور** = جنوب: لام وایە هەر بۆ ئەوەی دەگەڵ (باکور)ی رەسەن لە سەر وەزنیک بن داتاشراوە!

**ڕاڤە** = شرح، تفسیر: نازانم لە کوێراهاتوە، لە لادیی خومان (ڕاوەک) مان هەیە کە ماست و دۆ و... تیدەکەن بەلام چ مناسەبەتێک لە نیوان (پالاوتن) و (شرح و تفسیر) دا نابینم .

**واتا** = مانا، معنی: یعنی، ئەم ووشەیە و(واتە)ش بە مانای (کەوا بێ، کەوا بوو، ئەگەر بەم جورە بێ)یە، بەلام بە مانای (یەعنی؟...)

٥ــ بە مەنزوری لێک نیزیک کردنەوەی زمانی (کوردی) و (فارسی) و بۆ کەم کردنەوە و لە ناو بردنی فەرق و جیاوازی ووشەکانیان، سەرو گوێلاکی هێندی ووشەی فارسی یان کوردی، تێک شکێنراوە، (دەنگ)ە کانیان سەنگ وسوک کراون و بەم جورە کۆمەڵێ ووشەی نارەسەن هاتونە مەیدان و بە ناوی ووشەی زمانی کوردی تۆمار کراون و خویندەوارانی کورد وەک ووشەی (رەسەن)ی کوردی دەیانقۆزنەوە، "فەرهەنگی ایەالله مردوخ" لەم جورە ووشانەی کەم تیدانیە. ئەم دو دەستە لە (٥،٤) دا باسی کران بەو مانا داتاشراوانەی ئیستایان نانوسرێن و ئەگەر بوم دەر بکەوی کە ووشەی (رەسەن)ی کوردین و بە پیی سیاسەت و بەرنامەی "قامووس" جیگەیەکیان دەست بکەوی، لە شوێنی خۆیاندا تۆمار دەکرێن.

٦ــ لە پرسیارە فرعیەکانتان دەر بارەی ووشەی (تت .) پرسیاریکیان (ج ــ سەر چاوەی ئەو ووشانە چن؟) بەلامەوە رون نیە و نازانم مەبەستتان لە (سەر چاوە) چیە؟ ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کە من ووشەی (تت .) لە کوێ دێنم؟ ئەوا دەبێ بلێم لەو

سەرچاوانەیان ڕا دێنم کە باسم کردون یا خۆ لە کتێب و ڕۆژنامە و...و لە ڕێگای بیستنەوە دێنەدەستم. خۆ ئەگەر مەبەستیش ئەوە بێ کە ووشەی (تت .) لە کوێ ڕاهاتون، ئەوا لە سەرەوە باسم کرد کە ووشەی تازە داتاشراو چۆن پەیدا بون و دەبن و چۆن داتاشینی ووشەی تازە وەکو (ئاهۆ)یەکی زمانەوانی لێهاتوە و هەر کەس لە بەر خۆیەوە ووشەی دادەتاشێ و ئەو داتاشینە بەشی زۆری دەگەڵ ریبازی تطوری زمانی کوردی، دەگەڵ شێوەی ئیشتیقاقی لە زمانی کوردیدا و دەگەل دەستوری زمانی کوردی ڕێک ناکەوێ.

و ــ (پرسیاری ــ٥ ) ئەم پرسیارەشتان دو بەشە، کە جیاجیا وەڵامیان دەدەمەوە:

١ــ ئایا ووشەکان چۆن کۆ دەکەیەوە؟ نیزیکەی ٨٠ سەر چاوەت نوسیوە (لاپەرەی ١٠١ــ ١٠٦). بێجگە لە وانە چۆن لە زمانی خەلک ووشە کۆ دەکەیەوە ؟

کاری کۆکردنەوەی ووشە بەم جورەی خوارەوە ئەنجام دەدەم :

A/ ئاشکرایە خۆم هیندێک ووشەی کوردی دەزانم.

B / لە سەر چاوەکانی کە باسم کردون کەلک وەردەگرم.

C / لەو مەڵبەندانە کە گەڕاوم گەلێ ووشەی تر فێر بوم.

لە وانەش بگەڕێتەوە هەمیشە خەلکی گەلێ ناوچەی کوردستان دەبینم ووشەیان لێ وەردەگرم بەڵام بەراستی ووشە کۆکردنەوە لە زمانی خەلکی، بە تایبەتی خەلکی سادە ونەخوێندەوار و نیمچە خوێندەوار، زور دژوارە، چونکو لە وولاتمان فاسیلەی نیوان خوێندەوار و نە خوێندەوار (هیچ نە بێ لە بەر چاوی نەخوێندەوارەکە) گەلێکە، کابرای نەخوێندەوار لای وایە خوێندەوار هەمو شتێک دەزانێ یا دەبێ بزانێ، بۆیە کاتێ ووشەیەکی سەرنج ڕاکێش لە دەم کابرایەکی سادە دەردەچێ و بۆ ئەوەی چاکتری تێ بگەی لیێ دوپاتە دەکەیتەوە، کابرا دەم و دەست لە دڵی خۆییدا وای دادەنێ کە دەتەوێ گاڵتەی پێ بکەی، دەنا چۆن تۆ کە خوێندەواری و (هەموشتێ دەزانی) ووشەیەکی کە لای ئەو هیچ نیە، تۆ نایزانی و لەوی دەپرسیتەوە؟ هەر چەندیش زیاتر تێ بکۆشی و هەوڵ بدەی تێی بگەیینی کە بەراستی تو ئەم ووشەیە نازانی و مەبەستت ئەوەیە فێری ببی، کابرا

زیاتر وا دەزانێ گاڵتەی پێدەکەی و زیاتر دەمی خۆی دادروێ. سەرەڕای ئەوانە هەموی، من لە بەر موقعیتێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی کە بۆم ڕوخساوە کۆمەڵێکی زوری خەلکی جوربەجور دەناسم کە لە خەلکی دیکە هاسانتر بە دەستمەوە دێن، وەلامی پرسیارم دەدەنەوە، ئەگەر چی گەلێ جار توشی ئەوە هاتووم کابرا پێم دەلێ: "قوربان جا ئەوە چیە، چۆن جەنابت شتی وا نازانی؟" یا خۆ زەردە خەندەییکی دێتێ و بێ دەنگ دەبێ. بەم حالەشەوە ئەگەر لە خەلکی ناوچەیێکی معینی کوردستان ووشەییێکم بیست و لە وانە بو کە نەیزانم و نەم بیستبێ، لە چەند کەسیکی دیکەی خەلکی ئەو ناوچەیە دەپرسمەوە، کاتی بۆم دەرکەوت و دلنیا بوم کە ووشەیێکی رایجی ناوچەیەکە و خەلک لە قسەکردنا بەکاری دێنن ئەو جار فیشێکی بۆ دروست دەکەم و لە شوێنی خۆی هەلییدەگرم، پاشان هەوڵ دەدەم لە شیعری شاعیرانی کۆن، قسەی ئەستەق ومەتەلی کوردیدا بیدوزمەوە. هەر وەها تێدە کۆشم بزانم کە لە چ ناوچە و مەلبەندیکی دیکەشا بەکاردیت یان نا؟ ئەسل و سەرچاوەی ئیشتیقاقی بدوزمەوە. ووتم کە کۆکردنەوەی ووشە لە دەم خەلکی نەخوێندەوار کارێکی دژوارە، بەلام لەویش گرانتر و دژوارتر، کۆکردنەوەی ووشە لە خەلکی خوێندەوارە، چونکو کابرای خوێندەوار بە ئارەزوی خۆی و لەباری سەرنجی خۆیەوە مانات بۆ لێکدەداتەوە و توشی (تناقض)یک دەبێ سەرت لێ دەشێوێ و لە وانەشە ووشەیەکی (رەسەن)ی کوردی بە جاریک سەری تێدابچێ، لە خوارەوە نمونەیەکتان عەرز دەکەم: لە مەلبەندێ کە پێی دەلێن (بان سیروان) و دەکەوێتە دەورو بەری چۆمی (سیروان)ی بە ناوبانگ، (مەلا)یەکی تێگەییشتو بە هۆی دۆستێکی مشترکمانەوە کۆمەلێ ووشەی بۆ ناردبوم کە گەلیکیان لای خۆم تۆمار کرابون، سەرەرای ئەوەش من هاتم و کومەلە (فیش)ێکی تایبەتیم بۆ هەموو ووشەکانی ساز کرد، چونکو لەو باوەرەدام کە ئەم ناوچەیە (بان سیروان) دەگەل مەلبەندی (ژاوەرو)ی ئەو دیوی سنور لەو شوینانەن کە ووشەی کوردی رەسەنایەتی خۆی تێدا پارازتوە، هەر وەکو (هەورامان) نەک هەر رەسەنایەتی ووشە بەلکو شکلی کونی گەلی ووشەی بەو جۆرەی کە لە دەوروبەری بلاوبونەوەی ئیسلامەتی دا هەیان بوە ڕاگرتوە. لە ناو ئەو ووشانەدا کە نەم بیستبون ووشەی (بانگەشە) بو کە ماموستا بە (دعایە) یەعنی (تبلیغات propaganda)

مـانای لیّـدا بۆوە، خـوالیّـخۆش بو مـامۆسـتـا (گـیـو)یش ئەم ووشـەیەی بە دو شکڵی (باڵگاشە)و (بانگاشە) هەر بەو مانایەی نوسیوە، کە تەماشای سەرو شکڵی ووشەکەم دەکـرد لەوانە نەبو تازە داتاشـراو بێ تا مـانای (پروپاگـەندە) بدات، چونکو مـەفـهـومی پروپاگـەندە خـۆی تازە هاوتۆتە ناو کـۆمـەڵگا و زمـانـی کـوردیەوە و ناچێـتـە عـەقلەوە ووشـەیەکی (کـۆن) ئەو مـانا (تازە)یەی هەبێ، بەڵام لەو باوەڕەش دا بووم کـە ئەو (مـاموستا )یەی ووشەکەی بو ناردوم لە خوڕا نەینوسیوە و بێ گومان لە مەڵبەندی (بان سیروان) بەکار دێت بەڵام بۆ چی؟ و بە چ مانایەک؟ ئەوەیان جێگەی دو دڵی بو. ئەوجار کـەوتمە سـەروکـاری (تجـزیە)ی ووشـەکـە بە لای خـۆمـەوە بۆم دەرکـەوت کـە لەم کـەرتانە پێکهاتوە [بانگ + ا ـ ناش + ە ـ ئە/ا] کە هاومانای (ئاش بە تاڵ)ە لە واقعیدا مەدلولێکی پرۆپاگەندەشی هەر تێدایە، ئیتر بە دڵنیایی تۆمارم کرد و لەبەرگی دوەمی قاموسا (ب) کە هەر ئێستا لە بەر دەستمە و ئامادەی دەکەم بۆ چاپ، دەیبینن.

٢ـ"لە فەرهەنگی (خاڵ)و (مەهاباد) چۆن کەلک وەردەگری؟"

ئەم دو قـامـوسانە کۆمـەڵێ زور ووشـەیان تێـدا تۆمار کراوە، من هیـچ ووشەیەک نانوسم کـە تەعـقـیقم نەکردبێ. بە ڕاسـتـیش هەڵاواردنی ووشـەی (ڕەسەن) و (نـارەسەن) لێکتر خۆی کاریکی دژوارە هیچ، مەسەلەی کەلک وەرگرتنی لەو دو قاموسانە و هەمو کتیب و نامیلکەییکی تریش کە بە ناوی (فەرهەنگ) یا ناوەروکی "فـەرهەنگ" نوسراون لە دژوارتریش دژوارتر کـردوە. وەکـو دەزانن ئەم دو قـامـوسـانە لە وانەن کـە کـردومن بە سـەرچاوە بۆ "قـامـوس" و سـەرچاوەیەکی گـەلێ باشیـشن بەڵام لە ووشـەی "داتاشـراو" و "نارەسـەن" خـالـی نین، ڕەسـەنەکـانیـان لەوانەن هەمـو کوردێـک (کـەم یا زۆر) دەیانزانی و منیش لە لای خـۆم نوسـیـومن، هەندیک ووشـەشـیـان تیـدایە کە لە ئاخـافـتنی ڕۆژانەدا خـەلـک دەکـاریان ناکـا و بەسـەر زمـان خـەلکەوە نین من هەمـو ئەو جـورە ووشـانـەیان لێ وەردەگرم و ئەگەر لە وانە بن کە خۆم نەمزانیبن یا بە مـەعنایەکیـان ئەم بیستبن سەر چاوە کەشیان دیاری دەکەم.

بێـجگە لەوانە من بو بن لەهجـەی(سنەیی) لە "فـەرهەنگی مـردوخ" و بۆ بن لەهجەی سلەیمانی وتیرای ئی "خاڵ" لە ئی مـاموسـتـا (توفـیق وهبی)ش کـەلک وەردەگرم

وهەر بەو جورەی لە سەرەوە باسم کرد کاریان لە سەر دەکەم.

ز- (پرسیاری شەشەمتان) "بۆ رۆژنامە و گوڤاری کوردی جیگەییکت داناوە یا نا؟"

روژنامە و گوڤاری کوردیم وەکو سەر چاوەییکی ثابت دانەناوە چونکو لە بەر دەستم دانین بۆ نمونە گوڤاری گەلاویژ کە لە سالەکانی پیش شەری دووەمەوە تا ۱۹٤۹ بە ریک وپێکی دەرچوە و یەکەمین گوڤاریکی ئەدەبی کوردییە کە هەولی داوە نوسینی کوردی بخاتە سەر ریگەییکی راست و رەوان و چاکترین سەرچاوەیە بۆ ئەم کارە، ئەمەش قەت مانای ئەوە نیە کە من ئەو سەرچاوە گرینکانەم بەلاوە ناوە و هیچ کەلکیان لێ وەرناگرم.

ح - (پرسیاری حەوتەم)، "لە نوسینی (کۆکردنەوە تا نوسین) قاموس دا بێجگە لەخۆت کەسی دی بەشدارە؟"

نوسین و ریکخستنی "قاموس" دەبی بکەینە چەند قۆناغ، بەم جۆرە:

A - کۆ کردنەوەی ووشە.

B - نوسینەوەی ووشەکان لە سەر(فیش) وجیا کردنەوەی ووشەکانی هەر دەنگێ لە دەنگە کانی تر و یکخستینان بە تەرتیبی ئەلف و بێ.

C - تەحقیق دەربارەی: رەسەنی و نارەسەنی، ئەسلی ووشەکە و سەر چاوەی پەیدابونی و پیوەندی دەگەڵ زمانە کۆنەکان .

D - دیاری کردن هویتی دەستوری هەر ووشەیەک، هاوماناکانی لە لەهجە و بن لەجەکاندا.

E - مانالیدانەوەی ووشەکان.

F - تێبینی بۆ هەر ووشەیەکی بە پیویستی بزانم (٦،٥،٤ لە سەر (فیش)ی هەر ووشە یەک دەنوسرێ).

G - نوسینەوەیان بە شکلی کتیب و ئامادە کردنیان بۆ

چاپخانە.

لەو کارانەی سەرەوە، تەنیا قۆناغی دوەم، (نوسینەوەی ووشەکان لەسەر فیش و...) هەر وەکو لە سەرەتای بەرگی یەکەمی قاموسدا (ل/٩٤) ئیشارە کراوە، کۆنە دوستێکم یارمەتی داوم و لە (أ ـ ی) ووشەی هەموو دەنگەکانی لە بەر ئەو دەفتەرانەی کە ووشەکانم بە بی تەرتیب تێدا نوسیبونەوە خستوتە سەر فیش و ئەوجار (فیش)ەکانی هەر دەنگیکی لیک جودا کردوتەوە و خستوێتە سەر یەک و بەو جورە ٥٢ جلد فیش کە هەر فیشەی تەنیا ووشەیەکی لە گۆشەیەک لێ نوسراوە هاتۆتە بەرهەم، لەو قوناغەدا فیشەکانی دەنگی (ء) کە ئیستا بۆتە بەرگی یەکەمی "قاموس" چوار بەرگ بون کە هەر ووشەی (بسیط ومجرد)یان تێدا تۆمار کرابو، پاش ئەوەی ئیشیان لە سەر کراوە و (مشتقات)ی هەر ووشەیەکیش هاتۆتە گۆڕێ، فیشەکان لە (٤) بەرگەوە بونە (١٠) بەرگ و باقی ئیشەکانی (٦) قوناغەکەی دی هەموی خۆم کردومن و بۆ ئەوەی کاری قۆناغی حەوتەم وەکو کتێبێکی دەسنوس بمینێتەوە، جاریکی تر ڕۆژبەڕۆژ بو چاپخانە نوسیومەتەوە ئەوەش پیویستە بڵێم کە دوای نوسینەوەی فیشەکان، کتێبە دەسنوسەکە دەدەم بە چەند کەسێکی کوردی زان و هەر کەم و کورێکی تیدا بدۆزنەوە ئاگادارم دەکەن.

ط ـ (پرسیاری هەشتەم)، "بە بێ یارمەتی کۆڕی زانیاری دەت توانی "قاموس"ە کە دابنیی و چاپی بکەی؟ "

١ـ کۆڕی زانیاری هێشتا دانە مەزرابو کە من دەستم کردوە بەقامووس دانان، یانی (کۆڕ) هەبا و نەبا من (قاموس)م دادەنا.

٢- خۆتان دەزانن چاپ کردنی کتێب پیویستی بە پوڵ و چاپخانە هەیە، ئەگەر ئەو دوانە نەبن هیچ کتێبێ چاپ ناکرێ، من هەر چۆنی بو پوولم بۆ چاپی قامووس پێکەوە نابو، لەم بابەتەوە بۆ چاپی بەرگی یەکەم (کوڕ) هیچ یارمەتێکی ماڵی نەداوم، تەنیا دوای تەواو بونی ..٢ دانەیان لێ کڕیوم (ئەمە پوڵی کاغەزی بەرگی یەکەمی دەرهیناوەتەوە). بەڵام بۆ مەسەلەی چاپخانە، ئەگەر چاپخانەی کوڕ نەبا لە چاپخانەی دی پوڵی زورتری دەویست لەوەی کە لە چاپخانەی کوڕ لییان وەرگرتوم و ئەوەندەش ئازاد نەدەبوم کار لە سەر فوڕمەکان بکەم. بە کورتی بەرگی یەکەمی قامووس لە سەر حیسابی

خۆم و لە چاپخانەی کوڕ چاپ کراوە ئەگەر چاپخانەی کوڕ نەبا نەمدەتوانی چاپی بکەم.

[تیبینی ـ کۆر بریاری داوە بەرگی دوەمی قاموس (دەنگی ب) لە سەر حیسابی خۆی چاپ بکا و ئیستا خەریکی نوسینەوەیم و ئەمەش بە ئەندازەی بەرگی یەکەم دەبێ.]

ی ـ "پرسیاری نۆیەمتان" دەربارەی بەسەرهاتی خۆم، پرسیارێکە کە من هەمیشە بەرانبەر وەلامدانەوەی دورە و پەرێز وەستاوم، زۆر کەس داوایان لێ کردوم بەسەرهات و خاطراتی خۆم بنوسم، بەلام هێندەم پێ ناخۆشە باسی خۆم بکەم دەستم ناچێتە قەلەم.

کاکە گیان دەبێ بەسەرهاتی یەکێکی وەکو من چ بێ؟ کورتە چیرۆکێکی کوردەواری هەیە نابێ نەتان بیستبێ، دەلێن کابرایەکی کورد مرد و فرشتەی خوا چون لێیان پرسی: من ربک؟ وەلامی دانەوە: چەوەندەرێکم خواردوە هەموی ڕەگ و پوکە! ئەوەندش کە لە "پێشگۆتن"ی قاموس دا نوسیومە ئەگەر بە پیویستێکی زور پیویستم نەزانیبا نەمدەنوسی و پاش نوسینیش لام وابو بۆ رون کردنەوەی بە سەرهاتی"قاموس" نەک "خۆم" ئەوەندە بەسە. هەر چۆنێ بێ وا لە خوارەوە ولامی ئەو وورده پرسیاری نۆیەمتان پەیدا بون بۆ دەنوسم:

١ ـ "لە کوێ دەرست خوێندوە؟" پێش ئەوەی بچمە مەدرەسە ئەلف وبێتکە و هەندێ وورده کتێب و قورئانم لە کن بابم خوێندوە و پاشان چومە مەدرەسەی ئیبتدایی (سعادت) لە (سابلاغ)ی ئەو دەمە و(مەهابات)ی ئیستا، بە پیی یاسای ئەوکاتە (١٣٠٦ـ شەمسی) سێ کلاسی (١،٢،٣) ئیبتیداییم بە سالێک تەواو کردوە و چومە کلاسی چواروم و شەش کلاسەی ئیبتداییم بە چوار سالان ئیمتیحان داوە. پاش ئەمە هێندیک لە گولستانی سەعدی و چەند لاپەرەیەک قواعیدی عەرەبی (صرف میر)م لە مزگەوتی هەباساغای لای ماموستا (مەلا بایزی زگ دڕاوی) خوێندوە، لای مامۆستام (مەلا قادری مدرسی) دەرسی (جەبر)م خوێندوە هەر ئەو ماموستایەم هەستی نەتەوە پەروەریی وەخەبەر هیناوە سالی ١٣١٧ چومە (رضائیە) و دەورەی هەوەلی دەبیرستانم وەکو داوتەلەبی خارجی ئیمتیحان داوە. ئیتر ئاو بێنە ودەستان بشۆ. ئێستا بۆتان مەعلوم بو: چەوەندرەکە چەندە ڕەگ و پوک بو.

٢ـ "چ سالێک لای ماموستا گیو دەرسی فرانسەت خوێندوە؟" وەک لە بیرم بێ ماموستا گیوی رەحمەتی سالی ١٩٣٢ هاتەوە مەهاباد و دوکانی عکاسی دانا لە کاروانسەرای سەید عەلی حسینی و کۆمەڵی لە لاوانی سابلاغ دەرسی فرانسەیان لە لا دەخوێند و منیش بۆ ماوەی چەند مانگیک دەرسم خوێند و پاشان لای ماموستا (مەلا قادری مدرسی) درێژەم پیدا.

پاش ئەمانە لام وایە هەر ئەوە دێنیتەوە کە بڵەین کەرەستە و سەرمایەی منیش بۆ قامووس نوسین وەکو گەلێ لەقامووس نوسانی کورد تەنیا هەستی نیشتمانییە، بەڵام جیاوازێکی بچکۆلە هەیە و ڕەنگە ئەوەی بۆ من هەڵ کەوتوە بۆقامووس نوسانی تر ریک نەکەوتبێ، چونکو:

A – هەستی نیشتمان پەروەری کردومی بەگەڕیدەیەک، کەم مەڵبەندی کوردستان هەیە نەم دیتبێ یا دەگەڵ خەلکی ئەوی ماوەی گفتوگۆم بۆ هەڵ نەکەوتبێ.

B – هەر ئەو هەستە، وای لێکردوم هەوڵ بدەم ئەوەندەی پیم دەکرێ و بۆم دەلوێ ئاستی زانینی خۆم بەرزکەمەوە و زانیارێکی گشتی (نسبتا) چاک پەیدا بکەم بۆ ئەوەی لە ڕاست خەباتکارانی دیکە بە خۆم دا نەشکێمەوە.

C – کاری نیشتمانی ماوەی چاو پێکەوتن و دانشیتن و گفتوگۆی دەگەل کوردی دانیشتوی مەڵبەندەکانی کوردستان بۆ روخساندوم و رێگای پرسیار هیچ، وەڵام وەرگرتنەوەشی بۆ تەخت کردوم.

٢ – "بیجگە لە چاپی نیشتمان و ئەو قاموسە، لە زمان و ئەدەبیاتدا چ شوێنەوارێکت هەیە وەک شیعر و چیرۆک و شتی وا".

جارێ لە پێش هەمو شتێکا نابێ "نیشتمان" بە شوێنەوارێکی ئەدەبی یا هەرچی تری من دابندرێ، چونکو من تەنیا لێپرسراوی چاپکردنی بوم و وێرای هاورێیانی دی مەقالەشم تێ دانوسیوە. لە رۆژنامەی "کوردستان" چاپی مەهاباد (سالی ١٩٤٥-١٩٤٦)، "کوردستان" و "خەبات" چاپی بەغدا (سالی ١٩٥٨-١٩٦٠) و رۆژنامەی "النور" ی عەرەبی و "روناکی" کوردی چاپی بەغدا (سالی ١٩٦٨ - ١٩٧٠) مەقالاتی سیاسی و ئەدەبیم نوسیوە، سالی ١٩٥٩ کۆمەڵە

شیعرێکم بە ناوی "ئاشتی خوازی لادێ یی" دەگەڵ کۆمەڵە شیعرێکی دوستم کاک حەسەن قزلجی لە یەک نامیلکەدا بلاوکراوەتەوە، لە رۆژنامەی کوردی "هاوکاری" چاپی بەغدا (١٩٧١-١٩٧٤) چەند مەقالەییکی ئەدەبی و میژوییم چاپ کراوە.

٤ - بۆ وەلامی (تێبینی) ئەم پرسیارەتان دەبی عەرزتان بکەم کە لە سالانی گەریدەیی و تاربونم لە وولات، بێجگە لە خەباتی سیاسی هیچ کار و پیشەیێکم نەبوە، چوار ـ پێنج سالێک نەبێ کە لە شاری بەغدا لە رەستورانیک وکاباریێ یەک شەوانە بەناوی (محاسب) ئیشم کردوە.

یا ـ (پرسیاری دەیەم) پێت وایە دانان و چاپ کردنی تەواوی "قاموس" چەند سالان‌دەخایێنێ؟

بەو جورەی کە دەتوانستی جیسمی و فکری خۆم رادەبینم، هەر بەرگێکی "قاموس" کە بە قەد بەرگی یەکەم ببی (نیزیکەی ٢٥٠ لاپەرە)، بەلانی کەمەوە، بۆ دانان و رێکخستن و چاپکردنی (ئەگەر هیچ کۆسپیکی لابەلای نەیەتە رێ) سالێکی پتر دەوێ و بەوجورەی بەراوەردم کردوە تەواوی "قاموس" لە دە بەرگ کەمتر نابێ، بەرگێکی چاپکراوە، بەرگی دوەمیش (ب) ئەوا بە دەستەوەیە و رەنگە تا یەک دو مانگێکی تر بخرێتە ژێر چاپەوە، بەم حیسابە باقیەکەی دەمێنێتەوە (٨) بەرگ (٨) سالی پێدەوێ.

یب ـ (پرسیاری ١١هەم) "بەرگی ١ی قاموس چەند ووشەی تێدایە"؟

ئەوەی راست بێ من لە پێشدا ئەو حیسابەم نەکردبو، کەم و زوری ووشە بەلامەوە ئەهمیەتێکی دەرەجەی دوی هەیە، بەلای منەوە ئەوەی لە دەرەجەی یەکەمی ئەهمیەت دا دیت (نوعیت)ی قاموسە نەک (کمیت). لە سەر پرسیارەکەی ئێوە بژاردم (١٢٤٩)ووشەی تێدایە.

کاکە ئەمیر گیان

وادەزانم وەلامی پرسیارەکانت تەواوبون، لێم ببورە کە وا وەدرەنگی کەوت بەلام کاتی دەیخوێنیتەوە هەقم بەلادا دەدەی کە ئەو وەدرەنگی خستنەم بە خۆڕایی نەبوە و دەبی زۆر سوپاسی ئەو کچە کوردەش بکەم کە لە نوسینەوەی وەڵامەکاندا یارمەتی دام دەنا هێندەی تر دوادەکەوت.

لەم ئاخرو ئۆخری نامەکەم دا شتێکم لە سەر زمانی یەکگرتو بیرکەوتەوە کە لە خوارەوە عەرزتانی دەکەم:

ئاشکرایە زمانی (نوسین) و (قسەکردن)ی هەمو نەتەوەیەک کەم و زور لێکتر جیاوازییان هەیە، خۆتان دەزانن ئەو (فارسی)یەی دەنوسری دەگەڵ ئەوەی قسەی پێدەکری هێندیک فەرقیان هەیە بەلام ئەوندە زور نیە و ئەوە وای لە من کردوە کە بۆ زمانی (کوردی)ش هەر سنوریکی ئاوا ڕە چاو بکەم.

کە دێتە سەر زمانی عەرەبی مەسەلەکە بە جارێکی دەگۆری چونکو ئەو (عەرەبی)یەی دەنوسرێ دەگەل ئەو (عەرەبی)یەی قسەی پێدەکری (لە هەر وولاتێکی عەرەبیش بە شێوەیەکی تایبەتی قسەدەکری) زور لیک جیاوازن و ئەوە کاری کردوتە سەر خوێندەواری کورد لە عیراق و لایان وایە زمانی نوسینی کوردی دەگەڵ ئی قسەکردن ئەوەندەی عەرەبی یا نیزیک بەو، دەبی لیک جودا بن. من ئەوە بە ڕاست نازانم و لام وایە کە زمانی عەرەبی بە هۆی شرایطیکی زور تایبەتی ئەو حالەتەی وەرگرتوە کە لە هیچ زمانیکی ترا نابیندری و بۆ هیچ زمانیکیش دوپاتە نابیتەوە.

ئیتر سەرکەوتنان داوا دەکەم

براتان زەبیحی

٧٨/٩/٢٠

هەر ئاشتی یە کە هەمیشە و
هەتا هەتایە سەر دەکەویت
"عبدالکریم قاسم"

# ئاشتیخوازی لادی ــ یی

ر . زەبیحی

پیشکەش بە هەموو ئەو کەسانەی لە پیناو ئاشتی و
ئاسایش، بەختەوەری نەتەوەکانی دنیا تی ئەکوشن .

بژی ئاشتی! بروخی شەرر!

# سەرەتا

ئەو نامیلکە بچووکەی کە خوێندەواری خوشەویست ئەکەویتە بەر چاوی، زەبیحی لە سالی ١٩٥٤دا نووسی و دای بەمن کە بوی چاپ بکەم لەژیر عنوانی « دەنگی ئاشتی لە لادی » بەلام لە مانگی پینجەمی ئەو سالەدا گرتن و بررین دەستی پیکردو ئەو کومەلە هەلبەستە کە دەنگی ئاشتی خوازانی لادی بوو لە بەر زەبرو زەنگی شەرر فروشانی دەوری شایەتی و بوئەوەی کەسی لەسەر کیش نەکریتە بەندیخانە سووتینرا.

بەلام دەنگی ئاسایش کپ ناکری، زەنگی برایەتیو دلسوزی ئاهەنگی راپەرراندنی جووتیران، هەلبەستی ئاشتی خوازانی لادی، روژ بە روژ بە وینەی نەمامی ئازادی لقوپوپی ئەسەند تا چواردەی تەمووزی پیروز وایکرد کە زەبیحی بگەریتەوە ئەو خاکەی کە لە سالی ١٩٥٤دا ئەو بانگەی تیا نووسیبوو ئەوا جاریکی تر نووسیویەتەوەو چاپی ئەکا.

زەبیحی بە نووسەر ناسراوە بەلام ئەگەر تەماشای ئەو (مەلحەمە)یە بکەین کە لە وینەی چیروکی نمایش ریکی خستوە بومان دەرئەکەوی کە لە مەیدانی هەلبەستیش دا ئەتوانی ئەسپ تاوبدا...

من کە ئەو هەلبەستەم خویندەوە زورم لاجوان بوو چونکە لە سەر زبانی لادی ـ یی و کرمانج ووتراوە، بەلی هەموو کەس تی ـ ی ئەگا، بیرو باوەری ئاسایش خراوەتە قالبیکی واوە کە خویندەوار خوی هەستی پی ناکا و کاتی بە خوی ئەزانی کە هەموو ئامانجی ئاشتی و هەموو گوناهباری شەرر فروش و سەرمایەدارانی استعماری تی گەیشتوەو لە دلیا چەسپیوە کە: ئاشتی ئەبی هەر سەر کەوی...

ئیمە لەو روژە داو لەو قوناغە دا پیویستی مان زور بە هەلبەست و چیروکی وا هەیە... جا لە ناو جەرگەی دلەوە پیروز بایی لە کاک زەبیحی ئەکەم بو نووسینی ئەو چیروکە.

محمد توفیقووردی

**بایز** - ئەری باپیری، پیری، کونەسال
چیتە دەنالی، هەر وەکوو منال
**باپیر** - بایز گیانەکەم دەردت لە گیانم
نەخوشم، نەخوش، تالە ژیانم
**بایز** - هەر ئیستە دەچم، بو لای، (مام رەحمان)
لەبوتی، دینم صەد، داوو دەرمان
(پوورە خەج )دینم، لیت وورد بیتەوە
ناوکت کەوتبی، بوت بینیتەوە
دوور بی! لە گیانت، ئەگەر باداری
« با بچینە سەر (وەیس )بە توبە کاری »
**باپیر** - بایز! دەلەی چی، خەیالت خاوە
کەر لەوی کەوتوە، کوندە لەو لاوە
راستە من پیرم، لەشم بیمارە
بو، بیماری لەش زوو دەکری چارە
یەکجار گرانە، ئەو جارە، دەردم
هەر بینا، دیتت لە ناکاو مردم
نە، سەر نیشەمە، نە، لەش بەبارم
نە بریندارو، نە دەردە دارم
دەردی من ئەو جار دەردی هەموانە
دەردی مسکین و گاوانو شوانە
دەردی کریکار، رەنجبەر و جووتیار
دەردی سەپانو پالەی رەنج خەسار
دەردی ئەو دایکەی، کوری کوژرا بی
بە گوللەی دوژمن، لەشی بیژرا بی

دەردی ئەو بووکەی، شەوی زاوایی
سەر ئەنیتەوە، شەو، بە تەنیایی
میردەکەی دەبەن، بو مەیدانی شەرر
بووک لە تاوانا، قورر، ئەکاتە سەر
دەردی منالی زمان، نەگرتوو
بە، تەقەی بومبا، گیان لە، لەش دەر چوو
جا بایزا!، یەکی، ئەمە دەردی، بی
نەک دەردی، بەلکوو، هەزار دەردی بی
بە (مام رەحمان) و (پووره خەج )ی تو
عیلاجی نایە، هەستە، زوو بررو
**بایز** - باپیر گیان ئەتو، جاران، وا، نە بووی
گەلی ساویلکە و، زور خومانە، بووی
ئەم قسانە چین، لە کوییان دینی
دەتوانی، ئەختی، تیمان، گەیینی
ئاشکرای، بکەی، ئەم سیررو رازە
ئاگادار ببین، لەم بیره تازه
**باپیر** - وەره تەنیشتم، بایز، براکەم
تا دەردی دلمت، لە بو، بەبا کەم
لەم روژانە دا، هەوای، شارم کرد
چوومە ئەو کەژە، باری دارم کرد
بارم لە کەر نا، ریگەم گرتەبەر
خوم گەیاندە شار، بەصد، دەردی سەر
دارەکەم فروشت، بە شەش، پەنجایی
سی پەنجاییم، دا، بە شەکرو چایی
چوومە چایخانە، پالم لیداوە
چاییم خواردەوە، ماندووم حەساوە

وەنەوزم ئەدا خەو ئەیبردمەوە
کە چی وورتە ـ وورت وووریای کردمەوە
لە تەنیشتمەوە، چەند، لاویکی شورر
لە دەوری یەکتر، بەستبوویان، کورر
قسەو، دەنگو باس، لە هەموو بابەت
باسی شەررو شور جووتو کەسابەت
یەکیان، منی دی لیم هاتە پیشی
کەوتە پرسیاری، ئەحوالی لادی:
"چونن؟ چون ئەژین؟ چونە ئاغاتان؟"
"بانگی ئاسایش، هاتوتە لاتان؟"
**بایز** - بوچی، پیت نەگوت، خاوەن ئیمانین
پینج فەرز نویژ ئەکەین، زور موسولمانین
مەلا، بانگ ئەدا، روژی پینج جاران
بەیان، نیوەرو، شەویو ئیواران
**باپیر** - زور بە تالووکەی، هیچ راناوەستی
کەرت بار ئەکەی، بەلام نای بەستی
من قسەم، هیشتا، ناگاتە سەر زار
تو! تو وەکوو، وورچ لیم دەچیە سەر دار
گو یچکەم، بو شل کە، دلتی بدەیە
لە ناو قسەم دا هیچ هەل مەدەیە
وەلامم داوە، بە لاوی شاری
"ئیمەین شوانە کەی حەق نادیاری"
مانای (ئاسایش) نازانین چیە
چونکوو لە لادی، ئاسایش نیە
زستان جووت ئەکەین، هاوین، دروینە
خواردنمان! تەنیا، دوینە و ترخینە

بەراتی (مەلا) و زەکاتی (ئاغا)
بەرتیلی (پولیس)، جەژنانەی (کویخا)
سوورساتی (چەتە) و دیاری بو (مدیر)
گشتی، لە سەر شان، جووتیاری فەقیر
ئینجا، لیرەدا، کورەی، خەلکی شار
هیجگار بە ژیری هاتەوە، ووتار:
« من، ماموستا بووم، چەند سال، لە لادی »
« هەمووی دەزانم، چیتان بە سەر دی »
« ئەوانەی ووتت، گشتی بە جی ـ یە »
« نموونەی راستی، ژیانی لادی ـ یە »
« لە شارەکانیش، حالی کریکار »
« ناخوشەو پرە لە دەرد و ئازار »
« وەکوو جووتیران، نەچەوسینەوە »
« دایم ایش نەکەن، ناحەسینەوە »
« گەلی، رەنج نەدەن، رەنجیان خەسارە »
« بو ئیستیعمارە، قازانجو پارە »
« هوی، چارە رەشی، ئیوە و کریکار »
« هیچ کەسی تر نیە، غەیری ئیستیعمار »
ووتم: کاکە گیان! ئیستیعمار چونە!؟
دیوە، درنجە، مررچە یا مونە!؟
مالی، لە کوی ـ یە؟ دوورە، نیزیکە؟
لە خەلکی نەکا، ئەم فاک و فیکە!
رەنگی چلونە؟ دیزە یا بوزە!
ناشیرنو پیسە، یا جوانو قو ـ زە؟
جحیلە، پیرە، کورتە، دریژە؟
عاقل و زورزان یا کاسو گیژە؟

قسەی راست، دەکا، یا دروزنە؟
ئادەمیزادە یا رموزنە؟
ئەگەر بەرازە! هەتا راوی کەم
ئەگەر، ریوی ـ یە، دەرمانداوی کەم
ئەگەر وورچیشە! بلیم بە لوتی
مەهاریکی چاک، بخاتە لووتی
بە زەبری قەمچی هەلی پەرینی
ئەگەر مانی گرت چاوی دەرینی
دی، بە دی، بی با، بکا مالە و مال
ئەو سا، کە پیر بوو، بیخاتە ناو چال
**بایز** - پەککو! مام باپیر لەو جانەوەرە
قسەی لی مەکە، هەر باسی سەرە
زووکە با بچین، بو مالی کیخوا
ترسم، ری نیشتوە ئیستیعمار، بمخوا
**باپیر** - میللەتان، دەخوا بایز: ئیستیعمار
نەک، پیاوی پیری، دەس بە چیوو دار
ئەو کورە شاریە، تیە ـ ی گەیاندم باش
ئیستیعمار، چی ـ یەو چون لیدەکا ئاش
کاتی کە بیستی، ئەوەی پیم ووتی
گەلی پیکەنی، لە پاشان ووتی:
« مامە! ئیستیعمار، ییکجار، زوردارە »
« وە سەر یەک دەنی، بە ملیون پارە »
« وورچو بەراز نیە، بەلام لەوانە »
« زیانی زورترە بو ئەم جیهانە »
« لە باتی ئارەق، شەرابی گولنار »
« (نەوت)، ئەخواتەوە (میستەر ئیستیعمار) »

« له هەر، وولاتى (ئەوت) ئەدوزنەوە »
« دوو، سى (ميستەر)ى لى قوت ئەبنەوە »
« ريشە دادەكوتن، وەكوو (گياكەلە) »
« تالانمان، ئەكەن، بە درو ــ و تەشقەلە »
« له هەر جى، يەكى، ميشك رزيو بى »
« دزو پياو خراپ، رەنگى دزيو بى »
« به پارە و پوول و، به ليرە و دولار »
« ميللەت، ئەفروشن به مام ئيستيعمار »
« ئيستيعمار، ديوە و، حەز، بە شەرر ئەكا »
« ئارەزووى مەرگى، گشت بە شەر ئەكا »
« وەک (كوندە پەپوو) عاشقى، ويرانە »
« مايەى شەرر و شور، لە گشت جيهانە »
« شەرر وەكوو (ئاشە)و ئەويش (ئاش وەستا) »
« بە شەر ئەهاررى وەک (ئارد) لە پەستا »
« ئەگەر ئەم خەلكە، هەمووى بكوژرى »
« بزەى پيديتى: چەكى ئەفروشرى »
« بو فروشتنى ( تانک) و (مەتراليوز) »
« له هاتو ــ چو، دان، هەميشە (باليوز) »
« هەتا بفروشرى (بومبا) و (فروكە) »
« هەزاران (منال) ئەكەونە نووكە »
« داگيرى ئەكا وولاتمان بە زور »
« تالانمان ئەكا ديوى، لەندەهور »
« كيشەوەى ئەكا نەوتو لوكە و رون »
« لەباتيان، دينى (جلو بەرگى) كون »
« خوريو گەنم و جو، دەبا بە ليشاو »
« ويسكيو براندى، دينى بە سيلاو »

**بایز** - من لەم قسانە سەرم سورر ماوە
شتی وا خەراپ، چون، هەر وا ماوە
بوچی، نایکوژن، خەلکی بە جاریک!؟
هەر کەس، لەبەر خوی تیلایەک، داریک
بدەن، بە سەریا، سەری بشکینن
لە خوینی خویدا باش بی گەوزینن
**باپیر** - بیدەنگ بە بایز، قسەم زور ماوە
قسەی، لاوی شار، هیشتا نەبراوە
منیش، لیم پرسی، وەکوو تو، کاکە!
ئەگەر، ئیستیعمار، هیندە ناپاکە؟
هەقی کوشتنە و، تویاندن وەک سەگ
سەر پانکردنەوە، بە لیسو کوتەک
ووتی: « راست دەکەی، مامە پیرە گیان »
« ریگەییک هەیە، زور سووکو هاسان »
« برای هاوپشتن، ئیستیعمار و شەرر »
« ئاشتی ئیستیعمار، ناگەری بی شەرر »
« شەرر نەبی حالی ییکجار کەنەفتە »
« بی شەرر، دەبیتە، ئاشی ئاو کەفتە »
« چەکی نافروشری، بازار کەسادە »
« خەزینەی بەتال، رەنجی بەر بادە »
« پەریشان نەبیو نابووژیتەوە »
« وەکوو میزەلدان نەپووچیتەوە »
« مشکە کویرەیە و لە بەر هەتاوی: »
« ئاشتی، ئیستیعمار، هەلنایە چاوی »
« میللەتان هەموو دەس دەنە دەس یەک »
« ناوی ئاشتی، بکەن بە کوتەک »

« بی دەن لە پشتی شەررو شەر خوازان: »
« مستی پولایی ئاشتی خوازان »
« لەم سالانە دا کورریکیان گرتوە »
« چەند پیاوی خیر خوا، یەکتریان دیتوە »
« (قەشە)ی مەسیحیو (مەلا)ی موسولمان »
« (بەرهەما)ی بوداو (سیک)ی هیندوستان »
« ئادەمیزادی رەش و سوور و زەرد »
« سپی ئەمریکا و ئەلمان و هولەند »
« زانای ئەتومیو عالمی دین »
« فەرەنگی، رومی، حەبەشیو چینی »
« داوایان کردوە: ژنو پیاو گشتی »
« تیکوشن هەموو، لە پیناو ئاشتی »
« چاک بی پاریزن لە هەموو دونیا »
« چەکی ئاتومی، بخریتە دەریا »
« نەمینی باسی خوینرژتنو شەرر »
« ناوی نەبیسری، لە کوولەکەی تەرر »
« تا ایستە زور کەس، بوتە ئاشتیخواز »
« دەولەمەند، فەقیر، پوشتە و بەلەنگاز »
« مەطران و مەلا، خەلیفە و قەشە »
« موریان کردوە و کیشایان نەخشە »
« چەکفروشی پیس هیچیان بو، نەما »
« دەستیان کردوە، بە چەقلە سەما »
« بی ناز کەوتوون، هیزیان لیبراوە »
« بوونەتە لوتی، طەپلیان دراوە »
« چەک لە عەمباران هەلیهینا ژەنگ »
« مالیان ویران بوو، هەر ساز نەبوو جەنگ »

« چەند سال لە مەو پیش لە وولاتیکی دوور »
« دەستیان دا هیندیک، چەقە و لووره لوور »
« بە کوتری سپیو لکی دار زەیتوون »
« هەزار پیلانیان کرا توون بە توون »
« ئیتر چت پی بلیم، مامە پیرە گیان »
« بە بی ئاشتی سەر ناگری ژیان »
**بایز** - بەخوا، راست دەکا، باپیر هەش بە سەر
"لە بیرت نیە سالی سەفەر بەر؟
کرا بە عەسکەر پیرو جحیلمان
بو ردین دەچووین رویی سمیلمان
لە (تەوریز) و (خو)، (صوفیان) و (دیلمان)
ریچکەی بەستبوو ئیخسیر و دیلمان
لە (ئەستەموول) و (وان ) و (باش قەلا)
جحیل هەلوەرین بە وینەی گەلا
لە قاتیو قرریو بیدەغلو دانی
چیمان بە سەر هات گشتی دەزانی
سەگو پشیلەش نەما، کە نەیخوین
کالە ــ کون کران بە شورباو دوین
**باپیر** - لە بیر کەس ناچن، بایز ئەمانە
بە چاوی خوم دیم لە نیزیک (بانە)
ژنیک و پیاویک لە تاو برسیتی
منالیکیان خوارد بە زیند ــ ویتی
دە حیساب نایە چەند خراپە شەرر
بو شەرر و شەرر خواز پیویستە قەمتەر
شەرر وەکوو (وورچ ) و شەرر خواز (سەگی هار)
گەرەکە بکرین قەمتەر و مەهار

با ، بوت تەواو کەم قسەی لاوەکە
گوی، بگرە چی ووت شوررە پیاوەکە
دەری هینا بوم کاغەزی، نووسراو
بە نووسین، پەنجە، ایمزا و مور کراو
ووتی پیم: « ئەگەر حەز لە شەرر ناکەی »
« هەوای فەوتانی گشت بە شەر ناکەی »
« ئەگەر ناتەوی: کورد بکوژری »
« بە گوللە و بومبا میشکی بپرژی »
« مەزراو کیلگەکەت بکریتە خەندەک »
« تی ـ یدا بنیژری، کەلاک و جەندەک »
« گەرمان پی بکا ، ئیستیعماری هار »
« بومبای ئاتومان لی بخاتە کار! ؟ »
« ها نامەی ئاشتی ئەتوش موری کە »
« با شەرر نەمینی بەرەو گورری کە »
ووتم: کاکە گیان، ئەمن جووتیارم
رەنجو ئازارە، گشت ایشو کارم
بەری جواناو و رەنجی حەفتا سال
خانویکی رەشە و چەند سەری پاتال
شەش حەوت بزنیشم هەیە، لە بو دو
« ئیتر ئاو بینەو دەستی خوت بشو »
خەلکی دی ـ یە کەش، وەک من بزانە
ژیانیان ناخوش و، پر ئیش و ژانە
سالی سەفەر بەر، شەرەکەی ئەلمان
هەموومان دیوە، بە چاوی خومان
شەررمان لا پیسە و ئەوی شەرر خوازن
وەکوو درندەو گورگو بەرازن

کوا؟ کاغەز بینە هەتا موری کەم
بی بەم بو لادی، گەلی زوری کەم
**بایز** - ئافەرین، باپیر تو ییکجار ژیری
بە راستی پیاوی خاوەن تەگبیری
ئیستا بە جووتە دەیبەین بو (رەسوو)
پاشان دەچینە مالی (مام ووسو)
**باپیر** - بایز، ها بگرە ئەوەتا کاغەز
هەلسە راپەرە بە گورجیو بەلەز
بیبە بیگیرەوە لە ناو اوایی
لە مال بخوازە، زوو مالاوایی
بچین بگەری ـ ین هەموو (شار باژیر)
نابی بوەستین لە کاری وا خیر
پاشان ئاوا بین بو دیوی (بانە)
سی ـ یەم قوناغمان لە (مەریوان)ە
نامە تەسلیم کەین بە چەند لاوی کورد
ئازا و زیرەکوو خاوەن دەسوبرد
قولی لیهەلکەن بە مەردایەتی
« دریغی نەکەن لە کوردایەتی »
(هەورامان) (جوانرو) (ژاوەرو) و (سنە)
(کرماشان) و قەسر) (لورر) و (زەنگنە)
(هەوشار) و (گەرووس) (سەقز) و (بوکان)
(مەهاباد) (سەردەشت) (سندووس) و (لاجان)
(شنو) و (مەرگەوەر) لە گەل (حەکاری)
ئەوجار بو (بتلیس) بکەن ئیلجاری
(مووش) و (خەرپووت) و (دیریک) و (ماردین)
(جزیر و بوتان) جیگەی مەم و زین

(سیرت) و (دیاربەکر) (شەرناخ) و (سیواس)
(عەفرین) و (عامود) (قامیشلی) و (دەرباس)
کوردستان هەمووی بە خوارو ژووری
لەناو، وولاتوو لە سەر سنوور
گشتی بگەرین ئاواییو لادێ
نامەکەی ئاشتی لە سەر چەقی ری
بکەن بە ئالا و ریزی لیبگرن
هەر کەسی رابرد پیشی پیبگرن
باسی بو بکەن: شەرر و شەرر خوازی
نافەوتی مەگەر بە ئاشتیخوازی
نیشتمانی کورد بکریتە قەلا
لە بو شەرر خوازان ببیتە بەلا
شەرر و شەرر فروشی ئەگەر نەمینی
کوردیش ئازادی بە چاو دەبینی
**بایز** – باپیر گیان وا من ئەچم بەرەو مال
مالاوا ئەکەم لە مال و منال
**باپیر** – زور باشە بایز منیش هەر وەک تو
دوعا ئەخوازم لە دایکی سمکو
لە بەر مزگەوتا ئەبم چاوەری
خیرا خوت ساز کە زورت پی ئەچی

***

بایز خوی ساز کرد زور بە دەسو برد
هاتەوە بانگی مام باپیری کرد:

***

**بایز** - ئەهوی مام باپیر دوژ دامەمینە
فەرموو با بروین بگەینە (وینە)
دەرمانی ریگا هەر، رویشتنە
نەخوشی گەورە، بیکار نیشتنە
ایشی زور گران ها لە سەرمانە
ریگەیی دوورە وا لە بەرمانە
**باپیر** - لە گەلتم بایز، بەلام بزانە
تەنیا، ئاشتی ریگەی ژیانە
ئەگەر شەرر ببی هیچ کەس نامینی
بومبای ئاتومی دنیا دەرمینی
دەنگی ئاشتیخواز بەر لەشەرر ئەگری
کەلکی ژیانی گشت بە شەر ئەگری
ئەگەر هیچ نەبوو کەلکی ئەم کارە
ئەوجارە ئیتر چارمان ناچارە
لە خاکی خومان، ئوردووی بیگانە
بو ـ ی ئەنی ـ نیەوە صەد داوو دانە
لە (لغاوگیر)ان پیشیان لی ئەگرین
سەرباز وەکوو کەو، بە توورری ئەگرین
جی مولگەی لەشکر شوینی فروکە
ویرانی ئەکەین دەیکەین بە لوکە
**بایز** - ئەگەر کوردستان لە بو ئاشتیخواز
ئەکری، ببیتە بەهەشتی پر ناز
دەیکەینە دوزەخ لە بو شەررخوازان
دەبی بسووتین، ئەگەر نەسازان
بال ئەگریتەوە، کوتری سپی
نامینی فەرقی رەش لە گەل سپی

له شوین کوندەبووی ناحەزی شەرر ساز
بولبول له گولزار دینینه ئاواز
بژی ئاشتی یو گشت ئاشتیخوازی
هەر بمری شەررو هەموو شەر سازی

گوڤاری رزگاری ژمارە ١ سالی یەکەم یەک شەمە ٢٠ نیسان ١٩٦٩

# مێژووی سوسیالیزم بە زمانی سادە

(ئەم وتارە لە لایەن ماموستا عیساوە بە تایبەتی بو گوڤاری رزگاری نووسراوە)

لەو روژەوە کە ئادەمیزاد لە ژیانی گیان لەبەری رووت و پەتی جیا بوتەوە و وەکوو گیانداریکی ژیری خاوەن هوش و فام خوی لە سەرزەوی ناسیوە، پیداویستەکانی بەربەرەکانی مانەوە (تنازعی بقا)و بی هیزی بەرانبەری گیان لەبەری تر، هەروەها پیویستی پەیدا کردنی بژیوی (ارزاق و المواد الاعاشیە) ناچاری کردوە هیزی خوی لە گەل هیزی چەند هاوجەشنیکی تری تیکەل بکا و بە کومەل بژی.

ژیانی بە کومەل هەر چەند، لە سەرەتاوە بە هوی (غریزەی بدایی)و بو پاریزگاری بەرانبەر مەترسی گیان لەبەرانی تر بە سەر ئادەمیزادا سەپاوە، بەلام بە کومەل ژیان خوی و گەشە کردن و پەرسەندنیشی بە تی پەربوونی روژگار صفەتی (حیوانی اجتماعی) بە سەر ئادەمیزادا بریوە و ئەوەندەی میژوو ئاگادارە ئەم صفەتە روژ بە روژ چاکتر و قوولتر ریشەی داکوتاوە و رەنگی خوی لە هەموو کەلین و قوژبنەکانی ژیانی ئادەمیزاد داوە.

ئاستی پیداویستی ژیان لە سەرەتای ژیانی انسانی ی ئادەمیزادا زور نزم بووە و پەپدا کردنی (بژیوی)یش ئەوەندە سادە بوە کە ماوەییکی دوور و دریژ ئادەمیزاد بژیوی خوی لە (طبیعت)و بە (خاو)ی وە دەست دەهینا و تەنیا بە نرخی ماندوو بوون لە سەری دەوەستا، ئەویش هەموو ئەوانەی پیکەوە دەژیان پی ی هەل دەسان، بە تەعبیریکی اقتصادی لەو سەردەمەدا (کلفە الانتاج) تەنیا ماندوو بوونی ئادەمیزاد بوو، واتە وەکوو مەتەلی کوردی دەلی ئادەمیزاد (رونی خوی لە سەری خوی دەدا) بە کوکردنەوە بژیوی یەوە ماندوو دەبوو (هیز)یکی (صرف) دەکرد، ئەو بژیوی یەی دەخوارد و (هیز)ە کەی لی وەردەگرتەوە، ئامرازی رەنیو هینان سەردەمیکی دوور و دریژ تەنیا چەنگ و پلی ئادەمیزاد و داروبەردی دەستکاری نەکراو بوو، ئادەمیزاد هیشتا کەلکە لەو سەودای (تملک)ی نەکەوتبوە سەر، یان هەر عەقلی پی نەشکا بوو بویە ئەو ئامرازە سادانەی رەنیو هینان

(ادوات الانتاج) پاش تطور و چاکتر بوونیشیان ملکی هەموو ئەو کومەلە خەلکە بوون کە پیکەوە دەژیان و کەلکیان لی وەردەگرت.

هەموو ریژیمیکی کومەلایەتی کە لە دەزگا جور بە جورەکانی ئیدارە و بیروباوەر و معتقدات دا خوی دەنوینی و بە تەعبیری زانستی پی ی دەگوتری سەرخان (البناء الفوقی) انعکاسی سیستیمی ئابووری واتە ژیرخان (البناء التحتی) ئەو دەورو زەمانەیە و پیویستە سەرخان لە گەل ژیرخان ریک بی و بگونجی هەر ناکوکی و ناریکی یەک لە نیوان ئەم دوو بەشەدا دەبتە هوی لە بەر یەک ترازان و هەلوەشانی سەر تا پای کوشکی کومەلایەتی و ئەوسا لە سەر کەلاوەی ریژیی پیشوو رژیمیکی نوی دادەمەزریت کە لە گەل سیستیمی ئابووری دا بە تەواوی ئەگونجی.

ئەو سەردەمەی کە لە سەرەوە باس کرا چونکوو سیستیمی ئابوری ناوکویی (الاقتصاد المشاع) لە گوری بوو، ئامرازی رەنیو هینان پیداویستی ژیان ملکی هیچ کەسی نەبوو، بویە ریژیی سیاسی کومەلایەتیش ناوکویی بوو ، سەر کوماری ئەو سەر دەمە (رئیس القبلە) کار و باری عەشیرەتەکەی بەریوە دەبرد و تەنیا صفتی براگەورەیی و ریش سپیتی هەبوو بو هەلسووراندنی ئبشوکار و خاوەنی جورە ئیمتیازیکی ئابووری نەبوو، هەموو ئەفرادی (عەشرەت) وەکوو یەک لە کارو باری کومەلایەتی دا بەشدار دەبوون - بەروبوو و دەسترەنجی هەر کومەلە خەلکیک هی هەمووان بوو کەس شستی تایبەتی خوی نەبوو، هەموو شتیک هی هەمووان بوو، خاوەنی شتومەک (عەشیرەت) بوو (چونکوو تا کە بناغەی کومەلایەتی ئەوسا بووە) نەک افرادی عەشیرەتەکە، هەر کەس (چەندەی بی توانیبا ئیشی دەکرد و چەندەشی توانیبا دەیخوارد) سیستیمیکی سادەی ناوکویی ئابوری و ریژیمیکی سیاسی ناوکویی سادەی متناسب لە گەل سیستیمی ئابوری ئەوسا، باری کومەلایەتی ئەو سەردەمە لە هەموو ریژیمیکی کومەلایەتی کە لە دوایی دا هاتوونەتە کایەوە، جیا کاتەوە. ئەو سەردەمە لە میژووی ژیانی ئابوری ئادەمیزادا بە کومەلی ناوکویی سەرتایی ناسراوە.

پەرەسەندن و بەرز بوونەوەی ئاستی ژیان و گەشە کردنی عەقلی ئادەمیزاد، پیداویستەکانی ژیانی زیاتر کرد لەمەش پیویستی چاکتر کردنی ئامرازەکانی رەنیو

هینانی هینا کایەوە بەخیوکردنی ئاژەل و پاتال و کەوی کردنی ئەو گیان لە بەرانەی بو ژیانی ئادەمیزاد پیویست بوون و پیویستی زور کردنی دەغلودان و دانەویلە، کومەلی ئەوسای کردە دوو مەجمووعەی رەنیوهین (منتج) بو دوو شیوەی ئەساسی رەنیوهینان (انتاج) کشتوکالی و حەیوانی، ئەمانە هەمووی بە تیکرایی وبەرە بەرە کنەیان لە ناو پیوەندیکانی رەنیو هینانی (علاقات الانتاج) کومەلی ناوکویی سەرتایی کرد تا لە قوناغیکی ژیانی انسانی ئادەمیزادا بە جاریک شیوەی رەنیوهینان و پیوندیکانی رەنیوهینان کەوتنە گیژاوی تناقضاتەوە و بناغەی کومەلی ناوکویی سەرتایی یان هەلتەکاند و ئادەمیزاد کەوتە سەر ئەو رەیبازەی گەشە کردن و پەرە سەندنی کومەلایەتی و ئابوری کە تا ئیستا پی یدا رویشتوە و ئیستاش هەر بە سەر ئەم ریگایەدا بەرەو پیشەوە هەنگاو دەنی.

لەو روژەوە کە پیوەندیکانی رەنیوهینانی (کومەلی ناوکویی سەرتایی) لە بەر یەک ترازاوە، مجتمعی ئادەمیزاد چەند جورە شیوەی رەنیوهینانی بە خویەوە دیوە کە هەر یەکە پیوەندی رەنیو هینانی تایبەتی خویان هەبوە و ریژیی سیاسی -کومەلایەتی (سەرخان) متناسب لە گەل سیستیمی ئابوری (ژیرخان)یان بو دامەزراوە، لە گەل تیک تەپینی کوشکی یەکەم کومەلی ناوکویی یەکەم (ظلمی اجتماعی)ش دەستی پیکرد، هەموو ئەو سیستیمە ئابوری یانەی لە دواییدا ئادەمیزاد لە سەر ریبازی پەرە سەندن و گەشە کردن تووشیان هاتوە لە سەر بناغەی چەوساندنەوەی چیینایەتی بوون، چینیک یا چەند چینیک خاوەنی ئامرازی رەنیوهینان بوون چینە رەنیوهینەکانیان چەوساندوتەوە.

وە نەبی ئادەمیزاد لە سەرەتای پەیدا بوونی زولم و زوری اجتماعی بە چەوساندنەوە رازی بووبی و بە هاسانی ملی کەچ کردبی، بەلکوو هەموو ئەو سیستیمە ئابوری و ریژیی کومەلایەتی یانەی ئادەمیزاد پاش کومەلی ناوکوویی سەرتایی بە خویەوە دیتوون ئەنجامی ئاوات و هەول و تیکوشان و خەباتی سەخت و خویناوی ئادەمیزادن بو لادانی ئەو زولم و زورە اجتماعی یە کە لە ئەنجامی هەلوەشانی کومەلی ناوکویی سەرەتایی، سەرتاپای کومەلانی خەلکی سەرزەوی گرتوتەوە.

ئادەمیزاد بو لادانی زولم و زوری کومەلایەتی و ناوەک یەکی ئابووری لە هەموو

ناست و ئاسویەکی ژیانی دا خەباتی کردوە، مفکرینی اجتماعی زور خەریکی چاککردنی کومەل بوون و تیوری جور بە جوریان بو دامەزراندنی مجتمعیک داناوە کە ئادەمیزاد بە بەختیاری و ئاسودەیی تی یدا بژی، ئیفلاتوون کتیبی (جمهوریت)ی نووسیوە و فارابی (مدینە الفاضلە) لە سەردەمی دەستەلاتی ساسانیکان دا (مزدا) بە ناوی پیغەمبەرتی دینیکی تازەی داهینا کە لە سەر بناغەی (ناوکویی) هەموو شتیک دامەزرا بوو، لە سەرەتای ئیسلامیتش دا (ابوذری غفاری) جورە بیرو باوەریکی ئیشتراکی دینی هەبوو، تا ناوەراستی چەرخی نوزدەهەم گەلی بیرورا و تیوری جور بە جوری سوسیالیستی کەوتبوە مەیدانەوە کە هەر یەکەیان بە شیوەییکی جیاواز لە گەل ئەوانیتر باری کومەلایەتی و ئابوری مجتمعی لیک دەدایەوە و لە باری سەرنجی خویەوە بو دامەزراندنی مجتمعیکی سوسیالیستی استنتاجی دەکرد.

ئادەمـــیـــزاد بو چاک کـــردنی ژیانی خـــوی، بو لادان و رامـــالینی زولم و زوری کومەلایەتی، هەر بە خەباتی (نەزەری)دا نەکەوتوە، بەلکوو بە دریژایی میژوو وە لە ژیر سیبەری سیستیمە جور بە جورەکانی ئابوری دا بو ئەم مەبەستە گەلی شورشی خویناوی روویداوە، شورشی دیلەکانی رومای کون کە بە شورشی سپارتاکوس ناوبانگی دەرکردوە، شـــورشی (زەنج) لە جـەنووبی عـــیـــراق، شـــورشی گـــەورەی فـــەرەنســـا ســـالی ١٧٨٩ز نموونەییکی ئەم جورە شورشانەن. بەلام ئەگەر (جەمهووریەت )ە کەی (ئیفلاتوون) دەردی کومەلی دەرمان نەکردوە و (فارابی) بە (مەدینە)ی خوی نەیتوانیوە هیچ برینیکی کومەل ساریژ بکات ئەگەر شورشی سپارتاکوس پی -ی نەکرا کە لەوەی دیلی وکویلەیی لە ئەستوی دیلەکانی روما دابرنی، ئەگەر کومونەی پاریس بوی نەلوا (ئازادی و وەلەیەکی و عەدالەت) بو مجتمعی فەرەنسا جی بە جی بکات، ئەگەر شورشی زەنج بوی نەکرا چارەرەشی جووتیارانی جەنووبی عیراق بگوری بە خوشی و بەختیاری، بە کورتی ئەگەر خەباتی (نەزەری) و (عەمەلی) ئادەمیزاد بو دامەزراندنی مجتمعیکی پر ئاسایش و خوشی بە ئانجام نەگەیشتوە، ئەگەریتەوە بو ئەوەی کە: دەمی تیژی خەنجەری خەباتی نەزەری و عەمەلی ئادەمیزاد لەم ماوە دوور و دریژەدا تەنیا ئاراستە کراوە بو چاککردنی دام و دەزگا و ریژیمی سیاسی کومەل (سەرخان)، ئاستی پیشکەوتن و زانستی ئادەمیزاد

نە گەیشبوە رادەی دوزینەوەی ئەم راستی یە کە (سەرخان)ی هەموو کومەلیک لە سەر (ژیرخان)ی کومەل (سیستیمی ئابوری)دادەمەزریت و بو گورینی (سەرخان) پیویستە ژیرخانیکی تازە واتە سیستیمیکی ئابوری نوی دابمەزریندریت.

کاروانی کومەلایەتی ئادەمیزاد وەکوو (کل)یکی یەک پارچەی پیکەوە نووساو نەکەوتوتە سەر ریگای گەشە کردن و پەرەسەندن، بەلکو وەکوو چەند پارچەی (کل)یک دەستی کردوە بە گەشە کردن و هەر بەشەی لە هەر سووچیکی دنیادا بە جیا و بە شیوەییکی تایبەتی منسجم لە گەل زروفی ناوچەی خویدا تطوری کردوە ئەگەرچی ئەو ریگایەی پی یدا رویشتوون هەر یەک بوە و لە ئەنجاما هەموویان ئەگەنەوە یەک، بەلام ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین بەشیکی مجتمع چەند قوناغیکی بریوە بەشی واش هەیە کە هیشتا یەکەم قوناغی تەواو نەکردوە، بە کورتی ئیمە ناتوانین قوناغەکانی تطوری کومەلایەتی بە خەتیک لیک جیا بکەینەوە هەر وەکوو ناشتوانین ماوەییکی دیاری کورت یا دریژ دابنی ین بو بەشیکی مجتمع کە قوناغیک لە قوناغەکانی گەشە کردن تیکەوە پیچیت، ئەمانە هەمووی سەر بە ظروفی (ذاتی) و (موضوعی) پارچەکانی کومەلن و هەر پارچەیەی بە گویرەی (ممیزات) و (خصایصی) تایبەتی خوی گەشە دەکا و خیراتر یاسست تر پەرە دەستینی.

لە نیوەی دووهەمی چەرخی نوزدەهەما مەسەلەی دوزینەوەی یاساکانی گەشە کردنی ئابوری کومەل - بە شیوەییکی متناسب لە گەل مستوای تطوری عەقلی و علمی ئادەمیزاد - تطوری کرد و نیزیک بووە لە (کەمال و واقعیت) ئابوری لەوە دەرچوو کە تەنیا ریوشوینیک بی بو پاشەکەوت کردن و مەعنای زور پەیدا کردن و کەم خەرج کردن بی و بەلکو بوو زانستیک (تحکم) لە هەموو گوشە و کەناری ژیانی کومەلایەتی ئادەمیزادا بکات وە کومەل ناسی (علم الاجتماع = سوسیولوژی) وەکوو زانستیکی نوی هاتە ریزی زانستەکانی ترەوە و سیاسەتیش لە چەنگالی نحتیکاری شازادە و بەگزادەکان رزگاری بوو (تەئمیم) کراو بوو بە زانستیک وەکوو هەموو زانستەکانی تر بخویندری و خەلک بتوانی فیری ببی، پاش ئەو رووداوە گرینگانە تطوری کومەلایەتی دەستی کرد بە خیرایی و هیشتا دە سالەی دووهەمی چەرخی بیستەم نەبرابووە کە لە سالی ١٩١٧دا سەرخان و

ژێرخانی ڕێژیمی قەیسەری ڕووسیا تێک تەپێنراو لەسەر کەلاوەی ئەوان دەزگای دەوڵەتی یەکیتی سوڤیت و سیستیمی ئابوری (سوسیالیستی) بەرز کراونەوە، دامەزراندنی دەزگای دەوڵەت لە سەر سیستیمی ئابوری ئیشتراکی نەک هەر خەونی لە میژینەی ئادەمیزادی وەدی هینا بەڵکو (هەورر)ی تیووری یە تازەکانی ئابوری و سیاسی و سوسیولوژی بە ساغی (کل)ی کردار و تاقی کردونەوە هینایەدەر و قابلیتی تطبیقی ئەو نظریانەی ئاشکرا کرد کە تا ئەو ڕوژە دەربارەی گەشە کردن و پەرە سەندنی کومەل دوزرابوونەوە و لەوساوە جلەوی گەشە کردن و پەرە سەندنی کەوتە دەست ئادەمیزاد و کومەل لە بەرزی و نزمی تطوراتی عفوی رزگاری بوو ئیتر مەسەلە بوو بە مەسەلەی گەشە پی کردن و پەرە پیدانی کومەل. لە ماوەی ئەم پەنجا سالەی کە بەسەر شورشی ئوکتوبەردا تی پەریوە و ولاتانی ڕوژهەلاتی ئەوروپا و چین و کوریا و ڤیتنام و کووبا تیکەل بە کاروانی سوسیالیزم بوون.

ئەمەی کە تا ئەم دوایانە لە یاسا دوزراوەکانی تطور بومان دەردەکەوی و تەجربەی شورشی ئوکتوبەر تا دەگاتە شورشی چینیش هەروایان پیشان داوە ئەوە بوو: کە چونکە بناغەی کومەل لە سەر چەوساندنەوە و قازانجی چینایەتی دامەزراوە و هیچ چینیکی دەستەلاتداریش ئامادە نی یە بە ئارەزووی خوی واز لە قازانج و دەستەلاتی خوی بهینی، بویە بو گورینی هەر ڕیژیمیکی کومەلایەتی و دامەزراندنی ڕیژیمیکی پیشکەوتووتر پیویستە ریگای (شورش) و (عنف) بگیریتە بەر. بەلام سالی ١٩٥٦ لەکونگرەی بیستەمی پارتی کومونیستی سوڤیتی دا بیروڕایەکی نوی کەوتە مەیدانەوە کە: چونکوو ئیستا سوسیالیزم لە دنیادا گەلی پەرەی ئەستاندوە و نیزیکەی نیوەی خاک و سی یەکی دانیشتوانی سەر زەوی گرتوتەوە و چونکوو سوسیالیزم بوتە هیزیکی سەرەکی لە دنیادا ئیتر لە وانەیە لە گەلی وولاتی تر بە خەباتی پەرلەمانی و بە ریگای (لاعنف)دا سیستیمی سوسیالیستی بهینریتە دی. ئەگەرچی ئەم تیوری یە تازەیە نەیتوانیوە و ناش توانی ١٠٠٪ جیگای تیوری (عنف) بگریتەوە بەلام ١٠٠٪ یشی بو(عنف) نەهیشتوتەوە، هیچ نەبی ئەو بیرەی خستوتە سەری میللەتانەوە کە ڕەنگە لە وانەبی بە ریگای (لاعنفی)دا بتوانری مجتمعیکی سوسیالیستی دابمەزریندریت.

لە سالانی پاش ۱۹۵۰وە تا ئیستا، لە دوو قارەی ئاسیا و ئەفریقا گەلی وولات لەژیر دەستی ئیمپریالیزم رزگاریان بوە و سەربەخویی سیاسی خویان بە چەنگ هیناوە ئەم وولاتانە بە تایبەتی ئەوانی ئەفریقا چونکوو مجتمعیکی خاو و گەشە نەکردوو بوون (نسبیا) ریگایەکی تایبەتی تطوریان گرتوتە بەر و لەبەر روشنایی ئەم شیوە تازەیەی تطور، زانایانی ئابوری و سیاسی هەندی (تیوری) تازەیان دارشتوە و ناویان لی ناوە (تطوری لاراسمالی)و ئەمە وا ئەگەیینی کە ئیمکانی ئەوەش هەیە بی ئەوەی مجتمعیک بە ریگای تکاملی تدریجی دا بگاتە قوناغی سوسیالیستی، هەر یەکسەر لە هەر قوناغیکی گەشە کردندا بیت دەتوانی قەلەمباز بهاویژی و دەست بکا بە دامەزراندنی چەشنە ئیشتراکیتیک کە لە گەل زروفی تایبەتی خوی دا بگونجیت و بەم جورە ریگای دووری نیزیک کاتەوە.

ئەگەرچی زور باش دەزانین کە سوسیالیزم لەو موضوعانە نی یە بە وەندەی تا ئیستا باسمان کردوە هەقی خوی درابیتی بەلکوو ئەو هەموو کتیبە و تەجرەبەی هەموو ئەو وولاتانەی لە پاش شورشی ئوکتوبەرەوە دەستیان کردوە بە دامەزراندنی ئیشتراکیەت هیشتا بەو جورەی پی ویستە نەیانتوانیوە کەلین و قوژبنی سوسیالیزم روناک کەنەوە و هیچ مەلەاونیک نەیتوانیوە بگاتە بنی دەریای ئیشتراکیەت لە گەل ئەوەشا بە خومانا را دەپەرموین کە بە چەند دیر و ووشەییکی کورت تریش مەفهومی ئیشتراکیەت بخەینە بەر چاو، رەنگە ئەمە خوی هەر یەکیک بی لە خصایصی سوسیالیزم. لە لاییکەوە بە هەزاران کتیبی لە سەر نووسراوە و چەند دەولەتی گەورە و پچوک لە دنیادا کەوتوونە ژیر سیبەری ئەم سیستیم و ریژیمە کەچی هەموو روژی لە تەجرەبەی وولاتیک شتیکی تازە، مەسەلەییکی نوی و تیوریکی تری سوسیالیزم دەدوزریتەوە، لە گەل ئامەشا ئیمکانی ئەوە هەیە بە چەند دیریک باسی بکری:

سوسیالیزم باریکی طبیعی و شیوەییکی خورسکاوە بو کومەلی ئادەمیزاد، پیوەندیکی عادلانەیە لە نیوان هیزی (رەنیوهینان) و خاوەنەکانی (ئامرازی رەنیوهینان) کە لە کومەلی سوسیالیستی دا هەر دووکیان هەر یەکن، ئامرازی رەنیو هینان هی میللەتە و هەر میللەتیشە کە ئیش دەکا، بی ئەوەی خاوەنی ئامرازی رەنیوهینان بو دەسکەوت و

قازانجی تایبەتی خوی بیچەوسینیتەوە بەر و بووی دەسترەنجی خوی دەخوا سوسیالیزم ئاوەدان کردنەوەی کونە هەواری کومەلی ئادەمیزاد و رازاندنەوەی ئەو هەوارەیە بە شیوەییکی نوی، گیرانەوەی کومەلە بو باری طبیعی خوی، راست کردنەوەی ئەو لاری و خواری یە کە ئادەمیزاد لە ریگەی گەشە کردن و تطورا بە ناچاری تووشی هاتووە، لابردن و رامالینی ئەو زولمە کومەلایەتی یەیە کە چینەکانی خاوەن ئامرازی رەنیوهینان بە دریژایی میژوو - هەر لەو روژەوە کە بناغەی یەکەم کومەلی ناوکویی سەرەتایی هەل تەکاوە تا ئیستا - لە چینە رەنیوهینەکانیان کردوە، سوسیالیزم هەل تەکاندنی (ژیرخان)ی هەموو ئەو ریژیمە سیاسی یانەیە کە لە سەر پایەی چەوساندنەوە بەرز کراونەتەوە و ئابوری و ریژیمیکی سیاسی متناسب (ژیرخان و سەرخان)یکی وایە کە ئامرازی ئیشکردن هی میللەت بی، میللەت بە ئامرازی خوی بو خوی و تەنیا بو خوی ئیش بکات، رەنیو بینیت و بەروبووی رەنیوهینانیشی بو خوی بخوا.

هەموو چینە دەستەلاتدارەکانی قوناغە جیاجیاکانی کومەلی ئادەمیزاد، بەربەرەکانی ئەو جورە بیروباوەرەیان کردوە کە ویستوویەتی - بە هور شیوەییک بی - رەگوریشەی چەوساندنەوە دەربهینی و لەوکاتەشەوە کە یاساکانی تطور دوزراونەتەوە و اثبات کراوە کە کومەل چار و ناچار بەرەو سوسیالیزم دەچی و ئیشتراکی قوناغیکە ئادەمیزاد خوشی بیو ترشی بی هەر پی یدا تی دەپەری و روژیک دیت - دەرنگ یا زوو- کە سوسیالیزم سەر تا سەری دنیا دەگریتەوە، ئا لەو کاتەوە لە قانونی عقوبانی گەلی لە دەولەتاندا سزای قورس بو ئەو کەسانەی لە پیناو سوسیالیستی دا خەبات دەکەن داندراوە، بی ئەوەی ئەم سزا قورسانە چاوی کەسیان ترساند بی، بیروباوەری سوسیالیزم روژ بە روژ زیاتر پەرەی سەندوە و ئیستا با بو روالەتیش بی وەکوو جاران سلی لی ناکری، هەر وولاتە و میللەتەی تیدەکوشی بو دامەزراندنی سوسیالیزمیش ئەبی هەندی (اصلاحات)ی وا بکا کە لە سەرەوە بونی ئەوەی لی دی ریگا خوش دەکا بو (ئیشتراکیتی)، بەلام لەبنەوە بو پیشگرتن بە سوسیالیزمە، بو خاو کردنەوەی خەباتی میللەتە لە پیناو سوسیالیزما.

لیرەدا پیوستیکی گرینگ و ئەرکیکی قورس دەکەویتە سەرشانی ئەو چین و کومەل

و پارتە سیاسی یانەی کە لەپیناو ئازادی و بەختیاری و خوشی ژیانی میللەتەکانیان دا خەبات دەکەن و دەیانەوی مجتمعیک دابمەزرینن کە هیچ جورە چەوساندنەوەییکی تیدا نەبی، ئەو پیویست و ئەرکەش ئەوەیە کە خویان بە خەیالاتەوە نەخافلین و ریگای راست و رەوان و عیلمی بو دامەزراندنی سوسیالیزم بگرنە بەر، وەکوو راستیکی نەگور بیخەنە پیش چاو کە سوسیالیزم وەدی نایە و ناکری وەدی بیت ئەگەر سیستیمی ئابوری (ژیرخان)ی کومەل هەل نەتەکینری و سیستیمی ئابوری سوسیالیستی لە شوین دانەمەزریت، ئەگەر پیوەندی یەکانی رەنیوهینان (علاقات الانتاج) سەرتاپا نەگورین و جورە پیوندی یەکی تازە نەهینریتە روو ئەگەر رەچەلەکی هەموو جورە چەوساندنەوەییک نەبریندریتەوە و ئەگەر بو پاریزگاری سیستیمی ئابوری تازە ریژیمیکی سیاسی و دەزگاییکی بە زیپک و لیهاتوو دانەمەزریت. بەلی پیویستە خەباتکارانی ریگای سوسیالیزم ئەوانە هەموو لەبەر چاوی خویان رابگرن و ئەوەش بزانن ئەگەر سوسیالیزم وەکوو جاران سلی لی ناکری مانای ئەوە نی یە دوژمنانی ئیشتراکیتی چەکیان فری داوە و دەستیان بەرز کردوتەوە، بەلکو ئیمپریالیزمی کون و نوی و چینە چەوسینەرەوەکان شیوەی بەربەرەکانی خویان گوریوە بە اسلوبیکی شەیتانانەی تازە دژی سوسیالیزم دەخەپتن، دەستیکی بویان نەکراوە بی برن جاری ماچی دەکەن پاشان هەر بویان هەلکەوت هیچ نەبی دەیگەزن.

سوسیالیزمی عیلمی کە کونگرەی شەشەمی پارتیمان وەکوو ئامانجی ستراتیژی لە پروگرامەکەمان دا دایناوە، رەگوریشەی چەوسانەوە لە بنەرت دا دەردینی و زولم و زوری کومەلایەتی ناهیلی و برایەتی و وەک یەکی لە ناو میللەتاندا دەچەسپینی.

پایەی چەوساندنەوەی نەتەوایەتیش وەکوو هی چینایەتی لە سەر قازانج و دەسکەوتی ئابوری دامەزراوە، دەولەتیک کە بە ناوی میللەتیکی گەورەوە حوکم دەکا و نیشتمانی میللەتیکی بچووکتر یا دواکەوتەتری داگیر کردوە، عاشقی خول و دارو بەرد و دیمەنی چیا و شیو و دولی ئەو نیشتمانە نی یە، بەلکو دەمی لەپیت و بەرەکەتی ئەو خاکە شیرین بوە بویە وازی لی ناهینی، جا بو ئەوەی میللەتە ژیردەستەکە ووشیار نەبیتەوە و خولیا و بیری خو رزگار کردنی نەکەویتە سەر ریگای هەموو جورە ئازادیکی لی

دەبڕیتەوە، دەرگای خوێندن و فێربوونی لێ دادەخا، نایەلی بە زمانی زگماکی خوی بخوێنی یا قسە بکا، هەول دەدا خصائص و ممیزانی نەتەوایەتی میللەتە پچووکەکە لە ناوبەری و لەبوتەی میللەتە گەورەکەدا بی تاوینیتەوە، خو ئەگەر میللەتە بچوکەکە ملی بو هەموو زولم و زوریک کەچ نەکرد و قاچی لە بەرەی (خوی!!) زیاتر دریژ بکا و بە جوریک کە جوران داوای مافی نەتەوایەتی خوی کرد، یا بو ئەستانەوەی مافە زەوت کراوەکانی دەستی دایە چەک ئەوا شورشەکەی بە زەبری قورقوشم و باروت دادەمرکینریتەوە.

بەلام ئەگەر لە باتی پیوەندی گەورە و بچوکی، بالادەستی و ژیردەستی، پیوەندی برایەتی و وەک یەکی لە نیوان میللەتانی دونیادا - گەورە و بچووک - دابمەزریت و ئەو میللەتانەی کەوا ریککەوتوە - بە تاثیری هەر عاملیک بی - ئیستا پیکەوە و لە ژیر سیبەری ئالای دەولەتیکدا دەژین ئیحترامی هەست و ئامانجی نەتەوایەتی یەکتر بگرن و ثروت و سامانی نیشتمانی ناوکویی یان وەکوو برا بو خیر و خوشی نیشتمانی هەر یەکەیان وەکوو یەک بە کار بینن، ئەوا هیچ پی ویست بە چەوساندنەوەی لاییک لە لایەن لایەکی ترەوە نابی. ئەم جورە پیوەندیەی ناو میللەتان تەنیا لە سایەی سوسیالیزما دیتەدی و ئەو کاتەیە کە هەر میللەتە بە تەواوی دەبیتە خاوەنی چارەنووسی خوی وە دەستەلاتداری راستەقینەی نیشتمانەکەی.

ئەم قسانە بەو مانایە نین کە میللەتیک واز لە خەباتی نەتەوایەتی خوی بهینی دەست لە سەر دەست دانی چاوەروانی دامەزرانی سوسیالیزم بکات تا ئامانجە نەتەوایەتیکانی وە دی بیت، بەلکو بەو مانایەیە کە میللەتیک ویرای خەباتی نەتەوایەتی لە سەری پیویستە خەبات بکا بو دامەزراندنی سوسیالیزم تا ببیتە دەستەبەری ئەو هەقە نەتەوایەتی یانەی وە دەستی هیناوە، ئەمە لە حالیکدا ئەگەر توانی پیش دامەزراندنی سوسیالیزم مافی نەتەوایەتی خوی بستینیتەوە، ئەلەم حالەتەدا پیویستە مافی (دیاری کردنی چارەنووس) بو دامەزراندنی سوسیالیزم کەلکی لی وەربگیری تا ریگە لە دوژمنان ببەستریتەوە ونەتوانن جاریکی تر میللەتەکە بچەوسیننەوە.

چریکەی کوردستان ژمارە - ١ تموز - اب / ١٩٧٩

# شۆڕشە پیرۆزەکەی گەلانی ئێران

باوەر ناکەم کەسێ لە خەوی شەوانیشدا بە خەیالیدا هاتبێ کە دەولەتی شاهەنشاهی ئێران، ئەو دەولەتەی کە ئیمپریالیزم هێندە پشتی پی بەستبوو بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە خەریکی پتەوکردنی بناغە و چەکدار کردنی بوو، ئەو دەولەتەی هەر سالە بە ملیار دۆلاری تەرخان دەکرد بو کرینی چەکی تازەی کەس نەدیتوو، ئەو دەولەتەی کە پادشاکەی زۆر بە ئاشکرا و لە خۆرایی بوونەوە دەیگوت تا چەند سالێکی دیکە ولاتەکەی دەگەێنێتە بەر دەروازەی شارستانێتی گەورە! وەک یەکی لە دەولەتە سنعەتی یە مەزنەکانی دنیا دەولەتێ کە لە هەر شوێنێکی رۆژ هەلاتی ناوەراست دوو کەس سەریان بەرز بکردایەوە و بیان ویستایە بۆ ئازادی نەتەوە و گەلی خۆیان، دژی ئیمپریالیزم و نۆکەرە خۆمالی یەکانی، خەبات بکەن خێرا ئەو دەیقۆستەوە و بە دژی قانزاجی خۆی دا ئەنا و دەستی دەکرد بە یارمەتی دانی کۆنەپەرستەکان. کەسێ باوەری نەدەکرد ئا ئەم دەولەتە کە بنکەی پیشەوەو ژاندارمی مفت و دلسۆزی ئیمپریالیزمی ئەمریکی بوو لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا، بەو هەموو تۆپ و تانگ و لە نیو ملیۆن سەرباز پترەوە، وا سووک و ئاسان لە ژێر دەستویی ی خەلکێکدا کە ئەگەر بلێین "بەن - بریان ددان بوو" رەنگە زۆر لە راستی لامان نەدابێ، ئاوا تێک و مەکان بدرێ و داری لە سەر بەردی نەمێنێ! کە چی ئەوی لە خەوی شەواندا بە خەیالدا نەدەهات هەر بە راستی رووی دا، وە ئەم رووداوە جارێکی تر و سەرسورهێنانەتر هێز و دەسەلاتی گەلی دەرخستەوە بۆ ئەوانەی، کە لە رووی نەزانی یا تۆقاوی یەوە، لێ ی بە گومان بوون. وە دای بە تەپلی سەری ئەوانەدا، کە سەبارەت بە تۆپ و تانک و فرۆکە و پارەی زۆر و پشتیوانی ئیمپریالیزم وەها بایی بوون لایان وایە ئەتوانن، هەتا سەر، ریگەی رزگاری و ئازادی لە گەلان بگرن. وە ئەم ئەنجامەی گەلانی ئێران وەدستیان هێنا باوەر و ئیمانی ئازادیخواز و شۆرشگێرانی دنیای بە سەرکەوتن و بە مراز گەیشتنی ناچار و دووایی بزووتنەوەی

ئازادی جەماوەری گەلەکانیان کۆڵێ لە جاران پتەوتر و بە هێزتر کرد.

هیچ گومان لەوە دانییە کە لەوەی بە جێهێنراوە کارێکی فرە گەورە و گرنگ وپیرۆزە وە جێگەی شانازی یە نەک هەر بۆ گەلانی ئێران بگرە بۆ گشت هێزە ئازادیخواز و دوژمنەکانی ئیمپریالیزم و کۆنە - پەرستی لە سەرانسەری جیهاندا. بەلام هیچ گومان لەوەشدا نییە کە، هەر وەکو ئیمام خومینی وە زۆر لە سەرکردەکانی شۆڕشەکە ئەلێن (هێشتا شۆڕش تەواو نەبووە). ئەوەی تا ئێستە کراوە بەشی یەکەمی فرمانە گەورە وگرنگ و پیروزە کەیە. پێشینان بێ سەبارەت نەیان ووتووە: رووخاندن هەرچەند سەخت و بە ئەرک و ئازار بێتە بەر چاو، لە گەل ئەوەشدا لە دورسکردنەوە ئاسانترە. مەگەر نیاز لە رووخاندن هەر رووخاندن بێ و بەس. کە مرازیش لە شۆڕش ئەمە نیە. گەلێک کە بە قوربانی یەکی زۆر بە ئەرک و ئازار و خوین و فرمێسک و ئارەقێکی زۆر، رێژێمێک دەرووخێنی، لە سەرێکەوە گەرەکیە خۆی لە زولم و زۆر و چەوساندنەوە رزگار کات، وە لە سەرێکی کەوە ئەیەوێ کۆمەلگایەکی بە دلی خۆی دورست بکا کە تیا، ئازادی و شادی بە پێی ئارەزووی خۆی وەدەست بهێنی. ئەگینا خۆ ئەگەر نیاز رووخاندنی رێژێمێک و ماوەدان بە دورست بوونی یەکێکی لەو خراپتر یا هەر وەک ئەویش بێت ئەوا هەر لە سەرەتاوە مەسەلەکە ئەو رەنج و ئازار و فیداکاری و خوین رشتن و مال ویرانی یەی بۆچی بوو؟ دەردی کورد ووتەنی: کەرێکم دا بە کەرێ سندان لە بناگوی یان دەرێ! بۆیە هیچ گومان لەوە دا نیە کە نیاز لە شۆڕش - نەک کوودێتا - هێنانەدی رێژێمێکی لە پێشوو چاکترە. وە هیچ گومان لەوەشدا نیە کە ئامانجی گەلانی ئێرانیش ئەمە و کۆلێکیش لەمە زیاتر بووە و زیاتریشە.

جگە لەمە فاکتەر (عامیل) و پال - پێوەنەرێکی کەش هەیە کە وا لە سەر رۆینی شۆڕش و بە گورجی پێکهینانی ئامانجەکانی وەک فرمانێکی ناچاری و پێویست ئەخاتە ئەستۆی هێزە شۆڕشگێرەکانی میللەتانی ئێران کە لەویش: مەترسی گەرانەوەی رێژیمی دۆژمنانی گەل، واتە کۆنە - پەرستی سەر بە ئیمپریالیزمە، کە هەمیشە دەس بە چەکەوە وان لە کەمین دا، وە لە هەموو کەمی و سستی و ناتەواوی یەک کەلک وەرئەگرن. گەلانی ئێران بە گشتی و هێزە شۆڕشگێرەکانی، کە دەردی رێژیمی دوابراویان چێشتووە لە

حالێکدا کە گشت هۆی درندەیی و زۆر و ستەمەکەی تەنیا پاراستنی رێژیمەکەی بوو لە خەتەرێ کە زۆر کەس بە وەهمی ئەزانی، بێ گومان ئەبێ ئێستە ئەم هێزە شۆرشگێرانە بە تەواوی ئەو مەترسی یە هەلسەنگێنن کە دووچاری خۆیان و نیشتمانەکەیان ئەبێت لە حالی، خوانە خواستە، نووچدانی شۆرش و هەلگێرانەوەیدا، کە ئەوسا تۆلە سەندن ورق و کینە و ترس و دەرس وەرگرتن لەم رووخاندنەی دوایی وای لێ ئەکەن بە جۆری رەفتار بکا کە رێژیمی پێشوو لە چاویا بێ بە دەوری نەوشیروان (رێژیمی ئێستەی عیراق دەق نموونەی ئەم چەشنە حوکمەیە) جا لە بەر ئەم هۆیەش پێویستە لە سەر هێزە شۆرشگێرەکانی ئێران کە بە یەکیەتی و فیداکاری و دلسوزی یەکی لە جاران زیاترەوە لە سەر خەباتی دلێرانەی خۆیان برۆن، تا گشت ئامانجەکانی شۆرشە پیرۆزەکەیان پێکدێنن، و گەلانی ئێران دەگەێنن بە ئاواتە خوشەکانیان، وە قەوم و نیشتمان و خویشیان هەتا هەتایە لە گەرانەوەی رێژیمی نۆکەرانی ئیمپریالیزم رزگار ئەکەن و ئێرانیکی سەر بەخۆ و ئازاد و چەند گەلێکی برا و هاوبەش و هاوشان و شاد و کامران، وە یەکیەتی یەکی پتەوتر لە ئەلبورز و کێوەکانی کوردستان، لە جێگەی ئیمپراتوریەتی دوابراوی زولم و ستەم و چەوساندنەوە و ژاندارمی ئیمپریالیزم و دوژمنی ئازادی و خوشی و شادی گەلان، بهێنرێتە مەیدانەوە وە بە گورجی و گۆلی یەکی وا بکەونە کار کە ئەو سالانەش پر بکەنەوە کەوا رێژیمی پێشوو لە دەستی داوون چ لە بابەت بەجێهێنانی دەوری مێژووی گەلانی ئێرانەوە لە خەباتکردن دژی ئیمپریالیزمی جیهانیدا، بە دەسگرتن و یارمەتی دانی خەباتی گەلانی زۆرلێکراو چەوساوە و لێقەوماو، وە چ لە بەشدار بوون لە پێشخستنی شارستانیتی دا.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە تەجرەبەی خەباتی دوور و درێژی گەلانی ئێران و گەلانی دەرو دراوسێ بە تایبەتی، وە هی گەلانی کەی دنیا بە گشتی گەنجینەیەکی بە هادارن بۆ دەرس و پەند لێ وەرگرتن.

(یەکەم) دەرس و پەند کە لەم گەنجینەیە وەربگیرێت وە مەنتیقی شۆرشەکەش پێویستی ئەکا گۆرینی رێژیمەکەیە .

گۆرینی ناوی رێژیم لە شاهنشاهی یەوە بە (کۆماری ئیسلامی) بەشێکی ئەم

کارەیە بەشەکەی دی، یا راستتر بەشە گرنگەکەی، کە وا ناوەروکە کەیەتی هێشتا پێکنەهێنزاوە. بۆیە ئەلێم بەشە گرنگەکەی ماوە، چونکە ئەوەی تا ئێستە گۆڕراوە هەر ناوە، کە شتێکی ئاشکرایە لە هیچ حال و کارێک دا تەنیا گۆڕینی ناو نابێ بە هۆی گۆڕانی (ناوەرۆک). وە لە مەش ئاشکراتر ئەو راستی یەیە کەوا گەلانی ئێران بۆیە نەچوون بە گژ رێژیمی دوابراوی پەهلەوی دا چونکە ناوی (شاهنشاهی) بوو. ئەوەی خەلکی سەرانسەری ئێران ناچار بەو خەباتە سەخت و تال و خۆینینە کرد بۆ لەناو بردنی (ناوەرۆک)ی رێژیمە کە بوو نەک ناوی.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەی گەلانی فیداکاری ئێران پێویستە: ناوەرۆکی (کۆماری ئیسلامی)بە رێ و شوێن دانان و سوور بوون لە سەر پاراستنی سەر بەخۆیی ئیران لە گشت روویەکەوە، لە گەل مافە دیموکراتی یەکانی جەماوەری گەل پرکرێتەوە. وە لە سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی دەولەتدا بە کردەوەش دلسۆزانە و لاسارانە پەیرەوی بکرێت. ئەوی راست بێ هەتا ئێستە زوربەی کاربەدەستانی شۆرش و دەولەت وە بە تایبەتی ئیمام خومەینی هەلوێستی دژایەتی خۆیان بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و دیکتاتۆریەتی، وە پشتیوانی کردنی بزوتنەوەی ئازادیخوازی گەلان بە گشتی، وە گەلانی ئیسلام بە تایبەتی، بە ئاشکرا دەر بریوە. بەلام هەرچی وەکو سیاسەتی ناوەوەی کۆمارەکەیە هەلوێست لە عاستی هێندە روون و دیار نیە. بەرژەوەندی شۆرش و پتەو کردنی بناغەکەی پێویستێکی زۆریان بە دیار بوون و پیشاندانی شوێنی بەرز و گرنگی سەر بەستی یە دیموکراتی یەکانی جەماوەری خەلک و عەدالەتی ئابوری و کۆمەلایەتی هەیە لە (ناوەرۆک)ی کۆماری ئیسلامی دا. لێرەدا گومان - بزوین ئەو سلەمینەوە بۆ چی یە کەوا جارو بار هێندی دەسەلاتدار پیشانی ئەدەن بەرامبەر بە ووشەی (دیموکراتی). هەر وەکو لە بیر خویانی ببەنەوە، یا نەزانن کە ئەو دیموکراتی یەی ئیمرو بووەتە ویردی زمانی خەلک هەر شتێکی وەک ئەو (وامرهم شوری بینهم)یە کە لە (سوورەی ئەلشورای) قورئانی کەریم دا باس کراوە!

(دووەم) دەرس کە لە گەنجینەی خەباتی گەلان وەربگیرێ: پێویستی چارە کردنی مەسەلەی نەتەوایەتی یە. ئەو مەسەلەیەی کە بە ئەندازەیەک، لەم سەردەمەدا، باوی

سەندووە پێویستی چارە کردنی کەوتوتە پێش هێندی مەسەلەی ژیانی تریشەوە.

ئێران وەکو وولاتێکی فرە - نەتەوە هەر لە زووەوە بە دەست ئەم دەردەوە ئەنالێنی، وە سەبارەت بەوەی کە لەبایەخ پێ نەدانی هەمیشەیی و کوتانەوە و لێدانی درندانەی ناو بە ناو بترازێ هیچ چارەیەکی ژیرانەی نەکراوە، دەردەکە خەریکی لێ - پیسکردنە، بەتایبەتی لە شوێنی وەک کوردستاندا کە دژواری ئاینی (مذهبی)یشی ئەچێتە پال.

هیچ گومان لەوە دا نیە کەوا ئەم شۆرشە گەورەیەی ئێران تەنیا بە هۆی یەکیەتی و هاوخەباتی و هاوکاری گشت گەلەکانی وولاتەکەوە توانی ئەم سەرکەوتنە بێ وێنە، سەر سورمێنەی دەسکەوی، وە هیچ عاملێکی تر هێندەی ئەم یەکیەتی یە کاریکەر وبرندە نەبووە لە چۆک بە سوپای شاهەنشاهی دادان و شۆرش سەرخستن دا.

جا کە سەرکەوتن بە خەباتی گشت گەلانی ئێران و بە خوین و فرمێسک و ئارەقی هەموان دەست کەوتبێ پێویستە بەرهەمەکەشی بۆ هەموان بێت. لام وایە هیچ کەسێک نیە کە خۆی بە دلسۆزی شۆرشی ئێران و کۆماری ئیسلامی بزانێت لەم هەقە لاری ببێ.

گەلانی ئێران، گەلی فارسی لێدەرچێ، هەموو ئەوانیکە سەرەرای ستمی سیاسی و ئابوری و کومەلایەتی بە دەس ستەمێکی کەشەوە ئەیان نالاند، کە ئەویش ستەمی نەتەوایەتی بوو. جا ئەم زۆر لێکرانە بە لایانەوە هێندە بە ئازار و ناخۆش و پر نزمی و سەرشوری ئاشکرا و لە روو بوو هیچ دوور نیە کە بگوتری هەموو ستەمەکانی تریان بە ئانجام و بەروبوومی ئەم ستەمە دائەنا. بۆیە لە راستی لانادەین ئەگەر بلێین خەباتی ئەم گەلانە دژی رێژیمی کۆن، بەر لە هەموو شتێک، بۆ خۆ رزگار کردن لەم ستەمە و دەستخستنی ئازادی و مافە نەتەوەیی یەکانیان بوو. ئنجاکە حالەکە ئەمە بێت، وە گرنگی مەسەلەکە گەیشتبێتە ئەم رادەیە، هیچ گومان لەوە دا ئەمێنێ کە بۆئەوەی هەموو گەلانی ئێران، وەک یەک، لە بەروبوومی شۆرش بەرخوردار بن، ئەبێ ئەم نارەزایی یەی ئەو گەلانە نە هێلرێ وە بە مافی نەتەوایەتی خۆیان بگەیەنرێن؟

موشکیلە (دژوار)ی نەتەوایەتی لە زۆر وولاتی کەی دنیادا بووە و هەیشە، وە لە هەر شوینە بە جۆریک چارە کراوە، یا ئەکرێت: هەر لە رەزا کردنی تەواوی نەتەوەکانەوە بگرە تا ئەگاتە کوشتن و برینیان. بۆ نموونە هەر هیچ دوور نەرۆین ئەوە سویسرە و

یۆگۆسلاڤیاو ئەوەش عیراق و تورکیا.

لە ئێرانی ئیمرودا ریگەی راست و رەوانی چارە کردنی موشکیلەکە زۆر دیار و ئاشکرایە: شۆرشی گەلانی موسلمانی ئیرانی بۆ نەهێشتنی زور و ستەم و نارەزایی خەلکی زولم لیکراوی وولاتەکە پێکهاتووە و کۆماری ئیسلامیش بۆ بەجێهێنانی ئەم ئامانجە و هێنانەدیی ئاواتەکانی خەلکی ئیران دامەزرێنراوە، وە چارەکردنی دژواری نەتەوایەتی بە پێی خواست و ئارەزووی کەمایەتی یە نەتەوەیی یەکانی ئیران لە چوارچێوەی دەولەت و کۆماری ئیسلامی ئیراندا پێویستە یەکێک بێت لە فرمانە هەرە گرنگ و بە پەلەکانی سەرکردایەتی شۆرش و دەولەت. چونکە ئەم گەلانەش چ بە موسلمانێتی بێت و چ بە ئێرانێتی هەقە هەقدارن و بەشە بە شدارن ئەمە جگە لەوەی کە (خوینبایی) خویشیان بە هەموو خوشی دلەوە پێشکەش بە شورش کردووە.

سەررای ئەمانەی ووتم نەتەوەکانی ئێران بە پێی عەدالەتی ئیسلامی و یاسای (انما المومنون اخوه ...)، وە بە پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان کەوا مافی چارەی - خۆ - نووسینی دان پیاناوە بۆ هەموو گەلانی سەرزەمین، واتە بە پیی دەستوری ئاسمانی و ئەرزی ئەبێ داخوازی یەکانیان بۆ پێک - بهێنرێت.

سەیر ئەوەیە لە گەل گشت ئاشکرایی رەوایی ئەم هەقە دا کەچی هێشتا کولیک نەک هەر ناحەز بگرە، دوژمنی خوینەخویشی هەیە هیندێک بە سەرەتای پارچە پارچە بوونی ئێران و جیابوونەوەی کەمایەتی یە نەتەوایەتی یەکانی، وە هەندێکی تر بەدەسکردی ئیمپریالیستەکان و داوودەزگای کۆن، وە بەشی سێ یەمیش بە پێچەوانەی یەکیەتی و برایەتی موسلمانێتی دادەنێت!! وە بەرەئی ئەمانە گەلەکانی ئێران نابێ هیچ جۆرە دەسەلاتیکیان بدرێتی، وە پێویستە بە زەبری کوتەک و شەق دەمکوت بکرێن!!

سەرنجێکیووردی گەرەک نیە بۆ ئەوەی ئینسان تێ بگات کە ئەم قسانە تەنیا بروبیانوون و هیچی تر. ئەگینا خاوەنی ئەم قسانە زۆر باش ئەزانن کە داخوازی گەلەکانی ئێران بریتی یە لە (ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دا). وە هەتا ئێستە لە رابەریکی دینی یا سیاسی هیچ یەکێ لە کەمایەتی یە نەتەوەیی یەکانی ئێران نەبیستراوە کە بە خراپە نەبی باسی جیابوونەوەی کردبێ، وە هەموو جەماوەری

خەلکی ئەم گەلانەش چەندە دلسۆز و فیداکارن بو دەسخستنی مافە نەتەوەیی یەکانیان هیندەش فیداکار و دلسوزن بو یەکیەتی ئێران، وە مافی خویان و یەکیەتی ئێران بە تەواوکەری یەک ئەزانن.

لە پاشا کە نەتەوە پەرستەکان ئەلێن: ئۆتۆنۆمی هەنگاوی یەکەمە بۆ جیابوونەوە! تەنیا چاو پێداخشاندنێکی وولاتە فرە - نەتەوەکانی دنیا ناراستی ئەم قسەیەشیان دەردەخات، چونکە ئەبینین هەراوهۆریا و داوای جیابوونەوە کردن تەنیا لەو شوێنانەدا هەیە کەوا کەمایەتی یە نەتەوەیی یەکان یا هەر هیچ هەقێکیان نەدراوەتێ یا هەقێکی کەم و شەقێکی زۆریان پێ رەوا دیتراوە.

سەررای ئەمە داوا کردن و پەسند کردنی سیستەمی ئۆتۆنۆمی و فیدرالیش لە وولاتێکدا بە هیچ جۆرێک ئەوە ناگەیەنێ کە وا یەکیەتی نیشتمانی تیایا کز و لاوازە، بە پێچەوانە هەندێ وولات ئەم سیستمانەیان زۆرتری بۆیە هەلبژاردووە کە یەکیەتی و برایەتی و نیشتمان پەرەوری لە سەر بنچینەی پتەوی، رەزامەندی و خواستنی بەشی هەرە زۆری خەلکی وولات دابمەزرێنن، وە بەم ئامانجەش گەیشتوون. جگە لەمەش لە زۆر وولاتدا، لە هەلبژاردنی ئەم سیستەمانەدا حسابێکی زۆریش کراوە بو مەسەلەی ئاسانکردنی بەرێوە بردنی وولات، وە سپاردنی هەلسووراندنی کارو باری ناوخویی خەلکی هەرێمەکان بە خۆیان، کە بێ گومان تیایا لە خەلکی کەی وولاتەکە شارەزاترن.

جا لەم رووەشەوە ئێران وەک وولاتێکی گەورە و فراوان، وە کۆمارە ئیسلامی یەکەشی کە وا لە لایەکەوە خەریکی دورسکردنی سەر لە نۆی ی دەولەتێکە، بە چەشنی کە لە جیهان دا وینەی نیە. وە لە لایەکی ترەوە کۆلی موشکیلەی نالەباری میراتی دەوری کۆن سەری قال کردووە. لە کاتێکدا کە دوژمنێکی زۆر و در و پیسیش، لە ناوەوە و لە دەرەوە، بە جۆرێکی زیرەکانە خەریکی پیلان و تەگبیرن بو: پەک لە کاردان و رێ لێ تێکدان و لە ناو بردنی. ئا لەم حالەدا وەرگرتنی هەر یەکێک لەم سیستەمانە کەلکێکی زۆری ئەبێ لە سووککردنی بار و ئاسانکردنی کاری دەولەت دا. ئەمە سەررای رازی کردن و بەجێ گەیاندنی خواستی رەوای خەلکەکەش.

لە ناو پەلپەکانی نەتەوە - پەرستەکانی ئێران دا لە گشتیان سەیرتر ئەوە یانە کە

ئەڵێن: داخوازی ئەم گەلانە پێچەوانەی برایەتی موسلمانان، وە سەرەتاکانی دینی ئیسلامە!! پیاو نازانێ نیازیان لە چ موسلمانەتی و کام سەرەتا دینی یەیە! چونکە ئەگەر موسلمانێتی بە پەیرەوی کردنی قورئان و حەدیث بێ، ئەوە قورئان ئەفەرموی (المومنون اخوه...)وە هەرگیز نەبیستراوە کە برایەتی مانای ئاغایەتی برایەک و نوکەری براکەی تر، یا دەستداری ئەم برا و بێ دەست کردنی ئەو برا بێت. بەتایبەتی برایەتی نێو گەلان. کە پێویستە لە سەر بنچینەی پتەوی وەک - یەکی و یەکسانی و هاو - بەشی و یەک - مافی دابمەزرێنرێ بە پێ ی ئایاتی قورئانی وەک: (واذا حکمتم بین الناس ان تحکموا بالعدل). ئەگینا، واتە ئەگەر لە بریتی ئەمە لە سەر بناغەی فشەلی ئاغایەتی و نوکەری و (سەرگول بۆ من و پاشماوە بۆ تۆ) دورست بکرێ بەرامبەر بە پچووکترین کۆسپ خۆی ناگرێ و لێک ئەبێتەوە. موسلمانی راست ئەوەیە کە وەک (حەدیس) ئەفەرموی: چی بو خۆی پێ خۆش بێ بۆ خەلکی کەش ئەوەی پێ خۆش بێت (المومن من احب لغیره ما احب لنفسه). جگە لەمە ئەگەر ئەو قسەیە راست بێ کەوا داوا کردنی کەمێ لە مافی رەوای خۆکردن لە ئیسلام لادان بێت! ئەبێ ئەو هەموو نەتەوە موسلمانانەی دنیا کە هەر یەکەیان جیایە لەوی تر و دەولەتی تایبەتی خۆی هەیە فریان بە سەر ئیسلامەوە نەمابێت!! کە هیچ واش نیە.

ئنجا با بێینە سەر مەسەلەی بە کارهێنانی هێز بو دەمکوت کردنی ئەو گەلە ئێرانی یانەی داوای مافی نەتەوایەتی یان ئەکەن.

١- هەر بە دەرکەوتنی ئامادە نەبوون بۆ دانی مافی نەتەوەیی بە گەلەکانی ئێران تۆوی گومان لە دلدا چەکەرە ئەکا، وە خەلکەکە دەکەونە نارەزایی دەربرین، وە لە گەل هەرەشە کردن بە هێز بەکارهینان دا (یەکیەتی نیشتمانی ئێرانی یان) کە چەکی هەرە کاریگەر بوو لە سەرخستنی شۆرش دا، وە (یەکانە) چەکی کاریگەری پاراستن یەتی لە ناو دەچێت وە لە بریتی ئەو ناخۆشی و دوژمنایەتی دەکەوێتە ناوان. کە لە ئەنجامیا ئێران ئەکرێ بە مەیدانی شەرێکی ناوخۆیی کە برا تیایا برای خۆی ئەکوژی، وە دیسانەوە ئەو وولاتە جوانە لە خوێن و فرمێسک دا نوقم ئەکرێتەوە.

٢ - بە کار هێنانی سوپای کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ لێدان و دەم کوتکردنی

گەلە ئێرانی یەکان، هەر لەبەر ئەوەی کە داوای بەشێکی کەم لەو هەقانە دەکەن کەوا رابەری شورش ئیسلامی ئێران ئیمام خومەینی بەڵێن ئەدا بە گەلانی دنیا کە یارمەتی یان ئەدات لە وەرگرتنیاندا، واتە: کوشتنی موسلمانانی ئێران لە لایەن لەشکری ئیسلامەوە لە سەر کەمێ لەو هەقانە، زیانیکی بێ ئەندازە ئەگەیەنێ بە ناوبانگی ئیسلام لە گشت دنیادا، لە دلی موسلماناندا ناهومێدی و پەژارە وە لای ئەوانی کەش بەرامبەر بە ئامانج و دورشمەکانی شورشەکە و بە کەلک هاتنی ئیسلامەتی بۆ کردنە بناغەی دەولەت و هەلسووراندنی کار و باری دنیای سەدەی بیستەم گومانێکی زۆر و تا رادەیەکیش بە جێ بلاو ئەکاتەوە.

٣ - بە کارهینانی هیز لەگەل ئەو هەموو زیانە گیانی و مادی و مەعنەوی یانەدا کە دووچاری ئێرانی ئەکات ناتوانی گەلانی نارەزای وولاتەکە دەمکوت کات و دوایی بە خەباتیان بهێنێ. ئەگەر لە سەرەتادا و لە هەندێ شوین چەند سەرکەوتنێکیش وەدەسخات، لەئەنجام دا هەر ئاخر شەر و ژێرکەوتوو ئەبێ. حوکمی مێژوو (تاریخ) ئەمەیە:

ستەمکار نیە کە پایەدار بێ بەرامبەر گەلێ ویستی رزگاری بێ وە ئەگەر ئەمە وانەبوایە نە بنەمالەی پەهلەوی ئێران و نە بنەمالەی سوموزای نیکاراگوا رۆژیان بەم رۆژە نەئەگەیشت، وە بنەمالەی تکریتی بەغداش کوردێکیان لە کوردستانی عێراقدا نەهێشتبوو!

ئەمە جگە لەوەی کە سوپای وولاتێ بە کوشتنی خەلکی وولاتەکە فێر کردن، خۆی لە خۆیا کارێکی پر مەترسی یە و ئەنجامی زۆر خراپی لێ پەیدا ئەبێ.

ئەگەرچی باسەکە زۆر ئەهێنێ، بەلام ئەوە زیاتری لە سەر نەرۆم باشە، قسە هەزارە و دووانی بەکارە، وە لە مەسەلەی پایەداری کۆماری ئێراندا دوو قسەکە ئەمانەن:

١ - دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی لە سەر بناغەی سەربەخۆیی و ئازادی ئێران لە هەموو روویەکەوە، وە پاراستنی عەدالەتی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و مافە دیموکراتی یەکانی کۆمەلانی خەلکی ئێران.

٢ - دامەزراندنی سیستەمێکی ئۆتۆنۆمی یا، فیدەرالی کە کەمایەتی یە

نەتەوەیی یەکان تیایا، وەک یەک، لە بەر و بوومی شۆرشەکەیان بەر خوردار بن، وە بە مافە رەواکانی خۆیان بگەن لە چوار چێوەی ئێرانێکی ئازاد و سەر بەخۆدا.

پایەدار بێ شۆرشی ئێران بۆ هێنانەدی ئاواتەکانی
کۆمەلانی خەلکی ئێران
(برزوو)

# چەند لایەنێکی ژیانی زەبیحی

نەوشیروان مستەفا

## زەبیحی سیاسی

یەکێ لە سەروەرییەکانی مێژووی نوێی کورد کۆمەڵەی ژ.ک و، یەکێ لە سەروەرییەکانی مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی گۆڤاری نیشتمانە. یەکێ لە دامەزرێنەرانی چالاکی کۆمەڵەی ژ.ک و یەکێ لە دەرهێنەرانی سەرەکیی گۆڤاری نیشتمان رەحمانی زەبیحی یە، بەم پێیە لە هەردو سەروەری دا، بەشێکی گەورەی، بەم جوامێرە ئەبڕێ.

زەبیحی لە مەهاباد لە دایک بووە و هەر لەوێش سەردەمی هەرزەکاری تێ پەڕاندووە. زەبیحی کەسێکە خۆی خۆی پێ گەیاندووە. لە هیچ زانستگەیەکی بەرزدا نەیخوێندووە و شەهادەی وەرنەگرتووە، بەڵام خۆی بە ڕەنجی شانی خۆی سەرمایەیەکی زۆری تێگەیشتنی سیاسی، ئاگاداری ئەدەبی، ڕۆشنبیری، مێژوویی، زمانەوانی پێکەوە ناوە. هەر زوو بە باشی خۆی فێری زمانی فارسی و ئازەری و، هەندێ بنچینەی زمانی فەرەنسی کردووە. کەشمەکێشی ڕۆژگاریش ناچاریان کرد زمانی دووان و نوسینی عەرەبی و هەندێ بناغەی ئینگلیزیش فێر ببێ.

زەبیحی ئەبێ لە ناو هاوڕێکانی دا پیاوێکی هەڵکەوتوو بووبێ، ئەگینا لە ناو کۆمەڵێکی خێڵەکی دواکەوتووی وەکوو ئەوسای موکریان دا، کە هێشتا خان و ئاغا و بەگ چینی سەرەوەیان پێک ئەهێنا، بێ ئەوەی ئەم سەرۆکی عەشیرەت، یان خاوەن دێ و دێهات، یان خاوەن سامانی زۆر و بازرگانی بێ، بتوانێ ببێتە کەسێکی بەڕێز و گوێلێگیراوی وەها کە سەرانی خێڵ و کەسایەتی دینیی و پیاوە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکە بە شانازیەوە سوێندی ئەندامەتی و دڵسۆزی لە ڕێکخراوەکەی دا بخۆن.

کۆمەڵەی ژ.ک دەورێکی کاریگەری گێڕا لە گەشاندنەوەی هۆشی نەتەوایەتی کورد

دا لە موکریان و، دوای ئەوەیش لە ئامادەکردنی زەمینەی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان و پێکهێنانی حکومەتی کوردستان دا لە مەهاباد. دەوری زەبیحی لەم خەباتە پیرۆزەدا، چ لە دارشتنی پرۆگرامی سیاسی کۆمەڵەدا و، چ لە بنیاتنانی تەلاری رێکخراوەیی و، چ لە چاپ و بڵاوکردنەوەی نیشتمان و بڵاوکراوەکانی تری دا، لە ناو هاورێکانی دا لە سەرکردایەتی کۆمەڵەی ژ.ک دا دیارە. زەبیحی لە زیندانی ئێران دا بوو، کە کۆمەڵەی ژ . ک هەڵوەشێنرایەوە و لە جێگەی ئەو حیزبی دێمۆکرات دامەزرا. ئەگەرچی جێگەی زەبیحی لە سەرکردایەتی حیزبە تازەکەیش دا پارێزراو بوو، بەڵام ئەم گۆرانە لە بارێکەوە بۆ پێشەوەچون بوو، لە بارێکی ترەوە گۆرینێ بوو بە قازانجی چینی سەرەوەی کۆمەڵ، سەرکردایەتی جوڵانەوەی سیاسی کوردی لە دەس چینی ناونجی دەرهێنایە دەر.

زەبیحی، هەروەکوو لە دامەزراندنی حیزبی دێمۆکرات دا هیچ دەورێکی نەبووە، لە دامەزراندنی حکومەتی کوردستان و دانانی وەزارەتەکەی و دارشتنی رێبازە سیاسیەکەیشی دا، هیچ دەورێکی نەبووە. کاتێ لە زیندان ئازاد کرا هەردووکیان دامەزرا بوون و، ئیتر دەوری چینی ناونجی تازە پێگەیشتووی کۆمەڵیش کەم بووبۆوە، سەرانی خێڵ و زەویدارە گەورەکان و بازرگانە زلەکان هات بوونە مەیدانی کارەوە و، زۆری پلە و پایە بەرزەکانی حیزب و حکومەت لە دەس ئەوان دا بوو.

زەبیحی دوای روخانی حکومەتی کوردستان رووی کردە کوردستانی عیراق. وەکو ئەڵێن لەم قۆناغەدا هەوڵێکی داوە بۆ زیندوکردنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک و دەرکردنەوەی نیشتمان، بەڵام هەوڵەکەی بێ ئەنجام بووە. لەو ساوە زەبیحی بیرێکی لە لا گەڵاڵە بووبوو، کە تێکۆشەرانی کورد کەوتنە هەر پارچەیەکی کوردستانەوە، خزمەت بەو پارچەیە بکەن و لە گەڵ حیزبە سیاسیەکانی ئەوان کار بکەن. زەبیحی هەتا دوا ساڵەکانی تەمەنی پێرەوی ئەم سەرەتایەی کرد.

حیزبی دێمۆکراتی کوردستان، دوای هەرەسی مەهاباد، تووشی تێشکان بوو. تێکۆشەرانی دێمۆکرات تا پەنجاکان نەیانتوانی حیزبەکە رێک بخەنەوە. زەبیحی کە ئەودەم لە کوردستانی عێراق بووە، بۆ ئەم مەبەستە هیچ هەوڵێکی نەداوە، بەڵکو لە

بەرامبەر ئەوەدا ئەو کاتەی لە کوردستانی عێراق جێگیر بووە هاوکاریی پارتی دیمۆکراتی کوردستانی عێراقی کردووە و، دوای ئەوەی لە عێراق جێگەی پێ لێژ ئەبێ و ئەچێتە سوریا ئەوسا هاوکاری لە گەڵ تێکۆشەرانی ئەوێ ئەکا بۆ دامەزراندنی پارتی دیمۆکراتی کورد لە سوریە.

زەبیحی دوای شۆڕشی ١٤ ی تەمموزی ٩٥٨ گەڕایەوە عێراق و، وەکو هەر تێکۆشەرێکی کوردی عێراق، بە چالاکی لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان دا کەوتە کارکردن، تا گەیشتە کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی. لە ناو پارتی دا ماوەیەک لێپرسراوی لقی کەرکوک و ماوەیەک لێپرسراوی لقی بەغداد و، ماوەیەکیش لە ناو م س دا لێپرسراوی کاروباری دارایی بو.

دوای ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ کە هەردوو باڵە ناکۆکەکەی پارتی لە ژێر سایەی مەلا مستەفای بارزانی دا یەکیان گرتەوە، زەبیحی پشتیوانی لەم یەکگرتنەوەیە کرد. بەڵام وەکو هەندێ لە هاوڕێکانی، ئەم نەچوو لە لای مەلا مستەفا دابنیشێ، بەڵکو هەر لە بەغداد مایەوە، مەلا مستەفاش داوای لێ نەکرد بچێتە لای. زەبیحی ئەم قۆناغەی ژیانی بۆ ئامادەکردنی قاموسەکەی تەرخان کرد.

دوای ڕووخانی رژێمی شا، زەبیحی دوای چەندین ساڵ دوور وڵاتی سەردانی مەهابادی کردەوە و، بە دیدەنی خزم و دۆست و ناسیاوەکانی شاد بۆوە، بەڵام ئەم شادیەی تا سەر درێژەی نەکێشا، بەڵکو دوای گەڕانەوەی لە یەکێ لەم سەفەرانەی دا بێ سەروشوێن گوم بوو.

زەبیحی، لە ژیانی سیاسی دا، خۆنەویست و دڵ و دەرون فراوان و نەفس بەرز بوو. هەتا بڵێی ی نتم بوو. خۆی لە گێڕانەوەی باسی ڕووداوەکانی ژیانی سیاسی و ئەدەبی خۆی ئەبوارد، تەنانەت ئەوەی ماوەی زۆریشی بە سەردا تێپەڕی بوو، زۆر کەم باس ئەکرد.

......

## زەبیحی ڕۆژنامەوان

دەسپێکی ژیانی ڕۆژنامەوانی زەبیحی ئەگەڕێتەوە سەردەمی گەنجی، ئەو کاتەی

لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی دا کۆمەڵەی ژ.ک یان دامەزراند و، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری «نیشتمان» وەکو بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ.ک. بابەتەکانی «نیشتمان» زەبیحی کۆی ئەکردەوە و ڕێکی ئەخست و ئامادەی ئەکرد بۆ چاپ، هەر خۆیشی ئەیبرد بۆ تەوریز و سەرپەرشتی لە چاپدانی ئەکرد. سەرەڕای ئەمانەیش چەندین وتاری بە ناوی «بێژەن» تێ دا نووسیوە. «نیشتمان» گرنگیەکی تایبەتی هەیە لە ژیانی ڕۆژنامەوانی، سیاسی و ڕۆشنبیری کوردستانی ئێران دا. ئەگەرچی باسی دەرچوونی هەندێ بڵاوکراوەی کوردی تر ئەکرێ لە لایەن مژدەدەرکانی مەسیحی و، دوای ئەویش لە لایەن سمکۆوە، بەڵام، نیشتمان جێگەیەکی تایبەتی هەیە، سەرەتای دەسپێکردنێکی پڕ فەڕ و بەرەکەتە لە ژیانی ڕۆژنامەوانیی کوردستانی ئێران دا و، هەتا ئێستایش خەرمانێکی دەوڵەمەنە لە ناو کەلەپوری سیاسی کورددا.

کە حیزبی دێمۆکرات دامەزرا و، کەوتە دەرکردنی «کوردستان» زەبیحی لە گەڵ دوو کەس لە هاوڕێکانی لە زیندانی ئێران دا بوو، «کوردستان» هەواڵی ئازادی زەبیحی و هاوڕێکانی وەکوو مژدەیەکی خۆش بڵاو کردۆتەوە. ئەویش لەو ماوەیەدا چەند وتاری سیاسی لە نووسینی خۆی و هی وەرگێڕاوی تێ دا بڵاو کردۆتەوە. زەبیحی لەو سەردەمەدا شێعریشی داناوە.

رووخانی حکومەتی کوردستان، سەرەتای دەس پێ کردنی ژیانی دەربەدەری و ئاوارەیی زەبیحیە. زەبیحی ڕووی کردە کوردستانی عێراق و لە بەغداد گیرسایەوە، بەڵام لەوێش نەیتوانی هەتا سەر بمێنێتەوە. لە بەر ئەوە چووە سوریا. لەو سەردەمەدا کێشەیەکی قووڵ لە نێوان شیوعیەکان و نیشتمانپەروەرانی کوردا لە سەر ئەوە هەبوە، کە ئایا کورد بە پێی تەعریفەکەی ستالین ئومە، واتە نەتەوەیە، یان ئومە نیە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئەو زەمانەی لە شام بووە، نامیلکەیەکی بە زمانی عەرەبی نوسیوە بە ناوی: «الرد علی الکوسموبولیتیه».

دوای ١٤ ی تەمموزی ٩٥٨ کە هاتەوە عیراق، یادداشتە دەسنووسەکانی ئەم یەکێ لە سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەی عەلادین سجادی بوو لە سەر کۆماری مەهاباد. جگە لەوە هەندێ وتاری بە زمانی عەرەبی هەر لە سەر کۆماری مەهاباد بە ناوی «زانا» وە بۆ

خەبات نووسی. کە ڕۆژنامەی خەبات بوو بە زمانی ڕەسمیی پ د ک، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئیمتیازی دەرکردنی حەفتەنامەیەکی سیاسی کوردی بە ناوی کوردستانەوە وەرگرت. سەرنووسەری حەفتەنامەکە جەلال تاڵەبانی بوو، بەڵام کۆڵەکەی نووسین و ئامادەکردنی بابەتەکانی: جەلال تاڵەبانی، هەژار و زەبیحی بوون. کوردستان لە هەلومەرجێک دا دەرچوو کە باری سیاسی کوردستانی عێراق بەرەو گرژی و پەشێوان ئەچوو، صدیق میرانی خۆشناوی بە سەردا کوژرا و، مامۆستا ئیبراهیم فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو. ئەو گرژی و توندوتیژیە بە وتار و لێدوان و شێعرەکانی ئەم چەند ژمارەیەی کوردستانەوە دیارە. ڕۆژنامەکەش داخرا. زمانی ئەم چەند ژمارەیە تۆکمە و ڕەوان و دەوڵەمەندە.

دوای کەرت بوونی پارتی و، جولانەوەی کورد، زەبیحی لە گەڵ باڵی م س بەڵکو ئەندامی م س بوو. سالانی ٦٥ ـ ٦٦ لێپرسراوی لقی بەغداد بوو، ئەودەم بلاوکراوەیەکیان بە نهێنی لە بەغداد بە زمانی عەرەبی دەرئەکرد بە ناوی «باهۆز» کە تێکەلاو بو لە هەواڵ و لێدوانی سیاسی، لە سەر دۆخی عێراق و کوردستان. زەبیحی لە نووسین و ئامادەکردنی بابەتەکانی باهۆزدا دەوری سەرەکی هەبوو.

کاتێ ڕۆژنامەی «النور» لە بەغداد دەستی کرد بە بلاوبونەوە، پاش ماوەیەک پاشکۆیەکی مانگانەی کوردی بە ناوی «روناکی» دەرکرد. چەند ژمارەیەکی کەمی دەرچوو، بەلام زەبیحی نووسەری سەرەکی روناکی بوو. لە پاڵ ئەوەیش دا هەندێ وتاری بۆ «رزگاری» نووسی کە گرنگترینیان وتارێکی تیۆری بوو بە ناونیشانی: «سۆسیالیزم بە زمانی سادە».

## زەبیحی زمانەوان

زەبیحی، بە پێچەوانەی هەژار و هێمنەوە کە بیرەوەریەکانی خۆیان بە درێژی تۆمار کردووە، زۆر بە دەگمەن باسی خۆی و بنەماڵەکەی ئەکرد و هەرگیز دانی بە ساڵی لە دایکبوونی دا نەئەنا. کاتێ کە ون بوو تەمەنی لە ٦٠ ساڵ تێپەڕی بوو. بەشی زۆری ئەو تەمەنە درێژە ئاڵۆزەی بە کاری سیاسی و حیزبایەتیەوە بە سەر برد بوو، تەنانەت

ژیانی ڕۆژنامەوانیشی هەر بەشێکی لە جیابونەوە نەهاتوی ژیانە سیاسیەکەی بووە.
زەبیحی زیادتر لەوەی خۆی بە زمانەوان دابنێ، خۆی بە سیاسی ئەزانی. کەچی لە گەڵ هەموو ئەو بەشداریە گرنگەی کە لە ڕووداوە سیاسیەکانی هەردوو دیوی کوردستانی ئێران و عێراق دا، کردوویەتی، ڕەنگە ئەو کارەی لە بواری زمانەوانی دا بەرهەمی هێناوە، گرنگتر بێ لە هەموو کارە سیاسیەکانی.

نەبوونی دەوڵەت، کە هۆی سەرەکی زۆر لە مەینەتیەکانی کوردە، کاری لە زمانەکەیشی کردووە. داوودەزگایەکی تایبەتی نەبووە خەریکی زمانی کوردی و، کۆکردنەوەی وشەکانی و لێکۆڵینەوە و گەشەپێدانی بێ. لە بەر ئەوە ئەو کارە یەکتەنییانەی هەندێ لە زانایانی کورد کردوویانە، جێگەی ئافەرین و شانازین، کە یەکێکیان بەرهەمەکەی زەبیحی: «قاموسی زمانی کوردی»یە.

ئەو کاتەی زەبیحی دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بەرگی یەکەمی قاموسەکەی، چەندین فەرهەنگی تری کوردی - کوردی و، کوردی - زمانی بێگانە، لە کتێبخانەی کوردی دا هەبون و، هەندێکیان بەرهەمی گرانبەها بوون. بەڵام ئەو کارەی زەبیحی دەستی پێ کرد بوو، لە چاو ئەوانی پێش خۆی دا جیاواز و، لە هەمویان فراوانتر و قوڵتر بوو. مەخابن کە مەرگ، ئەویش ئەگونجێ بە هۆی کاری سیاسیەوە بووبێ، ڕێگەی نەدا جگە لە دوو حەرفی یەکەم و دووەمی ئەلف و بێ زیاتر بڵاو بکاتەوە و، ئەم پرۆژە زمانەوانیەی کە ئەبوو بە گەنجینەیەکی گەورە بۆ کورد، تەواو بکا.

گیانی زەبیحی شاد و یادی هەمیشە زیندوو بێ

........

بژی سەرۆك و كوردو
كوردستان و هیوا !
لا اله الا الله محمد رسول الله
J. K
دیاری كومەلەی ژ.ك
بولاوەكانی كورد
١٩٤٣ - ١٣٢٢

خویندره وه رزه کان.

ئەم کتیبە بچوکەی لە بیش چاوتانە لەم سی نامیلکەیە:

١ـ دیاری‌ی مەلا محمدی کویی

٢ـ گول بژیریك لە دیوانی حاجی قادری کویی

٣ـ دستە گو لیکی جوانو بونخوش لە باغی نیشتمان بەروەری هاتونە بەرهەم.

کومەلەی ژ . ك بو بیش خستن وە سەر خستنی کورد لە شەقامی شارستانیتی (تمدن) دا بە هەمو هیز و توانای خوی تی ئەکوشیت تابە یارمەتی خوا رەك وریشەی عەشیرەتو عەشیرەتبازی کەسەرچاوەی هەمو چارەرەشیو و بەسەرهاتیکی تالو گریکی (سخت) ە بینینەدەر

ئەمە ئومانجیکی (بهتان) ...

کە ئەمە ئەبین مەلا و شیخەکان بونە بەرهەلستی پیش کەوتنی کورد چونکو دیرینك (تاریخ) بومان دەرئە خاکە ئەم دەستەیە گەلی کاری باش و بەکەلکیان ئەنجام داوە و بوخدمەتی کوردایەتی تیکوشیون، چون ئەبی بەداتیکی وەك مەلا ادریس بتلیسی بیبژریت بەرهەلستی سەرکەوتنی کورد، باوەرمان نیە هیچ کوردیك خدمەتی ئەم بیاوە نیشتمان بەروەرەی لەبیر بچیت

لە نیو شیخەکانمانا جەنابی شیخ عبیدالله، شیخ عبدالقادر، شیخ سعید ئەبیندرین کە هەمو کوردیك ئەزانی ئەنیا لەبیناوی کوردایەتی داخویان ماندو کردەوە تاسەریان لەسەر داناوە

خلاصە لەنیو شیخەکانا پیاوی وەکو (شیخ یوسف شمس الدین البرهانی) ئەبینریت کە بەدەستوری ئەم دانە کتیبکی زلی وەکو (ابن حجر) کراوە بە کوردی داخەکەم وەکیر ایمە نەکەوتوە.

لە وانەی کە وا حاجی قادر و مەلا محمد جوت بەگژیانا مشیخ و کولکە مەلاکان کە خولە نوین، کرامت بەخەلك نشان ئەدەن ئەم دەستەیە بەهیچ کلوجیك ریکای حقیقتیان ئەدوزیونەوە بەلکو نابو (شیخ) شان بەر خاونەکەونوە. دەناوەکو سعدی شیرازی لەدیباجەی گلستانە کەیدا ئەلیت دکانرا کە خیرشەخیری باز نیادەیە بەدەنگ دائەنیشن وەوازیان لەخەلك ئەهینا بەلام عەشیرەتەکانیش کی هەیە لەدەسیان وەوەز ئەبویت، ناوەریکەن کارەساتی وایان هیناوە ئەدی کەدونیای شارستانیتی لیبان بیزارە تەنیا آغاوات و سەردار عەشیرەتەکان کەبونە مایەی دوبەرەکی یاجەنە دەرەکی لە کوردستانا ئەبیانەوانی بەر هەلست بوپیش کەوتنی کورد.

کومەلەی ژ . ك هەر ئەوان بە مسئول ئەزانیت.

• حەزئەکەی بیت بلیم چیە کوردی •
• عاقلی و چاکی و جەوان مەردی •

دیاری مەلا محمدی کویی

دەبارەی کومەلەی ژ . ك بو هەلسەندنی آغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد

لەخەوی ئەدەمی چاپ کرا

١٣٢٢

لەلایەن هەیئەتی ناوەندی کومەڵەی
ژ.ك پیشکەشی هەمو لاوە نیشتمان
پەروەرەکانی کورد ئەکریت.

٣

بسم الله الرحمن الرحیم

# آرەزو

زوربووە بەرخیکی لەر و لاواز
بوتە خەر تیکی دوگ زەلام و قەلەو
یا منالیکی سیس و مردوخە
بوتە پیاویکی گورج و گول وپتەو
گەلی ملت و مەا وسەر کەوتون
کە ئەبیتە خەیالووەهم وخەو
بویە اومید ئەکەم لەلطفی خووا
خالقی مانك و روژ و روژو شەو

٤

کوردە کانیش بکاتە صاحب جاە
سنەالله فی الذین خلوا
تەلەفونی بخسانە تماو کوردان
بانگی بەکثر بکەن بەدەنگی هەلەو
هەوهەوی میرەوان لە مەیدانا
زەازەلەی داتە ملکی کە بخسرەو
بینە زیر دەستی ملتی کوردی
هەراە باتو مەوە هەیە تا دەهلەو
بە نظر تو خدایە هاسانە
بازو شاهین هەلین لەدەستی کەو

آەو ناله بو ژیانە وەی ملت

هەتادەرم لەبو کوردان دەنالم
عیلاجیان جون بکەم هاوار بە مالم
فەقیر و جاهل و ناخوێندەوارن
لەلای نەوعی بەشەر بیقدرو خوارن
کەسی قەدری لەلای خزمان نەمینی

٥

لەگەل یەك بەد رەووشتو بەد نهادن
لە بویە واکەساد و بیمرادن
لە علم و معرفت روتن بەکلی
خەیالی خاوە لایان فکری ملی
حەسودن بویە بازاریان کەسادە
نەزانن بویە طاعەتیان فەسادە
لەسەر عەردی ئەوی کوردیزمان بی
لەلای وایە ئەبی سوك و نەزان بی
دەبی حەمال و گاوان و شوان بی
دەبی زەبیال و کەنناس وسەبان بی
دەبی هەرریش دریژو پانولە بی
دەبی هەر عاجز و گرژ و مەلول بی
دەبی هەر بەندەبی .. و ... بی
دەبی بیعلم و بی املا و قەلەم بی
ئەوەند بیهوش و بیدین و نەزانە

مەلاکانیش لەحەقیان زور خەیانن
ئەوانیش هەر دەلەی گەوجو ئەزانن
لەباتی باسی دین و رکنی ایمان
مەلا بویان ئەخوینی مدحی شیخان
ئەلی شیخی هەیە صاحب کرامت
نکاتان بونەکا روژی قیامت
شەووروژی بە ذکری خواخریکە
دیارە زور لەخدمت خوا نزیکە
گەلی جاران دەچیتە فەوقی عەرشی
ئەگەر حەزکا لەلای خوا دادەنیشی
خلاصە چەند خەرافاتیکی دیکە
مەلا نەقلی دەکا بەو فاك و فیکە
عەوامی قور بەسەروەك وائە زانن
جەنابی شیخ بە خزمی خوا ئە زانن
خصوصاً گەر ئەلین یا .....
جی وەهمیکی ئەداتە ذهنی عالەم



ئەوانەی شیخیان لایان خدایە
حسابی وان لە سەر توقی مەلایە
(مەلا) تو باسی خوایان بو بفرمو
و ها باشە لە بو وان و لە بوتو

(( قازانجی شیخە کانمان ))

هەتا شیخی لە کوردستان بمینی
اومیدی زندەگانیت بی نەمینی
طریقی ........ و ........
بە پایدا رونەتو آهەنگی کوردی
هەمویان بونە صوفی و پیرو دەرویش
بە بەر مال و سەبیحەو رشتە و ریش
هەمو بی‌ایش و بی‌کار و تەوەزل
وورگیان وەك ئەستور و سەلکەزل
لەوان و ئەرضروم تاحەددی جافان
تەوەللا بون لەعقل و علم و عرفان



بەوی شول و بەوی عقل و تجزی
محقق قەومی کورد نابیتە ریزی
بەریشی گرز و پرچی پرلە ئەسپی
بشاغەی ابشی کوردان چون ئەچەسپی
بە کەشکول و سووال و فقر و ذلت
محالە کاکی خوم تەشکیلی دەولەت
هەمو بی‌هوش و بی‌گوش و نە زانن
ادارەی ملك ودەولەت چون ئەزانن
امید وقەط نە بی کورد بیتە دەولەت
لەبەدبەختی ئەویستا بونە سەلەت
ئەوەی زانایە ناو جەرگی بەلاسە
ئەوەی نادانە نازانی چە باسە
جەنابی شیخ ئەلیت آخر زەمانە
قیامت را دەبی هەربە و زووانە
ارادەی خوایە ایوە هەروە هابن
وەکو هاروت و ماروت ین ... روبن



بلی با شیخ قیامەت ایوە را بو
بەجەهلو تەنبەلی مالمان خەرابو
لەبەر قەولی پیر و بوچی ئەمانە
لەدەس کوردا نەما غەیری هەمانە
لەبەر ئەزوبری وان شیخانی بەدبەخت
گەلی کورد نابتە صاحب‌رایەتو تەخت
لەبەرچی کاری خەلکی وا دورستە
ئەگەر هیندوکە گەر آگر پەرستە
ئەگەر (لازە) ئەگەر (رومە) ئەگەر (جوو)
لە زیر نیری ئەم و ئەو باکی دەرچو
ئەگەر راستە ئەلەی دونیا خەراوە
لە بوچنە ئەو هەمو جوتو بەراوە
ئەگەر دونیا خەرابی بەو نیزیکە
جە نابت بو بەدونیا واخەریکە
ئەگەر عزت دەوی هەستە بە همت
بەذکرو صەبرو تەدبیرو کیاسەت

١٠

ئەبی ملت هەمو یەك بی لەگەل یەكێ
لە ئەربابی قەلەم تاخاوەنی چەكێ
ئەگەر كوردیك اهانەت كەن لە بەصرە
هەمو بینە خروش و جوش و نەعرە
هەتا حقی ئەسینن را ئەوەستن
لەبەر بی اتفاقی خوار و بەستن
خەزینیكو هەبی مال عموی
وەكو (جوو) و (ئەرمەنی داشناك) و (رومی)
لەروبیە و آنە و جاریكێ و غازی
بەكەلكودی لەروزی پەنجە بازی
فریدەن مەنتەشاو بەرمال و كەشكول
ئەرك كەن تەبل و رەقص و خذمەت وشول
تفەنگێ و توپ و تەییارە پەیاكەن
بەعەزمی دین و دونیا رو لەخوا كەن
وەكو شیر وەرنە مەیدانی جەرارەت
بەغیرەت بن بەغیرەت بن بەغیرەت

١١

پیاوی ترسەنوك وەك یوشكەسوكە
ژنی بیوەبەكورکە و نوکەنوکە
صەحابەی رەش كەوا قەبری دیارە
بەساقەی سی عات دوری لەشارە
صەحابەی **مصطفی** كەرترسەنوك بان
چی ایشیان بو لەتوركستان و ایران
بەكەن خوفی نەكەن ترسی لەهیچ كەس
بەغەیری پادشای داداری ئەقدەس
دەبی بی شك و شبهە وانە زانی
بەتەحقیری حەیساتە و زندەگانی
ئەوەی دونیای ئەبی دبنی ضەعیفە
مەلایی یانە شیخ بی یان خەلیفە
مەداری دین و دونیا هەر غینایە
بلی (الفقر فخری) افترایە
هەوایی كەورەیی دەركەنلە نیوسەر
بەبی توپو تفەنگو مال و عەسكەر

١٢

محقق تا قیامت شانە بەكەلك
ئەگەر توپو ئەبی بان اون ایكی لك
بەغەوواص و بەپاپوری زرەهلی
بە باوان و بە زیپلینی زرەهلی
لەدونیا هەرچی بیت كوردی محقر
ئەبی یارە لەبوت نابی میسر
وولا نیكتان هەیە پركان و مەعدەن
بەپیل و پیەرە دو قووتی لیدەن
دەزانن شاوی ئەرزی چە تیایە
وەلی مەرقومی ئەمری كیمیایە
هەتا ئەو علمە زور چاكی نەخوینن
دەبی هەر پاقلەو سلقان بچینن
مەلای شادان بەعنوانی شەریعەت
حەرامی كرد لەتو علمی طەبیعەت
لەبوی هەرچی لەوخاكە وەدەر كەوت
لە (رادیوم) و لە (زیر) و (پاقر) و (نەوت)

١٣

هەموی كەوتوتە ژیردەستی فەرەنگان
چیاوچولان ئەبورن وەك پلەنگان
بیان بورن جیایان چون ئەكولن
هەتاكەی ایوە هەر بەر مال بەكولن
(سوری) و (ماز) و (كەتیرە) و (حەوت) و (گەلوان)
وەكو (سیچكە) و (بنیشت) و (دون) و (قەزوان)
دەخیلو بم نەكەن بیدەن لەدەستو
والا وا بزانن روحو دەرچو
هەتاكو لەبەنە خاوەندی صەنایع
هەمو نیعمەی خوا ئەروا بەضایع
بەخورایی ئەچی عومری عەزیزتان
بەهاوین و بەهار پاییز و زستان
مەچو نەخانەقا و جابی خانان
لەمیدم وایە بمە خانی خانان
ئەگەر خواهیش ئەكەن خواو لی بی‌زاری
ئەچونە تەكیە كان بو حوقە بازی

١٤

قناری قط مەکەن ایوە و خدا تان
دەنا بەر یاد نەبی مال و منالتان
بەجی بینن ئەوەی واجب کرایە
بەوی نەوعی کە مەطلوبی خدایە
ئەگەر بلب جاهلە یا کور مەلابی
لە ئەحوالی امم بسا شارەزابی
• سەیاحەت کەن بچن بو سووەتستان ١•
• بزانن چون بە خیرانی هەلستان •
• لەقەومی روس چەظلمیکی ئەکرد (چار) •
• هەموی زمەری ئەخوارد ملت بەناچار •
• لەبر (لەنین) هەلستاوەك دلیران •
• بناغەی ظلمی چاری کرد ویران •
• بنای نا دەو لەتیکی سوسیالیست •
• لەناوی برد بەجاریك ایمپرالیست •

١- ئەم شعرانەی لەبو قولابەکانا نوسراوت لەلایەن بیژن نووسەری کومەلە هولراونە وە

١٥

• لەناو کومەل بە زوری دەر کرا (خان) •
• بە تیلا (بەگ) خرایە بەندو زیندان •
• بەمەحضی هەل کرانی بەیرەقی سوور •
• لەناو خەلکانەمافیتنەو شەرو شوور •
• ئەلەرزیت کاکی (آغا) وك بنی آو •
• کە آلای سوور و آلی دیتە بەرچاو •
• تەماشا کەن لە مەیدانی هەراوشەر •
• چلون سەربازی سور ! آزاو دلاوەر •
• شەرو روژ بی‌ووچان وانی ئەکوشن •
• لەجەبهەی‌شەر ئەلەی شەربەت ئەنوشن •
• بەفەرمانی ستالین : پیاوی شەرکەر •
• ئەدەن بەرباهە مو نەیروی هیتلەر •
• بەیانی بلبلی سوتا و لە بوکول •
• وەهائە بخویند بەدلسوزی لە سرچل •
لە دونیادا دەبی هەر کوردی بەد فەر
نەبیتە خاوەنی دەیهیم و ئەفسەر

١٦

وەژیر کەوتوو رەزیلی کلی ملت
بەلای لیدا زیانی وا بە ذلت
نەمان خویند و نەمان دیتو ئەمان بیست
عەلە مداریك لەنیو کوردان هەلستیت
ئەتو ئەی مامە کوردە بیم بلی چیت ؟
کەلاش خواری کراس دریاو کە وا چیت
کە بو قیچ و لیچ ئەستورو ددان کر
کەتو کویرو کەررو کیرو سەلك خر
هەتادە مری بەخواری رای دەبوبری
بە بەد بەختیو بەبی دەستیو فەقیری
بەجان و دل لەرەببی خوت ئەخوازی
زگت پربی لە ئەستورك و پیازی
بە کوردی بیت بلیم ایشت شلوقە
دووای چی کەو تووی بەم کور کە اوقە
کر بنی من لە بو تو یە و الا
ئەمام بیت نیە حاشا و کلا

١٧

ئەتو چو نیك دەژی من هەر (مەلا) مە
ایتر بەسیە برام خەتمی کە لامە
من پەخەی خولەبویە دائەدرم
ایوە نابن بە هیچ و من ئەمرم
دەبی من کە یقی جیم بە دونیابی
قەوی من وا رەزیل و رسوابی
بی کەس و بیدەر و فەقیر و هەژار
بی سەر و سەرفەراز و بی سەردار
ئەوی ریگای لەکوردە کان کوری
لەعنەتی خووای لە ئەلحەدو گوری
ملتی کورد فەقیر و بەستە زمان
بەقەی ئەوکە سانە چون خەداتان
وا نەزانن کە عنصری کوردی
بە دەلیلی بژیت و نامەردی
ئەوی کوردە چی گەورەوو چی صغر
ایشکی . . . . . گویدریژی . . . . .

١٨

ئەوی کوردی لە ئەسلی یاب آدم
دەبی بارکیشی . . . . . عەبەی . . . . .
قوری کام جی بگرمەوە بو تان
بو برایانی جزیرە و بوتان
خمی دونیا بکەین بەسەر خومان
بو عەزیزانی ئەرضروم و وان
ایوە هەر چەند کە قەومیکی زورن
فایدەی چی کە توخمی خو خورن
وا ئەزانن کە کورد گەلی زیندون
من ئەبینم علی العموم مزدون
واوەزیر کەو تورن بەبی دەسەلات
رەبی ئەو قەومە بوچی وای بەسەرات
باشی سلطان صلاح ئەیوبی
زور نەچو بو یەدەوری مەنکوبی
چی عەشیرەت چە ئەهلی شارستان
لە هەمو طول و عەرضی کوردستان

١٩

بونە یەخسیرو نوکەری ئەم و ئەو
باری خەلکی دەبەن بەروژ و بەشەو
لەسەر ئەو خالە یەکتری ئەکوژن
خوینی یەکتر مثالی شیر ئەمژن
دەرحەقی یەك ئەوەندە زور ئەومرن
کەلەکەی یەك بەشیر و روحب ئەبرن
بەزگیك تیر بەدوزگان برسی
هیچ لەجاکە و خەرایە نایرسی
جاهل و بی کەمال و شەرمی حضور
أبغضی خەلکی خوا فەقیر و فەخور
حەیفە بو غیرەتی ( صلاح الدین )
ئەوکە یسانەش بلین ئەمەش کوردین
حەز ئەکەی بیت بلیم چیە کوردی
عاقلی و چابوکی و جەوانمەردی
عاصریکی لە فەوقی . . . . . و . . . . .
صاحبی حەزم و رەزم و بەزم و کەرەم

٢٠

لاوەکان قەدری ئەصلی خو ئەگرن
بیرەکان بالەذاتا بمرن
خاصە ئەو باوەکانی مەکتەبی ( کو )
دەبنە پشت و پەناهی ملتی خو
ایوە ئەولاد و جەرگ وناوی منن
ایوە نوری گلینە چاوی منن
عومری خوتان مەبەن بە خورایی
تی بکوشن بە علم و آزایی

## بو آگاداری و ووشاری لاوان

هەستە بیشکەوە ئەی لاوی کوردی
آگت لە خوبی کاروان رابردی
بە نوری علم ریگا وە دەر خە
بەزوری باسکان بلری وە سەرخە
بە بالی علم بفرە وەك طەیران
بە قووەتی علم هەرزبن بەحران

٢١

علمی طەبیعەت علمی خدایە
قالەوی قولە گشتی ئەمەوایە
علمی حکایەت گەر کەلکی هەبا
دەبوایە دونیا هەموی بومە با
علمی کیمیات گەر نەخویندووە
بەخوانازانی خواچی کردووە
ایمە پابەندی وەهمو خەیالین
ایمە خەریکی کەریدە ججالین
علمی صەنایع لای ایمە نیە
گەر شتیک هەبی ئەویش قەولیە
بەئیر و زاز بو شیریز و لورکە
نەتیجەی علمی کیمیایە بی شك
بەگلیکی صبی و بەآوی تری
دوشاوی شیرنت چون بو ئەکری
کاردوی وەك کبرد زیانت دەبری
بەترش و سماق ژەهری چون ئەبری

علمیکی گەورە لە ناو کوردان بو
بە قسەی برۆیوچ چون لە کیسمان چو
بە دەف و دەمبەک بەرەقص و سەما
علم و مەعریفەت لای کوردان نەما
بەخووا زور حەیفە حەیف و مەخابین
ملتی کوردی هە تاکەی واین
جەهالەت بروا دەوری عیرفانە
کو نەباب بمری نورەی کورانە
ئەی لاوی کوردی نوری دوچاوم
قووەتی دلم جەرگ و هەناوم
باوانی بابم لاوانی مەکتەب
بە عەقل و عیرفان بە علم و ئەدەب
بە ئەخلاقی چاك بە دین و ایمان
بە ریك و پیکی وەکو برایان
لە گەل یەکتری وەك روح و بەدەن
ابتزاج بکەن بو عزی زەمەن



ایوە بوومەتەوە ئەولادی صوفی
خدا توفیقتان بدا یارە ببی
هیچ فەرقو تاکەم لە گەل مەسعودی
خوا بو پاریزی لە چەنگ حەسودی
مجید و صلاح لای من وەك ایومن
ایوش برازاب بیم باوەر بکەن

## چلونی باوەری جاهلانی خەلەتاو

ئەلین باران بە ئەمری شیخ ئەبلزەی
بە ئەمری «کن فکان» وەك ئەمری باریی
خلاصە کافەیی ذەرراتی عالەم
چی افلاك وچی املاك وچی ئەنجوم (ەبیوم)
بە ئەمری حەضرەتی پیرە دەوامی
حەیات و مەوتو تەرتیب و نظامی
(مەلا) گەر بیت بلی نابی ومعابی
ئەلین ئەو فاسقە بوتە وەهابی



ئەوی ئەی شیخە پیسی بوری چلکن
ئەوی ئەی وورك هەمانەی زار بوگن؟
ئەتو دەوواری چەرخی بی‌ستونی؟!
ئەتو توقینەری چەشمە وعیونی؟!
ئەوی ئەی‌شیخە کویری‌خواری مەجذوم!
ئەتوی نایب هەنابی حی‌قیوم؟!
ئەری‌ئەی پیستە خوری لیناك کوراوی!
لە گەل ذەرراتی عالم تیکەلاوی!
ئەتو ممتازی رزقی مار و موری؟!
ئەتو انشا کنندەی نار و نوری؟!
بە حکمی تو ئەبی عفوی گوناهان؟
وەکو پاپای نەصارای خیوی غفران؟!
ئەوی عەفوی بکەی جیگای ئەعیمە!
ئەوی عەفوی نەکەی مأوای جەحیمە؟!
هەمو عالم لە ژیر فەرمانی تویە؟
حەیاتی توش! بە مستیك آردەجویە!!



ئەگەر ملکە هەمو ملکی خدایە
ئەگەر شیخە ئەگەر قطبە هە بابە
ارادە و قدرەتی خوای من تەواوە
چەحاجەنمان بەشیخ‌نابی کراوە (مشوحەروا)
بە ئەقطاب و بە ئەوتاد و بە ئەبدال
ئەبوبە (آدیسون) ئەی مردی بەتال
لە علم و اختراعا چی وەدەر حست
بنورە ملتی خوی کو وەسەر خست
بە علمی کیمیا و قووەتی نور
بە تەییارە و بە زیپلینو بە وابور
چلون قطبی قەبریان بی نیشان کرد
ربا و تەزویری شیخیشیان عەیان کرد
موسلمانان لە چەنگ وان کورد ذلیل بون
دەفەرمو شیخە شیتی گیژی مەجنون
بزانم تونەو پساجت لەدەست دی؟؟
لە بەحر و بەرو و جەبل و شار ولادی

٢٦

وەرن ئەی اومتی خیر البریە
لە پاش تەقدیمی اخلاص و تحیە
بە علم و عقل و هوش و فکر و عرفان
بە قەولی **مصطفی** و آیاتی قورآن
بزانن ئەوقسانە پاکی بوچن
ئەگەر خوامان هەبی اقطاب بوچن
بەقەولی جاهلان خوتان مەگورن
بە چاوی دل لە دونیایی بنورن
لەژیر ئەرزی هەتاکوژور و ژیرو
لە مانگ و روژ هەتاکو مار و میرو
بە کەمو کەیف و وضع و چەندوچونی
بە ئەطوار و بە ئەدوار و سکونی
(گەلاویژ) چەند زەلامە چەندە دورە
(سوها) تاریکە یا خوزور بە نورە
هە یا چونە لەجی ترکیب کراوە
نطاق ئەو گەرانە چون دراوە

٢٧

ئەگەرانی چونەکی ئەیکا ادارە
لەبوکی دیتە تەعداد و ژمارە
بە غەیری قودرەتی داداری جبار
بە غەیری پادشای خلاق و قهار
بە قطبیکی ضەعیف و ناتەوانا
ادارەی چون ئەبی ئەی مەردی دانا
ئەوەی لای ایوە داواری امورن
لە بەر دەستی خوا کەمتر لە مورن
کەسی ایمانی بە خوا و قودرەتی بی
چاون ئەو اعتقادەی دەچتە قەلبی
قسیکت بونە کەم چاکی بزانە
قبولی کە بی عذر و بەهانە
لە سەرزار و زمانان گەرچی سوکە
لە میزانی حەقیقەت زور گرانە
بە خیری خوت بە خەلکی راگە یینە
هەتا ظاهر بی ئەو سری نیهانە

٢٨

هەتاکو ئەهلی شار و دەشت و لادی
خەبەردار بن لە ئەحوالی زەمانە
بوخوت ئەحوالی لادی چاك ئەزانی
یەکی جوتیار یەکیکی پەرخەوانە
فلان آودیرە ئەوپات عەرد ئەکیلی
شووانە ئەم ئەویتریان سەپانە
خەریکی کار و بار و جوتو شوان
لە فیلی فیل گەران ناشارەزانە
مەلا پیسکیان هەیە منداڵی لیمدا
نەخوێندەو و ئەحمەق و بوچ و نەزانە
وەکو گەر گرتە خوا دایم لەدی دا
بە ریشی یان ئەلەی عالمی جووانە
ئەویش بو شیخ وەکو کلبی معلم
بە دەم گەر و پشکی بوئەگری لە لانە
ئەلی توبەی بکەن لای شیخ بە گورجی
قیامەت رادەبی هەر بە زووانە

٢٩

دەزو چیشتی لە بو شیخی دوروست کەن
بلاوساوار و شلکینە و کەلانە
بە عام کویخا بلین ئەسبابی ریکخبی
لە بو شیخ شەو دەبیتە دیوەخانە
کەنیزیك ساعەتی دوبوهەتاسی
لە بو پیاوان بەسە نورەی ژنانە
ژنی کویخاو ئەهالی دینە جەذبە
ایتر هاوار گریان و فغانە
لە پاش ئەو هایوهوی و تیکوتانە
دەلی ئەی قەوم وگەل کوکەن اعانە
مریشك و هیلکە و چوینتیر و کاوور
کەرە و ئەندوك و ساوار و هەمانە
گوریسو سیبەك و ناو دوکو هەشکە
جەوال و تورەکە و تیروك و خانە
لە ئەقدینەشی ئەوی حاضر بە دەستە
لە روپیە و جوتە و وچاریك و آنە

٣٠

هەموی حاضر بکەن بی خو خوراندن
دەحیرابن بسە چوستیو عاقلانە
بەهەر نەوعی کە شیخ تەشریفی رویی
یەکی عاقل هەلئەستی اەو میانە
ئەلی ئەی قەوم و گەل ایوە بەاەدنین
اەکەیدو فیل و نەیرەنك و فەسانە
لەلام مەعلوم بووە بی شك و شبهە
بە آثار " و بە ئەتوار و نیشانە
نەهەمی مەقصەدی شیخی زەمانە
اەئەم دەورە دراو و نان و .......

تەواو بو

نووسەری کومەلەی ژ . ك بەبونەی
هەندی دەستکاری شعرەکانی ئەم دیاریە
لە جەنابی مەلا محەدی کویی تکاو داوای
چاوپوشین ئەکات
کوردستانی موکوریان - لاجان ١٣٢٢ - ١٩٤٣

خوینەرە بەرزەکان:
تکاتان لی ئەکەین دوای خویندنەوەی ئەم نامیلکەیە هەر هەستیکی ( حس ) بەرانبەر بەشیخ و مەلاکان لەدەروونتانا پەیابو هەرئەو هەستە دەر بارەی آغا و سەرادر عەشیرەتەکان بوخوتان پەیاکەن چونکو بەپی ی بەر آوەردیکی زور وورد کە ایمە کردومانە هوی هەرە زلی دوا کەوتنی کورد عەشیرەتو عەشیرەتبازیە نەك شیخەتی و مەلایەتی.

« تەنیەای کاری حیزو بی خیرە »
« دەستی ماند و لە سەرژکی تیرە »

٣

# گول بژیریک

## لە دیوانی حاجی قادری کویی
## بلبلی نیشتمانی کورد

بە بارەی کومەلەی ژ . ك بو ور شیاری
آغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد
لە چاپ درا

١٣٢٢

هەیئەتی ناوەندی (مرکزی) کومەلەی ژ . ك
ئەم سیباریە پیشکەشی گیانی ( روح ) لاوی
رەحمەتی م . ص . توص ئەندامی ژمارە ١٣
کومەلە ئەکات.

٣٥

بسم الله الرحمن الرحیم

به‌سه‌رهاتی حاجی قادر به کورتی

حاجی قادر کوری مەلا احمده لە گوندی « گورقەرەج » لە سالی ١٢٣٢ ی هجری هاتوته دونیا
بەهاری ژینی حاجی بە خوێندن و نیشتمان پەروەری لەشاری ( کوی ) رابراوە لە دوواییدا چوتە ئەستەمبول میوانی بەدرخان پاشا ئەبیت کورانی بەدرخان پاشا بە دەستی ئەم پیاوە نیشتمان پەروەرە پەروەر اون .

٣٦

حاجی قادر گەلی شعری نیشتمانی و غزلی هەبوە بەلام لەدەس دەرچون « غیرەتی ملی » کتیبێکی شعر بوە کە حاجی بوخوی کویکردبوو لەکاتی مردنیا بوله چاپدانی ئەم مجموعەیه زور تکانەکات داخە کەم کەئەم خزینە هیژا ( نفیس ) یە لەدەس چە نابی ( عبدالرزاق بەگی بەدرخانی ) دائەبیت وەکو ئەزانن ئەم ذاتە لەلایەن حکومەتی عثمانی محکوم کراوله موصل خنکاندیان « خواله هەمو پیاویکی نیشتمان پەروەر خوش بیت »
« حاجی قادر لەتەمەنی ( سن ) هەشتا سالیدا و اتا لە سالی ١٣٩٢ ی هجریدا لە دونیارویوە .

٣٧

( ستایشتی خوا )

ئەی بی‌نەظیر وهەمتا : هەرتوی کە پەرقەراری بی دار و بی دیاری ؛ بیدار و پایەداری بوباغی مەردی پاکی : دەسمایە کەی خەزانی بو مەزرەعی فەقیران : بارانەکەی بەهاری بو پادشا نیشانی بوهەر سەوادی ئەعظەم بی‌صەدر و شانشینی ؛ بی پەردە پەردە داری جەبباری بی فتوری ؛ سولطانی بی قصوری رەززاقی مار و موری ؛ آودیری دیمە کاری فیروزە تەختی گەردون : مەصنوعی نەقشی تویە یاقوت و لەعل روزە ؛ ئەستیرەکان دو راری جی و مەکانی تویە ؛ بی جی و بی مەکانی لەیل و نەهاری تویە ؛ بی لەیل و بی نەهاری هەر ئەمری تومەدارە : بو کار و باری عالەم هەر جەندەبی وەزیر و بی صەدر وکارو باری

٣٨

صەحرانە وەردە : شوقی خورشید وماهی تابان دو جاریەن شەوو روز : بی مەحمەل و عەماری مەعلومە بوچی حاجی : مەدحت ئەکا بە کوردی تاکەس نەلی بە کوردی : نەکراوە مەدحی باری

باالهی بە آیەتی منزل
بە جوار یاری احمدی مرسل
بی‌ئەوایانی مولکی کوردستان
هەرلە گاوانی تا دەگانە شوان
لەخەوی جەهل و مەستی وغەفلەت
بەخەبەر کەی بەنە عەبی رەحمەت
پاکی دەرچن لەکاری نابەمحل
روی رافرینن بودەری ئەسفەل
حاجی‌یە : شعرەکانی وەک کاوە
روژی دەبینن درەوشی هەلداوە

٣٩

هەر کوردە لە بەینی کلی ملت
بێبەهرە لەخوێندن و کتابەت
بیگانە بە ترجەمەی زمانی
ئەسراری کتیبی غەیری زانی
یەکسەر علما درشت و ووردی
نەی خوێندووە هیچ دو حەرفی کوردی
ممکن نیە دەر بچی لەچەنگی
حەتتا رەقەم وخەطی فەرەنگی
صاحب کتیب و پەیامە هەر کەس
ایمە ئەبێ بووینە قەومی چەرکەس
ملتی بێ کتیب و بێنوسین
غەیری کوردان نیە لەرووی زەمین
(جوو) چە قەدری هەیە لەپێو کوردان
غەیری لیدان و جوێن وتی هەلدان
قەومی (جوو) چاکە اتفاقی هەیە
کورد بێغیرەتیو تفاقی هەیە

٤٠

( چەنگنە ) ی ابرە باوجودی کەرن
هەروەکو درمی ایمەدەر بەدەرن
ایوە عاقلترن بە صەد مەنصەب
کورەکانیان دەنیرنە مەکتەب
ایستیکە آمرانی کوردستان
هەرلە ( بوتانە ) وەهەتا ( بابان )
ئەم هەتنوانی مەکتەبەن یەکسەر
کوردەکان باردە کەن وەکوو . . .
وادیارە هەتاکو دونیابی
کوردەکان حالیان دەبی وابی
لەگاوان و شووانی کوردەکان یەك
بەسە بو لەشکری صەد کەررە دوالەك
بەسەر گەردی شووانتان حاتەمی طەی
بە قوربانی سەیانتان آلی بەرمەك
مریشکی ایوە صەیبادی شەهینە
لە کن عونقا فروجە حاجی لەك لەك

٤١

شووانی میگەلی ایوە لەشەرا
وەکو قەسابە دوژمن میگەلی‌شەك
لەبەر حیزە بخوێی و نانەبابی
لە ژێری حیزی حیزان بوینەدوشەك
هەتاوەك آگری ژێرکان لەگەل یەك
ئەگەر توفان بێ لەشکرتان بە پوشێك
لەکوێەی گانوستووون بویە کەریوی
لە سەرایوە وەماشیر گیرەوەك سەگ
صەلاحی ایوە ایستاکە سیلاحە
طەماعی گەورەی بێچەك نەکەن ئەك
کراوە انتخابی دوشکە صوفی
لەدیوانی کەری بێ‌نقطەیی شەك
تاریك نەکەون قەبیلی ئەکراد
هەر وادە بنە خەرابە : آباد
ئەنواعی مال لە گەورەتا چوك
خەملیوە ممالکی وەکو بوك

٤٢

یەك بەر گن و یەك زمان ویەك رەنك
بێ غەیرەتو عەیبو عاروبێ دەنك
دونیابە بەهەوادە خوێن و دەبەمن
هەر چونی مەرامیانە دەبکەن
هەر کوردن : گەرچی باکی مەردن
پامالی زەمانە مەحوی کردن
هەر مانە وەبێ ئەواوو مەظلوم
وەك بومی خەرابە زار و مەشئوم
گەر باعیثی ئەم دەپرسی کامە .
شەرطیکە کەیوهە مو ئەمامە
ئەو شەرطە یەکلی اتفاقە
گەر مەرعەشو وان و گەر عراقە
صەد شیخ و مەلا و ئەمیر و خانی
بولذتی عەیشو زیندەکانی
لەولاوە ئەوان بە حیلە سازی
لەم لاوە ئەوان بەتەقلە بازی

٤٣

قوربان ئەمەندەو وولاتی داوا
تاموتكو رەشیدە پاكی فەوتا
یەكیان ئەمی تودەكەی تەبات كرد
غەمیان نەبو «كورد» ئەگەر هەموو مرد
ادیا جاكە لیم نەبن دەرهەم
لەم قسەو لەم حكایەتەی دەیكەم
خانەقا و شیخ و تەكیەكان یەكسەر
بیم بلین نەفعیان چیە آخەر
غەیری تەعلیمی تەنبەلی كردن
جەمعی ئەملاك و پارەكو كردن
دەفعە یێك امتحانیان ناكەن
تی بكەن زەهرەیانە تریاكەن
عەكسی لی بدەن ئەگەر وەكو زەر
تیدەگەن رانكرن وەیارەهەر
دەخیلی شیخ و میخ مەبن ئەبەدا
هیچ كەس رزقی هیچ كەسی نادا

٤٤

ئەی حەریكی رموز و مار ونیار
ئەورو باوەنی گەیوەتە اعجاز
قوتلەكەی (ایفەلی) لە ئەوولاتە
عەكسی ئەو گەر دیشی لەژیر خاكە
كوردی ئەم رەمینەیان بیوا !
حاضری نوبی جوبە جەووی سەما
جیی بودا پەرەستن ایستاكەش
گەبری بی دین و هیندووی رەش
بوچی فەرمویەتی نەبیی ئەمین
(اطلبوالعلم واو بالصین)
نیرومی لەم حەدیثە فەرقی نیە
گەرمەلا نەهیی فەرمودیەی نیە
تووره فیری فەن بەجیتەلەوە
(گاور)ە یا (جو)؛ وەیا (هیندو)ە
لازمە خول بخوی وەكو بەرداش
هەمو فەرنیك دەگوری ئەمری مەعاش

٤٥

تەنبەلی كاری حیز و بی‌خیرە
دەستی مالدولە سەرزگی تیرە
ئەهلی حەیست تەشوان و گاوانە
صاحبی فەنو علم و عرفانە
فندەی گەر بدایە ذكر و دعا
دەبوە قارون گەدایی سەرریگا
هەرچی بی بەهرەبو لە كەسبی كەمال
بوتە دەرویش و مارگر و حەممال
صوفی گەر تەشنە بولەذكری هەنار
صەد دوویزی دە دایەكاسبێك آو
اتحادی بە اتفاقی ئەنام
سوبەرە بو حەوادثی ئەییام
كوردی ایمە بەزان و پاش كەوتن
بیكەوە بوش و آگروەتوتن
خو ئەگەر دەستی یەكتری بگرن
وەك (سكەندەر) جهان هەمو دەگرن

٤٦

...

ئەگەر كوردێك قسەی بابی بەزانی
محقق دایكی حیزە بارگی زانی (زناكار)
وەرە بابوت بەلام باسی نیهانی
نەفس خوشە گەر جاكی بزانی
(صلاح‌الدین) و (نورالدین) كوردی
عەزیزانی (جزیری) و (موش) و (وانی)
(مهلهل) (ئەردەشیر) و (دەیسەم) و (شیر)ە
(قباد) و (باز) و (میری) و (ئەردەلانی)
ئەمانە پاكیان كوردن نهایەت
ئەبەربی دەفتەری وون بون و فانی
كتیب و دەفتەر و تاریخ و كاغەز
لە كوردی گەر بنوسرایە زمانی

* بوناسینی ئەم حكمدارە كوردانە تەماشا كردنی كتیبی كوردستانی موكوریانی «آذربایجان» تابلی جرنی موكوریانی گەلی زیاری بەكەلك [illegible] — بیژەن

مەلا و پیر و شیخ و پادشامان
هەتا مەحشەردە ماناو نیشانی
خودەزانن سلالە یی ئەکراد
لیرەوە بکرە تا دەگاتە (قباد)
هەمو عالم هەمو شیخ و میرن
زیرەك و زیرو ئەهلی تەدبیرن
وەسەطی یانی یازدە روژ ریەیە
پرلەرەش مال و خانە و دیەیە
بە دریژی لە (قاف) کەرا بوردن
تا بە (شیراز) و (اصفهان) کوردن
شاسوارن پیادەیین آزان
پرد نیشیان وەکو لکی مەیدان
جود و بە خشینیان لەلاباوە
خوینی مەیدانیان لەکن آوە
بە شجاعەت هەمو وەکو (روستەم)
بە سەخاوەت هەمو وەکو (حاتەم)



لەوەقا سموئیل و اسماعیل
عەهدو پەیمانیەن چیای قەندیل
کوردی شانامە پاکیان کوردە
کافی ئەم صافەکافی ئەووردە
لەشەرا زور کەرمت وەقەوماوە
رومیانیەن چلون جوواب داوە
(حاجی) دەمریت لەداخ: هاوارە
کوردی بیچارە دەبنە آوارە

---

## سنوری کوردستان

کوردە ئەزانی لەکوی ساکنە خزمانی تو
گوی گرە بوتو بلیم مەسکەنی قەومانی تو
کیوی ئروس وعمقی حەوزەیی ئەسکەندەرون
غەربیە تابەحری رەش سەرحەدی مەیدانی تو
بەحری رەش و ئەردەهان آوی ئەراسە بزان
حەددی شمالە ئەمە کوژی بیجولانی تو



ئەلوەندو گولی و وری ئلسەری آوی ئەراس
سەرحەدی روژ هەلاتە جوگەو کیوانی تو
ئەهوازو کیوی حەمرەین زەنگارو ریەی نوسیبەین
بو تەرەفی جەنوبە رەوضەیی رضوانی تو
داخلی ئەم سنورە دوازدە ویلایەت هەیە
دەلین دوازدە میلیونە نفوسی کوردانی تو
(حاجی) دروە اصلا نفوسیان نەنوسرا
دەگاتە بیست میلیون بنوسری خزمانی تو
خاکی جزیر و بوتان یەعنی وولاتی کوردان
صەد حەیف و صەد مەخابەن دەیکەن بە ...
واربگەتان دە بە سریت عیلاتی حاف و بلباس
گەر بشمرن لە گەرمان مەمنوعە بچنە کویستان
کای کج و هەتیوی شیرین بی رایدە کشین
هاوار ئەبیتە بەرکی پەشمە دەخیل وآمان
مەسجد دەبیتە دەیرو ناقوسیان مؤذن
(مەطران) دەبیتە قاضی مفتی دەبیتە (رەهبان)



هیچ غیرە تیك نەماوە صەدجار قەسەم بە قورآن
بەیدابی . . . . . . . ئامینی یەك لەکوردان
سەرتان لەئور هەلبینن وەرن حالمان ببینن
جوتین لەدستی ظلمی بیدینی دور لەایمان
واللە ثم باللە تاللە ئەم بەلایە
هەر هیندە بیدە زانن اقلیمی کردە توفان
توفانی آونیە خو دەرچی لەکیوی جودی
بەحری تەنەنك و توپە آسانە بەحری عومان
ئەم قسەیەکە کردم ناگاتە چەند سالی تر
ئەم حالەتە دەبینن یەك یەك بە چاوی خوتان
کار ایستیکە وەهایە مەگەر خدا بەسوکی
نیکیان بدا وەالا دوورە لەعەقلی انسان
هەرچی وەکو بەیانم بو کردوون بە تەحقیق
پەیدا دەبن سەگاتە کام قوربکەین بەسەرمان
لەم بەینە اتفاقی پەیدا بکەن بە هەردی
فەرقی نەبی شووان و جوتیار و میروگاران

٥١

گەر هیچ ئەبی بەأوبن تابع بەدەولەتی بن
بیگانە چاکە دوژمن نەك دوژمنی لەخومان
روی وە کوبنی مون کەس پشتی بی‌نەبەستی
کەوتونە داوی خویان بژمردە بون وحەیران
کوا والی (سنندوج) بەگزادەیی رەواندوز ؟
کوا حاکمان (بابان) میری (جزیر) و(بوتان) ؟
ئەو آیەتەی ( فسیروفی‌الارض ) خواکە فەرموی
اجرای دەکەن سەگانە باالنفس شاهی خویان
کوا ئەو دەمەی کە کوردان آزادوسەربەخوبون؟
سولطانی مولك و ملت صاحبی جەیش وعرفان
جوشیك بدەن وەکو هەنك تەدبیربکەن، بیدەنك
ئەسبابی شەر پەیا کەن: توپ و تفەنك و(تەاوان؟)
بارانەوە و توکل لەم عەصرە بارەناکا
تیرە دوعای جەوشەن پەیکانە حرزی مەیدان
بوچی ؟ بەشیری ایمە یەعنی رەسولی ئەکرەم
هیچ ئەدعیەی نەزانی؟ روزی کە دەچوە مەیدان

٥٢

وەك ( خیوە ) و ( بخارا ) بەلانارواپەهەت
دەفعی بکەن مشایخ دفعی بکەن مەلاتان
هەر شیخی کەوتە شوینی یەك دو کەسی رەش وروت
خەلقی یەکەکەر دەزانی خوی حەضرەتی سلیمان
یەکتان تەچونە گەردوش وانیدە کەن لەدونیا
هەر پادشاهی رومە و شاه عجم لە تاران
قطبی زەمانە خالد آوارە بو وەکو من
بی قەدر و قیمەت و شان بی‌خانمان و بی‌نان
سەیف وقەلەم شەریکن لەم عەصرەدا دریغا
شیرم قەلەمتراشە کالا نیەتی قەلەمدان
مەسئەلیکی مەشهورە : گەر قوردە کەی بەسەرتا
ایکـیرە خاك و خولی دەرمالی گەورە مالان
ئەنیا ایمەوە هانین دیبا چەبی (مەم وزین )
حالیت دەکاچلو نە ئەحوالیان سخندان
خوتان دەلین ئە گەرچی مەشهوری خاص و عامە
هەرریویەك گەرابی آزاترە لەشیران

٥٣

بنوارە سەعیو غیرەت ایستا لەناو ئەوروپا
خویان خەزینە دارن خویان وەزیرو سلطان
هەر دوینی ئەهلی (سودان) هەستانەبی‌وەکوشیر
ایستیکە مستقلن مەحـودی کای نەدیان
(بولغار) و(صورب) و(یونان) هەم (ئەرمەنی) و (قەرەطاغ)
هەر بینیمات بەتەعداد نابن یەقەددی بابان
هەر یکە مستقلن کلیکی دەولە نیکن
صاحبی جەیش و رایەت ئەرکانی حەرب ولیمان
لاییقیانە (ئەرمەن) غیرەتکەشن لەبوخو
وەك ایمەنین لەگەل یەك دەعوا بکەن بەشیران
بوفەننو حەربوسەنعەت ! بوخەیطورە بطی ملت
دەینیرنە ئەوروپایە گەورە و بچوکی خویان
( حاجی ) کەسبکە بیکەس بو ایوە قوردەبیوی
گوی‌ەی لی‌دەکەن ظەریفە نایکەن بەلالەخوتان

٥٥٥

٥٤

ئەو روزە بەئەمری حەبیبی مەننان
ئەو عالەمە باکی بوبە توفان
دەبیاری ئەما لە جینسی ذیروح
غەیری ئەمە جونە کەشتی ( نوح )
ئەو روزە کەیشتە وەقتی مەعهود
وەستاوە لەسەر چیایە کەی ( جوود )
هەرسی کوری کردیانە مەسکەن
ئەوجی و مەکانە مثلی گولشەن
ایستاکە جزیرە بی مەحابا
مەعمورەبی ئەوومەلە لەدونیا
ئەولادی صەحیحیان بە بورهان
کوردن لەمەکانی جەددی خویان
سوککانی بلادی ربعی مەسکوون
بالجملە لەمەنە مولشەعب‌بوون
بی تەفرەقەبون مطبع و هەم دەماك
هەم مەشرەبو و هەم لباس و هەم رەنك

آیین و مەذاهب و رەسائل
واكردیە فیرقە و قەبائل
وەك خەلكی نەچونە مولكی ئەدنا
جی باوكی خوبانی كردە مەئوا (مأوا)
آری بەحەدیث و نصی قورآن
( حب وەتەن) ، دەلیلی ایمان
حادث نیە ئەصلە گوفتو گوبان
مەوروثە لە دەوری جەددی خوبان
ایستاكە كە واجبە طاعەتی وان
ئەصلن بەنەسەب كەریم و شەجعان
مقادی .......... مطیع ..........
مەحكومی خەرات و حیزو دوەن
رەسمیكی قەدیمە دەوری گەردون
حەسمی اجبابە هەم دەمی دون
( حاجی ) ئەمنیش مثالی كوردان
كووتومە كەمەندی نەفس و شەیطان



لەم حەیس و كەمەندە فیكری دەرچوون
مومكین نیە من لە كم ئەوان دوون
مەوقوفە بەروستەمی عنایەت
محتاجە بە همت وهدایەت
دەرچم لە ئەسیری مثلی ( بیژەن)
راهی بو بە قوووەتی تەهەمتەن
ئەی بی دەل و شەریك و تەنها
« ما اعظم شأنك تعالی »
ئەعیین بكە روستەمی درایەت
توسەن بدە خسروی هدایەت
با ( كورد ) و ئەمن لەدەستی دوونان
دەرچین تەعر ئەتوی رەحیم و رەحمان
سلام‌الله من كل یوم
لە ئەصحابانی صاحب غیرەت ودین
لەبی عاری هەموان كەوتە یادم
قەسە و رەمزی برایی و اتحادم



لەبەر دووری ، لەئەقران و لەئەمثال
لەكوردانم دەبرسی ضرب‌الامثال
لەبویەك ئەم دو ئەشعاری رەش ورووت
هەتا بەبادا بو روحم كە بیەسەر لووت
دە قەر موری ئەم عەدابە بوچ دەكیشی
چەمەلزومە ئەگەر جاوت نەبیشی،
قوری كوی كەم بەسەر خوماڵە غیرەت
خەوم نایە لەداخی مولكو ملت
ئەگەر وەك من خەبەردار بن لەدەولەت
لەحەیفان خودە خنكینن بە بی بەت
دوازدە میلیونە كوردستان نفووسی
بەقەولی ئەهلی تەخمینی كەنووسی
هەموان شیری بیشەن (حاتەم) ی جوود
لەشەردا كیوی (جوود) وبەحری مەحدود
وەلیكن فایدەی چی هەرج و مەرجن
لەدەعوا دادەگەل بەكتر بەمەرجن !



لەگوبیی گاتو ستوون هەر چەلد شیرن
وەكی كەر ویشك جاوآوا و كویژن
ئەوی ئەعلابە سەردە سنەی شكارە
ئەوی ئەدنایە بەستەی زولفی یارە
ئەوی آزایە شانامەی دەخوینی
ئەوی مسكینە گەنم وجودە چینی
ئەمانەی بی‌شعور و گیژو ویژن
مطیعی مفتەخور و هەرزە بیژن
كورنكی وابە هەستینە سەربی
بزانی چون هەمو كەس هاتە سەربی
بكاسەیری جەریدە و حالی ملت
كتیبی تازەو تاریخی دەولەت
بزانی تاجی قەو ماوە لە ئەطراف
سەرابا آگرە ئەطراف و ئەكناف
ئەگەر كاریك نەكەین لەم بەینە داروو
وولاتت باكی وەبزانە لە دەس چو

( بەشەرحالی ) بەسەر ناچن لە عەویلی

لە هەر لاوە دەتان هارن وەکو آش

لەژیرپای دا دەچن حەیف و مەخابن

گەداین ایوە : دوژمنتان بە شاین

بەغەیری (رومی) و ( انکلیس ) و (روسی)

بە بی حەددە ولەتن ناویان نووسی

لەجیەی خویان هەلسداون بە غیرەت

لەدونیا ناوی خویان ناوە دەولەت

سەرا با صاحبی سکە و سوپاهن

وەکو (جەم) خاوەنی تەخت و کلاهن

لە تەدبیری اموری مولکی خویان

شەریکن پینە چیو بازاری و شووان

لەجوشین و خروشین وەك پلەنگن

بە من چی کافرن یانە فەرەنگن

وەکو بیستو مە بودە فعی مەصائب

ئەوەی تەدبیر کردوە فکری صائب



بکوریش ویلایەت بینە ئەحباب

وەکو بیاویکی واحدین لەهەرباب

لەمەو لاتوش وەها بربینە سەروەی

لە (بوتان) تا ( بەبات) و سەرحەدی(رەی)

بینە یەك لە تەعلیم و لەنوسین

حن و بەرك و زمان و رەسم آیین

---

برا خوشە ویستەکان واتی ئەگەن ایمە بەزمان خومانەوەها وارتان ئەکەینی بەلکوئەمەدایکی نیشتمانەخوی هاویشتونە باوەشی کومەلەی ژ . ك و ئەلی ریککەوون تاسەر کەوون .

تەواو بو

کوردستانی مو کوریان لاجان ـ خاکەلیوەی ١٣٢٢ـ١٩٤٣

« هەر ملی لەلاوە جەنی خوی بە دەستەوە »
« کوردیك ئەگەر سەری هەلبی دەلین بوتە سەربزیو »

دەستەگولیکی جوان وبونخوش
لەباغی نیشتمان پەروەری

بە بارەی کومەلەی ژ . ك بو بەهیز کردنی هەستی نیشتمان پەرستی لەناو آغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد لەجاپ درا

١٣٢٢

بیشکەشی لاوە خوبیدەوارو. گەنجە ووریاکانی کورد لەهەمو ناوچە یبکی کوردستان ئەکریت

بسم الله الرحمن الرحیم

(لاوێکی کوردی موکوریانی لەئەمەن)
(٢٦ و ٢٧ سالیدا خاوەندی دلێکی)
(کە بەبریسکەی نیشتمان پەروەری هەر)
(بە رەوروناکی ئەچێت ئەم هەلبەستانەی)
(خوارەوەی بو ئاوردوین بەلام ویستویەتی)
(نیوی نەنوسین).

## ستایشتی خوا وەکو حاجی قادر

ئەی بی مکان و تەنها خلاقی هەر مکانی
بی‌باب و ئەهل و ئەولاد بی‌مثل و بی نیشانی
دەرمانی دەردەداران خوشی دلی هەزاران
شوق و صەفای بەهاران ویشك وتەری خەزانی
وەختی کە بی‌یە بەخشین بەحرو وبەرت عەطایە
گەر بی‌یە زەجری عەبدیك هەرنارە دوجهانی



ئەم روحی ملتی کورد پاك و بەدین و ایمان
بوخوت حەبیر و بینا دائما وغەیب زانی
بونابەکانی پیشوی دابوت جەلال و عزت
بوچ بی بەشونەصیبن آوارە بون کورانی
ژیر دەستی کلی ملت بی مال و حال و یابن
نیشوبەخوینی بەکثر کەوتون بەناو وانی
بو خاطری جەلالت صفاتی بی‌مثالت
رەحمی بکەی بەکوردان هەر چون سلاح دەزانی

## بو آغاواتی کورد

قسیکی خوش دەزانم بیتدەلیم ایمرو بەمزگینی
بەشەرطیکی نەکەی تالان و مالی خەلك نەزفینی
دەلینگت هەل نەکەی ریگا بەکاروانی خەلك نەگری
تولی خوت هەل نەمالی مالی هیچ کوردیکی نەسینی
سەبالی کەردزین و ریگری و شورشت لەسەردەرکەی
زەوبوزار و گیا و مەزرای برا کانت نەسوتینی



بە خالە و مامەو وکاکە و براکە پیکەوە بدوین
خەیالی‌خاوو کە لای کو نەدەعیەو بوزونەدرینی
لەژیر پیی ملتی بیگانە نەیە هەیەو خدمەتکار
حەیا و آبروی برات مزینی! شوشەی قەدری نەشکینی
سەوا سەر بەبی کوردان بەسراوە بیکە تیو اولفەت
ئەکەسور (تکثر) لابەرە لەم وشەیە مویکی نەبینی
بە هارمان هاتەوە روزی سەعادەتمان طلوعی کرد
دەبی نەمجارە کە کوردی بنوسی! عەشیرەتی خوبی
لەژیر دەست و جەبوری‌دوژمنی «ئەوبری» و «نەفام» دەرچین
خداوەندا ئەتو دەتوانی ئەم کارانە پیك بینی



« دوای جەنگی رابوردو کە جمهوریەتی تورکیا ساز بو محکمەیەك بەناوی « محکمەی سەربەخویی » دانەرا جەنابی شیخ عبدالقادر شەمزینی و سید محمدی کوری دە گەل هەندی لەگەورەو ناودارانی کوردلەم محکمەیەدا محاکمە کران و هەلیان آوەسین ایجا « شیخ احمدی سربل‌آوایی » کە پیاویکی بەناوبانگی‌موکوریانە ئەم شینەی خوارەوەی بو شەهیدانی ریگای‌سەربەستی کورد گیراوە »

ئەم آسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
ایجادی وا کراوە کە قبەی هەمو غەمە
بارانی مەرگە بەفرە کفن رەعدە نفخ صور
ئەورو گرانی قانضی ئەرواحی عالەمە
سەرتیپی تیپی هەورە شەمال بو صەفی قتال
تلرەنجەکی ئەرزەیە تەییارەیی ئەمە

روژی سیایە روژو شەوی تارە چەرخی پیر
هەوری لەدودە آهە تەمی وی هەموغەمە
ام چەرخە کونە ماشینە کەی ژەنگی کرتووە
جەوری نەکابە خوینەکی سوورانی عەستەمە
ام قەرنی بیستەمی مەدەنیت بە خوینی کورد
رەنگی لەسەر نەهیشتووە هیشتاکە بی کەمە
نار ندراوە چەرخی ستەم ؛ کاریە
ئەو ظلم و جەورە قسمەتی هەرشین وزاریە
خاصە بە خوینی کوردی شمالی هەمو زەمین
گولزاری خوینە غنچە صفت دل هەمو غەمین
هەوری خەفەت لە ئەوجی فەرەجدا مسلطە
شادی نە بو لەهیچ دلی دانەبی بەشین
محشر مثالە دەشتی شمال کەربەلا صفت
غەمناکە ام موصیبەتە سکانی حەوتە مین
اکثر لەوانە سیدن و هاشمی نەسەب
میراثی جدیانە شەهادت کە پی گەیین



فەرمانی قەتلی عامی • کەمال • بی کە مالیە
مەقصودی مەحوی دینە لە اعدامی ئەهلی دین
واحەسرەتا جرای اوەیدم کوژرایەوە
قەتلی محرمی لە شەهدانی برایەوە
• جەنگیز • • کەمال • • ئەهلی کەمال شاهیدی دەدا
کوانی زەمان و عەصری • مەغول • ظلمی واکرا
هەر بەو گوناهە دوژمنی دین مەحوی کردەوە
لەو جیژ مەکانی کوردەکە بیتی خداکرا
نصی حدیثە ترکی ........ ایستە مەحکەمە
بەو ظلمە خبثی باطنیات بەر مەلاکرا
دل بە حری خوینە صوفی مەیرسە چەفایدە
تەعدادی ناکری کەبلیم چەند خەطاکرا
هاوارە قەومی کورد وەرن روژی غیرەتە
نسبت بەایمە ظلم و تعدی جماکرا
عضەم تەوەلدە زورە دلم هیندە پر غەمە
سەحبالی ناطقم لە غە مالال و تەبعکەمە



٭٭٭

« ئەم قەصیدەی خوارەوە هونراوەی »
« جەنابی ( حسن سیف القضات ) ە »
« کە بە کیکە لە پیاوە بەرە بشتان »
« بەرورەکانی موکوریان ئەگەر »
« پیرە میردی سلیمانی لیان »
« زوبیرە یت ایمەسیوم سوانە ئەلیم »
« پیرە میردی ساوبلاغم » .

کوردینە تا بە کەی ایمە لە کیوان مثالی دیو
بیینو بجینو بو مەئەای قط خدان و جیو
خەلکی هەمو لەباغ و لەشارانە کەیف خوش
ایمە بلاو بی سەرە ماوین لەدەشت و کیو
بو آسمان دەرونو لە بەحرا دەکەن سەفەر
هەر عەردە نیشتگاهی مە صەنعاتە وەردوشیو
ریەی وانە کەهکەشانو ریەی ایمە بەردەلان
جیەی وانە تەختو بەختو جیەی ایمەبەردوجیو



رەشمالە مال و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە
قەصرو سەرایی خەلکی دیبە پر لەزیروزاو
بووانە هەرجی جوانە لەجی دی لەژن لەمال
هەر شاخ و داخە بومە کوری رەش کجی دزیو
ژیر دەستی و اطاعەتی بیگانە تا بە کەی
شەرمە لە بومە هیندە بژین بی نیشان ونیو
مەغبونی هەر معاملە محکومی هەر کەسی
شاهان بە مەحوی ایمە دە بەستن گری و گریو
کوردانی کوردەکان کە لەترسیان دەلەرزی ئەرض
کی بو لەشامی شاو لە مصراش بیوە خدیو (صلاح الدین)
کوردانی کوردەکان بەخدا روژی غیرەتە
دەست دەینە خەنجەران و بپاوانە پی بەنیو
بوجمانە مال و سەر کە لەسەر سەروەری لەچی
کور نابی قط بترسی لەزیندان و داروجیو
بی هەل کرن کە پی کەشەر بو مەشایی بە
دەست تیککرن درەنگە حەیلانە بجینە نیو

٧٣

ئەوژینی بەم ضەلالەتە بوچمانە چاوە کەم

بیسیەوان لەرێی نەجاتی وەتەن بابە نیرومیو

سەر جونی تەحت؛ رویتی سەرداری پیدەوی

حوشیە؛ لەم شەهادەتی شیخانە نیوبەنیو *

هەر ملتی لەلاوە حەقی خوی بەدەستە وە

کوردیکیش گەرسەری هەلینی دەلین بوتەسەر بزاو

آرادی؛ سەربە خوبی؛ میری و گەورەیی

داوا دەکەین بەزار و زمان و ددان ولیو

تاکەی لەباغی خەلکی بەزیزی و بەمل کەچی

خوشە لەباغی عیالی چنینی ھەنار و سیو

فکری لە حالی خو کەن و بگرین بەحالی خو

هەر بی‌سەربو عداوەتی خوتانە دیتەراو

لا هەلدرا و وجەرگ براو و فڕیدراو

رأمان دەدەن بەجاری لە هەورار بونشیو

---

* ئەم شیرەش بیاو کوژی و حنابانی «عکەی واستقلال» یبر کورد تەحانەوە

٧٤

هەر کەس کە بیری تواوە وجی بابی خوی نەبی

ئەو بی بەشە لەکوردی دەری کەن لەبیتیەنیو

هەرجی دەبی بەلابی حەق هەر حەقە حسن

تینە لەریەی وەتەن غەمی دەرکردن و جنیو

٥٥٥

« خالەمین کوری حاجی شیخ مصطفایە »

« سیەیکی بەرزنجیە؛ بەکیکەلەلاوە »

« نیشتمان پەروەرەکانی کوردی‌مو کوریان »

« شیرەکانی هەمو بەکوردی بەتی(روت) »

« لەمونیەوە و زور کەم ووشەی »

« بیگانەی تیدا نەبیری لەزیرەوە بەشە ییکی »

« مەشهوری لەم لاوە ئەنوسین » .

سەیری کویستانی خوشە قاسیەی کەو

بودلیکی بەخەم دوچاوی بەخەو

ایستە: کەی وەختی باس چاوخەرە

سەر هەلینە بینە هات و هەو

٧٥

هەمو دونیا گەیی بە دلخوای خوی

ایمە هەرباسی بزن و کیلک وزەو

سەیری کە وەك گەنم جلون کەوتیە

کیژی بیزیلك ورا ئەلە قانی کەو

وەختە کیژ بی لەناوی ئەم کیژە

وەختە بیسیەی لەهاتو جوی برنەو

دتیە گویم وا صلاح نەبیوبی

بانگی خەلکی دەکاتە دەنگ و بەقەو؛

« بوجی رەنجی منو بە ضایعدا »

« بوجی دا وەولکی خوبە گیتوبرەو »

« دو کەس دەردی ایمە دەرمان کەن »

« بیاوی زورزان و سواری دەست و جلەو »

« هەستە ئەی کوردە راکە ( ژیمو ) بەکە *

« دەس کە بە قسەی رەلام و توندوتیەو »

---

* زیمو بانەخشی نوسرا و سیکای نامەی طلل « صەلالایم » .

٧٦

« گەورەی ئەم کوە لەکە گوبەی بابی نەدای »

« تف کە لەم مجلسی هەلیوە بەشەو »

سواری ئەسپی طەبیەتی سوارم

قط بە لاوار دەبی نەیشتی جەمەو

ملەم دەردەکاتە دەس دوژمن

وەك بە ئەسپی بەکار و قوزو قەلەو

خالە کیان شعرت آوردە برزینی

لە گەلی جاوی بوستوی جەو؛ جەو(جەون)

وادە بیتم دو کوردی دەس ایکدا

ئەم بەنەمیان دەلی ئەمیدی بەئەو :

« بەهومیدی خدا و بیغەمبەر »

« بەدلی گەرم و جاوی سوور و نەر »

« کوردەکان جیدی سەر نەوی نابن »

« هەر ئەوەند بەختی بوخو آزابن »

جەند لە میژە ئەمن کە هەم جاونور

بو گەلی کوردەکانی بی کەس و زور

هەڵسن لەخەوا خزمەدەموچاوو بشورن
چاوێکی هەڵێنن لەچی بوراست بورن
پرسێکی لەیەك کەن لەچی ئەحوال وچەشورن؟
ئەم عالەمە بوچ عاجزو بی کەیف وسرورن؟
بوچی ئەکەن ئەم کوردە فەقیرە هەموهاوار؟

ئەم دەنگ و هەراو نالەووشینە لەچەلایە؟
ئەم آهی جگەر سوز و گریە لەچەلایە؟
ئەم گشت جەزەعو، کوشتو، برینە، لەچەلایە؟
سەرچاوەیی ئەم چەشمەیی خوینە لەچەلایە؟
جی بی ئەبی ئەم شورشو غەوغایە لەئەقطار؟

ئەم دەنگە هەمو نالەیی کوردانە لەدەستغەیر
ئەم شورە صەدای شیوەنی کوردانی لەدەستغەیر
ئەم جەزعە هەمو سوزشی کوردانە لەدەستغەیر
ئەم خوینە کەشەخوینی شەهیدانە لەدەستغەیر
ئەم نەعرە هەمو نەعرەیی کوردانە لەسەردار



واجاکە هەمو متحدوبەکدل و جابین
بویەك ئەوەکو دەستە برا عەینی برابین
مردانە لەبو مەقصەدی یەك پشت و پەنابین
بەوشەرطە هەمو تابعی ئەحکامی خوابین
تاجلە رەهابین لەدەسی دوزمنی خونخوار

دوزمن لەهەمولا ؛ چی بە چەپداچی بەراسا
بو ملتی کوردی شەووروز وان لەهەلاسا
دایم ئەوەیان والە سەر و فکرو حەواسا
ریشەورەگی کورد بپنەدەر هەرلە ئەساسا
تاکو نەمینی یەك نەفەری کورد لە ئەقطار

هەر کەس کە ووتی «ئەم نەیەچەندە» ئەبنەغلامی
تەسلیمی ئەکەن مال وسەر و جانی گرامی
بوی ئەبنە ئەنا خوان و دوعاگویی دەوامی
ئەی ملتی بیچارە عەجەب جاهل و خامی!
قەومیکی تەواو بی زەر وبی سیم وئەزانکار



فەند ەی ئەم وئەو پریە لەدەرمانی کوشەندە
بەس نەفرە بخونهەر بەقسەی خوش وبەخەندە
ئەی بی خەبەران بەس بیە جاکر و بەندە
مەشهورە کەکە متر نەبووە شەندە لەمەندە
روزی ئەبی بەم «فەندە» ئەبن ایوە گرفتار

بوەبن وحوا ؛ وەرنەوە گشت گەورە و کچکان
هەرکەن لە دلا جملە خەیالاتی پەریشان
چەند جشتی هەیە واسطە بونە کەتی کوردان
وەك کبر و حەسەد ؛ بغضی بەکر قلتی عیرفان
اصلاحی بکەن تاکو بکوشن بەهاوار



«ئەم شرانەی خوارەوە لەژمارەیەکەی سالی چوارەمی گەلاویژدا بەناوی طاهر هاشی کرماشان چاپ کراون عوانەکەی «من و پیاوێك». بەلام ایمە ئەیگورین».

## ماکەی دزی!

دزی ئەرك بکە! «ئەی چی بکەم گەدام»
نیکوشە بوخوت! «ئەلین ناسزام»
لەبەر تیکوشین! «بەلی مە علومە»
کوشش زور چاکە و خوبری مەحرومە
قسەم بیبیە! «قرضا بیستم»
عەمەلی بیبکە! «ناخوشە ولستم»
لای کی؟ «لای آغام» بوچی! «رقی دی»
لەچی؟ «لەمەی خەلك شەوراحەت بنوی»
چلون پیاویکە؟ «یەکەم دزەوە»
هیوای بەچیە؟ «زناریکە شەوە»

٨٩

داخو هەیەتی فکری سەربەستی؟
« ئەوانە ئەکەن حەزیە بەستی»
بەبەستی بوچی؟ «چونکو دەغەلە»
مەقصودی چیە؟ «فتنەی کومەلە»

## ئەزانی مەعنای حەقیقەتی کورد
## بە مەزاقی خوی دزیو دەسوبرد

ئەو مربی‌نە؟ «وەها دیارە»
بوچەن ایشی‌تر؟ «هەر بو ئەم کارە»
داخو هەیەتی فکری نیشتمان؟
یا سەر بەخویی کومەلی کوردان؟
« ئەخیر دزبازار آشفتەی ئەوی »
« تا ببری مالی گەدایان شەوی »
هەتاله مالی یەکتر بەد چاوبین
ئەبی چاو پر آو لیو هەلقر چاوبین
ئەر ایمە گوشتی خومان نەجاوین
هیچکەسی پیمان؛ نالی خراوین

٩٠

ئەترسم ئەبی خەرابیمان چاك
بەم هیوایەوە بچینە ژیر خاك

«مستر فاسوم میسیونی لوتریانی ئەمەریکی»
«لەسالی ١٩١٦ دا لەسابلاغ کتیبکی دەستوری»
«زمانی کوردی»
«A practical Kurdish grammar»
«داناوە! بەراستی گەنجینە یەکی هیژاو بەنرخە»
«وادەرئەکەوی یەکەم پیاویکی لەکوردستانی»
«موکوریانا بەکوردی نوسیبیتی ئەم‌ذاتە شریفەیە»
«مستر فاسوم کتەکەی لەسالی ١٩١٩ دا»
«لەئەمەریکا چاپ کردوە. کەلە سابلاغەوە»
«بواپەیانت ناردوە. لەسەرەتایەم جورەخوی»
«ئەناسینت»
«. . . by L. O. Fossum Ph. D.»
«American Missionary . . . . . .»
«. . . . . . . Auther of a Hymn»
«Book and Editor of a monthly»
«newspaper, also in the Kurdish»
«language.»
«واتا ئەم کتبە دانراوە لەلایەن ل . او .»

٩١

«فاسوم، ف. ا. د. میسیونی ئەمەریکی ...»
«دانەری کتیبکی گورانیو لەچاپ دەری»
«روژنامەیکی مانگانە بەزمانی کوردی».
«وا زان ئەکریت ئەم روژنامەیەی لەسابلاغەوە»
«نوسیوە بولە چاپدان ناردوبە نەئەمەریکا»
«بەلام نەئەم روژنامەیەو نەکتبی گورانیکەی»
«وەدەست ایمە نەکەوتوە».
«ئەتەوەی کورد خدمەتی ئەم پیاوە گەورەیەی»
«هەرگیز لەبیرناچیت داخەکەم ویەی»
«مستر فاسومان وەگیرنەکەوت دوبالیرەدا»
«چاپمان ئەکرد. مستر فاسوم لەلایەرەکانی»
«دوایی دەستور کتە یا چەند گورانیکی»
«بەکوردی نوسیوە ایمە یەکیکیان لەخوارەوە»
«ئەنوسین».

وەتەنی بابیرم؛ کوردستانی قەدیم
کیوو شاخ و دەشتی؛ خوشن بودلم
جی‌ی دایك وبابم؛ مالی خوشك و برا
هەر توزیکی و بەردیکی؛ بوم مرواریە
وەتەنی . . . . . . قەدیم . . . . . . دلم

٩٢

وەتەنی مەحبوبی؛ کوردستانی بیند
ئەرضیە پر یادگاری؛ لەجحیلی‌من
هەوای‌وی خوش وروناك؛ آوی‌سارد وپاك
شوانان بەهەزاران؛ صوحبەتانی چاك
وەتەنی . . . . . . . قەدیم . . . . . . . دلم

قولکە؛ ئەشکەوت؛ دوای: هەروەبیرمدی
لیرەبوم بورآوی؛ لەوی بو شەری
هەمو ئەوجێانە؛ رابوردون ویستا
خەرابیەم عەفو بکە؛ یارەب خدای گەورە
وەتەنی . . . . . . قەدیم . . . . . . دلم
دەنگی زورناو دەهول؛ هەوای پردەکا
زموی؛ میشە؛ بلیندی؛ قول هەمویکەوە
دەخرینن بووقەومەی: کەلە نیوبان داوە
لەبیرناچی زەحمەتو خەمیان کیشاوە
وەتەنی . . . . . . قەدیم . . . . . . دلم

٭٭٭

ژمارە ٧، ٨، ٩ — نیشتمان — ٢٧ رەی - ٣١

# خەونم دیت

هێمن **

دێی شەوی هاڵە خەوم دایکی وەتەن جلکی رەشی
بوو لە بەردا ـ وەکو گوڵ وابوو بەلا رووی بەگەشی
هاتە بێنی لێم و ککوڵی رۆڵەی من چارە رەشی
تۆ لە ئازادی و سەربەستی چە بێ بەهرە و بەشی
رابەرە لەو خەوە بێدارەوە بە
وەختی خەفەت نیە ووشیارەوە بە
من ـ : دایە من ماوەیەکی زۆرە لە خەو بووم بێدار
ئەت ووچان نادەم و بە یوەستە دەکەم ئیش و کار
لێی دەکۆشم بە شەو و رۆژ دەمێک نیمە قەرار
هەر حەرێنم کە بکەم حزت و گورانت رزگار
ئەو : گیانی گەر راست دەکەی هەوڵ بدە
ـ دایکی خۆت بێ بە سە رزگاری بکە
من ـ چم لە دەس دێ بە تەنی ئیستەکە حولم وەبەری
هەرچی هەوڵ دەدەم و کار ... کەم نیە ئەمری
ئەو : خوێری و حیزی لە تۆ بۆیە وەها کوێر دەبەری
بە تەنی کار بکە رۆڵەکە صاحب هونەری
من ـ دایە جا چ لە من ئێستە کە دەوری
ئەو ـ بە گورانم بێ هەستی تە خەوی
ئەو قسانەی سەرەوەی دایکی وەتەن هەر موبە پێیم
یەک بە یەک ـ دوواییە هەڵسا بە گڕی دوور بوو لێم

کە ئەوەم بینی منیش هاتمە دەری گوورج لە جێم
ایستەکا لە زمانی ووپەوە بە کوردان دەلێم
تا بە کەی ابوە وەها بێ هوشی
کار بکەن هەول بدەن لی بکوشن
شێرەیی و عارە لە بۆ ابوە لەوەندە پەست بن
عیبە وا قوربەسەر و دەربەدەر و ژێر دەست بن
لەنگە: زۆر بەلکە کەوا گیژ و هور و بەرمەست بن
ریك کەون تا زووە کاریکی بکەن سەربەست بن
کوردینە: آخر بەسە لەو بەندە گیە
سەرت زۆر خوشترە لەو ژیندە گیە

# وەطن ! !

م . م . [illegible]

وەتەن گیان و دلم قوربانی تو ابی — سەر و مالم بەلا گەردانی تو ابی
لەبەر ئینی حەفای بیگانە یا خوا — هەمیشە بیکەس من قەلغانی تو ابی
وەکو کیوانی خویت هەمیشە بلیند بە — کە بیشکەی ساکنی کویستانی تو ابی
گیوراوان بانەلی هەرگیز کە دوژمن — طماع کارانە چاوەروانی تو ابی
شەطاو و باغ و گولزاری سەراسەر — بەهەشت ابی وانە ابی هاوشانی تو ابی
دەکیشین تا کو آلای سەربەخوانی — وەکو جاران لە سەر کیوانی تو ابی
محالە خەر بکا ئەوانی کوردی — کە سیك بەروەردەی دامانی تو بی
لە مەرگ کویری بکا گەر تا سیاسیك — خەریکی ذیللەت و فەوتانی تو بی
وەطن یا رەبی هەرکەس خیرخوانە — نصیبی رەوضەی رضوانی تو بی

ژمارە ٧، ٨، ٩ — نیشتمان — لاپەڕەی – ٣٧

# خۆشبەختی ؟!

م . قادری ٣٦

لە ژمارەی شەشی نیشتمانی ساڵی یەکەم ئەندامی خۆشەویست ئازەر ٨٣١ لە لایەن خۆشبەختییەوە چەند ووتارێکی پێی کەش کرد بوون : لەوا منیش بە نۆبەی خۆم بە چاکی دەزانم لەو لایەنەوە چەند شتێکتان عەرض بکەم .

بە یانی بزنەی شەماڵ لە سەرە خولك و پۆپی دارەکانی بەهەشتی دەلەرزاندەوە کە عیزرائیل لە بارەگاهی گەورەی خودا رەندی هاتە خوار و رووی لە بەهەشت کرد و گوتی : وەرە لەی ئافەریدە ئەی ئادەمی ، وەرە تا پێکەوە بچینە دونیا ، بچینە بە دەشتێکی دی ، آسودە و دلنیابە لەوێش بەشی تۆ هەر خۆشبەختییە .

هاتمە دونیاوە ، خۆم لە باوەشی خودای خۆشەویستی دا دیت کە ـ دایکـ بو ، شاد و خەندان لە باوەشی دا گەورە بووم ، بەلام هێشتا بە غەیری زەردەخەندەی دایک ، دەستی دڵ نەرمی ، ئاوازی بێ کینەیی ، دڵی شادی و داماڵی پاکیزە و باوەشی پڕ مهری ئەبێ هیچی دیم نە دیبو ، باوەڕیم بە هیچ نەبو ، پڕ لەوەی دڵنیا بم . لە باوەشی دایکدا هەڵاتم ، بیم لە ڕێگەی ژیان دا تا ، بەرەو بەیستانە و آوێدە وار چومە پێش کە : خۆشبەخت بم .

بەهار بو ، دار و بەرد ، زەوی و وەرد ، گیا و گوڵ و زەمین و آسمان سەراپا جلکی خردا کردی جیهانیان لە بەر بو ، دەرو بیشتم کە خۆشبەختی ئەمەوە تۆشی بولبولێك بوم لە سەر چلێك آوازە خووان ، لە گوڵێك ، بێ پەروا لێم پرسی : دەر بە دەر و رەنج کێشاووم خۆشبەختیم نیشان دە . هەر دەڵك باڵە کاڵی یەك دوو جار لێك دا سەری بلند کرد و گوتی : لەگەڵ من بە ، خۆشبەختی دەبینی ئەمەوە لجار لە نێوان گوڵالەکانی زەرد و سووری چەمەن دا گەڕا ، لەگەڵ هەر یەکێك نازێك و بەگوێی

ژمارە ٧، ٨، ٩ نیشتمان لاپەرەی — ٣٩

لە لە نجاما بیچارە و سەرلی شێواو ، بە لەندامێکی چەماو ، پشتێکی شکاو ، شەقای ژیانم بە پایان گەیشت ، سێبەری مەرگ لە سەرەخو روناکی ژیانی داپوشی ، پشت شکاو ، جەرگ سوتاو و هێز نەماو نالەیەکم لە دلدا نە دەر و گوتم : خودایا بە اومێدی دیتنەوەی خوشبەختی تەمەنم بە پایان گەیشت هەر چەندی کردم رازی خوشبەختی بزانم بی هودە بو ، کوششم کرد خوشبەختی ببینمەوە بی سود بو ، آیا لە رووی خاکا خوشبەختی آفەریدە نەکراوە ؟

آوازێك لە دەرگاهی آسمانی دا لە دلم دەی گوت : ای شاك هەر جیگایەك خودای لی بی خوشبەختیش لەوی یە ! لە ژیاندا چەندە خوشبەخت و دلشاد دەبووی اگەر لە هەمو کاتێکدا بتزانیبا بالاتر لە هەمو کەس چاوێك هەیە دەیبینی ، بی نیازێك هەیە نیازت رەوا دەکا ، گوێیەك هەیە دەیبیسی ، بە خشندەیەك هەیە دەبەخشی ! چەند خوشبەخت دەبوی اگەر لە هەمو کارێك دا چاوی اومێدت بو آسمان بلند کردبا ، دەستی داوات بو بالا بردبا و بتزانیبا خودا هەیە !!!.

# کورد چی دەوی

٥ پەنا بە خودای مەزن ٥ هێمن

آگری جەنگ داس کاوە : اوردووی آلمان کشاوە و بە شپرێوی گەراوە دوواوە : هیتلەری نازی لی تێك چو و لەشکری قڕ بو : کارگاکانی لەرت و تونا و کارخانەکانی خاپور کران .

قورکەی لەبەر ئەوانی نەوت لە کەلك کەوت : تو بی بی ! رووت و سەربازی لە بەر بەفر و با رووت ماوە بەلی : لەوە بە لە نجامی ظلم و زور : لەوە بە دووا روژی کە بیك کە بو خوشی ژیانی مەروك تال بکات :

لاپەرەی ـ ٣٠ نیشتمان ژمارە ٧، ٨، ٩

ایتر بەو زووانە گیتی لە هومەن دەبیتەوە، صلح و آشتی جیگای جەنگ و خوین ریژی دەگریتەوە دنیا یەکی وەك بەهاران بە لکە صد جەندان خوشتر لە بەهاران دادەمەزریتەوە.

و لەو سەرباز و لە فەرمانەی کە لەو ماوە دور و دریژە دا آسایشتی خویان لە پیناو آسایشتی مرد دما بەخت کردووە و مەردانە لە بەرامبەر پەلامارى دوژمنا رایەستان و گیا زیان لە سەر بەری دەست دانا وە و بو پاراستنی لیشتمالی خوشەویستی خویان تی کوشان: جالکی رەزم فری دەدەن و بەرگی بەزم دەپوشن: و لەوی نەتەوە پچوك و بی دەسەلاتانەی کە بی سوچ و تاوان لە آزادی بەش براو بیبەش و ولاتیان لە لایەن آلمانی فاشیستەوە داگیر کراوە: لە بەدبەختی و چارەرەشی و ژیر دەستی و نەنگ لە رزگار دەبن و دیسان دەکەونەوە فرمانە و سەر لە نوی آزاد دەبنەوە و هەر آمان دەبنەوە بە صاحبی تاج و تەخت طبل و آلا.

ایمەش لەو کاتە بەهەل دەزانین و بەو دەولەتە داد گەرانە کە لە سەرخی میلەتە پچوکەکان بە گژ دەولەتیکی زل و درر و شەرانی وەك آلمان داهاتن وە و پیناوەدا خوینی هەزاران لاو چاك و نەوجوانی خویان بە رشتن دا هەرا دەگەیەنین.

کە کوردیش نەتەوەیەکی تاریخی و لە مێژینەیە: کووردیان خاوەنی مێژوویەکی پر افتخارە کووردیان بە پیچەوانە باوەری دوژمنەکانی کە بە وەحشی دەزانن لە تەمەدن بی بەش نیە کووردیان قەومیکی لی قەوماوە و بەش خوراوە و بە پەیمانە پیروزەکەی « آتلانتیك » شا مەیلی حالی ئەویشە: و ایستا دەیەوی چەندی چاو لە دەست و ژیر چەپوکی بیگانان لە بی و لە بەندەگی و لە سارەت رزگار بیت و حقی مشروعی بە فیرو نەخوری.

و پر بە دەم هاوار دەکا و دەلی: لە ی حکومە لە گەورە و دلسوزەکان بە زەییتان پیم دابیت و لە جانسم بدەن.

ژمارە ٧-٨-٩ نیشتمان لاپەرەی - ٣١

کوردی بە ناوبانگ

# مەلاعلی اشنوی-شیخانی

بە قەلەمی س . م . ح . گرشاسب

بە خطی خودی ئەم ذاتە نسب و بە سراها نیان وا وەگیر کەوتووە : مەلا علی کووری شیخ حامد کووری شیخ فتح الدین کووری شیخ محمد کووری شیخ طاهر کوری شیخ پیرمند کوری شیخ شهاب الدین کوری شیخ فتح الدین کوری شیخ نصرالله ( له ١٥١/ هـ-ق له دایك بووە ) کوری شیخ فتح الدین کوری شیخ فخر — الدین محمود ( له ٧٤٩ هـ-ق له دایك بووە ) کوری شیخ فتح الدین کوری شیخ فخرالدین کوری شیخ یوسف ( قبری له کێویدا هەلکەوتووە له روژ آوای باراندیری ووری وە ) کوری شیخ یعقوب ( له ٦٥٠ هـ-ق مردووە قبری له دێی بی بی ووری یە ) کوری شیخ محمد مشهور به پیرمند کورانی ( قبری له دیداتی ووری یە ) کوری ئەمیر عمر شارەزووری یە له ١١٣١ هـ-ق دا ژیاوە ، تاریخی ئەو مردنی به چاکی معلوم نیە وە له دێی شیخان لزراوە پیاو ێکی زانا و له علمی معقول ومنقول و حسابدا زور بە فرووەت بووە . ژیانی خوی به تألیف و تدریس له مدرسەی ( شیخان ) رابواردووە له تصنیفاتی ئەوەی کە وەدەست ایمە کەوتووە دو کتیبن : ١ — تشریح مەلا علی کە له لایەن مەلا علی قزلجی و گەلێك له زانایانی کوورد حاشیەی لی کراوە و له مصر بە چاپ گەیشتووە . ٢ — شرح عوامل زمخشریە له هەمیر شێوی بەرە مشهور بە ترکیبی شیخانی بە هیشتا چاپ نەکراوە . مەلا علی ئی ئەم مدارە خط خوش بووە دوایی مثنوی ئەم دوو شعرەی دەرحەق بەو کردووە .

فی حسنه فی کل قلب شهرة … حتی کان مداره الا هواه
والی عین قرة من قربه … حتی کان محبه الا فداه

چونکو لەهەوەلی کاردا وسیلەمان بە چاکی فراهم نەبو . تکامان لە هەموو خوینەرەکان ئەوە یە لە هێندی عیوب و اغلاط چرتی کە دێتە بەر چاو چاو پوشن .

لاپەرەی ـ ٢٣ نیشتمان ژمارە ٧، ٨، ٩

بەشی پزیشکی

# تیفوس

( چون پیاو لە نوش بون رزگاری دە بیت)

آمرل ، ٧ ، م ، ئیرج ٢١٥

لە ژمارەی پیشوو دا باسی تیفوس ( رەشە کە و تو یـی ـ گرانە تا ) م بو کردن لە م ژمارە یە دا چەند دەستور یك بو نوش نە بون بەم نەخوشیە بە یان دە کری .

هەر وەکو دەزانن تیفوس بە هوی ( ئەسپی ) پەیدا دە بیت بو یە پاك و خاوینی یە یەکەمی وەسیلەی رزگار بوون لە مەترسی ی تیفوس دە ژمیردریت ـ لە کاتیکا ئەم نەخوشیە لە جیگایە یەك پە یدا بوو پیویستە واکسینی ضدی تیفوس لە بە دەن بدریت ئەم واکسینە تیر یکەی سالیك ئاثیری دەمینیت و دەبیتە هوی رزگاری لە نووش بوون .

خاوینی نەخوشخانە و پیجەف دەبی زور زور بە چاکی را بگیری و جاوەدیری بکریت بە هوی دەکار هینانی " رولی حاکی " یا « آلدکل کامفرە ) بەینی بە تیریك بوونەوەی « ئەسپی » بگرن نەتووریوودایی لەم آماتجە پیاك دەبیت تیفوس هەر وەکو دەزانن لە جیگای بار دا ئیشتوو : بەر باز خانە ، گرتو خانە ، کارگا ، ایستگەی ریگای آسن و کەشتی پە یدا دە بیت بو یە لازمە لە وەختی بلاو بوونەوەی ئەم نەخوشیە لەو جورە جیگایانە و تیریك بوونەوەی نەخوشی خو بپاریزن .

# فهرست



وەحە لێك باسی دیکەش دەخوێندرێنەوە

عراق کوردلرندن سعدینی بیزه یازدیغی بودر :

بن خانه‌ده مراجعت ایتدیم ایکی انگلیس افسری گلیب

سؤالان سوروشدیلر :

سؤال - نه ایچون ایرانه گیتمشدیڭ

جواب - یرلرینی آزاد ایتمکدن استفاده ایدیب مهاباده
سیاحت ایچون گیتمشدم

سؤال - فقط مهاباده گیتمشدڭ یا آیری یرلرده دا گزدیڭ

جواب - خیر فقط مهاباده گیتدم

سؤال - اوردا روسلاری دا گوردون یا یوخ

جواب - مهاباد دا روس عسکری یوخیدی

سؤال - ایران کوردلری روسلارا نه جور باخیرلار

جواب - چوخ احترام ایله و اونلاری خلاصدان قرتاران

بیر ملت کیمی باخیرلار

سؤال - نگر کوردلرڭ تانیدیقلاری پیغمبر گیبی مقابله‌دا

روسلار نه قدر کوردلره ظلم ایلەدیلر

کومەڵەی ژ. ک
ئیدارەی ناوەندی
ژمارەی ــ
بەرواری 5 رەزبەری 1323
کونسولی بەریزی یەکیەتی سوفیت لە شاری تەوریزی
بەریزەوە رادەگەیەنم کـە وەرگیرداوی بەرنامەی حیزبەکەمان و ئەو ژمارانەی روژنامەکەمانم کە تائیستا دەرچوون پیشکیش کـردوون .
ئیستاش (ئەوا) هەواڵە تازەکانی گەیشتوو بە کومیتەی ناوەندی حیزبمان پیشکیش دەکەم.
1ـ لقی ریکخراوەکەمان لە شارەکانی کرمانشان (ئیران) و سولەیمانی (عیراق) تازە دامەزراندووە.
2ـ لەروی نامەی لقی سولەیمانی را دەردەکەوێ کە لاوەکانی کوردی عیراق لە روژنامەکەمان (بەهوی سەربەستیمان لەنووسیندا و لایەنگریمان لە یەکیەتی سوفیت ) زور بە گەرمی پیشواز دەکەن و هەر ژمارەی بە دیناریک دەکرن و 60،50 کەس ( دەستاودەست) دەیخویننەوە.
3ـ لقی سولەیمانی داوا لە روژنامەکەمان دەکا کە پتر بـە لایـەنگری سوفیت بنووسی و زانیاری زیاتر لەبارەی حکومەتی سوفیتدا بڵاو کاتەوە.
4ـ لە بەغدایە لەلایەن باڵویزخانەی ئینگلیسەوە گوڤاریکی 48 لاپەرەیی بەنیوی "دەنگی گیتی تازە" دەردەچی. ئاغاکانی کوردی ئیرانی بەهوی پوستی ئیرانەوە بەدەستیان گەیشتووە. خوینەری کەمە چونکو خەلک روژنامەکەمان (نیشتمان ) زور دەخویننەوە ئینگلیسیەکان لە عیراق بوخویان کوتویانە کە روژنامەی نیشتمان بڵاو دەبیتەوە.
5ـ یەکیک لەو لاوە کوردانەی لەم دوایەدا لە عیراق گەراوەتەوە ئەو دەنگوباسەی کە ویرای ئەم نامەیە دەینیرم بو نووسیوین.

بەرپرسی بەشی راگەیاندنی حیزبی ژ. ک

نووسراوەی کوردی عیراق .... بۆ ئێمە ئەوەیە:
کە گەڕامەوە بۆ عیراق دوو ئەفسەری ئینگلیسی ئەم پرسیارانەیان لێکردم
پرسیار: بۆچ چووبوویە ئێران؟
وەڵام: لە ئازادی ڕێگا کەلکم وەرگرتوو چوومە گەڕان بۆ مەهابادێ.
پرسیار: هەر بۆ مەهابادی چووی یان ڕێگایتریشت گرتەبەر؟
وەڵام:نا هەر چوومە مەهاباد.
پرسیار: لەوێ ڕووسەکانیشت دی یان نا؟
وەڵام: مەهاباد بنکەی ڕووسانی لێ نییە .
پرسیار : کوردی ئێران چۆن دەڕواننە ڕووسەکان ؟
وەڵام: زۆر بەڕێزەوە وەک نەتەوەیەکی کە ئەوانیان لە بەدبەختی ڕزگار کردوە.
پرسیار: ئایا کوردەکان لەبیریان چوتەوە لە شەری پێشوودا ڕووسەکان چیان بەسەر هێنان ؟
وەڵام : کوردەکان ئەوەی دەزانن کە ئەو ڕووسانە لەگەڵ ڕووسی سەردەمی شەری یەکەم جاوازیان هەیە. ئەمانە بە شێوەی یەکەتی سۆڤیت ڕاهێنراون و هەموو نەتەوەکان بە چاوێک تەماشا دەکەن و هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کوردان بە عەدالەتەوەیە و ئینسانیە.
پرسیار : ( بە تووڕەییەوە ) مەگەر ئێستا ئینگلیسیەکان چ زوڵمێکی لە کوردان دەکەن ؟
وەڵام : هەڵەت ئینگلیسیەکان ڕاستەوخۆ زوڵم لە ئێمە ناکەن ، تەنیا حکومەتی ناعادڵانەی ئێران و عیراق و تورکیەیان بەسەردا سەپاندووین لەفسەرەکان باسی هەڵسوکەوتی عادڵانەی دەوڵەتی ئینگلیس و لەپاشان تێکۆشان لە پێناو ڕزگاری گەلی کورد دەکەن .

ڕەحمانی زەبیحی

کومەڵەی ژ. ک
ئیدارەی ناوەندی
بەرواری 7 رەزبەری 1323
ژینرال کونسولی بەریزی بەکیەتی سوڤیت لە شاری تەوریز
بەریزەوە ئاگادارتان دەکەمەوە کە سوپای ئیران بەنیازی بەرەو مەریوان چوون بووە و (حەمە رەشیدخان) بەرگری لەم کارەیان کردوە.
(سرتیپ هوشمەند ئەفشار) کە لەم دوایانەدا هاتبووە مەهاباد دەیهەوێ ئەوێ بخاتە سەر ناوچەی سەقزەوە و هیزەکانی ئیران بینیتە مەهاباد
.مەحمودخانی کانیسانانی لە دژی حەمەرەشیدخان هانداوە و پاش پیکدادانیک مەحمود خان هەڵاتووە.
لە 22ی سپتامبریدا هیزیکی سەربازی زۆری ئیران لە سنەوە بەرەو سەقز هاتووە. ئیلەکوییەکان، و گەڵباخیەکان و فەیزوڵلابەگیەکانی دەوری سەقز یارمەتیان دەکەن و داوای یارمەتیان لە ئەمیر ئەسعەدیش کردووە ئەویش قەولی داوە بەلام جاری نەرویشتوە ــ سوپای ئیران بە هیزی عەشایەرەوە بەرەو مەریوان وەریکەوتووە و 4 تانکیشیان هەیە
عەشیرەی جاف لە کوردەکانی عیراق و شیخ لەتیف کوری شیخ مەحمودی بەناوبانگ چەند مانگیکە هاتوونە شاروچکەی سەردەشت ، 1500 سواریان لەگەڵە کە چوونەتە نیو مەنگور و گەورکان و بەشیکیشیان چوونە یارمەتی حەمەرەشیدخان لەپاش پیکهەڵپرژانیکی کەم براکەی حەمە رەشید خان پاش بریندار بوون شاری مەریوانی بەجیهیشتووە و گەراوەتەوە بانەی.
وەکی دەرکەوتووە سوپای کۆکراوە لە سەقز بە نیازی داگیرکردنی بانەیە. حەمە رەشیدخان بو ئیمەی نووسیوە :

"... بالکونێک سەلیم ئاغا کێشی ئوف لەولی دابوو لەکاتی شەڕی ئیمە و ئێران دەوڵەتی سوڤیت یارمەتی حەمەڕەشیدخان دەدا و یان هەر ریگەنادا سوپای ئیران بەرەو ئەو ناوچە بێ. ئەم قسانەش (بڕیارانە) لە کونسولخانە هەن".

ئیستا داوای حەمەڕەشیدخان لە ئێوە ئەوەیە کە ئێوە پێشی هێرشی ئێران بو ئەوان بگرن هەتا سوارەی کورد لە دوورەوە دەگەنە یارمەتی ئەوان، هەروەها ریگا نەدەن کە سوپای ئێران تانک لەدژی هێزەکانی حەمەڕەشیدخان بەکار بهێنێ.

لە عێراقێ ئینگلیزەکان عەشیرە کوردەکان چەکدار دەکەن دیارە بو شەری دژی عەرەبەکانە.

سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر (بابەکر سەلیم ئاغا) لەسەر داوای ئینگلیسیەکان بو ئەمیر ئەسعەدی نووسیوە پێش چالاکی حیزبی ئیمە بگرێ.

(سەرتیپ هوشمەند ئەفشار) لەسەقز ئەو کەسانەی

دوو کوری سەیفوللاخانی و براکەشی، حاجی ئەمینالتجار و ئەفسەرێک و سەروانێکی سوپای ئیرانی بە تاوانی پیوەندی لەگەڵ حەمەڕەشیدخان خستونەتە بەندیخانەوە.

(سەرتیپ هوشمەند ئەفشار) بو لەوتاندنی گشتی کوردان لە حکومەتی ئیرانەوە ئەمری پێکراوە.

ئوستانداری رەزائیە (سەرهەنگ دڕخشانی) هاتووە مەهاباد و شەوێ لە مالی دوکتور ئەمین ئەفشاری مابووە.

لە کوتایی نامەکەمدا تکا و داوام هەیە کە لە مەسەلەی حەمەڕەشیدخانیدا یارمەتی بدەن.

بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی ژ. ک. رەحمانی زەبیحی

ئیدارەی ناوەندی

ژمارە

بەرواری 11ی رەزبەری 1323

لاپەرەی یەکەمی وێنووە

جوونە گەرانی سەروک عەشیرەتە کوردەکان هەر باسدەکری.

(ئیستا مەبەستی ئەم کارە ناروونە)

لە مەهاباد خەبەرم وەرگرتوە کە لە ماوەی چەند روژی داهاتوودا سەروک عاشیرەتەکان ( قەرەنی ئاغا مامەش، عبداللا ئاغا مەنگور ، بایز ئاغا گەورک - قازی محەمەد ) لە رەزائیەن و لەویرا بەریدەکرینە تارانی.

بەربرسی بەشی راگەیاندنی حیزبی ژ. ک

رەحمانی زەبیحی

کۆمەڵەی ژ. ک
ئیدارەی ناوەندی
ژمارە
بەرواری 14ی سەرماوەزی 1323
کونسولی بەڕێزی یەکیەتی سوڤێت ـ لەشاری تەورێز
بەڕێزەوە ئاگادارتان دەکەم :

1ـ ڕێکخراوی خەڵکی کوردی عیراقی بە نێوی هیوا (ئومێد) بـۆ پێوەنـدی گرتن لەگەڵ ئێمە دوو ئەندامیان ناردبوو کە ئێمە لەگەڵ ئەمان بڕیارماندا بۆ بەرەو پێشبردنی ئامانجی هەردوو ڕێکخراوەکە ( ئازادی گـەلی کـورد) هاوکاری بکەین و کاتی پێوەندی گرتن لە گەڵ دەوڵەتێکی دیکـە ئـەوان پرسمان پێبکـەن . پاشـان بەرپرسـی ڕێکخراوەکەمـان لە (هـەولێر) لەگـەڵ بەرپوەبەرەکـانی ئـەم ڕێکخراوە دانیشتووە . داوامـان لە ڕێکخـراوەی خۆمان کردوە کە بزانن بیرو ڕایان چۆنە . ڕێکخراوەکەمـان لە ئـاخر نامەی خۆیاندا (17 ی نوامبر) بۆیان نووسیوین لەگەڵ بەرپوەبەرەکـانی" هیوا"لە هـەولێر دانیشتوون و بـە لایـەنگری ئینگلیسـیەکانیان دەزانـن . لەشارەکـانی دیکـەی (کوردسـتانی) عـیراقیش لە لقەکـانی دیکـەی ڕێکخراوەکەمان پرسیار دەکەین.

2ـ لە عـیراق ڕێکخراوێکـی کومونیـستی هەیـە کـە لەم دوایانـەدا بڵاوکراوەیەکیان بە نهێنی دەرکردووە و لە ژمارەی یەکەمیدا پیرۆزباییان لە ڕۆژنامەکەی ئێمە( نیـشتمان) کردووە . ئێمەش دەمانـهەوێ لەگـەڵ ئەم ڕێکخراوە پێوەندی بگرین . هەروەها لقەکانمان لە عیراق دڵنیـان کـە ئەمانە بۆخۆیان نوێنەر دەنێرن.

3ـ بەیاننامەی ئێمە سەبارەت بە نەوتی باکووری ئێران گەیشتە عێراق و بڵاو کراوەتەوە.

4ـ لە نامەی ژمارە 351ی کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکەمان نووسراوە:
یەکیەتی سۆڤیتی مەزن ویستیاری پێشکەوتنی شارستانیتیە لە نێو گەلی کورددا و بەم بۆنەیەش ئێمە داوا دەکەین کە لەلایەن سۆڤیتەوە لە شارەکانی مەهاباد، بۆکان و نەغەدە و شنۆناوەندی کولتووری** بکرێتەوە و هەر نەبێ بۆ کرانەوەی ئەو ناوەندە لە شاری مەهاباد، زۆر تکادەکەین.

5ـ نامەی ژمارە 347ی کومیتەی ناوەندی حیزبمان دەڵێ:
سوپای ئێرانێ بە سەرۆکایەتی سەرتیپ هوشمەندی نەفشار چوتە سەردەشتێ و خەڵکی وێ زۆر نارازین - سوپای ئێران بۆ هەر شوێنێک دەچێ بۆ چاوترساندن دەسدەکا بە گرتنی خەڵکی. ئێستا لە نێو گیراوەکانی سەردەشتیدا 3 ئەندامی ئێمەیان لەگەڵە، یەکیان خەڵکی مەهابادە بەویان کوتوە کە لە مەهاباد نەوتی ئێران دەدەن بە سۆڤیت و لەدژی دەوڵەتی ئێران قسانەکەن و ئێمەش ئێوە لێرە لە زیندان دەکەین.

بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی ژ.ک

ڕەحمانی زەبیحی

1944/12/23

ژنرال کونسولی یەکیەتی سوڤیتی مەزن لە شاری تەوریز

هێندێ لە ئەندامە چالاک و خاوەن بڕواکانی حیزبەکەمانتان پێدەناسێنم

کە ئەمانەن :

1. قاسم قادر قازی لە مەهابادی پیر
2. عەلی ریحانی
3. عەبدولرحمان کەیانی لاو
4. مەناف کەریمی
5. محەمەد یاهو
6. محەمەد دلشاد
7. سەدیق حەیدەری
8. محەمەد ئەمین شەرەفی
9. رحمان ئیلخانیزادە بوکان
10. عەباس حەقیقی
11. رەحمان شەرەفکەندی (هەژار)
12. مامەند قادری لە نەغەدە پیر
13. مەجید خوسرەوی لاو
14. محەمەد قادری لە شنو لاو
15. نافع لە سەقز
16. محەمەد سەعید خافیدی کرمانشان
17. تاهیر هاشمی
18. عوسمان دانش لە سولەیمانیە
19. قادر دەباغی
20. محەمەد سەعید مەلا عەلی لە هەولێر
21. فەتاح غولامی لە سەردەشت
22. محەمەدئەمین شیخ الاسلامی لە مەهاباد (هیمن)

بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی ژ. ک ـ رەحمانی رەحیمی

ای ژانویەی 1945

کونسولی بەڕێزی یەکیەتی سوڤیێتی مەزن ـ لە شاری تەورێز

لەپێشدا بەبۆنەی سالی تازەوە سلاو و پیروزبایی حیزبەکەمان پێشکێش دەکەم . پاشان ،لە نامەکانی ڕابردوودا باسی ڕێکخراوی کومونیستەکانم لە عیراق بۆ کردبوون . لە لقی سولەیمانیەمانەوە لەم دواییانەدا کەسێک هاتووە و بلاوکراوەکەیانی بۆ هیناوین . ئەوا وەرگێردراوەکەیانتان پێشکێش دەکەم .

لەلایەن ڕێکخراوی کومونیستەکانی گەلی کورد لە عیراقەوە نوێنەر دەنێردرێتە لای حیزبمان ، پاشان زانیاری تیر و تەسەلتان لەبارەیانەوە پێشکێش دەکەم .

بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی ژ.ک

رەحمانی زەبیحی

(٢)

ما بنام پشتیبانی از وجدان و شفقت و آزادی در این بیانیه؛ خطیر دست تقاضای تشریک مساعی و تأیید به سوی احزاب مترقی و آزادیخواه ایران و همچنین جمعیات مترقی و آزادیخواه کرد در هر جا باشند دراز کرده، از تمامی آنها تقویت آرا انتظار داریم. و با ملت نجیب و همدرد ما آذربایجانی تشریک مساعی کامل خواهد شد و روابط دوستی تاریخی خود را بمراتب استوار خواهیم ساخت. حال فقط برای اثبات موجودیت و شناساندن حقوق خود در ایران بشرح ملیت و شرائط اساسی آن بطور عموم می پردازیم.

## ملت کورد و ملیت آن

جمعی از انسان را ملت می گویند که حائز و وابسته این شرائط باشند: زبان، مذهب، موقعیت جغرافیائی، تاریخ مشترک، آمال و آرزوی مشترک. کورد دارای مجموع این شرائط بوده و در نزد دوست و دشمن افتخار کلمه ملت را دارد. هر گروهی که ناشی از ایمان و اذعان و علاقمندی باین شرائط و پایه ها باشد ملیت و شعور ملی است. خوشبختانه تاریخ مشترک کورد عبارت است از مجموعه آثار و مظهرهای این روح برومند ملی. اینک ما ذیلا نسبت بهر یک از این پایه های اساسی بطور اختصار بحث خواهیم کرد.

## زبان کوردی

آخرین تحقیقات مستشرقین زبان شناس براین است که کوردی یک زبان بسیار قدیم آریائی میباشد. نیکیتین دانشمند خاور شناس فرانسوی می گوید زبان فعلی کورد از ریشه های قدیم آری بوده و دارای نحو و قواعد خاصی میباشد و خاصیت زبان شرقی و اصول آریائی صرف را دارا است.

زبان کوردی در نزد مستشرقین اهمیت بسزائی دارد حتی در دانشگاه تاریخی (سوربون) که دارای شهرت جهانی دارد از چند سال پیش شعبه ای برای زبان کوردی تخصیص و تدریس آن بعهده یکی از مستشرقین مبرز فرانسوی واگذار شده.

مطبوعات کوردی بعد از جنگ اول ترقی شایانی کرد. مشهورترین آن در روسیه (ریّی تازه) و در سوریه (هاوار، روژا نوی، ستیر) و در عراق (بانگ کورد، ژین، زبان، گلاویژ، ژار، کرمانجی) و کتب و رساله های سودمند بیشمار طبع و منتشر شده و در مدت جنگ اخیر نهضت مطبوعاتی مهمی شروع و در مدت یکساله جمهوریت کردستان ایران (روزنامه کوردستان، مجله های کوردستان، نیشتمان، هاوار نیشتمان، هاوار، گروگالی مندالان) در مهاباد و (هه لاله) در بوکان و (راویژ) در سنندج و در سایر مناطق کوردستان هم بمراتب بر نشاط مطبوعاتی کوردی افزوده شد.

## مذهب کورد

قوم کورد باستثنای عده کمی مسیحی و بعضی زرداتی قدیم (یزیدی) عموما مسلمان و اکثر آنها سنی هستند و مبادی انسانیت را از آئین زرداتی قدیم نیاکان خودشان محفوظ داشته اند و بهمین جهت با ادیان دیگر بسیار مسامحه دارند بخلاف همسایگانشان که در این قسمت هیچگونه تسامحی ندارند. دولتهای ذینفع برای سلب قومیت حس و حقوق نژادی تجانس دینی را وسیله قرار داده برای استهلاک کورد بنام همکیشی بسیار سعی کرده اند ولی تیر آنها بسنگ خورده است.

## موقعیت جغرافیائی کوردستان

کوردستان ستون فقرات خاور میانه است و شامل قسم اعظم سلسله جبالی است که از دریای سیاه تا نزدیکیهای (قفقاز) تا خلیج فارس امتداد دارد و در قسمت غربی دشتهای وسیع و حاصلخیز

که از همه امکانات ... به نفع ملت خود استفاده کرده و دنباله روی و تسلط از سیاستهای شرق یا غرب را
به مصالح ملت خود نمی دانست. البته نظر او مانند دیگران بود تا از سیاست شوروی بهره‌برداری کنیم و جوشش را هم خوردیم
عبدالرحمن ذبیحی جزو افرادی بود که میدانست دولت ایران مورد اعتماد نیست و استقرار نیرو دولت به مهاباد
و کشت و کشتار میزند از ایران خارج و به عراق رفت.

در عراق بصورت مخفیانه با گروه ابراهیم احمد - دکتر کمال فؤاد - جلال طالبانی - عمر مصطفی (عمر دبابه) و علی عسکری
و یاران آنها همکاری نزدیک داشت و مورد احترام و اعتماد آنها بود.

وقتی در سال ۱۹۶۷ گروه دفتری احمد را از ملا مصطفی جدا شده و با عده‌ای پیشمرگه به ایران آمدند
عبدالرحمن همراه آنها نبود و در بغداد توقف داشت. آنها در ایران یکی دو بار به خانه یاران آمده و یکی از سفرهایش
شبی را با من گذراند و قرار بود با هم همدیگر را ملاقات کنیم که متأسفانه دیگر او را ندیدیم.

از عبدالرحمن ذبیحی این بزرگ مرد گمنام دو تا نامه که تمام هست و عمر زندگی خود را در راه
تعهد سرنوشت خود فداکرد نامه‌ای بیادگار دارم که فتوکپی آن ضمیمه این نوشته است.

دست‌خط برادرم عبدالرحمن ذبیحی

شیرازی عزیز خیلی بسیار خرسندیست که پس از
سالها میتوانم این نامه را برای شما بنویسم امروز که تصادفاً
با یکی از دوستان قدیمی ملاقاتی دست داد و ذکر خیری از
شما بمیان آمد بمناسبت آنکه سال پیش در تهران بزیارت
جنابعالی موفق شده بودند پس نامه‌ای را که خدمتتان
نوشته بودم زیارت شد و از اینکه پس از اینهمه
سال توانستم از سلامتی‌تان باخبر بشوم نمیدانی چه حالت
وجدی دست داد . عزیزم من که الحمدلله سالم هستم
و روزگار بخوشی میگذرد و از وضع خود هیچ گله‌ای ندارم
چون خواجه شیراز فرموده وفا کنیم و ملامت کشیم و خوش
باشیم که در طریقت ما کافریست رنجیدن .
در پایان شما را بخدا میسپارم عشق [illegible] هستم
دوست دیرین شما [illegible]
[illegible]

کاکە ئەمیر گیانە

وادەزانم وەلامی پرسیارەکانت تەواو نین ، لێم ببورە کە وا دەدرەنگی
کەوت بەلام کاتی دەیخوێنیتەوە هەقم بەلادا دەدەی کە ئەو وەدرەنگی
خستنەم بە خۆڕایی نەبووە و دەبێ زۆر سوپاسی ئەو کچە کوردە بکەم کە لە
نوسینەوەی وەلامەکانما یارمەتی دام دەنا هێندەی تر دوادەکەوت .
لەم ئاخر و ئۆخری نامەکەمدا شتێکم لەسەر زمانی یەکگرتو بیرکەوتەوە کە
لەخوارەوە عەرزتانی دەکەم :

ئاشکرایە زمانی (نوسین) و (قسەکردن)ی هەموو نەتەوەیەک کەدیکەم وزۆر
لێکتر جیاوازییان هەیە ، خۆتان دەزانن ئەو (فارسی)یەی دەنوسرێ دەگەڵ
ئەوەی قسەی پێدەکرێ هێندێک فەرقیان هەیە بەلام ئەوەندە زۆرنییە وئەوە
وای لێ نەکردوە کە بۆ زمانی (کوردی)ش هەرسنورێکی ئاوا زۆر جیاوبکەم .
کە دێینە سەر زمانی عەرەبی مەسەلەکە بە جارێکی دەگۆڕێ چونکو ئەو (عەرەبی)
یەی دەنوسرێ دەگەڵ ئەو (عەرەبی)یەی قسەی پێدەکرێ (لە هەر وڵاتێکی
عەرەبیش بە شێوەیەکی تایبەتی قسە دەکرێ) زۆر لێک جیاوازن وئەوە کاری
کردوەتە سەر خوێندەوارانی کورد لە عیراق و لایان وایە زمانی نوسینی کوردی
دەگەڵ ئی قسەکردن ئەوەندەی عەرەبی یا نزیک بەو ، دەبێ لێک جودا
بێ . من ئەوە بەڕاست نازانم وبەلام وایە کە زمانی عەرەبی بە هۆی
شرایطێکی زۆر تایبەتی ئەوحالەتەی وەرگرتوە کە لە هیچ زمانێکی تردا نابیندرێ و
بۆ هیچ زمانێکیش دروست نابێتەوە .

ئیتر سەرکەوتنتان داواکەم
ڕاتانە زەبیحی

## تەرجمەی نامەی یەکەمی سەرهەنگ عیسا پەژمان

عیسا پەژمان
"سەرهەنگ"
پاریس
١٢/١١/٩٥

هاوشاری ئازیز، و دۆستی بەوەجی نەدیتوو و سەد ساڵ ئاشنا "کاک عەلی کەریمی" لە تەک سلاوی زۆر، میهری فرە و مەیل و شۆقی بێ پایان گەیشتنی نامەی تەئریخی ٩٥/١٠/٣٠ی ئێوە بە کەمێک وەدرەنگی کەوتن لەبەر سەفەرێکی کورت رادەگەیێنم.
لە وەرگرتنی ئەو نامەیە کە بۆن و نیشانەی خودالێخۆشبوو برای ئازیز و میهرەوانم کاک عەبدولڕەحمانی زەبیحی پێوە بوو زۆر خۆشحاڵ و شاد بووم و سپاستان لێدەکەم بۆ نووسینی نامەیەکی ئەوتۆ. پێتان سەیر بووە کە نێوی نەسلی و نازناوی کاک عەبدولڕەحمانم تێکەڵ کردووە و لە کتێبەکەم دا نووسیومە. یەکەم ئەوە جێی پێ سەیر بوون نییە، لەبەر گرێ وگۆڵ و گرفتی ژیان و درێژایی زەمان و تێپەڕینی سی و شەش ساڵ لە هەوەڵین دیداری ئێمە لە دیمشق، ناوی نەسلی وی لەتەک نازناوی تێکەڵ کراوە.
مەبەستی من ناساندنی کەسایەتییەک بووە بەو کەسانەی کە نەیانناسیوە جا ئەوە عەبدولڕەحمان یان حەسەن یان حوسێن بێ فەرق ناکا. جا بۆیە لە دۆخی ئەوتۆ دا قەت سەرتان سوور نەمێنێ چونکوو لەم دنیایەدا زۆر شتی گەورەتر و گرینگتر هەن کە سەرسوورێنەرن. بە هەمە حاڵ، سەبارەت بە دەرەجەی خوێندنی ئەمن شتێکم لێ نەپرسی و وەک دەڵێن ئیستینتاقم لە گەڵ نەکرد. هەر لە یەکەم پێوەندی دا میهر و دۆستی لە نێو ئێمەدا پێک هات کە چ حەوجی بە هێنانە گۆڕی پرسیاری ئەوتۆ لە گۆڕێدا نەبوو. لەمەش دەرچێ خەت و ئینشای وی بە تەواوی لە ئاستی لیسانسەکانی ئەو زەمانی و

ئێستا بەرەوژوورتر بوو. ئەگەریش دواتر پێوەندییەکی لە گەڵ دوکتور رادمەنیش هەبووبێ ئەوە نابێتە هۆی کۆمۆنیست بوونی وی یان سەر بە حیزبی توودە بوونی. ئەو لەبەر هاوکاری لە گەڵ یاد زیندوو سپەهبود تەیموری بەختیار کە دوکتور رادمەنیش سەفەری بەغدای دەکرد و بەختیاری دەدی حەتمەن کاک عەبدولڕەحمانیشی دیوە. ئەگەر سەبارەت بەوی بەر لەم جەریانە نووسیومە بە دڵنیاییەوە؛ خۆی گوتویە نەک ئەوەی ئەمن لە زمان وییەوە هەڵمبەستبێ. مەسەلەکە ئەوەندە گرینگ نەبووە کە بایەخی "هەڵبەستنی" هەبێ.

بە هەمە حاڵ، ئەمن لە ساڵی ١٩٥٩ ساڵێک دوای قەومانی کودەتا (ئینقلاب)ی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی عێراق بۆ هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە وەکوو لێکۆڵینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی، کۆمەڵایەتی و بابەتەکانی دیکەی گیر و گرفتی عێراق و ناوچەکانی باکووری عێراق چوومە عێراق. هەڵبەت لە توێژینەوەی ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران و ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستم دابوون بە تەواوی لە گەڵ ناوی عەبدولڕەحمانی زەبیحی ئاشنا بووم. کاتێک چوومە دیمشق و خەریکی تەدارەکی لێکۆڵینەوە لەسەر ناوچە جۆربەجۆرەکانی سووریا و بە تایبەتی ناوچە کوردنشینەکانی ئەوێ بووم، لە هۆتێل تووشی خودالێخۆشبوو زەبیحی هاتم. ئەو خۆی وەک عیسا عەرەفات و خەڵکی مەهاباد ناساند و هاتە دیوەکەی من و بە راشکاوی و بەڕەوتی پیاو و پیاوەتی گوتی راکردووە و خەڵکی مەهابادە و باسی زەمانی حکوومەتی قازی محەمەد و هێندی هێنا گۆڕێ. رۆژێک دوایە لە شەقامێکی دیمشق تووشی کوردێکی ناسیاو بووم، ئەو بوو کە لە توێی قسەکانی دا ناوی راستەقینەی کاک عەبدولڕەحمانی پێ گوتم. ئەمن هیچ بە رروم دا نەدەداوە و دوای دووسێ رۆژ کە یەکترمان دەدی ئەمن چوومە بەیرووت و نیتر نەوم نەدیتەوە. لە ساڵی ١٩٦٠ کاتێک مەئمووریەتی عێراقم درایە وەکوو ئاتاشەی عەسکەری ئێران لە بەغدا و چوومە ئەوێ لە جێژنێکی نەورۆزدا کە بانگ کرابووم و جەلال تالەبانی بانگ هێشتنی کردبووم تووشی زەبیحی بووم و پێی گوتم کە ئەندامی لێژنەی ناوەندی یە و هەموو شەوەکە بە تەنیشت یەکترییەوە بووین. لە ساڵی ١٩٦١ کە بابەتی هاوکاری ئێران و کوردەکانی باکووری عێراق هاتە گۆڕێ و

هەموویان (سەرۆکەکان) چوونە باکوور، کاک عەبدولڕەحمان و چەند کەسی دیکە لە بەغدا مانەوە و بە نهێنی دەژیان و لە لایەن حیزبەوە (پارتی دیمۆکراتی کوردستان) لە تەک مندا لە پێوەندی دا بوون. هەڵبەت یەدوڵا فەیلی پەیامهێنەر بوو و حەوتووی جارێک و ئەگەر پێویست بووبا دووجار لە ماڵی خۆم چاوم بە کاک عەبدولڕەحمان دەکەوت و هەر جۆرە عەمالیاتێکی موشتەرەکی هەمانبا بە هاوفکری یەکتری جێ بەجێمان دەکرد. نێوانی مەلا مستەفا و سەرۆکانی حیزب واتە "پارتی دیمۆکراتی کوردستانی عێراق" تێکچوو لە چاوپێکەوتنێکم دا لە گەڵ مەلا مستەفا تاوانێکی زۆری دایە پاڵ عەبدولڕەحمان و داوای لێکردم پێوەندیی لە تەک وی بپسێنم. بەڵام بە بیر گۆڕینەوە لە گەڵ سەرۆکەکانی پارتی و پێ باش بوونی ئەوان و نێ شەخسی خۆشم ئەو پێوەندییەم هەر پاراست و نەمپساند. تەنانەت مەلا مستەفا بە منی گوت ئەمری کوشتنی وی داوە، هەر وەک چۆن مامۆستایەکی مەکتەبیان کە ناویم لە بیر چووەتەوە بە پێی ئەمری ئەو مەلا ناملایە کوشت. لە بەغدا ئەو باسەم بە عەبدولڕەحمان ڕاگەیاند. وامان بڕیار دا ئەمن نوێنەری مەلا مستەفاش لە بەغدا ببینم و پێوەندیم لە گەڵی هەبێ و مەسەلەی پێوەندی هەبوونی خۆم و عەبدولڕەحمان لەوی بشارمەوە کە کردیشمان.

یەک دووجار بە نهێنی بۆ ڕاپەراندنی کاروباری حیزبی لە تەک عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری هات بۆ تاران و لە ماڵی من دەبوون (بۆخۆم لە مەئموورییەتی بەغدا بووم) بەڵام بۆ ئەو کارە لە تاران دەبووم تا ئەو کاتەی دەگەڕانەوە. هێندێک بەسەرهاتی دیکەشم لایە بۆ دواییەی هەڵدەگرم. ئێوە وەکوو پرسیار ئەوەی کە پێویستیتان پێی هەیە بنووسن ئەمن وڵامتان دەدەمەوە. بەرگێک کتێبی "اسرار قرارداد ۱۹۷۵" کە لە مەر عەمەلیاتی باکووری عێراقە وەک دیاری دەنێرم. دوای خوێندنەوەی ئەگەر نوختەی گرینگی ئەوتۆی بۆ ئێوە تێدابێ کە پرسیاری لەسەر بکەن بنووسن کە وڵامی پێویستتان بدەمەوە. بە هەمە حاڵ پیاوێکی کارجوان و بەشەرف و داوێنپاک بوو... ڕەوانی شاد بێ. بە هیوای بە دەست گەیشتنی کتێب و وەرگرتنی نامەکانی ئێوە لەمەودوا.

لە گەڵ باشترین ئاواتم

سەرهەنگی ستاد عیسا پەژمان

# تەرجمەی بەشێک لە نامەیەکی تری سەرهەنگ پەژمان

عیسا پەژمان
"سەرهەنگ"
پاریس
٧/١/٩٦

...بەلام لەمەر یاد زیندوو عەبدولڕەحمانی زەبیحی، پێموایە پێشتر بۆم نووسیبووی کە من لە سەرەتا لە دیمشق لە گەلی بوومە ئاشنا و دوایە لە بەغدا بووینە دۆست. ماوەی پێنج ساڵ کە وەک ئاتاشەی عەسکەری لە عێراق بووم لە گەڵ بەرێزیان هاوکاری نزیکم هەبوو. ئەو تەرتیبی هاتنی عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری بۆ ئێران ئامادە کرد، چونکوو بەرپرسی پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق لە بەغدا بوو، لە هەمان کاتدا ئەندامی لیژنەی ناوەندی و کۆمیتەی (مەکتەبی) سیاسیش بوو. من قەت پێموانییە لە سەرەتای دەسپێکردنی هاوکاری لە گەڵ سەرهەڵداوەکان تا کاتی نیمزای پەیمانی ١٩٧٥ی ئەلجەزایر ئەو هاتبێتە ئێران. فکر ناکەم کە ئەو بابەتە کاک برایم ئەحمەدیش کە ئاگای لە کاروبارەکان بووە ئەنیید کا. دوکتۆر شیرازی چ کارێکی دیکەی بووە جگە لە ددانسازی و پیشەی تر کە ئاگای لە هاتنی کاک عەبدولڕەحمان و یان عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری بووبێ. وتەکانی دوکتۆر شیرازی دەبێ بە پارێزەوە وەربگیرێن. سەبارەت بە وی هەر کاتێک یەکترمان دی بە دوور و درێژی قسە دەکەین. یادزیندوو زەبیحی و من ئەوەی کە توانیمان بۆ کورد و کوردستانمان کرد تەنێ کاک برایم ئەحمەد و جەلال تالەبانی ئاگایان لێیە. گیروگرفت و موشکیلەی ئەساسی ئێمە مەلا مستەفا بوو کە تا رۆژی مردن دەستی لە دوژمنایەتی و لاساری و کارشکێنی هەڵنەگرت. ئەو لە دوژمنانی قەستەسەری خوداڵێخۆشبوو زەبیحی بوو و سوور بوو لەسەر کوشتنی و

بۆ لە ناوبردنی ئەمری دەرکردبوو، ئەوەی بە من گووت. ئەگەرچی دووستی کەسی حیزبی(ئی پارتی) کوشت و تاکوتەرای حیزبی یا غەیری حیزبی کوردی ئێرانی تەسلیمی ساواک کرد و لە ئاست رۆڵەکانی کورد گەورەترین خیانەتی کرد، لەبەر لایەنگری و رەوتی پارتی و پارتییەکان (لایەنگرانی مەکتەبی سیاسی) هیچکات لە گەڵ ئێمە ساف و دڵپاک نەبوو..................

..................................................................................................................

..................................................................................................................

............

نیتر هەر بژی بە شادی و شادمانی
و هەر بژی کورد و کوردستان
برای دڵسۆزتان
عیسا پەژمان

## قامووسی سیاسی

قامووسی سیاسی کتیبێکی زور بەنرخو نایابە ، لە ژیر چاوەدیری ( ما ـ پروفسور )ی سووەتی «ب . ن پانوماریفا» دا ، بەزمانی رووسی دانراوە ، هەموو باسیکی اقتصادی ، فەلسەفی‌و سیاسی ، گرینگی تیدایە .

لەلایەن ح . قزلجی و ر . ذەبیحی ، کراوە بە عەرەبی ، بەشی یەکەمی لە بابەت ( مسائل المادیة الدیالیکتیکیة )وە ، بەم زوانە دەرنەچیو پیشکەشی خوینەوارانی بەریز نەکریت .

دانەی بە ٤٠ فلس

---

هەر ئاشتی‌یە کە هەمیشە ئەتاهەتایە سەر دەکەویت !
«عبدالکریم قاسم»

ئاشتیخوازی لادی ـ یی

و

پەیمانی دوو لایی

ح . قزلجی　　ر . ذەبیحی

چاپخانەی « النجاح » بەغدا
١٩٥٩

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# جوغرافیای کوردستانی ئێران

عەلی ئەصفەری شەمیمی هەمەدانی
دایناوە

عبد الرحمن محمد امین زەبیحی
لە فارسی‌یەوە کردوویە بە کوردی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغدا – ١٩٨٠

گۆڤاری رۆشنبیری نوێ : ژمارە ٧١
تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم ١٩٧٨

عوسمان هەوشار

گـــەردەلوولم ،
بەســـەرتا هات ،
جێ گەت گۆڕی ،
کەوتیشە تـەڵا ،
شنەی شـــەماڵ ،
دنیـــای جۆلـــت
بەجێ ی هێشـــتم
وەکو خەونێك بێ گێڕمەوە

تا بەســـەرهات و ئـــەرکی ئازارو توانەوە ، لە بەزارەبی و رەنجەرۆیی لـــە رۆژگارو شـــەوگارە دوورو درێژکانـــی ، ئارمانـــی عـــەشـــقی بەفیرۆ جوبی ڕاپەبەڕێت و دێتـــەوە سەرخۆ ، لە هۆنراوەی (لە ڕێی بەرزیتـــا) بڵاوکراوەی هاوکاری ژمـــارە ٤١٩ ئاداری ١٩٧٨ بـــە زمانی دانایەك ئەڵێ :

بەرەنجی شانی گیانی دلداری ،
بر بە شانەی فام کۆ ئەکەمەوە ،
ووشەی داســتە ، وەکو دلداری،
ئەهۆنمەوە ....

١ ـ (ئەتوکەی بـــەهار) چابـــی یەکەم ١٩٦٩
٢ ـ گۆڤاری شـــەفەق سالی ١٩٦١
٣ ـ رۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٤١٩ ئاداری ١٩٧٨

عبدالرحمن زەبیحی

# رەخـــنەی زانستیانـــە یاخود شـــدلـم کوێرم هیـچ نابـوێرم

سالێك زیاترە بەرگی یـەکـەمی « قاموو...
زمانی کوردی » بڵاوبۆتەوە ، هەموو ئەو ماوەیە ه...
جاوەم لـە ڕێگا بوە کە خوێنـــدەوارو زانایانی کور...
ئەکاتێ بدەنە خۆیان و دەست‌کەن بە رەخنەگرتن لێ...
بەداخـەوە لـەم ماوە دوورو درێژەدا تەنیـا بر...
خوێنـــدبێتم کاك مەحموود ئامەدار لـە رۆژنامـ...
«هاکاری»دا شتێکی لەسەر (قاموس) نووسی ک...
ئەویش زیاتر (ئەسن) و بێ هەڵکوتن بو لەوەی ڕەخ...
لێگرتن و دیار خستنی کـەم و کوڕیـەکانی ، هـ...
جۆنێ بێ زۆر سوپاس بۆ کاك مەحموود .

لەم دوایانەدا بیـــنم کە کاك جەمال ئەبێز ل...
ڕووی لوتف و بەندەنەوازیەوە «قاموو ســـی» بەســ...
کردۆتەوە و لە «گۆڤاری کۆلێجی ئـــەدەبیات ، ژم...
٢٢ ، سالی ١٩٧٨»دا رەخنـــەی لێگرتووە ، دوت...
نۆخەیش ! ئەوە ئاواتەکەم هاتەدی ، هیچ نەبێ ئ...
کاك جەمال ڕچەی شکاندو لەوانەیە خەڵك جاوی ...
بکەن و بە ئەشتەری «ڕەخنەی زانستی»یانە هەمـ...

قاموسی زمانی کوردی

بەرگی یەکەم

الزعيم الركن عبد الكريم قاسم

يتحدث

مبادىء ثورة ١٤ تموز

فى خطب الزعيم

١٩٥٨

مطبعة المبتى

وفد طلبة كردستان العراقية

ووفد اكراد الاقليم الشمالي من الجمهورية العربية المتحدة

يقابل سيادة رئيس الوزراء فى وزارة الدفاع

يوم الخميس ١٨/٩/١٩٥٨

قابل سيادة الزعيم الركن عبدالكريم قاسم رئيس الوزراء صباح امس في وزارة الدفاع وفد طلبة كردستان العراقية مع وفد من اكراد الاقليم الشمالي من الجمهورية العربية المتحدة وقد القى كل من الاستاذ جلال طالباني احد اعضاء وفد طلبة كردستان العراقية كلمة طيبة والاستاذ عبد الرحمن ذبيحي احد اعضاء وفد اكراد الاقليم الشمالي للجمهورية العربية المتحدة كلمة عبر فيها عن شعوره الصادق نحو الجمهورية العراقية .

فاجابهم سيادة الزعيم الركن عبدالكريم قاسم رئيس الوزراء الكلمة التالية :

اني اعتبر هذا اليوم من احسن ايامي لاجتماعي باخواني الاكراد الذين هم

خوێنـەرانی بەڕێـز !

ئەگەر لە بیرتـان مابێ لە چەند شوێنی سەرەتاکەی بەرگی یەکەمی ئـەم (( قامۆس ))ەدا مەترسیی خۆم دەربڕیوە کە ڕەنگە (( قامۆس )) شتێکی بۆ ڕێـك بکەوێ و تەواوبوون بە خۆیەوە نەبینێ ، ئاشکرایە هەمبتـە مەترسیی لە ڕوداوی خراپ و کارەساتی ئالەبار و سەلبیی ( مەنفی ) دەکرێ کە ببێتە بەرهـەڵستی جێبەجێبوونی کاران . جا هەر بۆیە منیش ئەوەی بە خەیالمدا نەهاتبێ ئـەوە بوە کە ڕوداوێکی چاك و کارەساتێکی لەبار و ئیجابی ( مثبت ) ببێتە بەرهەڵست و کۆسپی سەرڕێگای قامۆس .

ئەم بەرگی دوەمە تەواو نەکەوتبوە ژێر چاپ ، هەرای میللەتانی ئێران دژی ڕژێمی شاهەنشاهی دەستی پێکرد و بە پێی پەرەسەندنی ئەم شۆڕشـە چالاکی منیش لە نوسینەوە و ڕێکخستنی فیشەکانی ئەم بەرگە ، لە کورتیدەدا و بوەمە دەنکە گەنمی نێوان دو بەرداشان . لـە لایەکەوە (( قاموس ))ە و دەستی پێکراوە و هەرچۆنێ بێ دەبێ تەواو بێ و هیچ نەبێ ئەوەندەی لە ووزەدایـە کاری لەسەر بکرێت ، لەلایەکیتریشەوە چلۆنایەتی ئێران مەیدانی خەبـاتی سیاسی نەتەوەی کوردی خۆش‌کردوە و چەشنی میقناتیس ڕامدەکێشێ .

ئەم حالەی من بۆ بە هۆی بەدیهاتنی هەندێ کەم و کوڕی لەم بەرگەدا کە هێندێکیان ، خوێنـەوارانی بەرێـز بـە سەلیـقە دەتوانـن بیزانـن و هێندێکیشیان کە ڕەنگە زۆریش نەبن ، وا لە خـوارەوە بەرزتـان دەکرێ :

١ــ هەلەی چاپی تێدایە کە لەدواییدا غەلەتنامەی بۆکراوە .

٢ــ بە پێی ئەو دەستورەی کە بۆ ڕێکخستنی ئەم قامۆسە ڕەچاوم‌کردوە و لە سەرەتای بەرگی یەکەما نیشانم داوە ، ووشەی گەلی ( مرکب ) کە لە حالەتی ئیزافەدا بن دەبێ لە ژێر (ماك)یکی ئەسلیدا بنوسرێن ، بەلام لە هەندێ شوێنی ئەم بەرگەدا هێندێك لەم چەشنە ووشانە وەکو ماکێکی ئەسلی لەسەری دێرەوە نوسراون .

٣ــ ئەم بەرگە ئەگەرچی لە ( سـەرپەڕ )ەکەی نوسراوە . ( ب ) بـەلام ووشەکانی کە بە [ ب + ( ی ، یْ ، یێ ) ] دەستپێدەکەن تێیدانیـە و ئـەو کۆمەلە ووشەیەم بە ناچاری هەلگرتوە بۆ سەرەتای بەرگی سێیەم .

هەینی ١٩٧٩/٦/٢٢

بەغدا

تێبینی: ئەو نووسراوەیەی زەبیحی. وەک پاشکۆ لە جلدی (ب)ی قاموسەکەیدا هاتووە کە تێیدا باسی مەترسی لەناوچوونی قاموس و هەروەها چارەنووسی نادیاری ژیانی خۆی دەکا. وا وێدەچێ ئەو نووسراوەیە لە ئاخرین نووسینەکانی زەبیحی بێ. بەداخەوە لەگەڵ ئەوەش کە گۆڤاری «سروە» بە بێ ئیزن و هیچ یاسایەک کتێبەکانی چاپ و بلاوکردەوە، ئەو لاپەڕەیەی لێ هەلاواردووە ــ نووسەر.

زەبیحی و محەمەدی شاپەسەند - کاتی دەرکردنی گۆڤاری نیشتمان - تەوریز

زەبیحی لەگەڵ سەفیری چین لە بەغدا

هەژار و زەبیحی - سەردەمی کومەلەی ژ.ک کاتی دەرکردنی کوڤاری نیشتمان - تەوریز

حەسەنی قزڵجی، نووری ئەحمەد تەها ، زەبیحی

سەردەمی کۆمەڵەی ژ. ک ساڵی ١٩٤٤ تەوریز
راوەستاوەکان لەراستەوە : ١) زەبیحی ٢) محەمەدی شاپەسەند
دانیشتووەکان لەراستەوە : ١) هاشمی خەلیل زادە ٢)خەلیلی ساوجبلاغچی (خانە )

سەردەمی کۆمەڵەی ژ. ک تەوریز

لەراستەوە : ١) زەبیحی ٢) حوسینی نەوبەری (ئازەری) ٣) سەدیقی حەیدەری
٤) جەعفەری ساوجبلاغچی (ئازەری) ٥) نەناسراو ٦) محەمەدی شاپەسەند

سەردەمی چالاکی کۆمەڵەی ژ.ک
راوەستاو لە راستەوە ١) مەحمود وەلی زادە ٢) سمایل خانی فەروخی ٣) زەبیحی ٤) وەهاب بلوریان،
دانیشتووەکان لە راستەوە ١) نەجمەدین تەوحیدی ٢) قاسم ئیلخانی زادە ٣) عەبدولرەحمان ئیمامی
(ئەو وینەیە لەکتیبی کۆماری کورد -وەرگێراوی سەید محەمەدی سەمەدی وەرگیراوە)

سەردەمی کۆماری کوردستان-مەهاباد

دانیشتوو: قازی محەمەد، ریزی یەکەم لە راستەوە ١) حاجی مستەفای داودی ٢) خەلیلی خوسرەوی ٣) ئەحمەدی ئیلاهی ٤) محەمەدەمینی موعینی ٥) وەهابی بلوریان ٦) رەحمانی ئیلخانی زادە ٧) کەریمی ئەحمەدەین ٨)عەلی ریحانی، ریزی دووهەم لە راستەوە ١) زەبیحی ٢) حوسێنی فروهەر ٣) سەید محەمەدی ئەیوبیان ٤) مەنافی کەریمی ٥) محەمەدی یاهو ٦) سەدیقی حەیدەری

(ئەو وینەیە لە کتێبی جەمهوری کوردستان ١٩٤٦نووسراوەی ویلیام ئیگلتن (کوڕ) وەرگیراوە)

سە ردە می کۆماری کوردستان ـ مە هاباد

دانیشتووە کان لە راستە وە : ١)خە لیلی خوسرە وی ٢) زە بیحی ٣) قە دری جە میل پاشا ٤) قازی محە مە د ٥) غە نی خوسرە وی ٦) هە مزە ی نە لوس ٧) مە نافی کە ریمی ، راوە ستاوە کان لە راستە وە : ١) رەئیس بەکر ٢) رە حمان وە یسی ٣) ئە حمە د ٤)...؟ ٥) مستە فا سولتانیان ٦) ...؟ ٧) عە زیزی مە نسووری قازی ٨) وە هابی قازی ٩) عە لی خوسرە وی ١٠) محە مە دە مینی شە رە فی ١١) دلشاد رە سولی

خۆپیشاندانی هێزی پێشمەرگە لە مەهاباد لەبەرانبەر قازی محەمەد وکاربەدەستانی کۆماری کوردستان
لەلای چەپەوە: ئەفەری دووهەم قازی محەمەد ونەفەری چوارەم زەبیحی، نەفەری یەکەم بە جلوبەرگی نیزامی: ئیبراهیم سەلاح

سەردەمی کۆماری کوردستان ـ مەهاباد

دانیشووان لەراستەوە : ۱)خەلیلی خوسرەوی ۲) زەبیحی ۳) قەدری جەمیل پاشا ۴) قازی محەمەد

کونگرەی پارتی - بەغدا
یەکەم دانیشتووی ریزی یەکەم : زەبیحی

سه رده می عه بدولکه ریم قاسم ـ به غدا

له راسته وه : ۱) هه ژار ۲) و ۳)....؟ ۴) عه بدولکه ریم قاسم ۵) مام جه لال ٦و۷)...؟ ۸) زه بیحی

بنکەی کەلار سالی ١٩٦٧

راوەستاوەکان لە ڕاستەوە: ١) حەمە چاوشین ٢)محەمەد حەسەن برزو ٣) حەسەن سلەیمان ٤) رەئیس محەمەدەمین فەرەج ٥) عەریف محەمەد موریاسی ٦) عەریف تالیب ٧) زەبیحی ٨) ...؟ ٩) حەمەی فەرەج ١٠) عومەر دەبابە ١١) سەید تاهیری جەباری ١٢) شێخ لەتیف بەرزنجی ١٣) معاون شێخ سەدیق ١٤) محەمەد حاجی تاهیر، دانیشتووەکان لە راستەوە: ١) مەلا رئوف حەلەبجەیی ٢) زیرو عەبدولا ٣) شێخ رئوفی شێخ مارف ٤) ....؟

بنكەی كەلار ساڵی ١٩٦٧ لەكاتی كۆنگرەی پارتی ( مەكتەبی سیاسی )
لەڕاستەوە: ١) عەزیز گورگە ٢) ...؟ ٣) نەقیب حەمە ساڵح ٤) قادر بەردەسپی ٥) زەبیحی ٦) هەمزە ئاغا پشتدەری ٧) ئەحمەد حەمەدەمین ئاغای دزەیی ٨) مام جەلال ٩) ...؟ ١٠) شێخ لەتیفی بەرزنجی ١١)ماموستا عەبباس حوسین

بنکەی کەلار سالی ١٩٤٧

لەراستەوە: ١) حەمە موریاسی ٢) قادر کۆکەیی ٣) ...؟ ٤) ئەحمەد حەمەدەمین ئاغای دزەیی ٥) بیستونی مەلا عومەر ٦) هەمزەئاغا ٧) ...؟ ٨) شێخ لەتیف بەرزەنجی ٩)...؟ ١٠) زەبیحی

بنکه‌ی لشکری پارتی له‌که‌لار - ١٩٦٨/٤/٢٠

راوه‌ستاو له‌چه‌په‌وه: ١) عومه‌ر سۆفی ٢)عه‌زیز وسو ٣)سه‌ید مه‌جید ٤) شێخ له‌تیف به‌رزه‌نجی ٥) ئه‌حمد حه‌مه‌ده‌مین ئاغای دزه‌یی ٦) عه‌زیز گورگه ٧) زه‌بیحی ٨)حه‌مه سالح ٩)حوسێن کادر ١٠)قادر به‌رده سپی ١١) شه‌ریف ١٢) سه‌مه‌د و چه‌ند پێشمه‌رگه

بنکەی پارتی لە ماوەت

نەفەری دەستی ڕاستی مەلای ماوەت زەبیحی یە و نەفەری دووهەم عەبدوللا ئیسماعیل ونەفەری سێهەم لای چەپ محەمەدی شاپەسەندە

ئەم وێنەیە بە تایبەتی من گرتوومە،
لە بەهاری ساڵی ١٩٦٩ گیراوە. پێشکەشی
دەکەم بە مامۆستا بڕایم ئەحمەدی
شۆڕشگێڕی نووسەر و شاعیر، لەگەڵ ڕێزدا

16.7.1998 خالید دلێر
سویسرە

وێنەی مامۆستا
عبدالرحمن محمد امین زەبیحی

زەبیحی لەتەمەنی ١٣-١٤ ساڵیدا ، لەپۆلی شەشەمی نیبتیدایی

بەغدا ـ ١٩٧٠/٢/٩

لەراستەوە: ١) محەممەدی رەشادی ٢)محەممەدی محیدین (محەممەدی عەزەکویر) ٣)زەبیحی ٤)محەمەدی شایەسەند.

زەبیحی لە ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد، ساڵی ١٩٧٩ - لەندەن
(چەند مانگ پێش هاتنەوەی بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان)

سەردەمی کومەڵەی ژ. ک و دەرکردنی گوڤاری نیشتمان ، رەمەزانی ١٣٢٣ ـ تەوریز
راوەستاوەکان لەراستەوە : ١) محەمەدی شاپەسەند ٢و٣) نەناسراو (دەبی خەلکی تەوریز بن) دانیشتووەکان لەراستەوە : ١) ...؟
٢)خەلیلی ساوجبلاغچی (خانە) ٣) زەبیحی ٤) نەناسراو.

زەبیحی لە مەهاباد، ساڵی ١٩٧٩
(لە ماڵی خۆمان گیراوە-نووسەر)

زەبیحی لە بەیروت، لەسێپتامبری ساڵی ١٩٧٤

ماموستا شیخ عیزەددینی حوسێنی و زەبیحی

(دوای هێرشی یەکەمی خومەینی بۆ سەر کوردستان لەنێوان سنووری کوردستانی ڕۆژهەلات وباشوور لە شێنێ

محه مه دی شاپه سه ند

(ئه و وێنه یه له و ساڵانه ی دوایی له سوله یمانیه گیراوه وبه خۆی جووتیاری حاجی تۆفیق گه یشتووه ته ده ستم)

# سەرچاوەکان


١- نیشتمان، بلاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ.ک ١٩٤٣-١٩٤٤ ژمارە ١-٩

٢- رۆژنامەکانی کوردستان، چاپی مەهاباد ١٩٤٦

٣- کوردستان و کورد، د. عەبدولڕەحمان قاسملو

٤- چل ساڵ خەبات، د. عەبدولڕەحمان قاسملو

٥- پێداچوونەوە، کەریم حیسامی، ستۆکهۆڵم ١٩٩٦

٦- قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، عەبدولڕەحمان زەبیحی، بەغدا ١٩٧٧

٧- قامووسی زمانی کوردی، بەرگی دووهەم، عەبدولڕەحمان زەبیحی، بەغدا ١٩٧٩

٨- کۆماری کورد، ویلیام ایگلتون جونیر، وەرگێڕاوی سید محمد صمدی مەهاباد ١٩٨٠

٩- تاریک و ڕوون، هێمن

١٠- بۆ کوردستان، هەژار، چاپی سێهەم، تاران ١٩٧٩

١١- حکومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆڤیێتی دا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ١٩٩٣

١٢- جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، د. عەزیز شەمزینی، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزو، وەرگێڕاوی ف. ئەسەسەرد، چاپی دووەم ١٩٨٥

١٣- ژێ. کاف چبوو؟ چی دەویست؟ کۆکراوەی سید محمد صمدی، مەهاباد ١٩٨١

١٤- جوغرافیای کوردستانی ئێران، عەلی ئەصغەری شەمیمی هەمەدانی، تەرجەمەی عەبدولڕەحمان زەبیحی، بەغدا ١٩٨٠

١٥- گۆڤاری نیشتمان، جەمال نەبەز، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوئید ١٩٨٥

١٦- ببلیوگرافیای دوو صەد ساڵی کتێبی کوردی، مصطفی نەریمان، بەغدا ١٩٨٨

١٧- گۆڤاری گزینگ، سوئید

١٨- گۆڤاری رابوون، سوئید

١٩- گۆڤاری هاوار، ئالمان

٢٠- چریکەی کوردستان، ژمارە ١، لەندەن ١٩٧٩

٢١- گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٧١، تشرینی دووەم ١٩٧٨

٢٢- گۆڤاری ڕزگاری، ژمارە ١، ساڵی یەکەم ١٩٦٩

٢٣- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، سلەیمانی، ژمارە ١١٩، ساڵی ١٩٩٤

٢٤- جنبش ملی کرد، کریس کوچرا، ترجمه ابراهیم یونسی، تهران ١٣٧٣

٢٥- جمهوری کردستان، ویلیام ایگلتون جونیر، ترجمه سید محمد صمدی، مهاباد، ١٣٦١
٢٦- اسرار بستن پیمان ١٩٧٥ الجزیره، سرهنگ عیسی پژمان، انتشارات نیما، فرانسه
٢٧- کردها و کردستان، جلد ٣ و ٤، سرهنگ عیسی پژمان، انتشارات نیما ١٩٩٢، فرانسه
٢٨- اسرار شگفت انگیز قتل تیمور بختیار، سرهنگ عیسی پژمان، فرانسه
٢٩- خاطراتی از ماموریت های من در آذربایجان، سرلشکر احمد زنگنه
٣٠- کردها و یک بررسی تاریخی و سیاسی، حسن ارفع، ترجمه فارسی از متن انگلیسی
٣١- خاطرات نورالدین کیانوری، تهران ١٣٧١، انتشارات اطلاعات
٣٢- قاضی محمد و جنبش رهایی بخش ملی خلق کرد، د. رحیم قاضی (چاپ نەکراو لە لای کاک حەسەنی قازی)
٣٣- کردستان والحرکه القومیه الکردیه، جلال طالبانی، بغداد ١٩٧٠
٣٤- الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیه، الدکتور عبدالستار طاهر شریف، بغداد ١٩٨٩
٣٥- الزعیم الرکن عبدالکریم قاسم یتحدث، بغداد ١٩٥٨

36- David McDowell, A Modern History of the Kurds. I.B.Taruris, 1995.

37- Amir Hassanpour, Nationalism and Language in Kurdistan, 1918-1985, San Francisco, Mellen Research University Press, 1992.

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٥ی

## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێڕ | بابەت | جۆری چاپ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٣٠١ | بەئاشتی کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٣٠٢ | پیاسەیەك بەکووچەکانی قەدەردا | ئاوێزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپ‌وبڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٣٠٤ | دەنگی بلوێری دەق | عەبدوخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٠٥ | رۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٠٧ | دوورگەی بێداری | تەھا ئەحمەد رەسوڵ | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٠٨ | داستانی خەبات‌و ماڵئاوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٠٩ | ماچی گوڵشەن‌و کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد ھیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣١٠ | شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ | عەبدولقادر ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١١ | کورد لەچەند تۆمارێکی مێژووییدا | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣١٢ | فەرھەنگی کورد ناسین | مەلا عەبدوخالق شوانی | فەرھەنگ | چاپکردن |
| ٣١٣ | شیخ محمد خال مفسرا | عمر علي محمد | ماجستێرنامە | چاپکردن |
| ٣١٤ | دیوانی مەزڵوم | ئا/ ئومێد کاکە رەش | دیوانی شیعر | چاپکردن |
| ٣١٥ | دیوانی فۆلکلۆری ناوچەی ئەردەڵان | ئا/ح. موسەنن | فۆلکلۆر | چاپکردن |
| ٣١٦ | ئەنفال‌و رەھەندە سۆسیۆلۆجییەکان | محەمەد رەئوف ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١٧ | کێشە نەتەوەییەکان‌و رووداوە سیاسیەکانی کوردستان‌و جیھان | د. کەمال مەعروف | لێکۆڵینەوەی سیاسی | چاپکردن |
| ٣١٨ | دڵۆپەی ئەو شیعرانەی قژیان زەردو چاویان شینە | جەبار سابیر | شیعر | چاپکردن |
| ٣١٩ | ئاخاوتنی ھەنووکەیی | ھەڵکەوت عەبدوڵڵا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٢٠ | کورد لەزەردەشتییەوە بۆ ئیسلام | سامان عوسمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٢١ | رۆژنامەڤان | فەرەیدون سامان | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٣٢٢ | بیرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی | فوئادی تاھیر سادق | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٢٣ | بیبلۆگرافیای چاپکراوەکانی ب.گ. چاپ‌و بڵاوکردنەوە | ئا: جەبار سابیر | بیبلۆگرافیای | چاپکردن |
| ٣٢٤ | چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی ھاوچەرخی کورد | کامەران بابان زادە | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٢٥ | سەلیقەی زمانەوانی.. | د.حسێن محەمەد عەزیز | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٢٦ | چەپکە گوڵ | کاوە فەقێ زادە | ھونەری | چاپکردن |
| ٣٢٧ | من‌و بولبول | ئا: جەلال محەمەد مستەفا کوردی | بەرھەمەکانی محەمەد مستەفا کوردی | چاپکردن |
| ٣٢٨ | ناوچەی پشدەر لەناوێنەی رۆژگاردا | ئەحمەد محەمەد عەلی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٢٩ | فردەوسی ئەمتومان | دڵشاد مستەفا | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٣٠ | غوربەتی فڕین | ئاسۆ جەبار | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٣١ | سەربردەی باڵەو بەر بناری سوورکێو | محەمەد خوسرەوی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٣٢ | بەشێك لەبیرەوەرییە تاڵ‌و شیرینەکانی ژیانم | سەید عەلی رەحمانی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٣٣ | عصیەت‌و تیوری دەوڵەت لەبیری ئین خەلدوندا | ئەلیرت عیسا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |

| ٣٣٤ | من طوبخانة الى عرعر | عارف قوربانی | رامیاری | چاپکردن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٣٣٥ | پوختەیەك لەمێژووی گەورە رفێزی جیهانی | لوقمان حەیلانی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٣٦ | هەڵویست | شێخ عەبدول | چیرۆك | چاپکردن |
| ٣٣٧ | شێواز لەکورتە چیرۆکی کوردیدا | سەلیم رەشید | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣٣٨ | دوژمنی گەلو مێگەلێوم | شێرزاد حەسەن | ١٧ وتاری شانۆیی | چاپکردن |
| ٣٣٩ | جلەی داربەڕووەکەی نیشتمان | ئا.ب.گ. چاپو بلاوکردنەوە | ڕێزلێنان | چاپکردن |
| ٣٤٠ | شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات | قوبادی جەلی زادە | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٣٤١ | محاسەبەی ئیابەت | ئا: ئەحمەد حسێن | کۆمەڵێ وتار | چاپکردن |
| ٣٤٢ | بەسەرهاتی رەفیق حلمی | ناهیدە رەفیق حلمی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٤٣ | وێرانکاریو تاوانەکانی بەعس لەبیرەوەرییەکانمدا | جەمال شێخ نووری | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٤٤ | التبیان فی بیان الناسخ المنسوخ ... | ئومێد ئەحمەدین | نامەی ماجستێر | چاپکردن |
| ٣٤٥ | نۆژەن | ریکار ئەحمەد | چیرۆك | چاپکردن |
| ٣٤٦ | پرادیگمای ژن | ماردین جەلال | کۆمەلایەتی | چاپکردن |
| ٣٤٧ | ئۆریست کەی دەگەڕێتەوە؟ | حەمە کەریم هەورامی | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٤٨ | مابین القومیە والدین واسیاسە | کەمال محەمەد | رامیاری | چاپکردن |
| ٣٤٩ | پێکهاتەی نەتەوەیی لە ... | د.عەبدوڵا غەفور | ئامار | چاپکردن |
| ٣٥٠ | التشکیلات الاداریە فی جنوبی کردستان | د.عەبدوڵا غەفور | ئامار | چاپکردن |
| ٣٥١ | ئەلفبێیەکی مۆزیك | و.ع.ع سەگرمە | مۆسیقا | چاپکردن |
| ٣٥٢ | مذکرات مجهولة من سجن غیر منظور | د. نسرین فخری | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣٥٣ | عیشق لە جوانکاریدا | مینە | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣٥٤ | دیوانی قانع | بورهان قانع | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٣٥٥ | حیکایەتی گیانداران | د.شوکریە رەسول | حیکایەت | چاپکردن |
| ٣٥٦ | پایزو بەهاری خونچە | گەلاوێژ | چیرۆك | چاپکردن |
| ٣٥٧ | فەرهەنگی فوئاد | فوئاد رەشید بەکر | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٣٥٨ | کرکوك قلب کوردستان | ئا: فوئاد حمە خورشید | رامیاری | چاپکردن |
| ٣٥٩ | بۆتان ئەگێڕمەوە | ئا: بەیاد عەبدولقادر | شیعرو یاداشت | چاپکردن |
| ٣٦٠ | عەشیرەتگەریو خێڵگەری.. | نەجم عەبدوڵلا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٦١ | دنیا بینییەکانی هونەری شێوەکاری | بەختیار سەعید | شێوەکاری | چاپکردن |
| ٣٦٢ | رەنگ لەفۆلکلۆری کوردیدا | هەردەویل کاکەیی | فۆلکلۆر | چاپکردن |
| ٣٦٣ | پیاوێکی شەپقە رەشی پاڵتۆرەشی پیلاو شین | فەرهاد پیرباڵ | رۆمان | چاپکردن |
| ٣٦٤ | بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور | خەبات عەبدوڵلا | جەگرافیای عەسکەریی | چاپکردن |
| ٣٦٥ | فەرهەنگی ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا | عەبدووەهاب کانەبی | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٣٦٦ | عەقڵ گەرایی | عومەر میراودەلی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٦٧ | خالەندی | کەیومەرس ئیکرەفتار | زمانەوانی | چاپکردن |